# معالم السنة النبوية

## مەشخەڵی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ

پوختەی (١٤) کتێبە، کە بنچینەی کتێبەکانی فەرموودەن


کۆکردنەوەی

صالح أحمد الشامي

وەرگێڕانی

عبد الکریم فتاح


بەرگی دووەم

# مەشخەڵی سوننەتی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

## "پوختەی (١٤) کتێبە، کە بنچینەی کتێبەکانی فەرموودەن"

کۆکردنەوەی

صالح احمد الشامي

وەرگێڕانی

عبدالکریم فتاح

بەرگی دووەم

مەبەستی سێیەم: عیبادەتەکان

٥٠
ڕێکخراوی خاڵ

٢٥
نووری حەقیقەت

■ بابەت: مەشخەڵی سوننەتی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"
■ کۆکردنەوە: صالح احمد الشامي
■ وەرگێران: عبدالكريم فتاح
■ دیزاینەری ناوەوە: هەردی زیاد صالح
■ دیزاینەری بەرگ: جمعە هموندی
■ ساڵی چاپ: 2022
■ چاپخانە: ڕێدار بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
■ تیراژ: 2000 دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکانە گشتییەکان
ژمارە سپاردنی (٣٤٨) ساڵی ٢٠٢٢ی پێدراوە

تێبینی: لەسەر وەرگرتنی مۆڵەت لە شێخ صاڵح ئەحمەد شامی و بنەماڵەکەی
هەستاین بە وەرگێرانی ئەم کتێبە

## بەشی یەكەم

# پاكبوونەوە لە پیسییەكان

## ١- دەروازەی: خۆپاككردنەوە بە ئاو

**٨٦٩-** (ق) عن أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا خَرَجَ لِحَاجَتِهِ، أَجِيءُ أَنَا وَغُلاَمٌ، مَعَنَا إِدَاوَةٌ مِنْ مَاءٍ. يَعْنِي: يَسْتَنْجِي بِهِ. [خ١٥٠/ م٢٧١]

**(ق) لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە، وتی: كاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دەردەچوو بۆ پێویستی سەر ئاو، من و غولامێك دەهاتین و جەوەندەیە ئاومان لەگەڵ بوو، واتە: خۆی پێ پاك دەكردەوە.**

**٨٧٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي أَهْلِ قُبَاءٍ ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ﴾** [التوبة:١٠٨] قَالَ: كَانُوا يَسْتَنْجُونَ بِالْمَاءِ، **فَنَزَلَتْ فِيهِمْ هَذِهِ الآيَةُ**). [د٤٤/ ت٣١٠٠/ جه٣٥٧]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (ئەم ئایەتە: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ﴾** [التوبة:١٠٨] **فەرمووی: دەربارەی ئەهلی قوبا دابەزی، فەرمووی: خۆیان بە ئاو پاكدەكردەوە، بۆیە ئەم ئایەتە دەربارەیان دابەزی).**

**٨٧١-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مُرْنَ أَزْوَاجَكُنَّ أَنْ يَسْتَطِيبُوا بِالْمَاءِ، فَإِنِّي أَسْتَحْيِيهِمْ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَفْعَلُهُ. [ت١٩/ ن٤٦]

* صحيح.

**لە عائیشەوە، وتی: فەرمان بە ژنەكانتان بكەن خۆیان بە ئاو پاكبكەنەوە، من شەرمیان لێ دەكەم، چونكە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی ئەنجام دەدا.**

## ٢- دەروازەی: خۆ پاككردنەوە بە بەردی بچووك

**٨٧٢-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: اتَّبَعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، وخَرَجَ لِحَاجَتِهِ، فَكَانَ لاَ يَلْتَفِتُ، فَدَنَوْتُ مِنْهُ، فَقَالَ: (**ابْغِنِي أَحْجَاراً أَسْتَنْفِضْ بِهَا - أَوْ نَحْوَهُ - وَ لاَ تَأْتِنِي بِعَظْمٍ، وَلاَ رَوْثٍ**)، فَأَتَيْتُهُ بِأَحْجَارٍ بِطَرَفِ ثِيَابِي، فَوَضَعْتُهَا إِلَى جَنْبِهِ، وَأَعْرَضْتُ عَنْهُ، فَلَمَّا قَضَى أَتْبَعَهُ بِهِنَّ. [خ١٥٥]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) كەوتم، ئەو بۆ پێویستی سەر ئاو چووە دەرەوە، ئەو لای نەدەكردەوە، لێی نزیك بوومەوە، فەرمووی: (**چەند بەردێكم بۆ بهێنە خۆمی پێ پاكبكەمەوە**-یان بەو جۆرەی ئەو فەرمووی- **ئێسك و پاشەڕۆی ئاژەڵانم بۆ مەهێنە**)، بە چمكی پۆشاكەكەم چەند بەردێكم بۆ هێنا و لە تەنیشتییەوە دامنا و پشتم لێ هەڵكرد، كە تەواو بوو بەردەكانی بەدوای یەكتردا بەكارهێنا.

## ٣- دەروازەی: نەهیكردن لە خۆ پاككردنەوە بە دەستی ڕاست

**٨٧٣-** (ق) عن أَبِي قَتَادَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَأْخُذَنَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلاَ يَسْتَنْجِ بِيَمِينِهِ، وَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ**). [خ١٥٤، (١٥٣)/ م٢٦٧]

(ق) لە ئەبی قەتادەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**گەر یەكێك لە ئێوە میزی كرد با زەكەری خۆی بە دەستی ڕاست نەگرێت، و بە دەستی ڕاست خۆی پاكنەكاتەوە، و لەناو دەفری ئاوخواردنەوەش هەناسە نەدات**).

## ٤- دەروازەی: گەر بە بەرد خۆی پاككردەوە با تاك بێت

**٨٧٤-** (م) عن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا اسْتَجْمَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُوتِرْ**). [م٢٣٩]

(م) لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**گەر یەكێك لە ئێوە بە بەرد خۆی پاككردەوە با تاك بێت**).

## ٥- دەروازەی: خۆپەنادان لە چوونە سەر پێشاو

**٨٧٥-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ذَاتَ يَوْمٍ خَلْفَهُ، فَأَسَرَّ إِلَيَّ حَدِيثاً لاَ أُحَدِّثُ بِهِ أَحَداً مِنَ النَّاسِ، وَكَانَ أَحَبَّ مَا اسْتَتَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِحَاجَتِهِ: هَدَفٌ، أَوْ حَائِشُ نَخْلٍ. [م٣٤٢]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی جەعفەرەوە، وتی: ڕۆژێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە پاشکۆی خۆی سواری کردم، بە نهێنی قسەیەکی بۆ کردم بۆ هیچ کەسی باس ناکەم، باشترین شتێ پێغەمبەری خودا لە چوونە سەر پێشاو خۆی پێ پەنابدابایە بریتی بوو لە: بەرزییەك[1]، یان بێستانێکی دارخورما.**

**٨٧٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا أَرَادَ الْبَرَازَ، انْطَلَقَ حَتَّى لاَ يَرَاهُ أَحَدٌ. [د٢/ جه٣٣٥]

* صحيح.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەر(ﷺ) گەر بیویستبایە بچێتە سەر پێشاو دەڕۆیشت و دووردەکەوتەوە تا کەس نەیبینێت.**

**٨٧٧-** عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أَرَادَ الْحَاجَةَ، لَمْ يَرْفَعْ ثَوْبَهُ، حَتَّى يَدْنُوَ مِنَ الْأَرْضِ. [ت١٤/ مي٦٩٣]

* صحيح.

**لە ئەنەسەوە، وتی: گەر پێغەمبەر(ﷺ) چوونە سەر پێشاوی بویستبا، پۆشاکەکەی بەرز نەدەکردەوە تا شۆڕبێتەوە بۆ زەوی.**

---

[1] **واتە: بەردێك یان درەختێك یان تەپۆڵکەیەك-و.**

## ٦- دەروازەی: نەهیکردن لە پیسی کردن لەسەر رێگە و ژێر سێبەر

**٨٧٨**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**اتَّقُوا اللَّعَّانَيْنِ**)، قَالُوا: وَمَا اللَّعَّانَانِ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**الَّذِي يَتَخَلَّى فِي طَرِيقِ النَّاسِ، أَوْ فِي ظِلِّهِمْ**). [م٢٦٩]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خۆتان لە دوو نەفرەتکارەکە[1] بپارێزن**)، وتیان: دوو نەفرەتکارەکە چین، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: (**ئەو کەسەی لەسەر رێگەی خەڵك، یان لەژێر سێبەریان پیسی دەکات**).

## ٧- دەروازەی: نەهیکردن لە میزکردنە ناو ئاوی وەستاو

**٨٧٩**- (ق) عن أبي هُرَيْرَة: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**لاَ يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ الَّذِي لاَ يَجْرِي، ثُمَّ يَغْتَسِلُ فِيهِ**). [خ٢٣٩/ م٢٨٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**یەکێك لە ئێوە میز نەکاتە ناو ئاوێکی بەردەوام[2] کە جاری نابێت، پاشان خۆی تێدا بشوات**).

## ٨- دەروازەی: میزکردن بە پێوە

**٨٨٠**- (ق) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم سُبَاطَةَ قَوْمٍ، فَبَالَ قَائِماً، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَجِئْتُهُ بِمَاءٍ، فَتَوَضَّأَ. [خ٢٢٤/ م٢٧٣]

**(ق) لە حوزەیفەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ سەرەنگوێلکێك[3]، بە پێوە میزی کرد، پاشان داوای ئاوی کرد، منیش ئاوم بۆ هێنا، دەستنوێژی گرت.**

---

[1] واتە: ئەو دوو شتەی نەفرەت بۆ مرۆڤ رادەکێشن-و.

[2] بەردەوام: واتە: وەستاو-و.

[3] واتە: جێخاشاك-و.

**٨٨١**- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا بَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَائِماً مُذْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْقُرآن. [ك٦٥٩/ هق١٠١/١]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە عائیشەوە، وتی: لەو کاتەوەی قورئان بەسەر پێغەمبەری خودادا(ﷺ) دابەزیوە بە پێوە میزی نەکردووە.[1]**

## ٩- دەروازەی: حوکمی مەزی(المذي)[2]

**٨٨٢**- (ق) عن عليٍّ قال: كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً، فَاسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسْأَلَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: (فِيهِ الْوُضُوءُ). [خ١٧٨، (١٣٢)/ م٣٠٣]

**(ق) لە عەلییەوە، وتی: پیاوێك بووم مەزیم زۆر بوو، شەرمم کرد پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بکەم، فەرمانم کرد بە میقدادی کوڕی ئەسوەد پرسیاری لێکرد، فەرمووی: (دەستنوێژگرتنەوەی تێدا هەیە[3]).**

---

[1] واتە: بۆ هەڵگرتنی دژایەتی نێوان فەرموودەی (٨٨٠ و ٨٨١) پێدەچێ حوزەیفە کاتێ پێغەمبەری بینی بێت لە میزکردنەکە تەواو بووبێت و هەستابێتەوە سەر پێ و داوای ئاوی کردبێت، ئەو لەو کاتەدا وایزانیوە پێغەمبەر بە پێوە میزەکەی کردووە و ئاگادار نەبووە بە دانیشتن و هەستانەوەی، چونکە لە رووی ئەدەبەوە مرۆڤ تەماشای کەسێك ناکات دەچێتە سەر پێشاو، بۆیە ئەسڵ فەرموودەکەی خاتوو عائیشەیە(٨٨١)-و.

[2] مەزی(المذي) ئاوێکی سپی نەرمی لینجە لە حەزەوە لە زەکەری پیاو یان داوێنی ئافرەت دێتە دەرەوە، جیاوازە لە مەنی و ئاوهاتنەوەی لەگەڵ نییە، لەوانەیە کەسەکە هەست بە هاتنە دەرەوەی نەکات، لە ژن و پیاودا هەیە و لە ژندا زۆرترە تا پیاوان.

[3] واتە: لەش پیس ناکات و غوسڵی لەشگرانی نایەتە سەر، تەنها دەستنوێژ دەشکێنێ، گەر کەسەکە دەستنوێژی هەبوو دەبێ بیگرێتەوە-و.

## ١٠- دەروازەی: خۆپاککردنەوە و روونەکردنە قیبلە

٨٨٣- (ق) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا أَتَيْتُمُ الغَائِطَ، فَلاَ تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ وَلاَ تَسْتَدْبِرُوهَا، وَلكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا)**.

قَالَ أَبُو أَيُّوبَ: فَقَدِمْنَا الشَّامَ، فَوَجَدْنَا مَرَاحِيضَ بُنِيَتْ قِبَلَ القِبْلَةِ، فَنَنْحَرِفُ، وَنَسْتَغْفِرُ الله تَعَالَى. [خ٣٩٤، (١٤٤)/ م٢٦٤]

**(ق) لە ئەبی ئەیوبی ئەنصارییەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (گەر چوونە سەر پێشاو، روو مەکەنە قیبلـە و پشتی تێمەکەن، بەڵکو روو بە خۆرهەڵات یان روو بە خۆرئاوا).**

**ئەبو ئەیوب وتی: هاتین بۆ شام، بینیمان ئاودەست روو بە قیبلە دروستکراوە، خۆمان دەسوڕاند و داوای لێخۆشبوونمان لە خودا دەکرد.**

## ١١- دەروازەی: ئەوەی لە کاتی چوونە سەر پێشاو دەوترێت

٨٨٤- (ق) عن أنسٍ قال: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ قَالَ: **(اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ والْخَبَائِثِ)**. [خ١٤٢/ م٣٧٥]

**(ق) لە ئەنەسەوە، وتی: گەر پێغەمبەر(ﷺ) بڕۆیشتبایە بۆ سەر پێشاو دەیفەرموو: (أللهم إنّي أعوذُ بِكَ منَ الخُبْثِ والخبائِث-خودایە پەنات پێ دەگرم لە "الخبث والخبائث[1]").**

٨٨٥- عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْغَائِطِ قَالَ: **(غُفْرَانَكَ)**. [د٣٠/ ت٧/ جه٣٠٠/ مي٧٠٧]

* صحيح.

---

[1] (الخبث والخبائث) بریتین لە نێرە و مێیەی شەیتانەکان.

لە عائیشەوە: گەر پێغەمبەر(ﷺ) لە پێشاو بهاتبایەتە دەرەوە دەیفەرموو: (غُفرانك[1]).

## ١٢- دەروازەی: لە کاتی میز کردن قسەکردن نییە

٨٨٦- (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَجُلاً مَرَّ، وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَبُولُ، فَسَلَّمَ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ. [م٣٧٠]

(م) لە ئیبن عومەرەوە: پیاوێك تێپەری، پێغەمبەری خودا(ﷺ) میزی دەکرد، سەلامی لێکرد، پێغەمبەر وەلامی نەدایەوە.

٨٨٧- عَنِ الْمُهَاجِرِ بْنِ قُنْفُذٍ: أَنَّهُ سَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ يَبُولُ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ، حَتَّى تَوَضَّأَ، فَلَمَّا تَوَضَّأَ رَدَّ عَلَيْهِ. [ن٣٨/ مي٢٦٨٣]

* صحيح.

لە موهاجیری کوری قونفوزەوە: ئەو سلاوی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کاتێك میزی دەکرد، وەلامی نەدایەوە، تا دەستنوێژی گرت، کاتێك دەستنوێژی هەلگرت وەلامی دایەوە.

## ١٣- دەروازەی: میزی منداڵ

٨٨٨- (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قالَتْ: كانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُؤْتَى بِالصِّبْيَانِ، فَيَدْعُو لَهُمْ، فَأُتِيَ بِصَبِيٍّ فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَأَتْبَعَهُ إِيَّاهُ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ. [خ٦٣٥٥، (٢٢٢)/ م٢٨٦]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: منداڵ دەهێنرا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و دوعای بۆ دەکرد، منداڵێك هێنرا میزی کرد بەسەر پۆشاکەکەیدا داوای ئاوی کرد رژاندی بە دوایدا و نەیشۆری.

[1] (غفرانك): واتە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم.

**٨٨٩**– عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ فِي بَوْلِ الرَّضِيعِ: (**يُنْضَحُ بَوْلُ الْغُلَامِ، وَيُغْسَلُ بَوْلُ الْجَارِيَةِ**). [ت٦١٠/ جه٥٢٥]

* صحيح.

**لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت): دەربارەی میزی منداڵی شیرەخۆر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (میزی منداڵی نێرینە ئاوپرژێن دەکرێت[1] و میزی منداڵی مێینە دەشۆرێت).**

## ١٤– دەروازەی: هاندان بۆ خۆپاکراگرتن لە میز

[انظر: ١٦٥١]

## ١٥– دەروازەی: حوکمی مەنی

**٨٩٠**– (ق) عن سليمانَ بنِ يَسَارٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ: عَنِ الْمَنِيِّ يُصِيبُ الثَّوْبَ، فَقَالَتْ: كُنْتُ أَغْسِلُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَيَخْرُجُ إِلَى الصَّلَاةِ، وَأَثَرُ الْغَسْلِ فِي ثَوْبِهِ: بُقَعُ الْمَاءِ. [خ٢٣٠، (٢٢٩)/ م٢٨٩]

**(ق) لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە، وتی: پرسیارم لە عائیشە کرد: دەربارەی مەنی کە بە پۆشاکەوە دەلکێت، وتی: لە پۆشاکی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەمشۆری، دەڕۆیشت بۆ نوێژ و ئەسەری شۆرینەکە بە پۆشاکەکەیەوە چەندین پەڵەی ئاو بوو.**

**٨٩١**– (م) عَنْ عَلْقَمَةَ وَالْأَسْوَدِ: أَنَّ رَجُلاً نَزَلَ بِعَائِشَةَ، فَأَصْبَحَ يَغْسِلُ ثَوْبَهُ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: إِنَّمَا كَانَ يُجْزِئُكَ، إِنْ رَأَيْتَهُ، أَنْ تَغْسِلَ مَكَانَهُ، فَإِنْ لَمْ تَرَ نَضَحْتَ حَوْلَهُ، وَلَقَدْ رَأَيْتُنِي أَفْرُكُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَرْكاً؛ فَيُصَلِّي فِيهِ. [م٢٨٨]

---

[1] **واتە: ئاو لە شوێنی میزەکە دەپرژێنرێت–و.**

**(م) لە عەلقەمە و ئەسوەدەوە: پیاوێك بوو بە میوانی عائیشە، بەیانی لێبوویەوە پۆشاکەکەی دەشۆری، عائیشە وتی: گەر بینیت ئەوەندە بەسە شوێنەکەی بشۆی، گەر نەتبینی ئاو دەپرژێنی بە دەوروبەرەکەیدا، من دەمبینی و لە پۆشاکی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە ولێن[1] هەڵمدەوەراند، و نوێژی تێدا دەکرد.**

**٨٩٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم: يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الَّذِي يَأْتِي فِيهِ أَهْلَهُ؟ قَالَ: (**نَعَمْ، إِلاَّ أَنْ يَرَى فِيهِ شَيْئاً؛ فَيَغْسِلَهُ**). [جه٥٤٢]

* صحيح.

**لە جابری کوڕی سەمورەوە، وتی: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد: ئایا لەو پۆشاکەی پێیەوە دەچێتە لای خێزانی نوێژ بکات؟ فەرمووی: (بەڵێ، مەگەر شتێکی تێدا ببینێت[2]، ئەوکات دەیشۆرێت.**

## ١٦- دەروازەی: پیسی بکەوێتە ناو رۆن(چەوری)

**٨٩٣-** (خ) عَنْ مَيْمُونَةَ أُمِّ المؤْمِنِينَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم سُئِلَ عَنْ فَأْرَةٍ سَقَطَتْ فِي سَمْنٍ، فَقَالَ: (**أَلْقُوهَا، وَمَا حَوْلَهَا فَاطْرَحُوهُ، وَكُلُوا سَمْنَكُمْ**). [خ٢٣٥]

**(خ) لە مەیموونەوە دایکی باوەڕداران، پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا دەربارەی مشك بکەوێتە ناو رۆنەوە، فەرمووی: (مشکەکە فڕێ بدەن و دەوروبەرەکەی لادەن و رۆنی خۆتان بخۆن).**

---

[1] "ولێن"م بۆ وشەی (فَرْك) بەکارهێناوە، گەر بتەوێ پیسییەکی وشەکەوە بوو لە پۆشاکێك بکەیەوە بە پرواندنی پۆشاکەکە هەوڵی هەڵوەراندنی دەدەی، ئەو کارە پێی دەوترێت "ولێن"ــو.

[2] واتە: مەگەر پیسییەکی پێوە ببینێتــو.

## ١٧- دەروازەی: پاكی پێستی مردارەوەبوو بە دەباغی

**٨٩٤-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: وَجَدَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم شَاةً مَيِّتَةً، أُعْطِيَتْهَا مَوْلَاةٌ لِمَيْمُونَةَ مِنَ الصَّدَقَةِ، قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**هَلاَّ انْتَفَعْتُمْ بِجِلْدِهَا**). قَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ؟ قَالَ: (**إِنَّمَا حَرُمَ أَكْلُهَا**). [خ١٤٩٢/ م٣٦٣ . ٣٦٥]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) كاوڕێكی مردارەوەبووی بینییەوە، لە صەدەقەدا درا بە كەنیزەكێكی مەیموونە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بۆچی سوودتان لە پێستەكەی نەبینی؟)، وتیان: ئەوە مردارەوەبووە؟ فەرمووی: (خواردنی حەرام كراوە[1]).**

**٨٩٥-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِذَا دُبِغَ الإِهَابُ فَقَدْ طَهُرَ**). [م٣٦٦]

**(م) لە عەبدوڵای كوڕی عەباسەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (گەر پێستی دەباغی نەكراو دەباغی بكرێت پاكبووەتەوە).**

## ١٨- دەروازەی: حوكمی سەگ

**٨٩٦-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا شَرِبَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ؛ فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعاً**). [خ١٧٢/ م٢٧٩]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر سەگ لە دەفری یەكێك لە ئێوە خواردییەوە، با حەوت جار بیشۆرێت[2]).**

- وفي رواية لمسلم: (**طُهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ، إِذَا وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ؛ أَنْ يَغْسِلَهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ، أُولاَهُنَّ بِالتُّرَابِ**).

---

[1] واتە: مردارەوە بوو خواردنەكەی حەرام كراوە نەك پێستەكەی-و.

[2] واتە: با گڵاوی دەربكات بە حەوت جار شۆرین-و.

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: **(پاکیبوونەوەی دەفری یەکێك لە ئێوە، گەر سەگ دەمی تێخست، ئەوەیە حەوت جار بیشۆرێت، یەکەمیان بە خۆڵ بێت)**.

## ١٩- دەروازەی: پیسی بەر نەعل بکەوێت

**٨٩٧**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا وَطِئَ أَحَدُكُمْ بِنَعْلِهِ الْأَذَى، فَإِنَّ التُّرَابَ لَهُ طَهُورٌ**). [د٣٨٥، ٣٨٦]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە بە نەعلەکەی پێی لە پیسی نا، خۆڵ پاکبوونەوەیە بۆی[1])**.

## ٢٠- دەروازەی: حوکمی پشیلە

**٨٩٨**- عَنْ كَبْشَةَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ. وَكَانَتْ تَحْتَ ابْنِ أَبِي قَتَادَةَ.: أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ دَخَلَ، فَسَكَبَتْ لَهُ وَضُوءاً، فَجَاءَتْ هِرَّةٌ فَشَرِبَتْ مِنْهُ، فَأَصْغَى لَهَا الْإِنَاءَ حَتَّى شَرِبَتْ. قَالَتْ كَبْشَةُ: فَرَآنِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَتَعْجَبِينَ يَا ابْنَةَ أَخِي؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، إِنَّهَا مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ**).

[د٧٥/ ت٩٢/ ن٦٨، ٣٣٩/ جه٣٦٧/ مي٧٦٣]

* صحيح.

لە کەبشەی کچی کەعبی کوڕی مالیکەوە-لە خزمەتکاری ئیبن ئەبی قەتادەدا بوو: ئەبو قەتادە چووەتە ژوورەوە، ئەو[2] ئاوی دەستنوێژی بۆ کردووەتە

---

[1] یەکسانە بەردەوام بێت لە رۆیشتن تا بە هۆی بەرکەوتنی خاك نەعلەکە پاك دەبێتەوە، یان دابنیشێ و بە خۆڵ پاکی بکاتەوە-و.

[2] واتە: کەبشەی کچی کەعب-و.

دەفرێك، پشیلەیەك هاتووە و لێی خواردووەتەوە، ئەبو قەتادە دەفرەکەی بۆ لار کردەوە تا پشیلەکە خواردییەوە، کەبشە وتی: ئەبو قەتادە منی بینی تەماشای دەکەم، وتی: کچی برای خۆم سەرتسوڕدەمێنێت؟ وتم: بەڵێ، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پشیلە پیس نییە، چونکە لەو گیاندارە نێر و مێیانەیە بەسەر ئێوەدا دەگەڕێن)**.

## ٢١- دەروازەی: میز

**٨٩٩-** عَنْ أُمَيْمَةَ بِنْتِ رُقَيْقَةَ قَالَتْ: كَانَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَدَحٌ مِنْ عَيْدَانٍ تَحْتَ سَرِيرِهِ، يَبُولُ فِيهِ بِاللَّيْلِ. [د٢٤/ ن٣٢]

* حسن صحيح.

**لە ئومەیمەی کچی روقەیقەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لەژێر جێی خەوتنەکەی پەرداخێکی لە دار هەبوو بە شەو میزی تێدەکرد.**

## ٢٢- دەروازەی: ئاوی دەریا

**٩٠٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نَرْكَبُ الْبَحْرَ، وَنَحْمِلُ مَعَنَا الْقَلِيلَ مِنَ الْمَاءِ، فَإِنْ تَوَضَّأْنَا بِهِ عَطِشْنَا، أَفَنَتَوَضَّأُ بِمَاءِ الْبَحْرِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ)**.

[د٨٣/ ت٦٩/ ن٥٩/ جه٣٨٦/ مي٧٥٦]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە سواری دەریا دەبین و کەمێك لە ئاو لەگەڵ خۆمان هەڵدەگرین، گەر دەستنوێژی پێ بگرین تینوو دەبین، ئایا بە ئاوی دەریا دەستنوێژ**

بگرین؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوە ئاوەکەی پاککەرەوەیە[1]، و مردارەوەبووی حەلاڵە)**.

**٩٠١-** عَن ابنِ عُمَرَ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الْمَاءِ وَمَا يَنُوبُهُ مِنَ الدَّوَابِّ وَالسِّبَاعِ، فَقَالَ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا كَانَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلِ الْخَبَثَ)**.

[د٦٣/ ت٦٧/ ن٥٢٠/ جه٥١٧/ مي٧٥٨]

* صحيح.

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا دەربارەی ئاو و ئەوەی گیانداران و دڕندە دەچنە سەری[2]، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (گەر ئاو بگاتە قولەتێن[3] پیسی هەڵناگرێت).**

---

[1] ئاوی پاککەرەوە(الطَّهور)-لە فیقهدا- ئەو ئاوەیە بێ دەستنوێژی و لەشپیسی پێ هەڵدەگیرێت و پۆشاك و شتومەکی لە پیسی پێ پاك دەکرێتەوە، وەلێ "ئاوی پاك(الطاهِر)" ئەو ئاوەیە لە خۆیدا پیس نییە و گەر بەر جەستە و پۆشاك بکەوێت پێویست بە شۆرین و پاککردنەوە ناکات، ناوی یەکەمیان(پاککەرەوە) تێپەڕە و ناوی دووەمیان(پاك) تێنەپەڕ-و.

[2] واتە: بۆ خواردنەوە و خۆ خستنە ناو ئاوەکە دەچنە سەری-و.

[3] (البغا) لە پەراوێزی (الدارمي)دا دەڵێت: دەفرێك سەد لیتر ئاو بگرێت.

## بەشی دووەم

## حەیز

### ١- دەروازەی: ئافرەتی حەیزدار نوێژ و ڕۆژوو وازلێدەهێنێت

**٩٠٢- (ق)** عَنْ مُعَاذَةَ: أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ لِعَائِشَةَ: أَتَجْزِي إِحْدَانَا صَلاَتَهَا إِذَا طَهُرَتْ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ كُنَّا نَحِيضُ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَلاَ يَأْمُرُنَا بِهِ، أَوْ قَالَتْ: فلاَ نَفْعَلُهُ.

[خ٣٢١/ م٣٣٥]

**(ق) لە موعازەوە: ئافرەتێك بە عائیشەی وت: یەكێك لە ئێمە گەر پاكبوویەوە، ئایا نوێژەكەی دەگێڕێتەوە؟ عائیشە وتی: ئایا تۆ حەروریت؟[1] لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، دەكەوتینە حەیزەوە و فەرمانی پێ نەدەكردین بەو كارە، یان وتی: ئەنجامامان نەدەدا.**

- وفي رواية لمسلم: قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ فَقُلْتُ: مَا بَالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ وَلاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ قُلْتُ: لَسْتُ بِحَرُورِيَّةٍ، وَلكِنِّي أَسْأَلُ، قَالَتْ: كَانَ يُصِيبُنَا ذلِكَ فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاَةِ.

**لە ریوایەتێكدا: وتی: پرسیارم لە عائیشە كرد و وتم: بۆچی حەیزدار ڕۆژوو قەزا دەكاتەوە و نوێژ قەزا ناكاتەوە؟ وتی: تۆ حەروریت؟ وتم: حەروری نیم، بەڵام**

---

[1] دانەپاڵە بۆ لای (حروراء) دێیەك بوو نزیك بە كوفە، یەكەمین كۆبوونەوەی خەواریج لەو شوێنە بوو، هەروی دەڵێت: لەو دێیە پەیمانیان بەست بۆیە درانەپاڵی، مانای قسەكەی عائیشە(خوا لێی رازی بێت) دەستەیەك لە خەواریج قەزا كردنەوەی نوێژی فەوتاو-لە كاتی حەیزداریدا- لەسەر ئافرەتی حەیزدار بە واجب دەبینن، ئەوەش پێچەوانەی ئیجماعی موسڵمانانە، پرسیاركردنەی عائیشە پرسیاركردنی ئینكارییە، واتە: ئەوە ڕێگەی حەرورییەكانە و خراپترین ڕێگەیە-د.

دەپرسم، وتی: ئەوەم تووشدەهات[1]، فەرمانمان پێ دەکرا بە قەزای ڕۆژوو و فەرمانمان پێ نەدەکرا بە قەزای نوێژ.

٩٠٣- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي أَضْحَى . أَوْ فِطْرٍ . إِلَى المصَلَّى، فَمَرَّ عَلَى النِّسَاءِ، فَقَالَ: (**يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ فَإِنِّي أُرِيتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ**). فَقُلْنَ: وَبِمَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ، وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَذْهَبَ لِلُبِّ الرَّجُلِ الحَازِمِ مِنْ إِحْدَاكُنَّ**). قُلْنَ: وَمَا نُقْصَانُ دِينِنَا وَعَقْلِنَا يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**أَلَيْسَ شَهَادَةُ الْمَرْأَةِ مِثْلَ نِصْفِ شَهَادَةِ الرَّجُلِ**) ؟ قُلْنَ: بَلَى، قَالَ: (**فَذَلِكَ مِنْ نُقْصَانِ عَقْلِهَا، أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتْ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ**)، قُلْنَ: بَلَى، قَالَ: (**فَذَلِكَ مِنْ نُقْصَانِ دِينِهَا**). [خ٣٠٤/ م٨٠]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە جەژنی قوربان یان ڕەمەزان ڕۆیشتە دەرەوە بۆ شوێنی نوێژ، بە پاڵ ئافرەتاندا تێپەڕی، فەرمووی: (**ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، صەدەقە بکەن، چونکە من ئێوەم بینی زۆرینەی ئەهلی ئاگر بوون**)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، بە هۆی چییەوە؟ فەرمووی: (**زۆر نەفرەت دەکەن، سپڵەن بەرانبەر هاوسەرەکانتان، ناتەواوێکم -لە ئەقڵ و دیندا- نەبینیوە لە یەکێك لە ئێوە زۆرتر و زیاتر ئەقڵی پیاوی خاوەن لێبڕان ببات**)، وتیان: ناتەواوی دین و ئەقڵمان چییە، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: (**ئایا شایەتی ئافرەت نیوەی شایەتی پیاو نییە**)؟، وتیان: با، فەرمووی: (**ئەوە لە ناتەواوی ئەقڵییەوە، ئایا گەر کەوتە حەیزەوە نوێژ و ڕۆژوو وازلێناهێنێت؟**)، وتیان: با، فەرمووی: (**ئەوەش لە ناتەواوی دینییەوە**).

## ٢- دەروازەی: خۆشۆرین لە حەیز و زەیسانی

٩٠٤- (ق) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ غُسْلِهَا مِنَ المحِيضِ، فَأَمَرَهَا كَيْفَ تَغْتَسِلُ، قَالَ: (**خُذِي فِرْصَةً مِنْ مِسْكٍ، فَتَطَهَّرِي بِهَا**). قَالَتْ: كَيْفَ

[1] واتە: تووشی حەیز دەهاتم-و.

أَتطَهَّرُ؟ قَالَ: (تَطَهَّرِي بِهَا)، قَالَتْ: كَيْفَ؟ قَالَ: (سُبْحَانَ اللهِ! تَطَهَّرِي)، فَاجْتَبَذْتُهَا إِلَيَّ، فَقُلْتُ: تَتَبَّعِي بِهَا أَثَرَ الدَّمِ. [خ٣١٤/ م٣٣٢]

(ق) لە لە عائیشەوە: ئافرەتێك پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد دەربارەی خۆشۆرینی لە حەیز، فەرمانی پێکرد چۆن خۆی دەشۆرێ، و فەرمووی: **(پارچە لۆکەیەکی میسکاوی بگرە و پێی پاکبکەرەوە)**، وتی: چۆن پێی پاکبکەمەوە؟ فەرمووی: **(پێی پاك بکەرەوە)**، وتی: چۆن؟ فەرمووی: **(سبحان الله![1] خۆت پاکبکەرەوە)**، ئافرەتەکەم راکێشا بۆ لای خۆم و وتم: بیهێنە بە ئەسەری خوێنەکەدا[2].

- وفي رواية لمسلم: عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ أَسْمَاءَ سَأَلَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ غُسْلِ الْمَحِيضِ؟ فَقَالَ: **(تَأْخُذُ إِحْدَاكُنَّ مَاءَهَا وَسِدْرَتَهَا، فَتَطَهَّرُ، فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ دَلْكاً شَدِيداً، حَتَّى تَبْلُغَ شُؤُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَيْهَا الْمَاءَ، ثُمَّ تَأْخُذُ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتَطَهَّرُ بِهَا)**. فَقَالَتْ أَسْمَاءُ: وَكَيْفَ تَطَهَّرُ بِهَا؟ فَقَالَ: **(سُبْحَانَ اللهِ! تَطَهَّرِينَ بِهَا)**، فَقَالَتْ عَائِشَةُ ـ كَأَنَّهَا تُخْفِي ذَلِكَ ـ: تَتَبَّعِينَ أَثَرَ الدَّمِ. وَسَأَلَتْهُ عَنْ غُسْلِ الْجَنَابَةِ؟ فَقَالَ: **(تَأْخُذُ مَاءً فَتَطَهَّرُ، فَتُحْسِنِ الطُّهُورَ ـ أَوْ تُبْلِغُ الطُّهُورَ ـ ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ، حَتَّى تَبْلُغَ شُؤُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تُفِيضُ عَلَيْهَا الْمَاءَ)**. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: نِعْمَ النِّسَاءُ نِساءُ الأَنْصَارِ؛ لَمْ يَكُنْ يَمْنَعُهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ.

لە ریوایەتێکی موسلیمدا لە عائیشەوە: ئەسما پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد لە خۆشۆرینی حەیزداری؟ فەرمووی: **(یەکێك لە ئێوە ئاو و سیدرەی ببات و خۆی پاك بکاتەوە و خۆپاککردنەوەی باش و چاك بێت، پاشان ئاو بەسەری خۆیدا بکات و زۆر دەست بخاتە ناو سەری تا ئاوەکە دەگات بە بێخی سەری، پاشان ئاو بەسەر خۆیدا**

---

[1] سبحان الله: بۆ سەرسوڕمانە، مانای سەرسوڕمانەکە لێرەدا: چۆن نموونەی ئەو ئاشکرایە دەشارێتەوە کە مرۆڤ بۆ تێگەیشتنی پێویستی بە بیرکردنەوە نییە—د.

[2] ئەسەری خوێنەکە: جمهووری زانایان دەڵێن واتە داوێنی ئافرەت(فەرج).

**بکات، پاشان پارچە لۆکەیەکی میسکاوی هەڵدەگرێت و خۆی پێ پاك دەکاتەوە)**، ئەسما وتی: چۆن خۆی پێ پاك دەکاتەوە؟ فەرمووی: **(سبحان الله! خۆتانی پێ پاکدەکەنەوە)**، عائیشە -وەك ئەوەی قسەکەی خۆی بشارێتەوە- وتی: دەیهێنی بە ئەسەری خوێنەکەدا، ئەسما پرسیاری خۆشۆرینی کرد لە لەشپیسی؟ فەرمووی: **(ئاو دەبات و خۆی پاکدەکاتەوە و پاککردنەوەکە باش و چاك ئەنجام دەدات -یان دەیگەیەنێ بە رادەی پاککردنەوە- پاشان ئاو بەسەر خۆیدا دەکات و دەستی تێدەخات تا دەگاتە بێخی سەری، پاشان ئاو بە خۆیدا دەکات)**، عائیشە وتی: باشترین ئافرەت ئافرەتانی ئەنصار بوون شەرم و حەیا رێگری لێنەدەکردن لەوەی لە دین حاڵی ببن.

٩٠٥- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِذَا اغْتَسَلَتِ الْمَرْأَةُ مِنَ الْحَيْضِ، فَلْتُمِسَّ أَثَرَ الدَّمِ بِطِيبٍ.

* إسناده صحيح. [مي١٢٠٢]

لە عائیشەوە وتی: گەر ئافرەت لە حەیز خۆی شۆری با بۆنی خۆش لە ئەسەری خوێنەکە[1] بدات.

٩٠٦- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا اغْتَسَلَتِ المَرْأَةُ مِنْ حَيْضِهَا نَقَضَتْ شَعْرَهَا وَغَسَلَتْهُ بِخِطْمِي وَأُشْنَان، وإذَا اغْتَسَلَتْ مِنْ جَنَابَةٍ صَبَّتْ عَلى رَأْسِها المَاءَ وَعَصَرَتْهُ). [مخ/٥/١٦٩٣]

* إسناده صحيح.

لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئافرەت لە حەیزەکەی خۆی شۆری پەلکەی سەری دەکاتەوە و بە (خِطْمِي و أُشْنان[2]) دەیشۆرێ، گەر لە لەشگرانی خۆی شۆری ئاو دەکات بە سەر سەری خۆیدا و پەلکەکانی سەری دەگوشێ)**.

---

(1) ئەسەری خوێنەکە: وەك لە فەرموودەکەی تر(٩٠٤) ئاماژەی پێدرا بریتییە لە فەرج-و.

(2) "خطمي و أشنان": دوو جۆر رووەکن بۆ پاککردنەوە بەکاردەهێنرێن، لە وڵاتی ئێمە ئەو سەردەمانەی سابوون کەم بوو خەڵك گیای "خرنووکە"یان بۆ پاککردنەوە بەکاردەهێنا-و.

## ٣- دەروازەی: شێوە حەیز(الإستحاضة[١])

٩٠٧- (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فَلاَ أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلاَةَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ، إِنَّمَا ذَلِكَ عِرْقٌ، وَلَيْسَ بِحَيْضٍ، فَإِذَا أَقْبَلَتْ حَيْضَتُكِ فَدَعِي الصَّلاَةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ، ثُمَّ صَلِّي**). [خ٢٢٨/ م٣٣٣]

(ق) لە عائیشەوە، وتی: فاتیمەی کچی ئەبی حوبەیش هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من ئافرەتێکم خوێنم لەبەر دەڕوات و پاکنابمەوە، ئایا وازبهێنم لە نوێژ؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**نەخێر، ئەوە رەگێکە و حەیز نییە، گەر حەیزەکەت هاتە بەرەوە نوێژ وازلێبهێنە، گەر وادەی حەیزەکەت پشتیهەڵکرد[٢] خوێنەکە لە خۆت بشۆرە و پاشان نوێژ بکە**).

- زاد البخاري: (**ثُمَّ تَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلاَةٍ، حَتَّى يَجِيءَ ذَلِكَ الْوَقْتُ**).

بوخاری ئەمەی زیاد کردووە: (**پاشان بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بگرە تا ئەو کاتە دێتە بەرەوە**).

- وفي رواية للبخاري: (**دَعِي الصَّلاَةَ قَدْرَ الأَيَّامِ الَّتِي كُنْتِ تَحِيضِينَ فِيهَا**). [خ٣٢٥]

لە ریوایەتێکی بوخاریدا: (**بە بڕی ئەو رۆژانەی پێشتر تیایاندا حەیزت هەبووە وازبهێنە لە نوێژ[٣]**).

---

[١] شێوە حەیز(الإستحاضة) بریتییە لە هاتنی خوێن لە داوێنی ئافرەت بەبێ وادە و کاتی حەیز و زەیسانی، ئەوەش بە هۆی نەخۆشی یان هەر هۆیەکی تر–و.

[٢] واتە: تەواو بوو–و.

[٣] واتە: ئافرەتەکە دەبێ رۆژەکانی حەیزی خۆی بزانێت، بزانێت لە کەیەوە بۆ کەی دەست پێ دەکات، ئەوەش بەپێی ئەو کات و وادەی نەخۆشی شێوە حەیز(الإستحاضة)ی نەبووە و کەوتووتە ناو حەیزەوە، ئەو ماوەیە واز لە نوێژ و رۆژوو دەهێنێت، کە ماوەکە تەواو بوو خۆی دەشۆرێ و دەست بە نوێژ و رۆژوو دەکاتەوە، با خوێنیشی لەبەر بڕوات، چونکە ئەو خوێنە خوێنی حەیز نییە، بەڵکو خوێنی شێوە حەیزە، ئەوەش لە ئەمڕۆدا لە رووی زانستی پزیشکییەوە چارەسەری هەیە و دەبێت ئافرەت پشتگوێی نەخات–و.

٩٠٨- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تُهَرَاقُ الدِّمَاءَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَاسْتَفْتَتْ لَهَا أُمُّ سَلَمَةَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**لِتَنْظُرْ عِدَّةَ اللَّيَالِي وَالأَيَّامِ الَّتِي كَانَتْ تَحِيضُهُنَّ مِنَ الشَّهْرِ قَبْلَ أَنْ يُصِيبَهَا الَّذِي أَصَابَهَا، فَلْتَتْرُكِ الصَّلاَةَ قَدْرَ ذَلِكَ مِنَ الشَّهْرِ، فَإِذَا خَلَّفَتْ ذَلِكَ فَلْتَغْتَسِلْ، ثُمَّ لِتَسْتَثْفِرْ بِثَوْبٍ ثُمَّ لِتُصَلِّ**).
[د٢٧٤/ ن٢٠٨/ جه٦٢٣/ مي٨٠٧]

* صحيح.

**لە لە ئوم سەلەمەوە، هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)، ئافرەتێك لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خوێنی لەبەر دەڕۆیشت، ئوم سەلەمە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاری بۆ کرد، فەرمووی: (با لە ژمارەی ئەو ڕۆژ و شەوانە وردبێتەوە لە مانگێکدا تیایاندا دەکەوتە ناو حەیزەوە بەرلەوەی ئەوەی تووشببێت کە تووشیهاتووە[١]، با بە بڕی ئەوانە لە مانگێکدا وازبهێنێت لە نوێژ[٢]، گەر ئەو ماوەیەی تێپەڕاند با خۆی بشۆرێت، پاشان بە پۆشاکێك توند خۆی ببەستێ[٣] و پاشان نوێژ بکات).**

٩٠٩- عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ كَانَتْ تُسْتَحَاضُ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ دَمَ الْحَيْضِ دَمٌ أَسْوَدُ يُعْرَفُ، فَإِذَا كَانَ ذَلِكَ فَأَمْسِكِي عَنِ الصَّلاَةِ، وَإِذَا كَانَ الآخَرُ فَتَوَضَّئِي وَصَلِّي**).
[د٢٨٦/ ن٢١٦، ٣٦١]

* صحيح.

**لە عائیشەوە: فاتیمەی کچی ئەبی حوبەیش شێوە حەیزی هەبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: (خوێنی حەیز خوێنێکی ڕەشە و دەناسرێتەوە، گەر ئەوە بوو خۆت لە نوێژ بگرەوە، گەر ئەویتر بوو[٤] دەستنوێژ بگرە و نوێژ بکە).**

---

[١] واتە: بەر لە تووشبوونی بە شێوە حەیز(الإستحاضة)-و.

[٢] واتە: هەر بەو جۆرە وازهێنان لە ڕۆژوو بەپێی فەرموودەکانی پێشتر-و.

[٣] واتە: پارچە لۆکەیەك بە داوێنی هەڵبگرێت و داوێنی خۆی بە قوماشێك ببەستێ(هەڵبەستێ) تاکو ڕێگری بکات لە هاتنە خوارەوەی خوێن و نوێژەکەی بکات-د.

[٤] واتە: شێوەی ڕەش نەبوو، هەر ڕەنگێکی تر بوو سوور یان شێوەیەکی تر-و.

## ٤- دەروازەی: شۆرینی خوێنی حەیز

**٩١٠**– (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ أَنَّهَا قَالَتْ: سَأَلَتِ امْرَأَةٌ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ إِحْدَانَا إِذَا أَصَابَ ثَوْبَهَا الدَّمُ مِنَ الْحَيْضَةِ، كَيْفَ تَصْنَعُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا أَصَابَ ثَوْبَ إِحْدَاكُنَّ الدَّمُ مِنَ الْحَيْضَةِ، فَلْتَقْرُصْهُ، ثُمَّ لِتَنْضَحْهُ بِمَاءٍ، ثُمَّ لِتُصَلِّي فِيهِ**). [خ٣٠٧ (٢٢٧)/ م٢٩١]

(ق) لە ئەسمای کچی ئەبی بەکرەوە، وتی: ئافرەتێك پرسیاری لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد، و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر یەکێك لە ئێمە خوێنی حەیز لکا بە پۆشاکەکەیەوە، چی بکات؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر پۆشاکی یەکێك لە ئێوە لە حەیزەوە خوێنی بەرکەوت با بیپروێنێ**[1] **، پاشان ئاوی لێ بپرژێنێ و پاشان تیایدا نوێژ بکات)**.

**٩١١**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ خَوْلَةَ بِنْتَ يَسَارٍ أَتَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهُ لَيْسَ لِي إِلاَّ ثَوْبٌ وَاحِدٌ، وَأَنَا أَحِيضُ فِيهِ، فَكَيْفَ أَصْنَعُ؟ قَالَ: (**إِذَا طَهُرْتِ فَاغْسِلِيهِ، ثُمَّ صَلِّي فِيهِ**) فَقَالَتْ: فَإِنْ لَمْ يَخْرُجِ الدَّمُ؟ قَالَ: (**يَكْفِيكِ غَسْلُ الدَّمِ، وَلاَ يَضُرُّكِ أَثَرُهُ**). [د٣٦٥]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە: خەولەی کچی یەسار هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من تەنها یەك پۆشاکم هەیە، تیایدا تووشی حەیز دەبم، چی بکەم؟ فەرمووی: **(گەر پاکبوویەوە بیشۆرە و پاشان نوێژی تێدا بکە)**، وتی: ئەی گەر خوێنەکە دەرنەچێت؟ فەرمووی: **(ئەوەندە بەسە بۆ تۆ خوێنەکە بشۆری، ئەسەرەکەی زیانت پێ ناگەیەنێت)**.

---

[1] گەر خوێنەکە وشك بووبوویەوە–و.

## ٥- دەروازەی: پاکێتی جەستەی حەیزدار

**٩١٢-** (ق) عَنْ عُرْوَةَ أَنَّهُ سُئِلَ: أَتَخْدُمُنِي الْحَائِضُ، أَوَ تَدْنُو مِنِّي الْمَرْأَةُ وَهْيَ جُنُبٌ؟ فَقَالَ عُـرْوَةُ: كُلُّ ذلِكَ عَلَيَّ هَيِّنٌ، وَكُلُّ ذَلِكَ تَخْدُمُنِي، وَلَيْسَ عَلَى أَحَدٍ فِي ذَلِكَ بِأْسٌ، أَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ: أَنَّهَا كَانَتْ تُرَجِّلُ . تَعْنِي: رَأْسَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم . وَهِيَ حَائِضٌ، وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حِينَئِذٍ مُجَاوِرٌ فِي الْمَسْجِدِ، يُدْنِي لَهَا رَأْسَهُ، وَهِيَ فِي حُجْرَتِهَا، فَتُرَجِّلُهُ وَهْيَ حَائِضٌ. [خ٢٩٦/ م٢٩٧]

**(ق) لە عوروەوە، ئەو پرسیاری لێکرا: ئایا ئافرەتی حەیزدار خزمەتم بکات، یان ئایا ئافرەت کە لەشی گران بێت لێم نزیك ببێتەوە؟ عوروە وتی: هەموو ئەوانە لەسەرم ئاسانن، و هەموو ئەوانە خزمەتم دەکەن، لەوەدا لەسەر هیچ کەس خراپییەك بوونی نییە، عائیشە هەواڵی پێدام: ئەو سەری دادەهێنا -واتە سەری پێغەمبەری خودای دادەهێنا- و ئەو لە حەیزدا بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەو کاتەدا لە مزگەوت لە ئیعتیکافدا بوو، سەری بۆ عائیشە نەوی دەکرد و ئەو لە ژوورەکەی خۆیدا بوو، بۆی دادەهێنا و ئەو لە حەیزدا بوو.**

**٩١٣-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَتَّكِئُ فِي حَجْرِي وَأَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ. [خ٢٩٧/ م٣٠١]

**(ق) لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە باوەشم شانی دادەدا و من لە حەیزدا بووم، پاشان قورئانی دەخوێند.**

**٩١٤-** (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَشْرَبُ وَأَنَا حَائِضٌ. ثُمَّ أُنَاوِلُهُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم. فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ. فَيَشْرَبُ، وَأَتَعَرَّقُ الْعَرْقَ وَأَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ أُنَاوِلُهُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ. [م٣٠٠]

**(م) لە عائیشەوە، وتی: دەمخواردەوە و من لە حەیزدا بووم، پاشان دەمدا بە پێغەمبەر(ﷺ) و دەمی دەخستە سەر شوێنی دەمی من و دەیخواردەوە، ئێسقانم دەکڕاندەوە و من لە حەیزدا بووم، پاشان دەمدا بە پێغەمبەر(ﷺ) و دەمی دەخستە سەر شوێنی دەمی من.**

**٩١٥-** (م) عَنْ مَيْمُونَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَضْطَجِعُ مَعِي وَأَنَا حَائِضٌ، وَبَيْنِي وَبَيْنَهُ ثَوْبٌ. [م٢٩٥]

**(م) لە مەیموونەوە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵم رادەکشا و من حەیزدار بووم، لە نێوان من و ئەو پۆشاکێك هەبوو.**

**٩١٦-** عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: مَا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ مِنَ امْرَأَتِهِ إِذَا كَانَتْ حَائِضاً؟ قَالَتْ: كُلُّ شَيْءٍ غَيْرُ الْجِمَاعِ، قَالَ: قُلْتُ: فَمَا يَحْرُمُ عَلَيْهِ مِنْهَا، إِذَا كَانَا مُحْرِمَيْنِ؟ قَالَتْ: كُلُّ شَيْءٍ غَيْرُ كَلاَمِهَا. [مي١٠٧٩]

* إسناده صحيح.

**لە مەسروقەوە، وتی: وتم بە عائیشە: چی بۆ پیاو حەڵاڵە لە ژنەکەی خۆی گەر حەیزدار بێت؟ وتی: هەموو شت جگە لە جووتبوون، وتی: وتم: ئەی چی لەسەر پیاوەکە لە ژنەکەیدا حەرامە، گەر هەردووکیان لە ئیحرامدا بن؟ وتی: هەموو شت جگە لە قسەکردنی ژنەکە.**

## ٦- دەروازەی: ماوەی حەیز

**٩١٧-** عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: تُمْسِكُ الْمَرْأَةُ عَنِ الصَّلاَةِ فِي حَيْضِهَا سَبْعاً، فَإِنْ طَهُرَتْ فَذَاكَ؛ وَإِلاَّ أَمْسَكَتْ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْعَشْرِ، فَإِنْ طَهُرَتْ فَذَاكَ، وَإِلاَّ اغْتَسَلَتْ وَصَلَّتْ، وَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ. [مي٨٥٩]

* إسناده صحيح.

**لە حەسەنەوە، وتی: ئافرەت حەوت رۆژ خۆی لە نوێژ دەگرێتەوە، گەر پاکبوویەوە باشە، ئەگینا لە نێوان حەوتەوە بۆ دە خۆی لە نوێژ دەگرێتەوە، گەر پاکبوویەوە باشە، ئەگەر نە، خۆی دەشۆرێ و نوێژ دەکات، چونکە ئەو شێوە حەیزی هەیە(مستحاضة).**

**٩١٨**– عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: أَقْصَى الْحَيْضِ خَمْسَ عَشْرَةَ. [مي ٨٦١]

* حسن.

**لە عەتاوە وتی: دوورترین حەیز پازدەیە[١].**

**٩١٩**– عَنْ مَالِك، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ أَبِي عَلْقَمَةَ، عَنْ أُمِّهِ . مَوْلاَةِ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ . أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ النِّسَاءُ يَبْعَثْنَ إِلَى عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ بِالدِّرَجَةِ فِيهَا الْكُرْسُفُ، فِيهِ الصُّفْرَةُ مِنْ دَمِ الْحَيْضَةِ، يَسْأَلْنَهَا عَنِ الصَّلاَةِ؟ فَتَقُولُ لَهُنَّ: لاَ تَعْجَلْنَ حَتَّى تَرَيْنَ الْقَصَّةَ الْبَيْضَاءَ، تُرِيدُ بِذَلِكَ الطُّهْرَ مِنَ الْحَيْضَةِ. [خ. الحيض، باب ١٩/ ط١٣٠]

**لە مالیکەوە، لە عەلقەمەی کوڕی ئەبی عەلقەمەوە، لە دایکییەوە–مەولاتی عائیشە، دایکی باوەڕداران– وتی: ئافرەتان پارچە قوماشێکی پێچراوەیان دەنارد بۆ لای دایکی باوەڕداران عائیشە، لۆکەی تێدا بوو، بە لۆکەکەوە ڕەنگی زەرد لە خوێنی حەیزی پێوە بوو، پرسیاریان دەکرد دەربارەی نوێژ؟ ئەویش پێی دەوتن: پەلە مەکەن تا شێوە گەچی سپی دەبینن، مەبەستی بەوە پاکبوونەوە بوو لە حەیز.**

**٩٢٠**– عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ قَالَ: الْكُدْرَةُ وَالصُّفْرَةُ فِي أَيَّامِ الْحَيْضِ حَيْضٌ. وَكُلُّ شَيْءٍ رَأَتْهُ بَعْدَ أَيَّامِ الْحَيْضِ مِنْ دَمٍ، أَوْ كُدْرَةٍ، أَوْ صُفْرَةٍ؛ فَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ. [مي٨٨٧]

* إسناده صحيح.

**لە سوفیانی سەورییەوە، وتی: لێڵی و زەردی لە ڕۆژەکانی حەیزدا حەیزە، هەر شتێکی بینی لە دوای ڕۆژەکانی حەیز لە خوێن، یان لێڵی، یان زەردی، ئەو لە شێوە حەیزدایە(مستحاضة).**

---

[١] واتە: پازدە ڕۆژە–و.

## ٧- دەروازەی: کەمترین پاکی

**٩٢١**- عَنْ سُفْيَان قَالَ: الطُّهْرُ خَمْسَ عَشْرَةَ. [مي ٨٨١]

* إسناده صحيح.

**لە سوفیانەوە، وتی: پاکی پازدەیە[1].**

**٩٢٢**- عَنْ عَامِرٍ الشَّعْبِيِّ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى عَلِيٍّ تُخَاصِمُ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا، فَقَالَتْ: قَدْ حِضْتُ فِي شَهْرٍ ثَلاَثَ حِيَضٍ؟ فَقَالَ عَلِيٌّ لِشُرَيْحٍ: اقْضِ بَيْنَهُمَا، قَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ وَأَنْتَ هَاهُنَا؟ قَالَ: اقْضِ بَيْنَهُمَا، قَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ وَأَنْتَ هَاهُنَا؟ قَالَ: اقْضِ بَيْنَهُمَا، فَقَالَ: إِنْ جَاءَتْ مِنْ بِطَانَةِ أَهْلِهَا مِمَّنْ يُرْضَى دِينُهُ وَأَمَانَتُهُ تَزْعُمُ أَنَّهَا حَاضَتْ ثَلاَثَ حِيَضٍ، تَطْهُرُ عِنْدَ كُلِّ قُرْءٍ وَتُصَلِّي جَازَ لَهَا؛ وَإِلاَّ فَلاَ، فَقَالَ عَلِيٌّ: قَالُونُ وَقَالُونُ، بِلِسَانِ الرُّومِ: أَحْسَنْتَ. [مي٨٨٣]

* إسناده صحيح.

**لە عامیری شەعبییەوە، وتی: ئافرەتێك هات بۆ لای عەلی ناکۆکی هەبوو لەگەڵ مێردەکەی تەڵاقی دابوو، ئافرەتەکە وتی: لە مانگێکدا سێ حەیزم بەسەردا هاتووە؟ عەلی بە شورەیحی وت: لە نێوانیان قەزاوەت بکە، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، تۆش لێرە بیت؟ وتی: قەزاوەت بکە لە نێوانیان، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران تۆش لێرە بیت؟ وتی: قەزاوەت بکە لە نێوانیان، شورەیح وتی: گەر لای کەسوکارییەوە -لەوانەی دین و ئەمانەتیان جێگەی ڕەزامەندییە- هاتووە و بانگەشەی ئەوە دەکات سێ حەیزی پیادا هاتووە و لەگەڵ هەر حەیزێکدا پاکبووەتەوە و نوێژی کردووە دروستە بۆی، ئەگینا نەخێر، عەلی بە زمانی ڕۆمی وتی: قالون، قالون: چاکت کرد.**

---

[1] واتە: کەمترین پاکی پازدە ڕۆژە، چونکە زۆرترین حەیز پازدە ڕۆژە-و.

## ٨- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی کاتی زەیسانی هاتووە

**٩٢٣-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كَانَتِ النُّفَسَاءُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تَقْعُدُ بَعْدَ نِفَاسِهَا أَرْبَعِينَ يَوْماً، أَوْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، وَكُنَّا نَطْلِي عَلَى وُجُوهِنَا الْوَرْسَ. تَعْنِي: مِنَ الْكَلَفِ.
[د٣١١/ ت١٣٩/ جه٦٤٨/ مي٩٩٥]

* حسن صحيح.

**لە ئوم سەلەمەوە وتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئافرەتی زەیسان لەدوای زەیسانییەکەی چل ڕۆژ، یان چل شەو دادەنیشت، ڕوخسارمان بە وەرەس[١] سواغ دەدا. واتە: بەهۆی "الكَلَف[٢]"ەوە.**

**٩٢٤-** عَنِ الْحَسَنِ: إِذَا رَأَتِ الدَّمَ عِنْدَ الطَّلْقِ يَوْماً أَوْ يَوْمَيْنِ، فَهُوَ مِنَ النِّفَاسِ. [مي١٠٠١]

* إسناده صحيح.

**لە حەسەنەوە: گەر لە ژانی منداڵبوون ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ خوێنی بینی ئەوە لە زەیسانییە[٣].**

**٩٢٥-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ عَنِ النبي صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا مَضَى لِلنُّفَسَاءِ سَبْعٌ ثُمَّ رَأَتِ الطُّهْرَ فَلْتَغْتَسِلْ وَلْتُصَلِّي). [هق٣٤٢/١]

**لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (گەر حەوت[٤] بەسەر زەیساندا تێپەڕی و پاشان پاکبوونەوەی بینی با خۆی بشۆرێ و نوێژ بکات).**

---

[١] وەرەس: ڕووەکێکی زەردە، بۆیاخی پێ دەکرێت، لێیەوە بۆ جوانکردنی ڕەنگ ڕوخساری پێ سوور دەکرێت.

[٢] الكلف: ڕەنگێکی سووری مەیلە و ڕەش و لێڵە بەهۆی منداڵبوونەوە دەدات لە ڕوخساری ئافرەتان، لە کوردەواریدا پێی دەوترا (ماڵە)، بۆیە ڕوخساری خۆیان بە ڕووەکی وەرەس سواغداوە تا ڕەنگی ماڵەکە نەهێڵن-و.

[٣] واتە: ئەو یەك دوو ڕۆژەی ژان تیایدا خوێن دەبینرێت لە چل ڕۆژەکەی زەیسانی حساب دەکرێت-و.

[٤] حەوت ڕۆژ یان حەوت شەو-و.

## ٩- دەروازەی: چوونە لای حەیزدار و کەفارەتەکەی

**٩٢٦–** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: فِي الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ؟ قَالَ: (يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ، أَوْ نِصْفِ دِينَارٍ). [د٢٦٤/ ن٢٨٨/ جه٦٤٠/ مي١١٤٦]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): دەربارەی ئەو کەسەی دەچێتە لای ژنەکەی و ئەو لە حەیزدایە؟ فەرمووی: (دینارێك، یان نیو دینار دەکات بە صەدەقە).**

**٩٢٧–** عَنْ مُجَاهِدٍ: فِي الْحَائِضِ إِذَا طَهُرَتْ مِنَ الدَّمِ؟ لاَ يَقْرَبُهَا زَوْجُهَا حَتَّى تَغْتَسِلَ. [مي١١١٧]

* إسناده صحيح.

**لە موجاهیدەوە: دەربارەی حەیزدار گەر لە خوێن پاکبوویەوە؟ مێردەکەی لێی نزیك نابێتەوە تا ژنەکە خۆی دەشۆرێت.**

**٩٢٨–** عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ سُئِلاَ عَنِ الْحَائِضِ: هَلْ يُصِيبُهَا زَوْجُهَا إِذَا رَأَتِ الطُّهْرَ قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ؟ فَقَالاَ: لاَ، حَتَّى تَغْتَسِلَ. [ط ١٢٩]

**لە مالیکەوە پێی گەیشتووە: سالمی کوڕی عەبدوڵا و سولەیمانی کوڕی یەسار پرسیاریان لێکرا دەربارەی حەیزدار: ئایا مێردەکەی دەچێتە لای گەر پاکی بینی بەرلەوەی خۆی بشۆرێت؟ وتیان: نەخێر، تا خۆی دەشۆرێت.**

# بەشی سێیەم

# دەستنوێژ

## ١- دەروازەی: فەزڵی دەستنوێژ

**٩٢٩-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا تَوَضَّأَ العَبْدُ المُسْلِمُ ـ أَوِ المُؤْمِنُ ـ فَغَسَلَ وَجْهَهُ، خَرَجَ مِنْ وَجْهِهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيْهَا بِعَيْنَيْهِ مَعَ المَاءِ ـ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ المَاءِ ـ. فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ، خَرَجَ مِنْ يَدَيْهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ كَانَ بَطَشَتْهَا يَدَاهُ مَعَ المَاءِ ـ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ المَاءِ ـ. فَإِذَا غَسَلَ رِجْلَيْهِ، خَرَجَتْ كُلُّ خَطِيئَةٍ مَشَتْهَا رِجْلاَهُ مَعَ المَاءِ ـ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ المَاءِ ـ حَتَّى يَخْرُجَ نَقِيّاً مِنَ الذُّنُوبِ)**. [م٢٤٤]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بەندەی موسڵمان-یان باوەڕدار- دەستنوێژی گرت، و ڕوخساری شۆری، لەگەڵ ئاوەکە-یان لەگەڵ دوایین دڵۆپی ئاوەکە- هەموو گوناهێك بە دوو چاوی تەماشای ئافرەتی کردبێت دەڕوات، گەر دوو دەستی شۆری، لەگەڵ ئاوەکە-یان لەگەڵ دوایین دڵۆپی ئاوەکە- هەرچی گوناهێك دوو دەستی وەشاندبێتی لە دوو دەستی دەڕوات، گەر دوو لاقی شۆری، لەگەڵ ئاوەکە-یان لەگەڵ دوایین دڵۆپی ئاوەکە- هەرچی گوناهێك دوو لاقی پێی ڕۆیشتبێت دەڕوات، تا دێتە دەرەوە پاك لە گوناهان)**.

**٩٣٠-** (م) عَنْ عثمانَ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عِنْدَ انْصِرَافِنَا مِنْ صَلاَتِنَا هَذِهِ ـ قَالَ مِسْعَرٌ: أُرَاهَا العَصْرَ ـ فَقَالَ: **(مَا أَدْرِي، أُحَدِّثُكُمْ بِشَيْءٍ أَوْ أَسْكُتُ)**؟ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنْ كَانَ خَيْراً فَحَدِّثْنَا، وَإِنْ كَانَ غَيْرَ ذَلِكَ فَاللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: **(مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَطَهَّرُ، فَيُتِمُّ الطُّهُورَ الَّذِي كَتَبَ اللهُ عَلَيْهِ، فَيُصَلِّي هَذِهِ الصَّلَوَاتِ الخَمْسَ؛ إِلاَّ كَانَتْ كَفَّارَاتٍ لِمَا بَيْنَهَا)**. [م٢٣١]

(م) لە عوسمانەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: کاتێك لەم نوێژەمان-میسعەر دەڵێت: پێموایە نوێژی عەصرە- چووینە دەرەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) قسەی بۆ

كردین و فەرمووی: **(نازانم شتێكتان بۆ باس بكەم، یان بێدەنگ بم؟)**، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر خێرە بۆمان باس بكە، گەر شتێكی ترە خودا و پێغەمبەرەكەی زاناترن، فەرمووی: **(هەر موسڵمانێك خۆی پاكبكاتەوە و ئەو پاكبوونەوەی خودا لەسەری نووسیوە تێر و تەواو بێت و ئەم پێنج نوێژە بكات دەبنە كەفارەتی ئەوەی لە نێوانیاندایە**[1]**)**.

## ٢- دەروازەی: بەبێ پاكبوونەوە نوێژ قبووڵ ناكرێت

**٩٣١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تُقْبَلُ صَلاَةُ مَنْ أَحْدَثَ، حَتَّى يَتَوَضَّأَ)**. [خ١٣٥/ م٢٢٥]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(كەسێك تووشی "الحدث-بێدەستنوێژی" بێت نوێژەكەی قبووڵ ناكرێت تا دەستنوێژ دەگرێتەوە)**.

- زاد في البخاري: قَالَ رَجُلٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ: مَا الحَدَثُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: فُسَاءٌ أَوْ ضُرَاطٌ.

لە ریوایەتەكەی بوخاریدا ئەمەی زیاد كردووە: پیاوێك لە حەزرەمەوت وتی: "الحدث" چییە، ئەی ئەبا هورەیرە؟ وتی: تس و تڕ.

**٩٣٢-** (خ) عَنْ عَمْرِو بْنِ عامِرٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، قُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ؟ قَالَ: يُجْزِئُ أَحَدَنَا الوُضُوءُ مَا لَمْ يُحْدِثْ. [خ٢١٤]

(خ) لە عەمری كوڕی عامیرەوە، لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی دەگرت، وتم: ئێوە چیتان دەكرد؟ وتی: دەستنوێژ بەس بوو بۆ یەكێك لە ئێمە گەر تووشی بێدەستنوێژی نەبوایە[2].

---

[1] واتە: كەفارەتی ئەو گوناهانەی دەكەونە نێوان پێنج نوێژەكە-و.

[2] واتە: چەند نوێژێكی فەرز بە یەك دەستنوێژ ئەنجام دەدرێت گەر دەستنوێژەكەی نەشكێت یان تەنگاو نەبێت، تەماشای فەرموودەی ژمارە(٩٤٥) بكە-و.

## ٣- دەروازەی: دەستنوێژی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٩٣٣-** (ق) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ زيد: وسئل عَنْ وُضُوءِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَدَعَا بِتَوْرٍ مِنْ مَاءٍ فَتَوَضَّأَ لَهُمْ، فَكَفَأَ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا ثَلاَثاً، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاَثاً، بِثَلاَثِ غَرَفَاتٍ مِنْ مَاءٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثاً، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ إِلَى المِرْفَقَيْنِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، فَأَقْبَلَ بِيَدَيْهِ وَأَدْبَرَ بِهِمَا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ. [خ١٩٢/ م٢٣٥]

**(ق) لە عەبدوڵای كوڕی زەیدەوە: پرسیاری دەستنوێژی پێغەمبەری(ﷺ) لێكرا؟ داوای دەفرێ ئاوی كرد و دەستنوێژی بۆ گرتن، خواری كردەوە و سێ جار ئاوی كرد بە دوو دەستیدا، پاشان دەستی خستە ناو دەفرەكە و سێ جار روخساری خۆی شۆری، پاشان دەستی خستەوە ناو دەفرەكە و هەردوو دەستی-دوو جار دوو جار- تا ئەنیشك شۆری، پاشان دەستی خستەوە ناو دەفرەكە و مەسحی سەری پێ كرد، بە هەردوو دەست لە پێشەوە بۆ دواوەی برد، پاشان دەستی خستەوە ناو دەفرەكە و دوو قاچی خۆی شۆری.**

**٩٣٤-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: تَوَضَّأَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مَرَّةً مَرَّةً. [خ١٥٧]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) یەكجار یەكجار دەستنوێژی گرت[1].**

**٩٣٥-** (خ) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ زَيْدٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم تَوَضَّأَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ. [خ١٥٨]

**(خ) لە عەبدوڵای كوڕی زەیدەوە: پێغەمبەر(ﷺ) دوو جار دوو جار دەستنوێژی گرت.**

**٩٣٦-** (م) عَنْ سَفِينَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يُغَسِّلُهُ الصَّاعُ مِنَ الماءِ، مِنَ الجَنَابَةِ، وَيُوَضِّؤُهُ المدُّ. [م٣٢٦]

---

[1] واتە: یەك جار یەك جار ئەندامەكانی دەستنوێژی دەشۆری-و.

(م) لە سەفینەوە، وتی: لە خۆشۆرینی لەشگرانی (صاع)ێك ئاو پێغەمبەری دەشۆری، لە دەستنوێژیش (مُدّ)ێك ئاو بەشی دەکرد[1].

٩٣٧- عَنْ عَبْدِ الله بْنِ زَيْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (الأُذُنَانِ مِنَ الرَّأْسِ). [جه٤٤٣]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی زەیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دوو گوێ لە سەرە[2])**.

٩٣٨- عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ الله بْنَ عُمَرَ كَانَ يَأْخُذُ المَاءَ بِأُصْبُعَيْهِ لِأُذُنَيْهِ. [ط٦٩]

* إسناده صحيح.

لە نافیعەوە: ئیبن عومەر بە دوو پەنجەی ئاوی دەبرد بۆ دوو گوێی.

## ٤- دەروازەی: دەستنوێژی تێر و تەواو

٩٣٩- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ القِيَامَةِ غُرّاً مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الوُضُوءِ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ؛ فَلْيَفْعَلْ). [خ١٣٦/ م٢٤٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: من گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(لە ڕۆژی قیامەت بە ناوچاوانی سپی و پێی سپییەوە ئومەتەکەم بانگ دەکرێن، لە ئاساری دەستنوێژەوە، هەر کەس لە ئێوە توانی سپێتییەکەی درێژ بکاتەوە با ئەنجامی بدات)**.

---

[1] یەك (صاع) دوو لیتر و نیوە، یەك (مُدّ) نزیك بە ٦٤٤ ملیلترە، بۆ زانیاری یەك لیتر یەکسانە بە هەزار ملیلیتر-و.

[2] واتە دوو گوێ بەشێکن لە سەر، وەك چۆن سەر مەسح دەکرێت دوو گوێش مەسح دەکرێن-و.

**٩٤٠**- (م) عَنْ سَالِمٍ ـ مَوْلَى شَدَّادٍ ـ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ يَوْمَ تُوُفِّيَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، فَدَخَلَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ فَتَوَضَّأَ عِنْدَهَا، فَقَالَتْ: يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ! أَسْبِغِ الوُضُوءَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ**). [م٢٤٠]

**(م) لە سالمەوە(مەولای شەداد)، وتی: ئەو ڕۆژەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص وەفاتی کرد ڕۆیشتم بۆ لای عائیشە(هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ))، عبدالرحمانی کوڕی ئەبی بەکر هاتە ژوورەوە و لای ئەو دەستنوێژی گرت، عائیشە وتی: ئەی عبدالرحمن، دەستنوێژی تێر و تەواو هەڵبگرە، چونکە من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (ویل للأعقاب من النار-وەیل لە ئاگر بۆ کەسێك پاژنەکانی ناشۆرێت).**

**٩٤١**- (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ: أَنَّ رَجلاً تَوَضَّأَ، فَتَرَكَ مَوْضِعَ ظُفُرٍ عَلَى قَدَمِهِ، فَأَبْصَرَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**ارْجِعْ، فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ**)، فَرَجَعَ، ثُمَّ صَلَّى. [م٢٤٣]

**(م) لە عومەری کوڕی خەتابەوە: پیاوێك دەستنوێژی گرت، شوێنی نینۆکێك لە پێی خۆی وازلێهێنا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بگەڕێوە، و دەستنوێژەکەت بە باشی بگرە).**

**٩٤٢**- عَنْ لَقِيطِ بْنِ صَبِرَةَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله! أَخْبِرْنِي عَنِ الوُضُوءِ؟ قَالَ: (**أَسْبِغِ الوُضُوءَ، وَخَلِّلْ بَيْنَ الأَصَابِعِ، وَبَالِغْ فِي الاِسْتِنْشَاقِ؛ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ صَائِماً**).

[د١٤٢/ ت٣٨/ ن٨٧/ جه٤٠٧/ مي٧٣٢]

* صحيح.

**لە لەقیتی کوڕی صەبیرەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، هەواڵم پێ بدە دەربارەی دەستنوێژ؟ فەرمووی: (دەستنوێژی تێر و تەواو هەڵبگرە، ئاو بگەیەنە نێوان پەنجەکان، لە ئاو کردنە ناو لووت زیادەڕەوی بکە، مەگەر بەڕۆژوو بیت[1]).**

[1] واتە: گەر بەڕۆژوو بوویت زیادەڕەوی مەکە-و.

**٩٤٣**- عَنْ عَبْدِ الله بْنِ بُسْرٍ المازِنِيِّ، عَنْ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (**مَا مِنْ أُمَّتِي مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَأَنَا أَعْرِفُهُ يَوْمَ القِيَامَةِ**)، قَالُوا: وَكَيْفَ تَعْرِفُهُمْ يَا رَسُولَ الله فِي كَثْرَةِ الخَلاَئِقِ؟ قَالَ: (**أَرَأَيْتَ لَوْ دَخَلْتَ صَبْرَةً فِيهَا خَيْلٌ دُهْمٌ بُهْمٌ، وَفِيهَا فَرَسٌ أَغَرُّ مُحَجَّلٌ، أَمَا كُنْتَ تَعْرِفُهُ مِنْهَا**) ؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: (**فَإِنَّ أُمَّتِي يَوْمَئِذٍ غُرٌّ مِنَ السُّجُودِ، مُحَجَّلُونَ مِنَ الوُضُوءِ**). [حم١٧٦٩٣]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**له عەبدوڵای کوڕی یوسری مازنییەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: (لە ڕۆژی قیامەت یەك بە یەکی ئومەتەکەم دەناسمەوە)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن دەیانناسییەوە لەناو زۆری دروستکراوان؟ فەرمووی: **((ئایا گەر بچییە ناو ڕەوگێك لە ئەسپ ئەسپی سوور و ڕەش بن و ئەسپێکی ناوچاو مارۆی دەست و لاق سپی تێدا بێت، ئایا ئەو ئەسپە لە ناو ئەوان ناناسییەوە؟))**، وتی: با، فەرمووی: **(لەو ڕۆژەدا ئومەتەکەم لە سوژدەوە ناوچاوانیان سپییە و لە دەستنوێژەوە دەست و پێیان سپییە)**.

## ٥- دەروازەی: هەموو نوێژەکان بە یەك دەستنوێژ

**٩٤٤**- (م) عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ الحُصَيْبِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى الصَّلَوَاتِ يَوْمَ الفَتْحِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: لَقَدْ صَنَعْتَ اليَوْمَ شَيْئاً لَمْ تَكُنْ تَصْنَعُهُ؟ قَالَ: (**عَمْداً صَنَعْتُهُ يَا عُمَرُ**)!. [م٢٧٧]

**(م) لە بورەیدەی کوڕی حوصەیبەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی فەتح نوێژەکانی بە یەك دەستنوێژ ئەنجامدا، مەسحی لەسەر دوو خوفەکەی کرد، عومەر پێی وت: ئەمڕۆ شتێکت کرد پێشتر ئەنجامت نەدابوو؟ فەرمووی: (بە مەبەستەوە ئەنجامم دا، ئەی عومەر)**.

## ٦- دەروازەی: زیکر لەدوای دەستنوێژ

**٩٤٥**- (م) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: كَانَتْ عَلَيْنَا رِعَايَةُ الإِبِلِ، فَجَاءَتْ نَوْبَتِي، فَرَوَّحْتُهَا بِعَشِيٍّ، فَأَدْرَكْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَائِماً يُحَدِّثُ النَّاسَ، فَأَدْرَكْتُ مِنْ قَوْلِهِ: (**مَا مِنْ**

مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ، فَيُحْسِنُ وُضُوءَهُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، مُقْبِلٌ عَلَيْهِمَا بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ؛ إِلاَّ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ)، قالَ: فَقُلْتُ: مَا أَجْوَدَ هَذِهِ! فَإِذَا قَائِلٌ بَيْنَ يَدَيَّ يَقُولُ: الَّتِي قَبْلَهَا أَجْوَدُ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا عُمَرُ، قَالَ: إِنِّي قَدْ رَأَيْتُكَ جِئْتَ آنِفاً، قَالَ: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ، فَيُبْلِغُ . أَوْ فَيُسْبِغُ . الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُ الله وَرَسُولُهُ؛ إِلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ). [م٢٣٤]

(م) لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە، وتی: نۆرەی شوانی حوشترمان هەبوو، نۆرەکەی من هاتە بەرەوە، ئێواران دەمهێنانەوە، بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتم، بە پێوە قسەی بۆ خەڵکی دەکرد، بەم قسەی پیاگەیشتم: **(هەر موسڵمانێك دەستنوێژ بگرێت و دەستنوێژەکەی باش و چاك بێت، پاشان هەستێت و دوو رکات نوێژ بکات، بە دڵ و بە روو رووبکاتە دوو رکاتە نوێژەکە، بەهەشتی بۆ واجب دەبێت)**، وتی: وتم: چەند ئەمە[1] باش و چاکە، یەکێك لەوانەی لە بەردەمی بوون دەیوت: ئەوەی لە پێشییەوەیە باشتر و چاکترە، وردبوومەوە بینیم عومەرە، وتی: من تۆم بینی ئێستا هاتی، پێغەمبەر فەرمووی[2]: **(هەر کەس لە ئێوە دەستنوێژ بگرێت و دەستنوێژەکەی باش و چاك-یان تێر و تەواو- بێت، پاشان بڵێت: "أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمدا رسول الله" دەرگای هەشت بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لە کام دەرگاوە بخوازێت دەچێتە ژوورەوە).**

٩٤٦- عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ؛ فُتِحَتْ لَهُ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ). [ت٥٥/ جه٤٧٠]

* صحيح.

---

(1) واتە چەند ئەم سوودە یان ئەم مژدەیە یان ئەم عیبادەتە باش و چاکە-د.

(2) لەم جێگەوە عومەر فەرموودەکەی پێغەمبەر بۆ شوانەکە(عوقبەی کوڕی عامیر) دەگێڕێتەوە-و.

لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس دەستنوێژ بگرێت و دەستنوێژەکەی باش و چاك بێت، پاشان بڵێ: "أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، أللهم اجعلني من التوابين، واجعلني من المتطهرين" هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە لە کامیانەوە بخوازێت دەچێتە ژوورەوە).**

## ٧- دەروازەی: شۆرینی دوو دەست لە بەئاگاهاتن لە خەو

**٩٤٧-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ؛ فَلاَ يَغْمِسْ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلاَثاً، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ). [م٢٧٨]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە لە خەو هەستا با دەست نەخاتە ناو دەفرەوە تا سێ جار دەستی دەشۆرێت، چونکە ئەو نازانێت شەو دەستی لە کوێ بووە).**

## ٨- دەروازەی: لە شکەوە دەستنوێژ ناگرێتەوە

**٩٤٨-** (ق) عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ عَبْدِ الله بْنِ زَيْدٍ، أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم: الرَّجُلُ الَّذِي يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: (لاَ يَنْفَتِلْ . أَوْ: لا يَنْصَرِفْ . حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتاً، أَوْ يَجِدَ رِيحاً). [خ١٣٧/ م٣٦١]

(ق) لە عەبادی کوڕی تەمیمەوە، لە مامییەوە عەبدوڵای کوڕی زەید: ئەو سکاڵای بردە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ): پیاو کە خەیاڵی ئەوەی بۆ دروست دەبێ لە ناو نوێژەکەیدا شتێك دەبینێتەوە[1]؟ فەرمووی: **(تا دەنگ نەبیستێ یان بۆن نەکات خۆی لە نوێژەکەی ناکێشێتەوە یان پشتهەڵناکات).**

---

[1] واتە: خەیاڵی ئەوەی بۆ دروست دەبێت بە بایەك دەستنوێژەکەی شکابێت-و.

٩٤٩- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ فِي بَطْنِهِ شَيْئاً، فَأَشْكَلَ عَلَيْهِ، أَخَرَجَ مِنْهُ شَيْءٌ أَمْ لاَ؟ فَلاَ يَخْرُجَنَّ مِنَ المَسْجِدِ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتاً، أَوْ يَجِدَ رِيحاً). [م٣٦٢]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە لە سکی خۆیدا شتێکی هەست پێکرد و ئاڵۆزی و ناڕوونی بۆ دروست کرد، ئایا شتێکی لێ دەرچووە یان نە؟ با لە مزگەوت دەرنەچێت تا دەنگێك دەبیستێ، یان بۆنێك هەست دەکات).**

## ٩- دەروازەی: بە راست دەستپێکردن لە خۆ پاککردنەوە و شتانی تر

٩٥٠- (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِهِ، وَتَرَجُّلِهِ، وَطُهُورِهِ، وَفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ. [خ١٦٨/ م٢٦٨]

**(ق) لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دەستپێکردن بە راست جێگەی سەرنجی بوو لە: لەپێکردنی نەعل و قژ داهێنان و خۆپاککردنەوە، و هەموو کاروبارەکانی.**

٩٥١- عَنْ حَفْصَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَجْعَلُ يَمِينَهُ لِطَعَامِهِ وَشَرَابِهِ وَثِيَابِهِ، وَيَجْعَلُ شِمَالَهُ لِمَا سِوَى ذَلِكَ. [د٣٢]

* صحيح.

**لە حەفصەوە: پێغەمبەر(ﷺ) دەستی راستی تەرخان کرد بوو بۆ خواردن و خواردنەوە و پۆشاك، دەستی چەپی دابین کرد بوو بۆ شتانی تر جگە لەوە.**

## ١٠- دەروازەی: لە خواردن ئاوی لە دەم رادەدا و دەستنوێژی نەدەگرت

٩٥٢- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم شَرِبَ لَبَناً، فَمَضْمَضَ وَقَالَ: (إِنَّ لَهُ دَسَماً). [خ٢١١/ م٣٥٨]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) شیری خواردەوە[1]، ئاوی رادا لە دەمی و فەرمووی: (چەوری هەیە).**

**٩٥٣-** (ق) عَنْ مَيْمُونَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَكَلَ عِنْدَهَا كَتِفاً، ثُمَّ صَلَّى، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. [خ٢١٠/ م٣٥٦]

**(ق) لە مەیموونەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لە لای ئەو دەستێکی خوارد[2]، پاشان نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرتەوە[3].**

## ١١- دەروازەی: دەستنوێژگرتن لە گۆشتی حوشتر

**٩٥٤-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم: أَأَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الغَنَمِ؟ قَالَ: **(إِنْ شِئْتَ فَتَوَضَّأْ، وَإِنْ شِئْتَ فَلاَ تَوَضأْ)**. قَالَ: أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ؟ قَالَ: **(نَعَمْ، فَتَوَضَّأْ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ)**. قَالَ: أُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ؟ قَالَ: **(نَعَمْ)**. قَالَ: أُصَلِّي فِي مَبَارِكِ الإِبِلِ؟ قَالَ: **(لاَ)**. [م٣٦٠]

**(م) لە جابری کوڕی سەمورەوە: پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ): ئایا لە گۆشتی مەڕ[4] دەستنوێژ بگرم؟ فەرمووی: (گەر دەتەوێ دەستنوێژ بگرەوە، گەر دەخوازی دەستنوێژ مەگرەوە)، وتی: لە گۆشتی حوشتر[5] دەستنوێژ بگرم؟ فەرمووی:**

---

(١) یان ماستاو-و.

(٢) واتە: دەستی حەیوانێکی سەربڕاو بە برژاوی یان بە لێنراوی-و.

(٣) پێش خواردنەکە پێغەمبەر(ﷺ) دەستنوێژی هەبووە، واتە: بە خواردنی گۆشت دەستنوێژ ناشکێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لە دەستی حەیوانێکی خواردوە و بەدوایدا بەبێ گرتنەوەی دەستنوێژ نوێژی کردووە-و.

(٤) واتە: لە دوای خواردنی گۆشتی مەڕ-و.

(٥) واتە: لە دوای خواردنی گۆشتی حوشتر-و.

**(بەڵێ، لە گۆشتی حوشتر دەستنوێژ بگرە)**، وتی: لە مۆڵەڕانی مەڕدا[1] نوێژ بكەم؟ فەرمووی: **(بەڵێ)**، وتی: لە مۆڵگەی[2] حوشتردا نوێژ بكەم؟ فەرمووی: **(نەخێر)**.

## ١٢- دەروازەی: ئایا دەستنوێژ دەگرێت لەو خواردنانەی بە ئاگر لێنراون؟

**٩٥٥-** (خ) عَنْ سَعِيدِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله رضي الله عنهما: أَنَّهُ سَأَلَهُ عَنِ الوُضُوءِ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ؟ فَقَالَ: لاَ، قَدْ كُنَّا زَمَانَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم لاَ نَجِدُ مِثْلَ ذلِكَ مِنَ الطَّعَامِ إِلاَّ قَلِيلاً، فَإِذَا نَحْنُ وَجَدْنَاهُ لَمْ يَكُنْ لَنَا مَنَادِيلُ؛ إِلاَّ أَكُفَّنَا وَسَوَاعِدَنَا وَأَقْدَامَنَا، ثُمَّ نُصَلِّي، وَلاَ نَتَوَضَّأُ. [خ٥٤٥٧]

**(خ) لە سەعیدی كوڕی حاریسەوە، لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پرسیاری دەستنوێژی لێكرا لەو شتانەی بە ئاگر لێدەنرێن؟ وتی: نەخێر، لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر كەم لەو جۆرە خواردنانەمان هەبوو، گەر لەو جۆرە خواردنەمان هەبوایە دەستماڵمان نەبوو، تەنها دەست و قۆڵ و پێمان هەبوو[3]، پاشان نوێژمان دەكرد و دەستنوێژمان نەدەگرت.**

**٩٥٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ اللهِ قَالَ: كَانَ آخِرَ الأَمْرَيْنِ مِنْ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم: تَرْكُ الوُضُوءِ مِمَّا غَيَّرَت النَّارُ. [د١٩٢/ ن١٨٥]

* صحيح.

**لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە، وتی: دوایینی دوو ئەمرەكە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ): وازهێنان بوو لە دەستنوێژ لەو خواردنانەی ئاگر گۆڕیبوونی(بە ئاگر لێنرابوون).**

---

(1) مۆڵەڕان: ئەو شوێنەیە مەڕ و بزنی تێدا مۆڵ دەبن و بۆ پشوو و مانەوە دەوەستن-و.

(2) مۆڵگە: ئەو شوێنەی حوشتری تیا مۆڵ دەدرێت و دێن بە چۆكدا و پاڵدەكەون-و.

(3) واتە: لە خواردنی چەور و لێنراو و برژاو بە دەست و قۆڵ و پێ دەم و دەستی خۆمان دەسڕی و دەستماڵمان نەبوو-و.

## ١٣- دەروازەی: خەوی کەسی دانیشتوو دەستنوێژ ناشکێنێت

**٩٥٧-** (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، وَالنَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُنَاجِي رَجُلاً فِي جَانِبِ المسْجِدِ، فَمَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ حَتَّى نَامَ الْقَوْمُ. [خ٦٤٢/ م٣٧٦]

**(ق) لە ئەنەسەوە، وتی: قامەت بۆ نوێژ کرا، پێغەمبەر(ﷺ) ئاخافتنی دەکرد لەگەڵ پیاوێك لە تەنیشتی مزگەوتەکەوە، پێغەمبەر هەڵنەستا بۆ نوێژەکە تا خەڵکەکە خەوتن.**

**٩٥٨-** عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يَنَامُ جَالِساً، ثُمَّ يُصَلِّي وَلاَ يَتَوَضَّأُ. [ط٤٢]

* إسناده صحيح.

**لە نافیعەوە: ئیبن عومەر بە دانیشتنانەوە دەخەوت، پاشان نوێژی دەکرد و دەستنوێژی نەدەگرتەوە.**

## ١٤- دەروازەی: سیواك

**٩٥٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي - أَوْ عَلَى النَّاسِ - لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ صَلاَةٍ).** [خ٨٨٧/ م٢٥٢]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر لەسەر ئومەتەکەم-یان لەسەر خەڵك- گران نەبوایە فەرمانم پێ دەکردن بە سیواك لەگەڵ هەموو نوێژێك).**

**٩٦٠-** (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(أَكْثَرْتُ عَلَيْكُمْ فِي السِّوَاكِ).** [خ٨٨٨]

**(خ) لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دەربارەی سیواك زۆرم بۆ ئێوە باس کردووە).**

**٩٦١-** (م) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا دَخَلَ بَيْتَهُ، بَدَأَ بِالسِّوَاكِ. [م٢٥٣]

**(م) لە عائیشەوە: گەر پێغەمبەر(ﷺ) بهاتبایەتە ژوورەوە بۆ ماڵەکەی بە سیواك دەستی پێ دەکرد.**

## ١٥- دەروازەی: مەسح لەسەر مێزەرە و خوف

**٩٦٢-** (ق) عَنِ المُغِيْرَةِ بنِ شُعْبَةَ ﷺ قالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي سَفَرٍ، فَقَالَ: (**أَمَعَكَ مَاءٌ**) ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، فَنَزَلَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، فَمَشى حَتَّى تَوَارَى عَنِّي فِي سَوَادِ اللَّيْلِ، ثُمَّ جَاءَ، فَأَفْرَغْتُ عَلَيْهِ الإِدَاوَةَ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُخْرِجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْهَا، حَتَّى أَخْرَجَهُمَا مِنْ أَسْفَلِ الجُبَّةِ، فَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ أَهْوَيْتُ لأَنْزِعَ خُفَّيْهِ، فَقَالَ: (**دَعْهُمَا، فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ**)، فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا. [خ٥٧٩٩ (١٨٢)/ م٢٧٤]

**(ق) لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: شەوێك لە سەفەرێ لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووم، فەرمووی: (ئاوت پێیە؟)، وتم: بەڵێ، لە وڵاخی سوارییەکەی دابەزی، بەپێ ڕۆیشت تا لە تاریکی شەودا لێم بزر بوو، پاشان هاتەوە، جەوەندە ئاوەکەم بۆ خوار کردەوە، ڕوخسار و دوو دەستی شۆری، جبەیەکی خوری لەبەر بوو نەیتوانی دوو قۆڵی لێ دەربهێنێ تا لە ژێر جبەکەوە دوو دەستی دەرهێنا، هەردوو باڵی خۆی شۆری، پاشان مەسحی سەری خۆی کرد، پاشان چەمیمەوە بۆ ئەوەی دوو خوفەکەی لە پێ بکەمەوە، فەرمووی: (لێیانگەڕێ، من هەردووکیانم بە پاکی لەپێ کردووە)، بۆیە مەسحی سەرەوەی هەردووکیانی کرد.**

**٩٦٣-** (خ) عَنْ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ: أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَمْسَحُ عَلَى الخُفَّيْنِ. وَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَمْسَحُ عَلَى عِمَامَتِهِ. [خ٢٠٤ و٢٠٥]

**(خ) لە عەمری کوڕی ئومەیەی زەمرییەوە: ئەو پێغەمبەری خودای(ﷺ) بینی مەسحی سەر دوو خوفەکەی دەکرد، هەروەها وتی: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی مەسحی سەر مێزەرەکەی دەکرد.**

٩٦٤- (م) عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ قَالَ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ أَسْأَلُهَا عَنِ المسْحِ عَلَى الخُفَّيْنِ؟ فَقَالَتْ: عَلَيْكَ بِابْنِ أَبِي طَالِبٍ فَسَلْهُ، فَإِنَّهُ كَانَ يُسَافِرُ مَعَ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم، فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: جَعَلَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم ثَلاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلْمُسَافِرِ، وَيَوْماً وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ. [م٢٧٦]

**(م) لە شورەیحی کوڕی هانیئەوە، وتی: هاتم بۆ لای عائیشە، پرسیاری لێبکەم دەربارەی مەسح لەسەر دوو خوف؟ وتی: بچۆ بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالب پرسیاری لێ بکە، ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەفەری دەکرد، پرسیارمان لە ئەو کرد، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سێ ڕۆژ و سێ شەوی داناوە بۆ موسافیر و ڕۆژ و شەوێکیش بۆ موقیم.**

٩٦٥- عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ قَالَ: رَأَيْتُ جَرِيرَ بْنَ عَبْدِ الله تَوَضَّأَ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقُلْتُ لَهُ فِي ذَلِكَ؟ فَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم تَوَضَّأَ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقُلْتُ لَهُ: أَقَبْلَ المائِدَةِ أَمْ بَعْدَ المائِدَةِ؟ قَالَ: مَا أَسْلَمْتُ إِلاَّ بَعْدَ المائِدَةِ. [ت٩٤]

* صحيح.

**لە شەهری کوڕی حەوشەبەوە، وتی: جەریری کوڕی عەبدوڵام بینی دەستنوێژی گرت و مەسحی لەسەر دوو خوفەکەی کرد، لەو بارەیەوە پرسیارم لێکرد؟ وتی: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی دەستنوێژی گرت و مەسحی دوو خوفەکەی کرد، پێم وت: ئایا پێش سورەتی "المائدة" یان دوای سورەتی "المائدة"؟[1] وتی: من لەدوای سورەتی "المائدة" موسڵمان بووم.**

---

[1] **لە دوای سورەتی (المائدة): واتە لە دوای دابەزینی سورەتی (المائدة) کە ئایەتی دەستنوێژی تێدایە، ئەوەش بریتییە لە ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ﴾ [المائدة: ٦]، مەسح کردن لە دوای ئەم ئایەتەی سورەتی (المائدة) ڕەوایەتی مەسحەکە و نەسخ نەبوونەوەی نیشان دەدات(صالح)-د.**

## ١٦- دەروازەی: مەسح لەسەر بەستەر(پێچەر)ی برین و بڕین

**٩٦٦**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: إِذَا لَمْ يَكُنْ عَلَى الْجُرْحِ عِصَابُ، غَسَلَ مَا حَوْلَهُ وَلَمْ يَغْسِلْهُ.

**لە ئیبن عومەرەوە: گەر لەسەر برین بەستەر(پێچەر) نەبوو، دەورووبەری برینەکە دەشۆریٚ و برینەکە ناشۆریٚ.**

- وفي رواية: مَنْ كَانَ لَهُ جُرْحٌ مَعْصُوبٌ عَلَيْهِ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى الْعِصَابِ، وَيَغْسِلُ مَا حَوْلَ الْعِصَابِ.

**لە ریوایەتێکدا: هەر کەس برینێکی پێچراوی هەبوو دەستنوێژ بگرێت و مەسحی پێچرەکە(بەستەرەکە) بکات، و دەورووبەری پێچەرەکە بشوات.**

- وفي رواية: أَنَّ إِبْهَامَ رِجْلِهِ جُرِحَتْ فَأَلْبَسَهَا مَرَارَةً وَكَانَ يَتَوَضَّأُ عَلَيْهَا.

**لە ریوایەتێکدا: پەنجە گەورەی پێی ئیبن عومەر بریندار بوو کیسی زراوی مەڕی بەسەردا پۆشی، ئەو دەستنوێژی بەسەر کیسی زراوەکەدا دەگرت.**

- وفي رواية: أَنَّهُ تَوَضَّأَ وَكَفُّهُ مَعْصُوبَةٌ فَمَسَحَ عَلَيْهَا وَعَلَى الْعِصَابِ، وَغَسَلَ سِوَى ذَلِكَ.

[هق/١/٢٢٨]

**لە ریوایەتێکدا: ئەو دەستنوێژی دەگرت و دەستی پێچرا بوو، مەسحی لەسەر دەستەکە و لەسەر پێچەرەکە دەکرد و جگە لەوە ئەوانی تری دەشۆری.**

## ١٧- دەروازەی: دەستنوێژ و غوسڵ بەو ماوەی لە خۆ پاککردنەوەی ئافرەت دەمێنێتەوە

**٩٦٧**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: اغْتَسَلَ بَعْضُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي جَفْنَةٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لِيَتَوَضَّأَ مِنْهَا . أَوْ يَغْتَسِلَ . فَقَالَتْ لَهُ: يَا رَسُولَ الله! إِنِّي كُنْتُ جُنُباً، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ الْمَاءَ لاَ يُجْنِبُ**).

* صحيح. [د٦٨/ ت٦٥/ ن٣٢٤/ جه٣٧٠/ مي٧٦١]

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: یەکێ لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بە ناوی تەشتێك خۆی شۆری، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆئەوەی دەستنوێژی لێ بگرێت -یان خۆی لێ بشۆرێت- هاوسەرەکەی پێی وت: ئەی پێغەمبەری خودا، من لەشگران بووم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئاوەکە لەشگران نابێت).**

## ١٨- دەروازەی: ئایا لە دەستدان لە زەکەر دەستنوێژ دەگرێتەوە

**٩٦٨-** عَنْ بُسْرَةَ بِنْتِ صَفْوَانَ: أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ؛ فَلْيَتَوَضَّأْ**). [د١٨١/ ت٨٢/ ن١٦٣/ جه٤٧٩/ مي٧٥١]

* صحيح.

**لە بوسرەی کچی صەفوانەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەر کەس دەست لە زەکەری خۆی بدات با دەستنوێژ بگرێتەوە).**

**٩٦٩-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَنْ مَسَّ فَرْجَهُ، فَلْيَتَوَضَّأْ**). [جه٤٨٢]

* صحيح.

**لە ئەبی ئەیوبەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەر کەس دەست لە (فرج[1])ی خۆی بدات با دەستنوێژ بگرێتەوە).**

**٩٧٠-** عَنْ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ الحَنَفِيِّ قَالَ: قَدِمْنَا عَلَى نَبِيِّ الله صلّى الله عليه وسلّم، فَجَاءَ رَجُلٌ كَأَنَّهُ بَدَوِيٌّ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ الله! مَا تَرَى فِي مَسِّ الرَّجُلِ ذَكَرَهُ بَعْدَ مَا يَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ: (**هَلْ هُوَ إِلاَّ مُضْغَةٌ مِنْهُ**) ؟ أَوْ (**بَضْعَةٌ مِنْهُ**). [د١٨٢/ ت٨٥/ ن١٦٥/ جه٤٨٣]

* صحيح.

**لە تەلقی کوڕی عەلی حەنەفییەوە، وتی: هاتین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پیاوێك هات وەك ئەوەی دەشتەکی بێت، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، چی دەبینی لە**

---

[1] **الفرج: بریتییە لە ئەندامی نێرینەی پیاو، یان ئەندامی مێینەی ئافرەت-و.**

دەستدانی پیاوێك لـە زەکـەری خـۆی دوای دەسـتنوێژگرتن؟ فـەرمووی: **(ئایـا ئـەوە چیترە جگە لە پارچەیەك لە ئەو؟**[1]**)**، یان: **(بەشێك لە ئەو)**.

## ١٩- دەروازەی: دەستنوێژ لە خەوتنەوە

**٩٧١-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(وِكَاءُ السَّهِ العَيْنَانِ، فَمَنْ نَامَ فَلْيَتَوَضَّأْ)**. [د٢٠٣/ جه٤٧٧]

* حسن.

**لە عەلی کوڕی ئەبی تالبەوە(خوا لێـی رازی بێـت)، وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: (بەستەری دواوە**[2] **دوو چاوە، هەر کەس خەوت با دەستنوێژ بگرێتەوە).**

## ٢٠- دەروازەی: ئایا لە ماچکردنەوە دەستنوێژ دەگرێتەوە؟

**٩٧٢-** عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَبَّلَ بَعْضَ نِسَائِهِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. قَالَ: قُلْتُ: مَنْ هِيَ إِلاَّ أَنْتِ؟ فَضَحِكَتْ.

[د١٧٩/ ت٨٦/ ن١٧٠/ جه٥٠٢]

* صحيح.

**لە عورووەوە، لە عائیشەوە: پێغەمبەر(ﷺ) ماچـی یـەکێك لـە ژنـەکانی خـۆی کـرد پاشان ڕۆیشتە دەرەوە بۆ نوێژ و دەستنوێژی نەگرتەوە، عورووە وتـی: وتم: ئـەو ژنـە کێیترە جگە لە تۆ؟ عائیشە پێکەنی**[3].

---

[1] واتە: دەستنوێژی ناشکێت، چونکە زەکەری پارچەیەکە لە جەستەی-و.

[2] واتـە: چـاوەکانی بـڕوانن کەسـەکە ئاگـای لـە پاشـی خـۆی دەبێـت و دەسـتنوێژەکەی ناشکێت-و.

[3] عورووە خوشکەزای عائیشە بووە، بۆیە توانیویەتی ئەو قسە بکات-و.

**٩٧٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قُبْلَةُ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ وَجَسُّهَا بِيَدِهِ مِنَ المُلاَمَسَةِ، فَمَنْ قَبَّلَ امْرَأَتَهُ أَوْ جَسَّهَا بِيَدِهِ؛ فَعَلَيْهِ الوُضُوءُ. [ط٩٧]

* إسناده صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، ئەو دەیوت: ماچی ژن لە لایەن پیاوەکەیەوە و دەستلێدانی لە "الملامسة"یە[1]، هەر کەس ژنەکەی خۆی ماچ کرد یان بە دەست دەستی لێدا دەستنوێژی لەسەرە.**

## ٢١- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی لوتپژان و خوێن هاتووە

**٩٧٤-** عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا رَعَفَ انْصَرَفَ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ رَجَعَ، فَبَنَى وَلَمْ يَتَكَلَّمْ. [ط٧٩]

* إسناده صحيح.

**لە نافیعەوە: عەبدوڵای کوڕی عومەر گەر لوتی بپژایە نوێژی بەجێدەهێڵا و دەستنوێژی دەگرتەوە و پاشان دەگەڕایەوە دەستی پێ دەکردەوە و قسەی نەدەکرد.**

**٩٧٥-** عَنْ عُرْوَةَ: أَنَّ المِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ مِنَ اللَّيْلَةِ الَّتِي طُعِنَ فِيهَا، فَأَيْقَظَ عُمَرَ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ، فَقَالَ عُمَرُ: نَعَمْ، وَلاَ حَظَّ فِي الإِسْلاَمِ لِمَنْ تَرَكَ الصَّلاَةَ، فَصَلَّى عُمَرُ وَجُرْحُهُ يَثْعَبُ دَماً. [ط٨٤]

* إسناده صحيح.

**لە عوروەوە: میسوەری کوڕی مەحرەمە هەواڵی پێداوە: ئەو لەو شەوەی عومەری کوڕی خەتاب شمشێرەکەی لێدرا چووە بۆ لای، عومەری کوڕی خەتابی بۆ نوێژی بەیانی بەئاگا هێناوە، عومەر وتی: بەڵێ، کەسێك بەشی لە ئیسلامدا نییە واز لە نوێژ بهێنێت، عومەر نوێژەکەی کرد و برینەکەی خوێنی لێ دەڕۆیشت.**

---

[1] مەبەستی ئایەتی: ﴿أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاءَ﴾ [المائدة: ٦] -و.

# بەشی چوارەم

## خۆشۆرین(غوسڵ)

### ١- دەروازەی: موسڵمان پیس نابێت

**٩٧٦-** (م) عَنْ حُذَيْفَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَقِيَهُ وَهُوَ جُنُبٌ، فَحَادَ عَنْهُ، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ جاءَ فَقَالَ: كُنْتُ جُنُباً، قَالَ: (**إِنَّ الْمُسْلِمَ لاَ يَنْجُسُ**). [م٣٧٢]

**(م) لە حوزەیفەوە: پێغەمبەری خودای(ﷺ) پێگەیشت ئەو لەشگران بوو، بۆیە حوزەیفە خۆی لێلادا[1]، خۆی شۆری، و پاشان هات وەوتی: لەشم گران بوو، پێغەمبەر فەرمووی: (موسڵمان پیس نابێت).**

### ٢- دەروازەی: خەوتنی لەشگران

**٩٧٧-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ، وَهُوَ جُنُبٌ، غَسَلَ فَرْجَهُ، وَتَوَضَّأَ لِلصَّلاَةِ. [خ٢٨٨ (٢٨٦)/ م٣٠٥]

**(ق) لە عائیشەوە، وتی: گەر پێغەمبەر بیویستبا بخەوێت و لەشگران بوایە فەرجی خۆی دەشۆری و دەستنوێژی نوێژی دەگرت.**

**٩٧٨-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: اسْتَفْتَى عُمَرُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم: أَيَنَامُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ؟ قَالَ: (**نَعَمْ إِذَا تَوَضَّأَ**). [خ٢٨٩ (٢٨٧)/ م٣٠٦]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: عومەر پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد: ئایا یەکێك لە ئێمە دەخەوێت ئەو لەشگران بێت؟ فەرمووی: (بەڵێ، گەر دەستنوێژ بگرێت).**

---

**[1] واتە: حوزەیفە لەشی گران بوو، بۆیە خۆی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لادا بۆئەوەی تەوقەی لەگەڵ نەکات، چونکە پێیوابوو لەشی گران بێت واتە لەشی پیسە و نابێت دەستی بەر پێغەمبەر بکەوێت-و.**

**٩٧٩-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يَنَامُ وَهُوَ جُنُبٌ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَمَسَّ مَاءً. [د٢٢٨/ ت١١٨، ١١٩/ جه٥٨١. ٥٨٣]

* صحيح.

**لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەخەوت و ئەو لەشگران بوو بەبێ ئەوەی دەستی بەر ئاو بكەوێت.**

## ٣- گەر ویستی جووتبوون دووبارە بكاتەوە

**٩٨٠-** (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ، فَلْيَتَوَضَّأْ)**. [م٣٠٨]

**(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەكێك لە ئێوە چووە لای خێزانەكەی، پاشان ویستی بچێتەوە لای با دەستنوێژ بگرێت).**

## ٤- دەروازەی: گەر جێی دوو خەتەنەكە بەریەكتركەوتن

**٩٨١-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: أَنَّ الفُتْيَا الَّتِي كَانُوا يُفْتَوْنَ أن «المَاءَ مِنَ المَاءِ» كانت رُخْصَةً رخصها رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم فِي بدء الإِسْلاَمِ، ثُمَّ أَمَرَ بِالاِغْتِسَالِ بَعْدُ.
[د٢١٤/ ت١١٠/ جه٦٠٩/ مي٧٨٦]

**لە ئوبەی كوڕی كەعبەوە: ئەو فتوای دەیدەن: ((ئاو لە ئاوەوەیە))[1]، روخسەتێك بوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە سەرەتای ئیسلام ڕێگەی پێدا، پاشان دوای ئەوە فەرمانی كرد بە خۆشۆرین.**

---

[1] پوختەی ئەوەی فەرموودەكە دەیگەیەنێت: خۆشۆرین لە فەرموودەی ((ئاو لە ئاوەوەیە)) پەیوەستە بە دابەزینی مەنی لە زەكەر، پاشان ئەم فەرموودە هاتووە بۆ واجب كردنی خۆشۆرین لە بەریەككەوتنی ئەندامی نێرینە و مێینەی ژن و پیاو با مەنیش دانەبەزێت.

- وفِي رواية لأبي داود: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم إِنَّمَا جَعَلَ ذَلِكَ رُخْصَةً لِلنَّاسِ فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ لِقِلَّةِ الثِّيَابِ، ثُمَّ أَمَرَ بِالغُسْلِ، وَنَهَى عَنْ ذَلِكَ.

**لە ریوایەتێکی ئەبی داودا: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی لە سەرەتای ئیسلامەوە کرد بە روخسەت بۆ خەڵك لەبەر کەمی پۆشاك، پاشان فەرمانی کرد بە خۆشۆرین، و نەهی کرد لەوە.**

- ولفظ الترمذي: إِنَّمَا كَانَ «الماءُ مِنَ الماءِ» رُخْصةً فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ، ثُمَّ نُهِي عنها.

* صحيح.

**لەفزەکەی ترمزی: ((ئاو لە ئاوەوەیە)) روخسەتێك بوو لە سەرەتای ئیسلام پاشان نەهی لێکرا.**

**٩٨٢**– عَنْ عَبْدِ الله بن عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا التَقَى الخِتَانَانِ، وَتَوَارَتِ الحَشَفَةُ؛ فَقَدْ وَجَبَ الغُسْلُ)**. [جه٦١١]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر شوێنی دوو خەتەنەکە بەریەکتر کەوتن و سەری زەکەر بزر بوو غوسڵ واجب دەبێت).**

## ٥- دەروازەی: گەر ئافرەت ئیحتیلام بوو

**٩٨٣**– (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ إِلَى رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَتْ لَهُ، وَعَائِشَةُ عِنْدَهُ: يَا رَسُولَ الله، المرْأَةُ تَرَى مَا يَرَى الرَّجُلُ فِي المنَامِ، فَتَرَى مِنْ نَفْسِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ مِنْ نَفْسِهِ؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا أُمَّ سُلَيْمٍ؛ فَضَحْتِ النِّسَاءَ، تَرِبَتْ يَمِينُكِ، فَقَالَ لِعَائِشَةَ: **(بَلْ أَنْتِ، فَتَرِبَتْ يَمِينُكِ، نَعَمْ، فَلْتَغْتَسِلْ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ إِذَا رَأَتْ ذَاكَ)**. [م٣١٠]

**(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: ئوم سولەیم هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)–عائیشە لە لای بوو– پێی وت: ئەی پێغەمبەری خودا، ئافرەت ئەوە دەبینێت پیاو لە خەودا دەیبینێت، لە نەفسی خۆی ئەوە دەبینێت پیاو لە نەفسی**

**خۆی دەبیینێت؟ عائیشە وتی: ئەی ئوم سولەیم، ئافرەتانت شەرمەزار کرد، دەستی ڕاستت خۆڵاویی بێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە عائیشە: (دەستی ڕاستی خۆت خۆڵاویی بێت، بەڵێ، با خۆی بشۆرێ، ئەی ئوم سولەیم، گەر ئەوەی بینی).**

## ٦- دەروازەی: سیفەتی غوسڵ

٩٨٤- (ق) عَنْ عَائِشَةَ . زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم .: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الجَنَابَةِ، بَدَأَ فَغَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ يُدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي المَاءِ، فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعْرِهِ، ثُمَّ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثَلاَثَ غُرَفٍ بِيَدَيْهِ، ثُمَّ يُفِيضُ المَاءَ عَلَى جِلْدِهِ كُلِّهِ. [خ٢٤٨/ م٣١٦]

**(ق) لە عائیشەوە –هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)-: کە پێغەمبەر(ﷺ) لە لەشگرانی خۆی دەشۆری بە شۆرینی دوو دەستی دەستی پێ دەکرد، پاشان دەستنوێژی دەگرت وەك چۆن دەستنوێژ بۆ نوێژ هەڵدەگرێت، پاشان دوو دەستی دەخستە ئاوەکە و بێخی مووەکانی پێ تەڕ دەکرد، پاشان بە دوو دەستی سێ مشتی دەکرد بە سەریدا و پاشان ئاوی بەسەر هەموو پێستیدا دەکرد.**

٩٨٥- (ق) عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ الباقِرِ: أَنَّهُ كَانَ عِنْدَ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله، هُوَ وَأَبُوهُ، وَعِنْدَهُ قَوْمٌ، فَسَأَلُوهُ عَنِ الغُسْلِ؟ فَقَالَ: يَكْفِيكَ صَاعٌ، فَقَالَ رَجُلٌ: مَا يَكْفِينِي! فَقَالَ جَابِرٌ: كَانَ يَكْفِي مَنْ هُوَ أَوْفَى مِنْكَ شَعْراً وَخَيْرٌ مِنْكَ. ثُمَّ أَمَّنَا فِي ثَوْبٍ. [خ٢٥٢/ م٣٢٩]

**(ق) لە ئەبو جەعفەری باقرەوە: لای جابری کوڕی عەبدولڵا بوو، ئەو و باوکی، کۆمەڵێکی لە لابوو، پرسیاری غوسڵیان لێکرد؟ وتی: (صاع)ێکت بەسە[1]، پیاوێك وتی: بەشم ناکات، جابر وتی: بەشی کەسێکی دەکرد مووی لە تۆ زۆرتر بوو و لە تۆش باشتر و چاکتر بوو[2]، پاشان لە پۆشاکێکدا ئیمامەتی بۆ دەکردین.**

---

(١) "صاع"ێك: دوو لیتری نیوە –و.

(٢) مەبەستی پێغەمبەری خودایە –و.

**٩٨٦**– (ق) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كَانَتْ هِيَ وَرَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يَغْتَسِلاَنِ فِي الإِنَاءِ الوَاحِدِ مِنَ الجَنَابَةِ. [خ٣٢٢ (٢٩٨)/ م٢٩٦]

**(ق) لە ئوم سەلەمەوە وتی: ئەو و پێغەمبەری خودا لە دەفرێكدا –لە لەشگرانی– خۆیان دەشۆری.**

**٩٨٧**– (م) عَنْ مَيْمُونَةَ قَالَتْ: وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مَاءً وَسَتَرْتُهُ، فَاغْتَسَلَ. [م٣٣٧]

**(م) لە مەیموونەوە، وتی: ئاوم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دانا و داپۆشی[1] و خۆی شۆری.**

## ٧- دەروازەی: خۆشۆرین هەموو حەوت رۆژ جارێك

**٩٨٨**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، أَنْ يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ يَوْماً، يَغْسِلُ فِيهِ رَأْسَهُ وَجَسَدَهُ)**. [خ٨٩٧/ م٨٤٩]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (لەسەر هەموو موسڵمانێك پێویستە هەموو حەوت رۆژ جارێك خۆی بشوات، تیایدا سەر و جەستەی بشۆرێت.**

## ٨- دەروازەی: لە ئاوی وەستاودا خۆی ناشۆرێ

**٩٨٩**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَغْتَسِلْ أَحَدُكُمْ فِي المَاءِ الدَّائِمِ، وَهُوَ جُنُبٌ)** فَقَالَ: كَيْفَ يَفْعَلُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: يَتَنَاوَلُهُ تَنَاوُلاً. [م٢٨٣]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (یەكێك لە ئێوە لە ئاوی هەمیشەییدا[2] خۆی نەشۆرێت و ئەو لەشگران بێت)، وتی: ئەدی چی بكات، ئەی ئەبو هورەیرە؟ وتی: بە دەستبردن دەستی بۆ ببات[3].**

---

[1] واتە: لە چاوی خەڵك داپۆشی–و.

[2] واتە: ئاوی وەستاو كە ئاوی لەبەر نارِوات–و.

[3] واتە: لێی هەڵبگوزێت–و.

## ٩- حوکمی پەلکەی ئافرەتی خۆشۆر

**٩٩٠-** (م) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قالتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله، إِنِّي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي، فَأَنْقُضُهُ لِغُسْلِ الجَنَابَةِ؟ قَالَ: (**لاَ، إِنَّمَا يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِي عَلَى رَأْسِكِ ثَلاَثَ حَثَيَاتٍ، ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَيْكِ المَاءَ، فَتَطْهُرِينَ**). [م٣٣٠]

**(م) لە ئوم سەلەمەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، من ئافرەتێکم پەلکەی سەرم دەبەستم، بۆ خۆشۆرینی لەشگرانی بیکەمەوە؟ فەرمووی: (نەخێر، ئەوەندە بەسە سێ جار پڕ بە دوو مشت بکەی بەسەریدا، پاشان ئاو بکەی بە خۆتدا و پاکببییەوە).**

- وفي رواية: فَأَنْقُضُهُ لِلْحَيْضَةِ وَالجَنَابَةِ؟ فقال: (**لا**).

**لە ریوایەتێکدا: لە حەیز و لەشگرانی بیکەمەوە؟ فەرمووی: (نەخێر).**

## ١٠- دەروازەی: خەوتوو تەڕی ببینێت

**٩٩١-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الرَّجُلِ يَجِدُ البَلَلَ، وَلاَ يَذْكُرُ احْتِلاَماً؟ قَالَ: (**يَغْتَسِلُ**)، وَعَنِ الرَّجُلِ يَرَى أَنَّهُ قَدْ احْتَلَمَ، وَلاَ يَجِدُ البَلَلَ؟ قَالَ: (**لاَ غُسْلَ عَلَيْهِ**). [د٢٣٦/ ت١١٣/ جه٦١٢/ مي٧٩٢]

* حسن.

**لە عائیشەوە وتی: پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا دەربارەی پیاو تەڕی ببینێت و بیری ئیحتیلامەکەی نەبێت؟ فەرمووی: (خۆی دەشوات)، هەروەها پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاو کە ئیحتیلام بووە و تەڕی نابینێت؟ فەرمووی: (خۆشۆرینی لەسەر نییە).**

## ١١- دەروازەی: خۆشۆرینی بێباوەڕ کە موسڵمان دەبێت

**٩٩٢**- عَنْ قَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أُرِيدُ الإِسْلاَمَ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَغْتَسِلَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ. [د٣٥٥/ ت٦٠٥/ ن١٨٨]

* صحيح.

**لە قەیسی کوڕی عاصیمەوە، وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئیسلامم دەویست، فەرمانی پێکردم بە ئاو و سیدر خۆم بشۆرم.**

**٩٩٣**- عَنْ عُثَيْمِ بْنِ كُلَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ: أَنَّهُ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: قَدْ أَسْلَمْتُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَلْقِ عَنْكَ شَعْرَ الكُفْرِ**). يَقُولُ: احْلِقْ. قَالَ: وأَخْبَرَنِي آخَرُ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لِآخَرَ مَعَهُ: (**أَلْقِ عَنْكَ شَعْرَ الكُفْرِ وَاخْتَتِنْ**). [د٣٥٦]

**لە عوسەیمی کوڕی کولەیبەوە، لە باوکییەوە، لە باپیرییەوە: ئەو هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: من موسڵمان بووم، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (مووی بێباوەڕی لە خۆت بکەرەوە)**، دەیوت: سەرت بتاشە.

**وتی: یەکێکی تر هەواڵی پێدام: پێغەمبەر(ﷺ) بە یەکێکی تری فەرموو کە لەگەڵی بوو: (مووی بێباوەڕی لە خۆت بکەرەوە و خەتەنە بکە).**

## ١٢- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی چوونە ناو حەمام هاتووە

**٩٩٤**- عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَدْخُلِ الحَمَّامَ بِغَيْرِ إِزَارٍ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُدْخِلْ حَلِيلَتَهُ الحَمَّامَ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَجْلِسْ عَلَى مَائِدَةٍ يُدَارُ عَلَيْهَا الخَمْرُ**). [ت٢٨٠١/ ن٣٩٩]

* صحيح.

لە جابرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس ئیمانی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەیە با بەبێ ژێرپۆشاك نەچێتە حەمامەوە، هەر کەس ئیمانی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەیە با حەلاڵەکەی خۆی نەباتە حەمامەوە، هەر کەس ئیمانی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەیە لەسەر خوانێك دانەنیشێت عارەقی لەسەر دەگێڕن).**

**٩٩٥**– عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّهُ سَمِعَ أُمَّ الدَّرْدَاءِ تَقُولُ: خَرَجْتُ مِنَ الحَمَّامِ، فَلَقِيَنِي رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(مِنْ أَيْنَ يَا أُمَّ الدَّرْدَاءِ)** ؟ قَالَتْ: مِنَ الحَمَّامِ فَقَالَ: **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا مِنِ امْرَأَةٍ تَضَعُ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِ أَحَدٍ مِنْ أُمَّهَاتِهَا؛ إِلاَّ وَهِيَ هَاتِكَةٌ كُلَّ سِتْرٍ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الرَّحْمَنِ).** [حم٢٧٠٣٨]

* حديث حسن.

لە سەهلی کوڕی مەعازی کوڕی ئەنەسەوە، لە باوکییەوە: ئەو گوێی لە ئوم دەردا بوو دەیوت: لە حەمام هاتمە دەرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێمگەیشت و فەرمووی: **(لە کوێ بووی، ئەی ئوم دەردا؟)**، وتی: لە حەمام، فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هەر ئافرەتێك لە جێگەیەك جگە لە ماڵی یەکێك لە دایکانی پۆشاکەکەی دابنێت[1] هەرچی سیتر هەیە لە نێوان ئەو و ڕەحمان پێشێلی کردووە).**

---

[1] واتە: جلەکانی لەبەر دابکەنێت–و.

# بەشی پێنجەم

## تەیموووم

### ١- دەروازەی: ڕەوایەتی تەیموم

٩٩٦- (ق) عَنْ عَائِشَةَ - زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم - قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالبَيْدَاءِ - أَوْ بِذَاتِ الجَيْشِ - انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي، فَأَقَامَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم عَلَى التِمَاسِهِ، وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ. فَأَتَى النَّاسُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، فَقَالُوا: أَلاَ تَرَى مَا صَنَعَتْ عائشَةُ؟ أَقَامَتْ بِرَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم وَالنَّاسِ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ! فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ، وَرَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم وَاضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي قَدْ نَامَ، فَقَالَ: حَبَسْتِ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم وَالنَّاسَ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ! فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَعَاتَبَنِي أَبُو بَكْرٍ، وَقَالَ مَا شَاءَ الله أَنْ يَقُولَ، وَجَعَلَ يَطْعُنُنِي بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي، فَلاَ يَمْنَعُنِي مِنَ التَّحَرُّكِ؛ إِلاَّ مَكَانُ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم عَلَى فَخِذِي، فَقَامَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم حِينَ أَصْبَحَ عَلَى غيرِ مَاءٍ، فَأَنْزَلَ الله آيَةَ التَّيَمُّمِ؛ فَتَيَمَّمُوا. فَقَالَ: أُسَيْدُ بْنُ الحُضَيْرِ: مَا هِيَ بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ! قَالَتْ: فَبَعَثْنَا البَعِيرَ الَّذِي كُنْتُ عَلَيْهِ، فَأَصَبْنَا العِقْدَ تَحْتَهُ. [خ٣٣٤/ م٣٦٧]

**(ق) لە عائیشەوە–هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)– لە یەکێك لە سەفەرەکان لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) چووینە دەرەوە، تا گەیشتینە "البیداء" یان "ذات الجیش"، ملوانکەیەکم پچڕایەوە، پێغەمبەری خودا بۆ چنینەوەی وەستا و خەڵکی لەگەڵی وەستان، ئەوان لەسەر ئاوێك نەبوون، خەڵکی هات بۆ لای ئەبی بەکری صدیق و وتیان: نابینی عائیشە چی کرد؟ پێغەمبەری خودا و خەڵکەکەی ڕاگرت و لەسەر ئاوێك نین و ئاویشیان پێ نییە، ئەبوبەکر هات، پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەری لەسەر ڕانم نابوو و خەوی لێکەوتبوو، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) و خەڵکەکەت بەند کرد و لەسەر ئاوێك نین و ئاویشیان پێ نییە ! عائیشە وتی: ئەبوبەکر سەرزەنشتی کردم،**

ئەوەی خودا بخوازێت بیلێت وتی، بە دەستی دەیدا لە کەلەکەم، بەڵام ئەوەی ڕێگری لێ دەکردم لە جووڵە شوێنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو لەسەر ڕانم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستا کاتێك لەسەر بێئاوی ڕۆژی لێبوویەوە، خودا ئایەتی تەیمومی دابەزاند، بۆیە تەیموومیان کرد، ئوسەیدی کوڕی خوزەیر وتی: ئەوە یەکەمین بەرەکەتی ئێوە نییە، ئەی ئالی ئەبی بەکر، عائیشە وتی: ئەو حوشترەی من لەسەری بووم هەڵمانساندەوە ملوانکەکەمان لەژێریدا بینییەوە.

## ٢- دەروازەی: چۆنێتی تەیموم

**٩٩٧-** عَنْ مَالِك، عَنْ نَافِعٍ: أَنَّهُ أَقْبَلَ هُوَ وَعَبْدُ الله بْنُ عُمَرَ مِنَ الجُرُفِ، حَتَّى إِذَا كَانَا بِالمِرْبَدِ، نَزَلَ عَبْدُ الله، فَتَيَمَّمَ صَعِيداً طَيِّباً، فَمَسَحَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ إِلَى المِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى.

[ط١٢٣، ١٢٤]

* إسناده صحيح.

**لە مالیکەوە، لە نافیعەوە: ئەو و عەبدوڵای کوڕی عومەر لە "جُرُف[١]"ەوە هاتن تا گەیشتنە "المِربَد[٢]"، عەبدوڵا دابەزی و لە خۆڵێکی بەرزی پاك تەیمووی گرت، مەسحی ڕوخسار و دوو دەستی کرد تا ئەنیشك، پاشان نوێژی کرد.**

**٩٩٨-** عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ التَّيَمُّمِ؟ فَأَمَرَنِي ضَرْبَةً وَاحِدَةً لِلْوَجْهِ وَالكَفَّيْنِ. [د٣٢٧، ت١٤٤/ مي٧٧٢]

* صحيح.

**لە عەماری کوڕی یاسرەوە، وتی: پرسیاری تەیموومم لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد؟ فەرمانی پێکردم بە یەك لێدان لە ڕوخسار و دوو دەست.**

---

(١) "الجرف" شوێنێکە سێ میل لە مەدینەوە دوورە-و.

(٢) "المربد" میلێك یان دوو میل لە مەدینەوە دوورە-و.

## ٣- دەروازەی: ئایا نوێژ دووبارە دەکاتەوە گەر ئاوی بینییەوە

**٩٩٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: خَرَجَ رَجُلاَنِ فِي سَفَرٍ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ وَلَيْسَ مَعَهُمَا مَاءٌ، فَتَيَمَّمَا صَعِيداً طَيِّباً، فَصَلَّيَا، ثُمَّ وَجَدَا المَاءَ فِي الوَقْتِ، فَأَعَادَ أَحَدُهُمَا الصَّلاَةَ وَالوُضُوءَ، وَلَمْ يُعِدِ الآخَرُ. ثُمَّ أَتَيَا رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم فَذَكَرَا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ لِلَّذِي لَمْ يُعِدْ: **(أَصَبْتَ السُّنَّةَ، وَأَجْزَأَتْكَ صَلاَتُكَ)**، وَقَالَ لِلَّذِي تَوَضَّأَ وَأَعَادَ: **(لَكَ الأَجْرُ مَرَّتَيْنِ)**.

* صحيح.　　[د٣٣٨، ٣٣٩/ ن٤٣١، ٤٣٢/ مي٧٧١]

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: دوو پیاو دەرچوون بۆ سەفەرێك، نوێژ هاتە بەرەوە و ئاویان پێ نەبوو، لە خۆڵێکی بەرزی پاك تەیموومیان كرد و نوێژیان كرد، پاشان لە ناو تێنەپەڕینی کاتی نوێژەکە ئاویان بینییەوە، یەکێکیان نوێژەکە و دەستنوێژی دووبارە کردەوە، ئەویتریان دووبارەی نەکردەوە، پاشان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەوەیان بۆ باس کرد، بەوەی فەرموو نوێژەکەی دووبارە نەکردبووەوە: (سوننەتت پێکاوە و نوێژەکەت بەسە بۆ تۆ)، بەو کەسەشی فەرموو نوێژەکەی دووبارە کردبووەوە: (دوو جار پاداشتت بۆ هەیە).**

## ٤- دەروازەی: تەیموم بۆ لەشگرانی

١٠٠٠- (ق) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ الخُزَاعِيِّ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم رَأَى رَجُلاً مُعْتَزِلاً، لَمْ يُصَلِّ فِي القَوْمِ، فَقَالَ: **(يَا فُلانُ، مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ فِي القَوْمِ)** ؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ الله أَصَابَتْنِي جَنَابَةٌ وَلاَ مَاءَ، قَالَ: **(عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ، فَإِنَّهُ يَكْفِيكَ)**.　　[خ٣٤٨ (٣٤٤)/ م٦٨٢]

**(ق) لە عیمرانی کوڕی حوصەینی خوزاعییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێکی بینی کەناری گرتبوو و لەگەڵ خەڵکەکە نوێژی نەدەکرد، فەرمووی: (ئەی فلان، چی رێگریت لێ دەکات لەگەڵ خەڵکەکە نوێژ بکەی؟)، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، تووشی لەشگرانی بووم و ئاوێکیش نییە، فەرمووی: (خۆڵێکی بەرزت لەسەرە[1]، ئەوە بەسە بۆ تۆ).**

---

[1] واتە تەیموم بکە-و.

١٠٠١- عَنْ عَمْرِو بْنِ العَاصِ قَالَ: احْتَلَمْتُ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ، فِي غَزْوَةِ ذَاتِ السُّلاَسِلِ، فَأَشْفَقْتُ إِنِ اغْتَسَلْتُ أَنْ أَهْلِكَ، فَتَيَمَّمْتُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ بِأَصْحَابِي الصُّبْحَ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**يَا عَمْرُو، صَلَّيْتَ بِأَصْحَابِكَ وَأَنْتَ جُنُبٌ**) ؟ فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي مَنَعَنِي مِنَ الاغْتِسَالِ، وَقُلْتُ: إِنِّي سَمِعْتُ الله يَقُولُ: ﴿**وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا**﴾ [النساء:٢٩]، فَضَحِكَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم وَلَمْ يَقُلْ شَيْئاً. [د٣٣٤]

* صحيح.

**لە عەمری كوڕی عاصەوە، وتی: لە شەوێكی سارد و لە غەزوەی "ذات السلاسل"دا ئیحتیلام بووم، ترسی ئەوەم هەبوو گەر خۆم بشۆم تیابچم، بۆیە تەیموم كرد و پاشان نوێژی بەیانیم بە هاوەڵانم كرد، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس كرد، فەرمووی: (ئەی عەمر، نوێژت بە هاوەڵانت كرد و تۆ لەشگران بووی؟)، هەواڵی ئەوەم پێدا رێگری لێكردم لە خۆشۆرین و وتم: من گوێم لە خودا بوو دەیفەرموو: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ [النساء:٢٩]، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێكەنی و هیچی نەفەرموو.**

## ٥- دەروازەی: ئایا بەدوای ئاودا دەگەڕێت(ئایا هەوڵی بەدەستهێنانی ئاو دەدەت)؟

١٠٠٢- (ع) عَن عَبْد الله بنِ أَحْمَد قَالَ: وَسَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: وَمَا كَانَ فِي قَرْيَةِ عَبْدِ الرَّزَّاقِ بِئْرٌ، فَكُنَّا نَذْهَبُ نُبَكِّرُ عَلَى مِيلَيْنِ نَتَوَضَّأُ، وَنَحْمِلُ مَعَنَا المَاءَ. [حم١٤١٦٦م]

**(ع) لە عەبدوڵای كوڕی ئەحمەدەوە، وتی: هەروەها گوێم لە باوكم بوو دەیوت: لە ئاوەدانییەكەی عبدالرزاق[1] بیرێك نەبوو، بەیانیان زوو دووری دوو میل دەڕۆیشتین و دەستنوێژمان دەگرت و ئاومان لەگەڵ خۆمان هەڵدەگرت.**

---

[1] مەبەستی ئەو گوندەیە عبدالرزاق لێی ژیاوە-و.

**١٠٠٣-** عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ كَانَ يَكُونُ فِي السَّفَرِ فَتَحْضُرُهُ الصَّلاَةُ وَالْماءُ مِنْهُ عَلَى غَلْوَةٍ أَوْ غَلْوَتَيْنِ وَنَحْوَ ذَلِكَ، ثُمَّ لاَ يَعْدِلُ إِلَيْهِ. [هق١/٢٣٣]

**لە نافیعەوە، لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: ئەو لە سەفەردا بوو و نوێژ دەهاتە بەرەوە و ئاو بڕی "غلوة"[١]"یەك یان دوو "غلوة" و نزیك بەوە دوور بوو، پاشانیش لای نەدەدا بۆ لای.**

## ٦- دەروازەی: تەیەمووم لە سەفەر

**١٠٠٤-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ قال: قال رَسُول الله صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ طَهُورُ الْمُسْلِمِ، وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ عَشْرَ سِنِينَ، فَإِذَا وَجَدَ الْمَاءَ، فَلْيُمِسَّهُ بَشَرَتَهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ**).

* صحيح. [د٣٣٢/ ت١٢٤/ ن٣٢١]

**لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خۆڵێکی بەرزی پاك پاکبوونەوەی موسڵمانە، با دە ساڵ ئاو نەبینێتەوە، گەر ئاوی بینییەوە با بیدات لە پێستی خۆی، چونکە ئەوەیان باشترە[٢]).**

## ٧- دەروازەی: تەیەمووم بۆ وەڵامدانەوەی نوێژ

**١٠٠٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: أَقْبَلَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم مِنَ الغَائِطِ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ عِنْدَ بِئْرِ جَمَلٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم، حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الحَائِطِ، فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى الحَائِطِ، ثُمَّ مَسَحَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ رَدَّ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم عَلَى الرَّجُلِ السَّلاَمَ. [د٣٣١]

* صحيح.

---

[١] **"غلوة"یەك نزیك بە (٣٠٠-٤٠٠) باڵە، یەك باڵ نزیك بە (٤٥سم)ە، واتە یەك "غلوة" (١٣٥ بۆ ١٨٠)ە-مەتر-و.**

[٢] **واتە گەر ئاوی بینییەوە با دەستنوێژی پێ بگرێت، چونکە باشترە لە خۆڵ بۆ دەستنوێژ-و.**

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا لەسەر پێشاو گەڕایەوە لە لای "بئر الجمل" پیاوێکی پێگەیشت و سەلامی لێکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەڵامی سەلامەکەی نەدایەوە تا رووی لە دیواری باخەکە کرد و دوو دەستی لەسەر دیوارەکە دانا[1] و مەسحی روخسار و دوو دەستی پێ کرد و پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەڵامی سەلامی پیاوەکەی دایەوە.

## ٨- دەروازەی: تەیەموم لە نەخۆشی و بریندا

١٠٠٦- عَنْ جَابِرٍ قَالَ: خَرَجْنَا فِي سَفَرٍ، فَأَصَابَ رَجُلاً مِنَّا حَجَرٌ، فَشَجَّهُ فِي رَأْسِهِ، ثُمَّ احْتَلَمَ، فَسَأَلَ أَصْحَابَهُ فَقَالَ: هَلْ تَجِدُونَ لِي رُخْصَةً فِي التَّيَمُّمِ؟ فَقَالُوا: مَا نَجِدُ لَكَ رُخْصَةً، وَأَنْتَ تَقْدِرُ عَلَى الماءِ، فَاغْتَسَلَ فَمَاتَ. فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ صَلّى الله عليه وسلّم أُخْبِرَ بِذَلِكَ، فَقَالَ: **(قَتَلُوهُ، قَتَلَهُمْ اللهُ! أَلاَ سَأَلُوا إِذْ لَمْ يَعْلَمُوا، فَإِنَّمَا شِفَاءُ العِيِّ السُّؤَالُ؛ إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيهِ أَنْ يَتَيَمَّمَ وَيَعْصِرَ** . أَوْ يَعْصِبَ، شَكَّ مُوسَى - **عَلَى جُرْحِهِ خِرْقَةً، ثُمَّ يَمْسَحَ عَلَيْهَا، وَيَغْسِلَ سَائِرَ جَسَدِهِ).** [د٣٣٦]

* حسن.

لە جابرەوە وتی: دەرچووین بۆ سەفەرێك، بەردێك بەر پیاوێك لە ئێمە کەوت و سەری شکاند، پاشان ئیحتیلام بوو، پرسیاری لە هاوەڵەکانی کرد و وتی: ئایا روخسەتێك بۆ من دەبینن لە تەیەمومدا؟ وتیان: روخسەتت بۆ نابینین، تۆ ئاوت لەبەردەستە، کەسەکە خۆی شۆری و مرد، کاتێك هاتین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بەوە هەواڵی پێدرا، فەرمووی: **(کوشتیان، خودا بیانکوژێت، گەر نەیانزانی با پرسیاریان بکردبا، شفای نەزانی پرسیارە، ئەوەندەی بەس بوو تەیەمومی بکردبایە و برینەکەی توند ببەستبایە، یان پەڕۆیەکی لەسەر برینەکە بپێچایە**-موسا شکی کردووە- **و پاشان مەسحی لەسەر بکردبایە و بەشەکانی تری جەستەی بشۆریبایە).**

---

[1] دیارە دیواری باخەکە گڵ و خاك بووە و پێغەمبەر(ﷺ) وەك خۆڵێکی پاك تەیەمومی پێکردووە-و.

# بەشی یەکەم

## بانگ

### ١- دەروازەی: دەستپێکردنی بانگ و ڕۆشنکردنەوەی وشەکانی

١٠٠٧- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ المسْلِمُونَ حِينَ قَدِمُوا المدِينَةَ، يَجْتَمِعُونَ فَيَتَحَيَّنُونَ الصَّلاَةَ، لَيْسَ يُنَادَى لَهَا، فَتَكَلَّمُوا يَوْماً فِي ذلِكَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اتَّخِذُوا نَاقُوساً مِثْلَ نَاقُوسِ النَّصَارَى، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ بُوقاً مِثْلَ قَرْنِ اليَهُودِ، فَقَالَ عُمَرُ: أَوَلاَ تَبْعَثُونَ رَجُلاً يُنَادِي بِالصَّلاَةِ، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**يَا بِلاَلُ، قُمْ فَنَادِ بِالصَّلاَةِ**). [خ٦٠٤/ م٣٧٧]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە، وتی: کاتێك موسڵمانان هاتن بۆ مەدینـە کۆدەبوونـەوە و کات و وادەی نوێژیان دیاری دەکرد، بانگی بۆ نەدەکرا، ڕۆژێك لەو بارەیەوە قسـەیان کرد، یەکێکیان وتی: زەنگێك وەك زەنگی نەصارا دابنـێن، یـەکێکی تـر وتـی: بوقێـك وەك شاخەکەی[(١)] یـەهوود، عومـەر وتـی: بـۆ پیاوێـك نـانێرن بـانگ بـۆ نوێـژ بکـات، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی بیلال، هەستە و بانگ بۆ نوێژ بکە).**

١٠٠٨- عَنْ عَبْدِ الله بْنِ زَيْدٍ قَالَ: لَمَّا أَمَرَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم بِالنَّاقُوسِ يُعْمَلُ لِيُضْرَبَ بِهِ لِلنَّاسِ لِجَمْعِ الصَّلاَةِ، طَافَ بِي وَأَنَا نَائِمٌ رَجُلٌ يَحْمِلُ نَاقُوساً فِي يَدِهِ، فَقُلْتُ: يَا عَبْدَ الله، أَتَبِيعُ النَّاقُوسَ؟ قَالَ: وَمَا تَصْنَعُ بِهِ؟ فَقُلْتُ: نَدْعُو بِهِ إِلَى الصَّلاَةِ، قَالَ: أَفَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى مَا هُوَ خَيْرٌ مِنْ ذَلِكَ؟ فَقُلْتُ: بَلَى، قَالَ: فقالَ: تَقُولُ: الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ. أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله. أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله. حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ. حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ. الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله. قَالَ: ثُمَّ اسْتَأْخَرَ عَنِّي غَيْرَ بَعِيدٍ، ثُمَّ قَالَ: وَتَقُولُ إِذَا أَقَمْتَ الصَّلاَةَ: الله

---

(١) شاخی گیاندار، گا یان بەران و خرت—و.

أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله.

فَلَمَّا أَصْبَحْتُ أَتَيْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا رَأَيْتُ، فَقَالَ: (**إِنَّهَا لَرُؤْيَا حَقٌّ إِنْ شَاءَ الله، فَقُمْ مَعَ بِلاَلٍ، فَأَلْقِ عَلَيْهِ مَا رَأَيْتَ فَلْيُؤَذِّنْ بِهِ، فَإِنَّهُ أَنْدَى صَوْتاً مِنْكَ**). فَقُمْتُ مَعَ بِلاَلٍ، فَجَعَلْتُ أُلْقِيهِ عَلَيْهِ وَيُؤَذِّنُ بِهِ، قَالَ: فَسَمِعَ ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ يَجُرُّ رِدَاءَهُ وَيَقُولُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ يَا رَسُولَ الله! لَقَدْ رَأَيْتُ مِثْلَ مَا أُرِيَ، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**فَلِلَّهِ الحَمْدُ**). [د٤٩٩/ جه٧٠٦]

**لە عەبدوڵای کوڕی زەیدەوە، وتی: کاتێک پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی کرد بە ناقووس کاری پێبکرێ و بۆ کۆبوونەوەی نوێژ بۆ خەڵکی لێ بدرێت، من خەوتبووم پیاوێک زەنگێکی بە دەستەوە گرتبوو و بە دەورمدا دەسوڕایەوە، وتم: ئەی بەندەی خودا، ئەو زەنگە دەفرۆشی؟ وتی: چی پێ دەکەی؟ وتم: خەڵکی پێ بانگ دەکەم بۆ نوێژ، وتی: دەتەوێ باشتر لەوەت پێ نیشان بدەم؟ وتم: بەڵێ، وتی: بلێ: (ألله أكبر، ألله أكبر، ألله أكبر، ألله أكبر، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن محمدا رسول الله، أشهد أن محمدا رسول الله، حيَّ على الصلاة، حيَّ على الصلاة، حيَّ على الفلاح، حيَّ على الفلاح، ألله أكبر، ألله أكبر، لا إله إلاّ الله)، وتی: پاشان هەندێ-زۆر دوور نە- لێمدواکەوت، پاشان وتی: گەر قامەتت کرد بۆ نوێژ دەڵێی: (ألله أكبر، ألله أكبر، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن محمدا رسول الله، حيَّ على الصلاة، حيَّ على الفلاح، قد قامت الصلاة قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة، ألله أكبر، ألله أكبر، لا إله إلا الله).**

**کاتێک ڕۆژم لێبوویەوە هاتم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەوەی بینی بووم هەواڵم پێدا، فەرمووی: (ئەوە-إنشاء الله- خەون بینینی حەقە، هەستە لەگەڵ بیلال ئەوەی بینیوتە بەسەریدا بیڵێ با ئەویش بانگی پێ بدات، چونکە ئەو دەنگی لە تۆ خۆشترە)، لەگەڵ بیلال هەستام و خوێندم بەسەریدا و بانگی پێ دەدا، وتی: عومەری کوڕی خەتاب ئەوەی بیست، ئەو لە ماڵی خۆی بوو، هاتە دەرەوە و کراسەکەی خۆی ڕادەکێشا و دەیوت: سوێند بەو کەسەی بە حەق تۆی ڕەوانە کردووە، ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوەی بینراوە منیش بینیومە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (حەمد بۆ خودا).**

■ وأخرج الترمذي بعضه، وفيه: (فَإِنَّهُ أَنْدَى وَأَمَدُّ صَوْتاً مِنْكَ).   [ت١٨٩]

* حسن صحيح.

**هەندێکی ترمزی دەرهێنانی بۆ کردووە، تیایدا هاتووە: (چونکە ئەو دەنگی لە تۆ خۆشتر و درێژترە).**

## ٢- دەروازەی: بانگ جووتە و قامەت تاکە

**١٠٠٩**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: إِنَّمَا كَانَ الأَذَانُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، وَالإِقَامَةُ مَرَّةً مَرَّةً، غَيْرَ أَنَّهُ يَقُولُ: قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، فَإِذَا سَمِعْنَا لإِقَامَةَ تَوَضَّأْنَا، ثُمَّ خَرَجْنَا إِلَى الصَّلاَةِ.   [د٥١٠/ ن٦٢٧/ مي١٢٢٩]

* حسن.

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: بانگ لەسەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوو دوو بوو، و قامەتیش یەك یەك، جگە لەوەی دەیوت: (قد قامت الصلاة قد قامت الصلاة)، کاتێك گوێمان لە قامەت دەبوو دەستنوێژمان دەگرت[1]، پاشان دەردەچووین بۆ نوێژ.**

## ٣- دەروازەی: فەزڵی بانگ

**١٠١٠**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلاَّ أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لاَسْتَهَمُوا، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لاَسْتَبَقُوا إِلَيْهِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي العَتَمَةِ وَالصُّبْحِ، لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْواً ).**   [خ٦١٥/ م٤٣٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر خەڵکی بیانزانیبا چی لە بانگ و ریزی یەکەمدایە، پاشانیش بەدەستیان نەهێنایە جگە بە قورعە کردن، ئەوا قورعەیان بۆ دەکرد، گەر بیانزانیبا چی لە زووهاتندایە بۆ نوێژ پێشبڕکێیان بۆ دەکرد، گەر بیانزانیبا چی لە عیشا و بەیانیدایە بە سینگە خشکێ بۆی دەهاتن).**

---

[1] واتە لە ماڵەوە دەستنوێژمان دەگرت-و.

**١٠١١**– (م) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ عَمِّهِ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، فَجَاءَهُ المؤذِّنُ يَدْعُوهُ إِلَى الصَّلاَةِ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**المُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقاً يَوْمَ القِيَامَةِ**). [م٣٨٧]

(م) لە تەلحەی کوڕی یەحیاوە، لە باوکییەوە، وتی: لای موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان بووم، بانگوێژەکە هات بانگی کرد بۆ نوێژ، موعاویە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(بانگوێژان لە ڕۆژی قیامەت درێژترین گەردنیان هەیە)**.

**١٠١٢**– عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ: أَنَّ نَبِيَّ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ الله وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ المُقَدَّمِ، وَالمُؤَذِّنُ يُغْفَرُ لَهُ بِمَدِّ صَوْتِهِ، وَيُصَدِّقُهُ مَنْ سَمِعَهُ مِنْ رَطْبٍ وَيَابِسٍ، وَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ مَنْ صَلَّى مَعَهُ**). [ن٦٤٥/ جه٩٩٧]

* صحيح.

لە بەرائی کوڕی عازیبەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(خودا و فریشتەکانی صەڵەوات لێدەدەن لەسەر ریزی پێشەوە، بانگوێژ بە دەنگی درێژی خودا لێیخۆش دەبێت، هەر کەس لە تەڕ و وشك دەیبیستێ تەصدیقی دەکات، نموونەی پاداشتی ئەو کەسەی بۆ هەیە صەڵەواتی لەگەڵ داوە[1])**.

**١٠١٣**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**الإِمَامُ ضَامِنٌ، وَالمُؤَذِّنُ مُؤْتَمَنٌ، اللَّهُمَّ! أَرْشِدِ الأَئِمَّةَ، وَاغْفِرْ لِلْمُؤَذِّنِينَ**). [د٥١٧، ٥١٨/ ت٢٠٧]

* صحيح.

---

[1] واتە: کاتێك بانگ تەواو دەبێت و ئەو کەسەی گوێی لە بانگە دەبێت و دوعا و صەڵەواتی: (أللهم رب هذه الدعوة التامة..) دەخوێنێت، بانگوێژەکە پاداشتی ئەو کەسەی بۆ هەیە–و.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئیمام دەستەبەرە[1]، بانگوێژ ئەمانەتپێکراوە[2]، خودایە، ئیمامان رێنموونی بکە و لە بانگوێژان خۆشببە).**

## ٤- دەروازەی: وەڵامدانەوەی بانگوێژ

١٠١٤- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ المُؤَذِّنُ). [خ٦١١/ م٣٨٣]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر گوێتان لە بانگ بوو وەك ئەوەی بانگوێژەکە دەیڵێت بیڵێنەوە).**

١٠١٥- (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا قَالَ المُؤَذِّنُ: الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، فَقَالَ أَحَدُكُمْ: الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ. ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله. ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله، قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله. ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِالله. ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ، قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِالله. ثُمَّ قَالَ: الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، قَالَ: الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ. ثُمَّ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، مِنْ قَلْبِهِ، دَخَلَ الجَنَّةَ). [م٣٨٥]

(م) لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بانگوێژ وتی: (الله أكبر، الله أكبر)، یەکێك لە ئێوەش لە دڵەوە وتی: (الله أكبر، الله أكبر)، پاشان وتی: (أشهد أن لا إله إلا الله)، ئەویش وتی: (أشهد أن لا إله إلا الله)، پاشان وتی: (أشهد أن محمدا رسول الله)، ئەویش وتی: (أشهد أن محمدا رسول الله)، پاشان وتی:(حي على الصلاة)، ئەویش وتی: (لا حول ولا قوة إلا بالله)، پاشان وتی: (حي على الفلاح)، ئەویش وتی: (لا حول ولا قوة إلا بالله) پاشان وتی: (الله أكبر، الله**

[1] لە پارێزگاری نوێژەکە و ژمارەی رکاتەکانی.

[2] لە دیاریکردنی کاتی بانگەکان.

أكبر)، ئەویش وتی: (ألله أكبر، ألله أكبر)، پاشان وتی: (لا إله إلا الله)، ئەویش وتی: (لا إله إلا الله)، دەچێتە بەهەشتەوە).

## ٥- دەروازەی: دوعا لە کاتی بانگدا

١٠١٦- (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَةِ، وَالصَّلاَةِ القَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً الوَسِيلَةَ وَالفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُوداً الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ القِيَامَةِ). [خ٦١٤]

(خ) لە جابری کوڕی عەبدولڵاوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس کاتێك بانگ دەبیستێ بڵێ: (أللهم رب هذه الدعوة التامة، والصلاة االقائمة، آت محمدا الوسيلة والفضيلة، وابعثه مقاما محمودا الذي وعدته) لە ڕۆژی قیامەت شفاعەتی منی بۆ حەڵاڵ دەبێت).**

١٠١٧- (م) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِذَا سَمِعْتُمُ المُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً، صَلَّى الله عَلَيْهِ بِهَا عَشْراً، ثُمَّ سَلُوا اللهَ لِي الوَسِيلَةَ، فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الجَنَّةِ لاَ تَنْبَغِي إِلاَّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ الله، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ لِي الوَسِيلَةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ). [م٣٨٤]

(م) لە عەبدولڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(گەر گوێتان لە بانگوێژ بوو بەو جۆرە بڵێن ئەو دەیڵێت، پاشان صەڵەوات لەسەر من بدەن، چونکە هەر کەس صەڵەواتێك لەسەر من بدات خودا بەوە دە صەڵەواتی لەسەر دەدات، پاشان داوای وەسیلەم لە خودا بۆ بکەن، ئەوە مەنزیلەتێکە لە بەهەشت تەنها بۆ یەك بەندە لە بەندەکانی خودا دەبێت، رجام وایە ئەو بەندە من بم، هەر کەس داوای وەسیلەم بۆ بکات شفاعەتی منی بۆ حەڵاڵ دەبێت).**

١٠١٨- (م) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ المُؤَذِّنَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِالله رَبّاً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً؛ غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ). [م٣٨٦]

(م) لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس کاتێ گوێی لە بانگوێژ دەبێت بڵێت: "أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأن محمدا عبده ورسوله، رضيت بالله ربا، وبمحمد رسولا، وبالإسلام دينا" خودا لە گوناهی خۆشدەبێت).**

## ٦- دەروازەی: گرتنی دوو بانگوێژ و بانگدانی نابینا

١٠١٩- (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم مُؤَذِّنَانِ: بِلاَلٌ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى. [م٣٨٠]

(م) لە ئیبن عومەرەوە، وتی: دوو بانگوێژ هەبوون بۆ پێغەمبەری خودا: بیلال و ئیبن ئوم مەکتوومی نابینا.

## ٧- دەروازەی: "التثويب" لە بانگی بەیانیدا

١٠٢٠- عَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ قَالَ: كُنْتُ أُؤَذِّنُ لِرَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم، وَكُنْتُ أَقُولُ فِي أَذَانِ الفَجْرِ الأَوَّلِ: حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله. [ن٦٤٦]

* صحيح.

لە ئەبی مەحزورەوە، وتی: بانگم بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەدا، لە بانگی بەیانیدا دەموت: **"حيّ على الفلاح، الصلاة خير من النوم، الصلاة خير من النوم، الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله".**

**١٠٢١**– عَنْ سَعِيدِ بْنِ المسَيَّبِ، عَنْ بِلاَلٍ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يُؤْذِنُهُ بِصَلاَةِ الفَجْرِ، فَقِيلَ: هُوَ نَائِمٌ، فَقَالَ: الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، فَأُقِرَّتْ فِي تَأْذِينِ الفَجْرِ، فَثَبَتَ الأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ. [جه٧١٦]

* صحيح.

**لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە، لە بیلالەوە: ئەو هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) داوای مۆڵەتی لێ بکات بۆ نوێژی بەیانی، وترا: ئەو خەوتووە، وتی: "الصلاة خير من النوم، الصلاة خير من النوم"، بۆیە لە بانگدانی بەیانیدا جێگیر بوو، و کارەکە لەسەر ئەوە دامەزرا.**

## ٨- دەروازەی: بانگ لەسەر منارە

**١٠٢٢**– عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ امْرَأَةٍ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ قَالَتْ: كَانَ بَيْتِي مِنْ أَطْوَلِ بَيْتٍ حَوْلَ المسْجِدِ، وَكَانَ بِلاَلٌ يُؤَذِّنُ عَلَيْهِ الفَجْرَ، فَيَأْتِي بِسَحَرٍ، فَيَجْلِسُ عَلَى البَيْتِ يَنْظُرُ إِلَى الفَجْرِ، فَإِذَا رَآهُ تَمَطَّى، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَحْمَدُكَ، وَأَسْتَعِينُكَ عَلَى قُرَيْشٍ أَنْ يُقِيمُوا دِينَكَ، قَالَتْ: ثُمَّ يُؤَذِّنُ. قَالَتْ: وَاللهِ مَا عَلِمْتُهُ كَانَ تَرَكَهَا لَيْلَةً وَاحِدَةً. تَعْنِي هَذِهِ الكَلِمَاتِ. [د٥١٩]

* حسن.

**لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە، لە ئافرەتێکی بەنی نەجارەوە، وتی: ماڵەکەم بەرزترین ماڵ بوو لە دەوری مزگەوت، بیلال بانگی بەیانی لەسەر دەدا، بە سەحەردا دەهات و لەسەر ماڵەکە دادەنیشت و چاوەڕانی فەجری دەکرد، کاتێك دەیبینی هەڵهاتووە، پاشان دەیوت: خودایە من حەمدت دەکەم و داوای کۆمەکیت لێ دەکەم بۆ سەر قورەیش دینەکەت راپەڕێنن، ئافرەتەکە وتی: پاشان بانگی دەدا، ئافرەتەکە وتی: سوێند بە خودا، وا نازانم تەنها یەك شەویش ئەوەی وازلێهێنابێت، واتە وتنی ئەو چەند وشەیە.**

## ٩- دەروازەی: ئایا لەسەر بانگدان کرێ وەردەگرێت؟

**١٠٢٣**– عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي العَاصِ قالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، اجْعَلْنِي إِمَامَ قَوْمِي، فَقَالَ: **(أَنْتَ إِمَامُهُمْ، وَاقْتَدِ بِأَضْعَفِهِمْ، وَاتَّخِذْ مُؤَذِّناً لاَ يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْراً)**.

* صحيح. [د٥٣١/ ت٢٠٩/ ن٦٧١/ جه٧١٤]

**لە عوسمانی کوڕی عاصەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، بمکە بە ئیمامی قەومەکەم، فەرمووی: (تۆ ئیمامی ئەوانی، شوێنی لاوازترینیان بکەوە، بانگوێژێك بگرە لەسەر بانگەکەی کرێ وەرنەگرێت).**

## ١٠- دەروازەی: سوننەت لە بانگدا

**١٠٢٤**– عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالأَبْطَحِ، وَهُوَ فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ، فَخَرَجَ بِلاَلٌ، فَأَذَّنَ فَاسْتَدَارَ فِي أَذَانِهِ، وَجَعَلَ إِصْبَعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ. [جه٧١١]

* صحيح.

**لە ئەبی جوحەیفەوە، وتی: لە "الأبطح" هاتم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەو لە قوببەیەکی سوردا بوو، بیلال هاتە دەرەوە، بانگی دا و لە بانگەکەیدا دەسوڕایەوە و دوو پەنجەی خستبووە ناو دوو گوێی.**

## ١١- دەروازەی: بانگ بۆ کەسێك بەتەنها نوێژ بکات

**١٠٢٥**– عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(يَعْجَبُ رَبُّكُمْ مِنْ رَاعِي غَنَمٍ، فِي رَأْسِ شَظِيَّةٍ بِجَبَلٍ، يُؤَذِّنُ لِلصَّلاَةِ وَيُصَلِّي، فَيَقُولُ اللهُ عزّ وجل: انْظُرُوا إِلَى عَبْدِي هَذَا، يُؤَذِّنُ وَيُقِيمُ لِلصَّلاَةَ، يَخَافُ مِنِّي، قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي، وَأَدْخَلْتُهُ الجَنَّةَ)**. [د١٢٠٣/ ن٦٦٥]

* صحيح.

له عوقبەی کوڕی عامرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(پەروەردگارتان لە شوانێکی مەڕ سەری سوڕدەمێنێ لەسەر چیایەك، بانگ بۆ نوێژ دەدات و نوێژ دەکات، خودا(عز وجل) دەفەرموێت: تەماشای ئەو بەندەیەم بکەن، بانگ دەدات و نوێژ ئەنجام دەدات، لە من دەترسێت، لە بەندەکەم خۆشبووم و بردمە بەهەشتەوە).**

## ١٢- دەروازەی: هەندێ حوکمی پەیوەست بە بانگ

**١٠٢٦–** (خ) عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ قَالَ: أَذِّنْ أَذَاناً سَمْحاً، وَإِلاَّ فَاعْتَزِلْنَا.

[خ. الأذان، باب ٥]

**(خـ) لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە، وتی: بانگێکی "سَمْح" بدە، ئەگەر نە، لێمان کەنارگیر بە.**

**١٠٢٧–** (خ) وَيُذْكَرُ أَنَّ أَقْوَاماً اخْتَلَفُوا فِي الأَذَانِ، فَأَقْرَعَ بَيْنَهُم سَعْدٌ. [خ. الأذان، باب ٩]

**(خـ) باس لەوە دەکرێت خەڵکانێك لە وتنی بانگ جیاوازییان بۆ دروست بوو، سەعد قورعەی لە نێوانیان کرد.**

**١٠٢٨–** (خ) عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ: أنهَ تَكَلَّمَ فِي أَذَانِهِ. [خ. الأذان، باب ١٠]

**(خـ) لە سولەیمانی کوڕی صورەدەوە: ئەو لە باگدانەکەیدا قسەی کرد.**

**١٠٢٩–** (خ) عَنِ الحَسَنِ قَالَ: لاَ بَأْسَ أَنْ يَضْحَكَ وَهُوَ يُؤَذِّنُ أَوْ يُقِيمُ.

[خ. الأذان، باب ١٠]

**(خـ) لە حەسەنەوە، وتی: خراپ نییە پێبکەنێ کاتێك بانگ دەدات یان قامەت دەکات.**

**١٠٣٠**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَيْسَ عَلى النِّسَاءِ أَذَانٌ وَلا إِقَامَةٌ. [هق١/٤٠٨]

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: بانگ و قامەت لەسەر ئافرەت نییە.**

**١٠٣١**– عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّها كانت تُؤَذِّنُ وتُقيمُ، وتَقُومُ وَسَطَهُنَّ. [هق١/٤٠٨]

**لە عائیشەوە: ئەو بانگی دەدا و قامەتی دەکرد و لە ناوەندی ئافرەتەکان دەوەستا.**

## بەشی دووەم

# کاتەکانی نوێژ

## ١- دەروازەی: کاتەکانی پێنج نوێژەکە

**١٠٣٢-** (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالهَاجِرَةِ، وَالعَصْرَ وَالشَّمسُ نَقِيَّةٌ، وَالمغْرِبَ إِذَا وَجَبَتْ، وَالعِشَاءَ أَحْيَاناً وَأَحْيَاناً: إِذَا رَآهُمْ اجْتَمَعُوا عَجَّلَ، وَإِذَا رَآهُمْ أَبْطَؤُوا أَخَّرَ، وَالصُّبْحَ .كَانُوا، أَوْ .كَانَ النَّبِيُّ صَلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّيهَا بِغَلَسٍ. [خ٥٦٠/ م٦٤٦]

**(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی لە گەرمای نیوەی ڕۆژدا ئەنجام دەدا، نوێژی عەصر خۆر هێشتا پاك بوو[1]، مەغریب کاتێك خۆر ئاوا دەبوو، عیشاش هەندێ کات: گەر ئەوانی ببینیبا کۆبوونەتەوە پێشی دەخست، هەندێ کاتیش گەر ئەوانی بیبینیبا دواکەوتوون دوایدەخست، نوێژی بەیانیش-ئەوان یان- پێغەمبەر(ﷺ) بە لێڵەی بەرەبەیان ئەنجامی دەدا.**

**١٠٣٣-** (م) عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ الحُصَيْبِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَهُ عَنْ وَقْتِ الصَّلَاةِ؟ فَقَالَ لَهُ: (صَلِّ مَعَنَا هَذَيْنِ) . يَعْنِي: اليَوْمَيْنِ . فَلَمَّا زَالَتِ الشَّمْسُ أَمَرَ بِلَالاً فَأَذَّنَ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الظُّهْرَ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ العَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ بَيْضَاءُ نَقِيَّةٌ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ المغْرِبَ حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ، ثمَّ أَمَرَهُ فأَقَامَ العِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الفَجْرَ حِينَ طَلَعَ الفَجْرُ.

فَلَمَّا أَنْ كَانَ اليَوْمُ الثَّانِي أَمَرَهُ فَأَبْرَدَ بِالظُّهْرِ، فَأَبْرَدَ بِهَا، فَأَنْعَمَ أَنْ يُبْرِدَ بِهَا، وَصَلَّى العَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ، أَخَّرَهَا فَوْقَ الَّذِي كَانَ، وَصَلَّى المغْرِبَ قَبْلَ أَنْ يَغِيبَ الشَّفَقُ، وَصَلَّى العِشَاءِ

[1] واتە: زەردی لاربوونەوە ڕووی لێ نەکردبوو-و.

بَعْدَ مَا ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، وَصَلَّى الفَجْرَ فَأَسْفَرَ بِهَا، ثُمَّ قَالَ: (أَيْنَ السَّائِلُ عَنْ وَقْتِ الصَّلاَةِ) ؟ فَقَالَ الرَّجُلُ: أَنَا، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (وَقْتُ صَلاَتِكُمْ بَيْنَ مَا رَأَيْتُمْ). [م٦١٣]

**(م) لە بورەیدەی کوڕی حوصەیبەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): پیاوێك پرسیاری کاتی نوێژی لێکرد؟ پێی فەرموو: (ئەم دووە لەگەڵمان نوێژ بکە)، واتە: ئەم دوو ڕۆژە، کاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا فەرمانی بە بیلال کرد و بانگیدا، پاشان فەرمانی پێکرد قامەتی بۆ نیوەڕۆ کرد، پاشان فەرمانی پێکرد و قامەتی بۆ عەصر کرد و خۆر بەرز و سپی و پاك بوو، پاشان فەرمانی پێکرد و قامەتی بۆ مەغریب کرد کاتێك خۆر ئاوا بوو، پاشان فەرمانی پێکرد و قامەتی بۆ عیشا کرد کاتێك شەفەق بزر بوو، پاشان فەرمانی پێکرد و قامەتی بۆ فەجر کرد کاتێك بەرەبەیان هەڵهات.**

**کاتێك ڕۆژی دووەم هاتە بەرەوە فەرمانی بە بیلال کرد بە قامەتِ کاتیٚ تینی خۆر سارد دەبێتەوە، ئەویش لە تینی ساردبوونەوەی تینی خۆر قامەتی کرد، لە ساردبوونەوەی تینی خۆر زیادەڕەوەی کرد، نوێژی عەصری کرد و خۆر بەرز بوو، دوایخست بۆ سەرو ئەوەی هەبوو، نوێژی مەغریبی کرد بەرلەوەی شەفەق بزر ببێت، نوێژی عیشای کرد دوای ئەوەی سێیەکی سەرەتای شەو تێپەڕی، نوێژی بەیانی کرد زەردە دەرکەوتبوو، پاشان فەرمووی: (پرسیارکەرەکەی کاتی نوێژ لە کوێیە؟)، پیاوەکە وتی: ، منم، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (کاتی نوێژەکانتان لە نێوان ئەوانەدایە بینیتان).**

## ٢- دەروازەی: فەزڵی نوێژی بەیانی و عەصر

١٠٣٤- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ: مَلاَئِكَةٌ بِاللَّيْلِ، وَمَلاَئِكَةٌ بِالنَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاَةِ الفَجْرِ وَصَلاَةِ العَصْرِ، ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ، فَيَسْأَلُهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ: كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي؟ فَيَقُولُونَ: تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ، وأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ). [خ٥٥٥/ م٦٣٢]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە ناو ئێوە و بەدوای یەکتردا فریشتەی شەو و فریشتەی ڕۆژ دێن، لە نوێژی بەیانی و نوێژی عەصر**

**کۆدەبنەوە، پاشان ئەوانەی شەو لە ناوتان بوون بەرزدەبنەوە، خودا پرسیاریان لێ دەکات و ئەو زاناترە بەوان: بەندەکانی منتان چۆن بەجێهێلا؟ دەڵێن: بەجێمانهێڵان ئەوان نوێژیان دەکرد و چووین بۆ لایان ئەوان نوێژیان دەکرد).**

**١٠٣٥**– (م) عَنْ عُمَارَةَ بْنِ رُؤَيْبَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**لَنْ يَلِجَ النَّارَ أَحَدٌ صَلَّى قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا**) ؛ يَعْنِي: الفَجْرَ وَالعَصْرَ. [م٦٣٤]

**(م) لە عومارەی کوڕی رونەیبەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (کەسێك ناچێتە ناو ئاگرەوە بەر لە هەڵهاتنی خۆر و بەر لە خۆرئاوابوون نوێژی کردبێت)، واتە: نوێژی بەیانی و عەصر.**

## ٣- دەروازەی: کاتی نوێژی بەیانی

**١٠٣٦**– (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنَّ نِسَاءُ المؤْمِنَاتِ، يَشْهَدْنَ مَعَ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم صَلاَةَ الفَجْرِ، مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ، ثُمَّ يَنْقَلِبْنَ إِلَى بُيُوتِهِنَّ حِينَ يَقْضِينَ الصَّلاَةَ، لاَ يَعْرِفُهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الغَلَسِ. [خ٥٧٨، (٣٧٢)/ م٦٤٥]

**(ق) لە عائیشەوە، وتی: کۆمەڵێك ئافرەتی باوەڕدار بوون، لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نوێژی بەیانی ئامادە دەبوون بە پۆشاکەکانیان خۆیان دەپێچایەوە، پاشان دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان کاتێ نوێژەکەیان ئەنجام دەدا، لەبەر تاریکی هیچ کەس نەیدەناسینەوە.**

**١٠٣٧**– عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ، عَنْ رِجَالٍ مِنْ قَوْمِهِ مِنَ الأَنْصَارِ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَا أَسْفَرْتُمْ بِالفَجْرِ، فَإِنَّهُ أَعْظَمُ بِالأَجْرِ**). [ن٥٤٨]

* صحيح الإسناد.

**لە مەحموودی کوڕی لەبیدەوە، لە پیاوانێکی هۆزەکەی خۆیەوە لە ئەنصار، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (تا نوێژی بەیانی بە زەردەوە[1] ئەنجام بدەن پاداشتی گەورەترە).**

## ٤- دەروازەی: کاتی نوێژی نیوەڕۆ

**١٠٣٨-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي شِدَّةِ الحَرِّ، فَإِذَا لَمْ يَسْتَطِعْ أَحَدُنَا أَنْ يُمَكِّنَ وَجْهَهُ مِنَ الأَرْضِ، بَسَطَ ثَوْبَهُ، فَسَجَدَ عَلَيْهِ.
[خ١٢٠٨ (٣٨٥)/ م٦٢٠]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لە تونداهاتنی گەرما لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژمان دەکرد، گەر یەکێك لە ئێمە نەیتوانیبا ڕوخساری لە زەوی بدات پۆشاکەکەی ڕادەخست و سوژدەی لەسەر دەبرد.**

**١٠٣٩-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي الظُّهْرَ إِذَا دَحَضَتِ الشَّمْسُ. [م٦١٨]

**(م) لە جابری کوڕی سەموورەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ نوێژی نیوەڕۆی دەکرد خۆر لایبدایە.**

## ٥- دەروازەی: سارد کردنەوە لە توندی گەرما بە نوێژی نیوەڕۆ

**١٠٤٠-** (ق) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: أَذَّنَ مُؤَذِّنُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم الظُّهْرَ، فَقَالَ: **(أَبْرِدْ أَبْرِدْ)**، أَوْ قَالَ: **(انْتَظِرْ انْتَظِرْ)**، وَقَالَ: **(شِدَّةُ الحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا اشْتَدَّ الحَرُّ؛ فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلاَةِ)**، حَتَّى رَأَيْنَا فَيْءَ التُّلُولِ. [خ٥٣٥/ م٦١٦]

---

[1] **بە زەردەوە: واتە بە سپێدە و ڕۆشنبوونەوەی نوێژی بەیانی لە تاریکی شەو، نەك هەڵهاتنی زەردەپەڕی بەیانیانی خۆر-و.**

(ق) لە ئەبی زەڕەوە، وتی: بانگوێژی پێغەمبەر(ﷺ) بانگی نیوەڕۆی دا و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**أَبْرِدْ، أَبْرِدْ**)[1]، یان فەرمووی: (**انْتَظِرْ، انْتَظِرْ**)[2]، هەروەها فەرمووی: (**توندی گەرما لە هالاوی دۆزەخەوەیە، گەر گەرما توند بوو نوێژ بە فێنکی بکەن**)، تا سێبەری گردەکانمان دەبینی.

## ٦- دەروازەی: کاتی نوێژی عەصر

١٠٤١- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي العَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّةٌ، فَيَذْهَبُ الذَّاهِبُ إِلَى العَوَالِي، فَيَأْتِيهِمْ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ، وَبَعْضُ العَوَالِي مِنَ المدِينَةِ عَلَى أَرْبَعَةِ أَمْيَالٍ، أَوْ نَحْوِهِ. [خ٥٥٠ (٥٤٨)/ م٦٢١]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی عەصری دەکرد و خۆر بەرز و بە شەوق بوو، کەسێك دەڕۆیشت بۆ "العوالي"[3] دەگەڕایەوە بۆ لایان و خۆر هێشتا بەرز بوو، هەندێ لە "العوالي" لە مەدینەوە لە دووری چوار میلن، یان نزیك بەوە.

١٠٤٢- (ق) عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم العَصْرَ، فَنَنْحَرُ جَزُوراً، فَتُقْسَمُ عَشْرَ قِسَمٍ، فَنَأْكُلُ لَحْماً نَضيجاً قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ. [خ٢٤٨٥/ م٦٢٥]

---

[1] "أبرد، أبرد" واتە بانگی نوێژی نیوەڕۆ دوابخە تا گەرمای قرچەی نیوەڕۆ سارد دەبێتەوە–و.

[2] "انتظر، انتظر": واتە: بانگەکە دوابخە و چاوەڕوان بە تا تینی زۆری گەرما نامێنێت ئەوجا بانگەکە بدە–و.

[3] "العوالي": بریتییە لە گوندەکانی دەوروبەری مەدینە لە ئاراستەی نەجدەوە، گوندەکانی دەوربەری مەدینە لە ئاراستەی توهامەوە پێیان دەوترێت "السافلة"–د.

(ق) لە رافیحی کوڕی خەدیجەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێـژی عەصـرمان دەکـرد، دواتـر حوشـترێکمان سـەردەبڕی و دەمـانکرد بـە دە بەشەوەوە، و گۆشتی برژاو(لێنراو)مان دەخوارد بەرلەوەی خۆر ئاوا ببێت[1].

## ٧- دەروازەی: گوناهی ئەو کەسەی عەصری لەدەست دەچێت

**١٠٤٣**- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الَّذِي تَفُوتُهُ صَلاَةُ العَصْرِ، كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ**). [خ٥٥٢/ م٦٢٦]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فـەرمووی: **(ئـەو کەسـەی نوێـژی عەصری لەدەست دەچێت وەك ئەوەی خانەوادەکەی و ماڵەکەی تەنهاخستبێت)**.

**١٠٤٤**- (خ) عَنْ أَبِي المَلِيحِ قَالَ: كُنَّا مَعَ بُرَيْدَةَ فِي غَزْوَةٍ، فِي يَوْمٍ ذِي غَيْمٍ، فَقَالَ: بَكِّرُوا بِصَلاَةِ العَصْرِ، فَإِنَّ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ تَرَكَ صَلاَةَ العَصْرِ، فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ**). [خ٥٥٣]

(خ) لە ئەبی مەلیحەوە، وتی: لە غەزوەیـەك لەگـەڵ بورەیـدە بـووین، لـە ڕۆژێکـی تەماوییدا، وتی: زوو نوێژی عەصر بکەن، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس نوێژی عەصر وازلێبهێنێت کاری پووچ بووەتەوە[2])**.

## ٨- دەروازەی: کاتی نوێژی مەغریب

**١٠٤٥**- (ق) عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي المَغْرِبَ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَيَنْصَرِفُ أَحَدُنَا، وَإِنَّهُ لَيُبْصِرُ مَوَاقِعَ نَبْلِهِ. [خ٥٥٩/ م٦٣٧]

---

[1] واتە: دوای نوێژی عەصر فریای ئەو کارە دەکەوتین و گۆشتمان دەخوارد هێشتا خـۆر ئـاوا نەدەبوو-و.

[2] واتە: کاری چاکەی ئەو ڕۆژەی پووچ بووەتەوە-و.

(ق) لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی مەغریبمان دەکرد و یەکێك لە ئێمە دەگەڕایەوە و شوێنی تیرەکەی خۆی دەبینی.

١٠٤٦- (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم المَغْرِبَ، إِذَا تَوَارَتْ بِالحِجَابِ. [خ٥٦١/ م٦٣٦]

(ق) لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە، وتی: نوێژی مەغریبمان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد گەر خۆر ئاوابوایە.

## ٩- دەروازەی: کاتی نوێژی عیشا

١٠٤٧- (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي الصَّلَوَاتِ نَحْواً مِنْ صَلاَتِكُمْ، وَكَانَ يُؤَخِّرُ العَتَمَةَ بَعْدَ صَلاَتِكُمْ شَيْئاً، وَكَانَ يُخِفُّ الصَّلاَةَ. [م٦٤٣]

(م) لە جابری کوڕی سەموورەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژەکانی هاوشێوەی نوێژەکانی ئێوە ئەنجام دەدا، نوێژی عیشای شتێك دواتر لە نوێژی عیشای ئێوە ئەنجام دەدا، ئەو لە نوێژدا سووك و ئاسان بوو.

١٠٤٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي، لأَمَرْتُهُمْ بِتَأْخِيرِ العِشَاءِ، والسواك عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ).** [د٤٦/ ن٥٣٠/ جه٦٩٠]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر لەسەر ئومەتەکەم گران نەبوایە فەرمانم پێ دەکردن بە دواخستنی نوێژی عیشا، هەروەها سیواك لە هەموو نوێژێکدا[1]).**

---

[1] واتە: گەر لەسەر ئومەتەکەم گران نەبوایە فەرمانم پێ دەکردن بە سیواك لە هەموو نوێژێکدا-و.

## ١٠- دەروازەی: بە رکاتێك لە نوێژ بگەی[١]

١٠٤٩- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ؛ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ). [خ٥٨٠/ م٦٠٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بە رکاتێك لە نوێژ بگات بە نوێژەکەدا گەیشتووە).**

- وفي رواية لمسلم: (مع الإمام).

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: **(لەگەڵ ئیمام).**

- وفي رواية له: (فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ كُلَّها).

لە ریوایەتێکی تریدا: **(بە هەموو نوێژەکەدا گەیشتووە).**

١٠٥٠- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصُّبْحِ رَكْعَةً، قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَ الصُّبْحَ. وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ العَصْرِ، قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَ العَصْرَ). [خ٥٧٩ (٥٥٦)/ م٦٠٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس فریای رکاتێك لە نوێژی بەیانی بکەوێت بە نوێژی بەیانیدا گەیشتووە، هەر کەس فریای رکاتێك لە نوێژی عەصر بکەوێت-بەرلەوەی خۆر ئاوا ببێت- بە نوێژی عەصردا گەیشتووە[٢]).**

---

[١] واتە: بە رکاتێك لە نوێژی جەماعەت بگەی-و.

[٢] واتە: رکاتێك لە نوێژەکەی بکەوێتە پێش خۆرئاوابوون، ئەم فەرموودە ئامـاژەی ئەوەشـی تێدایە کەسـەکە نوێژەکـەی بەتـەنها ئـەنجام دابێـت، نـەك بـە جەماعـەت، چـونکە نوێـژی جەماعەت بە کاتی خۆی پێش خۆرئاوابوونـە بـە ماوەیـەکی زۆر، مەگـەر زەروورەتێـك بـۆ خەڵکەکە هاتبێتە پێش و نوێژی عەصریان دواخستبێت تا نزیکبوونەوە لە خۆرئاوابوون-و.

**١٠٥١**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الجُمُعَةِ أَوْ غَيْرِهَا، فَقَدْ تَمَّتْ صَلاَتُهُ**). [ن٥٥٦/ جه١١٢٣]

* صحيح.

**لە ئیبن عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس فریای رکاتێك لە جومعە یان هەر نوێژێکی تر بکەوێت نوێژەکەی تێر و تەواو بووە).**

**١٠٥٢**– عَنْ مَالِك، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ أَدْرَكَ مِنْ صَلاَةِ الجُمُعَةِ رَكْعَةً؛ فَلْيُصَلِّ إِلَيْهَا أُخْرَى. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَهِيَ السُّنَّةُ. [ط٢٣٨]

**لە مالیکەوە، لە ئیبن شیهابەوە، ئەو دەیوت: هەر کەس لە نوێژی جومعە فریای رکاتێك بکەوێت با رکاتەکەی تریش بخاتە سەری، ئیبن شیهاب وتی: ئەوە سوننەتە.**

## ١١- دەروازەی: ئەو کاتانەی نەهی کراوە نوێژیان تێدا بکرێت

**١٠٥٣**– (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**لاَ صَلاَةَ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ، وَلاَ صَلاَةَ بَعْدَ العَصْرِ حَتَّى تَغِيبَ الشَّمْسُ**).

[خ٥٨٦/ م٨٢٧]

**(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (لە دوای نوێژی بەیانی نوێژ نییە تا خۆر بەرزدەبێتەوە، لە دوای نوێژی عەصریش نوێژ نییە تا خۆر ئاوا دەبێت).**

**١٠٥٤**– (م) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الجُهَنِيِّ قَالَ: ثَلاَثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ، أَوْ أَنْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ الشَّمْسُ، وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ. [م٨٣١]

(م) لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنییەوە، وتی: سێ کات پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی لێکردین نوێژیان تێدا بکەین، یان مردووەکانی تێدا بنێژین: کاتێك خۆر هەڵدێت و دەردەکەوێت تا بەرز دەبێتەوە، کاتێك سێبەری وەستاوی نیوەڕۆ دەوەستێت تا خۆر لادەدات، کاتێکیش خۆر لاردەبێتەوە بۆ ئاوابوون تا بزر دەبێت.

## ١٢- پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" لە دوای عەصر دوو رکاتی ئەنجام دەدا

١٠٥٥- (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: رَكْعَتَانِ، لَمْ يَكُنْ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يَدَعُهُمَا سِرًّا وَلاَ عَلاَنِيَةً: رَكْعَتَانِ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَرَكْعَتَانِ بَعْدَ العَصْرِ. [خ٥٩٢ (٥٩٠)/ م٨٣٥]

(ق) لە عائیشەوە، وتی: دوو رکات نوێژ، پێغەمبەری خودا(ﷺ)–نە بە نهێنی و نە بە ئاشکرا– وازیلێنەدەهێنان، دوو رکات پێش نوێژ بەیانی و دوو رکات دوای نوێژی عەصر[(١)].

- وفي رواية لمسلم: عن أَبِي سَلَمَةَ: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ عَنِ السَّجْدَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يِصَلِّيهِمَا بَعْدَ العَصْرِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّيهِمَا قَبْلَ العَصْرِ، ثُمَّ إِنَّهُ شُغِلَ عَنْهُمَا أَوْ نَسِيَهُمَا، فَصَلاَّهُمَا بَعْدَ العَصْرِ، ثُمَّ أَثْبَتَهُمَا، وَكَانَ إِذَا صَلَّى صَلاَةً أَثْبَتَهَا.

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: لە ئەبی سەلەمەوە: ئەو پرسیاری لە عائیشە کرد دەربارەی دوو سوژدەکە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە دوای عەصر ئەنجامی دەدان؟ وتی: بەر لە عەصر ئەو دوانەی ئەنجام دەدا، پاشان سەرقاڵ بوو لە ئەنجامدانی ئەو دوانە یان لە بیری کردن، بۆیە دوای عەصر ئەنجامیدان، ئەو کە نوێژێکی ئەنجام دەدا جێگیری دەکرد.

---

(١) واتە: ئەم نوێژە تایبەت بووە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، بۆ موسڵمان ئەسڵ پابەندبوونە بە نەهییەکەی پێغەمبەری خوداوە لە ئەنجام نەدانی نوێژ دوای نوێژی عەصر، ئەوەش هەڵدەگرێت قەزای دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی عەصری کردبێتەوە–و.

## ١٣- دەروازەی: قەزاکردنەوەی نوێژی فەوتاو

**١٠٥٦-** (ق) عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ نَسِيَ صَلاَةً، **فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهَا، لاَ كَفَّارَةَ لَهَا إِلاَّ ذَلِكَ**: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾ [طه:١٤]). [خ٥٩٧/ م٦٨٤]

**(ق) لە ئەنەسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس نوێژێکی لەبیرکرد گەر بیری کەوتەوە با ئەنجامی بدات، کەفارەتەکەی تەنها ئەوەیە: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾[طه:١٤]).**

- وفي رواية لمسلم: (.. أو نامَ عنها..).

**لە ریوایەتێکی موسلیمدا: (..یان خەوی لێکەوت لە نوێژەکە).**

**١٠٥٧-** عَنْ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، فَنَامَ عَنِ الصُّبْحِ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَاسْتَيْقَظَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**تَنَحَّوْا عَنْ هَذَا المَكَانِ**)، قَالَ: ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَأَذَّنَ، ثُمَّ تَوَضَّؤوا، وَصَلَّوْا رَكْعَتَيْ الفَجْرِ، ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَأَقَامَ الصَّلاَةَ، فَصَلَّى بِهِمْ صَلاَةَ الصُّبْحِ. [د٤٤٤]

* صحيح.

**لە عەمری کوڕی ئومەیەی زەمرییەوە، وتی: لە یەکێك لە سەفەرەکانی لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، لە نوێژی بەیانی خەوی لێکەوت تا خۆر هەڵهات، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەئاگاهات و فەرمووی: (لەم شوێنە کەنار بگرن)، وتی: پاشان فەرمانی بە بیلال کرد بانگی دا، پاشان دەستنوێژیان گرت و دوو رکاتە سوننەتەکەی بەیانییان ئەنجامدا و فەرمانی بە بیلال کرد و قامەتی بۆ نوێژ کرد و نوێژی بەیانیان ئەنجام دا.**

## ١٤- دەروازەی: فەزڵی نوێژ لە کاتی خۆیدا

**١٠٥٨-** (ق) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: سَأَلتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم: أَيُّ العَمَلِ أَحَبُّ إِلَى الله؟ قَالَ: (**الصَّلاَةُ عَلَى وَقْتِهَا**)، قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: (**ثُمَّ بِرُّ الوَالِدَيْنِ**)، قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: (**الجِهَادُ فِي سَبِيلِ الله**)، قَالَ: حدَّثَنِي بِهِنَّ، وَلَوِ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي. [خ٥٢٧/ م٨٥]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پرسیارم لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد: چ کارێك لای خودا خۆشەویستترینە؟ فەرمووی: **(نوێژ لەسەر کاتی خۆی)**، وتی: پاشان چ کارێکی تر؟ فەرمووی: **(پاشان چاکە لەگەڵ دایك و باوك)**، وتی: پاشان چ کارێکی تر؟ فەرمووی: **(جیهاد لە ڕێگەی خودا)**، وتی: بەو پرسیارانە ئەوانەی بۆ باس کردم، گەر پرسیاری زیاترم بکردبایە بۆی زیاد دەکردم.

**١٠٥٩-** (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(كَيْفَ أَنْتَ إِذَا كَانَتْ عَلَيْكَ أُمَرَاءُ يُؤَخِّرُونَ الصَّلاَةَ عَنْ وَقْتِهَا، أَوْ يُمِيتُونَ الصَّلاَةَ عَنْ وَقْتِهَا)** ؟ قَالَ: قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: (صَلِّ الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكْتَهَا مَعَهُمْ فَصَلِّ، فَإِنَّهَا لَكَ نَافِلَةٌ). [م٦٤٨]

(م) لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: **(تۆ دەبێ چۆن بیت گەر کۆمەڵێك فەرمانڕەوات لەسەر بێت نوێژ لە کاتی خۆی دوابخەن، یان نوێژ لە کاتی خۆی دەمرێنن؟)**، وتی: وتم: فەرمانم بە چی پێ دەکەی؟ فەرمووی: **(نوێژ لە کاتی خۆیدا بکە، گەر لەگەڵ ئەوانیش پیاگەیشتی نوێژەکە بکەرەوە، بۆ تۆ دەبێتە نافیلە)**.

**١٠٦٠-** عَنْ أُمِّ فَرْوَةَ قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (الصَّلاَةُ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا). [د٤٢٦/ ت١٧٠]

* صحيح.

لە ئوم فەروەوە، وتی: پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا: چ کارێك باشترینە؟ فەرمووی: **(نوێژ لە کاتی سەرەتایەوە)**.

## ١٥- دەروازەی: قسەکردن لە دوای نوێژی عیشا

**١٠٦١-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَسْمُرُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ فِي الأَمْرِ مِنْ أَمْرِ المسْلِمِينَ، وَأَنَا مَعَهُمَا. [ت١٦٩]

* صحيح.

لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵ ئەبوبەکر دەربارەی کاروبارێك لە کاروباری موسڵمانان بە شەو قسەیان دەکرد و من لەگەڵیان بووم.

۱۰٦۲– عَنْ عَـائِشَةَ قَـالَتْ: مَـا نَـامَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم قَبْلَ العِشَـاءِ، وَلاَ سَمَرَ بَعْدَهَا. [جه۷۰۲]

* صحيح.

لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەر لە عیشا نەخەوتووە و دوای عیشا قسەی نەکردووە[۱].

۱۰٦۳– عَنْ عُرْوَةَ قَالَ: سَمِعَتْنِي عَائِشَةُ وَأَنَا أَتَكَلَّمُ بَعْدَ العِشَـاءِ الآخِرَةِ فَقَالَتْ: يَا عُرَيَّ، أَلا تُرِيحُ كَاتِبَكَ؟ فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَمْ يَكُنْ يَنَامُ قَبْلَهَا وَلا يَتَحَدَّثُ بَعْدَهَا.

[حب٥٥٤٧]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

لە عوروەوە، وتی: لە دوای عیشا قسەم دەکرد عائیشە ئامۆژگاری کردم و وتی: ئەی عورەییە، ئایا نووسەرەکەت[۲] ئاسوودە ناکەی؟ چونکە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەر لە عیشا نەدەخەوت و دوای عیشا قسەی نەدەکرد.

---

[۱] واتە: هەڵگرتنی بەرهەڵستکاری نێوان فەرموودەی (۱۰٦۱) و (۱۰٦۲) بەم جۆرەیە: زەروورەت بوونی نەبووبێت پێغەمبەر(ﷺ) لەدوای نوێژی عیشا قسەی نەکردووە، بەڵام گەر زەروورەتێك هاتە پێشەوە و پێویستی بە قسەکردن بوو قسەی تێدا دەکرێت، وەك قسەکردنەکەی پێغەمبەر و ئەبوبەکر لەدوای نوێژی عیشا–و.

[۲] نووسەرەکەت: واتە فریشتەی نووسینی قسە و کردارەکان، ئاماژەی تێدایە بۆ ئایەتی: ﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ [ق: ۱۸] –و.

## ١٦- دەروازەی: بەدوای یەکتردا هاتنی نوێژەکان

١٠٦٤- عَنْ مَالِك، عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ الله بْنَ عُمَرَ كَانَ يَقُولُ: مَنْ نَسِيَ صَلاَةً، فَلَمْ يَذْكُرْهَا إِلاَّ وَهُوَ مَعَ الإِمَامِ، فَإِذَا سَلَّمَ الإِمَامُ؛ فَلْيُصَلِّ الصَّلاَةَ الَّتِي نَسِيَ، ثُمَّ لِيُصَلِّ بَعْدَهَا الأُخْرَى.

[ط٤٠٨]

* إسناده صحيح.

**لە مالیکەوە، لە نافیعەوە: عەبدوڵای کوڕی عومەر دەیوت: هەر کەس نوێژێکی لەبیر کرد و کاتێك بیری کەوتەوە لەگەڵ ئیمام بوو[1]، کە ئیمامەکە سەلامی دایەوە با ئەو نوێژە ئەنجام بدات لەبیری کردووە، پاشان بە دوایدا نوێژەکەی تر[2] بکاتەوە.**

[1] واتە: لەگەڵ ئیمام نوێژی دەکرد-و.

[2] واتە: ئەو نوێژەی لەگەڵ ئیمامەکە کردی، بۆئەوەی ڕێکخستن و بەدوای یەکترداهاتن تێکنەچێت-و.

## ١- دەروازەی: یەکەمین مزگەوت لە زەویدا

١٠٦٥- (ق) عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله، أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الأَرْضِ أَوَّلُ؟ قَالَ: (المَسْجِدُ الحَرَامُ)، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: (المَسْجِدُ الأَقْصَى)، قُلْتُ: كَمْ كَانَ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: (أَرْبَعُونَ سَنَةً، ثُمَّ أَيْنَمَا أَدْرَكَتْكَ الصَّلاَةُ بَعْدُ فَصَلِّهْ، فَإِنَّ الفَضْلَ فِيهِ). [خ٣٣٦٦/ م٥٢٠]

(ق) لە ئەبی زەڕەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، کام مزگەوت یەکەمجار لە زەویدا دانرا؟ فەرمووی: **(مەسجیدولحەرام)**، وتی: وتم: پاشان کام مزگەوت؟ فەرمووی: **(مەسجیدولئەقصا)**، وتی: وتم: ماوەی نێوانیان چەند بوو؟ فەرمووی: **(چل ساڵ، پاشان لە هەر کوێ نوێژت بۆ هاتە بەرەوە ئەنجامی بدە، چونکە فەزڵ لەناو ئەوەدایە).**

## ٢- دەروازەی: زەوی مزگەوتە و پاکبوونەوە

١٠٦٦- (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أُعْطِيتُ خَمْساً لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِداً وَطَهُوراً، فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلاَةُ؛ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِيَ المَغَانِمُ، وَلَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً). [خ٣٣٥/ م٥٢١]

(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(پێنج شتم پێدراون، بە هیچ کەسی پێش من نەدراون: مانگە ڕێیەك بە ترس سەرخراوم، زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت و پاککەرەوە[١]، هەر پیاوێك لە ئومەتەکەم نوێژی پێگەیشت با نوێژ بکات، غەنیمەتم بۆ حەڵاڵ بووە و بۆ هیچ کەسی پێش من حەڵاڵ نەبووە، شافاعەتم**

---

[١] واتە: پاککەرەوە لە بێ دەستنوێژی و لەشگرانی بە تەیموم کردن، هەروەها پاککردنەوەی نەعل و پێڵاو لە پیسی بە خۆڵ و خاك-و.

**پێدراوە، پێغەمبەر تایبەت بە هۆزەکەی(گەلەکەی) رەوانە دەکرا، من بۆ هەموو خەڵکی رەوانە کراوم).**

**١٠٦٧**– (م) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**فُضِّلْنَا عَلَى النَّاسِ بِثَلاَثٍ: جُعِلَتْ صُفُوفُنَا كَصُفُوفِ المَلاَئِكَةِ، وَجُعِلَتْ لَنَا الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِداً، وَجُعِلَتْ تُرْبَتُهَا لَنَا طَهُوراً، إِذَا لَمْ نَجِدِ المَاءَ**). وَذَكَرَ خَصْلَةً أُخْرَى. [م٥٢٢]

**(م) لە حوزەیفەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بە سێ شت فەزڵی ئێمە بەسەر خەڵکیدا دراوە: ریزەکانی ئێمە کراوە بە ریزی فریشتەکان، هەموو زەویمان بۆ کراوە بۆ مزگەوت، و خۆڵەکەی بۆ ئێمە پاککەرەوەیە گەر ئاومان نەبینییەوە)، خەسڵەتێکی تری باس کرد.**

## ٣- دەروازەی: بینای مزگەوتی شەرفمەندی پێغەمبەر

**١٠٦٨**– (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم المدِينَةَ، فَنَزَلَ أَعْلَى المدِينَةِ فِي حَيٍّ يُقَالُ لَهُمْ بَنُو عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَأَقَامَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِيهِمْ أَرْبَعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى بَنِي النَّجَّارِ، فَجَاؤوا مُتَقَلِّدِي السُّيُوفِ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَأَبُو بَكْرٍ رِدْفُهُ، وَمَلأُ بَنِي النَّجَّارِ حَوْلَهُ، حَتَّى أَلقَى بِفِنَاءِ أَبِي أَيُّوبَ، وَكَانَ يُحِبُّ أَنْ يُصَلِّي حَيْثُ أَدْرَكَتْهُ الصَّلاَةُ، وَيُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ، وَأَنَّهُ أَمَرَ بِبِنَاءِ المسْجِدِ، فَأَرْسَلَ إِلَى مَلَأٍ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ، فَقَالَ: (**يَا بَنِي النَّجَّارِ، ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ هَذَا**)، قَالُوا: لاَ وَالله لاَ نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلاَّ إِلَى الله. فَقَالَ أَنَسٌ: فَكَانَ فِيهِ مَا أَقُولُ لَكُمْ: قُبُورُ المشْرِكِينَ، وَفِيهِ خَرِبٌ، وَفِيهِ نَخْلٌ. فَأَمَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِقُبُورِ المشْرِكِينَ فَنُبِشَتْ، ثُمَّ بِالخَرِبِ فَسُوِّيَتْ، وَبِالنَّخْلِ فَقُطِعَ، فَصَفُّوا النَّخْلَ قِبْلَةَ المسْجِدِ، وَجَعَلُوا عِضَادَتَيْهِ الحِجَارَةَ، وَجَعَلُوا يَنْقُلُونَ الصَّخْرَ وَهُمْ يَرْتَجِزُونَ، وَالنَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مَعَهُمْ، وَهُوَ يَقُولُ:

**اللَّهُمَّ لاَ خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُ الآخِرَهْ فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ**

[خ٤٢٨ (٢٣٤)/ م٥٢٤]

(ق) لە لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ مەدینە، لە گەڕەکێکی سەرەوەی مەدینە دابەزی پێیان دەوترێ بەنی عەمری کوڕی عەوف، پێغەمبەر(ﷺ) چواردە شەو لە ناویاندا بوو، پاشان ناردی بەدوای بەنی نەجاڕدا، هاتن و شمشێریان لە شان نابوو، وەك ئەوەی تەماشای پێغەمبەر(ﷺ) بکەم لەسەر وڵاخی سوارییەکەی و ئەبوبەکر لە پاشکۆیدا بوو و کۆمەڵی بەنی نەجاڕ بە دەوریدا بوون، تا لە بەردەم ماڵی ئەبو ئەیوب دابەزی، ئەو پێیخۆش بوو لە کوێ نوێژی بۆ هاتە بەرەوە نوێژ بکات، لە پەچەی[1] رانەمەڕدا نوێژی دەکرد، ئەو فەرمانی کرد بە دروستکردنی مزگەوت، ناردی بە دوای کۆمەڵێك لە بەنی نەجار و فەرمووی: **(لەگەڵم بڕیاری نرخی ئەم زەوییە بدەن و پێم بفرۆشن)**، وتیان سوێند بە خودا، تەنها لە خودا داوای نرخەکەی دەکەین، ئەنەس وتی: ئەمەی پێتان دەڵێم لەو زەوییەدا هەبوو: گۆڕی هاوەڵدانەران، و کەلاوەیەك و دارخورمایەك، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد گۆڕی هاوەڵدانەران هەڵدرانەوە و کەلاوەکە تەخت کرا و دارخورماکە بڕا، دارخورمایان لە رووی قیبلەی مزگەوتەکەوە ریز کرد، دوو لاکەیان بە بەرد هەڵچنی، ئەوان بەردیان دەگواستەوە و هۆنراوە و ئاوازیان دەوتەوە و پێغەمبەریش(ﷺ) لەگەڵیان، ئەو دەیفەرموو:

**أللهم لا خير إلا خير الآخرة فاغفر للأنصار والمهاجرة**

**(خودایە جگە لە خێری دواڕۆژ خێر بوونی نییە، لە ئەنصار و کۆچکەران خۆشببە).**

**١٠٦٩**– (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم إِلَى فُلاَنَةَ ـ امْرَأَةٍ قَدْ سَمَّاهَا سَهْلٌ ـ: **(أَنْ مُرِي غُلاَمَكِ النَّجَّارَ، يَعْمَلُ لِي أَعْوَاداً، أَجْلِسُ عَلَيْهِنَّ إِذَا كَلَّمْتُ النَّاسَ)**، فَأَمَرَتْهُ يَعْمَلُهَا مِنْ طَرْفَاءِ الغَابَةِ، ثُمَّ جَاءَ بِهَا، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم بِهَا، فَأَمَرَ بِهَا فَوُضِعَتْ، فَجَلَسَ عَلَيْهِ. [خ٢٠٩٤ (٣٧٧)/ م٥٤٤]

(ق) لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناردی بۆ لای فڵان ئافرەت–ئافرەتێك سەهل ناوی هێنا–: **(فەرمان بە غوڵامە دارتاشەکەت بکە تەختێکم**

[1] پەچە: ئەو شوێنەیە رانەمەڕی تێدا مۆڵ دەدرێت–و.

**بۆ دروست بکات لەسەری دابنیشم کاتێك قسە بۆ خەڵکی دەکەم)**، فەرمانی پێکرد لە درەختی دارستان دروستی بکات، پاشان غوڵامەکە هێنای، ژنەکە غوڵامەکەی بەوەوە رەوانەی لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد، پێغەمبەر فەرمانی پێکرد و دامەزرێنرا، و پێغەمبەر لەسەری دانیشت.

**١٠٧٠-** (خ) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ أَخْبَرَهُ: أَنَّ المسْجِدَ كَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَبْنِيّاً بِاللَّبِنِ، وَسَقْفُهُ الجَرِيدُ، وَعُمُدُهُ خَشَبُ النَّخْلِ، فَلَمْ يَزِدْ فِيهِ أَبُو بَكْرٍ شَيْئاً، وَزَادَ فِيهِ عُمَرُ، وَبَنَاهُ عَلَى بُنْيَانِهِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، بِاللَّبِنِ وَالجَرِيدِ، وَأَعَادَ عُمُدَهُ خَشَباً، ثُمَّ غَيَّرَهُ عُثْمَانُ، فَزَادَ فِيهِ زِيَادَةً كَثِيرَةً، وَبَنَى جِدَارَهُ بِالحِجَارَةِ المنْقُوشَةِ وَالقَصَّةِ، وَجَعَلَ عُمُدَهُ مِنْ حِجَارَةٍ مَنْقُوشَةٍ، وَسَقَفَهُ بِالسَّاجِ. [خ٤٤٦]

**(خ) لە نافیعەوە: عەبدوڵای کوڕی عومەر هەواڵی پێدا: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) مزگەوتەکە بە خشتی قوڕ بینا کرابوو و سەقفەکەی پەلکی دارخورما بوو و کۆڵەکەکانی داری دارخورما بوون، ئەبوبەکر تیایدا شتێکی زیاد نەکرد، عومەر تیایدا زیادی کرد و لەسەر بناغەکەی خۆی لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە خشتی قوڕ و پەلکی دارخورما بینای کردەوە، کۆڵەکانی بە دار دامەزراندەوە، پاشان عوسمان گۆڕی، زیادەی زۆری تێدا ئەنجامدا و دیوارەکەی بە بەردی نەقشکراو و گەچ بینا کردەوە، کۆڵەکەکانی کرد بە بەردی نەقشکراو و سەقفەکەی بە داری ساج[1].**

## ٤- دەروازەی: ئەو مزگەوتەی لەسەر تەقوا بینا کرا

**١٠٧١-** (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي بَيْتِ بَعْضِ نِسَائِهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ المسْجِدَيْنِ الَّذِي أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى؟ قَالَ: فَأَخَذَ كَفّاً مِنْ حَصْبَاءَ فَضَرَبَ بِهِ الأَرْضَ، ثُمَّ قَالَ: (**هُوَ مَسْجِدُكُمْ هَذَا**) لِمَسْجِدِ المدِينَةِ. [م١٣٩٨]

---

(١) ساج: جۆرێك بووە لە تەختە دار لە هندستانەوە هێنراوە.

(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: لە یەکێك لە ماڵی هاوسەرەکانی چوومە ژوورەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ)، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، کام لەم دوو مزگەوتە لەسەر تەقوا بینا کراوە؟ وتی: مشتێك لە چەوی گرت بە دەستەوە و کێشای بە زەویدا، و پاشان بە مزگەوتی مەدینەی فەرموو: **(ئەوە ئەم مزگەوتەی ئێوەیە)**.

## ٥- دەروازەی: فەزڵی نێوان حوجرەکە و مینبەرەکە

**١٠٧٢-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الجَنَّةِ، وَمِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي**). [خ١١٩٦/ م١٣٩١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(لە نێوان ماڵەکەم و مینبەرەکەم باخچەیەك لە باخچەکانی بەهەشت هەیە، مینبەرەکەم لەسەر حەوزەکەمە)**.

**١٠٧٣-** عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مِنْبَرِي عَلَى تُرْعَةٍ مِنْ تُرَعِ الجَنَّةِ**) فَقُلْتُ لَهُ: مَا التُّرْعَةُ يَا أَبَا العَبَّاسِ؟ قَالَ: البَابُ.
[حم٢٢٨٤١، ٢٢٨٧٤]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

لە ئەبی حازمەوە، لە سەهلی کوڕی سەعدەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(مینبەرەکەم لەسەر "تُرْعَة"یەك لە "تُرَع"[1]ی بەهەشتە)**، پێم وت: "تُرْعَة" چییە، ئەی باوکی عەباس؟ وتی: دەروازەیە.

---

[1] "تُرَع" کۆی وشەی "تُرعَة"یە کە مانای دەروازە(قاپی) هەیە، واتە: دەروازەیەك لە دەروازەکانی بەهەشت-و.

## ٦- دەروازەی مزگەوتی قوبا

١٠٧٤- (ق) عَن ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَأْتِي مَسْجِدَ قُبَاءٍ كُلَّ سَبْتٍ، ماشِياً وَرَاكِباً. [خ١١٩٣ (١١٩١)/ م١٣٩٩]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: هەموو شەممەیەك پێغەمبەر(ﷺ) دەهات بۆ مزگەوتی قوبا، بە پیادەڕەوی و بە سواری.**

- وفي رواية عندهما: فيصلي فيه ركعتين. [خ١١٩٤]

**لە ریوایەتێك لای هەردووکیان: دوو رکات نوێژی تێدا ئەنجام دەدا.**

١٠٧٥- عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليهِ وسلّم: (مَنْ خَرَجَ حَتَّى يَأْتِيَ هَذَا المَسْجِدَ - مَسْجِدَ قُبَاءَ - فَصَلَّى فِيهِ، كَانَ لَهُ عَدْلَ عُمْرَةٍ). [ن٦٩٨]

**لە سەهلی کوڕی حونەیفەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس دەربچێت تا دێت بۆ ئەم مزگەوتە-مزگەوتی قوبا- و نوێژی تێدا بکات هاوتای عومرەیەکە بۆ ئەو).**

- وفي رواية: (مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ، ثُمَّ أَتَى مَسْجِدَ قُبَاءَ، فَصَلَّى فِيهِ صَلاَةً، كَانَ لَهُ كَأَجْرِ عُمْرَةٍ). [جه١٤١٢]

* صحيح.

**لە ریوایەتێکدا: (هەر کەس لە ماڵەوە خۆی پاك بکاتەوە، پاشان بێت بۆ مزگەوتی قوبا و نوێژێکی تێدا بکات، وەك پاداشتی عومرەیەکی بۆ هەیە).**

## ٧- دەروازەی: فەزڵی دروستکردنی مزگەوت

١٠٧٦- (ق) عَنْ عُبَيْدِ الله الخَوْلاَنِيِّ: أَنَّهُ سَمِعَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ يَقُولُ - عِنْدَ قَوْلِ النَّاسِ فِيهِ حِينَ بَنَى مَسْجِدَ الرَّسُولِ صلّى الله عليه وسلّم -: إِنَّكُمْ أَكْثَرْتُمْ، وَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه

وسلّم يَقُولُ: (مَنْ بَنَى مَسْجِداً ـ قَالَ بُكَيْرٌ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ: ـ يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ الله، بَنَى الله لَهُ مِثْلَهُ فِي الجَنَّةِ). [خ٤٥٠/ م٥٣٣]

(ق) لە عوبەیدوڵای خەولانییەوە: ئەو گوێی لە عوسمانی کوڕی عەففان بوو-کاتێك خەڵکی قسەیان دەربارە کرد، ئەو دەمەی مزگەوتەکەی پێغەمبەری بینا کردەوە- وتی: ئێوە زۆرتان وت، من گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس مزگەوتێك بینا بکات**-بوکەیر وتی: پێموایە وتی:- **بەو کارە مەبەستی ڕووی خودا بێت، خودا هاوشێوەی ئەوە لە بەهەشت بۆی دروست دەکات)**.

- وفي رواية لمسلم: أَنَّ عُثْمَانَ قَالَ ذَلِكَ عندما كَرِهَ النَّاسُ بِنَاءَ المسْجِدِ، وَأَحَبُّوا أَنْ يَدَعَهُ عَلَى هَيْئَتِهِ.

لە ڕیوایەتێکی موسلیمدا: عوسمان ئەوەی وت کاتێك خەڵکی بیناکردنەوەی مزگەوتەکەیان پێناخۆش بوو، و پێیانخۆش بوو لەسەر شێوەی خۆی وازیلێبهێنرێت.

**١٠٧٧**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ بَنَى مَسْجِداً لِلَّهِ، كَمَفْحَصِ قَطَاةٍ، أَوْ أَصْغَرَ، بَنَى الله لَهُ بَيْتاً فِي الجَنَّةِ). [جه٧٣٨]

* صحيح.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بۆ خودا مزگەوتێك بینا بکات وەك کولانەی قەتێ**[1]**، یان بچووکتر، خودا ماڵێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکات)**.

## ٨- دەروازەی: مزگەوتەکان خۆشەویستترین جێگەن لای خودا

**١٠٧٨**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أَحَبُّ البِلاَدِ إِلَى الله مَسَاجِدُهَا، وَأَبْغَضُ البِلاَدِ إِلَى الله أَسْوَاقُهَا). [م٦٧١]

---

[1] کولانەی قەتێ: ئەو شوێنەی تیایدا دەنیشێ و هێلکەی تێدا دەکات، مەبەست گەیاندنی موبالەغەیە، ئەگینا کەمترین ڕووبەری مزگەوت ئەوەیە جێگەی یەك کەسی تیا ببێتەوە.

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خۆشەویستترین جێگە لای خودا مزگەوتەکانن، خراپترین جێگە لە لای خودا بازاڕەکانن).**

## ٩- دەروازەی: سەفەر کردن تەنها بۆ سێ مزگەوتە

**١٠٧٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ: الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ صلّى الله عليه وسلّم، وَمَسْجِدِ الأَقْصَى).**

[خ١١٨٩/ م١٣٩٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(سەفەرکردن تەنها بۆ سێ مزگەوتە: مەسجیدولحەرام، و مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) و مەسجیدولئەقصا).**

**١٠٨٠-** (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هذَا، أَفْضَلُ مِنَ أَلفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ؛ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ).** [م١٣٩٥]

(م) لە ئیبن عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(نوێژێك لە مزگەوتەکەم باشترە لە هەزار نوێژ لە شوێنانی تر، جگە لە مەسجیدولحەرام).**

**١٠٨١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ اللهِ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي أَفْضَلُ مِنَ أَلفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ؛ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ، وَصَلاَةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَفْضَلُ مِنْ مِائَةِ أَلفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ).** [جه١٤٠٦]

* صحيح.

لە جابرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(نوێژێك لە مزگەوتەکەم باشترە لە هەزار نوێژ لە شوێنانی تر، جگە لە مەسجیدولحەرام، نوێژێکیش لە مەسجیدولحەرام باشترە لە سەد هەزار نوێژ لە شوێنانی تر).**

## ١٠- دەروازەی: نەهی لە دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ

١٠٨٢- (ق) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ: ذَكَرَتَا كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِالحَبَشَةِ، فِيهَا تَصَاوِيرُ، فَذَكَرَتَا لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**إِنَّ أُولئِكَ، إِذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ، بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِداً، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، فَأُولئِكَ شِرَارُ الخَلْقِ عِنْدَ الله يَوْمَ القِيَامَةِ**). [خ٤٢٧/ م٥٢٨]

(ق) لە عائیشەوە: ئوم حەبیبە و ئوم سەلەمە باسی کڵێسایەکیان کرد لە حەبەشە بینیبوویان، وێنەی تێدا بووە، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد، فەرمووی: **(ئەوانە گەر پیاوێکی صاڵحیان تێدابووایە و بمردبایە لەسەر گۆڕەکەی مزگەوتێکیان دروست دەکرد و ئەو جۆرە وێنانەیان تێدا دەکێشا، ئەوانە لە ڕۆژی قیامەت خراپترین دروستکراوی خودان).**

١٠٨٣- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**قَاتَلَ الله اليَهُودَ، اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ**). [خ٤٣٧/ م٥٣٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا یەهوود بکوژێت، گۆڕی پێغەمبەرانیان کرد بە مزگەوت).**

## ١١- دەروازەی: مزگەوت لە ماڵدا

١٠٨٤- (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ. وَكَانَ ضَخْماً. لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: إِنِّي لاَ أَسْتَطِيعُ الصَّلاَةَ مَعَكَ، فَصَنَعَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم طَعَاماً، فَدَعَاهُ إِلَى بَيْتِهِ، وَنَضَحَ لَهُ طَرَفَ حَصِيرٍ بِمَاءٍ، فَصَلَّى عَلَيْهِ رَكْعَتَيْنِ. [خ١١٧٩ (٦٧٠)]

(خ) لە ئەنەسی کوڕی مالیکی ئەنصارییەوە، وتی: پیاوێك لە ئەنصار-کە پیاوێکی جەستە گەورە بوو- وتی بە پێغەمبەر(ﷺ): من ناتوانم نوێژ لەگەڵ تۆ بکەم، خواردنی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دروستکرد و بانگی کرد بۆ ماڵەکەی، بە ئاو لا حەسیرێکی بۆ تەڕ کرد و دوو رکات نوێژی لەسەر کرد.

**١٠٨٥**– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أَمَرَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم بِبِنَاءِ المسَاجِدِ فِي الدُّورِ، وَأَنْ تُنَظَّفَ وَتُطَيَّبَ. [د٤٥٥/ ت٥٩٤/ جه٧٥٨، ٧٥٩]

* صحيح.

**لە عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی کرد بە دروستکردنی مزگەوت لە ماڵەکان، هەروەها پاکبکرێنەوە و بۆنی خۆشیان لێ بدرێت.**

**١٠٨٦**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ أَرْسَلَ إِلَى رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم: أَنْ تَعَالَ فَخُطَّ لِي مَسْجِداً فِي دَارِي أُصَلِّي فِيهِ، وَذَلِكَ بَعْدَ مَا عَمِيَ، فَجَاءَ فَفَعَلَ. [جه٧٥٥]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە: پیاوێك لە ئەنصار ناردی لەدووی پێغەمبەری خودا(ﷺ): وەرە و مزگەوتێکم لە ماڵەکەم بۆ دیاری بکە تیایدا نوێژ بکەم، ئەوەش دوای ئەوەی نابینا بوو، ئەویش هات و ئەو کارەی کرد.**

## ١٢- دەروازەی: تەحیەتولمەسجید

**١٠٨٧**– (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ السَّلَمِيِّ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ؛ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ)**. [خ٤٤٤/ م٧١٤]

**(ق) لە ئەبی قەتادەی سەلەمییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە چووە ناو مزگەوتەوە با دوو رکات نوێژ بکات بەرلەوەی دابنیشێت).**

## ١٣- دەروازەی: فەزڵی دانیشتن لە مزگەوت

**١٠٨٨**– (م) عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ قَالَ: قُلْتُ لِجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: أَكُنْتَ تُجَالِسُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَ: نَعَمْ كَثِيراً، كَانَ لاَ يَقُومُ مِنْ مُصَلاَّهُ الَّذِي يُصَلِّي فِيهِ الصُّبْحَ أَوِ الغَدَاةَ

حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَإِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ قَامَ، وَكَانُوا يَتَحَدَّثُونَ، فَيَأْخُذُونَ فِي أَمْرِ الجَاهِلِيَّةِ، فَيَضْحَكُونَ، وَيَتَبَسَّمُ. [م٦٧٠]

**(م) لە سەماکی کوڕی حەربەوە، وتی: بە جابری کوڕی سەمورەم وت: ئایا لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دادەنیشتی؟ وتی: بەڵێ، زۆر، ئەو نوێژی بەیانی یان بەیانیان لە شوێنی نوێژەکەی–کە نوێژی تێدا دەکرد– هەڵنەدەستا تا خۆر هەڵدەهات، گەر خۆر هەڵبهاتبایە هەڵدەستا، ئەوان قسەیان دەکرد، و باسی کاروباری سەردەمی نەفامیان دەکرد و پێدەکەنین، و ئەویش خەندەی دەکرد.**

**١٠٨٩–** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ صَلَّى الغَدَاةَ فِي جَمَاعَةٍ، ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ)**، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(تَامَّةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ)**. [ت٥٨٦]

* حسن.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس نوێژی بەیانی بە جەماعەت بکات، پاشان دابنیشێت یادی خودا بکات تا خۆر هەڵدێت، پاشان دوو رکات بکات وەك پاداشتی حەج و عومرەیەکە بۆی)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (تامة تامة تامة–تێر و تەواو، تێر و تەواو، تێر و تەواو).**

**١٠٩٠–** عَنْ سَهْلٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(مَنْ كَانَ فِي المَسْجِدِ يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ، فَهُوَ فِي الصَّلاَةِ)**. [ن٧٣٣]

* صحيح.

**لە سەهلی ساعیدییەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەر کەس لە مزگەوت چاوەڕوانی نوێژ بکات ئەو لە نوێژدایە).**

**١٠٩١–** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم المَغْرِبَ، فَرَجَعَ مَنْ رَجَعَ، وَعَقَّبَ مَنْ عَقَّبَ، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مُسْرِعاً، قَدْ حَفَزَهُ

النَّفَسُ، وَقَدْ حَسَرَ عَنْ رُكْبَتَيْهِ، فَقَالَ: (أَبْشِرُوا، هَذَا رَبُّكُمْ قَدْ فَتَحَ بَاباً مِنْ أَبْوَابِ السَّمَاءِ، يُبَاهِي بِكُمُ المَلاَئِكَةَ، يَقُولُ: انْظُرُوا إِلَى عِبَادِي قَدْ قَضَوْا فَرِيضَةً، وَهُمْ يَنْتَظِرُونَ أُخْرَى). [جه۸۰۱]

* صحيح.

[وانظر: ۳۳۳۰ (ورجل قلبه معلق بالمسجد).

وانظر: ۱۱٤۲ في انتظار الصلاة].

لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی مەغریبمان كرد، ئەوەی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە گەڕایەوە و ئەوەی مایەوە مایەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پەلە هاتەوە، هەناسەی خێرا بووبوو و دوو ئەژنۆی خۆی دەرخستبوو، و فەرمووی: **(مژدەتان لێ بێت، ئەوە پەروەردگاری ئێوەیە دەرگایەك لە دەرگاكانی ئاسمانی كردەوە، شانازی دەكات بە ئێوەوە لای فریشتەكان، و دەفەرموێت: تەماشای بەندەكانم بكەن فەرزێكیان جێبەجێ كردووە و ئەوان چاوەڕوانی فەرزێكی ترن[1])**.

## ١٤- دەروازەی: پاككردنەوەی مزگەوت

١٠٩٢- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَبَالَ فِي المَسْجِدِ، فَتَنَاوَلَهُ النَّاسُ، فَقَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (دَعُوهُ، وَهَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ مَاءٍ . أَوْ ذَنُوباً مِنْ مَاءٍ . فَإِنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ، وَلَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ). [خ۲۲۰]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: ئەعرابییەك هەستا و لە مزگەوتەكە میزی كرد، خەڵكی لێیهاتنە دەنگ، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون: **(لێیبگەڕێن، دۆڵچەیەك یان سەتڵێك ئاو بكەن بەسەر میزەكەیدا، ئێوە وەك ئاسانكار رەوانە كراون، وەك گرانكار رەوانە نەكراون)**.

---

[1] واتە فەرزی مەغریبیان ئەنجامداوە و چاوەڕوانی فەرزی عیشان–و.

**١٠٩٣**– (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ فِي المسْجِدِ مَعَ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم إِذْ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ، فَقَامَ يَبُولُ فِي المسْجِدِ، فَقَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم: مَهْ مَهْ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تُزْرِمُوهُ، دَعُوهُ)**، فَتَرَكُوهُ حَتَّى بَالَ. ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم دَعَاهُ، فَقَالَ لَهُ: **(إِنَّ هَذِهِ المَسَاجِدَ لاَ تَصْلُحُ لِشَيْءٍ مِنْ هَذَا البَوْلِ وَلاَ القَذَرِ، إِنَّمَا هِيَ لِذِكْرِ الله عزّ وجل، وَالصَّلاَةِ، وَقِرَاءَةِ القُرْآنِ)**، أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم. قَالَ: فَأَمَرَ رَجُلاً مِنَ القَوْمِ، فَجَاءَ بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ، فَشَنَّهُ عَلَيْهِ. [م٢٨٥]

**(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: ئێمە لە مزگەوت بووین لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ئەعرابییەك هات و هەستا و لە مزگەوتەکە میزی کرد، هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتیان: نەکەی، نەکەی، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (میزەکەی پێ مەبڕن، لێیگەڕێن)، بۆیە وازیان لێ هێنا تا میزەکەی کرد، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگی کرد و پێی فەرموو: (ئەم مزگەوتانە بۆ شتێك لەم میز و پیسییە گونجاو نین، بەڵکو بۆ یادی خودا(عز وجل) و نوێژ و خوێندنی قورئانن)، یان بەو جۆرەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی، وتی: پێغەمبەر فەرمانی کرد بە پیاوێك لە خەڵکەکە دۆڵچەیەك ئاوی هێنا و پرژاندی بە سەریدا.**

**١٠٩٤**– عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَعْقِلِ بْنِ مُقَرِّنٍ قَالَ: صَلَّى أَعْرَابِيٌّ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، بِهَذِهِ القِصَّةِ. قصة حديث أبي هريرة عند أبي داود. وَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(خُذُوا مَا بَالَ عَلَيْهِ مِنَ التُّرَابِ، فَأَلْقُوهُ، وَأَهْرِيقُوا عَلَى مَكَانِهِ مَاءً)**. [د٣٨١]

* مرسل.

**لە عەبدوڵای کوڕی مەعقیلی کوڕی موقەڕینەوە، وتی: ئەعرابییەك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کرد، بەم چیرۆکە –چیرۆکەکەی ئەبی هورەیرەرە لای ئەبی داود– پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەو خاکەی میزی بەسەردا کردووە بگرن و فڕێی بدەن، ئاو بڕێژن بە شوێنەکەیدا).**

## ١٥- دەروازەی: پاکوخاوێنی مزگەوت

١٩٠٥- (ق) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَأَى نُخَامَةً فِي القِبْلَةِ، فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِ، حَتَّى رُؤِيَ فِي وَجْهِهِ، فَقَامَ فَحَكَّهُ بِيَدِهِ، فَقَالَ: (إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ فِي صَلاَتِهِ، فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ. أَوْ إِنَّ رَبَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ القِبْلَةِ. فَلاَ يَبْزُقَنَّ أَحَدُكُمْ قِبَلَ قِبْلَتِهِ، وَلكِنْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمَيْهِ)، ثُمَّ أَخَذَ طَرَفَ رِدَائِهِ، فَبَصَقَ فِيهِ، ثُمَّ رَدَّ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ، فَقَالَ: (أَوْ يَفْعَلُ هكَذَا).
[خ٤٠٥ (٢٤١)/ م٥٥١]

(ق) لە ئەنەسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) چڵم و بەڵغەمی لە ئاراستەی قیبلەوە بینی، ئەوە لەسەری گران بوو، تا لە روخساری بینرا، هەستا و بە دەستی خۆی کرِاندی و فەرمووی: **(یەکێك لە ئێوە گەر لە نوێژەکەیدا وەستا ئەو ئاخافتنی پەروەردگاری دەکات-یان پەروەردگاری لە نێوان ئەو و قیبلەدایە- بۆیە یەکێك لە ئێوە روو بە قیبلە تف هەڵنەدات، بەڵام لە چەپییەوە، یان لە ژێر دوو پێی)**، پاشان سوچێکی کراسەکەی خۆی گرت تفی تێکرد و هەندێکی هێنا بەسەر هەندێکیدا[1]، و فەرمووی: **(یان بەم جۆرە بکات)**.

١٠٩٦- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (البُزَاقُ فِي المَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا). [خ٤١٥/ م٥٥٢]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(تفکردنەوە لە مزگەوت گوناهە، کەفارەتەکەی شاردنەوەیەتی)**.

١٠٩٧- (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (عُرِضَتْ عَلَيَّ أَعْمَالُ أُمَّتِي حَسَنُهَا وَسَيِّئُهَا، فَوَجَدْتُ فِي مَحَاسِنِ أَعْمَالِهَا: الأَذَى يُمَاطُ عَنِ الطَّرِيقِ، وَوَجَدْتُ فِي مَسَاوِئِ أَعْمَالِهَا: النُّخَاعَةَ تَكُونُ فِي المَسْجِدِ لاَ تُدْفَنُ). [م٥٥٣]

---

[1] واتە: پێچایەوە-و.

(م) لە ئەبی زەڕەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(کاری ئومەتەکەم بە چاك و خراپییەوە بۆم خرایە روو، بینیم لە کارە چاکەکانی: پیسی و ئازار لابدرێت لە رێگە، هەروەها بینیم لە کارە خراپەکانی: چڵم و بەڵغەم لە مزگەوت بێت و نەشاررێتەوە)**.

١٠٩٨– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: رَأَى رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ المسْجِدِ، فَغَضِبَ حَتَّى احْمَرَّ وَجْهُهُ، فَقَامَتِ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَحَكَّتْهَا، وَجَعَلَتْ مَكَانَهَا خَلُوقاً، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(مَا أَحْسَنَ هَذَا)**. [ن٧٢٧/ جه٧٦٢]

* صحيح.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) چڵم و بەڵغەمی لە ئاراستەی قیبلەوە بینی، تووڕە بوو تا روخساری سوور هەڵگەڕا، ئافرەتێك لە ئەنصار هەستا و کڕاندی و بۆنی خۆشی بە جێگەکەیدا کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە چەند چاکە!).**

## ١٦– دەروازەی: خزمەتی مزگەوت

١٠٩٩– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ أَسْوَدَ ـ رَجُلاً أَوِ امْرَأَةً ـ كَانَ يَقُمُّ المسْجِدَ، فَمَاتَ، وَلَمْ يَعْلَمِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِمَوْتِهِ، فَذَكَرَهُ ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: **(مَا فَعَلَ ذلِكَ الإِنْسَانُ)**؟ قَالُوا: مَاتَ يَا رَسُولَ الله! قَالَ: **(أَفَلاَ آذَنْتُمُونِي)**؟ فَقَالُوا: إِنَّهُ كَانَ كَذَا وَكَذَا ـ قِصَّتُهُ ـ قَالَ: فَحَقَرُوا شَأْنَهُ، قَالَ: **(فَدُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ)**، فَأَتَى قَبْرَهُ، فَصَلَّى عَلَيْهِ. [خ١٣٣٧ (٤٥٨)/ م٩٥٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، رەشپێستێك–پیاو یان ژن– مزگەوتی گسك دەدا، ئەو مرد، پێغەمبەر(ﷺ) بە مردنەکەی نەزانی، رۆژێك باسی کرد و فەرمووی: **(ئەو مرۆڤە چی لێهات؟)**، وتیان: مرد، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(بۆچی ئاگادارتان نەکردم؟)**، وتیان: ئەو ئاوا و ئاوا بوو–چیرۆکەکەی– وتی: شانوشکۆیان کەمبایەخ کرد، پێغەمبەر فەرمووی: **(گۆڕەکەیم پێ نیشان بدەن)**، هات بۆ سەر گۆڕەکەی و نوێژی لەسەر کرد.

■ وفي رواية مسلم: ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ هَذِهِ القُبُورَ مَمْلُوءَةٌ ظُلْمَةً عَلَى أَهْلِهَا، وَإِنَّ الله عزّ وجل يُنَوِّرُهَا لَهُمْ بِصَلاَتِي عَلَيْهِمْ).

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: پاشان فەرمووی: **(ئەم گۆڕانە بە تاریکی خاوەنەکانیان پڕن، خودا(عز وجل) بە نوێژی من لە سەریان ڕۆشنیان دەکاتەوە).**

## ١٧- دەروازەی: بەرزکردنەوەی دەنگ لە مزگەوت

١١٠٠- (خ) عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: كُنْتُ قَائِماً فِي المسْجِدِ، فَحَصَبَنِي رَجُلٌ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، فَقَالَ: اذْهَبْ فَأْتِنِي بِهَذَيْنِ، فَجِئْتُهُ بِهِمَا، قَالَ: مَنْ أَنْتُمَا . أَوْ مَنْ أَيْنَ أَنْتمَا.؟ قَالا: مِنْ أَهْلِ الطَّائِفِ، قَالَ: لَوْ كُنْتُمَا مِنْ أَهْلِ البَلَدِ لأَوْجَعْتُكُمَا، تَرْفَعَانِ أَصْوَاتَكُمَا فِي مَسْجِدِ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم! [خ٤٧٠]

**(خ) لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە، وتی: لە مزگەوت بە پێوە وەستابووم، پیاوێك چەوی بۆ هەڵدام، وردبوومەوە و بینیم عومەری کوڕی خەتابە، وتی: بڕۆ ئەو دوانەم بۆ بهێنە، منیش هەردووکیانم هێنا، عومەر وتی: ئێوە کێن-یان ئێوە خەڵکی کوێن-؟ وتیان: لە ئەهلی تائیفین، وتی: گەر خەڵکی ئەم شارە بوونایە ئازارم دەدان، لە مزگەوتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەنگی خۆتان بەرزدەکەنەوە؟.**

## ١٨- دەروازەی: خەوتن لە مزگەوت

١١٠١- (ق) عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ عبدِ اللهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عاصِمٍ: أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم مُسْتَلْقِياً فِي المسْجِدِ، وَاضِعاً إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى. [خ٤٧٥/ م٢١٠٠]

[وانظر: **٣٨٤٥**].

**(ق) لە عەببادی کوڕی تەمیمەوە، لە مامیەوە، عەبدوڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیم: ئەو پێغەمبەری خودای(ﷺ) لە مزگەوت بینی پاڵیدابوویەوە، یەکێك لە لاقەکانی لەسەر ئەویتر دانابوو.**

## ١٩- دەروازەی: لە دوای بانگ لە مزگەوت دەرناچێت

١١٠٢- (م) عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ قَالَ: كُنَّا قُعُوداً فِي المسْجِدِ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَأَذَّنَ المؤذِّنُ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ المسْجِدِ يَمْشِي، فَأَتْبَعَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ بَصَرَهُ، حَتَّى خَرَجَ مِنَ المسْجِدِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَمَّا هَذَا، فَقَدْ عَصَى أَبَا القَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم. [م٦٥٥]

**(م) لە ئەبی شەعسائەوە، وتی: لە مزگەوت لەگەڵ ئەبی هورەیرە دانیشتبووین، بانگوێژ بانگی دا، پیاوێك لە مزگەوت هەستا و دەستی بە ڕۆیشتن کرد، ئەبو هورەیرە چاوی بۆ هەڵدا تا لە مزگەوتەکە چووە دەرەوە، ئەبو هورەیرە وتی: ئەوە لە ئەبا قاسم(ﷺ) یاخی بوو.**

١١٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا كُنْتُمْ فِي المَسْجِدِ، فَنُودِيَ بِالصَّلاَةِ، فَلاَ يَخْرُجْ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُصَلِّيَ**). [حم١٠٩٣٣، ١٠٩٣٤]

* إسناده صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردین: (گەر لە مزگەوت بوون بانگ بۆ نوێژ درا هیچ کەس لە ئێوە نەچێتە دەرەوە تا نوێژ دەکات).**

## ٢٠- دەروازەی: ڕێگری مەکەن لە هاتنی کەنیزەکەکانی خودا[(١)] بۆ مزگەوتەکانی خودا

١١٠٤- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَتِ امْرَأَةٌ لِعُمَرَ تَشْهَدُ صَلاَةَ الصُّبْحِ وَالعِشَاءِ فِي الجَمَاعَةِ فِي المسْجِدِ، فَقِيلَ لَهَا: لِمَ تَخْرُجِينَ، وَقَدْ تَعْلَمِينَ أَنَّ عُمَرَ يَكْرَهُ ذَلِكَ وَيَغَارُ؟ قَالَتْ: وَمَا يَمْنَعُهُ أَنْ يَنْهَانِي؟ قَالَ: يَمْنَعُهُ قَوْلُ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ الله مَسَاجِدَ الله**).

[خ٩٠٠ (٨٦٥)/ م٤٤٢]

---

(١) واتە: ئافرەتان_و.

(ق) لە ئیبن عومەرەوە، وتی: ژنێکی عومەر لە جەماعەتی نوێژی بەیانی و عیشا لە مزگەوت ئامادە دەبوو، پێی وترا: بۆچی دەچییە دەرەوە، تۆ دەزانی عومەر ئەوەی پێناخۆشە و غیرە دەکات؟ ژنەکە وتی: چی ڕێگری لێ دەکات نەهیم لێ بکات؟ وتی: فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕێگری لێ دەکات: **(ڕێگری مەکەن لە هاتنی کەنیزەکەکانی خودا بۆ مزگەوتەکانی خودا)**.

**١١٠٥**– (م) عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ قَالَتْ: قَالَ لَنَا رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ المَسْجِدَ، فَلاَ تَمَسَّ طِيباً**). [م٤٤٣]

(م) لە زەینەبەوە، ژنەکەی عەبدوڵای کوڕی مەسعوود، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووین: **(گەر یەکێك لە ئێوە لە مزگەوت ئامادە بوو بۆن لە خۆی نەدات)**.

**١١٠٦**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَقِيَتْهُ امْرَأَةٌ وَجَدَ مِنْهَا رِيحَ الطِّيبِ يَنْفَحُ، وَلِذَيْلِهَا إِعْصَارٌ، فَقَالَ: يَا أَمَةَ الجَبَّارِ! جِئْتِ مِنَ المسْجِدِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: وَلَهُ تَطَيَّبْتِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ حِبِّي أَبَا القَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**لاَ تُقْبَلُ صَلاَةٌ لاِمْرَأَةٍ تَطَيَّبَتْ لِهَذَا المَسْجِدِ، حَتَّى تَرْجِعَ، فَتَغْتَسِلَ غُسْلَهَا مِنَ الجَنَابَةِ**). [د٤١٧٤/ جه٤٠٠٢]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: ئافرەتێك پێیگەیشت هەستی بە بۆنی خۆشکرد لێیەوە، پۆشاکەکەی لەدواوە تۆزی دەکرد، وتی: ئەی کەنیزەکی خودای جەبار، لە مزگەوتەوە هاتی؟ وتی: بەڵێ، وتی: بۆ ئەو بۆنی خۆشت لە خۆتدا؟ وتی: بەڵێ، وتی: من گوێم لە خۆشەویستم(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(نوێژی ئافرەتێك قبووڵ نابێت بۆ ئەم مزگەوتە بۆنی خۆش لە خۆی بدات، تا دەگەڕێتەوە و خۆی دەشۆرێت وەك خۆشۆرین لە لەشگرانی)**.

**١١٠٧**– وَعَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ الله مَسَاجِدَ الله، وَلَكِنْ لِيَخْرُجْنَ وَهُنَّ تَفِلاَتٌ**). [د٥٦٥/ مي١٣١٥]

* حسن صحيح.

هەر لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(رێگری مەکەن لە هاتنی کەنیزەکەکانی خودا بۆ مزگەوتەکانی خودا، وەلێ با ئەوان بێنە دەرەوە و بۆنیان لە خۆیان نەدابێت).**

**١١٠٨-** عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(صَلاَةُ المَرْأَةِ فِي بَيْتِهَا أَفْضَلُ مِنْ صَلاَتِهَا فِي حُجْرَتِهَا، وَصَلاَتُهَا فِي مَخْدَعِهَا أَفْضَلُ مِنْ صَلاَتِهَا فِي بَيْتِهَا).** [د٥٧٠]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(نوێژی ئافرەت لە ماڵەکەی چاکترە لە نوێژ لە پەنای ماڵەکەی، نوێژ لە جێگەی پاڵدانەوە و نوستنی باشترە لە نوێژ لە ماڵەکەی)**[١].

**١١٠٩-** عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(لَوْ تَرَكْنَا هَذَا البَابَ لِلنِّسَاءِ).** قَالَ نَافِعٌ: فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ ابْنُ عُمَرَ حَتَّى مَاتَ. [د٤٦٢، ٥٧١]

* صحيح.

لە نافیعەوە، لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بمانتوانیبا ئەم دەرگایە تەرخان بکەین بە ئافرەتان)**، نافیع دەڵێت: ئیبن عومەر لێیەوە نەچووە ژوورەوە تا مرد.

## ٢١- دەروازەی: چوونە ناو مزگەوت و ئەوەی دەیڵێت لە چوونە ژوورەوە

**١١١٠-** (م) عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ ـ أَوْ عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ ـ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ، فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ، فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ).** [م٧١٣]

---

[١] واتە: تا زیاتر داپۆشراو و کەنارگیر بێت خێری زۆرترە -و.

(م) لە ئەبی حومەیدەوە -یان لە ئەبی ئوسەیدەوە- وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە چووە ناو مزگەوتەوە با بڵێت: "اللهم افتح لي أبواب رحمتك-خودایە دەرگاکانی رەحمەتی خۆت بۆ من بکەرەوە"، گەر هاتە دەرەوە با بڵێت: "اللهم إني أسألك من فضلك-خودایە من داوای فەزڵت دەکەم").**

١١١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ؛ فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ؛ فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ اعْصِمْنِي مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ). [جه٧٧٣]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە رۆیشتە مزگەوتەوە، با سەلام لە پێغەمبەر(ﷺ) بکات و بڵێت: "اللهم افتح لي أبواب رحمتك-خودایە دەرگاکانی رەحمەتی خۆتت بۆ بکەرەوە"، گەر رۆیشتە دەرەوە با سەلام لە پێغەمبەر(ﷺ) بکات و بڵێت: "اللهم اعصمني من الشيطان الرجيم-خودایە لە شەیتانی نەفرەتلێکراو بمپارێزە").**

١١١٢- وَعَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ فَلْيُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَلْيَقُلْ: اللهُمَّ أَجِرْنِي مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيم). [ك٧٤٧]

* قال الذهبي: على شرطهما.

هەر لە ئەبی هورەیرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە رۆیشتە مزگەوتەوە با صەڵەوات لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) لێبدات و بڵێت: "اللهم أجرني من الشيطان الرجيم-خودایە، لە شەیتانی نەفرەتلێکراو پەنام بدە").**

١١١٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مِنَ السُّنَّةِ إِذَا دَخَلْتَ المسْجِدَ أَنْ تَبْدَأَ بِرِجْلِكَ اليُمْنَى، وَإِذَا خَرَجْتَ أَنْ تَبْدَأَ بِرِجْلِكَ اليُسْرى. [ك٧٩١]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

لە ئـەنـەسـی کـوڕی مالیکـەوە، ئـەو دەیفـەرموو: لـە سوننەت ئەوەیە گەر چوویە ناو مزگەوتەوە بە قاچی ڕاست دەست پێبکەی، گەر چوویە دەرەوە بە قاچی دەست پێ بکەی.

## ٢٢- دەروازەی: کەسێك سیر یان پیاز بخوات نابێ بچێتە مزگەوتەوە

١١١٤- (ق) عَنْ عَطَاء أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ الله زَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ أَكَلَ ثُوماً، أَوْ بَصَلاً؛ فَلْيَعْتَزِلْنَا**)، أَوْ قَالَ: (**فَلْيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا، وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ**)، وَأَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أُتِيَ بِقِدْرٍ فِيهِ خَضِرَاتٌ مِنْ بُقُولٍ، فَوَجَدَ لَهَا رِيحاً، فَسَأَلَ، فَأُخْبِرَ بِمَا فِيهَا مِنَ البُقُولِ، فَقَالَ: (**قَرِّبُوهَا**) إِلَى بَعْضِ أَصْحَابِهِ كَانَ مَعَهُ، فَلَمَّا رَآهُ كَرِهَ أَكْلَهَا، قَالَ: (**كُلْ، فَإِنِّي أُنَاجِي مَنْ لاَ تُنَاجِي**). [خ٨٥٥ (٨٥٤)/ م٥٦٤]

(ق) لە عەتاوە، جابری کوڕی عەبدوڵا پێیوابوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (**هەر کەس سیر یان پیازی خوارد با لێمان کەنارگیر بێت**)، یان فەرمووی: (**با لە مزگەوتەکەمان کەنارگیر بێت**)، مەنجەڵێك هێنرا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) سەوزەی گژوگیای تێدا بوو، بینی بۆنی هەیە، پرسیاری کرد، هەواڵی پێدرا بەوەی تیایدایە لە گژوگیا، بە هەندێ لە هاوەڵانی خۆی فەرموو کە لەگەڵی بوون: (**لێی نزیك بینەوە**)، کاتێك ناپەسەندی خواردنی گیایەکەی بینی، فەرمووی: (**بخۆ من ئاخافتن لەگەڵ کەسێك دەکەم تۆ ئاخافتنی لەگەڵ ناکەی**)[1].

- وفِي رواية عند مسلم: قَالَ: نَهَى رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم عَنْ أَكْلِ البَصَلِ وَالكُرَّاثِ، فَغَلَبَتْنَا الحَاجَةُ، فَأَكَلْنَا مِنْهَا، فَقَالَ: (**مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ المُنْتِنَةِ، فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا، فَإِنَّ المَلاَئِكَةَ تَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ الإِنْسُ**).

---

(١) مەبەستی ئاخافتنە لەگەڵ جیبریل(علیه السلام)، چونکە هەموو باوەڕدارێك لە نوێژدا ئاخافتن لەگەڵ خودا دەکات-و.

لە ریوایەتێك لای موسلیم: وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە خواردنی پیاز و کەوەر(الكراث)[1]، پێویستی زاڵ بوو بە سەرماندا لێمانخوارد، فەرمووی: **(هەر کەس لەو رووەکە بۆگەنە دەخوات لە مزگەوتەکەمان نزیك نەبێتەوە، چونکە فریشتە ئازار دەخوات لەوەی مرۆڤ ئازاری پێ دەخوات).**

**١١١٥–** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ، فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا، وَلاَ يُؤْذِيَنَّا بِرِيحِ الثُّومِ).** [م٥٦٣]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لەم رووەکە دەخوات، با لە مزگەوتەکەمان نزیك نەبێتەوە و بە بۆنی سیر ئازارمان نەدات).**

**١١١٦–** عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنْ هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ، وَقَالَ: **(مَنْ أَكَلَهُمَا، فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا)**، وَقَالَ: **(إِنْ كُنْتُمْ لاَ بُدَّ آكِلِيهِمَا، فَأَمِيتُوهُمَا طَبْخاً)**. قَالَ: يَعْنِي: البَصَلَ وَالثُّومَ. [د٣٨٢٧]

* صحيح.

لە موعاویەی کوڕی قورەوە، لە باوکییەوە: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد لەو دوو رووەکە و فەرمووی: **(هەر کەس خواردنی، با لە مزگەوتەکەمان نزیك نەبێتەوە)**، هەروەها فەرمووی: **(گەر هەر دەبێت بیخۆن، بە لێنان بیمرێنن)**، وتی: واتە پیاز و سیر.

## ٢٣- دەروازەی: نەهی لە بانگدێران بۆ دۆزینەوەی شتی ونبوو لە مزگەوت

**١١١٧–** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ سَمِعَ رَجُلاً يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي المَسْجِدِ، فَلْيَقُلْ: لاَ رَدَّهَا الله عَلَيْكَ، فَإِنَّ المَسَاجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهَذَا).** [م٥٦٨]

---

[1] نەهییەکە (پیاز و کەوەر و سیر و توور و پیچك)یش دەگرێتەوە –و.

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس گوێی لە پیاوێك بوو لە مزگەوت بانگی رادەدێرا بۆ ونبوویەك، با بڵێت: خودا بۆت نەگێڕێتەوە، چونکە مزگەوت بۆ ئەوە دروستنەکراوە).**

- وفي رواية: (إِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ، أَوْ يَبْتَاعُ فِي المَسْجِدِ؛ فَقُولُوا: لاَ أَرْبَحَ اللهُ تِجَارَتَكَ، وَإِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَنْشُدُ فِيهِ ضَالَّةً فَقُولُوا: لاَ رَدَّ اللهُ عَلَيْكَ). [ت١٣٢١/ مي١٤٤١]

[وانظر: ١١٣٤].

لە ریوایەتێکدا: **(گەر یەکێکتان بینی لە مزگەوت دەیفرۆشت یان دەیکڕی، بڵێن: خودا قازانج نەخاتە بازرگانییەکەتەوە، گەر کەسێکتان بینی بانگی رادەدێرا بۆ ونبوویەك بڵێن: خودا بۆت نەگێڕێتەوە).**

## ٢٤- دەروازەی: نوێژ لە پەچەی رانە مەڕ(مۆڵی رانە مەڕ)دا

**١١١٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(صَلُّوا فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ، وَلاَ تُصَلُّوا فِي أَعْطَانِ الإِبِلِ).** [ت٣٤٨/ جه٧٦٨/ مي١٤٣١]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە پەچەی رانە مەڕدا نوێژ بکەن، لە مۆڵگەی حوشتردا نوێژ مەکەن).**

## ٢٥- دەروازەی: نوێژ لە سەربان و کەشتی و شوێنانی تر

**١١١٩-** (خ) عَنِ الحَسَنِ: أنه لَمْ يَرَ بَأْساً أَنْ يُصَلَّى عَلَى الجُمْدِ وَالقَنَاطِرِ، وَإِنْ جَرَى تَحْتَهَا بَوْلٌ، أَوْ فَوْقَهَا أَوْ أَمَامَهَا، إِذَا كَانَ بَيْنَهُمَا سُتْرَةٌ.

(خ) لە حەسەنەوە: لای خراپ نەبوو نوێژ بکرێت لەسەر شوێنی رەق و پرد با میزیش بە ژێریدا یان بە سەرەوەیدا یان بە بەردەمیدا بڕوات، گەر لە نێوانیان دابڕێك(سُترة) هەبێت

١١٢٠- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أنه صلَّى عَلَى سَقْفِ المسْجِدِ بِصَلاَةِ الإِمَامِ.

**(خـ) لە ئەبی هورەیرەوە: ئەو لەسەر سەقفی مزگەوت بە نوێژی ئیمام نوێژی کرد.**

١١٢١- (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أنه صَلَّى عَلَى الثَّلْجِ. [خ. الصلاة، باب ١٨]

**(خـ) لە ئیبن عومەرەوە: ئەو لەسەر بەفر نوێژی کرد.**

١١٢٢- (خ) عَنْ جَابِرٍ وَأَبِي سَعِيدٍ: أنهما صلّيا فِي السَّفِينَةِ قَائِمين.

**(خـ) لە جابر و ئەبی سەعیدەوە: ئەوان هەردووکیان بە پێوە لەسەر کەشتییەك نوێژیان کرد.**

١١٢٣- (خـ) وَقَالَ الحَسَنُ: تُصَلِّي قَائِماً مَا لَمْ تَشُقَّ عَلَى أَصْحَابِكَ تَدُورُ مَعَهَا؛ وَإِلاَّ فَقَاعِداً. [خ. الصلاة، باب ٢٠]

**(خـ) هەروەها حەسەن وتی: بە پێوە نوێژ دەکەی گەر لەسەر هاوەڵانت گران نەبێت لەگەڵی سوڕ دەخۆی، ئەگەر نە، بە دانیشتنانەوە[1].**

١١٢٤- (خ) عَنْ أَنَس: أنه صَلَّى عَلَى فِرَاشِهِ. [خ. الصلاة، باب ٢٢]

**(خـ) لە ئەنەسەوە: ئەو لەسەر جێگەکەی خۆی نوێژی کرد.**

١١٢٥- (خ) عَنِ ابْنِ عَوْنٍ: أنه صَلَّى فِي مَسْجِدٍ فِي دَارٍ يُغْلَقُ عَلَيْهِمُ البَابُ.
[خ. الصلاة، باب ٨٧]

**(خـ) لە ئیبن عەونەوە: ئەو لە مزگەوتێکدا نوێژی کرد لە خانوویەك دەرگایان لەسەر دادەخرا.**

---

[1] **واتە: گەر ئاراستەی قیبلە بە هۆی جوڵانی کەشتییەکەوە گۆڕا تۆش لەگەڵی ئاراستەکەی خۆت روو قیبلە راستدەکەیەوە، ئەگەر وەستانیش بە پێوە دژوار بوو-بەهۆی جووڵەی کەشتییەکەوە- دەتوانی دابنیشی-و.**

١١٢٦- (خـ) المسْجد يَكُونُ فِي الطَّرِيقِ مِنْ غَيْرِ ضَرَرٍ بِالنَّاسِ، وَبِهِ قَالَ الحَسَنُ وَأَيُّوبُ وَمَالِكٌ. [خ. الصلاة، باب ٨٦]

**(خـ) مزگەوت لە رێگە دەبێت بەبێ زیان گەیاندن بە خەڵك، حەسەن و ئەیوب و مالیك ئەوەیان وتووە.**

## ٢٦- دەروازەی: رازاندنەوەی مزگەوت و شانازی پێیەوە

١١٢٧- (خـ) عَنْ عُمَرَ: أنه أَمَرَ بِبِنَاءِ المسْجِدِ، وَقَالَ: أَكِنَّ النَّاسَ مِنَ المطَرِ، وَإِيَّاكَ أَنْ تُحَمِّرَ، أَوْ تُصَفِّرَ فَتَفْتِنَ النَّاسَ. [خ. الصلاة، باب ٦٢]

**(خـ) لە عومەرەوە: ئەو فەرمانی کرد بە بینای مزگەوت و وتی: داڵدەی خەڵك دەدات لە باران، ئاگادارت دەکەمەوە لەوەی رەنگی سوور یان زەرد بکرێت و خەڵکی تووشی فیتنە بکات.**

١١٢٨- (خـ) عَنْ أَنَسٍ قال: يَتَبَاهَوْنَ بِهَا، ثُمَّ لاَ يَعْمُرُونَهَا؛ إِلاَّ قَلِيلاً. [خ. الصلاة، باب ٦٢]

**(خـ) لە ئەنەسەوە، وتی: شانازی دەکەن بە مزگەوتەوە، پاشان ئاوەدانی ناکەنەوە[1]، مەگەر کەمێك.**

**١١٢٩-** عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي المَسَاجِدِ)**. [د٤٤٩/ جه٧٣٩/ مي١٤٤٨]

**لە ئەنەسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (قیامەت نایەت تا خەڵکی شانازی دەکەن بە مزگەوتەوە).**

- ولفظ النسائي: (**مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: أَنْ يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي المَسَاجِدِ**). [ن٦٨٨]

* صحيح.

---

[1] **واتە: بە نوێژ و زیکر و خوێندنی قورئان و مەجلیسی زانست-و.**

- **لەفزەکەی "النسائي": (لە نیشانەکانی قیامەت خەڵکی شانازی بکەن بە مزگەوتەوە).**

## ٢٧- دەروازەی: ئایا لە مزگەوت بەند دەکرێت؟

**١١٣٠- (خ)** عَنْ شُرَيْحٍ: أنه كَانَ يَأْمُرُ الغَرِيمَ أَنْ يُحْبَسَ إِلَى سَارِيَةِ المسْجِدِ.

[خ. الصلاة، باب ٧٦]

**(خـ) لە شورەیحەوە: ئەو فەرمانی دەکرد کەسی قەرزار بە کۆڵەکەی مزگەوتەوە بەند بکرێت.**

## ٢٨- دەروازەی: خواردن لە مزگەوت

**١١٣١-** عَنْ عَبْد الله بْنِ الحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ الزُّبَيْدِيِّ قال: كُنَّا نَأْكُلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم فِي المسْجِدِ الخُبْزَ وَاللَّحْمَ. [جه ٣٣٠٠]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی حاریسی کوڕی جەزئی زوبەیدییەوە، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مزگەوت نان و گۆشتمان دەخوارد.**

## ٢٩- دەروازەی: تێپەڕبوونی لەشگران و حەیزدار بە مزگەوتدا

**١١٣٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: جَاءَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم وَوُجُوهُ بُيُوتِ أَصْحَابِهِ شَارِعَةٌ فِي المسْجِدِ، فَقَالَ: **(وَجِّهُوا هَذِهِ البُيُوتَ عَنِ المَسْجِدِ)**، ثُمَّ دَخَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَلَمْ يَصْنَعْ القَوْمُ شَيْئاً، رَجَاءَ أَنْ تَنْزِلَ فِيهِمْ رُخْصَةٌ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ بَعْدُ فَقَالَ: **(وَجِّهُوا هَذِهِ البُيُوتَ عَنِ المَسْجِدِ، فَإِنِّي لاَ أُحِلُّ المَسْجِدَ لِحَائِضٍ وَلاَ جُنُبٍ)**. [د٢٣٢]

لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات و رووەکانی ماڵی هاوەڵانی بە رووی مزگەوتدا ئاوەڵا بوون، فەرمووی: **(رووی ئەم ماڵانە لە مزگەوت بگێڕن)**، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) چووە ژوورەوە و خەڵکەکە شتێکیان نەکرد، وەك رجا بەوەی تیایدا روخسەتێکیان بۆ دابەزێت، دواتر رۆیشتە دەرەوە بۆ لایان فەرمووی: **(رووی ئەم ماڵانە لە مزگەوت بگێڕن، من مزگەوت بۆ حەیزدار و لەشگران حەلاڵ ناکەم)**.

**١١٣٣**– عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بن عبدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: الجُنُبُ يَمُرُّ فِي المسْجِدِ، وَلاَ يَقْعُدُ فِيهِ، ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ [النساء:٤٣]. [مي ١٢١٠]

* إسناده حسن.

لە ئەبی عوبەیدەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: لەشگران بە مزگەوتدا تێدەپەڕێ، تیایدا دانانیشێ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ [النساء:٤٣].

## ٣٠- دەروازەی: ئەوەی لە مزگەوتدا ناپەسەندە

**١١٣٤**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنِ الشِّرَاءِ وَالبَيْعِ فِي المسْجِدِ، وَأَنْ تُنْشَدَ فِيهِ ضَالَّةٌ، وَأَنْ يُنْشَدَ فِيهِ شِعْرٌ، وَنَهَى عَنِ التَّحَلُّقِ قَبْلَ الصَّلاَةِ يَوْمَ الجُمُعَةِ.

* حسن. [د١٠٧٩/ ت٣٢٢/ ن٧١٣/ جه٧٤٩]

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە کڕین و فرۆشتن لە مزگەوت، هەروەها بانگڕادان تیایدا بۆ ونبوو، هەروەها هۆنینەوەی هۆنراوە تیایدا، هەروەها نەهی کرد لە ئەڵقە دروستکردن[1] بەر لە نوێژی رۆژی جومعە.**

---

[1] واتە: نەهی کردووە لە ئەڵقە دروستکردن بۆ مەجلیسی زانست و زیکر، چونکە دەبێ بە نوێژەوە خەریك بێت و گوێ بۆ زیکر و وتارەکە بگرێت–و.

## ٣١- دەروازەی: ئەو شوێنانەی نەهییان لێکراوە نوێژیان تێدا بکرێت

١١٣٥- (خ) عَنْ عُمَرَ: أنه رَأَى أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يُصَلِّي عِنْدَ قَبْرٍ، فَقَالَ: القَبْرَ القَبْرَ. وَلَمْ يَأْمُرْهُ بِالإِعَادَةِ. [خ. الصلاة، باب ٤٨]

**(خـ) لە عومەرەوە: ئەو ئەنەسی کوڕی مالیکی بینی لای گۆڕێك نوێژی دەکرد، وتی: گۆڕ، گۆڕ، بەڵام فەرمانی پێ نەکرد بە دووبارەکردنەوەی نوێژەکەی.**

١١٣٦- (خ) وَيُذْكَرُ أَنَّ عَلِيّاً كَرِهَ الصَّلاَةَ بِخَسْفِ بَابِلَ. [خ. الصلاة، باب ٥٣]

**(خـ) باس لەوە دەکرێت عەلی نوێژکردنی لە وێرانەی بابل لا ناپەسەند بووە.**

١١٣٧- (خ) عَنْ عُمَرَ قال: إِنَّا لاَ نَدْخُلُ كَنَائِسَكُمْ مِنْ أَجْلِ التَّمَاثِيلِ الَّتِي فِيهَا الصُّوَرُ. [خ. الصلاة، باب ٥٤]

**(خـ) لە عومەرەوە، وتی: ئێمە ناچینە ناو کڵێساکانتان لەبەر ئەو پەیکەرانەی وێنەیان تێدایە.**

١١٣٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ، إِلاَّ الحَمَّامَ وَالمَقْبَرَةَ**). [د٤٩٢/ ت٣١٧/ جه٧٤٥/ مي١٤٣٠]

* صحيح.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەموو زەوی مزگەوتێکە جگە لە گەرماو و گۆڕستان)**

## ٣٢- دەروازەی: نوێژ لەسەر "الخُمْرَة[1]"

١١٣٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي عَلَى الخُمْرَةِ. [ت٣٣١]

* حسن صحيح.

---

(١) **"الخمرة": بەرماڵێکی بچووك، ترمزی دەڵێت: حەصیرێکی کورت.**

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر "الخمرة" نوێژی دەکرد.

**١١٤٠**– وعَنه: أنه صَلَّى وَهُوَ بِالبَصْرَةِ عَلَى بِسَاطِهِ، ثُمَّ حَدَّثَ أَصْحَابَهُ أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُصَلِّي عَلَى بِسَاطِهِ. [جه١٠٣٠]

* صحيح.

**لە هەر لە ئیبن عەباسەوە: ئەو لە بەصرە بوو لەسەر ڕاخەرەکەی خۆی نوێژی کرد، پاشان باسی ئەوەی بۆ هاوەڵانی کرد پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی لەسەر ڕاخەرەکەی دەکرد.**

## بەشی یەکەم

# پلە و پایەی نوێژ و پێشەکییەکانی

## ١- دەروازەی: پلە و پایەی نوێژ و حوکمی نوێژنەکەر

١١٤١- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَراً بِبَابِ أَحَدِكُمْ، يَغْتَسِلُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْساً، مَا تَقُولُ: ذلِكَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ**) ؟ قَالُوا: لاَ يُبْقِي مِن دَرَنِهِ شَيْئاً، قَالَ: (**فَذلِكَ مِثْلُ الصَّلَوَاتِ الخَمْسِ، يَمْحُو الله بِهَا الخَطَايَا**). [خ٥٢٨/ م٦٦٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(باشە گەر ڕووبارێك لە دەرگای یەکێك لە ئێوە بێت، هەموو ڕۆژێك پێنج جار خۆی تێدا بشۆرێت، چی دەڵێی: ئایا ئەوە چڵکی پێوە دەهێڵێت؟)**، وتیان: شتێك لە چڵکی پێوە ناهێڵێت، فەرمووی: **(ئەوە نموونەی پێنج نوێژەکەیە، خودا بەهۆیەوە خراپە و گوناهان دەسڕێتەوە)**.

١١٤٢- (م) وَعَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو الله بِهِ الخَطَايَا، وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ**) ؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ الله، قَالَ: (**إِسْبَاغُ الوُضُوءِ عَلَى المَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الخُطَا إِلَى المَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ؛ فَذلِكُمُ الرِّبَاطُ**). [م٢٥١]

(م) هەر لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دەتانەوێ شتێکتان پێ نیشان بدەم خودا گوناهانی پێ مەحو بکاتەوە و پلەکانی پێ بەرز بکاتەوە؟)**، وتیان بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(دەستنوێژی تێر و تەواو لە کاتی ناخۆشی[١]، و زۆری هەنگاو هەڵگرتن بۆ مزگەوت، و چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ، ئەوە بریتییە لە "الرباط"[٢])**.

---

(١) کاتی ناخۆشی: وەك سەرما و نەخۆشی.

(٢) "الرباط": بریتییە لە سەنگەرگیری و خۆ بەند کردن لە قەڵا و قوڵلەدا بەرانبەر بە دوژمن و چاودێری کردنی تاکو دزە نەکەن بۆ ناو خاکی ئیسلام-و.

**١١٤٣**– (م) عَنْ عَمْرِو بْنِ سَعِيدِ بْنِ العَاصِ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ عُثْمَانَ، فَدَعَا بِطَهُورٍ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَا مِنِ امْرِئٍ مُسْلِمٍ تَحْضُرُهُ صَلاَةٌ مَكْتُوبَةٌ؛ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهَا وَخُشُوعَهَا وَرُكُوعَهَا؛ إِلاَّ كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا قَبْلَهَا مِنَ الذُّنُوبِ، مَا لَمْ يُؤْتِ كَبِيرَةً، وَذَلِكَ الدَّهْرَ كُلَّهُ**). [م٢٢٨]

(م) لە عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاصەوە، وتی: لای عوسمان بووم، داوای ئاوی دەستنوێژی کرد، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**هەر مرۆیەکی موسڵمان نوێژە فەرزەکانی بۆ ئامادە بوو، بە باشی دەستنوێژ و خشوع و رکوعی ئەنجام بدات دەبێتە کەفارەتی ئەوەی پێش ئەو نوێژەیە لە گوناه، گەر گوناهی گەورەی ئەنجام نەدابێت، ئەوە بە درێژایی رۆژگارە**).

**١١٤٤**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَقُولُ: (**الصَّلَوَاتُ الخَمْسُ، وَالجُمُعَةُ إِلَى الجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ؛ مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُنَّ، إِذَا اجْتَنَبَ الكَبَائِرَ**). [م٢٣٣]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: (**پێنج نوێژەکە، و جومعە بۆ جومعە، و رەمەزان بۆ رەمەزان، سڕێنەرەوەی ئەو گوناهانەن لە نێوانیان گەر لە گوناهی گەورە خۆی بەدوور بگرێت**).

**١١٤٥**– (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاَةِ**). [م٨٢]

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**نێوان پیاو و وازهێنان لە "هاوەڵدانان و بێباوەڕی" وازهێنانە لە نوێژ**).

**١١٤٦**– عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ الحُصَيْبِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**العَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلاَةُ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ**). [ت٢٦٢١/ ن٤٦٢٠/ جه١٠٧٩]

* صحيح.

لە بورەیدەی کوڕی حوصەیبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمە و ئەواندایە نوێژە، هەرکەس وازیلێهێنا بێباوەڕی نواندووە).**

**١١٤٧**– عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ الصَّلاَةُ، فَإِنْ وَجَدَ صَلاَتَهُ كَامِلَةً كُتِبَتْ لَهُ كَامِلَةً، وَإِنْ كَانَ فِيهَا نُقْصَانٌ، قَالَ اللهُ تَعَالَى لِمَلاَئِكَتِهِ: انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ، فَأَكْمِلُوا لَهُ مَا نَقَصَ مِنْ فَرِيضَتِهِ، ثُمَّ الزَّكَاةُ، ثُمَّ الأَعْمَالُ عَلَى حَسَبِ ذَلِكَ).** [مي١٣٩٥/ د٨٦٦/ جه١٤٢٦]

* صحيح.

لە تەمیمی دارییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(یەکەمین شتێك بەندە لێپێچانەوەی لێ دەکرێت نوێژە، گەر بینی نوێژەکەی تەواوە بە تەواوی بۆی دەنوسرێت، گەر ناتەواوی تێدا بوو، خودا(سبحانە وتعالى) بە فریشتەکانی دەفەرموێت: وردبینەوە بزانن بەندەکەم نوێژی سوننەتی هەیە، ئەوەی ناتەواوە لە فەرزەکان بۆی تەواو بکەن، پاشان زەکات، پاشان کارەکان بەپێی ئەوە).**

## ٢- دەروازەی: رووکردنە قیبلە

**١١٤٨**– (ق) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ . أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْراً . وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُحِبُّ أَنْ يُوَجَّهَ إِلَى الْكَعْبَةِ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾[البقرة:١٤٤]، فَتَوَجَّهَ نَحْوَ الْكَعْبَةِ، وَقَالَ السُّفَهَاءُ مِنَ النَّاسِ، وَهُمُ الْيَهُودُ: ﴿مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَاۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُۚ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ [البقرة:١٤٢]، فَصَلَّى مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلٌ، ثُمَّ خَرَجَ بَعْدَمَا صَلَّى، فَمَرَّ عَلَى قَوْمٍ مِنَ الأَنْصَارِ فِي صَلاَةِ الْعَصْرِ، نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَقَالَ: هُوَ يَشْهَدُ: أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَأَنَّهُ تَوَجَّهَ نَحْوَ الْكَعْبَةِ، فَتَحَرَّفَ الْقَوْمُ، حَتَّى تَوَجَّهُوا نَحْوَ الْكَعْبَةِ. [خ٣٩٩ (٤٠)/ م٥٢٥]

(ق) لە بەرائی كوڕی عازیبەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ماوەی شازدە یان حەڤدە مانگ پێغەمبەری خودا(ﷺ) روو بە بەیتولمەقدەس بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێیخۆش بوو روو لە كەعبە بكات، خودا(سبحانە وتعالی) ئایەتی دابەزاند: ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾[البقرة:١٤٤]، رووی لە كەعبە كرد، خەڵكی گەمژە -كە بریتی بوون لە یەهوود- وتیان: ﴿مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَاۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُۚ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ [البقرة:١٤٢]، لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێك نوێژی كرد، پاش ئەنجامدانی نوێژەكە رۆیشتە دەرەوە، و بە پاڵ كۆمەڵێك لە ئەنصاردا گوزەری كرد لە نوێژی عەصردا بوون روو بە بەیتولمەقدەس، پیاوەكە شایەتی دا و وتی: ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی كرد و ئەو رووی لە كەعبە كرد، خەڵكەكە سوڕان تا روویان لە كەعبە كرد.

١١٤٩- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: بَيْنَا النَّاسُ بِقُبَاءٍ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ، إِذْ جَاءَهُمْ آتٍ فَقَالَ: إِنّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ اللَّيْلَةَ قُرآنٌ، وَقَدْ أُمِرَ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الكَعْبَةَ، فَاسْتَقْبِلُوهَا، وَكَانَتْ وُجُوهُهُمْ إِلَى الشَّامِ، فَاسْتَدَارُوا إِلَى الكَعْبَةِ. [خ٤٠٣/ م٥٢٦]

(ق) لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە، وتی: كاتێك خەڵكی لە مزگەوتی قوبا بوون لە نوێژی بەیانیدا، یەكێك هات بۆ لایان و وتی: ئەم شەو قورئان بۆ سەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) دابەزیوە، فەرمانی پێكراوە روو لە كەعبە بكات، بۆیە ئێوەش روو لە كەعبە بكەن، ئەوان روویان لە شام بوو سوڕانەوە بۆ لای كەعبە.

١١٥٠- (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ صَلَّى صَلاَتَنَا، وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا، فَذَلِكَ المُسْلِمُ، الَّذِي لَهُ ذِمَّةُ اللهِ وَذِمَّةُ رَسُولِهِ، فَلاَ تُخْفِرُوا اللهَ فِي ذِمَّتِهِ). [خ٣٩١]

(خ) لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر كەس نوێژەكەی ئێمە ئەنجام بدات و روو لە قیبلەكەی ئێمە بكات و سەربڕاوی ئێمە

**بخوات، ئەوە موسڵمانە، کە زیممەی خودا و زیممەی پێغەمبەری خودای بۆ هەیە بۆیە پەیمانشکێنی مەکەن لەگەڵ خودا لە زیممەکەیدا[1])**.

**١١٥١**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالمَغْرِبِ قِبْلَةٌ). [ت٣٤٢ـ ٣٤٤/ جه١٠١١]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا قیبلەیە)**.

**١١٥٢**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي وَهُوَ بِمَكَّةَ نَحْوَ بَيْتِ المَقْدِسِ، وَالكَعْبَةُ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَبَعْدَ مَا هَاجَرَ إِلَى المَدِينَةِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْراً، ثُمَّ صُرِفَ إِلَى الكَعْبَةِ. [حم٢٢٥٢]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی دەکرد روو بە بەیتولمەقدەس و ئەو لە مەککە بوو و کەعبە لەبەردەستی بوو، هەروەها شازدە مانگیش لەدوای ئەوەی کۆچی کرد بۆ مەدینە، پاشان رووی وەرگێڕرا بۆ کەعبە.

## ٣- دەروازەی: واجببوونی نوێژ لە پۆشاکدا[2]

**١١٥٣**– (ق) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ المُنْكَدِرِ قَالَ: رَأَيْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، وَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ. [خ٣٥٣ (٣٥٢)/ م٥١٨]

**(ق) لە محەمەدی کوڕی مونکەدیرەوە، وتی: جابری کوڕی عەبدوڵام بینی لە یەك پۆشاکدا نوێژی دەکرد، وتی: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی لە یەك پۆشاکدا نوێژی دەکرد.**

---

[1] واتە: وەفادار بن بە پەیمان و پارێزگاری لێ بکەن و دەستدرێژی مەکەنە سەر–و.

[2] وەك کراسێکی دەرەدامان یان جزداشەیەك بەبێ بوونی ژێرپۆشاك و شەرواڵ–و.

١١٥٤- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ سَائِلاً سَأَلَ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم، عَنِ الصَّلاَةِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (أَوَلِكُلِّكُمْ ثَوْبَانِ)؟ [خ٣٥٨/ م٥١٥]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پرسیارکەرێك لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاری نوێژی کرد لە یەك پۆشاکدا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئایا هەمووتان دوو پۆشاکتان هەیە؟).**

١١٥٥- (ق) وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ يُصَلِّي أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ، لَيْسَ عَلَى عَاتِقَيْهِ شَيْءٌ). [خ٣٥٩/ م٥١٦]

**(ق) هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (یەکێك لە ئێوە لە یەك پۆشاکدا نوێژ نەکات گەر لەسەر دوو شانی شتێك نەبێت[1]).**

- وفي رواية للبخاري: (مَنْ صَلَّى فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، فَلْيُخَالِفْ بَيْنَ طَرَفَيْهِ). [خ٣٦٠]

**لە ریوایەتێکی بوخاریدا: (هەر کەس لە یەك پۆشاکدا نوێژ بکات با دوو بەرەکەی لە یەکتر بئاڵێنێ[2]).**

١١٥٦- (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كَانَ رِجَالٌ يُصَلُّونَ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، عاقِدِي أُزُرِهِمْ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ، كَهَيْئَةِ الصِّبْيَانِ، وَيُقَالُ لِلنِّسَاءِ: (لاَ تَرْفَعْنَ رُؤُوسَكُنَّ حَتَّى يَسْتَوِيَ الرِّجَالُ جُلُوساً). [خ٣٦٢/ م٤٤١]

**(ق) لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، وتی: پیاوانێك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژیان دەکرد ژێر پۆشاکەکەیان لە گەردنیان دەبەست، وەك شێوەی منداڵان، بە ژنان دەوترا: (سەرتان بەرزنەکەنەوە تا بە دانیشتن پیاوان راستدەبنەوە[3]).**

---

[1] واتە: باشتر و چاکترە-و.

[2] بۆئەوەی لەبەری نەبێتەوە-و.

[3] چونکە گەر زووتر سەریان بەرزبکردبایە عەورەتی پیاوانیان دەبینی، لە کاتێکدا بەشێك لە پیاوان یەك پۆشاکیان لەبەردا بووە و ژێرپۆشاك(دەرپێ)یان لەبەردا نەبووە، ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شوێنی نوێژی ژنان و پیاوان لە مزگەوت پێکەوە بووە، بەڵام ئافرەتان لە ریزی دواوە وەستاون، دیوار و پەردە لە نێوان ئەوان و پیاواندا نەبووە-و.

**١١٥٧-** (ع) عَنْ أَبِي نَضْرَةَ قَالَ: قَالَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ: الصَّلاَةُ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ سُنَّةٌ، كُنَّا نَفْعَلُهُ مَعَ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم، وَلاَ يُعَابُ عَلَيْنَا. فَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: إِنَّمَا كَانَ ذَاكَ إِذْ كَانَ فِي الثِّيَابِ قِلَّةٌ، فَأَمَّا إِذْ وَسَّعَ اللهُ؛ فَالصَّلاَةُ فِي الثَّوْبَيْنِ أَزْكَى. [حم٢١٢٧٦]

* صحيح، رجاله رجال الصحيح.

**(ع) لە ئەبی نەزرەوە، وتی: ئوبەی کوڕی کەعب وتی: نوێژ لە یەك پۆشاکدا سوننەتە، ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەمان دەکرد و نەنگیمان لێ نەدەگیرا، ئیبن مەسعوود وتی: ئەوە کاتێك بوو پۆشاك کەم بوو، بەڵام ئێستا کە خودا بەرینی کردووە نوێژ لە دوو پۆشاکدا پاکترە[1].**

**١١٥٨-** عَنْ نَافِعٍ قَالَ: دَخَلَ ابْنُ عُمَرَ وَأَنَا أُصَلِّي فِي إِزَارٍ، فَقَالَ: أَلَمْ تُكسَ ثَوْبَيْنِ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: أَفَرَأَيْتَ لَوْ بَعَثْتُكَ فِي حَاجَةٍ أَكُنْتَ تَذْهَبُ هَكَذا كَمَا صَلَّيْتَ؟ قَلْتُ: لا، قَالَ: فَرَبُّكَ أَحَقُّ أَنْ تَزَيَّنَ له. [مه٧٦٦/ مخ١/٢٠٠]

* إسناد صحيح.

**لە نافیعەوە، وتی: ئیبن عومەر هاتە ژوورەوە و من لە ژێر پۆشاکێکدا نوێژم دەکرد، وتی: ئایا دوو پۆشاکت پێ نەپۆشرا؟ وتم: با، وتی: ئایا گەر رەوانەت بکەم بۆ پێویستییەك بەم جۆرە دەڕۆی وەك نوێژت کرد؟ وتم: نەخێر، وتی: پەروەردگارت لەپێشترە خۆتی بۆ برازێنییەوە.**

**١١٥٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَأْتَزِرْ وَلْيَرْتَدِ).** [حب (١٧١٣)/ هق٢/٢٣٥]

* إسناد صحيح على شرطهما.

**لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با ژێرپۆشاك بپۆشێ و بەسەریدا پۆشاك بپۆشێت).**

---

[1] **واتە: گەر پۆشاکەکە لەسەر دوو شانی بە شتێك نەبەسترابێت-و.**

## ٤- دەروازەی: نوێژ بە نەعلەوە

**١١٦٠-** (ق) عَنْ أَبِي مَسْلَمَةَ، سَعِيدِ بْنِ يَزِيدَ الأَزْدِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ: أَكَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي فِي نَعْلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. [خ٣٨٦/ م٥٥٥]

**(ق) لە ئەبی مەسلمەوە، سەعیدی کوڕی یەزیدی ئەزدی، وتی: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیك کرد: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) بە نەعلەکانییەوە نوێژی دەکرد؟ وتی: بەڵێ.**

**١١٦١-** عَنْ عَبْدِ الله بْنِ السَّائِبِ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي يَوْمَ الفَتْحِ، وَوَضَعَ نَعْلَيْهِ عَنْ يَسَارِهِ. [د٦٤٨/ ن٧٧٥/ جه١٤٣١]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی سائیبەوە، وتی: ڕۆژی فەتح پێغەمبەرم(ﷺ) بینی نوێژی دەکرد، نەعلەکانی لای چەپی خۆی دانابوو.**

**١١٦٢-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ، إِذْ خَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَوَضَعَهُمَا عَنْ يَسَارِهِ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ القَوْمُ ألقَوْا نِعَالَهُمْ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم صَلاَتَهُ، قَالَ: **(مَا حَمَلَكُمْ عَلَى إِلْقَائِكُمْ نِعَالَكُمْ)**؟ قَالُوا: رَأَيْنَاكَ أَلقَيْتَ نَعْلَيْكَ، فَأَلْقَيْنَا نِعَالَنَا، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ جِبْرِيلَ صلّى الله عليه وسلّم أَتَانِي، فَأَخْبَرَنِي أَنَّ فِيهِمَا قَذَراً)**. وَقَالَ: **(إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلَى المَسْجِدِ فَلْيَنْظُرْ؛ فَإِنْ رَأَى فِي نَعْلَيْهِ قَذَراً أَوْ أَذًى، فَلْيَمْسَحْهُ، وَلْيُصَلِّ فِيهِمَا)**. [د٦٥٠/ مي١٣٧٨]

* صحيح.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی بە هاوەڵانی دەکرد نەعلەکانی لەپێ داکەند و لای چەپی خۆیەوە داینان، کاتێك خەڵکەکە ئەوەیان بینی نەعلەکانی خۆیان هەڵدا، کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: (چ شتێ وای لێکردن نەعلەکانتان لە پێ دابکەنن؟)، وتیان: تۆمان بینی نەعلەکانت لە پێ داکەند، بۆیە ئێمەش نەعلەکانمان لە پێ داکەند، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (جیبریل(علیه السلام) هات بۆ لام، هەواڵی پێدام پیسییان**

**پێوەیە)، هەروەها فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە هات بۆ مزگەوت با وردبێتەوە، گەر بە نەعلەکانییەوە پیسی و خراپی بینی با بیانسڕێت و نوێژیان پێوە بکات).**

١١٦٣– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أنه أَتَى أَبَا مُوسَى الأَشْعَرِيَّ فِي مَنْزِلِهِ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَقَالَ أَبُو مُوسَى: تَقَدَّمْ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَإِنَّكَ أَقْدَمُ سِنّاً وَأَعْلَمُ، قَالَ: لاَ، بَلْ تَقَدَّمْ أَنْتَ، فَإِنَّمَا أَتَيْنَاكَ فِي مَنْزِلِكَ وَمَسْجِدِكَ فَأَنْتَ أَحَقُّ، قَالَ: فَتَقَدَّمَ أَبُو مُوسَى، فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: مَا أَرَدْتَ إِلَى خَلْعِهِمَا، أَبِالوَادِي المقَدَّسِ أَنْتَ؟ لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي فِي الخُفَّيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ. [حم٤٣٩٧]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە: هات بۆ لای ئەبو موسای ئەشعەری لە ماڵەکەی، نوێژ هاتە بەرەوە، ئەبو موسا وتی: پێشکەوە، ئەی باوکی عبدالرحمن، تۆ تەمەنت لەپێشتر و زاناتری، وتی: نەخێر، بەڵکو تۆ پێشبکەوە، ئێمە هاتووین بۆ ماڵەکەی تۆ و مزگەوتەکەی تۆ، تۆ لەپێشتری، وتی: ئەبو موسا پێشکەوت، نەعلەکانی لەپێ داکەند، کاتێك سەلامیدایەوە عەبدوڵا وتی: مەبەستت چی بوو بە داکەندنی نەعلەکانت، ئایا تۆ لە "الوادي المقدس"ی؟[1] من پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی لە خوفەکان و نەعلەکانیدا نوێژی دەکرد.**

## ٥- دەروازەی: نوێژگەر پیسی بە پۆشاکەکەی خۆیەوە ببینێت

١١٦٤– (خـ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أنه كَانَ إِذَا رَأَى فِي ثَوْبِهِ دَماً، وَهُوَ يُصَلِّي، وَضَعَهُ وَمَضَى فِي صَلاَتِهِ.

**(خـ) لە ئیبن عومەرەوە: ئەو گەر بە پۆشاکەکانییەوە خوێنی ببینیبا و نوێژی بکردبایە دایدەکەند و بەردەوام دەبوو لە نوێژەکەی.**

[1] ئاماژەی بەم ئایەتە کردووە کاتێك خودا(عز وجل) بە موسای فەرمووە: ﴿إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى﴾[طه: ١٢] –نەعلەکانت لە پێ دابکەنە، تۆ لە "الواد المقدس طوى"یت–و.

**١١٦٥-** (خـ) عَنِ ابْنِ المسَيَّبِ وَالشَّعْبِيِّ، قَالا: إِذَا صَلَّى وَفِي ثَوْبِهِ دَمٌ أَوْ جَنَابَةٌ، أَوْ لِغَيْرِ القِبْلَةِ، أَوْ تَيَمَّمَ: فَصَلَّى، ثُمَّ أَدْرَكَ الماءَ فِي وَقْتِهِ، لاَ يُعِيدُ. [خ. الوضوء، باب ٦٩]

**(خـ) له ئیبن موسەییەب و شەعبییەوە، وتیان: گەر کەسێك نوێژی کرد و بە پۆشاکەکەیەوە خوێن هەبوو یان لەشگران بوو، یان رووی لە قیبلە نەبوو، یان تەیمومی کرد، نوێژەکەی تەواو کرد و پاشان گەیشت بە ئاو لە کاتی بەسەرنەچوونی نوێژەکە، دووبارەی ناکاتەوە.**

## ٦- دەروازەی: پۆشاکی ئافرەت لە نوێژدا

**١١٦٦-** عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (**لاَ يَقْبَلُ اللهُ صَلاَةَ حَائِضٍ إِلاَّ بِخِمَارٍ**). [د٦٤١/ ت٣٧٧/ جه٦٥٥]

* صحيح.

**له عائیشەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (خودا نوێژی ئافرەتێك گەیشتبێتە تەمەنی حەیز وەرناگرێت بە سەرپۆشەوە نەبێت).**

**١١٦٧-** عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ الأَسْوَدِ الخَوْلاَنِيِّ. وَكَانَ فِي حَجْرِ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم.: أَنَّ مَيْمُونَةَ كَانَتْ تُصَلِّي فِي الدِّرْعِ وَالخِمَارِ لَيْسَ عَلَيْهَا إِزَارٌ. [ط٣٢٧]

* إسناده صحيح.

**له عوبەیدوڵای کوڕی ئەسوەدی خەولانییەوە -ئەو لەژێر چاودێری مەیموونەدا بوو هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)-: مەیموونە لە کراسێك و سەرپۆشێکدا نوێژی دەکرد ژێرپۆشاکی لەبەر نەبوو.**

## ٧- دەروازەی: نوێژ بە پۆشاکی ئافرەتانەوە

**١١٦٨-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لاَ يُصَلِّي فِي شُعُرِنَا، أَوْ فِي لُحُفِنَا. [د٣٦٧، ٣٦٨، ٦٤٥/ ت٦٠٠/ ن٥٣٨١]

* صحيح.

له عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ژێرپۆشاك و سەرپۆشاکی ئێمەدا نوێژی نەدەکرد.

## ٨- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی "السدل[1]" هاتووە لە نوێژدا

**١١٦٩**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنِ السَّدْلِ فِي الصَّلاَةِ، وَأَنْ يُغَطِّيَ الرَّجُلُ فَاهُ. [د٦٤٣/ ت٣٧٨/ مي١٤١٩]

* حسن.

**له ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە "السدل" لە نوێژدا، هەروەها نەهی کرد لەوەی پیاو دەمی خۆی داپۆشێت.**

## ٩- دەروازەی: بە نوێژ ئاسوودەمان بکە

**١١٧٠**- عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ ـ قَالَ مِسْعَرٌ: أُرَاهُ مِنْ خُزَاعَةَ ـ: لَيْتَنِي صَلَّيْتُ فَاسْتَرَحْتُ، فَكَأَنَّهُمْ عَابُوا عَلَيْهِ ذَلِكَ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**يَا بِلاَلُ! أَقِمِ الصَّلاَةَ أَرِحْنَا بِهَا**). [د٤٩٨٥]

* صحيح.

**له سالمی کوڕی ئەبی جەعدەوە، وتی: پیاوێك وتی: میسعەر وتی: پێموایە لە خوزاعە بێت-: خۆزگە نوێژم دەکرد و ئاسوودە دەبووم، وەك ئەوەی ئەو قسەیان بە نەنگی لەسەر دانابێت، ئەویش وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (ئەی بیلال، قامەت بۆ نوێژ بکە و بەوە ئاسوودەمان بکە).**

---

[1] "السدل": ئەوەیە خۆی بە پۆشاکەکەی بپێچێتەوە و دوو دەستی بباتە ناو پۆشاکەکە و رکوع سوژدە ببات و ئەو بەو جۆرە بێت.

## ١٠- دەروازەی: کەی فەرمان بە منداڵ دەکرێت بە نوێژ کردن

١١٧١- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مُرُوا أَوْلاَدَكُمْ بِالصَّلاَةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ).

* حسن صحيح. [د٤٩٥]

له عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن بە نوێژ کاتێك تەمەنیان حەوت ساڵانە، لەسەر نوێژ لێیان بدەن کاتێك تەمەنیان دە ساڵانە، و جێگەی نووستنیان لێ جیابکەنەوە).**

## ١١- دەروازەی: تەحریمی نوێژ و تەحلیلی نوێژ

١١٧٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مِفْتَاحُ الصَّلاَةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ). [ت٢٣٨/ جه٢٧٦]

* صحيح.

له ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کلیل و کردنەوەی نوێژ پاکبوونەوەیە، تەحریمی "الله أكبر"ە، و تەحلیلی سەلامدانەوەیە).**

## ١٢- دەروازەی: فەزڵی "الله أكبر"ی یەکەمجار

١١٧٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ صَلَّى لِلَّهِ أَرْبَعِينَ يَوْماً فِي جَمَاعَةٍ يُدْرِكُ التَّكْبِيرَةَ الأُولَى، كُتِبَتْ لَهُ بَرَاءَتَانِ: بَرَاءَةٌ مِنَ النَّارِ، وَبَرَاءَةٌ مِنَ النِّفَاقِ).

* حسن. [ت٢٤١]

له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس چل ڕۆژ بە جەماعەت بۆ خودا نوێژ بکات و بگات بە "الله أكبر"ی یەکەمدا دوو بەریبوونی بۆ دەنوسرێت: بەریبوونێك لە ئاگر، و بەریبوونێك لە دووڕوویی).**

## بەشی دووەم

# سوترەی نوێژگەر

## ١- دەروازەی: سوترەی نوێژگەر

**١١٧٤-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا خَرَجَ يَوْمَ العِيدِ، أَمَرَ بِالحَرْبَةِ فَتُوضَعُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَيُصَلِّي إِلَيْهَا وَالنَّاسُ وَرَاءَهُ، وَكَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السَّفَرِ، فَمِنْ ثَمَّ اتَّخَذَهَا الأُمَرَاءُ. [خ٤٩٤/ م٥٠١]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە رۆژی جەژن بڕۆیشتبایەتە دەرەوە فەرمانی دەکرد نێزەیەك لەبەردەمی دەبکوتن، لایەوە نوێژی دەکرد و خەڵکەکەش لەدوایەوە، لە سەفەریش ئەوەی ئەنجام دەدا، لەو پێناوەدا ئەمیرەکان نێزەیان هەڵگرتووە[1].**

**١١٧٥-** (م) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا نُصَلي وَالدَّوَابُّ تَمُرُّ بَيْنَ أَيْدِينَا، فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لِرَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: **(مِثْلُ مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ تَكُونُ بَيْنَ يَدَيْ أَحَدِكُمْ، ثُمَّ لاَ يَضُرُّهُ مَا مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ)**. [م٤٩٩]

**(م) لە تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵاوە، وتی: نوێژمان دەکرد و چوارپێ بە بەردەمماندا تێدەپەڕی، ئەوەمان بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) باس کرد، فەرمووی: (وەك پاشکۆی کەژاوە لەبەردەم یەکێك لە ئێوە بێت، پاشان زیانی پێ ناگات ئەوەی بە بەردەمی تێدەپەڕی).**

[1] واتە: لەو سوننەتەوە هەڵگرتنی نێزە لای ئەمیری سرییەکان بوو بە عادەت-و.

**١١٧٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لا تُصَلُّوا خَلفَ النَّائِمِ وَلاَ الْمُتَحَدِّثِ**). [د٦٩٤/ جه٩٥٩]

* ضعيف.

**لە ئیبن عەباسەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لە پشت خەوتوو و قسەکەرەوە نوێژ مەکەن).**

**١١٧٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى فِي فَضَاءٍ لَيْسَ بَيْنَ يَدَيْهِ شَيْءٌ. [حم١٩٦٥]

**لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە شوێنێکی ئاوەڵادا نوێژی کرد هیچ لەبەردەمی نەبوو.**

## ٢- دەروازەی: نزیکی لە سوترە و دیوار

**١١٧٨-** (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كَانَ بَيْنَ مُصَلَّى رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم وَبَيْنَ الجِدَارِ مَمَرُّ الشَّاةِ. [خ٤٩٦/ م٥٠٨]

* حسن لغيره.

**(ق) لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، وتی: لە نێوان سوژدەگای پێغەمبەر و دیوارەکەدا ڕێڕەوی مەڕێك بوو.**

**١١٧٩-** (خ) عَنْ عُمَر أنه قَالَ: المصَلُّونَ أَحَقُّ بِالسَّوَارِي مِنَ المتَحَدِّثِينَ إِلَيْهَا.

**(خ) لە عومەرەوە وتی: نوێژگەران لەپێشترن بە کۆڵەکە و پایەکان لە قسەکەران لایانەوە.**

**١١٨٠-** (خ) وعَنْهُ: أنه رَأَى رَجُلاً يُصَلِّي بَيْنَ أُسْطُوَانَتَيْنِ، فَأَدْنَاهُ إِلَى سَارِيَةٍ فَقَالَ: صَلِّ إِلَيْهَا. [خ. الصلاة، باب ٩٥]

(خ) هەر لە عومەرەوە: ئەو پیاوێکی بینی لە نێوان دوو کۆڵەکە نوێژی دەکرد، لە کۆڵەکەیەکیان نزیکی کردەوە و وتی: لای ئەمەوە نوێژ بکە.

**١١٨١**– عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى سُتْرَةٍ؛ فَلْيَدْنُ مِنْهَا، لاَ يَقْطَعُ الشَّيْطَانُ عَلَيْهِ صَلاَتَهُ**).

* إسناده صحيح، رجاله رجال الشيخين.		[د٦٩٥/ ن٧٤٧/ حم١٦٠٩٠]

[وانظر: **١٣٢٢** كان الصحابة يبتدرون السواري].

**لە سەهلی کوڕی ئەبی حەسمەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە لای سوترەیەکەوە نوێژی کرد با لێی نزیك ببێتەوە، شەیتان نوێژەکەی لەسەر نەبڕێت).**

## ٣- دەروازەی: بەرهەڵستی بەردەم نوێژگەر

**١١٨٢**– (ق) عَنْ عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم وَرِجْلاَيَ فِي قِبْلَتِهِ، فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ، فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا، قَالَتْ: وَالبيُوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ.		[خ٣٨٢/ م٥١٢]

**(ق) لە عائیشەوە –هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)– وتی: لەبەردەم پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەخەوتم و دوو لاقم لە قیبلەکەیدا بوو، کاتێك سوژدەی دەبرد چاوی لێ دادەگرتم لاقەکانم دەکێشایەوە، کاتێك هەڵدەستا رامدەکێشایەوە، وتی: لەو رۆژگارەدا ماڵەکان چرایان تێدا نەبوو.**

▪ وفِي رواية لهما: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُصَلِّي، وَهْيَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ القِبْلَةِ، عَلَى فِرَاشِ أَهْلِهِ، اعْتِرَاضَ الجَنَازَةِ.		[خ٣٨٣]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی دەکرد و ئەو[١] لە نێوان پێغەمبەر و قیبلەدا بوو، لەسەر جێی نووستنی خێزانەکەی، وەك وەستانی نوێژی جەنازە.**

---

[١] "ئەو" واتە: خاتوو عائیشە –و.

- وفي رواية لهما: أَنَّهُ ذُكِرَ عِنْدَهَا مَا يَقْطَعُ الصَّلاَةَ، فَقَالُوا: يَقْطَعُهَا: الكَلْبُ، وَالحِمَارُ، وَالمرْأَةُ، قَالَتْ: لَقَدْ جَعَلْتُمُونَا كِلاَباً! لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي، وَإِنِّي لَبَيْنَهُ وَبَيْنَ القِبْلَةِ، وَأَنَا مُضْطَجِعَةٌ عَلَى السَّرِيرِ، فَتَكُونُ لِي الحَاجَةُ، فَأَكْرَهُ أَنْ أَسْتَقْبِلَهُ، فَأَنْسَلُّ انْسِلاَلاً. [خ٥١١]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان: لای عائیشە باسی ئەو شتانە کرا نوێژ دەبڕن، وتیان: سەگ، و گوێدرێژ، و ئافرەت نوێژ دەبڕن، عائیشە وتی: ئافرەتتان کرد بە سەگ، من پێغەمبەرم(ﷺ) بینی نوێژی دەکرد، من لە نێوان ئەو و قیبلەدا بووم، من لەسەر جێگەی نووستن پاڵمدابوویەوە، پێویستیم دەبوو پێمباش نەبوو لە ڕووی قیبلەوە بەرەوڕووی بم، بۆیە خۆم دەکێشایە دواوە.**

## ٤- دەروازەی: حوکمی گوزەر کردن بە بەردەم نوێژگەردا

**١١٨٣-** (ق) عَنْ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ: أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ أَرْسَلَهُ إِلَى أَبِي جُهَيْمٍ، يَسْأَلُهُ: مَاذَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم فِي المارِّ بَيْنَ يَدَيِ المصَلِّي؟ فَقَالَ أَبُو جُهَيْمٍ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**لَوْ يَعْلَمُ المَارُّ بَيْنَ يَدَيِ المُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ، لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْراً لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ**).

قَالَ أَبُو النَّضْرِ: لاَ أَدْرِي أَقَالَ أَرْبَعِينَ يَوْماً، أَوْ شَهْراً، أَوْ سَنَةً. [خ٥١٠/ م٥٠٧]

**(ق) لە "أبي النضر"ەوە، لە بوسری کوڕی سەعیدەوە: زەیدی کوڕی خالید ڕەوانەی کرد بۆ لای ئەبی جوهەیم، پرسیاری لێ بکات: چی بیستووە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی گوزەرکەر بە بەردەم نوێژگەردا؟ ئەبو جوهەیم وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر گوزەرکەر بە بەردەم نوێژگەردا بیزانیبا چی لەسەرە چل[1] بوەستابا باشتر بوو بۆ ئەو لەوەی بە بەردەمیدا گوزەر بکات).**

**"أبو النضر" دەڵێت: نازانم فەرمووی: چل ڕۆژ، یان چل مانگ، یان چل ساڵ.**

---

[1] **مەبەستەکە چاوەڕوانی و زۆر وەستان باشتر و چاکترە تا گوزەر کردن بە بەردەم نوێژگەردا-و.**

**١١٨٤-** (ق) عَنْ أَبِي صالِحٍ السَّمَّان قال: رَأَيْتُ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ، يُصَلِّي إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، فَأَرَادَ شابٌّ مِنْ بَنِي أَبِي مُعَيْطٍ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَدَفَعَ أَبُو سَعِيدٍ فِي صَدْرِهِ، فَنَظَرَ الشَّابُّ فَلَمْ يَجِدْ مَسَاغاً إِلاَّ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَعَادَ لِيَجْتَازَ، فَدَفَعَهُ أَبُو سَعِيدٍ أَشَدَّ مِنَ الأُولَى، فَنَالَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَى مَرْوَانَ، فَشَكَا إِلَيْهِ مَا لَقِيَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَدَخَلَ أَبُو سَعِيدٍ خَلْفَهُ عَلَى مَرْوَانَ، فَقَالَ: مَا لَكَ وَلاِبْنِ أَخِيكَ يَا أَبَا سَعِيدٍ؟ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْهُ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ**). [خ٥٠٩/ م٥٠٥]

(ق) لە ئەبی صاڵحی سەممانەوە، وتی: لە ڕۆژی جومعە ئەبو سەعیدی خودریم بینی لای شتێکەوە نوێژی دەکرد بووبووە سوترە بۆی لە خەڵکی، گەنجێك لە "بني أبي معيط" ویستی بە بەردەمیدا بڕوات، ئەبو سەعید بە سینەی پاڵی پێوە نا، گەنجەکە وردبوویەوە هیچ ڕێگەیەکی تر نەبوو جگە لە بەردەمییەوە، بۆیە دیسان هەوڵی تێپەڕینی دا، ئەبو سەعید توندتر لە یەکەمجار پاڵی پێوە نا، قسەی بە ئەبو سەعید وت، پاشان ڕۆیشت بۆ لای مەروان سکاڵای ئەوەی کرد لە ئەبی سەعیدەوە تووشیهاتووە، ئەبو سەعید بەدوایدا چووە ژوورەوە بۆ لای مەروان، مەروان وتی: چی ڕوویداوە لە نێوان تۆ و برازاکەت ئەی ئەبو سەعید؟ ئەبو سەعید وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**گەر یەکێك لە ئێوە نوێژی لای شتێکەوە کرد لە خەڵکی ببێتە سوترە بۆی، گەر یەکێك ویستی بە بەردەمیدا گوزەر بکات با پاڵیبنێت، گەر ڕازی نەبوو با لەگەڵی بجەنگێ، چونکە ئەوە شەیتانە**).

## ٥- دەروازەی: ئەوەی نوێژ دەبڕێت

**١١٨٥-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَقْطَعُ الصَّلاَةَ: المَرْأَةُ، وَالحِمَارُ، وَالكَلْبُ، وَيَقِي ذَلِكَ مِثْلُ مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ**). [م٥١١]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئافرەت و گوێدرێژ و سەگ نوێژ دەبڕێت، بە ئەندازەی پاشکۆی کەژاوە ئەوە دەپارێزێت[1])**.

**١١٨٦–** عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَعِيدٍ أَنَّ عُثْمَانَ وَعَلِيّاً رضي الله عنهما قَالاَ: لاَ يَقْطَعُ صَلاَةَ المسْلِمِ شَيءٌ، وَادْرَؤُوهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ. [هق٢/٢٧٨]

**لە قەتادەوە، لە سەعیدەوە، عوسمان و عەلی(خوایان لێ رازی بێت) وتیان: هیچ شتێك نوێژی موسڵمان نابڕێت چەند دەتوانن پاڵیان بنێن[2].**

**١١٨٧–** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبد اللهِ بنِ عُمر، عَنْ أَبِيهِ كَانَ يَقُولُ: لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ شَيْءٌ مِمَّا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَي المصَلّي. [ط٣٧١/ هق٢/٢٧٨]

* إسناده صحيح.

**لە سالمی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، لە باوکییەوە، ئەو دەیوت: شتێك لەوەی بە بەردەم نوێژگەردا تێدەپەڕێت نوێژ نابڕێت.**

## ٦- دەروازەی: سوترەی ئیمام سوترەیە بۆ ئەوانەی لەدوای ئەوەوەن

**١١٨٨–** عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرٍو قَالَ: هَبَطْنَا مَعَ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم مِنْ ثَنِيَّةِ أَذَاخِرَ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَصَلَّى - يَعْنِي إِلَى جَدْرٍ - فَاتَّخَذَهُ قِبْلَةً وَنَحْنُ خَلْفَهُ، فَجَاءَتْ بَهْمَةٌ تَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَمَا زَالَ يُدَارِئُهَا حَتَّى لَصِقَ بَطْنُهُ بِالجَدْرِ، وَمَرَّتْ مِنْ وَرَائِهِ. [د٧٠٨]

* حسن صحيح.

---

[1] (بە ئەندازەی پاشکۆی کەژاوە) لە سوترە–کە بریتییە لە پارچە تەختەیەك سواربووی کەژاوە پشتی پێوە دەدات–نوێژەکەی لە ناتەواوی دەپارێزێت، زانایان جیاوازیان هەیە دەربارەی ئەم فەرموودە و فەرموودەکەی دوای ئەم فەرموودە(ژمارە ١١٨٦)، جمهوری زانایان لە پێشین و پاشین دەڵێن: تێپەڕبوونی شتێك لەوانە و هەر شتێکی تر نوێژ بەتاڵ ناکەنەوە، ئەوان وشەی (بڕین(قطع))یان لە فەرموودەکەدا بە کەمبوونەوەی خێری نوێژەکە تەئویل کردووە لەبەر سەرقاڵبوونی دڵ بەو شتانەوە، نەك مەبەست بەتاڵبوونەوەی نوێژەکە بێت–و–د.

[2] واتە ئەو شتانەی بە بەر نوێژەکەدا تێدەپەڕن پاڵیان بنێن–و.

لە عەبدولای کوڕی عەمرەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە "ثنية أذاخر" دابەزین، نوێژ هاتە بەرەوە و نوێژی کرد–واتە لای دیوارێکەوە– دیوارەکەی کردە قیبلە و ئێمەش لە دوایەوە، بەرخێك هات و بە بەردەمیدا گوزەری کرد، بەردەوام پێغەمبەر پاڵی دەنا تا سکی بە دیوارەکەوە نووسا و بەرخەکە لەدواوەی رۆیشت.

# بەشی سێیەم

# سیفەتی نوێژ

## ١- دەروازەی: (بەو جۆرە نوێژ بکەن منتان بینیوە نوێژ دەکەم)

**١١٨٩**- (ق) عَنْ أَبِي حَازِمِ بْنِ دِينَارٍ: أَنَّ رِجَالاً أَتَوْا سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ، وَقَدِ امْتَرَوْا فِي الْمِنْبَرِ مِمَّ عُودُهُ؟ فَسَأَلُوهُ عَنْ ذلِكَ، فَقَالَ: واللهِ إِنِّي لأَعْرِفُ مِمَّا هُوَ، وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ أَوَّلَ يَوْمٍ وُضِعَ، وَأَوَّلَ يَوْمٍ جَلَسَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، أَرْسَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى فُلاَنَةَ. امْرَأَةٍ قَدْ سَمَّاهَا سَهْلٌ .: **(مُرِي غُلاَمَكِ النَّجَّارَ، أَنْ يَعْمَلَ لِي أَعْوَاداً، أَجْلِسُ عَلَيْهِنَّ إِذَا كَلَّمْتُ النَّاسَ)**، فَأَمَرَتْهُ، فَعَمِلَهَا مِنْ طَرْفَاءِ الغَابَةِ، ثُمَّ جاءَ بِهَا، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَمَرَ بِهَا فَوُضِعَتْ هَاهُنَا، ثُمَّ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى عَلَيْهَا وَكَبَّرَ وَهُوَ عَلَيْهَا، ثُمَّ رَكَعَ وَهُوَ عَلَيْهَا، ثُمَّ نَزَلَ القَهْقَرى، فَسَجَدَ فِي أَصْلِ المِنْبَرِ، ثُمَّ عَادَ، فَلَمَّا فَرَغَ، أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: **(أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّمَا صَنَعْتُ هذَا لِتَأْتَمُّوا، وَلِتَعَلَّمُوا صَلاتِي)**. [خ٩١٧ (٣٧٧)/ م٥٤٤]

**(ق) لە ئەبی حازمی کوڕی دینارەوە: پیاوانێك هاتن بۆ لای سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی، ئەوان ناکۆکییان بۆ دروست بووبوو دەربارەی مینبەرەکەی پێغەمبەر چ جۆرە دارێك بووە؟ لەو بارەیەوە پرسیاریان لێکرد، وتی: سوێند بە خودا دەزانم لە چ جۆرە دارێکە، یەکەمین رۆژ مینبەرەکە دامەزرا من بینیم، هەروەها یەکەمین رۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری دانیشت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) جوابی نارد بۆ فلان ئافرەت- ئافرەتێك سەهلی ناوی هێنا-: (فەرمان بکە بە غولامەکەت تەختێکم بۆ دروست بکات کاتێك قسە بۆ خەڵکی دەکەم لەسەری دابنیشم)، ئافرەتەکە فەرمانی کرد بە غولامەکەی، ئەویش لە درەختی (طرفاء)ی دارستان دروستی کرد، پاشان هێنای، ناردی بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، فەرمانی کرد و لەو جێگەیە دانرا، پاشان پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی نوێژی لەسەر کرد و "الله أکبر"ی کرد و ئەو لەسەری بوو، رکوعی**

برد و ئەو لەسەری بوو، پاشان پاشە و پاش هاتە دواوە و لە ئەسڵی مینبەرەکەدا سوژدەی برد، پاشان گەڕایەوە، کاتێك تەواو بوو رووی لە خەڵکەکە کرد و فەرمووی: **(ئەی خەڵکینە بۆیە ئەمەم دروستکردووە تا چاوم لێبکەن و نوێژی من فێربن).**

١١٩٠– عَنْ عَبْدِ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَهْلُ مَكَّةَ يَقُولُونَ: أَخَذَ ابْنُ جُرَيْجٍ الصَّلاَةَ مِنْ عَطَاءٍ، وَأَخَذَهَا عَطَاءٌ مِنْ ابْنِ الزُّبَيْرِ، وَأَخَذَهَا ابْنُ الزُّبَيْرِ مِنْ أَبِي بَكْرٍ، وَأَخَذَهَا أَبُو بَكْرٍ مِنَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مَا رَأَيْتُ أَحَداً أَحْسَنَ صَلاَةً مِنْ ابْنِ جُرَيْجٍ. [حم٧٣]

لە عبدالرزاقەوە، وتی: ئەهلی مەککە دەڵێن: ئیبن جورەیج نوێژی لە عەتاوە وەرگرت، عەتا لە ئیبن زوبەیرەوە وەریگرت، ئیبن زوبەیر لە ئەبی بەکرەوە وەریگرت، ئەبوبەکر لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەریگرت، هیچ کەسم نەبینیوە وەك ئیبن جورەیج نوێژی چاك و باش بێت.

## ٢- دەروازەی: فێرکردنی چۆنێتی نوێژ

١١٩١– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم دَخَلَ المسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَرَدَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَيْهِ السَّلاَمَ، فَقَالَ: **(ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ)**، فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: **(ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ)**، ثَلاَثاً، فَقَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ! فَمَا أُحْسِنُ غَيْرَهُ، فَعَلِّمْنِي، قَالَ: **(إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ القُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعاً، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِماً، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِداً، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِساً، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِداً، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا)**. [خ٧٩٣ (٧٥٧)/ م٣٩٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، پیاوێکیش هاتە ژوورەوە و نوێژی کرد، پاشان هات و سەلامی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی سەلامەکەی دایەوە، و فەرمووی: **(بگەڕێوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد)**، نوێژی کرد و پاشان هاتەوە و سەلامی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، فەرمووی: **(بگەڕێوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت**

**نەکرد)**، سێ جار، پیاوەکە وتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق رەوانە کردووە، لەو باشتر نازانم، فێرم بکە، پێغەمبەر فەرمووی: **(گەر هەستای بۆ نوێژ "الله أکبر" بکە، پاشان ئەوەی لە لاتە لە قورئان بیخوێنە، پاشان رکوع ببە تا لە رکوع دڵنیا و دامەزراو دەبیت، پاشان سەر بەرزبکەرەوە تا لە وەستان دڵنیا و دامەزراو دەبیت، پاشان سوژدە ببە تا لە سوژدە دڵنیا و دامەزراو دەبیت، پاشان سەر بەرزبکەرەوە تا لە دانیشتن دڵنیا و دامەزراو دەبیت، پاشان سوژدە ببە تا لە سوژدە دڵنیا و دامەزراو دەبیت، پاشان ئەوە لە هەموو نوێژەکەت[1] ئەنجام بدە)**.

**١١٩٢-** (خ) عَنْ مَالِكِ بْنِ الحُوَيْرِثِ اللَّيْثِيِّ: أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي، فَإِذَا كَانَ فِي وِتْرٍ مِنْ صَلاَتِهِ، لَمْ يَنْهَضْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِداً. [خ٨٢٣]

**(خ) لە مالیکی کوڕی حوەیریسی لەیسییەوە: ئەو پێغەمبەری(ﷺ) بینی نوێژی دەکرد، گەر لە نوێژی ویتردا بوایە بەرزنەدەبوویەوە تا لە دانیشتن رێك دەبوویەوە[2].**

**١١٩٣-** (خ) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ: أَنَّهُ كَانَ جَالِساً مَعَ نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَذَكَرْنَا صَلاَةَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم.

فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ: أَنَا كُنْتُ أَحْفَظَكُمْ لِصَلاَةِ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم،... وذكر الحديث مختصراً. [خ٨٢٨]

**(خ) لە محەمەدی کوڕی عەمری کوڕی عەتاوە: ئەو لەگەڵ چەند کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو، نوێژی پێغەمبەری بیرهێنایەوە.**

**ئەبو حومەیدی ساعیدی وتی: من لە هەمووتان زیاتر نوێژی پێغەمبەری خودام(ﷺ) لەبەرە،...بە کورتی فەرموودەکەی باس کرد.**

---

[1] واتە: لە رکاتەکانی تردا هەمان شت ئەنجام بدە-و.

[2] ئەمە رۆشنکردنەوەی رەوایەتی (جلسة الإستراحة-دانیشتن لە بەرزبوونەوەی سوژدەی دووەم)ە لە نوێژدا، ئیمامی شافیعی و کۆمەڵێك لە ئەهلی فەرموودە وەریانگرتووە.

■ ونص الترمذي: قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ اعْتَدَلَ قَائِماً، وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: الله أَكْبَرُ، وَرَكَعَ، ثُمَّ اعْتَدَلَ، فَلَمْ يُصَوِّبْ رَأْسَهُ وَلَمْ يُقْنِعْ وَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ وَاعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلاً، ثُمَّ أَهْوَى إِلَى الأَرْضِ سَاجِداً، ثُمَّ قَالَ: الله أَكْبَرُ، ثُمَّ جَافَى عَضُدَيْهِ عَنْ إِبْطَيْهِ، وَفَتَخَ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ ثَنَى رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَقَعَدَ عَلَيْهَا، ثُمَّ اعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلاً، ثُمَّ أَهْوَى سَاجِداً، ثُمَّ قَالَ: الله أَكْبَرُ، ثُمَّ ثَنَى رِجْلَهُ وَقَعَدَ، وَاعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ، ثُمَّ نَهَضَ، ثُمَّ صَنَعَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ، حَتَّى إِذَا قَامَ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ كَبَّرَ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، كَمَا صَنَعَ حِينَ افْتَتَحَ الصَّلاَةَ، ثُمَّ صَنَعَ كَذَلِكَ، حَتَّى كَانَتِ الرَّكْعَةُ الَّتِي تَنْقَضِي فِيهَا صَلاَتُهُ، أَخَّرَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَقَعَدَ عَلَى شِقِّهِ مُتَوَرِّكاً، ثُمَّ سَلَّمَ. [ت٣٠٤]

**دەقەکەی ترمزی: وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستایە بۆ نوێژ بە ڕێکی بە پێوە دەوەستا، دوو دەستی بەرز دەکردەوە تا تەریب دەبوون بە دوو شانی، گەر بیویستبا رکوع ببات دوو دەستی بەرز دەکردەوە تا تەریب دەبوون بە دوو شانی، پاشان دەیفەرموو: "الله أكبر" و رکوعی دەبرد، پاشان لە رکوعدا پشتی ڕێك و راست دەبوو، سەری خۆی نزم و بەرز نەدەکردەوە، دوو دەستی دەخستە سەر ئەژنۆکانی، پاشان دەیفەرموو: "سمع الله لمن حمده"، دوو دەستی بەرز دەکردەوە و ڕێك و راست بە پێوە دەوەستا تا هەموو ئێسکەکان بە ڕێك و راستی دەچوونەوە شوێنی خۆیان، پاشان بۆ سوژدە بەرەو زەوی بەردەبوویەوە، پاشان دەیفەرموو: "الله أكبر"، پاشان دوو قۆڵی لە بنباڵی دوور دەخستەوە، پەنجەکانی پێی دادەکوتی[1]، پاشان لاقی چەپی رادەخست و لەسەری دادەنیشت، پاشان ڕێکدەبوویەوە تا هەموو ئێسکەکان بە ڕێکی و راستی دەچوونەوە شوێنی خۆیان، پاشان بۆ سوژدە بەردەبوویەوە، پاشان دەیفەرموو: "الله أكبر"، پاشان لاقی رادەخست و دادەنیشت، ڕێك و راست دەبوو تا هەموو ئێسکەکان دەچوونەوە شوێنی خۆیان، پاشان**

---

[1] واتە: هەڵدەدا–و.

هەڵدەستایەوە، پاشان لە رکاتی دووەم هەمان شتی دووبارە دەکردەوە، کە لە دوو سوژدەکە هەڵدەستا "الله أكبر"ی دەکرد، دوو دەستی بەرز دەکردەوە تا تەریب دەبوون بە دوو شانی، وەك چۆن ئەنجامی دا کاتێك نوێژەکەی دابەست، پاشان هەر بەو جۆرەی ئەنجام دەدا، تا ئەو رکاتەی نوێژەکەی تێدا تەواو دەبوو، لاقی چەپی ئەبردە دواوە و لەسەر لایەکی دادەنیشت بە خۆدان بەسەر سمتدا، پاشان سڵاوی دەدایەوە.

١١٩٤- (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَسْتَفْتِحُ الصَّلاَةَ بِالتَّكْبِيرِ، وَالقِرَاءَةَ بِالحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ، وَكَانَ إِذَا رَكَعَ لَمْ يُشْخِصْ رَأْسَهُ وَلَمْ يُصَوِّبْهُ، وَلكِنْ بَيْنَ ذلِكَ. وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكوعِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَائِماً، وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السَّجْدَةِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ جَالِساً، وَكَانَ يَقُولُ، فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ، التَّحِيَّةَ. وَكَانَ يَفْرُشُ رِجْلَهُ اليُسْرَى، وَيَنْصِبُ رِجْلَهُ اليُمْنَى، وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عُقْبَةِ الشَّيْطَانِ، وَيَنْهَى أَنْ يَفْتَرِشَ الرَّجُلُ ذِرَاعَيْهِ افْتِرَاشَ السَّبُعِ، وَكَانَ يَخْتِمُ الصَّلاَةَ بِالتَّسْلِيمِ. [م٤٩٨]

(م) لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژەکەی بە "الله أكبر" دەکردەوە، هەروەها خوێندنی (الحمد لله رب العالمين)، ئەو رکوعی دەبرد سەری قنج نەدەکردەوە و سەری نەوی نەدەکرد، بەڵکو لە نێوان ئەو دوانەدا، ئەو کاتێك سەری لە رکوع بەرز دەکردەوە سوژدەی نەدەبرد تا بە پێوە وەستانەکەی رێك و راست دەبوو، ئەو کاتێك لە سوژدە سەری بەرز دەکردەوە سوژدەکەی تری نەدەبرد تا دانیشتنەکەی رێك و راست دەبوو، ئەو دەیفەرموو: (لە هەموو دوو رکاتێکدا تەحیاتێك هەیە)، ئەو لاقی چەپی رادەخست و لاقی راستی هەڵدەدا، ئەو نەهی دەکرد لە "عقبة الشیطان"[1]، هەروەها نەهی دەکرد پیاو دوو باڵی رابخات وەك چۆن درندە رایدەخات، ئەو نوێژەکەی بە سەلامدانەوە کۆتایی پێ دەهێنا.

---

[1] "عقبة الشيطان": ئەبو عوبەید و کەسانی تر دەڵێن: بریتییە لە لە هەڵدان و داکوتینی دوو پێ و سمت خستنە سەر دوو پاژنەی پێیەکان کە نەهی لێکراوە، هەروەها راخستنی دوو باڵە وەك چۆن سەگ رایاندەخات.

**١١٩٥**- (م) عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعري قال: إِنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم خَطَبَنَا فَبَيَّنَ لَنَا سُنَّتَنَا، وَعَلَّمَنَا صَلاَتَنَا، فَقَالَ: (**إِذَا صَلَّيْتُمْ؛ فَأَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ، ثُمَّ لْيَؤُمَّكُمْ أَحَدُكُمْ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَالَ: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، فَقُولُوا: آمِينَ، يُجِبْكُمُ الله، فَإِذَا كَبَّرَ وَرَكَعَ فَكَبِّرُوا وَارْكَعُوا، فَإِنَّ الإِمَامَ يَرْكَعُ قَبْلَكُمْ وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ**)، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**فَتِلْكَ بِتِلْكَ، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ! رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ، يَسْمَعُ الله لَكُمْ، فَإِنَّ الله تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَالَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ صلّى الله عليه وسلّم: سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ، وَإِذَا كَبَّرَ وَسَجَدَ؛ فَكَبِّرُوا وَاسْجُدُوا، فَإِنَّ الإِمَامَ يَسْجُدُ قَبْلَكُمْ وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ**)، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**فَتِلْكَ بِتِلْكَ، وَإِذَا كَانَ عِنْدَ القَعْدَةِ، فَلْيَكُنْ مِنْ أَوَّلِ قَوْلِ أَحَدِكُمْ: التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لله. السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ. السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ. أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ**). [م٤٠٤]

(م) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری بۆداین و سوننەتەكانی بۆ رۆشن كردینەوە و نوێژەكەمانی فێركردین و فەرمووی: (**گەر نوێژتان كرد، ریزەكانتان رێك بكەن، و پاشان با یەكێكتان ئیمامەتتان بۆ بكات، گەر "الله أكبر"ی كرد، "الله أكبر" بكەن، گەر وتی: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، ئێوە بڵێن: ئامین، خودا ئێوەی خۆشدەوێت، گەر "الله أكبر" ی كرد و ركوعی برد ئێوەش "الله أكبر" بكەن و ركوع ببەن، ئیمام بەرلە ئێوە ركوع دەبات و بەرلە ئێوە بەرز دەبێتەوە**)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئەوە بەوە، گەر وتی: "سمع الله لمن حمده" با ئێوە بڵێن: "اللهم ربنا لك الحمد" خودا گوێتان بۆ دەگرێت، گەر "الله أكبر"ی كرد و سوژدەی برد "الله أكبر" بكەن و سوژدە ببەن، ئیمام بەر لە ئێوە سوژدە دەبات و بەر لە ئێوە بەرز دەبێتەوە**)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئەوە بە ئەوە[1]، گەر گەیشتە دانیشتن با سەرەتای قسەی یەكێك لە ئێوە بریتی بێت لە: "التحيات اطيبات الصلوات لله، السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، أشهد أنّ لا إله إلاّ الله، وأشهد أنّ محمدا عبده ورسوله"**).

---

(١) واتە: ئەو چی دەكات ئێوەش بەو جۆرە–و.

**١١٩٦**– عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ قالَ: قُلْتُ: لَأَنْظُرَنَّ إِلَى صَلاَةِ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم كَيْفَ يُصَلِّي؟ قَالَ: فَقَامَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم فَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ، فَكَبَّرَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى حَاذَتَا أُذُنَيْهِ، ثُمَّ أَخَذَ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ رَفَعَهُمَا مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا مِثْلَ ذَلِكَ، فَلَمَّا سَجَدَ وَضَعَ رَأْسَهُ بِذَلِكَ المَنْزِلِ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ، ثُمَّ جَلَسَ فَافْتَرَشَ رِجْلَهُ اليُسْرَى وَوَضَعَ يَدَهُ اليُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ اليُسْرَى، وَحَدَّ مِرْفَقَهُ الأَيْمَنَ عَلَى فَخِذِهِ اليُمْنَى، وَقَبَضَ ثِنْتَيْنِ وَحَلَّقَ حَلْقَةً، وَرَأَيْتُهُ يَقُولُ: هَكَذَا، وَحَلَّقَ بِشْرٌ الإِبْهَامَ وَالوُسْطَى وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ. [د٧٢٦، ٩٥٧/ ت٢٩٢/ ن٨٨٠/ جه٨٦٧/ مي١٣٩٧]

- هذا لفظ أبي داود.

* صحيح.

**لە وائیلی کوڕی حیجرەوە وتی: وتم: تەماشای نوێژی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەکەم چۆن نوێژ دەکات؟ وتی: پێغەمبەری خودا هەستا و ڕووی لە قیبلە کرد، "الله أکبر"ی کرد و دەستی بەرزکردەوە تا تەنیشتی دوو گوێی، پاشان دەستی چەپی بە دەستی ڕاست گرت، کاتێك ویستی بچێتە ڕکوع هەروەك ئەوە[1] دوو دەستی بەرز دەکردەوە، پاشان دوو دەستی خستە سەر دوو ئەژنۆی، کاتێك لە ڕکوع سەری بەرزکردەوە دوو دەستی هەروەك ئەوە بەرز کردەوە، کاتێك سوژدەی برد سەری خستە ئەو شوێنەی بەردەمی، پاشان دانیشت و لاقی چەپی ڕاخست، دەستی چەپی خستە سەر ڕانی چەپ، و ئەنیشکی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاست دانا، دوو پەنجەی نوقاند[2] و ئەڵقەیەکی دروست کرد، و بینیم بەم جۆرەی دەوت، بیشر بە پەنجە گەورە و پەنجەی ناوەڕاست بازنەیەکی دروست کرد و بە پەنجەی شایەتمان ئاماژەی کرد[3].**

**ئەمە لەفزی ئەبی داودە.**

---

[1] واتە: هەروەك "الله أکبر"ی تەحریم–و.

[2] واتە: چەماندەوە–و.

[3] واتە: پەنجەی شایەتمانی بەرزکردەوە–و.

## ٣- دەروازەی: "الله أكبر" و بەرزكردنەوەی دوو دەست لە كردنەوەی نوێژ و شتانی تر

**١١٩٧-** (ق) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم إِذَا قَامَ فِي الصَّلاَةِ، رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى تَكُونَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَكَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ حِينَ يُكَبِّرُ لِلرُّكُوعِ، وَيَفْعَلُ ذَلَكَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، وَيَقُولُ: (**سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ**)، وَلاَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السُّجُودِ. [خ٧٣٦ (٧٣٥)/ م٣٩٠]

**(ق) لە عەبدولڵای كوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی گەر لە نوێژدا بەپێوە بوەستایە دوو دەستی بەرز دەكردەوە تا تەنیشت دوو شانی، هەروەها ئەوەی ئەنجام دەدا كاتێ "الله أكبر"ی دەكرد بۆ ركوع، هەر بەو جۆرە ئەوەی ئەنجام دەدا كاتێك سەری لە ركوع بەر دەكردەوە، و دەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده)، پاشان دەیفەرموو: (ربنا ولك الحمد) بەرلەوەی سوژدە ببات، لە سوژدەدا ئەوەی نەدەكرد[١].**

**١١٩٨-** (ق) عَنْ أَبِي سَلَمة: أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ كَانَ يُكَبِّرُ فِي كُلِّ صَلاَةٍ مِنَ المَكْتُوبَةِ وَغَيْرِهَا، فِي رَمَضَانَ وَغَيْرِهِ، فَيُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ يَقُولُ: رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ قَبْلَ أَنْ يَسْجُدَ، ثُمَّ يَقُولُ: الله أَكْبَرُ حِينَ يَهْوِي سَاجِداً، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِين يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنَ الجُلُوسِ فِي الاِثْنَتَيْنِ، وَيَفْعَلُ ذلِكَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ حَتَّى يَفْرُغَ مِنَ الصَّلاَةِ، ثُمَّ يَقُولُ حِينَ يَنْصَرِفُ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنِّي لأَقْرَبُكُمْ شَبَهاً بِصَلاَةِ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم، إِنْ كَانَتْ هذِهِ لَصَلاَتَهُ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا. [خ٨٠٣ (٧٨٥)/ م٣٩٢]

---

[١] واتە: لە نێوان دوو سوژدەكە دەستی بەرز نەدەكردەوە-و.

(ق) لە ئەبی سەلەمەوە: ئەبو هورەیرە لە هەموو نوێژێکدا، نوێژی فەرز و نوێژەکانی تر "الله أكبر"ی دەکرد، لە رەمەزان و غەیری رەمەزان، کاتێك بەپێوە دەوەستا "الله أكبر"ی دەکرد، کاتێك رکوعی دەبرد"الله أكبر"ی دەکرد، پاشان دەیوت "سمع الله لمن حمده"، پاشان دەیوت: "ربنا ولك الحمد" بەرلەوەی سوژدە ببات، پاشان دەیوت: "الله أكبر" کاتێك دەچوو بۆ سوژدە، پاشان "الله أكبر"ی دەکرد کاتێك سەری لە سوژدە بەرز دەکردەوە، پاشان "الله أكبر"ی دەکرد کاتێك سوژدەی دەبردەوە، پاشان "الله أكبر"ی دەکرد کاتیێ سەری لە سوژدە بەرز دەکردەوە، پاشان "الله أكبر"ی دەکرد کاتیێ لە دانیشتنی دوو سوژدەکە بەرز دەبوویەوە، ئەوەی ئەنجام دەدا لە هەموو رکاتێکدا تا لە نوێژەکە دەبوویەوە، پاشان کە دەرۆیشت دەیوت: سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، من لە هەمووتان لە شێوەی نوێژی پێغەمبەری خودا(ﷺ) نزیکترم، نوێژی ئەو بەم جۆرە بوو تا لە دنیا دەرچوو.

**١١٩٩**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم إِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ. [د٧٤٣]

* صحيح.

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەر لە دوو رکات بەرزدەبوویەوە "الله أكبر"ی دەکرد و دوو دەستی بەرز دەکردەوە[١].

## ٤- دەروازەی: دانانی دوو دەست لە نوێژدا

**١٢٠٠**– (خ) عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يُؤْمَرُونَ أَنْ يَضَعَ الرَّجُلُ الْيَدَ الْيُمْنَى عَلَى ذِرَاعِهِ الْيُسْرَى فِي الصَّلاَةِ. قَالَ أَبُو حَازِمٍ: لاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ يَنْمِي ذلِكَ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٧٤٠]

---

[١] واتە: لە نوێژی مەغریب و نوێژە چوار رکاتییەکان-و.

**(خ) لە ئەبی حازمەوە، لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، وتی: فەرمان بە خەڵکی دەکرا لە نوێژدا دەستی راستیان لەسەر باڵی چەپیان دابنێن. ئەبو حازم وتی: دەزانم ئەوەی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بەرز دەکردەوە[1].**

**١٢٠١**– عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ هُلْبٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَؤُمُّنَا فَيَأْخُذُ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ. [ت٢٥٢/ جه٨٠٩]

* حسن صحيح.

**لە قەبیصەی کوڕی هولبەوە، لە باوکییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیمامەتی بۆ دەکردین دەستی چەپی بە دەستی راست دەگرت.**

**١٢٠٢**– عَنْ طَاوُسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَضَعُ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى يَدِهِ الْيُسْرَى، ثُمَّ يَشُدُّ بَيْنَهُمَا عَلَى صَدْرِهِ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ. [د٧٥٩]

* صحيح مرسل.

## ٥- دەروازەی: ئەوەی لە نێوان "الله أكبر"ی نوێژدابەستن و خوێندنی قورئاندا[2] دەیڵێت

**١٢٠٣**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَسْكُتُ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَبَيْنَ القِرَاءَةِ إِسْكَاتَةً. قَالَ أَحْسِبُهُ قَالَ: هُنَيَّةً. فَقُلْتُ: بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللهِ! إِسْكَاتُكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالقِرَاءَةِ، مَا تَقُولُ؟ قَالَ: **(أَقُولُ: اللَّهُمَّ! بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ، كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ! نَقِّنِي مِنَ الخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ! اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالبَرَدِ)**. [خ٧٤٤/ م٥٩٨]

---

[1] **واتە: سەهلی کوڕی سەعد فەرموودەکەی بۆ لای پێغەمبەر بەرز دەکردەوە، بۆیە (فەرمان دەکرا) واتە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کردووە–و.**

[2] **واتە: خوێندنی سورەتی (الفاتحة)–و.**

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نێوان "الله أكبر" و خوێندنی قورئان بێدەنگبوونێك بێدەنگ دەبوو-وتی: پێموایە وتی: کەمێك[1]- وتم: دایك و باوکم فیدات بێت، ئەی پێغەمبەری خودا، بێدەنگبوونت لە نێوان "الله أكبر" و خوێندنی قورئان چی دەڵێی؟ فەرمووی: **(دەڵێم: "أللهم باعد بيني وبين خطاياي كما باعدت بين المشرق والمغرب، أللهم نقني من خطاياي كما يُنقى الثوبُ الأبيضَ من الدنس، أللهم اغسل خطاياي بالماء والثلج والبَرَد")**.

**١٢٠٤-** (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم، إِذْ قَالَ رَجُلٌ منَ القَوْمِ: الله أَكْبَرُ كَبِيراً، وَالحَمْدُ لله كَثِيراً، وَسُبْحَانَ الله بُكْرَةً وَأَصِيلاً، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (مَنِ القَائِلُ كَلِمَةَ كَذَا وَكَذَا)؟ قَالَ رَجُلٌ مِنَ القَوْمِ: أَنَا، يَا رَسُولَ الله! قَالَ: (عَجِبْتُ لَهَا، فُتِحَتْ لَهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ). [م٦٠١]

(م) لە ئیبن عومەرەوە، وتی: کاتێك ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژمان دەکرد، پیاوێك لە خەڵکەکە وتی: "الله أكبر كبيرا، والحمد لله كثيرا، وسبحان الله بكرة وأصيلا"، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کێ بوو ئەو کەلیمە و ئەو کەلیمەی وت؟)**، پیاوێك لە خەڵکەکە وتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(سەرم لێیان سوڕما[2]، دەروازەکانی ئاسمانیان بۆ کرانەوە)**.

- قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فما تركتهنَّ منذُ سمعتُ رسولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يقول ذلك.

ئیبن عومەر وتی: وازملێنەهێناون لەو کاتەوەی لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست ئەوەی فەرموو.

**١٢٠٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلاَةَ قَالَ: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، تَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ).

* صحيح. [د٧٧٥/ ت٢٤٢/ ن٨٩٨/ جه٨٠٤/ مي١٢٧٥]

---

[1] واتە: وتی: پێموایە پێغەمبەر کەمێك بێدەنگ دەبوو-و.

[2] واتە: لەو چەند وشەیە سەرمسوڕما-و.

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەر(ﷺ) کە نوێژی دەکردەوە دەیفەرموو: **(سبحانك اللهم وبحمدك، تبارك اسمك، وتعالى جدُّك، ولا إله غيرُك).**

## ٦- دەروازەی: خوێندنی "الفاتحة" لە هەموو رکاتێکدا

**١٢٠٦-** (ق) عَنْ عُبَادَةَ بنِ الصَّامِتِ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ صَلاَةَ لِمنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ).** [خ٧٥٦/ م٣٩٤]

**(ق) لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نوێژ نییە بۆ کەسێك "فاتحة الكتاب" نەخوێنێت).**

**١٢٠٧-** (ق) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ رضي الله عنهما، كَانُوا يَفْتَتِحُونَ الصَّلاَةَ: بِالحَمْدُ لله رَبِّ العَالَمِينَ. [خ٧٤٣/ م٣٩٩]

**(ق) لە ئەنەسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر(خوایان لێ رازی بێت) نوێژیان بە "الحمد لله رب العالمين" دەکردەوە.**

- زاد في رواية مسلم: لا يذكرون ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ①﴾ في أول قراءة، ولا في آخرها.

**لە ریوایەتەکەی موسلیمدا ئەمە زیاد بووە: لە سەرەتای خوێندن و کۆتایی خوێندن ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ①﴾یان زکر نەدەکرد[1].**

**١٢٠٨-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ القُرْآنِ، فَهِيَ خِدَاجٌ)** ثَلاَثاً، غَيْرُ تَمَامٍ. فَقِيلَ لأَبِي هُرَيْرَةَ: إِنَّا نَكُونُ وَرَاءَ الإِمَامِ، فَقَالَ: اقْرَأْ بِهَا فِي نَفْسِكَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(قَالَ الله تَعَالَى: قَسَمْتُ** الصَّلاَةَ بَيْنِي وبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، فَإِذَا قَالَ العَبْدُ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ②﴾، قَالَ الله تَعَالَى: حَمِدَنِي عَبْدِي، وَإِذَا قَالَ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ③﴾، قَالَ الله

---

[1] لە نوێژە جەهرییەکاندا دەنگیان پێ بەرز نەدەکردەوە-و.

تَعَالَى: أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي، وَإِذَا قَالَ: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾، قَالَ: مَجَّدَنِي عَبْدِي . وَقَالَ مَرَّةً: فَوَّضَ إِلَيَّ عَبْدِي .، فَإِذَا قَالَ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، قَالَ: هَذَا بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، فَإِذَا قَالَ: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، قَالَ: هَذَا لِعَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ). [م٣٩٥]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس نوێژێکی کرد و "أم القرآن"ی تێدا نەخوێند ناتەواوە)**، سێ جار، تەواو نییە، وترا بە ئەبو هورەیرە: ئێمە لەدوای ئیمامەوە دەبین؟[1] وتی: لە نەفسی خۆتدا بیخوێنە، چونکە من لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست دەیفەرموو: **(خودا(سبحانه وتعالى) فەرمووی: نوێژم لە نێوان خۆم و بەندەکەم بۆ دوو نیوە بەش کردووە، ئەوەی بەندەکەشم داوای کرد بۆی هەیە، کاتێك بەندە دەڵێت:﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: بەندەکەم حەمدی کردم، گەر وتی: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: بەندەکەم سەنای کردم، گەر وتی: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: بەندەکەم پیرۆز و شکۆمەندی کردم-** جارێك فەرمووی: **بەندەکەم رادەستی منی کرد- گەر وتی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، دەفەرموێت: ئەمە لە نێوان من و بەندەکەمدایە و بۆ بەندەکەم هەیە داوا بکات، گەر وتی: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، دەفەرموێت: ئەمە بۆ بەندەکەمە و ئەوەی بەندەکەم داوای کرد بۆی هەیە).**

١٢٠٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا نَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالعَصْرِ خَلْفَ الإِمَامِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ، بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ وَسُورَةٍ، وَفِي الأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ. [جه٨٤٣]

* صحيح.

[1] واتە: ئایا لە نوێژە جەهرییەکاندا کاتێ ئیمام (الفاتحة) دەخوێنێت ئێمەش بیخوێنین؟-و.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: لە نیوەڕۆ و عەصردا لەدوای ئیمامەوە و لە دوو رکاتەکەی یەکەمدا "فاتحة الکتاب" و سورەتێکمان دەخوێند، لە دوو رکاتەکەی تردا تەنها "فاتحة الکتاب".

## ٧- دەروازەی: ئاشکراکردن و شاردنەوە لە نوێژدا

**١٢١٠-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَرَأَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِيمَا أُمِرَ، وَسَكَتَ فِيمَا أُمِرَ، ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ [مريم:٦٤]، ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[الأحزاب:٢١]. [خ٧٧٤]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لەوەی فەرمانی پێکرا بوو بە خوێندن و دەنگ هەڵبڕین دەیخوێند و دەنگی هەڵدەبڕی، لەوەش فەرمانی پێکرابوو بە بێدەنگ بوون بێدەنگ دەبوو، ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ [مريم:٦٤]، ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[الأحزاب:٢١].

**١٢١١-** عَنْ مَالِك، عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ الله بْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا فَاتَهُ شَيْءٌ مِنَ الصَّلاَةِ مَعَ الإِمَامِ فِيمَا جَهَرَ فِيهِ الإِمَامُ بِالقِرَاءَةِ، أَنَّهُ إِذَا سَلَّمَ الإِمَامُ قَامَ عَبْدُ الله بْنُ عُمَرَ فَقَرَأَ لِنَفْسِهِ فِيمَا يَقْضِي وَجَهَرَ. [ط١٨١]

* إسناده صحيح.

لە مالیکەوە، لە نافیعەوە: گەر ئیبن عومەر لەگەڵ ئیمام شتێك لە نوێژی لەدەستچووبا لەوەی ئیمام بە خوێندنەوە دەنگی تێدا هەڵبڕی بوو[١]، کاتێك ئیمام

[١] واتە: دوو رکاتی یەکەمی نوێژی مەغریب و دوو رکاتی یەکەمی نوێژی عیشا و دوو رکاتی نوێژی بەیانی، هەر رکاتێك لەمانەی لەگەڵ ئیمام لەدەستچووبا کاتێك ئیمام سەلامی دەدایەوە ئەو هەڵدەستا و رکاتەکەی یان دوو رکاتەکەی تەواو دەکرد و دەنگی تێدا بەرز دەکردەوە، چونکە لەو رکاتانە بووە ئیمام دەنگی تێدا بەرز کردووەتەوە-و.

سەلامی دەدایەوە عەبدوڵای کوڕی عومەر هەڵدەستا و بۆ خۆی دەیخوێند لەوەی تەواوی دەکرد دەنگی هەڵدەبڕی.

## ٨- دەروازەی: ئامین کردن

**١٢١٢–** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ المَلاَئِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنْبِهِ)**.

وَقَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَكَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (آمِينَ). [خ٧٨٠/ م٤١٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئیمام ئامینی کرد ئامین بکەن، چونکە هەر کەس ئامینەکەی لەگەڵ ئامینی فریشتە ڕێکبکەوێ خودا لە گوناهی پێشینەی دەبوورێت)**.

شیهاب دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: (آمین).

**١٢١٣–** عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم إِذَا قَرَأَ: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، قَالَ: (آمِينَ)، وَرَفَعَ بِهَا صَوْتَهُ. [د٩٣٢/ ت٢٤٨/ جه٨٥٥/ مي١٢٨٣]

لە وائیلی کوڕی حوجرەوە، وتی: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ)﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ی دەخوێند دەیفەرموو: **(آمین)**، دەنگی پێ بەرز دەکردەوە.

- ولفظ الترمذي: وَمَدَّ بِهَا صَوْتَهُ.

لەفزەکەی ترمزی: دەنگی خۆی پێ درێژ دەکردەوە.

* صحيح.

## ٩- دەروازەی: خوێندن لە نوێژی بەیانیدا

**١٢١٤–** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَرَأَ فِي رَكْعَتَي الفَجْرِ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ①﴾، وَ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ①﴾. [م٧٢٦]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە دوو رکاتە سوننەتەکەی بەیانیدا: (﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ①﴾، ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ①﴾)ی خوێند.**

**١٢١٥**– (م) عن ابنِ عَبَّاسٍ قال: كانَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ يَقْرَأُ في رَكْعَتَيِ الفَجْرِ: ﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾[البقرة:١٣٦]، وَالَّتي في آلِ عِمْرَانَ[٦٤]: ﴿تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾. [م٧٢٧]

**(م) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە دوو رکاتە سوننەتەکەی بەیانیدا: (﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾[البقرة:١٣٦] و ئەوەی لە (آل عمران)دایە: ﴿تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾ [آل عمران: ٦٤]) دەخوێند.**

**١٢١٦**– عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ: أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ المعَوِّذَتَيْنِ، قَالَ عُقْبَةُ: فَأَمَّنَا بِهِمَا رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم فِي صَلاَةِ الفَجْرِ. [ن٩٥١]

* صحيح.

**لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە: ئەو پرسیاری (المعوذتين)ی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، عوقبە وتی: لە نوێژی بەیانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەو دوانە ئیمامەتی بۆ کردین.**

**١٢١٧**– عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ الله الجُهَنِيِّ: أَنَّ رَجُلاً مِنْ جُهَيْنَةَ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقْرَأُ فِي الصُّبْحِ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ﴾ [الزلزلة: ١] فِي الرَّكْعَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا، فَلاَ أَدْرِي أَنَسِيَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم، أَمْ قَرَأَ ذَلِكَ عَمْداً. [د٨١٦]

* حسن.

**لە مەعازی کوڕی عەبدوڵای جوهەنییەوە، پیاوێك لە جوهەینە هەواڵی پێداوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە نوێژی بەیانیدا: (﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ﴾ [الزلزلة: ١])ی لە هەردوو رکاتەکەدا خوێند، نازانم ئایا پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەبیری چووبوو یان بە مەبەست ئەوەی خوێند.**

## ١٠- دەروازەی: خوێندنەوە لە نیوەڕۆ و عەصر

**١٢١٨-** (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ مِنْ صَلاَةِ الظُّهْرِ، بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، يُطَوِّلُ فِي الأُولَى، وَيُقَصِّرُ فِي الثَّانِيَةِ، وَيُسْمِعُ الآيَةَ أَحْيَاناً، وَكَانَ يَقْرَأُ فِي العَصْرِ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، وَكَانَ يُطَوِّلُ فِي الأُولَى، وَكَانَ يُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى مِنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَيُقَصِّرُ فِي الثَّانِيَةِ. [خ٧٥٩/ م٤٥١]

**(ق) لە ئەبی قەتادەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە دوو رکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆ "فاتحة الکتاب" و دوو سورەتی دەخوێند، لە یەکەمیاندا درێژەی پێ دەدا[1]، و لە دووەمیان کورتی دەکردەوە، هەندێ جار ئایەتێکی پێ دەبیستین، لە نوێژی عەصریش "فاتحة الکتاب" و دوو سورەتی دەخوێند، لە یەکەمیاندا درێژەی پێ دەدا، ئەو لە رکاتی یەکەمی نوێژی بەیانی درێژەی پێ دەدا و لە دووەمیاندا کورتی دەکردەوە.**

**١٢١٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالعَصْرِ بِـ: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ①﴾ [الطارق: ١]، وَ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ①﴾[البروج: ١]، وَنَحْوِهِمَا مِنَ السُّوَرِ. [د٨٠٥/ ت٣٠٧/ ن٩٧٨/ مي١٣٢٧]

* حسن صحيح.

**لە جابری کوڕی سەموورەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نوێژی نیوەڕۆ و عەصر (﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ①﴾ [الطارق: ١]، و ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ①﴾ [البروج: ١])ی دەخوێند، هەر بەو جۆرە هاوشێوەی ئەو دوانە لە سورەتەکان.**

## ١١- دەروازەی: خوێندنەوە لە مەغریبدا

**١٢٢٠-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ أُمَّ الفَضْلِ سَمِعَتْهُ، وَهُوَ يَقْرَأُ: ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا①﴾[المرسلات: ١]، فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّ! وَالله! لَقَدْ ذَكَّرْتَنِي بِقِرَاءَتِكَ هذِهِ السُّورَةَ، إِنَّهَا لآخِرُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقْرَأُ بِهَا فِي المَغْرِبِ. [خ٧٦٣/ م٤٦٢]

---

[1] بۆئەوەی خەڵکی بە نوێژدا بگەن-و.

(ق) لە ئیبن عەباسەوە (خوایان لێ رازی بێت)، وتی: ئوم فەزڵ گوێی لێگرتبوو ئەو: (﴿وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا١﴾[المرسلات: ١])ی دەخوێند، ئوم فەزڵ وتی: سوێند بە خودا، کوڕی خۆم، خوێندنەوەت بۆ ئەم سورەتە یادی هێنامەوە، ئەوە دوایین سورەتێك بوو گوێم لێبوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نوێژی مەغریب خوێندی.

**١٢٢١-** (ق) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَرَأَ فِي المغْرِبِ بِـ: ﴿ٱلطُّورِ١﴾. [خ٧٦٥/ م٤٦٣]

(ق) لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو لە نوێژی مەغریب (﴿ٱلطُّورِ١﴾)ی خوێند.

## ١٢- دەروازەی: خوێندن لە نوێژی عیشادا

**١٢٢٢-** (ق) عَنِ البَرَاءِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ فِي سَفَرٍ، فَقَرَأَ فِي العِشَاءِ فِي إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ، بِـ: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ﴾. [خ٧٦٧/ م٤٦٤]

(ق) لە بەرائەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لە سەفەرێك بوو، لە نوێژی عیشا لە یەکێك لە دوو رکاتەکەدا: (﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ﴾)ی خوێندەوە.

- وزاد في رواية لهما: فَمَا سَمِعْتُ أَحَداً أَحْسَنَ صَوْتاً، أَوْ قِرَاءَةً مِنْهُ. [خ٧٥٤٦]

لە ریوایەتێکی هەردووکیان ئەمە زیادبووە: هیچ کەسم نەبینیوە دەنگی خۆشتر یان خوێندنەوەی باشتر بێت لە ئەو.

**١٢٢٣-** عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقْرَأُ فِي العِشَاءِ الآخِرَةِ بِـ: ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا﴾، وَنَحْوِهَا مِنَ السُّوَرِ. [ت٣٠٩/ ن٩٨٨]

* صحيح.

لە بورەیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە عیشای دواییندا[1] ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا﴾ی دەخوێند، هەر بەو جۆرە هاوشێوەی ئەوە[2] لە سورەتەكان.

## ١٣- دەروازەی: سیفەتی ركوع و سوژدە و راستبوونەوە

**١٢٢٤-** (ق) عَنِ البَرَاءِ قَالَ: كَانَ رُكُوعُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَسُجُودُهُ، وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، وَإِذَا رَفَعَ مِنَ الرُّكُوعِ، مَا خَلاَ القِيَامَ وَالقُعُودَ، قَرِيباً مِنَ السَّوَاءِ. [خ٧٩٢/ م٤٧١]

**(ق) لە بەرائەوە، وتی: ركوع و سوژدەی پێغەمبەر(ﷺ) و نێوان دوو سوژدەكە و كاتێك لە ركوع بەرز دەبوویەوە -جگە لە وەستان و دانیشتن[3]- لە یەكسانییەوە نزیك بوون.**

**١١٢٥-** (م) عَنِ البَرَاءِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا سَجَدْتَ فَضَعْ كَفَّيْكَ وَارْفَعْ مِرْفَقَيْكَ).** [م٤٩٤]

**(م) لە بەرائەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر سوژدەت برد دوو بەری دەستت دابنێ و دوو ئەنیشكت بەرز بكەرەوە).**

**١٢٢٦-** (م) عَنِ العَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ المطَّلِبِ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(إِذَا سَجَدَ العَبْدُ سَجَدَ مَعَهُ سَبْعَةُ أَطْرَافٍ: وَجْهُهُ، وَكَفَّاهُ، وَرُكْبَتَاهُ، وَقَدَمَاهُ).** [م٤٩١]

**(م) لە عەباسی كوڕی عەبدولموتەلیبەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (گەر بەندە سوژدەی برد حەوت ئەندام لەگەڵی سوژدە دەبەن: روخساری، و دوو دەستی، و دوو ئەژنۆی و دوو پێی).**

---

[1] عیشای سەرەتا و یەكەم نوێژی مەغریبە، عیشای دوایین نوێژی عیشایە-و.

[2] واتە: بە بڕی سورەتی (والشمس وضحاها) لە سورەتەكانی تر قورئانی خوێند-و.

[3] وەستان و دانیشتن: مەبەست: وەستانە بۆ خوێندنی سورەتی فاتیحە و دانیشتن بۆ تەحیات-و.

**١١٢٧–** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ، وَلاَ يَبْسُطْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيْهِ انْبِسَاطَ الكَلْبِ**). [خ٨٢٢ (٢٤١)/ م٤٩٣]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(لە سوژدەدا ڕێك و ڕاست بن، یەکێك لە ئێوە دوو باڵی ڕانەخات وەك ڕاخستنی سەگ).**

**١١٢٨–** عَنِ ابْنِ عُمَرَ - رَفَعَهُ - قَالَ: (**إِنَّ اليَدَيْنِ تَسْجُدَانِ كَمَا يَسْجُدُ الوَجْهُ، فَإِذَا وَضَعَ أَحَدُكُمْ وَجْهَهُ فَلْيَضَعْ يَدَيْهِ، وَإِذَا رَفَعَ فَلْيَرْفَعْهُمَا**). [د٨٩٢/ ن١٠٩١]

* صحيح.

لە ئیبن عومەرەوە–بەرزی دەکاتەوە– پێغەمبەر فەرمووی: **(دوو دەست سوژدە دەبەن وەك چۆن ڕوخسار سوژدە دەبات، گەر یەکێك لە ئێوە ڕوخساری دانا با دوو دەستی دابنێ، گەر ڕوخساری بەرزکردەوە با ئەو دوانەش بەرزبکاتەوە).**

**١١٢٩–** عَنْ عَبْدِ الله بْنِ أَقْرَمَ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم، فَكُنْتُ أَرَى عُفْرَةَ إِبْطَيْهِ إِذَا سَجَدَ. [ت٢٧٤/ ن١١٠٧/ جه٨٨١]

هذا لفظ النسائي.

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی ئەقرەمەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژم کرد، کاتێ سوژدەی دەبرد سپێتی دوو بنباڵیم دەبینی.

ئەمە لەفزی نەسائییە.

**١١٣٠–** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ؛ فَلاَ يَبْرُكْ كَمَا يَبْرُكُ البَعِيرُ، وَلْيَضَعْ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ**). [د٨٤٠/ ن١٠٩٠/ مي١٣٦٠]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە سوژدەی برد، با چۆك دانەدات وەك چۆن حوشتر چۆك دادەدات، با دوو دەستی بەر لە دوو ئەژنۆی دابنێت).**

**١٢٣١**– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ أَسْوَأَ النَّاسِ سَرِقَةً الَّذِي يَسْرِقُ صَلاَتَهُ**)، قَالُوا: يَا رَسُولَ الله! وَكَيْفَ يَسْرِقُهَا؟ قَالَ: (**لاَ يُتِمُّ رُكُوعَهَا، وَلاَ سُجُودَهَا**). [حم١١٥٣٢]

* حديث حسن.

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خراپترینی خەڵکی لە دزیدا ئەو کەسەیە نوێژەکەی خۆی دەدزێت**)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، چۆن دەیدزێ؟ فەرمووی: (**رکوع و سوژدەی تێر و تەواو ناکات**).

## ١٤- دەروازەی: پلە و پایەی سوژدە

**١٢٣٢**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَقْرَبُ مَا يَكُونُ العَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ**). [م٤٨٢]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**نزیکترین حاڵی بەندە لە پەروەردگارەوە ئەو کاتەیە لە سوژدەدایە، بۆیە دوعای زۆر بکەن**).

**١٢٣٣**– (م) عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ كَعْبٍ الأَسْلَمِيِّ قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ مَعَ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم، فَأَتَيْتُهُ بِوَضُوئِهِ وَحَاجَتِهِ، فَقَالَ لِي: (سَلْ)، فَقُلْتُ: أَسْأَلُكَ مُرَافَقَتَكَ فِي الجَنَّةِ، قَالَ: (**أَوْ غَيْرَ ذَلِكَ**)؟ قُلْتُ: هُوَ ذَاكَ، قَالَ: (**فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ**). [م٤٨٩]

(م) لە رەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمییەوە، وتی: لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەمامەوە، ئاوی دەستنوێژ و پێویستییەکانیم بۆ هێنا، پێی فەرمووم: (**داوا بکە**)، وتم: داوای هاوەڵی تۆ دەکەم لە بەهەشت، فەرمووی: (**جگە لەوە شتێکی ترت داوابکردبایە؟**)، وتم: ئەوە داوەکەمە، فەرمووی: (**کەوابوو بە زۆری سوژدە لەسەر خۆت کۆمەکی من بکە**).

**١٢٣٤**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**تَأْكُلُ النَّارُ ابْنَ آدَمَ إِلاَّ أَثَرَ السُّجُودِ، حَرَّمَ اللهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ أَثَرَ السُّجُودِ**). [جه٤٣٢٦]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: (ئاگر ئادەمیزاد دەخوات جگە لە شوێنی سوژدە، خودا لەسەر ئاگر حەرامی کردووە ئەسەری سوژدە بخوات).**

## ١٥- دەروازەی: ئەوەی لە رکوع و سوژدەدا دەیڵێت

**١٢٣٥**– (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: (**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي**). يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ.

[خ٨١٧ (٧٩٤)/ م٤٨٤]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا لە رکوع و سوژدەیدا زۆر دەیفەرموو: (سبحانك اللهم ربنا وبحمدك، أللهم اغفر لي). قورئانی تەئویل دەکرد[1].**

**١٢٣٦**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ قَالَ: فَانْتَبَهَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنَ اللَّيْلِ... فَذَكَرَ الحَدِيثَ قَالَ: ثُمَّ رَكَعَ، قَالَ: فَرَأَيْتُهُ قَالَ فِي رُكُوعِهِ: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ العَظِيمِ**)، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَحَمِدَ اللهَ مَا شَاءَ أَنْ يَحْمَدَهُ، قَالَ: ثُمَّ سَجَدَ، قَالَ: فَكَانَ يَقُولُ فِي سُجُودِهِ: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى**)، قَالَ: ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، قَالَ: فَكَانَ يَقُولُ فِيمَا بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ: (**رَبِّ! اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي، وَاجْبُرْنِي وَارْفَعْنِي، وَارْزُقْنِي وَاهْدِنِي**). [حم٣٥١٤]

* حسن.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: شەو لای پوورم مەیموونە مامەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە شەو بەئاگا هات.. فەرموودەکەی باس کرد و وتی: پاشان رکووعی برد،**

---

[1] **واتە: ئەوەی لە قورئاندا فەرمانی پێکرابوو دەیکرد بە کردار، واتە: ئایەتی: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ﴾ [النصر: ٣].**

وتی: بینیم لە رکووعەکەی فەرمووی: (**سبحان ربي العظيم**)، پاشان سەری بەرزکردەوە و چەند بخوازێت حەمد بکات حەمدی خودای کرد، وتی: پاشان سوژدەی برد، وتی: لە سوژدەکەیدا دەیفەرموو: (**سبحان ربي الأعلى**)، وتی: پاشان سەری بەرزکردەوە، وتی: لە نێوان دوو سوژدەکەدا دەیفەرموو: (**رب اغفر لي وارحمني واجبرني وارفعني وارزقني واهدني**).

## ١٦- دەروازەی: نەهیکردن لە خوێندنەوەی قورئان لە رکووع و سوژدەدا

**١٢٣٧-** (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَشَفَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم السِّتَارَةَ، وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ: (**أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ، أَوْ تُرَى لَهُ؛ أَلاَ وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعاً أَوْ سَاجِداً، فَأَمَّا الرُّكُوعُ؛ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ** عزّ وجل، **وَأَمَّا السُّجُودُ؛ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ، فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ**). [م٤٧٩]

(م) لە ئیبن عەباسەوە فەرمووی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پەردەی لادا و خەڵکی لەدوای ئەبی بەکرەوە ریزیان بەستبوو، فەرمووی: (**ئەی خەڵکینە، لە مژدەکانی پێغەمبەرایەتی تەنها خەونی صاڵح ماوە کە موسڵمان دەیبینێت، یان بۆی دەبینرێت، دەزانن من نەهیم لێکراوە قورئان بخوێنم لە باری رکووع و سوژدەدا، رکووع، پەروەردگاری(عزوجل) تیادا بەمەزن رابگرن، سوژدە: لە دوعادا بکۆشن شایستەیە وەڵامتان بدرێتەوە**).

## ١٧- دەروازەی: ئەوەی دەیڵێت کاتێك لە رکووع بەرزدەبێتەوە

**١٢٣٨-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا قَالَ الإِمَامُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ! رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلاَئِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ**). [خ٧٩٦/ م٤٠٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**گەر ئیمام وتی: "سمع الله لمن حمده" ئێوە بڵێن: "أللهم ربنا لك الحمد"**

**چونکە هەر کەس قسەکەی لەگەڵ قسەی فریشتەکان ڕێبکەوێت لە هەرچی گوناهی پێشینەیەتی خۆشدەبێت).**

**١٢٣٩–** (م) عَنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا رَفَعَ ظَهْرَهُ مِنَ الرُّكُوعِ قَالَ: (**سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَاوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءُ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ**). [م٤٧٦]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە، وتی: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) پشتی لە** ڕکووع بەرز دەکردەوە دەیفەرموو: **(سمع الله لمن حمده، أللهم ربنا لك الحمد، ملء السماوات وملء الأرض وملء ما شئت من شيء بعدُ).**

## ١٨- دەروازەی: سیفەتی دانیشتن لە نوێژدا

**١٢٤٠–** (خ) عَنْ عَبْدِ الله بنِ عَبدِ الله بْنِ عُمَر: أَنَّهُ كَانَ يَرَى عَبْدَ الله بْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما يَتَرَبَّعُ فِي الصَّلاَةِ إِذَا جَلَسَ، فَفَعَلْتُهُ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ حَدِيثُ السِّنِّ، فَنَهَانِي عَبْدُ الله بْنُ عُمَرَ، وَقَالَ: إِنَّمَا سُنَّةُ الصَّلاَةِ أَنْ تَنْصِبَ رِجْلَكَ اليُمْنَى، وَتَثْنِي اليُسْرَى، فَقُلْتُ: إِنَّكَ تَفْعَلُ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: إِنَّ رِجْلَيَّ لاَ تَحْمِلاَنِي. [خ٨٢٧]

**(خ) لە عەبدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: ئەو عەبدوڵای کوڕی عومەری(خوایان لێ ڕازی بێت) دەبینی گەر لە نوێژ دابنیشتبایە چوارمشقی دەدا، منیش ئەوەم ئەنجامدا، من لەو ڕۆژەدا گەنج بووم، عەبدوڵای کوڕی عومەر نەهی لێکردم و وتی: سوننەتی نوێژ ئەوەیە قاچی ڕاستت هەڵبدەی و قاچی چەپ بنەوێنی، وتم: تۆ ئەو کارە دەکەی؟[1] وتی: پێیەکانم هەڵمناگرن.**

**١٢٤١–** (م) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم إِذَا قَعَدَ فِي الصَّلاَةِ، جَعَلَ قَدمَهُ اليُسْرَى بَيْنَ فَخِذِهِ وَسَاقِهِ، وَفَرَشَ قَدَمَهُ اليُمْنَى، وَوَضَعَ يَدَهُ اليُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ اليُسْرَى، وَوَضَعَ يَدَهُ اليُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ اليُمْنَى، وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ.

---

[1] **واتە: وتم: ئەی بۆچی تۆ بەو جۆرە لە نوێژەکەدا چوارمشقی دەدەی؟–و.**

(م) لە عەبدولڵای کوڕی زوبەیرەوە، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نوێژ دابنیشتبایە پێی چەپی دەخستە نێوان ران و لاقی، و پێی راستی رادەخست و دەستی چەپی لەسەر ئەژنۆی چەپ و دەستی راستی لەسەر رانی راست دادەنا، بە پەنجەی ئاماژەی دەکرد.

■ زاد النسائي: لاَ يُجَاوِزُ بَصَرُهُ إِشَارَتَهُ. وهي عند أبي داود. [د٩٩٠]

نەسائی ئەمەی زیاد کردووە: سەیرکردنی ئاماژەکەی تێنەدەپەڕاند، ئەوەش لای ئەبی داودە.

**١٢٤٢**– (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلاَةِ، وَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَرَفَعَ إِصْبَعَهُ الْيُمْنَى الَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ، فَدَعَا بِهَا، وَيَدُهُ الْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، بَاسِطُهَا عَلَيْهَا. [م٥٨٠]

(م) لە ئیبن عومەرەوە: گەر پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژ دانیشتبایە دوو دەستی لەسەر دوو ئەژنۆی دادەنا، پەنجەی راستی دوای پەنجە گەورە بەرز دەکردەوە و دوعای پێ دەکرد، دەستی چەپی لەسەر ئەژنۆی چەپی بوو، راخستنەکەی لەسەر بوو.

## ١٩- دەروازەی: تەحیات

**١٢٤٣**– (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، فَكَانَ يَقُولُ: (**التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ للهِ. السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ. أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، وأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله**). [م٤٠٣]

(م) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەحیاتی فێر دەکردین وەك چۆن سورەتێ لە قورئانی فێر دەکردین، دەیفەرموو: (**التحيات المباركات الصلوات الطيبات لله، السلام عليك أيُّها النبي ورحمة الله وبركاته، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله**).

**١٢٤٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ أَنْ يُخْفِيَ التَّشَهُّدَ. [د٩٨٦/ ت٢٩١]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: شاردنەوەی خوێندنی تەحیات[١] لە سوننەتە.**

## ٢٠- دەروازەی: صەڵەوات لەسەر پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" لەدوای تەحیات

**١٢٤٥-** (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: لَقِيَنِي كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ فَقَالَ: أَلاَ أُهْدِي لَكَ هَدِيَّةً سَمِعْتُهَا مِنَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَقُلْتُ: بَلَى، فَأَهْدِهَا لِي، فَقَالَ: سَأَلنَا رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ الله! كَيْفَ الصَّلاَةُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ البَيْتِ، فَإِنَّ اللهَ قَدْ عَلَّمَنَا كَيْفَ نُسَلِّمُ عَلَيْكُمْ؟ قَالَ: **(قُولُوا: اللَّهُمَّ! صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ. اللَّهُمَّ! بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كما بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)**. [خ٣٣٧٠/ م٤٠٦]

**(ق) لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبی لەیلاوە، وتی: کەعبی کوڕی عوجرەم پێگەیشت، وتی: ئایا دەتەوێ هەدیەیەکت هەدیە بکەم لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە؟ وتم: با، هەدیەم بکە، وتی: پرسیارمان لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد و وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، صەڵەوات لەسەر ئێوەی ئەهلوبەیت چۆنە، خودا فێری کردین چۆن سەلامتان لەسەر بکەین؟ فەرمووی: (بڵێن: "أللهم صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم، إنك حميد مجيد، أللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد").**

---

[١] واتە: دەنگی پێ بەرز نەکاتەوە –و.

## ٢١- دەروازەی: دوعا بەر لە سەلامدانەوە

١٢٤٦- (ق) عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ: أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم: عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلاَتِي، قَالَ: (**قُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً، وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الغَفُورُ الرَّحِيمُ**). [خ٨٣٤/ م٢٧٠٥]

(ق) لە ئەبی بەكری صدیقەوە(خوا لێی رازی بێت): ئەو وتی بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوعایەكم فێر بكە لە نوێژەكەمدا بیكەم، فەرمووی: (**بڵێ: "اللهم إني ظلمتُ نفسي ظلما كثيرا، ولا يَغفرُ الذنوبَ إلا أنتَ، فاغْفرْ لي مغفرة من عندك وارحمني إنك أنتَ الغفورُ الرحيم"**).

١٢٤٦م- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يَدْعُو: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذ بِكَ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَالمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَالِ**). [خ١٣٧٧/ م٥٨٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم دوعایەی دەكرد: (**اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر، ومن عذاب النار، ومن فتنة المحيا والممات، ومن فتنة المسيح الدجال**).

١٢٤٧- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم لِرَجُلٍ: (**مَا تَقُولُ فِي الصَّلاَةِ**) ؟ قَالَ: أَتَشَهَّدُ، ثُمَّ أَسْأَلُ الله الجَنَّةَ، وَأَعُوذُ بِهِ مِنَ النَّارِ، أَمَا وَالله مَا أُحْسِنُ دَنْدَنَتَكَ، وَلاَ دَنْدَنَةَ مُعَاذٍ، فَقَالَ: (**حَوْلَهَا نُدَنْدِنُ**). [د٧٩٢/ جه٩١٠]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پیاوێكی فەرموو: (**چی دەڵێی لە نوێژدا؟**)، وتی: تەحیات دەخوێنم، و پاشان داوای بەهەشت لە خودا دەكەم و پەنای پێ دەگرم لە ئاگر، بەڵام بە خودا ورتە ورتی تۆ و ورتە ورتی مەعاز باش نازانم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**ئێمەش بە دەوری ئەوەدا ورتە ورت دەكەین**).

- وهو عند أبي داود: عن أبي صالح عن بعض أصحاب النبي صلّى الله عليه وسلّم.

* صحيح.

ئەو فەرمووده لای ئەبی دەود: لە ئەبی صالحەوە لە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە(ﷺ).

## ٢٢- دەروازەی: سەلامدانەوە

**١٢٤٨-** (م) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: كُنْتُ أَرَى رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ، حَتَّى أَرَى بَيَاضَ خَدِّهِ. [م٥٨٢]

**(م) لە سەعدی کوڕی وەقاصەوە، وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی سەلامی بە لای راست و بە لای چەپدا دەدایەوە تا سپێتی روومەتیم دەبینی.**

**١٢٤٩-** عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ، حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ: (**السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ الله، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ الله**).

[د٩٩٦/ ت٢٩٥/ ن١٣٢١/ جه٩١٤]

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە: پێغەمبەر(ﷺ) بە لای راست و بە لای چەپیدا سەلامی دەدایەوە، تا سپێتی روومەتی دەبینرا: (السلام عليكم ورحمة الله، السلام عليكم ورحمة الله).**

**١٢٥٠-** عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُسَلِّمُ فِي الصَّلاَةِ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً تِلْقَاءَ وَجْهِهِ، يَمِيلُ إِلَى الشِّقِّ الأَيْمَنِ شَيْئاً. [ت٢٩٦/ جه٩١٩]

* صحيح.

**لە عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نوێژدا یەك سەلامی دەدایەوە بە ئاراستەی روخساری، شتێك بە لای راستدا لای دەدا.**

## ٢٣- دەروازەی: زیکر لەدوای نوێژ

١٢٥١- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ، حِينَ يَنْصَرِفُ النَّاسُ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ، كَانَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كُنْتُ أَعْلَمُ إِذَا انْصَرَفُوا بِذَلِكَ إِذَا سَمِعْتُهُ. [خ٨٤١/ م٥٨٣]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): بەرزکردنەوەی دەنگ بە زیکر هەبوو کاتێك خەڵکی لە نوێژە فەرزەکان پشتیان هەڵدەکرد و دەرۆیشتن لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ)، هەروەها ئیبن عەباس دەڵێت: کە دەمبیست بەوە دەمزانی پشتیان هەڵکردووە و رۆیشتوون.**

١٢٥٢- (ق) عَنْ وَرَّادٍ ـ كَاتِبِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ـ قَالَ: أَمْلَى عَلَيَّ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ فِي كِتَابٍ إِلَى مُعَاوِيَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ: (لاَ إِلهِ إِلاَّ الله وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. اللَّهُمَّ! لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ). [خ٨٤٤/ م٥٩٣]

**(ق) لە وەرادەوە-نووسەری موغیرەی کوری شوعبە- وتی: موغیرەی کوری شوعبە ئەمەی بەسەردا خوێندمەوە، لە نووسراوێکدا بۆ موعاویە: پێغەمبەر(ﷺ) لەدوای هەر نوێژێکی فەرز دەیفەرموو: (لا إله إلا الله وحده، لا شريك له، له الملك، وله الحمد، وهو على كل شيء قدير، أللهم لا مانعَ لِما أعطيتَ ولا مُعطي لِما منعتَ ولا ينفعُ ذا الجدِّ منكَ الجدُّ).**

١٢٥٣- (م) عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم، إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلاَتِهِ، اسْتَغْفَرَ ثَلاَثاً، وَقَالَ: (اللَّهُمَّ! أَنْتَ السَّلاَمُ وَمِنْكَ السَّلاَمُ، تَبَارَكْتَ ذَا الجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ). [م٥٩١]

**(م) لە سەوبانەوە، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نوێژەکەی تەواو دەبوو، سێ جار "أستغفر الله"ی دەکرد، و دەیفەرموو: (أللهم أنت السلام ومنك السلام تباركت ذا الجلال والإكرام).**

**١٢٥٤**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ سَبَّحَ اللهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثاً وَثَلاثِينَ، وَحَمِدَ اللهَ ثَلاَثاً وَثَلاَثِينَ، وَكَبَّرَ اللهَ ثَلاَثاً وَثَلاَثِينَ، فَتِلْكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ، وَقَالَ تَمَامَ المِائَةِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. غُفِرَتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحْرِ). [م٥٩٧]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ): (هەر کەس لەدوای هەر نوێژێك سی و سێ جار "سبحان الله"، و سی و سێ جار "الحمد لله" و سی و سێ جار "الله أكبر" بکات، ئەوە دەبێتە نەوەد و نۆ، سەد تەواو بکات و بڵێت: "لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير" لە گوناهەکانی خۆشدەبێت با وەك کەفی دەریاش بن).**

**١٢٥٥**– عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ أَقْرَأَ بِالمُعَوِّذَاتِ دُبُرَ كُلِّ صَلاَةٍ. [د١٥٢٣/ ت٢٩٠٣/ ن١٣٣٥]

* صحيح.

**لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردم لەدوای هەر نوێژێك "المعوِّذات" بخوێنم.**

**١٢٥٦**– عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَخَذَ بِيَدِهِ وَقَالَ: (يَا مُعَاذُ! وَاللهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ، وَاللهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ)، فَقَالَ: (أُوصِيكَ يَا مُعَاذُ! لاَ تَدَعَنَّ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ تَقُولُ: اللَّهُمَّ! أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ، وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ). [د١٥٢٢/ ن١٣٠٢]

* صحيح.

**لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی گرت و فەرمووی: (ئەی مەعاز، سوێند بە خودا، من تۆم خۆشدەوێت، سوێند بە خودا، من تۆم خۆشدەوێت)، فەرمووی: (ئامۆژگاریت دەکەم، ئەی مەعاز، لەدوای هەر نوێژێك وازنەهێنی لە وتنی: "اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحُسْنِ عبادتك").**

**١٢٥٧-** عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ إِذَا انْصَرَفَ مِنَ الصَّلاَةِ: (**اللَّهُمَّ! لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ**).

* إسناده صحيح على شرط مسلم. [حم١٦٨٨٩]

**لە موعاویەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو کاتێك لە نوێژ تەواو بوو و رۆیشت دەیفەرموو: (أللهم لا مانع لما أعطيت ولا معطي لما منعت ولا ينفع ذا الجد منك الجدُّ).**

## ٢٤- دەروازەی: تەواوبوون لە نوێژ و رۆیشتن

**١٢٥٨-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ قال: لاَ يَجْعَلْ أَحَدُكُمْ لِلشَّيْطَانِ شَيْئاً مِنْ صَلاَتِهِ، يَرَى أَنَّ حَقّاً عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَنْصَرِفَ؛ إِلا عَنْ يَمِينِهِ، لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم كَثِيراً يَنْصَرِفُ عَنْ يَسَارِهِ. [خ٨٥٢/ م٧٠٧]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: یەکێك لە ئێوە شتێك لە نوێژەکەی بۆ شەیتان دانەنێت، ئەو پێیوابێت حەقە لەسەری تەنها لای راستەوە پشتهەڵبکات و بڕوات، زۆرجار پێغەمبەرم(ﷺ) بینیوە لای چەپەوە پشتی هەڵکردووە و رۆیشتووە.**

## ٢٥- دەروازەی: خشوع لە نوێژدا

**١٢٥٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**هَلْ تَرَوْنَ قِبْلَتِي هاهُنَا؟ فَوَاللهِ! مَا يَخْفَى عَلَيَّ خُشُوعُكُمْ وَلاَ رُكُوعُكُمْ، إِنِّي لأَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي**). [خ٤١٨/ م٤٢٤]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئایا قیبلەی من لێرەوە دەبینن؟ سوێند بە خودا، خشوع و رکوعی ئێوە لە من شاراوە نییە، من لە پشتمەوە ئێوە دەبینم).**

**١٢٦٠-** (خ) عَنْ أَنَسٍ: كَانَ قِرَامٌ لِعَائِشَةَ، سَتَرَتْ بِهِ جَانِبَ بَيْتِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَمِيطِي عَنَّا قِرَامَكِ هذَا، فَإِنَّهُ لاَ تَزَالُ تَصَاوِيرُهُ تَعْرِضُ فِي صَلاَتِي**). [خ٣٧٤]

(خ) لە ئەنەسەوە: عائیشە پەردەیەکی هەبوو لایەکیماڵەکەی پێ داپۆشی بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ئەم پەردەیەت لە کۆڵمان بکەرەوە، چونکە لە نوێژەکەم بەردەوام وێنەکانی دەهاتنە پێش چاوم).**

**١٢٦١**- (خ) عَنْ عائِشَةَ قَالَتْ: سَأَلتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الالتِفَاتِ فِي الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: **(هُوَ اخْتِلاَسٌ، يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِن صَلاَةِ العَبْدِ).** [خ٧٥١]

(خ) لە عائیشەوە، وتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی لاکردنەوە لە نوێژدا؟ فەرمووی: **(ئەو دزییەکە، شەیتان لە نوێژی بەندە دەیدزێت).**

**١٢٦٢**- عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(إِنَّ الرَّجُلَ لَيَنْصَرِفُ وَمَا كُتِبَ لَهُ؛ إِلاَّ عُشْرُ صَلاَتِهِ، تُسْعُهَا، ثُمُنُهَا، سُبْعُهَا، سُدْسُهَا، خُمْسُهَا، رُبْعُهَا، ثُلُثُهَا، نِصْفُهَا).** [د٧٩٦]

* حسن.

لە عەماری کوڕی یاسرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(پیاوێك پشتهەڵدەکات و دەڕوات و تەنها دەیەکی نوێژەکەی بۆ نووسراوە، یان نۆیەکی، یان هەشتیەکی، یان حەوتیەکی، یان شەشیەکی، یان پێنجیەکی، یان چارەکی، یان سێیەکی، یان نیوەی).**

**١٢٦٣**- عَنْ عَبْدِ الله بْنِ أَبِي بَكْرٍ: أَنَّ أَبَا طَلْحَةَ الأَنْصَارِيَّ كَانَ يُصَلِّي فِي حَائِطِهِ، فَطَارَ دُبْسِيٌّ، فَطَفِقَ يَتَرَدَّدُ يَلْتَمِسُ مَخْرَجاً، فَأَعْجَبَهُ ذَلِكَ، فَجَعَلَ يُتْبِعُهُ بَصَرَهُ سَاعَةً، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى صَلاَتِهِ، فَإِذَا هُوَ لاَ يَدْرِي كَمْ صَلَّى؟ فَقَالَ: لَقَدْ أَصَابَتْنِي فِي مَالِي هَذَا فِتْنَةٌ، فَجَاءَ إِلَى رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم فَذَكَرَ لَهُ الَّذِي أَصَابَهُ فِي حَائِطِهِ مِنَ الفِتْنَةِ، وَقَالَ: يَا رَسُولَ الله! هُوَ صَدَقَةٌ للهِ فَضَعْهُ حَيْثُ شِئْتَ. [ط٢٢٢/ هق٢/٣٤٩]

[وانظر: **٣٢٨٦** صلاة مودع].

لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی بەکرەوە: ئەبو تەلحەی ئەنصاری لە باخەکەی نوێـژی دەکرد قومرییەك فڕی، بەردەوام دەهات و دەچوو بۆ دەرچەیەك دەگەڕا، ئەوە جێـی سەرنجی ئەبو تەلحە بوو[1]، ساتێك چاوی بەدوادا هەڵدا، پاشان گەڕایەوە بۆ نوێژەکەی، بینی نازانێت چەند رکاتی کردووە؟ وتی: لەم ماڵەم تووشی فیتنەیەك هاتم، هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسی ئەو فیتنەی کرد لە باخەکەی تووشـی هاتبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەو باخەم صەدەقەیە لەپێناوی خودا، چۆن دەخوازی بەو جۆرەی لێبکە.

## ٢٦- دەروازەی: بەرزکردنەوەی چاو بۆ ئاسمان لە نوێژدا

١٢٦٤- (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فِي صَلاَتِهِمْ)، فَاشْتَدَّ قَوْلُهُ فِي ذَلِكَ، حَتَّى قَالَ: (لَيَنْتَهُنَّ عَنْ ذَلِكَ، أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ). [خ٧٥٠]

(خ) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(خەڵکانێك چییانە چاویان بەرزدەکەنەوە بۆ ئاسمان لە نوێژەکانیان)**، لەوەدا قسەی توند بوو تا فەرمووی: **(وازدەهێنن لەوە یان چاوەکانیان پڕدەدرێن)**.

١٢٦٥- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ رَفْعِهِمْ أَبْصَارَهُمْ عِنْدَ الدُّعَاءِ فِي الصَّلاَةِ إِلَى السَّمَاءِ، أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ). [م٤٢٩]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خەڵکانێك یان وازدەهێنن لە بەرزکردنەوەی چاوەکانیان بۆ ئاسمان لە کاتی دوعا لە نوێژدا، یان چاوەکانیان پڕدەدرێن)**.

---

[1] واتە: قومرییەکە سەرنجی راکێشا و لە نوێژەکە بێئاگای کرد–و.

## ٢٧- دەروازەی: نوێژی نەخۆش

**١٢٦٦-** (خ) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: كَانَتْ بِي بَوَاسِيرُ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الصَّلَاةِ؟ فَقَالَ: (**صَلِّ قَائِماً، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِداً، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ**).
[خ١١١٧ (١١١٥)]

**(خ) لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: مایەسیریم لەگەڵ بوو، پرسیارم لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد دەربارەی نوێژ؟ فەرمووی: (بەپێوە نوێژ بکە، گەر نەوتوانی بە دانیشتنانەوە، گەر نەوتوانی لەسەر تەنیشتێك).**

**١٢٦٧-** (خ) عَنْ مَجْزَأَةَ، عَنْ رَجُلٍ مِنْهُمْ، مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ، اسْمُهُ أَهْبَانُ بْنُ أَوْسٍ، وَكَانَ اشْتَكَى رُكْبَتَهُ، فَكَانَ إِذَا سَجَدَ جَعَلَ تَحْتَ رُكْبَتِهِ وِسَادَةً. [خ٤١٧٤]

**(خ) لە مەجزەئەوە، لە پیاوێکی خۆیانەوە، لە هاوەڵانی درەختەکە[1]، ناوی ئەهبانی کوڕی ئەوس بوو، ئەو ئەژنۆی ئازاری هەبوو، ئەو کاتێك سوژدەی دەبرد سەرینێکی دەخستە ژێر ئەژنۆی.**

**١٢٦٨-** (خـ) عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: إِنْ لَمْ يَقْدِرْ أَنْ يَتَحَوَّلَ إِلَى القِبْلَةِ، صَلَّى حَيْثُ كَانَ وَجْهُهُ.
[خ. تقصير الصلاة، باب ١٩]

**(خـ) لە عەتاوە، وتی: گەر نەیتوانی ڕووبکاتە قیبلە ڕووی لە هەر کوێوە بێت بەو جۆرە نوێژ دەکات.**

**١٢٦٩-** (خـ) عَنِ الحَسَنِ قَالَ: إِنْ شَاءَ المرِيضُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ قَائِماً، وَرَكْعَتَيْنِ قَاعِداً.
[خ. تقصير الصلاة، باب ٢٠]

**(خـ) لە حەسەنەوە، وتی: نەخۆش گەر بیەوێت دەتوانێ دوو ڕکات بە پێوە بکات و دوو ڕکاتیش بە دانیشتنەوە.**

---

[1] واتە: پیاوەکە یەکێك بووە لە پیاوانی بەیعەتی (شجرة الرضوان)—و.

**١٢٧٠-** عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَقُولُ: إِذَا لَمْ يَسْتَطِعِ المَرِيضُ السُّجُودَ، أَوْمَأَ بِرَأْسِهِ إِيمَاءً، وَلَمْ يَرْفَعْ إِلَى جَبْهَتِهِ شَيْئاً. [ط٤٠٥/ هق٢/٣٠٦]

* إسناده صحيح.

**لە نافیعەوە: عەبدوڵای کوڕی عومەر دەیوت: گەر نەخۆش نەیتوانی سوژدە ببات، بەسەری ئاماژە دەکات، هیچ بەرز ناکاتەوە بۆ ناوچاوانی.**

## ٢٨- دەروازەی: دڵنیایی لە ڕێکبوونەوە و ڕاستبوونەوەی نێوان دوو سوژدەکە

**١٢٧١-** (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: مَا صَلَّيْتُ خَلْفَ رَجُلٍ أَوْجَزَ صَلَاةً مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي تَمَامٍ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا قَالَ: **(سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)** قَامَ حَتَّى نَقُولَ: قَدْ أَوْهَمَ، ثُمَّ يُكَبِّرُ وَيَسْجُدُ، وَكَانَ يَقْعُدُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ حَتَّى نَقُولَ: قَدْ أَوْهَمَ. [م٤٧٣/ د٨٥٣]

هذا لفظ أبي داود.

**(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: لە پشت پیاوێکەوە نوێژم نەکردووە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژەکەی کورتتر بووبێت بە تێر و تەواوی، گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیفەرمووبا: (سمع الله لمن حمده)، دەوەستا، تا ئێمە دەمانوت: وەهمی کردووە[1]، پاشان "الله أكبر"ی دەکرد و سوژدەی دەبرد، ئەو لە نێوان دوو سوژدەکە دادەنیشت تا دەمانوت: وەهمی کردووە.**

**ئەمە لەفزی ئەبی داودە**

**١٢٧٢-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ؛ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَائِماً، وَإِذَا سَجَدَ فَرَفَعَ رَأْسَهُ؛ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ جَالِساً، وَكَانَ يَفْتَرِشُ رِجْلَهُ اليُسْرَى. [جه٨٩٣]

* صحيح.

---

[1] **وەهمی کردووە: واتە پێیانوابوو لە نوێژەکەدا سەهووی بۆ دروست بووە–و.**

لە عائیشەوە، وتی: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەری لە رکوع بەرز دەکردەوە، سوژدەی نەدەبرد تا بە پێوە رێك و راست دەبوویەوە، کە سوژدەی دەبرد و سەری بەرز دەکردەوە نەدەچووە سوژدەکەی تر تا دانیشتنەکەی رێك و راست دەبوو، ئەو لاقی چەپی رادەخست.

**١٢٧٣**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ يَنْظُرُ اللهُ إِلَى صَلاَةِ رَجُلٍ لاَ يُقِيمُ صُلْبَهُ بَيْنَ رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ**). [حم١٠٧٩٩]

* حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا تەماشای نوێژی کەسێك ناکات لە نێوان رکوع و سوژدەی پشتی رێك و راست نەکاتەوە).**

## ٢٩- دەروازەی: ئەوەی لە نێوان دوو سوژدەکە دەیڵێ

**١٢٧٤**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَقُولُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ: (**اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي، وَعَافِنِي وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي**). [د٨٥٠/ ت٢٨٤/ جه٨٩٨]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوان دوو سوژدەکە دەیفەرموو: **(أللهم اغفر لي وارحمني، وعافيني واهدني وارزقني).**

**١٢٧٥**– عَنْ حُذَيْفَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَقُولُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ: (**رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي**). [جه٨٩٧/ مي١٣٦٣]

* صحيح.

لە حوزەیفەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوان دوو سوژدەکە دەیفەرموو: **("ربِّ اغْفِرْ لي، ربِّ اغْفِرْ لي–خودایە لێم خۆش بە، خودایە لێم خۆش بە")**

## ٣٠- دەروازەی: سیفەتی دانیشتنی نێوان دوو سوژدەکە

**١٢٧٦-** عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (يَا عَلِيُّ، لاَ تُقْعِ إِقْعَاءَ الكَلْبِ).

* حسن. [جه٨٩٥]

**لە عەلییەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی عەلی، "لا تُقع إقعاء الكلب[(١)]").**

**١٢٧٧-** عَنِ ابْنِ إِسْحَاقَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَنِ انْتِصَابِ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم عَلى عَقِبَيْهِ وَصُدُورِ قَدَمَيْهِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ إِذَا صَلَّى عَبْدُ الله بْنِ أَبِي نَجِيحٍ المَكِّيُّ عَنْ مُجَاهِدِ بْنِ جَبْرٍ أَبِي الْحَجَّاجِ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الله بْنَ عَبَّاسٍ يَذْكُرُهُ. قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا الْعَبَّاسِ والله إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّ هذَا جِفَاءً مِمَّن صَنَعَهُ، قَالَ: فَقَالَ: إِنَّهَا لَسُنَّةٌ. [هق١/١١٩]

* قال الذهبي: إسناده صحيح.

**لە ئیبن ئیسحاقەوە، وتی: عەبدوڵای کوڕی ئەبی نەجیحی مەکی دەربارەی راستبوونەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر دوو پاژنە و سنگی دوو پێی لە نێوان دوو سوژدەکە کاتێ نوێژی دەکرد، لە موجاهیدی کوڕی جەبری ئەبی حەججاجەوە بۆی باس کردم وتی: گوێم لێبوو عەبدوڵای کوڕی عەباس باسی دەکرد، وتی: پێم وت: باوکی عەباس، سوێند بە خودا، کەسێك ئەوەی ئەنجام بدابا ئێمە بە جەفامان دەبینی[(٢)]، وتی: ئەوە سوننەتە.**

**١٢٧٨-** عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ أَنَّهُ رَأَى عَبْدَ الله بْنَ عُمَرَ إِذَا سَجَدَ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السَّجْدَةِ الأُولَى، يَقْعُدُ عَلَى أَطْرَافِ أَصَابِعِهِ وَيَقُولُ: إِنَّهُ مِنَ السُّنَّةِ. [هق١/١١٩]

* قال الذهبي: إسناده صحيح.

---

(١) "إقعاء": شێوە دانیشتنێکە لە نوێژدا هەردوو نووکی پێی دادەکوتێ و لەسەر پاژنەکانی دادەنیشێت، پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد لە عەلی بەو جۆرە لە نوێژدا دابنیشێت-و.

(٢) واتە: بە پشتهەڵکردن لە سوننەتمان دەبینی-و.

لە ئەبی زوبەیرەوە، ئەو عەبدوڵای کوڕی عومەری بینی کاتێک سوژدەی دەبرد و لە سوژدەی یەکەم سەری بەرز دەکردەوە لەسەر لای پەنجەکانی دادەنیشت و دەیوت: ئەوە لە سوننەتە.

## ٣١- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی سەکتەکانی نوێژ هاتووە

**١٢٧٩**- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ قَالَ: حَفِظْتُ سَكْتَتَيْنِ فِي الصَّلاَةِ: سَكْتَةً إِذَا كَبَّرَ الإِمَامُ حَتَّى يَقْرَأَ، وَسَكْتَةً إِذَا فَرَغَ مِنْ فَاتِحَةِ الكِتَابِ وَسُورَةٍ، عِنْدَ الرُّكُوعِ.

قَالَ: فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عَلَيْهِ عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ، قَالَ: فَكَتَبُوا فِي ذَلِكَ إِلَى المدِينَةِ إِلَى أُبَيٍّ، فَصَدَّقَ سَمُرَةَ.

قَالَ أَبُو دَاوُد: كَذَا قَالَ حُمَيْدٌ فِي هَذَا الحَدِيثِ: وَسَكْتَةً إِذَا فَرَغَ مِنَ القِرَاءَةِ.

[د٧٧٧/ ت٢٥١/ جه٨٤٥/ مي١٢٧٩]

* رجاله ثقات (شعيب).

لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە، وتی: دوو سەکتەم لە نوێژدا لەبەر کرد، سەکتەیەک کاتێک ئیمام "الله أكبر" دەکات تا دەست بە خوێندن[1] دەکات، سەکتەیەکیش گەر لە خوێندنی "فاتحة الكتاب" و خوێندنی سورەتێک لێدەبێتەوە، و دەچێت بە رکوعدا.

وتی: عیمرانی کوڕی حوصەین ئەوەی بە نامۆ لە سەموورە بینی، وتی: بۆیە نامەیان نووسی بۆ ئوبەی لە مەدینە دەربارەی ئەوە، ئەوەی سەموورەی بە راستگێڕا.

ئەبو داود دەڵێت: حومەیدیش دەربارەی ئەم فەرموودە بەم جۆرەی وت: سەکتەیەک کاتێک لە خوێندنەوە تەواو دەبێت.

---

[1] واتە: خوێندنی سورەتی (الفاتحة)ـو.

## ٣٢- دەروازەی: دوعا لە نوێژدا

١٢٨٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا قَرَأَ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾، قَالَ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى). [د٨٨٣]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) (﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾)ی دەخوێند، دەیفەرموو: (سبحان ربي الأعلى).**

١٢٨١- عَنْ مُوسَى بْنِ أَبِي عَائِشَةَ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يُصَلِّي فَوْقَ بَيْتِهِ، وَكَانَ إِذَا قَرَأَ ﴿أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَـٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ۝٤٠﴾ [القيامة: ٤٠]؛ قَالَ: سُبْحَانَكَ! فَبَلَى، فَسَأَلُوهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم. [د٨٨٤]

* صحيح.

**لە موسای کوڕی ئەبی عائیشەوە، وتی: پیاوێك لەسەرماڵەکەی نوێژی دەکرد، ئەو کاتێك (﴿أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَـٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ۝٤٠﴾[القيامة: ٤٠])ی دەخوێند، دەیوت: (سبحانك، فبلى)، دەربارەی ئەوە پرسیاریان لێکرد وتی: لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیستووە.**

## ٣٣- دەروازەی: ئەوەی بەسە بۆ کەسی نەخوێندەوار و ئەعجەمی لە خوێندنەوە

١٢٨٢- عَنْ عَبْدِ الله بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: إِنِّي لاَ أَسْتَطِيعُ أَنْ آخُذَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْئاً، فَعَلِّمْنِي مَا يُجْزِئُنِي مِنْهُ، قَالَ: (قُلْ: سُبْحَانَ الله، وَالحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، وَالله أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِالله).

**لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: من ناتوانم شتێك لە قورئان وەربگرم، ئەوەندەم فێر بکە بەس بێت بۆم، فەرمووی: (بڵێ: سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر ولا حول ولا قوة إلا بالله).**

- زاد أبو داود: قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! هَذَا للهِ عزّ وجل، فَمَا لِي؟ قَالَ: (**قُلْ: اللَّهُمَّ! ارْحَمْنِي وَارْزُقْنِي، وَعَافِنِي وَاهْدِنِي**)، فَلَمَّا قَامَ قَالَ هَكَذَا بِيَدِهِ، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**أَمَّا هَذَا، فَقَدْ مَلأَ يَدَهُ مِنَ الخَيْرِ**). [د٨٣٢/ ن٩٢٣]

* حسن.

**ئەبو داود ئەمەی زیاد كردووە: وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەمە بۆ خودایە(عز وجل)، ئەی چی بۆ منە؟ فەرمووی: (بڵێ: "أللهم ارحمني وارزقني وعافني واهدني")، كاتێك هەستا بە دەستی بەم جۆرەی كرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەم كابرا دەستی خۆی پڕ خێر كرد).**

## ٣٤- دەروازەی: سوژدەی شوكر

**١٢٨٣**– عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُ كَانَ إِذَا جَاءَهُ أَمْرُ سُرُورٍ، أَوْ بُشِّرَ بِهِ، خَرَّ سَاجِداً شَاكِراً للهِ. [د٢٧٧٤/ ت١٥٧٨/ جه١٣٩٤]

* حسن.

**لە ئەبی بەكرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، ئەو كاتێك هەواڵێكی سرووری بۆ دەهات، یان مژدەی پێ دەدرا دەچوو بە سوژدەدا وەك شوكركار بۆ خودا.**

**١٢٨٤**– عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا تَابَ الله عَلَيْهِ خَرَّ سَاجِداً.

* صحيح. [جه١٣٩٣]

**لە عبدالرحمانی كوڕی كەعبی كوڕی مالیكەوە، لە باوكییەوە، وتی: كاتێك خودا تەوبەكەی لێ قبووڵ كرد ڕۆیشت بە سوژدەدا.**

# بەشی چوارەم

## کار و سەهو لە نوێژدا

### ١- دەروازەی: نەهی لە قسەکردن لە نوێژدا

**١٢٨٥-** (ق) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مسعودٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُسَلِّمُ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ، فَيَرُدُّ عَلَيْنَا، فَلَمَّا رَجَعْنَا مِنْ عِنْدِ النَّجَاشِيِّ، سَلَّمْنَا عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْنَا، وَقَالَ: (إِنَّ فِي الصَّلاَةِ شُغْلاً). [خ١١٩٩/ م٥٣٨]

**(ق) لە عەبدولڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: سەلاممان لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد ئەو لە نوێژدا بوو، وەڵامی دەداینەوە، کاتێك لای نەجاشی گەڕاینەوە سەلاممان لێکرد وەڵامی نەداینەوە، و فەرمووی: (لەناو نوێژدا سەرقاڵی هەیە).**

**١٢٨٦-** (ق) عَنْ زيدِ بنِ أَرْقَمَ قَالَ: إِنْ كُنَّا لَنَتَكَلَّمُ فِي الصَّلاَةِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، يُكَلِّمُ أَحَدُنَا صَاحِبَهُ بِحَاجَتِهِ، حَتَّى نَزَلَتْ: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ﴾ الآيَةَ [البقرة:٢٣٨]، فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ. [خ١٢٠٠/ م٥٣٩]

**(ق) لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژدا قسەمان دەکرد، یەکێك لە ئێمە پێویستییەکەی خۆی بۆ هاوەڵەکەی باس دەکرد، تا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ﴾ [البقرة:٢٣٨]، فەرمانمان پێکرا بە بێدەنگبوون.**

- ولفظ مسلم: حَتَّى نَزَلَتْ: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ [البقرة:٢٣٨]، فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ، وَنُهِينَا عَنِ الكَلاَمِ.

**لەفزەکەی موسلیم: تا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ [البقرة:٢٣٨]، فەرمانمان پێکرا بە بێدەنگبوون، و نەهیمان لێکرا لە قسەکردن.**

**١٢٨٧**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ صُهَيْبٍ أَنَّهُ قَالَ: مَرَرْتُ بِرَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ يُصَلِّي، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ إِشَارَةً، قَالَ: وَلاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ قَالَ: إِشَارَةً بِأُصْبُعِهِ.

* صحيح. [د٩٢٥/ ت٣٦٧/ ن١١٨٥/ مي١٤٠١]

**لە ئیبن عومەرەوە، لە سوهەیبەوە، ئەو وتی: بە پاڵ پێغەمبەری خودادا(ﷺ) گوزەرم کرد ئەو نوێژی دەکرد، سەلامم لێکرد، بە ئاماژە وەڵامیدایەوە، فەرمووی: وا دەزانم وتی: بە پەنجەی ئاماژەی کرد.**

## ٢- دەروازەی: نەفرەت کردن لە شەیتان لە نوێژدا

**١٢٨٨**- (م) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: قَامَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم، فَسَمِعْنَاهُ يَقُولُ: (**أَعُوذُ بِالله مِنْكَ**)، ثُمَّ قَالَ: (**أَلْعَنُكَ بِلَعْنَةِ الله**) ثَلاَثاً، وَبَسَطَ يَدَهُ كَأَنَّهُ يَتَنَاوَلُ شَيْئاً، فَلَمَّا فَرَغَ مِنَ الصَّلاَةِ قُلْنَا: يَا رَسُولَ الله! قَدْ سَمِعْنَاكَ تَقُولُ فِي الصَّلاَةِ شَيْئاً، لَمْ نَسْمَعْكَ تَقُولُهُ قَبْلَ ذَلِكَ، وَرَأَيْنَاكَ بَسَطْتَ يَدَكَ، قَالَ: (**إِنَّ عَدُوَّ الله إِبْلِيس، جَاءَ بِشِهَابٍ مِنْ نَارٍ لِيَجْعَلَهُ فِي وَجْهِي، فَقُلْتُ: أَعُوذُ بِالله مِنْكَ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قُلْتُ: أَلْعَنُكَ بِلَعْنَةِ الله التَّامَّةِ، فَلَمْ يَسْتَأْخِرْ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَرَدْتُ أَخْذَهُ، وَالله! لَوْلاَ دَعْوَةُ أَخِينَا سُلَيْمَانَ لأَصْبَحَ مُوثَقاً يَلْعَبُ بِهِ وِلْدَانُ أَهْلِ المَدِينَةِ**). [م٥٤٢]

(م) لە ئەبی دەرداوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) راستبوویەوە و گوێمان لێبوو دەیفەرموو: (**پەنا دەگرم بە خودا لە تۆ**)، پاشان فەرمووی: (**بە نەفرەتی خودا نەفرەتت لێ دەکەم**)، سێ جار، دەستی بڵاوکردەوە وەك ئەوەی دەست بۆ شتێك ببات، کاتێك لە نوێژەکە تەواو بوو وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، گوێمان لێبوو لە نوێژەکەدا شتێکت دەفەرموو، بەرلەوە گوێمان لێ نەبووە بیفەرمووی، هەروەها تۆمان بینی دەستت بڵاوکردەوە، فەرمووی: (**دوژمنی خودا، ئیبلیش چڵۆسکێ لە ئاگری هێنا بوو تا بینێ بە روومدا، منیش وتم: پەنا دەگرم بە خودا لە تۆ، سێ جار، پاشان وتم: بە نەفرەتی تێر و تەواوی خودا نەفرەتت لێ دەکەم، سێ جار، نەچووە دواوە، پاشان ویستم بیگرم، سوێند بە خودا، گەر دوعای برامان سولەیمان نەبوایە دەمبەستەوە و بەیانی منداڵانی ئەهلی مەدینە یاریان پێ دەکرد**).

## ٣- دەروازەی: ئەوەی لە نوێژدا ڕێگەپێدراوە لە کار

١٢٨٩- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: قَالَ: (إِنَّ عِفْرِيتاً مِنَ الجِنِّ تَفَلَّتَ عَلَيَّ البَارِحَةَ ـ أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا ـ لِيَقْطَعَ عَلَيَّ الصَّلَاةَ، فَأَمْكَنَنِي اللهُ مِنْهُ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَرْبِطَهُ إِلَى سَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي المَسْجِدِ، حَتَّى تُصْبِحُوا وَتَنْظُرُوا إِلَيْهِ كُلُّكُمْ، فَذَكَرْتُ قَوْلَ أَخِي سُلَيْمَانَ: ﴿رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ﴾ [ص:٣٥]). [خ٤٦١/ م٥٤١]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (عیفریتێك لە جین دوێنێ پەلاماری دام-یان کەلیمەیەکی هاوشێوەی ئەوە- بۆئەوەی نوێژەکەم پێ ببڕێت، خودا زاڵی کردم بەسەریدا، ویستم بە کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە بیبەستمەوە تا ڕۆژتان لێ دەبێتەوە و تەماشای دەکەن، بەڵام قسەکەی برام سولەیمانم بیرکەوتەوە: ﴿رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ﴾[ص:٣٥]).**

١٢٩٠- (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُصَلِّي، وَهْوَ حَامِلٌ أُمَامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ ـ بِنْتِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَلأَبِي العَاصِ بْنِ الرَّبِيعِ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ ـ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَهَا، وإِذَا قَامَ حَمَلَهَا. [خ٥١٦/ م٥٤٣]

**(ق) لە ئەبی قەتادەی ئەنصارییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی دەکرد، ئەو ئومامەی کچی زەینەبی هەڵگرتبوو-کچی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەو لە ئەبی عاصی کوڕی ڕەبیعی کوڕی عەبد شەمس بوو- کاتێك سوژدەی دەبرد دایدەنا، کاتێك هەڵدەستایەوە هەڵیدەگرت.**

١٢٩١- (ق) عَنْ مُعَيْقِيبٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ فِي الرَّجُلِ يُسَوِّي التُّرَابَ حَيْثُ يَسْجُدُ، قَالَ: (إِنْ كُنْتَ فَاعِلاً، فَوَاحِدَةً). [خ١٢٠٧/ م٥٤٦]

**(ق) لە موعەیقیبەوە: پێغەمبەر(ﷺ) بە پیاوێکی فەرموو خاك و خۆڵەکەی تەخت دەکرد کاتێك سوژدەی لەسەر دەبرد: (گەر ئەو کارە دەکەی یەکجار).**

**١٢٩٢-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: اسْتَفْتَحْتُ البَابَ وَرَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي تَطَوُّعاً، وَالبَابُ عَلَى القِبْلَةِ، فَمَشَى عَنْ يَمِينِهِ أَوْ عَنْ يَسَارِهِ، فَفَتَحَ البَابَ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى مُصَلاَّهُ.

* حسن. [د٩٢٢/ ت٦٠١/ ن١٢٠٥]

**لە عائیشەوە، وتی: هەوڵی کردنەوەی دەرگاکەم دا و پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی سوننەتی دەکرد، و دەرگاکە لەسەر قیبلە بوو، بۆیە بۆ لای ڕاستی یان چەپی ڕۆیشت و دەرگاکەی کردەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ شوێنی نوێژەکە.**

**١٢٩٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**اقْتُلُوا الأَسْوَدَيْنِ فِي الصَّلاَةِ: الحَيَّةَ، وَالعَقْرَبَ**). [د٩٢١/ ت٣٩٠/ ن١٢٠١/ جه١٢٤٥/ مي١٥٤٥]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە نوێژدا دوو ڕەشەکە بکوژن: مار و دووپشك).**

**١٢٩٤-** عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: رَأَيْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَسْتَشْرِفُ لِشَيْءٍ وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ، يَنْظُرُ إِلَيْهِ. [حم٤٠٨٣]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين

**لە ئەنەسی کوڕی سیرینەوە، وتی: ئەنەسی کوڕی مالیکم بینی سەرنجی شتێکی دەدا ئەو لە نوێژدا بوو، تەماشای دەکرد.**

## ٤- دەروازەی: نەهی لە دەستدانان لەسەر کەلەکە لە نوێژدا

**١٢٩٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نُهِيَ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِراً. [خ١٢٢٠/ م٥٤٥]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: نەهی کرا لەوەی پیاو نوێژ بکات و دەستی لەسەر کەلەکەی بێت.**

- ولفظ مسلم: عنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِراً.

لەفزەکەی موسلیم: لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): ئەو نەهی کرد لەوەی پیاو نوێژ بکات و دەستی لەسەر کەلەکەی بێت.

## ٥- دەروازەی: بیرکردنەوە لە شت لە نوێژدا

**١٢٩٦-** (خ) عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﷺ قَـالَ: يَقُـولُ النَّـاسُ: أَكْثَـرَ أَبُـو هُرَيْـرَةَ، فَلَقِيـتُ رَجُـلاً، فَقُلْتُ: بِمَا قَـرَأَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم البَارِحَةَ فِي العَتَمَةِ؟ فَقَالَ: لاَ أَدْرِي، فَقُلْتُ: لَمْ تَشْهَدْهَا؟ قَالَ: بَلَى، قُلْتُ: لكِنْ أَنَا أَدْرِي، قَرَأَ سُورَةَ كَذَا وَكَذَا. [خ١٢٢٣]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: خەڵکی دەڵێن: ئەبو هورەیرە ڕیوایەتی زۆر دەکات، منیش وتم: دوێنێ لە نوێژی عیشا پێغەمبەری خودا(ﷺ) چی خوێند؟ وتی: نازانم، وتم: ئامادە نەبووی؟ وتی: با، وتم: بەڵام من دەزانم، سورەتی ئەوە و ئەوەی خوێند.**

**١٢٩٧-** (خـ) عَنْ عُمَرَ أنه قَالَ: إِنِّي لأُجَهِّزُ جَيْشِي، وَأَنَا فِي الصَّلاَةِ.

[خ. العمل في الصلاة، باب ١٨]

**(خـ) لە عومەرەوە، وتی: من سوپاکەم ڕێکدەخەم و لە نوێژدام.**

## ٦- دەروازەی: وەسوەسە لە نوێژدا

**١٢٩٨-** (م) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي العَاصِ: أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ الله! إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ حَالَ بَيْنِي وَبَيْنَ صَلاَتِي وَقِرَاءَتِي، يَلْبِسُهَا عَلَيَّ، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**ذَاكَ شَيْطَانٌ يُقَالُ لَهُ: خِنْزَبٌ، فَإِذَا أَحْسَسْتَهُ، فَتَعَوَّذْ بِالله مِنْهُ وَاتْفُلْ عَلَى يَسَارِكَ ثَلاَثاً**). قَالَ: فَفَعَلْتُ ذَلِكَ، فَأَذْهَبَهُ الله عَنِّي. [م٢٢٠٣]

**(م) لە عوسمانی کوڕی ئەبی عاصەوە: ئەو هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، شەیتان کەوتووەتە نێوان من و نوێژەکەم و خوێندنەوەکەم،**

لێم تێکدەدات، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوە شەیتانێکە پێی دەوترێت "خنزب" گەر هەستت پێ کرد پەنا بگرە بە خودا لێی و سێ جار تف بە لای چەپدا بکە)**، وتی: ئەوەم کرد و خودا ئەوەی لێ لابردم.

## ٧- دەروازەی: هەڵکردنی پۆشاك و خڕکردنەوە و کۆکردنەوەی قژ

**١٢٩٩-** عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: كُنَّا لاَ نَتَوَضَّأُ مِنْ مَوْطِئٍ، وَلاَ نَكُفُّ شَعْراً وَلاَ ثَوْباً.

* صحيح. [د٢٠٤/ ت١٤٣م تعليقاً/ جه١٠٤١]

**لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: لە پێنان لە پیسی دەستنوێژمان نەدەگرتەوە، قژمان خڕ نەدەکردەوە و پۆشاکمان هەڵنەدەکرد.**

**١٣٠٠-** عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: رَآنِي رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم وَأَنَا سَاجِدٌ، وَقَدْ عَقَصْتُ شَعْرِي . أَوْ قَالَ: عَقَدْتُ . فَأَطْلَقَهُ. [مي١٤٢٠]

* إسناده صحيح.

**لە ئەبی رافیعەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) منی بینی و من لە سوژدەدا بووم و قژم لە ناوەڕاستی سەر کۆکردبووەوە -یان وتی: گرێمدابوو- ئەو قژمی کردەوە.**

## ٨- دەروازەی: گریان لە نوێژدا

**١٣٠١-** عَنْ عبدِ الله بْنِ الشِّخِّيرِ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي، وَفِي صَدْرِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الرَّحَى مِنَ الْبُكَاءِ صلّى الله عليه وسلّم. [د٩٠٤/ ن١٢١٣]

**لە عەبدوڵای کوڕی شەخیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی نوێژی دەکرد لە سینەیدا دەنگێك هەبوو وەك دەنگی دەستهاڕ لە گریانەوە(ﷺ).**

- ولفظ النسائي: وَلِجَوْفِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الْمِرْجَلِ.

* صحيح.

**لەفزەکەی نەسائی: ناخی دەنگێکی هەبوو وەك دەنگی مەنجەڵ.**

**١٣٠٢**– عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَقَّاصٍ قَالَ: كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْعَتَمَةِ بِسُورَةِ يُوسُفَ، وَأَنَا فِي مُؤَخِّرِ الصُّفُوفِ حَتَّى إِذَا جَاءَ ذِكْرُ يُوسُفَ سَمِعْتُ نَشِيجَهُ فِي مُؤَخِّرِ الصَّفِّ.

* قال النووي في الخلاصة (١/٤٩٧): إسناده صحيح. [هق٢/٢٥١]

**لە عەلقەمەی کوڕی وەقاصەوە، وتی: لە نوێـژی عیشـادا عومـەری کـوڕی خـەتاب سورەتی (یوسف)ی دەخوێند، لە ریزەکانی دواوە بووم تا باسی یوسف هاتە بەرەوە گوێم لە کوڕپەی گریانی بوو لە ریزی دواوە.**

## ٩- دەروازەی: ئامـاژە لە نوێژدا

**١٣٠٣**– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُشِيرُ فِي الصَّلاَةِ. [د٩٤٣]

* صحيح.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژدا ئاماژەی دەکرد.**

## ١٠- دەروازەی: شانـدادان لەسـەر دار عـەسا لە نوێژدا

**١٣٠٤**– عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ قَالَ: قَدِمْتُ الرَّقَّةَ، فَقَالَ لِي بَعْضُ أَصْحَابِي: هَلْ لَكَ فِي رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَ: قُلْتُ: غَنِيمَةٌ، فَدَفَعْنَا إِلَى وَابِصَةَ، قُلْتُ لِصَاحِبِي: نَبْدَأُ فَنَنْظُرُ إِلَى دَلِّهِ، فَإِذَا عَلَيْهِ قَلَنْسُوَةٌ لاَطِئَةٌ ذَاتُ أُذُنَيْنِ، وَبُرْنُسُ خَزٍّ أَغْبَرُ، وَإِذَا هُوَ مُعْتَمِدٌ عَلَى عَصاً فِي صَلاَتِهِ، فَقُلْنَا بَعْدَ أَنْ سَلَّمْنَا، فَقَالَ: حَدَّثَتْنِي أُمُّ قَيْسٍ بِنْتُ مِحْصَنٍ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم لَمَّا أَسَنَّ وَحَمَلَ اللَّحْمَ، اتَّخَذَ عَمُوداً فِي مُصَلاَّهُ يَعْتَمِدُ عَلَيْهِ. [د٩٤٨]

* صحيح.

**لە هیلالی کوڕی یەسافەوە، وتی: هاتم بۆ رەققە[1]، یەکێك لـە هـاوەڵانم پێـی وتم: پێتخۆشـە یـەکێك لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) ببـینی؟ وتـی: وتم: ئـەوە غەنیمەتـە،**

---

[1] **رەققە: شارێکە لە سوریا لەسەر روباری فورات.**

چووین بۆ لای وابیصە، وتم بە هاوەڵەکەم: سەرەتا لە سەکینە و ویقار و رووالەتی وردەبینەوە، بینیمان مێزەرەیەکی بچووکی دوو لفکەی لەسەرە، پۆشاکێکی دەرەدامانی خوری چنراوی تۆزاوی لەبەرە، بینیمان لە نوێژەکەیدا شان لەسەر عەصاکەی دادەدات، لەدوای ئەوەی سەلاممان دایەوە، وتی: ئوم قەیسی کچی میحصەن بۆی باس کردم: کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) چوو بە ساڵا و گۆشتی هەڵگرت لە شوێنی نوێژەکەی دارێکی هەبوو شانی لەسەر دادەدا.

## ١١- دەروازەی: سارد کردنەوەی چەو لە نوێژدا

**١٣٠٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي الظُّهْرَ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَآخُذُ قَبْضَةً مِنَ الحَصَى لِتَبْرُدَ فِي كَفِّي، أَضَعُهَا لِجَبْهَتِي أَسْجُدُ عَلَيْهَا، لِشِدَّةِ الحَرِّ.
[د٣٩٩/ ن١٠٨٠]

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە وتی: نوێژی نیوەڕۆم دەکرد لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) مشتێك چەوم هەڵدەگرت بۆ ئەوەی لەناو دەستم ساردبێتەوە و بۆ نێوچاوانم دایبنێم و سوژدەی لەسەر ببەم لەبەر توندی گەرما.

- وعند النسائي زيادة: ثُمَّ أُحَوِّلُهُ فِي كَفِّي الآخَرِ.

* حسن.

لای نەسائی زیادەیەك هەیە: پاشان دەمکردە دەستەکەی ترەوە.

## ١٢- دەروازەی: داپۆشینی دەم لە نوێژدا

**١٣٠٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يُغَطِّيَ الرَّجُلُ فَاهُ فِي الصَّلاَةِ. [جه٩٦٦]

* حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لەوەی پیاو لە نوێژدا دەمی خۆی داپۆشێت.

**١٣٠٧-** عَنْ مَالِك، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ المجَبَّرِ: أَنَّهُ كَانَ يَرَى سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ إِذَا رَأَى الإِنْسَانَ يُغَطِّي فَاهُ وَهُوَ يُصَلِّي، جَبَذَ الثَّوْبَ عَنْ فِيهِ جَبْذاً شَدِيداً، حَتَّى يَنْزِعَهُ عَنْ فِيهِ. [ط٣١]

لە مالیکەوە، لە عبدالرحمانی کوڕی موجەبەرەوە: ئەو سالمی کوڕی عەبدوڵای دەبینی گەر یەکێکی ببینیبا لە نوێژدا دەمی داپۆشیێت بە توندی پۆشاکەکەی رادەکێشا تا لە دەمی دەکردەوە.

## ١٣- دەروازەی: پێکەنین لە نوێژدا

**١٣٠٨-** (خـ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: إِذَا ضَحِكَ فِي الصَّلاَةِ، أَعَادَ الصَّلاَةَ، وَلَمْ يُعِدْ الوُضُوءَ. [خ. الوضوء، باب ٣٤/ هق١/١٤٤]

(خـ) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە وتی: گەر لە نوێژدا پێکەنی نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە، دەستنوێژ دووبارە ناکاتەوە.

**١٣٠٩-** عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِي: أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ فَرَأَوْا شَيْئاً، فَضَحِكَ بَعْضُ مَنْ كَانَ مَعَهُ، فَقَالَ أَبُو مُوسَى حَيْثُ انْصَرَفَ: مَنْ كَانَ ضَحِكَ مِنْكُمْ فَلْيُعِدَ الصَّلاَةَ. [هق١/١٤٥]

لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە: ئەو نوێژی بە خەڵکی دەکرد شتێکیان بینی هەندێ لەوانەی لەگەڵی بوون پێکەنین، کاتێ ئەبو موسا رۆیشت وتی: هەر کەس لە ئێوە پێکەنی با نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە.

## ١٤- دەروازەی: سەهوکردن لە نوێژدا

**١٣١٠-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى بِهِمُ الظُّهْرَ، فَقَامَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ، لَمْ يَجْلِسْ، فَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، حَتَّى إِذَا قَضَى الصَّلاَةَ، وَانْتَظَرَ النَّاسُ تَسْلِيمَهُ، كَبَّرَ وَهُوَ جَالِسٌ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ، ثُمَّ سَلَّمَ. [خ٨٢٩/ م٥٧٠]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی بوحەینەوە: پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی پێکردن، لە دوو ڕکاتی یەکەم بەرزبوویەوە و دانەنیشت، خەڵکەکە لەگەڵی بەرزبوونەوە، تا نوێژەکەی تەواو بوو و خەڵکەکە چاوەڕوانی سەلامدانەوەیان کرد، ئەو دانیشتبوو و "الله أکبر"ی کرد و دوو سوژدەی برد بەرلەوەی سەلام بداتەوە، پاشان سەلامی دایەوە.

**١٣١١**– (ق) عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم إِحْدَى صَلاَتَي العَشِيِّ . قَالَ ابْنَ سِيرِينَ: سَمَّاهَا أَبُو هُرَيْرَةَ، وَلكِنْ نَسِيتُ أَنَا . قَالَ: فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، فَقَامَ إِلَى خَشَبَةٍ مَعْرُوضَةٍ فِي المسْجِدِ، فَاتَّكَأَ عَلَيْهَا كَأَنَّهُ غَضْبَانُ، وَوَضَعَ يَدَهُ اليُمْنَى عَلَى اليُسْرَى، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، وَوَضَعَ خَدَّهُ الأَيْمَنَ عَلَى ظَهْرِ كَفِّهِ اليُسْرَى.

وَخَرَجَتِ السَّرَعَانُ مِنْ أَبْوَابِ المسْجِدِ، فَقَالُوا: قَصُرَتِ الصَّلاَةُ؟ وَفِي القَوْمِ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَهَابَا أَنْ يُكَلِّمَاهُ، وَفِي القَوْمِ رَجُلٌ فِي يَدَيْهِ طُولٌ، يُقَالُ لَهُ: ذُو اليَدَيْنِ، قَالَ: يَا رَسُولَ الله، أَنَسِيتَ أَمْ قَصُرَتِ الصَّلاَةُ؟ قَالَ: (**لَمْ أَنْسَ، وَلَمْ تُقْصَرْ**)، فَقَالَ: (**أَكَمَا يَقُولُ ذُو اليَدَيْنِ**) ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ، فَتَقَدَّمَ فَصَلَّى مَا تَرَكَ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ.

فَرُبَّمَا سَأَلُوهُ: ثُمَّ سَلَّمَ؟ فَيَقُولُ: نُبِّئْتُ أَنَّ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ قَالَ: ثُمَّ سَلَّمَ. [خ٤٨٢/ م٥٧٣]

(ق) لە ئیبن سیرینەوە، لە ئەبی هورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) یەکێك لە دوو نوێژەکەی شێوانی پێکردین–ئیبن سیرین وتی: ئەبو هورەیرە ناوی نوێژەکەی برد، بەڵام من لەبیرم چوو– وتی: دوو ڕکاتی پێ کردین و سەلامیدایەوە، هەستا بۆ لای تەختەیەکی دانراو لە مزگەوتەکە شانی لەسەر دادا وەك ئەوەی تووڕە بێت، دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپ دانا و پەنجەکانی لەیەکتر هەڵپێکا و ڕوومەتی لای ڕاستی لەسەر بەری دەستی چەپ دانا، بەراییەکەیان لە دەرگای مزگەوت چوونە دەرەوە، وتیان: نوێژ کورتبووەتەوە؟ لە خەڵکەکەدا ئەبوبەکر و عومەری تێدا بوو، هەیبەتیان کرد قسەی لەگەڵ بکەن، لە ناو خەڵکەکەدا پیاوێك هەبوو لە دوو دەستیدا درێژی هەبوو، پێی دەوترا: "ذو اليدين–خاوەن دوو دەستەکە" وتی ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا لەبیرت کرد یان نوێژ کورتکراوەتەوە؟ فەرمووی: (**لەبیرم نەکرد و نوێژیش**

**کورتنەکراوەتەوە)**، ئەوجا فەرمووی: **(ئایا بەو جۆرەیە "ذو الیدین" دەیڵێ؟)**، وتیان: بەڵێ، پێشکەوت و ئەوەی وازیلێهێنابوو ئەنجامیدا، و پاشان سەلامی دایەوە، پاشان "الله أکبر"ی کرد و سوژدەی برد وەك سوژدەکانی یان درێژتر، پاشان سەری بەرزکردەوە و "الله أکبر"ی کرد.

لەوانەیە پرسیاریان لێکردبێت: ئایا پاشان سەلامی دایەوە؟ ئەو دەڵێت: هەواڵم پێدراوە عیمرانی کوڕی حوصەین وتوویەتی: پاشان سەلامی دایەوە.

**١٣١٢–** (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ، فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى ثَلاَثاً أَمْ أَرْبَعاً؟ فَلْيَطْرَحِ الشَّكَّ، وَلْيَبْنِ عَلَى مَا اسْتَيْقَنَ، ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ، فَإِنْ كَانَ صَلَّى خَمْساً، شَفَعْنَ لَهُ صَلاَتَهُ، وَإِنْ كَانَ صَلَّى إِتْمَاماً لأَرْبَعٍ، كَانَتَا تَرْغِيماً لِلشَّيْطَانِ)**. [م٥٧١]

(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە لە نوێژەکەیدا شکی بۆ دروست بوو، نەیزانی چەند رکات نوێژی کردووە سێ یان چوار؟ با شکەکەی پاڵ بنێت و لەسەر ئەوەی دڵنیایە بینا بکات، پاشان دوو سوژدە ببات بەرلەوەی سەلام بداتەوە، گەر پێنج رکاتی کرد بوو نوێژەکەی شفاعەتی بۆ دەکات، گەر چواری تەواو کرد بوو لوتی شەیتان لە خۆڵەوە دەدەن)**.

**١٣١٣–** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم سَمَّى سَجْدَتَيِ السَّهْوِ المرْغِمَتَيْنِ.

* صحيح. [د١٠٢٥]

لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) دوو سوژدەی سەهوی ناونا **"المُرْغِمَتَيْنِ– خۆڵاویکەری لووتی شەیتان"**.

**١٣١٤–** عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ قَالَ: صَلَّى بِنَا المغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، فَنَهَضَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ، قُلْنَا: سُبْحَانَ الله! قَالَ: سُبْحَانَ الله، وَمَضَى، فَلَمَّا أَتَمَّ صَلاَتَهُ وَسَلَّمَ، سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَصْنَعُ كَمَا صَنَعْتُ.

لە زیادی کوڕی عیلاقەوە، وتی: موغیرەی کوڕی شوعبە نوێژی پێکردین لە دوو ڕکاتەکە هەستایەوە، وتمان: سبحان الله، ئەو بەرزبوویەوە، کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد و سەلامیدایەوە، دوو سوژدەی سەهووی برد، کاتێك ڕۆیشت وتی پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی ئەوەی کرد کە من کردم.

- زاد الترمذي والدارمي بعد «سَجَدَ سَجْدَتَيْ السَّهْوِ»: وَسَلَّمَ.

* صحيح. [د١٠٣٧/ ت٣٦٥/ مي١٥٤٢]

ترمزی و داریمی لەدوای (دوو سوژدەی سەهو) ئەمەیان زیاد کردووە: سەلامیدایەوە.

**١٣١٥**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِذَا سَهَا أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ، فَلَمْ يَدْرِ وَاحِدَةً صَلَّى أَوْ ثِنْتَيْنِ، فَلْيَبْنِ عَلَى وَاحِدَةٍ، فَإِنْ لَمْ يَدْرِ ثِنْتَيْنِ صَلَّى أَوْ ثَلاَثاً، فَلْيَبْنِ عَلَى ثِنْتَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَدْرِ ثَلاَثاً صَلَّى أَوْ أَرْبَعاً، فَلْيَبْنِ عَلَى ثَلاَثٍ، وَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ). [ت٣٩٨/ جه١٢٠٩]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، لە عبدالرحمانی کوڕی عەوفەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(گەر یەکێك لە ئێوە لە نوێژەکەی سەهوی کرد و نەیزانی یەك ڕکاتی کردووە یان دوو، با لەسەر یەك بینا بکات، گەر نەیزانی دوو ڕکاتی کردووە یان سێ با لەسەر دوو بینا بکات، گەر نەیزانی سێ ڕکاتی کردووە یان چوار با لەسەر سێ بینا بکات و دوو سوژدە ببات بەرلەوەی سەلام بداتەوە).**

**١٣١٦**– عَنِ المغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا قَامَ الإِمَامُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ: فَإِنْ ذَكَرَ قَبْلَ أَنْ يَسْتَوِيَ قَائِماً فَلْيَجْلِسْ، فَإِنْ اسْتَوَى قَائِماً فَلاَ يَجْلِسْ، وَيَسْجُدْ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ). [د١٠٣٦/ جه١٢٠٨]

* صحيح.

لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئیمام لە دوو ڕکاتەکە بەرزبوویەوە: گەر بەرلەوەی ڕێکبێتەوە و بەپێوە بوەستێ بیریکەوتەوە با دابنیشێتەوە، گەر ڕێکبوویەوە بە پێوە با دانەنیشێتەوە، و دوو سوژدەی سەهو ببات).**

## بەشی یەكەم

# نوێژی سوننەت

## ١- دەروازەی: دەستگرتن و پارێزگاری لە دوو ركات نوێژە سوننەتەكەی فەجر

**١٣١٧-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَت: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، عَلَى شَيْءٍ مِنَ النَّوَافِلِ، أَشَدَّ مِنْهُ تَعَاهُداً عَلَى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ. [خ١١٦٣/ م٧٢٤]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە شتێك لە نافیلەكانەوە(النوافل[1]) پێداگر و دەستگرتووتر نەبووە وەك لە دوو ركاتەكەی فەجر.**

**١٣١٨-** (م) عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُ قَالَ فِي شَأْنِ الرَّكْعَتَيْنِ عِنْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ: (لَهُمَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا جَمِيعاً). [م٧٢٥]

**(م) لە عائیشەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): دەربارەی دوو ركاتەكە كاتی هەڵهاتنی فەجر فەرمووی: (ئەو دوانە[2] لە هەموو دنیا لام خۆشەویستترن).**

- وفي رواية: قَالَ: (رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا).

**لە ریوایەتێكدا: فەرمووی: (دوو ركاتەكەی بەیانی چاكتر و باشترە لە دنیا و ئەوەی لە دنیادایە).**

---

[1] "النوافل" كۆی وشەی (نَفْل)ە، نوێژی نافیلە: واتە زیاد لە فەرزەكان.

[2] واتە: ئەو دوو ركاتە سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی-و.

**١٣١٩-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ، وَكَانَ يَقُولُ: (نِعْمَ السُّورَتَانِ هُمَا، يُقْرَأُ بِهِمَا فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، وَ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾). [جه١١٥٠]

* صحيح.

**لە عائیشەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەر لە فەجر دوو رکات نوێژی دەکرد، ئەو دەیفەرموو: (باشترین سورەت لە دوو رکاتەکەی فەجر بخوێنرێن ئەم دوو سورەتەن:﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾).**

**١٣٢٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا رَكَعَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ. [حم٦٦١٩]

* صحيح لغيره.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوو رکاتەکەی فەجری بکردبایە لەسەر لای راست پاڵیدەدایەوە.**

## ٢- نوێژی سوننەتی پێش و پاش نوێژە فەرزەکان

**١٣٢١-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ، بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ)، ثُمَّ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: (لِمَنْ شَاءَ). [خ٦٢٧ (٦٢٤)/ م٨٣٨]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی موغەفەلەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لە نێوان هەر دوو بانگێکدا نوێژێك هەیە، لە نێوان هەر دوو بانگێکدا نوێژێك هەیە)، پاشان لە سێیەمدا فەرمووی: (بۆ هەر کەس بیەوێت).**

**١٣٢٢-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ المؤَذِّنُ إِذَا أَذَّنَ، قَامَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يَبْتَدِرُونَ السَّوَارِيَ، حَتَّى يَخْرُجَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُمْ كَذلِكَ، يُصَلُّونَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ المغْرِبِ، وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ شَيْءٌ. [خ٦٢٥ (٥٠٣)/ م٨٣٧]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: گەر بانگوێژ بانگی بدابا خەڵکانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵدەستان دەستپێشخەرییان دەکرد بۆ لای پایە و کۆڵەکەکان، تا پێغەمبەر(ﷺ) دەهاتە دەرەوە ئەوان بەو جۆرە بوون، بەر لە مەغریب دوو رکاتیان دەکرد، لە نێوان بانگ و قامەتدا هیچ شتێك نەبوو.

**١٣٢٣**– (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، وَسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ المغْرِبِ، وَسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ، وَسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ الجُمُعَةِ، فَأَمَّا المغْرِبُ وَالْعِشَاءُ فَفِي بَيْتِهِ. [خ١١٧٢ (٩٣٧)/ م٧٢٩]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت) وتی: بەر لە نیوەڕۆ دوو سوژدەم[١] لەگەڵ پێغەمبەر ئەنجامدا، هەر بەو جۆرە دوو سوژدە لەدوای نیوەڕۆ، دوو سوژدە دوای مەغریب و دوو سوژدە دوای عیشا، و دوو سوژدە لەدوای جومعە، ئەوانەی مەغریب و عیشا لەماڵەوە دەیکردن.

**١٣٢٤**– (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ لاَ يَدَعُ أَرْبَعاً قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ. [خ١١٨٢]

(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) بەر لە نوێژی نیوەڕۆ چوار رکاتی وازلێنەدەهێنا، هەر بەو جۆرە دوو رکات بەر لە نوێژی بەیانی.

**١٣٢٥**– (م) عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ أَنَّهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يُصَلِّي للهِ كُلَّ يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوُّعاً، غَيْرَ فَرِيضَةٍ؛ إِلاَّ بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الجَنَّةِ ـ أَوْ إِلاَّ بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الجَنَّةِ ـ**).
قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ: فَمَا بَرِحْتُ أُصَلِّيهِنَّ بَعْدُ. [م٧٢٨]

(م) لە ئوم حەبیبەوە–هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)– ئەو وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەر بەندەیەکی موسڵمان هەموو رۆژێك دوازدە رکات

---

[١] واتە: دوو رکات نوێژی سوننەت.

**نوێـژی سـوننەت بکـات، جگـە لـە فـەرزەکان، خـودا لـە بەهەشـت مـاڵێکی بـۆ دروستکردووە–یان ماڵێکی لە بەهەشت بۆ دروستکراوە–)**، ئوم حەبیبە وتی: لەدوای ئەوە بەردەوام ئەو نوێژانەم ئەنجامداوە.

- زاد الترمذي: (أَرْبَعـاً قَبْـلَ الظُّهْـرِ، وَرَكْعَتَـيْنِ بَعْـدَهَا، وَرَكْعَتَـيْنِ بَعْـدَ الْمَغْـرِبِ، وَرَكْعَتَـيْنِ بَعْـدَ الْعِشَاءِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الْفَجْرِ). [ت٤١٥]

ترمزی ئەمەی زیاد کردووە: **(چوار رکات بەر لە نیوەڕۆ و دوو رکات دوای نیوەڕۆ و دوو رکات دوای مەغریب و دوو رکات دوای عیشا و دوو رکات بەر لە نوێژی فەجر).**

**١٣٢٦–** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، عَنْ تَطَوُّعِهِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي فِي بَيْتِي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعاً، ثُمَّ يَخْرُجُ فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ، ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ. وَكَانَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ. وَيُصَلِّي بِالنَّاسِ الْعِشَاءَ، وَيَدْخُلُ بَيْتِي فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ. وَكَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ، فِيهِنَّ الْوِتْرُ. وَكَانَ يُصَلِّي لَيْلاً طَوِيلاً قَائِماً، وَلَيْلاً طَوِيلاً قَاعِداً. وَكَانَ إِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ، رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَائِمٌ، وَإِذَا قَرَأَ قَاعِداً، رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَاعِدٌ. وَكَانَ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ. [م٧٣٠]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی شەقیقەوە، وتی: پرسیارم لە عائیشە کرد دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، دەربارەی نوێژە سوننەتەکانی؟ وتی: لە ماڵەکەی من بەر لە نیوەڕۆ چوار رکاتی دەکرد، پاشان دەچووە دەرەوە و نوێژی بە خەڵك دەکرد، پاشان دەهاتەوە ماڵەوە و دوو رکاتی دەکرد، ئەو نوێژی مەغریبی بە خەڵك ئەنجام دەدا و پاشان دەهاتەوە ماڵەوە و دوو رکاتی دەکرد، نوێژی عیشای بە خەڵك دەکرد دەهاتەوە بۆ ماڵەکەی من و دوو رکاتی دەکرد، لە شەو نۆ رکاتی دەکرد لەوانەدا ویتری تێدا بوو، شەوێکی دوور و درێژ بە پێوە نوێژی دەکرد و شەوێکی دوور و درێژ بە دانیشتنانەوە نوێژی دەکرد، ئەو کاتێك دەیخوێند و بە پێوە بوو، رکووع و**

سوژدەی دەبرد و ئەو بە پێوە بوو[1]، گەر بە دانیشتنانەوە بیخوێندبایە رکووع و سوژدەی دەبرد ئەو دانیشتبوو[2]، کاتێك فەجر هەڵدەهات دوو رکات نوێژی دەکرد.

**١٣٢٧**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(رَحِمَ اللهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعاً)**. [د١٢٧١/ ت٤٣٠]

* حسن.

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(رەحمەتی خودا لە کەسێك بەر لە عەصر چوار رکات دەکات)**.

## ٣- دەروازەی: نوێژی سوننەت لە مالەوە

**١٣٢٨**- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(اجْعَلُوا فِي بُيُوتِكُمْ مِنْ صَلاَتِكُمْ، وَلاَ تَتَّخِذُوهَا قُبُوراً)**. [خ٤٣٢/ م٧٧٧]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە نوێژەکانتان ببەنەوە ماڵەکانتان، ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان[3])**.

**١٣٢٩**- (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا قَضَى أَحَدُكُمُ الصَّلاَةَ فِي مَسْجِدِهِ؛ فَلْيَجْعَلْ لِبَيْتِهِ نَصِيباً مِنْ صَلاَتِهِ، فَإِنَّ اللهَ جَاعِلٌ فِي بَيْتِهِ مِنْ صَلاَتِهِ خَيْراً)**. [م٧٧٨]

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە لە مزگەوت نوێژەکەی ئەنجامدا با بەشێك لە نوێژەکەی بۆ ماڵەوە دابنێت، چونکە خودا لە نوێژەکەیدا خێر لە ماڵەکەی دادەنێت)**.

---

[1] واتە:بە پێوە دەیگواستەوە بۆ رکوع و سوژدە-و.

[2] واتە: لە دانیشتنەوە دەیگواستەوە بۆ رکوع و سوژدە-و.

[3] واتە: وەك مردوو مەبن لە ماڵەکانیان کە بریتییە لە گۆڕ و نوێژی تێدا ناکەن.

**١٣٣٠-** عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي مَسْجِدِ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ الْمَغْرِبَ، فَقَامَ نَاسٌ يَتَنَفَّلُونَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الصَّلَاةِ فِي الْبُيُوتِ**). [د١٣٠٠/ ت٦٠٤/ ن١٥٩٩]

* حسن.

**لە کەعبی کوڕی عوجرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوتی (بني عبدالأشهل) نوێژی مەغریبی کرد، خەڵکی راستبوونەوە و نوێژی نافیلەیان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لەسەرتانە ئەم نوێژە ببەنەوە ناوماڵەکان).**

## ٤- دەروازەی: نوێژی نافیلە بە دانیشتنانەوە

**١٣٣١-** (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقْرَأُ فِي شَيْءٍ مِنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ جالِساً، حَتَّى إِذَا كَبِرَ قَرَأَ جَالِساً، فَإِذَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنَ السُّورَةِ ثَلَاثُونَ أَوْ أَرْبَعُونَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَهُنَّ، ثُمَّ رَكَعَ. [خ١١٤٨ (١١١٨)/ م٧٣١]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەرم(ﷺ) نەبینی شتێك لە شەونوێژ بە دانیشتنانەوە بخوێنێت، کە پیری رووی لێ کرد بە دانیشتنانەوە دەیخوێند، گەر سی یان چل ئایەتێك لە سورەتەکە بمابا هەڵدەستایە سەر پێ و دەیخوێندن و پاشان رکووعی دەبرد.**

**١٣٣٢-** (خ) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ - وَكَانَ مَبْسُوراً - قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ صَلَاةِ الرَّجُلِ قاعِداً؟ فَقَالَ: (**إِنْ صَلَّى قائِماً فَهُوَ أَفْضَلُ، وَمَنْ صَلَّى قَاعِداً فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَائِمِ، وَمَنْ صَلَّى نَائِماً فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَاعِدِ**). [خ١١١٥]

**(خ) لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە -ئەو مایەسیری هەبوو- وتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد دەربارەی نوێژی پیاو بە دانیشتنانەوە؟ فەرمووی: (گەر بە پێوە نوێژ بکات باشترە بۆی، هەر کەسیش بە دانیشتناوە نوێژ بکات نیوە**

پاداشتی ئەو کەسەی هەیە بە پێوە نوێژ دەکات، هەر کەسیش بە راکشانەوە نوێژ بکات نیوەی پاداشتی دانیشتووی بۆ هەیە[1]).

## ٥- دەروازەی: نوێژی چێشتەنگاو

**١٣٣٣**– (ق) عَنِ عَبْدِ الرَّحمنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: ما أَنْبَأَنَا أَحدٌ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى الضُّحَى غَيْرُ أُمِّ هَانِئٍ، ذَكَرَتْ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ اغْتَسَلَ فِي بَيْتِهَا، فَصَلَّى ثَمَانِ رَكَعَاتٍ، فَمَا رَأَيْتُهُ صَلَّى صَلاَةً أَخَفَّ مِنْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ. [خ١١٠٣/ م. صلاة المسافرين ٣٣٦ (٨٠)]

**(ق) لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبی لەیلاوە، وتی: هیچ کەس هەواڵی پێ نەداین پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی چێشتەنگاوی ئەنجامداوە جگە لە "أم هانيء"، باسی لەوە کرد پێغەمبەر(ﷺ) لە رۆژی فەتحی مەککە لە ماڵەکەی ئەو خۆی شۆری، و هەشت رکات نوێژی کرد، نەمبینیوە نوێژێکی سوکتر لەو نوێژەی ئەنجامدابێت، بەڵام رکووع و سوژدەی تێر و تەواو دەکرد.**

**١٣٣٤**–(م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي الضُّحَى أَرْبَعاً، وَيَزِيدُ مَا شَاءَ اللهُ. [م٧١٩]

**(م) لە عائیشەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) چوار رکات نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد، چەند خودا بیویستبا زیادی دەکرد.**

**١٣٣٥**– (م) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: أَوْصَانِي حَبِيبِي صلّى الله عليه وسلّم بِثَلاَثٍ، لَنْ أَدَعَهُنَّ مَا عِشْتُ: بِصِيَامِ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَصَلاَةِ الضُّحَى، وَبِأَنْ لاَ أَنَامَ حَتَّى أُوتِرَ. [م٧٢٢]

**(م) لە ئەبی دەرداوە وتی: خۆشەویستەکەم بە سێ شت وەسێتی بۆ کردم، تا لە ژیاندا بم وازیان لێ ناهێنم، رۆژووی سێ رۆژ لە هەموو مانگێکدا، و نوێژی چێشتەنگاو، و نەخەوم تا نوێژی ویتر دەکەم.**

---

(١) واتە: چارەکێك پاداشتی ئەو کەسەی بە پێوە نوێژ دەکات–و.

**١٣٣٦**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لا يُحَافِظَ عَلى صَلاةِ الضُّحَى إِلاَّ أَوّابٌ**) قَالَ: (**وَهِيَ صَلاةُ الأَوَّابِينَ**). [مه١٢٢٤/ ك١١٨٢]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (تەنها کەسی "أوّاب" پارێزگاری لە نوێژی چێشتەنگاو دەکات). فەرمووی: (ئەوەش بریتییە لە نوێژی "الأوّابين"[1]).**

## ٦- دەروازەی: نوێژی ئەوابین(صلاة الأوّابين[2])

**١٣٣٧**–(م) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ: رَأَى قَوْماً يُصَلُّونَ مِنَ الضُّحَى، فَقَالَ: أَمَا لَقَدْ عَلِمُوا أَنَّ الصَّلاَةَ فِي غَيْرِ هَذِهِ السَّاعَةِ أَفْضَلُ، إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**صَلاَةُ الأَوَّابِينَ حِينَ تَرْمَضُ الْفِصَالُ**). [م٧٤٨]

**(م) لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە: کۆمەڵێکی بینی لە چێشتەنگاو نوێژیان دەکرد، وتی: ئەوان دەزانن نوێژ لە ساتێکی تر جگە لەم ساتە باشترە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نوێژی "ئەوابین" کاتێکە بەچکە حوشتر پێی بسوتێت[3]).**

## ٧- دەروازەی: نوێژی ئیستیخارە

**١٣٣٨**– (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُعَلِّمُنَا الإِسْتِخَارَةَ فِي الأُمُورِ كما يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يَقُولُ: (**إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالأَمْرِ،**

---

(١) "أوابين" کۆی وشەی "أواب"ە کە بریتییە لە کەسێك بە زیکر و تەسبیح زۆر بۆ لای خودا بگەڕێتەوە و تەوبە بکات و پەشیمانی دەرببڕێت–و.

(٢) دانەریش دەربارەی (الأوابين) دەڵێت: کۆی وشەی "الأواب"ە کە مانای گوێڕایەڵی هەیە، وتراویشە: مانای کەسی گەڕاوەی هەیە بە تەوبەکردن بۆ لای گوێڕایەڵی کردنی خودا.

(٣) واتە: لە هاویندا ئەوەندە دنیا گەرم دابێت تینی خۆر ڕەملی زەوی گەرم بکات و پێی بەچکە حوشتر–کە ناسکە– بە هۆی گەرمی ڕەملەکەوە بسوتێت.

فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ، ثُمَّ لِيَقُلِ: اللَّهُمَّ! إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ. اللَّهُمَّ! إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هذَا الأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي ـ أَوْ قَالَ: عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ ـ فَاقْدُرْهُ لِيَ وَيَسِّرْهُ لِي، ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هذَا الأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي ـ أَوْ قَالَ: فِي عاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ ـ فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِيَ الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ. قَالَ: وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ). [خ١١٦٦]

(خ) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیستیخارەی فێر دەکردین وەك چۆن سورەتێك لە قورئانی فێر دەکردین، دەیفەرموو: **(گەر یەکێك لە ئێوە ویستی کارێك ئەنجام بدات، با دوو رکات نوێژ-جیا لە نوێژی فەرز- ئەنجام بدات، پاشان بڵێت: "اللهم إني أستخيرك بعلمك، وأستقدرك بقدرتك، وأسألك من فضلك العظيم، فإنك تقدر ولا أقدر، وتعلم ولا أعلم، وأنت علام الغيوب، اللهم إن كنت تعلم أن هذا الأمر خير لي في ديني ومعاشي وعاقبة أمري**-یان فەرمووی: **في عاجل أمري وآجله-فاقدره لي ويسره لي، ثم بارك لي فيه، وإن كنت تعلم أن هذا الأمر شر لي في ديني ومعاشي وعاقبة أمري**-یان فەرمووی: **في عاجل أمري وآجله- فاصرفه عني واصرفني عنه، واقدر لي الخير حيث كان، ثم أرضني به")**، فەرمووی: **(ناوی پێویستییەکەی دەهێنێت)**.

## ٨- دەروازەی: تەحیەتولمەسجید (تحية المسجد[1])

**١٣٣٩-** عَنِ ابْنِ لاَسٍ الْخُزَاعِيِّ قَالَ: دَخَلَ عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ الْمَسْجِدَ، فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ أَخَفَّهُمَا وَأَتَمَّهُمَا، قَالَ: ثُمَّ جَلَسَ، فَقُمْنَا إِلَيْهِ فَجَلَسْنَا عِنْدَهُ، ثُمَّ قُلْنَا لَهُ: لَقَدْ خَفَّفْتَ رَكْعَتَيْكَ هَاتَيْنِ جِدّاً يَا أَبَا الْيَقْظَانِ؟ فَقَالَ: إِنِّي بَادَرْتُ بِهِمَا الشَّيْطَانَ أَنْ يَدْخُلَ عَلَيَّ فِيهِمَا، قَالَ:... فَذَكَرَ الْحَدِيثَ. [حم١٨٣٢٣، ١٨٣٢٤]

* حديث صحيح، وإسناده حسن.

[انظر: **١٠٨٧، ١٤٧٧**].

---

[1] "تحية المسجد": سڵاوی مزگەوت-و.

لە ئیبن لاسی خوزاعییەوە، وتی: عەماری کوڕی یاسر هاتە ناو مزگەوتەکە، سوکترین و تەواوترین دوو رکات نوێژی کرد، وتی: پاشان دانیشت، ئێمەش هەستاین و چووین بۆ لای و لای دانیشتین، پاشان پێمان وت: ئەی باوکی یەقزان، ئەو دوو رکات نوێژەت زۆر سووك ئەنجامدا؟ وتی: من بەو جۆرە دەستپێشخەریم کرد لە شەیتان لەو دوو رکات نوێژەوە بێتە ژوورەوە بۆم[1]. وتی:...فەرموودەکەی باس کرد.

## ٩- دەروازەی: نوێژی تەسبیح(صلاة التسبيح)

**١٣٤٠-** عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِلْعَبَّاسِ: **(يَا عَمِّ! أَلاَ أَصِلُكَ، أَلاَ أَحْبُوكَ، أَلاَ أَنْفَعُكَ)**؟ قَالَ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(يَا عَمِّ، صَلِّ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ تَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةٍ، فَإِذَا انْقَضَتِ الْقِرَاءَةُ فَقُلْ: اللهُ أَكْبَرُ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَسُبْحَانَ اللهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، خَمْسَ عَشْرَةَ مَرَّةً قَبْلَ أَنْ تَرْكَعَ، ثُمَّ ارْكَعْ فَقُلْهَا عَشْراً، ثُمَّ ارْفَعْ رَأْسَكَ فَقُلْهَا عَشْراً، ثُمَّ اسْجُدْ فَقُلْهَا عَشْراً، ثُمَّ ارْفَعْ رَأْسَكَ فَقُلْهَا عَشْراً، ثُمَّ اسْجُدْ الثَّانِيَةَ فَقُلْهَا عَشْراً، ثُمَّ ارْفَعْ رَأْسَكَ فَقُلْهَا عَشْراً قَبْلَ أَنْ تَقُومَ، فَتِلْكَ خَمْسٌ وَسَبْعُونَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ، وهِيَ ثَلاَثُمِائَةٍ فِي أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ، فَلَوْ كَانَتْ ذُنُوبُكَ مِثْلَ رَمْلِ عَالِجٍ لَغَفَرَهَا اللهُ لَكَ)**. قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَنْ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَقُولَهَا فِي كُلِّ يَوْمٍ؟ قَالَ: **(فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ أَنْ تَقُولَهَا فِي كُلِّ يَوْمٍ فَقُلْهَا فِي جُمُعَةٍ، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ أَنْ تَقُولَهَا فِي جُمُعَةٍ فَقُلْهَا فِي شَهْرٍ)**، فَلَمْ يَزَلْ يَقُولُ لَهُ حَتَّى قَالَ: **(فَقُلْهَا فِي سَنَةٍ)**. [ت٤٨٢/ جه١٣٨٦]

* صحيح.

لە ئەبی رافیعەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە عەباسی فەرموو: **(مامی خۆم، دەتەوێ سیلەی رەحمت لەگەڵ بەجێبهێنم، و بە پێدانی شتێك تایبەتت بکەمەوە، و سوودت پێ بگەیەنم؟)**، وتی: بەڵێ، ئەی پێغەمبەی خودا، فەرمووی: **(مامی خۆم، چوار رکات ئەنجام بدە، لە هەر رکاتێك (فاتحة الكتاب) و سورەتێك دەخوێنی، کە خوێندنەوە تەواو بوو بەرلەوەی رکووع ببەی پازدە جار: (الله أكبر، والحمد لله،**

---

[1] واتە ترسی هەبوو تووشی ریا بێت، بۆیە نوێژەکەی زۆر درێژە پێ نەدا، نوێژەکەشی بە تێر و تەواوی ئەنجامدا-و.

**وسبحان الله، ولا إله إلا الله) دەخوێنی، پاشان ڕکووع ببە و دە جار بیڵێ، پاشان سەرت بەرزبکەرەوە و دە جار بیڵێ، پاشان سوژدە ببە و دە جار بیڵێ، پاشان سەرت بەرزبکەرەوە و دە جار بیڵێ، پاشان بۆ جاری دووەم سوژدە ببەرەوە و دە جار بیڵێ، پاشان سەرت بەرزبکەرەوە و دە جار بیڵێ بەرلەوەی بەرزببیتەوە، ئەوە حەفتا و پێنج لە هەر ڕکاتێکدا و سێسەد لە هەر چوار ڕکاتەکەدا، گەر گوناهەکانت وەك ڕەملی كۆماکراو بن خودا لێیان خۆشدەبێت).**

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، کێ دەتوانێ هەموو ڕۆژێك ئەوە بڵێت؟ فەرمووی: **(گەر توانات نەبوو هەموو ڕۆژێ بیڵێی هەموو هەفتەیە، گەر توانات نەبوو هەموو هەفتەیە بیڵێی هەموو مانگێك)**، بەردەوام پێی دەفەرموو تا فەرمووی: **(لە ساڵێکدا بیڵێ)**.

## ١٠- دەروازەی: نوێژی پێویستی

[انظر: ٢٢٧١].

## ١١- دەروازەی: پاڵدانەوە لەدوای دوو ڕکاتە سوننەتەکەی فەجر

**١٣٤١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا صَلَّى رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ اضْطَجَعَ. [جه١١٩٩]

* حسن صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوو ڕکاتەکەی فەجری بکردبایە پاڵیدەدایەوە.**

## ١٢- دەروازەی: کەی دوو ڕکاتەکەی فەجر قەزا دەکاتەوە؟

**١٣٤٢-** عَنْ قَيْسِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلاً يُصَلِّي بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(صَلاَةُ الصُّبْحِ رَكْعَتَانِ)**، فَقَالَ

الرَّجُلُ: إِنِّي لَمْ أَكُنْ صَلَّيْتُ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، فَصَلَّيْتُهُمَا الْآنَ، فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [د١٢٦٧/ ت٤٢٣/ جه١١٥٤]

* صحيح.

**لە قەیسی کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێکی بینی لەدوای نوێژی بەیانی دوو رکات نوێژی دەکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نوێژی بەیانی دوو رکاتە)، پیاوەکە وتی: من ئەو دوو رکاتەی بەر لە دوو رکاتەکەی نوێژی بەیانییە ئەنجامم نەدابوون، بۆیە ئێستا ئەنجامەدان، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بێدەنگ بوو.**

**١٣٤٣**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ لَمْ يُصَلِّ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ؛ فَلْيُصَلِّهِمَا بَعْدَ مَا تَطْلُعُ الشَّمْسُ**). [ت٤٢٣]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس دوو رکاتەکەی فەجر ئەنجام نەدات، با ئەنجامیان بدات کاتێك خۆر دێتە دەرەوە).**

## ١٣- دەروازەی: ئایا کاتێك نوێژی فەرزی کرد یەکسەر سوننەت دەکات؟

**١٣٤٤**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ**. قَالَ عَنْ عَبْدِ الْوَارِثِ ـ **أَنْ يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ، أَوْ عَنْ يَمِينِهِ، أَوْ عَنْ شِمَالِهِ**). زَادَ فِي حَدِيثِ حَمَّادٍ: (**فِي الصَّلَاةِ**) يَعْنِي: فِي السُّبْحَةِ. [د١٠٠٦/ جه١٤٢٧]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئایا یەکێك لە ئێوە دەستەوسانە–وتی: لە عەبدولواریسەوە– بچێتە پێشەوە یان بێتە دواوە، یان بچێت**

**بۆ لای راست یان بۆ لای چەپ)، لە فەرموودەکەی "حمّاد"دا ئەمە زیادبووە: (لە نوێژدا[1])، واتە: لە نوێژی سوننەتدا.**

**١٣٤٥–** عَنْ ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: مَنْ صَلَّى الْفَرِيضَةَ ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يُصَلِّي بَعْدَهَا، فَلْيَتَقَدَّمْ أَوْ لِيُكَلِّمْ أَحَداً. [هق٢/١٩١]

**لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) وتی: هەر کەس فەرزەکان ئەنجام بدات پاشان ویستی لەدوایانەوە نوێژ ئەنجام بدات، با بچێتە پێشەوە یان لەگەڵ کەسێك قسە بکات[2].**

---

[1] واتە کە نوێژە فەرزەکەی بە جەماعەت تەواو کرد لە هەمان شوێندا نوێژی سوننەت نەکات، بەڵکو شوێنەکە بگۆڕێت بۆ پێشەوە و بۆ دواوە یان لای راست و بۆ لای چەپ–و.

[2] لەگەڵ کەسێك قسە بکات: واتە لە نوێژە جەماعەتەکە هاتووەتە دەرەوە و هەر نوێژێکی تر بکات نوێژی سوننەتە–و.

## بەشی دووەم

# شەونوێژ و نوێژی ویتر

## ١- دەروازەی: فەزڵی دوعا و نوێژ لە بەشی کۆتایی شەو

**١٣٤٦-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ، يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ).** [خ١١٤٥/ م٧٥٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەموو شەوێ پەروەردگارمان دادەبەزێ بۆ ئاسمانی دنیا، کاتێك بەشی سێیەمی کۆتایی شەو دەمێنێت[١]، دەفەرموێت: کێ بانگم دەکات وەڵامی دەدەمەوە، کێ داوام لێ دەکات پێی دەبەخشم، کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات لێیخۆش دەبم).**

## ٢- دەروازەی: شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە

**١٣٤٧-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً، تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى).** [خ٩٩٠ (٤٧٢)/ م٧٤٩]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە: پیاوێك دەربارەی شەونوێژ پرسیاری لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد، فەرمووی: **(شەونوێژ دوو دووە، گەر یەکێك لە ئێوە**

---

[١] واتە شەو بکرێت بە سێ بەشەوە، بەشی کۆتاییەکەی، هاتنی شەو لە مەغریبەوە دەست پێ دەکات تا هەڵهاتنی بەرەبەیان-و.

ترسی بەیانی هەبوو یەك ركات بكات، ئەوەی ئەنجامیداوە لە نوێژ بۆی دەبێت بە ویتر[1]).

## ٣- دەروازەی: سیفەتی هەستان بۆ شەونوێژ

**١٣٤٨-** (ق) عَنِ الأَسْوَدِ قَالَ: سَأَلْتُ عائِشَةَ ﵁: كَيْفَ صَلاَةُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِاللَّيْلِ؟ قَالَتْ: كانَ يَنَامُ أَوَّلَهُ، وَيَقُومُ آخِرَهُ، فَيُصَلِّي ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى فِرَاشِهِ، فَإِذَا أَذَّنَ المؤذِّنُ وَثَبَ، فَإِنْ كَانَ بِهِ حَاجَةٌ اغْتَسَلَ؛ وَإِلاَّ تَوَضَّأَ وَخَرَجَ. [خ١١٤٦/ م٧٣٩]

**(ق) لە ئەسوەدەوە، وتی: پرسیارم لە عائیشە(خوا لێی رازی بێت) کرد: شەونوێژی پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بوو؟ وتی: سەرەتای شەو دەخەوت و کۆتایی شەو هەڵدەستا، نوێژی دەکرد و پاشان دەهاتەوە بۆ ناو جێگەی نوستنەکەی، گەر بانگوێژ بانگی بدابا رادەپەڕی، گەر پێویستییەکی هەبوایە خۆی دەشۆری، ئەگەر نە، دەستنوێژی دەگرت و دەچووە دەرەوە.**

**١٣٤٩-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵁ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، مِنْهَا الْوِتْرُ وَرَكْعَتَا الْفَجْرِ. [خ١١٤٠/ م٧٣٧]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە شەودا سیازدە رکات نوێژی دەکرد، لەوانە ویتر و دوو رکاتەکەی فەجری تێدا بوو.**

- وفي رواية لمسلم: يُوتِرُ مِنْ ذَلِكَ بِخَمْسٍ، لاَ يَجْلِسُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ فِي آخِرِهَا.

---

[1] واتە: یەك ركات نوێژەكە نوێژەكانی پێش خۆی -كە دوو دوو ئەنجام دراون- دەكات بە تاك(ویتر)، چونكە خودا تاكە و تاكی پێخۆشە، وەك لە فەرموودەدا هاتووە، ئەمە بۆ كەسێكە دوای نوێژی عیشا نوێژی ویتری نەكردبێت-و.

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: لەو ژمارەیە پێنج رکاتی ویتری ئەنجام دەدا[1]، لە شتێك لەوانەدا دانەدەنیشت لە کۆتاییەکەیدا نەبێت[2].

**١٣٥٠**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لَهُ: (**أَحَبُّ الصَّلاَةِ إِلَى اللهِ صَلاَةُ دَاوُدَ عليه السلام، وَأَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللهِ صِيَامُ دَاوُدَ، وَكَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ، وَيَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً**).

[خ١١٣١/ م١١٥٩]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: (**خۆشەویسترین نوێژ لای خودا نوێژی داود(علیه السلام) بوو، خۆشەویسترین رۆژوو لای خودا رۆژووی داود بوو، نیوەی سێ بەشی شەو دەخەوت و سێیەکی هەڵدەستا، و شەش یەکی دەخەوتەوە[3]، رۆژێ بەڕۆژوو دەبوو و رۆژێ دەیشکاند**).

**١٣٥١**– (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ لِيُصَلِّيَ، افْتَتَحَ صَلاَتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ. [م٧٦٧]

(م) لە عائیشەوە، وتی: کە لە شەودا پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەڵدەستا بۆ شەونوێژ، نوێژەکەی بە دوو رکاتی سووك دەست پێ دەکرد.

---

[1] واتە: شەش رکات شەونوێژ و پێنج رکات ویتر و پاشان دوو رکاتە نوێژە سوننەتەکەی بەیانی–و.

[2] واتە: پێنج رکاتە ویترەکەی بە یەك تەحیات ئەنجام دەدا–و.

[3] واتە: شەوی دەکرد بە شەش بەشەوە، لەو شەش بەشە سێ بەشی سەرەتای شەو دەخەوت و پاشان هەڵدەستا و دوو بەشی شەو شەونوێژی دەکرد و ئەوجا یەك بەش لە شەش بەشەکە دەخەوتەوە و دواتر هەڵدەستایەوە–و.

## ٤- دەروازەی: هاندانی پێغەمبەری خودا"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" بۆ شەونوێژ

١٣٥٢- (ق) عَنْ عَلِيّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم طَرَقَهُ وَفَاطِمَةَ بِنْتَ النَّبِيِّ عليه السلام لَيْلَةً، فَقَالَ: (**أَلاَ تُصَلِّيانِ**)؟ فَقُلْتُ: يَا رَسولَ اللهِ، أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللهِ، فَإِذَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَنَا بَعَثَنَا، فَانْصَرَفَ حِينَ قُلْتُ ذَلِكَ وَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئاً، ثُمَّ سَمِعْتُهُ وَهُوَ مُوَلٍّ، يَضْرِبُ فَخِذَهُ، وَهُوَ يَقُولُ: ﴿**وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا**﴾ [الكهف:٥٤].

[خ١١٢٧/ م٧٧٥]

**(ق) لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە: شەوێك پێغەمبەری خودا تەقەی دا لە دەرگای ئەو و فاتیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: (نوێژ ناکەن؟)، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، نەفسمان بە دەستی خودایە، گەر بخوازێت بەئاگامان بهێنێت خەبەرمان دەکاتەوە، کە ئەوەم وت ڕۆیشت و وەڵامی نەدامەوە، پاشان گوێم لێبوو کاتێ پشتی هەڵکرد بە ڕانی خۆیدا دەکێشا و دەیفەرموو: (﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا﴾** [الكهف:٥٤] **- مرۆڤ زۆرترین موجادەلەکارە).**

١٣٥٣- (خ) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ فَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، الحَمْدُ للهِ، وَسُبْحَانَ اللهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، أَوْ دَعَا، اسْتُجِيبَ لَهُ، فَإِنْ تَوَضَّأَ وَصَلَّى قُبِلَتْ صَلاَتُهُ**). [خ١١٥٤]

**(خ) لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس لە شەو بەئاگابێت و بڵێت: "لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، الحمد لله، وسبحان الله، ولا إله إلا الله، والله أكبر، ولا حول ولا قوة إلا بالله" پاشان بڵێت: "اللّه اغفر لي-خودایە لێمخۆشبە"، یان دوعا بکات، وەڵامی دەدرێتەوە، گەر دەستنوێژ بگرێت و نوێژ بکات نوێژەکەی قبووڵ دەکرێت).**

**١٣٥٤**– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ وَأَبِي هُرَيْرَةَ، قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنِ اسْتَيْقَظَ مِنَ اللَّيْلِ، وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ، فَصَلَّيَا رَكْعَتَيْنِ جَمِيعاً، كُتِبَا مِنَ الذَّاكِرِينَ اللهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ)**.

* صحيح. [د١٣٠٩، ١٤٥١/ جه١٣٣٥]

لە ئەبی سەعیدی خودری و ئەبی هورەیرەوە، وتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە شەو بەئاگابێت و ژنەکەی بەئاگابهێنێ و هەردووکیان دوو رکات نوێژ بکەن، لە ریزی "الذاكرين اللّه كثيرا والذاكرات" دەنوسرێن)**.

**١٣٥٥**– عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَا مِنِ امْرِئٍ تَكُونُ لَهُ صَلاَةٌ بِلَيْلٍ، يَغْلِبُهُ عَلَيْهَا نَوْمٌ؛ إِلاَّ كُتِبَ لَهُ أَجْرُ صَلاَتِهِ، وَكَانَ نَوْمُهُ عَلَيْهِ صَدَقَةً )**.

* صحيح. [د١٣١٤/ ن١٧٨٣ . ١٧٨٥]

لە عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس نوێژی لە شەودا هەبوو و خەو بەسەریدا زاڵ بوو پاداشتەکەی بۆ دەنوسرێت و خەوەکەی لەسەر ئەو دەبێتە صەدەقە)**.

## ٥- دەروازەی: گەر هەستا بۆ تەهەجود چی دەڵێ؟

**١٣٥٦**– (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا تَهَجَّدَ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: **(اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الحَمْدُ، أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الحَمْدُ، أَنْتَ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ. أَنْتَ الحَقُّ، وَوَعْدُكَ الحَقُّ، وَقَوْلُكَ الحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ الحَقُّ، وَالجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ. اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلهِي، لاَ إِلهَ إِلا أَنْتَ)**.

[خ٧٤٩٩ (١١٢٠)/ م٧٦٩]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: گەر پێغەمبەر(ﷺ) هەستایە بۆ تەهەجود دەیفەرموو: **(أللهم لك الحمد أنت نور السموات والأرض، ولك الحمد أنت قيِّم السماوات**

**والأرض، ولك الحمد أنت رب السماوات والأرض ومن فيهن، أنت الحق، ووعدك الحق، وقولك الحق، ولقاؤك الحق، والجنة الحق، والنار حق، والنبيون حق، والساعة حق، أللهم لك أسلمتُ، وبك آمنتُ، وعليك توكلت، وإليك أنبت، وبك خاصمت، وإليك حاكمت، فاغفر لي ما قدمت وما أخرت، وما أسررت وما أعلنت، أنت إلهي لا إله إلا أنت)**.

## ٦- دەروازەی: ئەوەی ناپەسەندە لە زیادەڕەوی لە عیبادەت

**١٣٥٧-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَإِذَا حَبْلٌ مَمْدُودٌ بَيْنَ السَّارِيَتَيْنِ، فَقَالَ: (**مَا هـذَا الْحَبْلُ**)؟ قَالُوا: هَذَا حَبْلٌ لِزَيْنَبَ، فَإِذَا فَتَرَتْ تَعَلَّقَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ، حُلُّوهُ، لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ، فَإِذَا فَتَرَ فَلْيَقْعُدْ**).

[خ١١٥٠/ م٧٨٤]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) چووە ژوورەوە بینی پەتێکی درێژکراو لە نێوان دوو کۆڵەکەیە، فەرمووی: **(ئەم پەتە چییە؟)**، وتیان: ئەمە پەتی زەینەبە، گەر خاوبوونەوە ڕووی لێکرد دەستی پێوە دەگرێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(نەخێر، بیکەنەوە، با یەکێك لە ئێوە بە توانای خۆی نوێژ بکات، گەر خاوبوونەوە ڕووی لێکرد با دابنیشێت)**.

**١٣٥٨-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا امْرَأَةٌ، قَالَ: (**مَنْ هَذِهِ**)؟ قَالَتْ: فُلاَنَةُ، تَذْكُرُ مِنْ صَلاَتِهَا، قَالَ: (**مَهْ! عَلَيْكُمْ بِمَا تُطِيقُونَ، فَوَاللهِ لاَ يَمَلُّ اللهُ حَتَّى تَمَلُّوا**). وَكَانَ أَحَبُّ الدِّينِ إِلَيْهِ مَا دَاوَمَ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ.　[خ٤٣/ م٧٨٥]

(ق) لە عائیشەوە: پێغەمبەر(ﷺ) چووە ژوورەوە بۆ لای و ئافرەتێکی لە لا بوو، فەرمووی: **(ئەمە کێیە؟)**، وتی: فلانە ئافرەتە، باسی نوێژەکانی ئەو ئافرەتەی کرد، پێغەمبەر فەرمووی: **(دەستهەڵگرە، ئەوەندەی دەتوانن لەسەرتانە، سوێند بە خودا،**

خودا شەکەت نابێت تا ئێوە شەکەت دەبن[1])، باشترین ئایین لای پێغەمبەر ئەوە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بێت.

## ٧- دەروازەی: کۆشانی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" لە عیبادەتدا

١٣٥٩- (ق) عَنِ المغِيْرَة ﷺ قَالَ: إِنْ كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لَيَقُومُ. أَوْ لَيُصَلِّي. حَتَّى تَرِمَ قَدَمَاهُ. أَوْ سَاقَاهُ. فَيُقَالُ لَهُ، فَيَقُولُ: (أَفَلاَ أَكُونُ عَبْداً شَكُوراً).

[خ١١٣٠/ م٢٨١٩]

(ق) لە موغیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەڵدەستا- یان نوێژی ئەنجام دەدا- تا دوو پێی-یان دوو لاقی- دەئاوسان، پێی دەوترا[2]، دەیفەرموو: (ئەی نابێ بەندەیەکی شوکرکار بم).

١٣٦٠- (ق) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُصَلِّي إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، كَانَتْ تِلْكَ صَلاَتَهُ . تَعْنِي: بِاللَّيْلِ . فَيَسْجُدُ السَّجْدَةَ مِنْ ذَلِكَ قَدْرَ مَا يَقْرَأُ أَحَدُكُمْ خَمْسِينَ آيَةً، قَبْلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، وَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الْفَجْرِ، ثُمَّ يَضْطَجِعُ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ، حَتَّى يَأْتِيَهُ المؤَذِّنُ للصَّلاَةِ. [خ٩٩٤ (٦٢٦)/ م٧٣٦]

(ق) لە عائیشەوە: پێغەمبەری خودا یازدە رکات نوێژی دەکرد، ئەوە نوێژی بوو-مەبەستی: لە شەودا- لەوەدا سوژدەی دەبرد بڕی ئەوەی یەکێك لە ئێوە پەنجا ئایەت دەخوێنێت، بەرلەوەی سەر بەرزبکاتەوە، دوو رکات نوێژی بەر لە نوێژی

[1] واتە: کە بە هۆی زیادەڕەوییەوە شەکەتی رووی لێکردن خوداش کۆمەکی خۆی بۆ کارە خێرەکە لە ئێوە دەگرێتەوە، گەر عیبادەتەکە بەو جۆرە نەبێت پێغەمبەر ئەنجامیداوە لای خوداوە کۆمەکی ناکرێت-و.

[2] واتە: پێی دەوترا: خودا لە گوناهی پێشین و پاشینی تۆ خۆشبووە، بۆچی ئەوەندە خۆت زەحمەت دەدەی؟-و.

بەیانی ئەنجام دەدا، پاشان لەسەر لای راست پاڵیدەدایەوە تا بانگوێژ دەهات بۆ لای بۆ ئەنجامدانی نوێژ[1].

**١٣٦١-** (م) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَافْتَتَحَ الْبَقَرَةَ، فَقُلْتُ: يَرْكَعُ عِنْدَ الْمِائَةِ. ثُمَّ مَضَى، فَقُلْتُ: يُصَلِّي بِهَا فِي رَكْعَةٍ. فَمَضَى، فَقُلْتُ: يَرْكَعُ بِهَا. ثُمَّ افْتَتَحَ النِّسَاءَ فَقَرَأَهَا. ثُمَّ افْتَتَحَ آلَ عِمْرَانَ فَقَرَأَهَا، يَقْرَأُ مُتَرَسِّلاً، إِذَا مَرَّ بِآيَةٍ فِيهَا تَسْبِيحٌ سَبَّحَ، وَإِذَا مَرَّ بِسُؤَالٍ سَأَلَ، وَإِذَا مَرَّ بِتَعَوُّذٍ تَعَوَّذَ. ثُمَّ رَكَعَ، فَجَعَلَ يَقُولُ: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ**)، فَكَانَ رُكُوعُهُ نَحْواً مِنْ قِيَامِهِ. ثُمَّ قَالَ: (**سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ**) ثُمَّ قَامَ طَوِيلاً، قَرِيباً مِمَّا رَكَعَ. ثُمَّ سَجَدَ فَقَالَ: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى**)، فَكَانَ سُجُودُهُ قَرِيباً مِنْ قِيَامِهِ. [م٧٧٢]

(م) لە حوزەیفەوە، وتی: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژم کرد، سورەتی "البقرة"ی کردەوە، وتم: لە سەددا[2] رکوع دەبات، پاشان رۆیشت[3]، وتم: لە رکاتێکدا سورەتەکە دەخوێنێ، بەڵام رۆیشت، وتم: رکوعی پێ دەبات، پاشان سورەتی "النساء"ی کردەوە و خوێندی، پاشان سورەتی "آل عمران"ی کردەوە و خوێندی، بە هێواشی دەیخوێند، گەر بە پاڵ ئایەتی تەسبیحدا تێپەڕیبا تەسبیحی دەکرد، گەر بە پاڵ داواکردندا تێپەڕیبا داوای دەکرد، گەر بە پاڵ پەناگرتندا تێپەڕیبا پەنای دەگرت، پاشان رکووعی برد، لە رکووعدا دەیفەرموو: (**سبحان ربي العظيم**)، رکووعەکەی نزیك بوو لە وەستانەکەی، پاشان فەرمووی: (**سمع الله لمن حمده**)، پاشان زۆر بە پێوە وەستا، نزیك بەوەی رکووعی برد، پاشان سوژدەی برد، دەیفەرموو: (**سبحان ربي الأعلى**)، سوژدەکەی نزیك بوو لە وەستانەکەی بە پێوە.

---

[1] واتە: بانگوێژ دەهات داوای مۆڵەتی بانگدانی لێ دەکرد بۆ نوێژی بەیانی –و.

[2] واتە: لە ئایەتی سەدەمدا–و.

[3] واتە: بەردەوام بوو لە خوێندنی سورەتەکە–و.

## ٨- دەروازەی: ئەو کەسەی دەخەوێت تا ڕۆژ دەبێتەوە

**١٣٦٢-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ ﷺ قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلٌ، فَقِيلَ: مَا زَالَ نَائِماً حَتَّى أَصْبَحَ، مَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ، فَقَالَ: (**بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنِهِ**).
[خ١١٤٤/ م٧٧٤]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لای پێغەمبەر(ﷺ) باسی پیاوێك کرا، وترا: بەردەوام خەوتووە تا ڕۆژ دەبێتەوە، هەڵناسێت بۆ نوێژ، فەرمووی: (شەیتان میزی کردووەتە دوو گوێی).**

**١٣٦٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليهِ وسلّم قَالَ: (**يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ** عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلاَثَ عُقَدٍ، يَضْرِبُ كُلَّ عُقْدَةٍ: عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَأَصْبَحَ نَشِيطاً طَيِّبَ النَّفْسِ؛ وَإِلاَّ أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلاَنَ). [خ١١٤٢/ م٧٧٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(شەیتان سێ گرێ دەدات لە پشتەملی یەکێك لە ئێوە کاتێ ئەو بخەوێ، هەر گرێیەك دەدات: شەوێکی درێژت لەبەردەمە جاری ڕاکشێ[1]، گەر بەئاگاهات و یادی خودای کرد گرێیەکیان دەکرێتەوە، گەر دەستنوێژی گرت گرێیەکی تر دەکرێتەوە، گەر نوێژی کرد گرێکەی تر دەکرێتەوە، بۆیە ڕۆژی لێ دەبێتەوە چالاك و نەفس خۆش و پاك، ئەگەر نە، ڕۆژی لێ دەبێتەوە نەفس پیس و تەمبەڵ).**

## ٩- دەروازەی ویتر

**١٣٦٤-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُلَّ اللَّيْلِ أَوْتَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ. [خ٩٩٦/ م٧٤٥]

---

[1] واتە: هەر گرێیەك گرێ دەدات دەڵێت: شەوێکی درێژت لەبەردەمە جاری ڕاکشێ-و.

(ق) لە عائیشەوە، وتی: هەموو شەوێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ویتری کردووە، ویترەکەی تا سەحەر درێژ دەبوویەوە.

▪ وفي رواية لمسلم: قَالَتْ: مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، مِنْ أَوَّلِ اللَّيْلِ وَأَوْسَطِهِ وَآخِرِهِ، فَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ.

**لە ریوایەتێکی موسلیمدا: عائیشە وتی: هەموو شەوێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ویتری کردووە، لە سەرەتای شەو و ناوەڕاستی شەو و کۆتایی شەو، ویترەکەی درێژدەبوویەوە بۆ سەحەر.**

**١٣٦٥**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**اجْعَلُوا آخِرَ صَلاَتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْرًا**). [خ٩٩٨/ م٧٥١]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: (دوایین نوێژتان لە شەو بکەنە ویتر).**

**١٣٦٦**– (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ خَافَ أَنْ لاَ يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ أَوَّلَهُ، وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اللَّيْلِ؛ فَإِنَّ صَلاَةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ، وَذَلِكَ أَفْضَلُ**). [م٧٥٥]

(م) لە جابرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس ترسا لە کۆتایی شەو هەڵنەستێ با لە سەرەتای شەوەوە ویتر بکات، هەر کەس ویستی کۆتایی شەو هەڵبستێ با کۆتاییەکەی ویتر بکات، چونکە نوێژی کۆتایی شەو ""مشهودة[1]""، ئەوەش باشتر و چاکترە).**

**١٣٦٧**– عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: الْوِتْرُ لَيْسَ بِحَتْمٍ كَهَيْئَةِ الصَّلاَةِ الْمَكْتُوبَةِ، وَلَكِنْ سُنَّةٌ سَنَّهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [ت٤٥٣/ ن١٦٧٥/ جه١١٦٩/ مي١٦٢٠]

* صحيح.

---

(١) واتە: فریشتە لەسەری ئامادە دەبێت-و.

لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ویتر حەتمی نییە، وەك شێوەی نوێژە فەرزەکان[1]، بەڵکو سوننەتێك بوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) رەنگرێژی بۆ کرد.

**١٣٦٨**– عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (الْوِتْرُ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِخَمْسٍ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِثَلَاثٍ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِوَاحِدَةٍ فَلْيَفْعَلْ). [د١٤٢٢/ ن١٧٠٩٠/ جه١١٩٠/ مي١٦٢٣]

* صحيح.

لە ئەبی ئەیوبی ئەنصارییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ویتر حەقە لەسەر هەموو موسڵمانێك، هەر کەس ویستی بە پێنج ڕکات ویتر بکات با ئەنجامی بدات، هەر کەس ویستی بە سیان ویتر بکات با ئەنجامی بدات، هەر کەس ویستی بە یەك رکات ویتر بکات با ئەنجامی بدات).**

## ١٠- دەروازەی: قنووت

**١٣٦٩**– (ق) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لأُقَرِّبَنَّ صَلاَةَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم. فَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ يَقْنُتُ فِي الرَّكْعَةِ الأُخْرَى مِنْ صَلاَةِ الظُّهْرِ، وَصَلاَةِ الْعِشَاءِ، وَصَلاَةِ الصُّبْحِ، بَعْدَمَا يَقُولُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَيَدْعُو لِلْمُؤْمِنِينَ وَيَلْعَنُ الْكُفَّارَ. [خ٧٩٧/ م٦٧٦]

(ق) لە ئەبی سەلەمەوە، لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: لە نوێژی پێغەمبەر(ﷺ) نزیك دەبمەوە، ئەبو هورەیرە(خوا لێی رازی بێت) لە رکاتی کۆتایی نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عیشا، و نوێژی بەیانی، قنووتی دەخوێند، لەدوای ئەوەی دەیوت: "سمع الله لمن حمده"، دوعای بۆ باوەڕداران دەکرد و نەفرەتی لە بێباوەڕان دەکرد.

---

[1] واتە: نوێژی ویتر سوننەتە و فەرز نییە –و.

**١٣٧٠**- عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي: يَا أَبَتِ، إِنَّكَ قَدْ صَلَّيْتَ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ، وَعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ هَاهُنَا بِالْكُوفَةِ نَحْواً مِنْ خَمْسِ سِنِينَ، أَكَانُوا يَقْنُتُونَ؟ قَالَ: أَيْ بُنَيَّ، مُحْدَثٌ. [ت٤٠٢/ ن١٠٧٩/ جه١٢٤١]

* صحيح.

**لە ئەبی مالیکی ئەشجەعییەوە، وتی: وتم: بە باوکم: ئەی باوکی خۆم، تۆ لەدوای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی کوڕی ئەبی تالب ئا لەم جێگە لە کوفە-بۆ ماوەی پێنج ساڵ- نوێژت کردووە، ئایا قنووتیان دەکرد؟ وتی: کوڕی خۆم، داهێنراوە.**

**١٣٧١**- عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ لا يَقْنُتُ، إِلاَّ إِذا دَعَا لِقَوْمٍ أَوْ دَعَا عَلى قَوْمٍ. [مه٦٢٠]

* إسناده صحيح.

**لە ئەنەسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) قنووتی نەدەکرد، مەگەر بۆ کۆمەڵێك دوعای بکردبایە، یان لە کۆمەڵێك دوعای بکردبایە.**

## ١١- دەروازەی: قنووت لە رەمەزاندا

**١٣٧٢**- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِهِ: أَنَّ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ أَمَّهُمْ . يَعْنِي: فِي رَمَضَانَ . وَكَانَ يَقْنُتُ فِي النِّصْفِ الْآخِرِ مِنْ رَمَضَانَ. [د١٤٢٨]

* ضعيف. وقال شعيب: صحيح بشواهده.

**لە محەمەدی کوڕی سیرینەوە، لە یەکێك لە هاوەڵانییەوە: ئوبەی کوڕی کەعب ئیمامەتی بۆ کردن-واتە: لە رەمەزان- لە نیوەی کۆتایی رەمەزان قنووتی دەخوێند.**

## ١٢- دەروازەی: دوعای قنووت لە ویتردا

١٣٧٣- عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ رضي الله عنهما قَالَ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الْوِتْرِ فِي الْقُنُوتِ: (اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، إِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ). [د١٤٢٥/ ت٤٦٤/ ن١٧٤٤/ جه١١٧٨/ مي١٦٣٢]

* صحيح.

لە حەسەنی کوڕی عەلییەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) چەند کەلیمەیەکی فێرکردم لە قنووتی ویتردا بیانخوێنم: **(أللهم اهدني فيمن هديت، وعافني فيمن عافيت، وتولني فيمن توليت، وبارك لي فيما أعطيت، وقني شر ما قضيت، إنك تقضي ولا يقضى عليك، وإنه لا يذل من واليت، ولا يعز من عاديت، تباركت ربنا وتعاليت).**

١٣٧٤- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَقُولُ فِي آخِرِ وِتْرِهِ: (اللَّهُمَّ! إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سُخْطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ). [د١٤٢٧/ ت٣٥٦٦/ ن١٧٤٦/ جه١١٧٩]

* صحيح.

لە عەلی کوڕی ئەبی تالبەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە کۆتایی ویترەکەیدا دەیفەرموو: **(أللهم إني أعوذ برضاك من سخطك، وبمعافاتك من عقوبتك، وأعوذ بك منك، لا أحصي ثناء عليك، أنت كما أثنيت على نفسك).**

## ١٣- قەزاکردنەوەی ویتر

١٣٧٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ نَامَ عَنْ وِتْرِهِ، أَوْ نَسِيَهُ؛ فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهُ).

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر كەس لە ویترەكەی خەوت یان لەبیری چوو، با كاتێك بیری دەكەوێتەوە ئەنجامی بدات).**

■ زاد الترمذي: (وَإِذَا اسْتَيْقَظَ). [د١٤٣١/ ت٤٦٥/ جه١١٨٨]

**ترمزی ئەمەی زیاد كردووە: (گەر بەئاگا هات).**

* صحيح.

## ١٤- دەروازەی: شەونوێژ بە ئایەتێك دووبارەی بكاتەوە

**١٣٧٦**– عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَامَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِآيَةٍ حَتَّى أَصْبَحَ يُرَدِّدُهَا، وَالْآيَةُ: ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ [المائدة: ١١٨].

* حسن. [ن١٠٠٩/ جه١٣٥٠]

**لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە ئایەتێك شەونوێژی كرد تا ڕۆژی لێبوویەوە دووبارەی دەكردەوە، ئایەتەكە: ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ [المائدة: ١١٨].**

**١٣٧٧**– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَامَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِآيَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ لَيْلَةً. [ت٤٤٨]

* صحيح الإسناد.

**لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەر شەوێك بە ئایەتێك لە قورئان شەونوێژی كرد.**

## ١٥- دەروازەی: خوێندن لە ویتردا

**١٣٧٨**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَقْرَأُ فِي الْوِتْرِ بـ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾[الأعلى: ١]، وَ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ [الكافرون: ١]، وَ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾[الإخلاص: ١] فِي رَكْعَةٍ رَكْعَةٍ. [ت٤٦٢/ ن١٧٠١/ جه١١٧٢/ مي١٦٢٧]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە ویتردا: (﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾[الأعلى: ١] و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾[الكافرون: ١] و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾[الإخلاص: ١])ی دەخوێند، واتە: لە رکات رکاتدا.

**١٣٧٩**– عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُوتِرُ بِـ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾[الأعلى: ١]، وَ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾[الكافرون: ١]، وَ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾[الإخلاص: ١]، وَكَانَ يَقُولُ إِذَا سَلَّمَ: (**سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ**) ثَلاَثاً، وَيَرْفَعُ صَوْتَهُ بِالثَّالِثَةِ. [ن١٧٣٠]

* صحيح.

لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبزاوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە: (﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾[الأعلى: ١] و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾[الكافرون: ١] و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾[الإخلاص: ١] ویتری دەکرد، کاتێك سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو: (**سبحان الملك القدوس**) سێ جار، لە سێیەمدا دەنگی هەڵدەبڕی.

## ١٦- دەروازەی: وەستان لەپای ئایەتەکانی رەحمەت و ئەوانیتر

**١٣٨٠**– عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قُمْتُ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَبَدَأَ فَاسْتَاكَ وَتَوَضَّأَ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى، فَبَدَأَ فَاسْتَفْتَحَ مِنَ الْبَقَرَةِ، لاَ يَمُرُّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ إِلاَّ وَقَفَ وَسَأَلَ، وَلاَ يَمُرُّ بِآيَةِ عَذَابٍ إِلاَّ وَقَفَ يَتَعَوَّذُ، ثُمَّ رَكَعَ، فَمَكَثَ رَاكِعاً بِقَدْرِ قِيَامِهِ، يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: (**سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ**)، ثُمَّ سَجَدَ بِقَدْرِ رُكُوعِهِ، يَقُولُ فِي سُجُودِهِ: (**سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ**)، ثُمَّ قَرَأَ آلَ عِمْرَانَ، ثُمَّ سُورَةً، ثُمَّ سُورَةً فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ.

* صحيح. [د٨٧٣/ ن١٠٤٨]

لە عەوفی کوڕی مالیکەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) هەستام بۆ شەونوێژ، سیواکی کرد و دەستنوێژی هەڵگرت، پاشان هەستا و نوێژی کرد، دەستی پێکرد و

(البقرة)ی کردەوە، بە پاڵ هەر ئایەتێکی رەحمەتدا گوزەری بکردبایە دەوەستا و داوای دەکرد، بە پاڵ هەر ئایەتێکی سزادا گوزەری بکردبایە دەوەستا و پەنای دەگرت، پاشان رکووعی برد و بە بڕی وەستانەکەی مایەوە، لە رکوعەکەیدا دەیفەرموو: **(سبحان ذي الجبروت والملكوت والكبرياء والعظمة)**، پاشان بە بڕی رکووعەکەی سوژدەی برد، لە سوژدەکەیدا دەیفەرموو: **(سبحان ذي الجبروت والملكوت والكبرياء والعظمة)**، پاشان (آل عمران)ی خوێند، پاشان سورەتێکی تر و پاشان سورەتێکی تر، هەمان شێوەی ئەنجامدا

**١٣٨١**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذا قَرَأَ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾[الأعلى: ١] قَالَ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى). [هق٢/٣١٠]

[وانظر: **١٣٦١**].

لە ئیبن عەباسەوە: گەر پێغەمبەر(ﷺ): (﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾[الأعلى: ١])ی بخوێندبایە، دەیفەرموو: **(سبحان ربي الأعلى)**.

# بەشی یەکەم

## ئیمامەت

### ١- دەروازەی: لەپێشتر بە ئیمامەت

**١٣٨٢-** (ق) عَنْ مالِكِ بْنِ الحُوَيْرِثِ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِي، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً، وَكَانَ رَحِيماً رَفِيقاً، فَلَمَّا رَأَى شَوْقَنَا إِلَى أَهَالِينَا، قَالَ: (**ارْجِعُوا فَكُونُوا فِيهِمْ، وَعَلِّمُوهُمْ، وَصَلُّوا، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ؛ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ، وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ**).

[خ٦٢٨/ م٦٧٤]

**(ق) لە مالیکی کوڕی حوەیریسەوە: لەگەڵ چەند کەسێك لە هۆزەکەم هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، بیست شەو لای ماینەوە، ئەو کەسێکی خاوەن رەحم و بەزەیی و نەرم و نیان بوو، کاتێك تامەزرۆبوونی ئێمەی بۆ لای خانەوادەکانمان بینی، فەرمووی: (بگەڕێنەوە و لە ناویاندا بن و فێریان بکەن و نوێژ بکەن، گەر نوێژ ئامادە بوو با یەکێکتان بانگتان بۆ بدات و گەورەترینتان ئیمامەتتان بۆ بکات).**

**١٣٨٣-** (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ المهَاجِرُونَ الأَوَّلُونَ الْعُصْبَةَ ـ مَوْضِعٌ بِقُبَاءَ ـ قَبْلَ مَقْدَمِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، كَانَ يَؤُمُّهُمْ سَالِمٌ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، وَكَانَ أَكْثَرَهُمْ قُرْآناً.

[خ٦٩٢]

**(خ) لە ئیبن عومەرەوە، وتی: کاتێك کۆچکەرە پێشەنگەکان هاتن بۆ "العُصْبة"- شوێنێکە لە قوبا- بەر لە هاتنی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، سالم مەولای ئەبی حوزەیفە ئیمامەتی بۆ دەکردن، ئەو لە هەموویان زۆرتر قورئانی لەبەربوو.**

١٣٨٤- (م) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللهِ، فَإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ سِلْماً، وَلاَ يَؤُمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِي سُلْطَانِهِ، وَلاَ يَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ عَلَى تَكْرِمَتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ**). [م٦٧٣]

(م) لە ئەبی مەسعوودی ئەنصارییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خوێنەترینی کتێبەکەی خودا ئیمامەت بۆ خەڵك دەکات، گەر لە خوێندندا یەکسان بوون زاناترینیان بە سوننەت، گەر لە سوننەتدا یەکسان بوون پێشەنگترینیان لە کۆچ، گەر لە کۆچدا یەکسان بوون پێشەنگترینیان لە ئیسلامدا، پیاو لە ناوچەی دەسەڵاتی پیاودا ئیمامەت ناکات، تەنها بە مۆڵەت لە ماڵەکەیدا و لەسەر جێگەی دانیشتنەکەی دادەنیشێت).**

## ٢- دەروازەی: ئیمام نوێژ سووك و ئاسان دەکات و تێر و تەواو ئەنجامی دەدات

١٣٨٥- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: مَا صَلَّيْتُ وَرَاءَ إِمَامٍ قَطُّ أَخَفَّ صَلاَةً وَلاَ أَتَمَّ مِنَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وإِنْ كَانَ لَيَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَيُخَفِّفُ، مَخَافَةَ أَنْ تُفْتَنَ أُمُّهُ.
[خ٧٠٨/ م٤٦٩، ٤٧٠]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: هەرگیز لە پشت ئیمامێکەوە نوێژم نەکردووە نوێژەکەی لە پێغەمبەر(ﷺ) سووکتر و ئاسانتر و تێر و تەواوتر بوو بێت، گوێی لە گریانی منداڵ دەبوو و نوێژەکەی سووك و ئاسان دەکرد، لە ترسی ئەوەی نەبادا دایکەکەی تووشی فیتنە بێت.**

١٣٨٦- (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسولَ اللهِ، إِنِّي وَاللهِ لأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلاَةِ الغَدَاةِ مِنْ أَجْلِ فُلاَنٍ، مِمَّا يُطِيلُ بِنَا فِيهَا، قَالَ: فَمَا

رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَطُّ أَشَدَّ غَضَباً فِي مَوْعِظَةٍ مِنْهُ يَوْمَئِذٍ، ثُمَّ قَالَ: (يا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيُوجِزْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الْكَبِيرَ وَالضَّعِيفَ وَذَا الْحَاجَةِ).
[خ٧١٥٩ (٩٠)/ م٤٦٦]

(ق) لە ئەبی مەسعوودی ئەنصارییەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، سوێند بە خودا، من لە نوێژی بەیانی دوادەکەوم لەبەر فلان، لەوەی بۆ ئێمە درێژی دەکاتەوە لە نوێژەکەدا، وتی: هەرگیز پێغەمبەرم(ﷺ) نەبینیوە لە وەعزدا وەك ئەو ڕۆژە تووڕەبوونی زۆر بێت، پاشان فەرمووی: **(ئەی خەڵکینە، لە ئێوە کەسانێك هەن خەڵك دەتۆرێنن، هەرکام لە ئێوە نوێژی بە خەڵك کرد با کورت بێت، چونکە بەتەمەن و لاواز و خاوەن پێویستیان تێدایە)**.

١٣٨٧- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِلنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ مِنْهُمُ الضَّعِيفَ وَالسَّقِيمَ وَالكَبِيرَ، وَإِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَا شَاءَ).
[خ٧٠٣/ م٤٦٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە نوێژی بۆ خەڵك کرد با سووك و ئاسان ئەنجامی بدات، چونکە لاواز و نەخۆش و بەتەمەنیان تێدایە، گەر یەکێك لە ئێوە بۆ خۆی نوێژی کرد چەند دەخوازێت درێژی بکاتەوە)**.

## ٣- دەروازەی: بە ئیمام دانراوە تاکو چاوی لێبکەن و شوێنی بکەون

١٣٨٨-(ق) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ المؤْمِنِينَ أَنَّهَا قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي بَيْتِهِ وَهُوَ شَاكٍ، فَصَلَّى جَالِساً، وَصَلَّى وَرَاءَهُ قَوْمٌ قِيَاماً، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ: (أَنِ اجْلِسُوا). فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: (إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا صَلَّى جَالِساً فَصَلُّوا جُلُوساً).
[خ٦٨٨/ م٤١٢]

(ق) لە عائیشەوە دایکی ئیمانداران، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ماڵەکەی خۆی نوێژی کرد، ئەو نەخۆش بوو، بۆیە بە دانیشتنانەوە نوێژەکەی کرد، کۆمەڵێك لەدواوەی بە پێوە نوێژیان کرد، پێغەمبەر ئاماژەی بۆ کردن: **(دانیشن)**، کاتێك سەلامیدایەوە فەرمووی: **(بە ئیمام دانراوە تاکو چاوی لێبکەن و شوێنی بکەون، گەر رکووعی برد رکووع ببەن، گەر بەرزبوویەوە بەرز ببنەوە، گەر بە دانیشتنانەوە نوێژی کرد بە دانیشتنانەوە نوێژ بکەن)**[1].

**١٣٨٩**– (ق) عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا قَالَ: **(سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)** ، لَمْ يَحْنِ أَحَدٌ مِنَّا ظَهْرَهُ، حَتَّى يَقَعَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم سَاجِداً، ثُمَّ نَقَعُ سُجُوداً بَعْدَهُ. [خ٦٩٠/ م٤٧٤]

(ق) لە بەرائەوە، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیفەرموویا: **(سمع الله لمن حمده)، هیچ کەس لە ئێمە پشتی نەدەچەماند تا پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو بۆ سوژدە و پاشان ئێمەش بەدوایدا دەچووینە سوژدە.**

**١٣٩٠**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُعَلِّمُنَا، يَقُولُ: **(لاَ تُبَادِرُوا الإِمَامَ، إِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَالَ: وَلاَ الضَّالِّيْنَ، فَقُولُوا: آمِينَ، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)**. [م٤١٥]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فێری دەکردین و دەیفەرموو: **(دەستپێشخەری مەکەن لە ئیمام[2]، گەر "الله أکبر"ی کرد "الله أکبر" بکەن، گەر وتی: "ولا الضالّین" بڵێن: "آمین"، گەر رکووعی برد ئێوەش رکووع ببەن، گەر وتی: "سمع الله لمن حمده" بڵێن: "أللهم ربنا لك الحمد")**.

---

[1] لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە: ئەبو عەبدولا وتی: حومەیدی وتی: ئەم فەرموودە نەسخکراوەتەوە، چونکە دوایین نوێژێك پێغەمبە(ﷺ)ئەنجامیدا ئەو دانیشتبوو و خەڵکەکە بە پێوە بوون. [خ٥٦٥٨]

[2] واتە: پێش ئیمام مەکەون –و.

## ٤- دەروازەی: نەهی لە پێشکەوتنی ئیمام

**١٣٩١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَما يَخْشَى أَحَدُكُمْ . أَوْ: لاَ يَخْشَى أَحَدُكُمْ . إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ، أَنْ يَجْعَلَ اللهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ، أَوْ يَجْعَلَ اللهُ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ**). [خ٦٩١/ م٤٢٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: (**ئایا یەکێك لە ئێوە دەترسێت-یان یەکێك لە ئێوە ناترسێت-گەر بەر لە ئیمام سەر بەرز بکاتەوە خودا سەری بگۆڕێت بە سەری گوێدرێژ، یان خودا شێوەی بگۆڕێت بە شێوەی گوێدرێژ**).

**١٣٩٢-** (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ذَاتَ يَوْمٍ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: (**أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي إِمَامُكُمْ فَلاَ تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ وَلاَ بِالسُّجُودِ، وَلاَ بِالْقِيَامِ وَلاَ بِالاِنْصِرَافِ، فَإِنِّي أَرَاكُمْ أَمَامِي وَمِنْ خَلْفِي**). ثُمَّ قَالَ: (**وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ رَأَيْتُمْ مَا رَأَيْتُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً**) ، قَالُوا: وَمَا رَأَيْتَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**رَأَيْتُ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ**). [م٤٢٦]

(م) لە ئەنەسەوە، وتی: ڕۆژێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی پێکردین، کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد ڕووی لێکردین و فەرمووی: (**خەڵکینە، من ئیمامی ئێوەم نە بە ڕکووع و نە بە سوژدە و نە بە ڕاستبوونەوە و نە بە سەلامدانەوە پێشم مەکەون، من لە پێشەوەم و لە دواوە ئێوە دەبینی**)، پاشان فەرمووی: (**سوێند بەو کەسەی نەفسی محەمەدی بە دەستە گەر ئەوەی من دەیبینم ئێوە ببینن کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان**)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چیت بینی؟ فەرمووی: (**بەهەشت و ئاگرم بینی**).

## ٥- دەروازەی: گەر ئیمام دواکەوت

**١٣٩٣-** (م) عَنِ الْمُغِيرَةِ بنِ شُعْبَةَ: أَنَّهُ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تَبُوكَ، قَالَ الْمُغِيرَةُ: فَتَبَرَّزَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قِبَلَ الغَائِطِ، فَحَمَلْتُ مَعَهُ إِدَاوَةً قَبْلَ صَلاَةِ

الْفَجْرِ، فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَيَّ أَخَذْتُ أُهْرِيقُ عَلَى يَدَيْهِ مِنَ الإِدَاوَةِ، وَغَسَلَ يَدَيْهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ، ثُمَّ ذَهَبَ يُخْرِجُ جُبَّتَهُ عَنْ ذِرَاعَيْهِ فَضَاقَ كُمَّا جُبَّتِهِ، فَأَدْخَلَ يَدَيْهِ فِي الْجُبَّةِ، حَتَّى أَخْرَجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْ أَسْفَلِ الْجُبَّةِ، وَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ عَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ.

قَالَ الْمُغِيرَةُ: فَأَقْبَلْتُ مَعَهُ حَتَّى نَجِدُ النَّاسَ قَدْ قَدَّمُوا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، فَصَلَّى لَهُمْ، فَأَدْرَكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ، فَصَلَّى مَعَ النَّاسِ الرَّكْعَةَ الآخِرَةَ. فَلَمَّا سَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ قَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُتِمُّ صَلاَتَهُ، فَأَفْزَعَ ذَلِكَ الْمُسْلِمِينَ، فَأَكْثَرُوا التَّسْبِيحَ. فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم صَلاَتَهُ أَقْبَلَ عَلَيْهِمْ ثُمَّ قَالَ: (أَحْسَنْتُمْ). أَوْ قَالَ: (قَدْ أَصَبْتُمْ). يَغْبِطُهُمْ أَنْ صَلَّوُا الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا. [م٢٧٤م/ الصلاة ١٠٥]

**(م) لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە، ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) غەزای تەبووکی کرد، موغیرە وتی: پێغەمبەری خودا بۆ چوونە سەر ئاو دوورکەوتەوە و ڕووی لە پەناگەیەك کرد، جەوەندەیەکی بچووك ئاوم لەگەڵی هەڵگرت بەر لە نوێژی بەیانی، کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەڕایەوە بۆ لام لە جەوەندە ئاوەکەم کرد بە دوو دەستیدا، دوو دەستی سێ جار شۆری، پاشان ڕوخساری شۆری، پاشان دوو قۆڵی لە جبەکەی دەردەهێنا، دوو قۆڵی جبەکەی تەسك بوون، بۆیە دوو دەستی خستە ناو جبەکە تا دوو قۆڵی لە ژێر جبەکەوە دەرکرد، دوو قۆڵی شۆری تا ئەنیشك، پاشان لەسەر دوو خوففەکەی مەسحی کرد، پاشان هاتەوە، منیش لەگەڵی هاتمەوە تا خەڵکمان بینی عبدالرحمانی کوڕی عەوفیان پێشخستبوو و نوێژی بۆ کردبوون، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە یەکێك لە ڕکاتەکاندا گەیشت، ڕکاتی دوایینی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا، کە عبدالرحمانی کوڕی عەوف سەلامیدایەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستا بۆ تەواوکردنی نوێژەکەی، ئەوە موسڵمانانی تووشی ترس کرد، بۆیە تەسبیحی زۆریان کرد، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) نوێژەکەی تەواو کرد ڕووی لێکردن و پاشان فەرمووی: (چاکتان کرد)، یان فەرمووی: (ڕاست و دروستتان ئەنجامدا)، خۆزگەی پێ دەخواستن نوێژەکەیان لە کاتی خۆی ئەنجامداوە.**

## ٦- دەروازەی: ئیمام بە هۆیەك دەچێتە دەرەوە

**١٣٩٤**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ وَعُدِّلَتِ الصُّفُوفُ قِيَاماً، فَخَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمَّا قَامَ فِي مُصَلاَّهُ، ذَكَرَ أَنَّهُ جُنُبٌ، فَقَالَ لَنَا: (**مَكَانَكُمْ**). ثُمَّ رَجَعَ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَيْنَا وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ، فَكَبَّرَ، فَصَلَّيْنَا مَعَهُ. [خ٢٧٥/ م٦٠٥]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: قامەت بۆ نوێژ کرا و ریزەکان بە پێوە رێکخران، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لامان، کاتێ بە پێوە وەستا بۆ نوێژ بیریکەوتەوە ئەو لەشگرانە، پێی فەرمووین: (لە شوێنی خۆتان بمێننەوە)، پاشان گەڕایەوە[1] و خۆی شۆری و ئەوجا هاتە دەرەوە بۆ لامان و سەری تنۆکی ئاوی لێ دەچۆڕا، "الله أكبر"ی کرد و نوێژمان لەگەڵ ئەنجامدا.**

## ٧- دەروازەی: بەندە و ئیمامەتی تووشبوو بە فیتنە و بیدعەچی

**١٣٩٥**- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**يُصَلُّونَ لَكُمْ، فَإِنْ أَصَابُوا فَلَكُمْ، وَإِنْ أَخْطَؤُوا فَلَكُمْ وَعَلَيْهِمْ**). [خ٦٩٤]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نوێژتان بۆ دەکەن، گەر راست و دروست ئەنجامیاندا بۆ هەمووتانە، گەر بە هەڵە ئەنجامیاندا بۆ ئێوەیە و لەسەر ئەوانە[2]).**

## ٨- دەروازەی: ئیمام چاوەڕوانی کۆبوونەوە(گردبوونەوەی) خەڵك دەکات

**١٣٩٦**- عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حِينَ تُقَامُ الصَّلاَةُ فِي الْمَسْجِدِ، إِذَا رَآهُمْ قَلِيلاً جَلَسَ لَمْ يُصَلِّ، وَإِذَا رَآهُمْ جَمَاعَةً صَلَّى. [د٥٤٥]

* ضعيف. وقال شعيب: رجاله ثقات وهو مرسل.

---

[1] واتە: گەڕایەوە بۆ ماڵەوە-و.

[2] واتە: نوێژەکەی ئێوە دروستە و گوناهەکەی بە ملی ئەوانە-و.

**لە سالمەوە، "أبي النضر"، وتی: کاتێك لە مزگەوت بۆ نوێژ قامەت دەکرا گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوانی ببینیبایە کەمن دادەنیشت و نوێژی نەدەکرد[1]، گەر ببینیبایە کۆمەڵێکن نوێژی دەکرد.**

## ٩- دەروازەی: ئیمامەتی ئافرەتان

**١٣٩٧**– عَنْ عَطَاءٍ عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّهَا كَانَتْ تُؤَذِّنُ وَتُقِيمُ، وَتَؤُمُّ النِّسَاءَ، وَتَقُومُ وَسَطَهُنَّ.

**لە عەتاوە، لە عائیشەوە: ئەو[2] بانگی دەدا و قامەتی دەکرد و ئیمامەتی بۆ ئافرەتان دەکرد و لە ناوەڕاستیان دەوەستا.**

**١٣٩٨**– عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: تَؤُمُّ المرأَةُ النِّسَاءَ تَقُومُ وَسَطَهُنَّ. [هق٣/١٣١]
[وانظر: ١٠٣٠، ١٠٣١].

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ئافرەت دەتوانێ ئیمامەت بۆ ئافرەتان بکات و لە ناوەڕاستیان بە پێوە بوەستێ[3].**

## ١٠- دەروازەی: کەسێك ئیمامەت بۆ دەستەیەك بکات و ئەوان لایان ناپەسەند بێت

**١٣٩٩**– عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الْمُصْطَلِقِ قَالَ: كَانَ يُقَالُ: أَشَدُّ النَّاسِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ اثْنَانِ: امْرَأَةٌ عَصَتْ زَوْجَهَا، وَإِمَامُ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ. [ت٣٥٩]

* صحيح الإسناد.

---

[1] واتە: چاوەڕوان دەبوو تا خەڵکەکە کۆدەبوونەوە–و.

[2] واتە: عائیشە–و.

[3] واتە: لێیان پێش ناکەوێ–و.

لە عەمری کوڕی حاریسی کوڕی موستەلیقەوە، وتی: کاتی خۆی دەوترا: توندترین سزا لە ڕۆژی قیامەت سزای دوو کەسە: ئافرەتێك لە پیاوەکەی یاخی بێت، ئیمامی دەستەیەك ئەوان لایان ناپەسەند بێت.

## ١١- دەروازەی: ئیمام لە شوێنێك ڕادەوەستێ بەرزتر بێت لە شوێنی خەڵکەکە

١٤٠٠- عَنْ هَمَّامٍ: أَنَّ حُذَيْفَةَ أَمَّ النَّاسَ بِالْمَدَائِنِ عَلَى دُكَّانٍ، فَأَخَذَ أَبُو مَسْعُودٍ بِقَمِيصِهِ فَجَبَذَهُ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ قَالَ: أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّهُمْ كَانُوا يُنْهَوْنَ عَنْ ذَلِكَ؟ قَالَ: بَلَى، قَدْ ذَكَرْتُ حِينَ مَدَدْتَنِي. [د٥٩٧]

* صحيح.

لە هەممامەوە: حوزەیفە لە مەدائین لەسەر بەرزییەك ئیمامەتی بۆ خەڵك کرد، ئەبو مەسعوود کراسەکەی گرت و ڕایکێشا، کە لە نوێژەکەی تەواو بوو، وتی: نازانی ئەوان نەهییان لەوە لێ دەکرا؟[1] وتی: با، کاتێك کراسەکەت ڕاکێشام بیرم کەوتەوە.

## ١٢- دەروازەی: ئیمام نوێژی سوننەت لە جێگەکەی خۆی ئەنجام نادات

١٤٠١- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يُصَلِّ الإِمَامُ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي صَلَّى فِيهِ حَتَّى يَتَحَوَّلَ).** [د٦١٦/ جه١٤٢٨]

* صحيح.

لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئیمام لەو شوێنانە نوێژ ناکات نوێژی تێدا کردووە تا شوێنەکەی دەگۆڕێت[1]).**

---

[1] واتە: نازانی هاوەڵان نەهییان لەو کارە لێکراوە؟-و.

## ١٣- دەروازەی: فەتح بە رووی ئیمامدا

**١٤٠٢**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى صَلاَةً فَقَرَأَ فِيهَا، فَلُبِسَ عَلَيْهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ لِأُبَيّ: (**أَصَلَّيْتَ مَعَنَا**)؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (**فَمَا مَنَعَكَ**)؟ [د٩٠٧]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) نوێژێکی ئەنجامدا و تیایدا قورئانی خوێند، لێی تێکەڵ بوو، کاتێک سەلامیدایەوە بە ئوبەی فەرموو: (نوێژت لەگەڵ کردین؟)، وتی: بەڵێ، فەرمووی: (ئەی چی ڕێگری لێکردی[٢])؟.**

---

[١] واتە: بۆ ئەنجامدانی نوێژی سوننەت ئەو شوێنە دەگۆڕێت نوێژە فەرزەکەی تێدا کردووە، هەنگاوێك یان چەند هەنگاوێك بۆ پێشەوە یان بۆ دواوە، بۆ لای ڕاست یان بۆ لای چەپ-و.

[٢] واتە: چی ڕێگری لێکردی ئیمام لە خوێندنی قورئانەکە ڕاست نەکەیەوە؟ واتە: دەبوا ئیمام ڕاستبکەیەوە-و.

## بەشی دووەم

# نوێژی جەماعەت

### ١- دەروازەی: واجبوونی نوێژی جەماعەت

١٤٠٣- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحْطَبَ، ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلاَةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيَؤُمَّ النَّاسَ، ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ. وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُهُمْ: أَنَّهُ يَجِدُ عَرْقاً سَمِيناً، أَو مِرْمَاتَيْنِ حَسَنَتَيْنِ، لَشَهِدَ الْعِشَاءَ)**. [خ٦٤٤/ م٦٥١]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، ویستم فەرمان بکەم دار کۆبکەنەوە، پاشان فەرمان بکەم بە نوێژ و بانگی بۆ بدرێت، پاشان فەرمان بە پیاوێك بکەم ئیمامەتی خەڵکی بکات، پاشان خۆم بچم بۆ پیاوانێك ماڵەکانیان بەسەردا بسوتێنم، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، گەر یەکێك لەوان بزانێت گرتکێکی قەڵەو یان دوو قاچ دەبینێتەوە بۆ نوێژی عیشا ئامادە دەبوو).**

١٤٠٤- (م) وَعَنْهُ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلٌ أَعْمَى، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّهُ لَيْسَ لِي قَائِدٌ يَقُودُنِي إِلَى الْمَسْجِدِ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يُرَخِّصَ لَهُ فَيُصَلِّيَ فِي بَيْتِهِ، فَرَخَّصَ لَهُ، فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ فَقَالَ: **(هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلاَةِ)**؟ فَقَالَ: نَعَمْ. قَالَ: **(فَأَجِبْ)**. [م٦٥٣]

**(م) هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پیاوێکی کوێر هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ڕێنیشاندەرێك نییە بۆ هاتنی مزگەوت پێشەنگیم بۆ بکات، داوای لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد ڕوخسەتی بدات و لە ماڵەکەی خۆی نوێژ**

**بکات، پێغەمبەر روخسەتی دا، کاتێك پشتی هەڵکرد بانگی کرد و فەرمووی: (ئایا گوێت لە بانگە بۆ نوێژ؟)، وتی: بەڵێ، فەرمووی: (کەوابوو وەڵام بدەرەوە).**

١٤٠٥– (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسعودٍ قَالَ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَلْقَى اللهَ غَداً مُسْلِماً، فَلْيُحَافِظْ عَلَى هَؤُلاَءِ الصَّلَوَاتِ حَيْثُ يُنَادَى بِهِنَّ، فَإِنَّ اللهَ شَرَعَ لِنَبِيِّكُمْ صلّى الله عليه وسلّم سُنَنَ الْهُدَى، وَإِنَّهُنَّ مِنْ سُنَنِ الْهُدَى، وَلَوْ أَنَّكُمْ صَلَّيْتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ كَمَا يُصَلِّي هَذَا الْمُتَخَلِّفُ فِي بَيْتِهِ لَتَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ، وَلَوْ تَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ لَضَلَلْتُمْ. وَمَا مِنْ رَجُلٍ يَتَطَهَّرُ فَيُحْسِنُ الطُّهُورَ، ثُمَّ يَعْمِدُ إِلَى مَسْجِدٍ مِنْ هَذِهِ الْمَسَاجِدِ؛ إِلاَّ كَتَبَ اللهُ لَهُ بِكلِّ خَطْوَةٍ يَخْطُوهَا حَسَنَةً، وَيَرْفَعُهُ بِهَا دَرَجَةً، وَيَحُطُّ عَنْهُ بِهَا سَيِّئَةً. وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وَمَا يَتَخَلَّفُ عَنْهَا إِلا مُنَافِقٌ مَعْلُومُ النِّفَاقِ، وَلَقَدْ كَانَ الرَّجُلُ يُؤْتَى بِهِ يُهَادَى بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ حَتَّى يُقَامَ فِي الصَّفِّ. [م٦٥٤]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: هەر کەس پێیخۆشە سبەی بە موسڵمانی بە خودا بگات با پارێزگاری لەو نوێژانە بکات کاتێ بانگیان بۆ دەکرێت[1]، چونکە خودا سوننەتی هیدایەتی بۆ پێغەمبەرەکەی ئێوە شەرع کردووە، ئەو نوێژانە بە جەماعەت لە سوننەتەکانی هیدایەتن، گەر لە ماڵەکانتان نوێژ بکەن وەك چۆن ئەو دواکەوتووە لە ماڵەکەی خۆی نوێژ دەکات، سوننەتی پێغەمبەرەکەی خۆتان وازلێهێناوە، گەر سوننەتی پێغەمبەرەکەتان وازلێبهێنن گومڕا دەبن، هەر پیاوێك خۆی پاك بکاتەوە و پاکبوونەوەکەی چاك و باش بێت، پاشان روو لە مزگەوتێك لەم مزگەوتانە بکات بە هەر هەنگاوێك هەڵیدەگرێت خودا چاکەیەکی بۆ دەنوسێت و بەوە پلەیەك بەرزی دەکاتەوە و خراپەیەکی لێ هەڵدەوەرێنێ، تۆ ئێمەت دەبینی تەنها کەسی دووڕوو کە دووڕوویەکەی ئاشکرا بوو لە جەماعەت دوادەکەوت[2]، پیاوێکی نەخۆشیان دەهێنا دوو پیاو دەچوونە ژێر باڵی تا لە ریزی جەماعەتدا رایاندەوەستان.**

---

[1] **"حيّ على الصلاة" بانگکردنە بۆ نوێژ، وەك چۆن هەموو بانگەکە بانگ بۆ ئەنجامدانی نوێژ دەکات–و.**

[2] **عەبدوڵای کوڕی مەسعوود دەڵێت: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەر لە نوێژی جەماعەت دوانەدەکەوتین، تەنانەت دەچوونە ژێر باڵی پیر و نەخۆش و دەیانهێنان بۆ نوێژی جەماعەت–و.**

١٤٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ صَلاَةَ لِجَارِ الْمَسجِدِ إِلاَّ فِي الْمَسجِدِ). [ك٨٩٨، هق٣/٥٧]

* ضعيف.

**له ئەبی هورەیرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نوێژ بۆ جیرانی مزگەوت تەنها لە مزگەوتدایە).**

## ٢- دەروازەی: فەزڵی نوێژی جەماعەت

١٤٠٧- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (صَلاَةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلاَةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً). [خ٦٤٥/ م٦٥٠]

**(ق) له عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نوێژی جەماعەت بە بیست و حەوت پلە باشتر و چاکترە لە نوێژی تاك).**

١٤٠٨- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (تَفْضُلُ صَلاَةُ الْجَمِيعِ صَلاَةَ أَحَدِكُمْ وَحْدَهُ بِخَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءاً، وَتَجْتَمِعُ مَلاَئِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ). ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَاقْرَؤُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾ [الإسراء:٧٨].
[خ٦٤٨ (١٧٦)/ م٦٤٩]

**(ق) له ئەبی هورەیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (نوێژی بە کۆمەڵ بە بیست و پێنج بەش فەزڵی هەیە بەسەر نوێژی یەکێك لە ئێوە، فریشتەی شەو و فریشتەی ڕۆژ لە نوێژی بەیانیدا کۆدەبنەوە)، پاشان ئەبو هورەیرە دەڵێت: گەر دەتانەوێت ئەمە بخوێنن: ﴿إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾[الإسراء:٧٨].**

١٤٠٩- (م) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ). [م٦٥٦]

(م) لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس عیشا بە جەماعەت ئەنجام بدات وەك ئەوە وایە نیوەی شەوەکەی هەستابێت، هەر کەس بەیانی بە جەماعەت بکات وەك ئەوە وایە هەموو شەوەکە هەستابێت)**.

## ٣- دەروازەی: خوێندن لەدوای ئیمامەوە

**١٤١٠-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي عَائِشَةَ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(لَعَلَّكُمْ تَقْرَؤُونَ وَالْإِمَامُ يَقْرَأُ)** ، مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّا لَنَفْعَلُ، قَالَ: **(فَلاَ تَفْعَلُوا، إِلاَّ أَنْ يَقْرَأَ أَحَدُكُمْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ)**. [حم١٨٠٧٠]

* إسناده صحيح.

**لە محەمەدی کوڕی ئیبن ئەبی عائیشەوە، لە پیاوێکەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لەوانەیە ئێوە بخوێنن و ئیمام بخوێنێت)، دوو جار، یان سێ جار، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە ئەوە ئەنجام دەدەین، فەرمووی: (ئەوە مەکەن، جگە لەوەی یەکێك لە ئێوە "فاتحة الکتاب" بخوێنێت)**[1].

**١٤١١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم لما قَضَى صَلاَتَهُ أَقْبَلَ عَلَيْهِمْ بِوَجْهِهِ فَقَالَ: **(أَتَقْرَؤُونَ فِي صَلاَتِكُمْ وَالإِمَامُ يَقْرَأُ)**؟ فَسَكَتُوا، فَقَالَ لَهُمْ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ قَائِلٌ أَوْ قَائِلُونَ: إِنَّا لَنَفْعَلُ، قَالَ: **(فَلاَ تَفْعَلُوا، لِيَقْرَأْ أَحَدُكُمْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فِي نَفْسِهِ)**.

* إسناده صحيح. [حب١٨٤٤/ هق٢/١٦٦]

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) نوێژەکەی تەواو کرد رووی لێکردن و فەرمووی: (ئایا لە نوێژەکەتان دەخوێنن و ئیمام بخوێنێت؟)، بێدەنگ**

---

[1] واتە: لە نوێژە جەهرییەکاندا(مەغریب و عیشا و بەیانی) لە دوای ئیمامەوە -لە دوو رکاتی یەکەمدا- تەنها سورەتی (الفاتحة) دەخوێنێ و پاشان گوێ دەگرێت بۆ خوێندنی قورئانی ئیمامەکە-و.

بوون، سێ جار ئەوەی پێ فەرموون، یەکێك یان چەند کەسێك وتیان: ئێمە ئەوە ئەو کارە دەکەین، فەرمووی: **(ئەو کارە مەکەن، با یەکێك لە ئێوە "فاتحة الکتاب" لە نەفسی خۆیدا بخوێنێت)**.

**١٤١٢**– عَنْ عَلِيٍ: أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ ـ أَوْ يَحُثُّ ـ أَنْ يُقْرَأَ خَلْفَ الإِمَامِ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةٍ، وَفِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ.

* قال الذهبي: صحيح.		[ك٨٧٤/ هق١٦٨/٢]

**لە عەلییەوە: ئەو فەرمانی دەکرد–یان هانی دەدا– لە نوێژی نیوەڕۆ و عەصر و لە دوو رکاتی یەکەمدا لەدوای ئیمامەوە "فاتحة الکتاب"[1] و سورەتێك بخوێنرێت، لە دوو رکاتەکەی تر تەنها "فاتحة الکتاب".**

## ٤- دەروازەی: ڕێکخستنی ریزەکان و فەزڵی ریزی یەکەم

**١٤١٣**– (ق) عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(سَوُّوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلاَةِ)**.		[خ٧٢٣/ م٤٣٣]

(ق) لە ئەنەسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ریزەکان رێکبکەن، رێکخستنی ریزەکان لە ئەنجامدانی نوێژە)**.

- ولفظ مسلم: (مِنْ تَمَامِ الصَّلاةِ).

**لەفزەکەی موسلیم: (لە تێر و تەواوی نوێژە).**

**١٤١٤**– (ق) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ، أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ)**.		[خ٧١٧/ م٤٣٦]

(ق) لە نیعمانی کوڕی بەشیرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(یان ریزەکانتان رێکدەکەن یان خودا روخسارتان دەشێوێنێ)**.

---

[1] واتە: سورەتی فاتیحە–و.

■ وفي رواية لمسلم، زاد في أوله: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُسَوِّي صُفُوفَنَا، حَتَّى كَأَنَّمَا يُسَوِّي بِهَا الْقِدَاحَ، حَتَّى رَأَى أَنَّا قَدْ عَقَلْنَا عَنْهُ. ثُمَّ خَرَجَ يَوْماً فَقَامَ حَتَّى كَادَ يُكَبِّرُ، فَرَأَى رَجُلاً بَادِياً صَدْرُهُ مِنَ الصَّفِّ، فَقَالَ: (**عِبَادَ اللهِ، لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ**).

**لە ریوایەتێكی موسلیمدا لە سەرەتایەوە ئەمە زیادكراوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ریزەكانی ئێمەی رێكدەخست، تا وەك ئەوەی تیری پێ رێكبكات، تا بینی ئێمە لەوەوە ژنەوتمان. پاشان رۆژێك هاتە دەرەوە و تا خەریك بوو "الله أكبر" بكات، بینی پیاوێك سینەی لە ریزەكە پێشكەوتووە، فەرمووی: (بەندەكانی خودا، ریزەكانتان رێكدەكەن یان خودا روخسارتان دەشوێنێ).**

■ وفي رواية عند البخاري معلقة: قال النُّعمانُ: رَأيتُ الرَّجلَ مِنَّا يُلزِقُ كعبَه بكعبِ صاحبِهِ.

[الأذان والإمامة، باب ٧٦]

**لە ریوایەتێكی (معلق) لای بوخاری: نوعمان وتی: پیاوم دەبینی قولاپێی دەلكاند بە قولاپێی هاوەڵەكەیەوە.**

**١٤١٥**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لَوْ تَعْلَمُونَ. أَوْ يَعْلَمُونَ. مَا فِي الصَّفِّ الْمُقَدَّمِ، لَكَانَتْ قُرْعَةٌ**). [م٤٣٩]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: (گەر بزانن–یان بیانزانیبا– چ شتێك لە ریزی پێشەوەدایە دەكرایە قورعە).**

**١٤١٦**– عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَتَخَلَّلُ الصَّفَّ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلَى نَاحِيَةٍ، يَمْسَحُ صُدُورَنَا وَمَنَاكِبَنَا، وَيَقُولُ: (**لاَ تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ**). وَكَانَ يَقُولُ: (**إِنَّ اللهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصُّفُوفِ الأُوَلِ**). [د٦٦٤/ ن٨١٠/ مي١٢٩٩]

* صحيح.

**لە بەرائی كوری عازیبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە لایەكەوە بۆ لایەكی تر دەچووە ناو ریزەكان، دەستی بە سینە و شانماندا دەهێنا و دەیفەرموو: (ناڕێك**

**مەبن، چونکە دڵتان ناڕێك دەبێت)، ئەو دەیفەرموو: (خودا و فریشتەکانی صەڵەوات دەدەن لەسەر ریزی یەکەم).**

**١٤١٧**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ وَصَلَ صَفّاً وَصَلَهُ اللهُ، وَمَنْ قَطَعَ صَفّاً قَطَعَهُ اللهُ عزّ وجل**).

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس ریزێك بەیەك بگەیەنێت خودا دەیگەیەنێت، هەر کەس ریزێك ببڕێت خودا(عز وجل) دەیبڕێت).**

- زاد أبو داود في أوله: (**أَقِيمُوا الصُّفُوفَ، وَحَاذُوا بَيْنَ الْمَنَاكِبِ، وَسُدُّوا الْخَلَلَ، وَلِينُوا بِأَيْدِي إِخْوَانِكُمْ، وَلاَ تَذَرُوا فُرُجَاتٍ لِلشَّيْطَانِ...**). [د٦٦٦/ ن٨١٨]

* صحيح.

**ئەبو داود لە سەرەتاکەیەوە ئەمەی زیاد کردووە: (ریزەکان رێك و راست بکەنەوە، نێوان شانتان تەریب بکەن، نێوانەکان بگرن، نەرم بن بۆ دەستی براکانتان، کەلەبەر مەهێڵنەوە بۆ شەیتان...).**

**١٤١٨**– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَتِمُّوا الصَّفَّ الْمُقَدَّمَ، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ، فَمَا كَانَ مِنْ نَقْصٍ، فَلْيَكُنْ فِي الصَّفِّ الْمُؤَخَّرِ**). [د٦٧١/ ن٨١٧]

* صحيح.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ریزی پێشەوە تەواو بکەن پاشان ئەوەی بەدوایدا دێت، گەر ناتەواوییەك هەبوو با ریزی کۆتاییدا بێت).**

## ٥- دەروازەی: کە قامەت کرا تەنها نوێژی فەرز هەیە

**١٤١٩**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ صَلاَةَ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةُ**). [م٧١٠]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(گەر قامەت بۆ نوێژ کرا تەنها نوێژی فەرز هەیە).**

**١٤٢٠-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَرْجِسَ قَالَ: دَخَلَ رَجُلٌ الْمَسْجِدَ، وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي صلاَةِ الْغَدَاةِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ فِي جَانِبِ الْمَسْجِدِ، ثُمَّ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمَّا سَلَّمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ: **(يَا فُلاَنُ! بِأَيِّ الصَّلاَتَيْنِ اعْتَدَدْتَ؟ أَبِصَلاَتِكَ وَحْدَكَ، أَمْ بِصَلاَتِكَ مَعَنَا)؟.** [م٧١٢]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی سەرجیسەوە، وتی: پیاوێك هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەناو نوێژی بەیانیدا بوو، پیاوەکە لە تەنیشت مزگەوتەکە دوو رکات نوێژی کرد، پاشان رۆیشتە ناو نوێژەوە لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەلامیدایەوە فەرمووی: (ئەی فلان، بە کام لەم دوو نوێژەت متمانە دەکەی؟ بە نوێژەکەت کە بەتەنها کردت، یان بە نوێژەکەت لەگەڵ ئێمە؟).**

## ٦- دەروازەی: کەی نوێژگەران هەڵدەستن بۆ نوێژ؟

**١٤٢١-** (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي، وَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ).** [خ٦٣٨ (٦٣٧)/ م٦٠٤]

**(ق) لە ئەبی قەتادەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کە قامەت کرا، هەڵمەستن تا من دەبینن، لەسەرتانە ئارام و خامۆش بن).**

## ٧- دەروازەی: کێ لەدوای ئیمامەوە دەوەستێ؟

**١٤٢٢-** (م) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَمْسَحُ مَنَاكِبَنَا فِي الصَّلاَةِ وَيَقُولُ: **(اسْتَوُوا وَلاَ تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلاَمِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ).** [م٤٣٢]

(م) لە ئەبی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی بە شانماندا دەهێنا لە نوێژدا و دەیفەرموو: **(ڕێك و ڕاست بوەستن و ناڕێك مەبن، چونکە دڵتان ناڕێك دەبێت، با خاوەن حیلم و ژیری[1] لەدوای منەوە بوەستێت، پاشان ئەوانەی بەدوای ئەواندا دێن، پاشان ئەوانەی بەدوای ئەواندا دێن).**

## ٨- دەروازەی: ڕیزەکانی ئافرەتان لەدوای ڕیزەکانی پیاوانەوە

**١٤٢٣-** (خ) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا سَلَّمَ، قَامَ النِّسَاءُ حِينَ يَقْضِي تَسْلِيمَهُ، وَمَكَثَ يَسِيراً قَبْلَ أَنْ يَقُومَ.

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأُرَى ـ وَاللهُ أَعْلَمُ ـ أَنَّ مُكْثَهُ لِكَيْ يَنْفُذَ النِّسَاءُ قَبْلَ أَنْ يُدْرِكَهُنَّ مَنِ انْصَرَفَ مِنَ الْقَوْمِ. [خ٨٣٧]

**(خ) لە ئوم سەلەمەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەلامی دەدایەوە ئافرەتان هەڵدەستان[2]، کاتێك پێغەمبەر سەلامدانەوەکەی تەواو دەبوو بەر لە هەستانی هەندێکی کەم دەمایەوە.**

**ئیبن شیهاب دەڵێت: پێموایە–خودا زاناترە– مانەوەکەی بۆ ئەوە بوو ئافرەتان هەستن و بڕۆن بەرلەوەی ئەوانەی لە پیاوان هەڵدەستن بە ئافرەتان بگەن.**

**١٤٢٤-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا).** [م٤٤٠]

---

[1] واتە: ئەوانەی لە دیندا کامڵن و خاوەن ئەقڵ و حیلم و تەمەنن، ئەوانەش لەناو خەڵکدا بە ئەقڵ و زانست و ڕەوشتی بەرز و جوان دەناسرێنەوە و بەناوبانگ دەبن، لەناو هاوەڵان ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و عبدالرحمانی کوڕی عەوف و زوبەیری کوڕی عەوام و سەعدی کوڕی مەعاز و مەعازی کوڕی جەبەل، هتد..بەناوبانگ بوون–و.

[2] واتە: ئافرەتان بەر لە پیاوان لە مزگەوت دەچوونە دەرەوە، تاکو تێکەڵاوی دروست نەبێت و بە منداڵ و ئیش و کاریماڵەوەیان بگەن–و.

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(باشترین ریزی پیاوان ریزی یەکەمیانە، خراپترینیان دواییانە[1]، باشترین ریزی ئافرەتان دواییانە و خراپترینیان یەکەمیانە)**.

## ٩- دەروازەی: فەزڵی زۆری هەنگاو هەڵگرتن بۆ مزگەوت

**١٤٢٥-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَعْظَمُ النَّاسِ أَجْراً فِي الصَّلاَةِ أَبْعَدُهُمْ فَأَبْعَدُهُمْ مَمْشى، وَالَّذِي يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ الإِمَامِ، أَعْظَمُ أَجْراً مِنَ الَّذِي يُصَلِّي ثُمَّ يَنَامُ)**. [خ٦٥١/ م٦٦٢]

(ق) لە ئەبی موساوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(مەزنترین پاداشت لە نوێژدا دوورترین و دوورترینە لە رۆیشتن، ئەو کەسەی چاوەڕوانی نوێژ دەکات تا لەگەڵ ئیمام ئەنجامی بدات پاداشتی مەزنترە لەو کەسەی نوێژ دەکات و پاشان دەخەوێت)**.

**١٤٢٦-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(صَلاَةُ الْجَمِيعِ تَزِيدُ عَلَى صَلاَتِهِ فِي بَيْتِهِ وَصَلاَتِهِ فِي سُوقِهِ خَمْساً وَعِشْرِينَ دَرَجَةً، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ، وَأَتَى الْمَسْجِدَ، لاَ يُرِيدُ إِلاَّ الصَّلاَةَ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلاَّ رَفَعَهُ اللهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ خَطِيئَةً، حَتَّى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ، وَإِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ، كَانَ فِي صَلاَةٍ مَا كَانَتْ تَحْبِسُهُ، وَتُصَلِّي ـ يَعْنِي ـ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ، مَا دَامَ فِي مَجْلِسِهِ الَّذِي يُصَلِّي فِيهِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، مَا لَمْ يؤذِ، يُحْدِثْ فِيهِ)**.
[خ٤٧٧ (١٧٦)/ م٦٤٩ (٢٧٢) كتاب المساجد]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(نوێژی جەماعەت بیست و پێنج پلە زیاترە لە نوێژەکەی لە ماڵەوە یان نوێژەکەی لە بازاڕ، گەر یەکێك لە ئێوە بە باشی دەستنوێژی هەڵگرت و هات بۆ مزگەوت، تەنها مەبەستی نوێژ بێت، هەر هەنگاوێك هەڵدەگرێت بەهۆیەوە خودا پلەیەك بەرزی دەکاتەوە و خراپەیەکی لێ**

[1] واتە: مەبەست بە خراپترین(شرُّها): کەمترین پاداشتە، نەك ئەوان لە ئەنجامدانی کارەکەیان خراپەکار بن-و.

**هەڵدەوەرێنێ، تا دەچێتە ناو مزگەوتەوە، کە چووە ناو مزگەوت لەناو نوێژدایە تا نوێژەکە ئەو بەند بکات[1]، صەڵەواتی لەسەر دەدەن-واتە: فریشتە- تا لەو مەجلیسەدا بێت نوێژی تێدا دەکرد: "خودایە، لێیخۆش ببە، خودایە رەحمی پێ بکە"، گەر ئازار نەبەخشێتەوە، و تیایدا بێدەستنوێژ ببێت).**

**١٤٢٧-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: خَلَتِ الْبِقَاعُ حَوْلَ الْمَسْجِدِ، فَأَرَادَ بَنُو سَلِمَةَ أَنْ يَنْتَقِلُوا إِلَى قُرْبِ الْمَسْجِدِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ لَهُمْ: (**إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكُمْ تُرِيدُونَ أَنْ تَنْتَقِلُوا قُرْبَ الْمَسْجِدِ**) قَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللهِ قَدْ أَرَدْنَا ذلِكَ، فَقَالَ: (**يَا بَنِي سَلِمَةَ، دِيَارَكُمْ تُكْتَبْ آثَارُكُمْ، دِيَارَكُمْ تُكْتَبْ آثَارُكُمْ**). [م٦٦٥]

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: هەندێ شوێن لە دەوروبەری مزگەوت خاڵی بوو، بەنو سەلیمە ویستیان بگوێزنەوە بۆ نزیك مزگەوت، ئەوە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێی فەرموون: (**پێمگەیشتووە ئێوە دەتانەوێ بگوێزنەوە بۆ نزیك مزگەوتەکە**)، وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوەمان ویست، فەرمووی: **(ئەی بەنی سەلیمە، ماڵەکانتان، ئاسارەکانتان دەنوسرێن، ماڵەکانتان، ئاسارەکانتان دەنوسرێن[2]).**

**١٤٢٨-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ مَشَى إِلَى بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ، لِيَقْضِيَ فَرِيضَةً مِنْ فَرَائِضِ اللهِ، كَانَتْ خَطْوَتَاهُ إِحْدَاهُمَا تَحُطُّ خَطِيئَةً، وَالأُخْرَى تَرْفَعُ دَرَجَةً**). [م٦٦٦].

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە ماڵەوە خۆی پاك بکاتەوە و پاشان بڕوات بۆ یەکێك لە ماڵەکانی خودا بۆئەوەی فەرزێك لە فەرزەکانی خودا ئەنجام بدات، دوو هەنگاوی: یەکەمیان خراپەیەکی لێ هەڵدەوەرێ و ئەویتریان پلەیەك بەرزدەبێتەوە).**

---

[1] واتە: تا لە چاوەڕوانی نوێژەکەدا بێت و لەناو مزگەوت مابێتەوە بۆ ئەنجامدانی نوێژەکە بە جەماعەت-و.

[2] واتە: پابەند بن بە ماڵەکانی خۆتانەوە هەنگاوەکانتان بۆ هاتنی مزگەوت دەنوسرێن.

**١٤٢٩**- عَنْ بُرَيْدَةَ الْأَسْلَمِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**بَشِّرِ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). [د٥٦١/ ت٢٢٣]

* صحيح.

**له بورەیدەی ئەسلەمییەوە: لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (مژدە بدە بەوانەی بە تاریکی دەچن بۆ مزگەوت بە نوورێکی تەواو لە رۆژی قیامەت).**

**١٤٣٠**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يُكَفِّرُ اللهُ بِهِ الْخَطَايَا، وَيَزِيدُ بِهِ فِي الْحَسَنَاتِ**)؟ قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ**).

* حسن صحيح. [جه٤٢٧/ مي٧٢٥]

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو فەرمووی: (دەتانەوێ ئەو شتەی خودا هەڵە و خراپەکانی پێ هەڵدەوەرێنێ و چاکەکانی پێ زۆر و زیاد دەکات نیشان ئێوە بدەم)، وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (دەستنوێژی تێر و تەواو لەسەر ناخۆشی[1]، زۆری هەنگاو بۆ مزگەوت، و چاوەڕوانی نوێژ لەدوای نوێژ).**

## ١٠- دەروازەی: دواکەوتوو لە نوێژی جەماعەت بە ئارامی و ویقارەوە دێت

**١٤٣١**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ تَأْتُوهَا تَسْعَوْنَ، وَأْتُوهَا تَمْشُونَ، عَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا**). [خ٩٠٨ (٦٣٦)/ م٦٠٢]

---

[1] لەسەر ناخۆشی: واتە سەرباری بوونی ناخۆشی، واتە: حاڵەتی ناڕەحەتی، وەك سەرما، و و ترس و نەخۆشی، و هاوشێوەی ئەوانە.

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(گەر قامەت کرا بۆ نوێژ بە تەکان و راکردن مەیەن، بەڵکو بە رۆیشتنی ئاسایی وەرن، لەسەرتانە ئارام و لەسەرخۆ بن، ئەوەی پیاگەیشتن لە نوێژ ئەنجامی بدەن، ئەوەش لەدەستتان چوو تەواوی بکەن)**.

**١٤٣٢**– (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، إِذْ سَمِعَ جَلَبَةَ رِجَالٍ، فَلَمَّا صَلَّى قَالَ: **(مَا شَأْنُكُمْ)**؟ قَالُوا: اسْتَعْجَلْنَا إِلَى الصَّلاَةِ، قَالَ: **(فَلاَ تَفْعَلُوا، إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا)**. [خ٦٣٥/ م٦٠٣]

(ق) لە ئەبی قەتادەوە، وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژمان دەکرد گوێی لە دەنگ و هاواری پیاوان بوو، کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: **(چیتانە؟)**، وتیان: پەلەمان کرد بۆ نوێژ، فەرمووی: **(وا مەکەن، گەر هاتن بۆ نوێژ ئارام و لەسەرخۆ بن، ئەوەی پیاگەیشتن لە نوێژ ئەنجامی بدەن، ئەوەی لەدەستتان چوو تەواوی بکەن)**.

**١٤٣٣**– (خ) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ: أَنَّهُ انْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ رَاكِعٌ، فَرَكَعَ قَبْلَ أَنْ يَصِلَ إِلَى الصَّفِّ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(زَادَكَ اللهُ حِرْصاً، وَلاَ تَعُدْ)**. [خ٧٨٣]

(خ) لە ئەبی بەکرەوە: ئەو بە پێغەمبەردا گەیشت لە رکووعدا بوو، ئەو رکووعی برد بەرلەوەی بگاتە ریزەکە، ئەوەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد، فەرمووی: **(خودا خەمخۆریت زیاد بکات، دووبارەی مەکەرەوە)**.

## ١١- دەروازەی: چەپڵە بۆ ئافرەتان[(١)]

**١٤٣٤**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ)**.

---

(١) کە ئیمام لە نوێژدا هەڵەی کرد پیاوان بە کردنی (سبحان الله) ئاگاداری دەکەنەوە و ئافرەتان بە کێشانی دەستی راست بەسەر دەستی چەپدا وەك دەنگی چەپڵە–و.

(ق) له ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(تەسبیح بۆ پیاوانە و چەپڵە بۆ ژنانە).**

■ وزاد في رواية لمسلم: (**في الصَّلاةِ**). [خ١٢٠٣/ م٤٢٢]

**له ریوایەتەکەی موسلیمدا ئەمە زیاد کراوە: (لە نوێژدا).**

**١٤٣٥**– عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِذَا أَنْسَانِي الشَّيْطَانُ شَيْئاً مِنْ صَلاَتِي؛ فَلْيُسَبِّحِ الرِّجَالُ، وَلْيُصَفِّقِ النِّسَاءُ**). [حم١٤٦٥٤]

* صحيح لغيره.

لە جابرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(گەر شەیتان لە نوێژەکەمدا شتێکی لەبیربردم، با پیاوان "سبحان الله" بکەن و ژنان چەپڵە لێ بدەن).**

## ١٢- دەروازەی: نوێژ لە ماڵەوە لە کاتی باران

**١٤٣٦**– (ق) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ أَذَّنَ بِالصَّلاَةِ فِي لَيْلَةٍ ذَاتِ بَرْدٍ وَرِيحٍ، ثُمَّ قَالَ: أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَأْمُرُ المؤَذِّنَ، إِذَا كَانَتْ لَيْلَةٌ ذَاتُ بَرْدٍ وَمَطَرٍ، يَقُولُ: (**أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ**). [خ٦٦٦ (٦٣٢)/ م٦٩٧]

**(ق) لە نافیعەوە: ئیبن عومەر لە شەوێکی ساردی بارەشدا فەرمانی کرد بۆ نوێژ بانگ بدرێت، پاشان وتی: "ألا صلوا في الرحال–ئاگادار بن لە ماڵەکانتان نوێژ بکەن"، پاشان وتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی بە بانگوێژ دەکرد–گەر شەوێکی سارد و باران بوایە– دەیفەرموو: (ئاگادار بن، لە ماڵەکانتان نوێژ بکەن).**

## ١٣- فەزڵی لای راستی ئیمام

**١٤٣٧**– (م) عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، أَحْبَبْنَا أَنْ نَكُونَ عَنْ يَمِينِهِ، يُقْبِلُ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ، قَالَ: فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (**رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ . أَوْ تَجْمَعُ . عِبَادَكَ**). [م٧٠٩]

(م) لە بەرائەوە، وتی: کە نوێژمان لەدوای پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ئەنجام دەدا پێمانخۆش بوو لای راستییەوە بین و رووی خۆیمان تێبکات، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: **(رب قني عذابك يوم تبعث –أو تجمع– عبادك –پەروەردگار، لە سزای خۆت بمپارێزە رۆژێك بەندەکانت زیندوو دەکەیەوە، یان کۆدەکەیەوە).**

## ١٤- دەروازەی: کەسی تاك(تەنها) لای راستی ئیمامەوە دەوەستێت

**١٤٣٨–** عن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قال: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي الْمَغْرِبَ، فَجِئْتُ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ. [جه٩٧٤]

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی مەغریبی دەکرد، هاتم و لای چەپییەوە وەستام، لای راستی خۆیەوە منی وەستان.**

- وزاد عند أحمد: فَجَاءَ صَاحِبٌ لِي فَصَفَفْنَا خَلْفَهُ. [حم١٤٤٩٦]

* صحيح.

**لای ئەحمەد ئەمە زیاد کراوە: هاوەڵێکم هات و لەدوای پێغەمبەرەوە ریزمان بەست.**

## ١٥- دەروازەی: بە ئەنجامدانی رکاتێك لەگەڵ ئیمام بە نوێژدا گەیشتووە(نوێژی دواکەوتوو)

**١٤٣٩–** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا جِئْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ وَنَحْنُ سُجُودٌ فَاسْجُدُوا، وَلاَ تَعُدُّوهَا شَيْئاً، وَمَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ). [د٨٩٣]

* حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر هاتن بۆ نوێژ و ئێمە لە سوژدەدا بووین سوژدە ببەن و شتێك لێ مەژمێرن، هەر کەس بە رکاتێکدا بگات بە نوێژەکەدا گەیشتووە).**

١٤٤٠- عَنْ عَلِيٍّ وَعَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، قَالاَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا أَتَى أَحَدُكُمُ الصَّلاَةَ وَالْإِمَامُ عَلَى حَالٍ، فَلْيَصْنَعْ كَمَا يَصْنَعُ الْإِمَامُ**). [ت٥٩١]

* صحيح.

**لە عەلی و و مەعازی کوڕی جەبەلەوە، وتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە هات بۆ نوێژ و ئیمام لەسەر حاڵێك بوو با ئەوە بکات ئیمام ئەنجامی دەدات).**

١٤٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ فَقَدْ أَدْرَكَهَا، قَبْلَ أَنْ يُقِيمَ الإِمَامُ صُلْبَهُ**). [هق٢/٨٩]

**لە ئەبی هورەیرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس بە رکاتێکدا بگات بە نوێژەکە گەیشتووە، بەرلەوەی ئیمام پشتی راستبکاتەوە[1]).**

١٤٤٢- عَنْ مَالِك، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِذَا أَدْرَكَ الرَّجُلُ الرَّكْعَةَ، فَكَبَّرَ تَكْبِيرَةً وَاحِدَةً، أَجْزَأَتْ عَنْهُ تِلْكَ التَّكْبِيرَةُ. [ط١٧١]

**لە مالیکەوە، لە ئیبن شیهابەوە ئەو دەیوت: گەر پیاو بە رکوعدا گەیشت و یەك "الله أکبر"ی کرد، ئەو "الله أکبر"ەی بەسە[2].**

## ١٦- دەروازەی: پێشخستنی خواردن بەسەر نوێژدا

١٤٤٣- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا قُدِّمَ الْعَشَاءُ فَابْدَؤُوا بِهِ قَبْلَ أَنْ تُصَلُّوا صَلاَةَ الْمَغْرِبِ، وَلاَ تَعْجَلُوا عَنْ عَشَائِكُمْ**). [خ٦٧٢/ م٥٥٧]

---

(١) واتە: بەرلەوەی ئیمام لە رکووعی رکاتی کۆتایی پشتی راست بکاتەوە-و.

(٢) واتە: "الله أکبر"ی نوێژدابەستنەکەی بەسە بۆ چوونە رکووعەکەی، "الله أکبر" دەکات و راستەوخۆ دەچێتە رکووعەوە-و.

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بەرلەوەی نوێژی مەغریب ئەنجام بدەن ژەمی شێوان پێشکەشکرا بە ژەمەکە دەست پێبکەن، پەلەش مەکەن لە ژەمی شێوانتان).**

- وفي رواية لهما: (إذا وُضِعَ العَشاءُ وأُقِيمتِ الصلاة، فابدؤوا بالعَشَاءَ). [خ٥٤٦٣]

لە ریوایەتێکی هەردووکیان: **(گەر ژەمی شێوان دانرا و قامەت بۆ نوێژ کرا بە ژەمی شێوان دەست پێ بکەن).**

## ١٧- دەروازەی: کەسێك بە جەماعەتدا نەگات و لە مزگەوت نوێژی کرد

**١٤٤٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ رَاحَ فَوَجَدَ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا، أَعْطَاهُ اللهُ جَلَّ وَعَزَّ مِثْلَ أَجْرِ مَنْ صَلَّاهَا وَحَضَرَهَا، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أَجْرِهِمْ شَيْئاً).** [د٥٦٤/ ن٨٥٤]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: هەر کەس دەستنوێژ بگرێت و بە باشی ئەنجامی بدات، پاشان بڕوات و ببینێت خەڵك نوێژیان کردووە، خودا(عز وجل) هاوشێوەی پاداشتی ئەو کەسەی پێ دەدات نوێژەکەی کردووە و ئامادە بووە، ئەوەش شتێك لە پاداشتی ئەوان کەم ناکات.**

## ١٨- دەروازەی: جەماعەت لە مزگەوتێك نوێژی جەماعەتی تێدا کرابێت

**١٤٤٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَبْصَرَ رَجُلاً يُصَلِّي وَحْدَهُ، فَقَالَ: **(أَلاَ رَجُلٌ يَتَصَدَّقُ عَلَى هَذَا، فَيُصَلِّيَ مَعَهُ).** [د٥٧٤/ ت٢٢٠/ مي١٤٠٨]

* صحيح.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێکی بینی بەتەنها نوێژی دەکرد، فەرمووی: (پیاوێك بتوانێ صەدەقەیەك بەم کەسە بکات و لەگەڵی نوێژ بکات).**

## ١٩- دەروازەی: گەر نوێژ بکات و پاشان قامەت بۆ نوێژ کرا

**١٤٤٦-** عَنْ مِحْجَنِ بْنِ أَبِي مِحْجَنٍ الدِّيلِيِّ: أَنَّهُ كَانَ فِي مَجْلِسٍ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأُذِّنَ بِالصَّلاَةِ فَقَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ رَجَعَ وَمِحْجَنٌ فِي مَجْلِسِهِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ؟ أَلَسْتَ بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ!**) قَالَ: بَلَى، وَلَكِنِّي كُنْتُ قَدْ صَلَّيْتُ فِي أَهْلِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا جِئْتَ فَصَلِّ مَعَ النَّاسِ، وَإِنْ كُنْتَ قَدْ صَلَّيْتَ**). [ن٨٥٦]

* صحيح.

**لە میحجەنی کوڕی ئەبی میحجەنی دیلییەوە: ئەو لە مەجلیسێکدا بوو لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، بانگ بۆ نوێژ درا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستا و پاشان گەڕایەوە و میحجەن لە مەجلیسەکەی بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: (چی ڕێگریت لێ دەکات نوێژ بکەی؟ بۆ تۆ پیاوێکی موسڵمان نیت؟)، وتی: با، بەڵام لەناو خانەوادەکەم نوێژم کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر هاتی لەگەڵ خەڵك نوێژ بکە با نوێژیشت کردبێت).**

## ٢٠- دەروازەی: نوێژی تەنهاکەوتوو لەدوای ڕیزەوە

**١٤٤٧-** عَنْ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَأَى رَجُلاً يُصَلِّي خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُعِيدَ الصَّلاَةَ. [د٦٨٢/ ت٢٣٠/ جه١٠٠٤/ مي١٣٢٢]

* صحيح.

**لە وابیصەی کوڕی مەعبەدەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێکی بینی بەتەنها لەدوای ڕیزەکەوە نوێژی دەکرد، فەرمانی پێکرد نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە.**

## ٢١- دەروازەی: شوێنی وەستانی ئیمام گەر سیان بوون

**١٤٤٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ بِالْهَاجِرَةِ، فَوَجَدْتُهُ يُسَبِّحُ، فَقُمْتُ وَرَاءَهُ، فَقَرَّبَنِي حَتَّى جَعَلَنِي حِذَاءَهُ عَنْ يَمِينِهِ، فَلَمَّا جَاءَ يَرْفَا تَأَخَّرْتُ فَصَفَفْنَا وَرَاءَهُ. [ط٣٦٣]

* إسناده صحيح.

[وانظر: **١٤٣٨**].

**لە عەبدوڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعوودەوە، وتی: لە قرچەی نیوەڕۆدا ڕۆیشتم بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب، بینیم تەسبیحی دەکرد[1]، منیش لەدواوەی وەستام، نزیکی کردمەوە تا هێنامییە تەنیشتی لای ڕاستەوە، کاتێك یەرفا[2] هات هاتمە دواوە و لەدواوەی ئەو ڕیزمان بەست.**

## ٢٢- دەروازەی: نەهی لە نوێژ کردنی کەسی تەنگاو

**١٤٤٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْأَرْقَمِ: أَنَّهُ خَرَجَ حَاجّاً أَوْ مُعْتَمِراً، وَمَعَهُ النَّاسُ، وَهُوَ يَؤُمُّهُمْ، فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ أَقَامَ الصَّلَاةَ صَلَاةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ قَالَ: لِيَتَقَدَّمْ أَحَدُكُمْ . وَذَهَبَ إِلَى الْخَلَاءِ . فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَذْهَبَ الْخَلَاءَ، وَقَامَتِ الصَّلَاةُ؛ فَلْيَبْدَأْ بِالْخَلَاءِ)**. [د٨٨/ ت١٤٢/ ن٨٥١/ جه٦١٦/ مي١٤٦٧]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی ئەرقەمەوە: ئەو ڕۆیشت بۆ حەج یان عەمرە و خەڵکانێکی لەگەڵ بوون، ئەو ئیمامەتی بۆ دەکردن، ڕۆژێك قامەتی بۆ نوێژی بەیانی کرد، پاشان وتی: با یەکێك لە ئێوە پێشبکەوێت-خۆی ڕۆیشت بۆ سەر پێشاو- من لە پێغەمبەری**

---

[1] **واتە: نوێژ سوننەتی دەکرد-و**

[2] **یەرفا: دەرگاوانی عومەر بوو-و**

خودام(ﷺ) بیست دەیفەرموو: **(گەر یەکێك لە ئێوە ویستی بچێت بۆ سەر پێشاو و قامەت بۆ نوێژ کرا با بە چوونە سەر پێشاو دەست پێ بکات).**

## ٢٣- دەروازەی:کەسێك دەستنوێژی بشکێت لە نوێژەکە دەچێتە دەرەوە

١٤٥٠- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا أَحْدَثَ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ؛ فَلْيَأْخُذْ بِأَنْفِهِ، ثُمَّ لِيَنْصَرِفْ). [د١١١٤/ جه١٢٢٢]

* صحيح.

لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە لە نوێژەکەیدا دەستنوێژی شکا با دەست بە لوتییەوە بگرێت و پاشان پشتهەڵبکات و بڕوات).**

## ٢٤- دەروازەی: کەسی ڕۆیشتوو بۆ مزگەوت پەنجەکانی لە یەکتر هەڵناپێکێ

١٤٥١- عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ، فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ خَرَجَ عَامِداً إِلَى الْمَسْجِدِ، فَلاَ يُشَبِّكَنَّ يَدَيْهِ، فَإِنَّهُ فِي صَلاَةٍ).

* صحيح. [د٥٦٢/ ت٣٨٦/ مي١٤٠٤]

لە کەعبی کوڕی عوجرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە دەستنوێژی گرت و دەستنوێژەکەی باش و چاك بوو، پاشان ڕۆیشتە دەرەوە و مزگەوتی بەمەبەست گرت، با دوو دەستی لەیەکتر هەڵنەپێکێت، چونکە ئەو لە نوێژێکدایە).**

## ٢٥- دەروازەی: جەماعەت لە ماڵەوە

١٤٥٢- عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ: أَنَّهُ صَنَعَ طَعَاماً، فَدَعَا إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِي وَإِبْرَاهِيمَ التَّيْمِي وَسَلَمَةَ بْنَ كُهَيْلٍ وَذَرّاً وَأُنَاساً مِنْ وُجُوهِ الْقُرَّاءِ فَأَمَرَ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِي، فَقَصَّ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَصَلَّوْا فِي الْبُيُوتِ فِي جَمَاعَةٍ، وَلَمْ يَخْرُجُوا إِلَى الْمَسْجِدِ، ثُمَّ جَاءَهُمْ بِالطَّعَامِ. [هق٣/٦٧]

لە حەبیبی کوڕی ئەبی سابیتەوە: ئەو خواردنێکی دروست کرد و ئیبراهیمی نەخەعی و ئیبراهیمی تەیمی و سەلەمەی کوڕی کوهەیل و زەڕ و خەڵکانێك لە خوێنەرە پێشەنگەکانی قورئانی بانگهێش کرد، فەرمانی بە ئیبراهیمی تەیمی کرد چیرۆکی بەسەردا خوێندەوە، پاشان نوێژ هاتە بەرەوە و لەماڵەکە بە جەماعەت نوێژیان کرد و نەڕۆیشتنە دەرەوە بۆ مزگەوت، پاشان خواردنی بۆ هێنان.

## ٢٦- دەروازەی: ئەوەی لەگەڵ ئیمام پیادەگات سەرەتای نوێژەکەیەتی

١٤٥٣- عَنْ عَلِي ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَا أَدْرَكْتَ فَهُوَ أَوَّلُ صَلاَتِكَ. [هق٢/٢٩٨]

لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، ئەو وتی: ئەوەی پیادەگەی سەرەتای نوێژەکەتە[1].

١٤٥٤- عَنْ رَبِيعَةَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ وَأَبَا الدَّرْدَاءِ رضي الله عنهما قَالاَ: مَا أَدْرَكْتَ مِنْ آخِرِ صَلاَةِ الإِمَامِ، فَاجْعَلْهُ أَوَّلَ صَلاَتِكَ. [هق٢/٢٩٨]

لە رەبیعەوە، عومەری کوڕی خەتاب و ئەبو دەردا(خوایان لێ رازی بێت) وتیان: ئەوەی لە کۆتایی نوێژی ئیمامدا پیادەگەی بیکە بە سەرەتای نوێژەکەت.

## ٢٧- دەروازەی: کەسی دواکەوتوو لە نوێژ "الله أكبر"ی دابەستنی نوێژەکە بەسە بۆی

١٤٥٥- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ إِذَا أَتَيَا الإِمَامَ وَهُوَ رَاكِعٌ كَبَّرَا تَكْبِيرَةً وَيَرْكَعَانِ بِهَا. [هق٢/٩١]

---

[1] بۆیە لە دوو رکاتی یەکەمی نوێژەکەت دەبێ لە دوای فاتیحە سورەتێك بخوێنی-گەر پیابگەی- با ئیمامیش لە دوو رکاتی کۆتایی بێت-و

لە ئیبن شیهابەوە، وتی: گەر ئیبن عومەر و زەیدی کوڕی سابیت بهاتبان بۆ لای ئیمام و ئەو لە رکوعدا بوایە "الله أكبر"ێکیان دەکرد و هەر بەو "الله أكبر"ە رکوعیان دەبرد.

**١٤٥٦**– عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: إِنْ أَدْرَكَهُمْ رُكُوعاً أَوْ سُجُوداً أَوْ جُلُوساً يُكَبِّرُ تَكْبِيرَتَيْنِ.

[هق٢/٩١]

لە ئیبن مەسعوودەوە، وتی: گەر بە رکوعێك یان سوژدەیەك یان تەحیاتێکدا بگەیشتبان دوو "الله أكبر"یان دەکرد[1].

---

[1] کەوابوو هەردووکیان دروستە، یەك "الله أكبر" یان دوو "الله أكبر"–و

# پەڕتووکی حەوتەم

## نوێژی جومعە و دوو

## جەژنەکە و نوێژی ڕۆژگیران

## و نوێژە بارانە و ترس

# بەشی یەکەم

# نوێژی جومعە

## ١- دەروازەی: فەزیلەتی ڕۆژی جومعە

١٤٥٧– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وعَنْ حُذَيْفَةَ، قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَضَلَّ اللهُ عَنِ الْجُمُعَةِ مَنْ كَانَ قَبْلَنَا، فَكَانَ لِلْيَهُودِ يَوْمُ السَّبْتِ، وَكَانَ لِلنَّصَارَى يَوْمُ الأَحَدِ، فَجَاءَ اللهُ بِنَا، فَهَدَانَا اللهُ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ، فَجَعَلَ الْجُمُعَةَ وَالسَّبْتَ وَالأَحَدَ. وَكَذلِكَ هُمْ تَبَعٌ لَنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، نَحْنُ الآخِرُونَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، وَالأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، الْمَقْضِيُّ لَهُمْ قَبْلَ الْخَلاَئِقِ). [م٨٥٦]

(م) لە ئەبی هورەیرە و لە حوزەیفەوە، وتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا ئەوانەی پێش ئێمەی لە جومعە وێڵ کرد، بۆ یەهوود ڕۆژی شەممە هەیە و بۆ نەصارا ڕۆژی یەك شەممە، خودا ئێمەی هێنا و هیدایەتی داین بۆ ڕۆژی جومعە، کردی بە جومعە و شەممە و یەك شەممە، هەر بەو جۆرە ئەوان لە ڕۆژی قیامەت شوێنکەوتەی ئێمەن، ئێمە دواییینین لە ئەهلی دنیا و یەکەمینین لە ڕۆژی قیامەت و بەر لە هەموو دروستکراوان قەزاوەتیان بۆ دەکرێت).**

١٤٥٨– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ: فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا، وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ). [م٨٥٤]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(باشترین ڕۆژێك خۆری لێ هەڵهاتبێت جومعەیە، تیایدا ئادەم دروستکرا، و تیایدا خرایە بەهەشتەوە، و تیایدا لە بەهەشت دەرکرا، و قیامەت تەنها لە ڕۆژی جومعە بەرپا دەبێت).**

١٤٥٩– عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ

الصَّلاَةِ فِيهِ، فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ). قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلاَتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرِمْتَ. يَقُولُونَ: بَلِيتَ.؟ فَقَالَ: (إِنَّ اللهَ عزّ وجل حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ).

* صحيح. [د١٠٤٧/ ن١٣٧٣/ جه١٠٨٥/ مي١٥٧٢]

لە ئەوسی کوڕی ئەوسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە باشترینی ڕۆژەکانی ئێوە ڕۆژی جومعەیە، تیایدا ئادەم دروستکرا، و تیایدا مرێنرا، و تیایدا "النفخة[1]" و تیایدا "الصعقة[2]"، بۆیە تیایدا صەڵەواتی زۆر لەسەر من لێبدەن، چونکە صەڵەواتەکەتانم بۆ دەخرێتە ڕوو)**، وتی: وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن صەڵەواتی ئێمە بۆ تۆ دەخرێتە ڕوو لە کاتێکدا تۆ (أرمتَ–رزیوی)–دەڵێن (لیبتَ–پواوی)؟ فەرمووی: **(خودا جەستەی پێغەمبەرانی لە زەوی حەرام کردووە)**.

## ٢- دەروازەی: ئەو ساتەی لە ڕۆژی جومعەدایە

١٤٦٠- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ذَكَرَ يَوْمَ الجُمُعَةِ، فَقَالَ: (فِيهِ سَاعَةٌ لاَ يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ، وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي، يَسْأَلُ اللهَ تَعَالَى شَيْئاً، إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ). وَأَشَارَ بِيَدِهِ يُقَلِّلُهَا. [خ٩٣٥/ م٨٥٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسی ڕۆژی جومعەی کرد و فەرمووی: **(ساتێکی تێدایە هەر بەندەیەکی موسڵمان ڕێی لێ بکەوێ و ئەو بە پێوە نوێژ بکات[3] و لە خودای تەعالا شتێك داوا بکات پێی دەبەخشێت)**، ئاماژەی بە دەستی کرد کەمی دەکردەوە[4].

---

[1] "النفخة" فوو کردن بە کەڕەنادا–و

[2] "الصعقة" بریتییە لە مردنی هەموو دروستکراوان بە هۆی فووی دووەم کە ئیسرافیل دەیکات بە کەڕەنادا–و

[3] زانایان دەڵێن: نوێژ بکات یان چاوەڕوانی نوێژ بکات، یاخود لە دوعا و خوێندنی قورئاندا بێت–و

[4] واتە: بە دەست ئاماژەی بەوە دەدا کاتێکی زۆر کەم و ناسکە–و

**١٤٦١**– (م) عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ لِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: أَسَمِعْتَ أَبَاكَ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي شَأْنِ سَاعَةِ الْجُمُعَةِ؟ قالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**هِيَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ الإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلاَةُ**). [م٨٥٣]

**(م) لە ئەبی بوردەی کوڕی ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: عەبدوڵای کوڕی عومەر پێی وتم: ئایا گوێت لە باوکت بووە لە پێغەمبەری خوداوە قسە بکات دەربارەی ئەو ساتەی لە جومعەدایە؟ وتی: وتم: بەڵێ، گوێم لێ بوو دەیوت: لە پێغەمبەری خودام بیست دەیفەرموو: (ئەوە لە نێوان دانیشتنی ئیمامە تا نوێژ تەواو دەبێت).**

**١٤٦٢**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**يَوْمُ الْجُمُعَةِ ثِنْتَا عَشْرَةَ . يُرِيدُ سَاعَةً . لاَ يُوجَدُ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللهَ عزّ وجل شَيْئاً، إِلاَّ أَتَاهُ اللهُ عزّ وجل، فَالْتَمِسُوهَا آخِرَ سَاعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ**). [د١٠٤٨/ ١٣٨٨٥]

* صحيح.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: (ڕۆژی جومعە دوازدەیە–مەبەستی ساتە[1]– موسڵمان ببینرێتەوە شتێك داوا لە خودا بکات خودا(عز وجل) پێی دەبەخشێت، لە دوایین ساتیدا لەدوای عەصر بۆی بگەڕێن).**

## ٣- دەروازەی: غوسڵی ڕۆژی جومعە

**١٤٦٣**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ، فَلْيَغْتَسِلْ**). [خ٨٧٧/ م٨٤٤]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە هات بۆ جومعە با خۆی بشۆرێت).**

---

[1] واتە: دوازدە ساتە–و

١٤٦٤- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الْغَسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ). [خ٨٥٨/ م٨٤٦]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(غوسڵ لە ڕۆژی جومعە لەسەر هەموو موسڵمانێکی باڵغ واجبە[1]).**

١٤٦٥- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ تَوَضَّأَ يومَ الْجُمُعَةِ فَبِهَا وَنِعْمَتْ، وَمَنِ اغْتَسَلَ فَهُوَ أَفْضَلُ).

* حسن. [د٣٥٤/ ت٤٩٧/ ن١٣٧٩/ مي١٥٨١]

لە سەموورەی کوڕی جوندوبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە ڕۆژی جومعە دەستنوێژ بگرێت کارێکی باش و پەسەندە، هەر کەس خۆی بشۆرێ باشتر و چاکترە).**

١٤٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ، فَدَنَا وَاسْتَمَعَ وَأَنْصَتَ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ، وَزِيَادَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ. وَمَنْ مَسَّ الْحَصَى فَقَدْ لَغَا). [د١٠٥٠/ ت٤٩٨/ جه١٠٩٠]

* صحيح.

[وانظر: ١٤٧٦].

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس دەستنوێژ بگرێت بە دەستنوێژێکی باش و پاشان بێت بۆ جومعە و نزیك ببێتەوە و گوێبگرێت و بێدەنگ بێت لە گوناهەکانی نێوان ئەو و جومعەکەی تر و سێ ڕۆژ زیادە خۆشدەبێت، هەر کەس دەست بدات لە چەو لەغوی ئەنجامداوە[2]).**

[1] واتە: سوننەتێکی پێ لەسەر داگیراوە، نەك فەرز بێت، وەك لە فەرموودەی (١٤٦٥)دا ئاماژەی پێکراوە–و

[2] لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)ناو مزگەوتەکان چەو بوو، واتە بە دەستی یاری بە چەو بکات و لە وتاری ئیمام بێئاگا بێت–و

## ٤- دەروازەی: بۆنی خۆش بۆ جومعە

١٤٦٧- (خ) عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الجُمُعَةِ، وَيَتَطَهَّرُ مَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ، وَيَدَّهِنُ مِنْ دُهْنِهِ، أَوْ يَمَسُّ مِنْ طِيبِ بَيْتِهِ، ثُمَّ يَخْرُجُ فَلاَ يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ، ثُمَّ يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ، ثُمَّ يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّمَ الإِمَامُ؛ إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الجُمُعَةِ الأُخْرَى). [خ٨٨٣]

(خ) لە سەلمانی فارسییەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر پیاوێك ڕۆژی جومعە خۆی بشۆرێ، و چەند دەتوانێ خۆی پاك بكاتەوە و چەوری لە خۆی بدات[1]، یان لە بۆنی خۆشی ماڵەوە بۆن لە خۆی بدات، پاشان بڕوات و جیاكردنەوەی نەخستە نێوان دوو كەس[2]، پاشان ئەوەی بۆی نووسراوە لە نوێژ ئەنجام بدات، و پاشان گەر ئیمام قسەی كرد ئەو بێدەنگ بێت خودا لە گوناهی نێوان ئەو و جومعەكەی تری خۆشدەبێت).**

## ٥- دەروازەی: فەزڵی زوو ڕۆیشتن بۆ جومعە

١٤٦٨- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الجُمُعَةِ غُسْلَ الجَنَابَةِ ثُمَّ رَاحَ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشاً أَقْرَنَ، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الخَامِسَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً، فَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ حَضَرَتِ المَلاَئِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ). [خ٨٨١/ م٨٥٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس لە ڕۆژی جومعە وەك غوسڵی لەشگرانی خۆی بشۆرێ پاشان بڕوات وەك**

---

[1] خۆ هەنوین و چەوریدان لە خۆ و لەسەری خۆ سوننەتێكی پێغەمبەرە، بە تایبەت بە چەورییەك بۆن خۆش دەكات و جەستە پاك دەكاتەوە و پرچی سەر ڕێكدەخات–و

[2] واتە: لە مزگەوت بە نێوان دوو كەسدا هەنگاوی هەڵنەگرت و ئازاری خەڵكی نەدا تاكو بگاتە ڕیزی پێشەوە–و

ئەوە وایە حوشترێکی کردبێت بە خێر، هەر کەس لە ساتی دووەمدا بڕوات وەك ئەوە وایە مانگایەکی کردبێت بە خێر، هەر کەس لە ساتی سێیەمدا بڕوات وەك ئەوە وایە بەرانێکی شاخداری کردبێت بە خێر، هەر کەس لە ساتی چوارەمدا بڕوات وەك ئەوە وایە مریشکێکی کردبێت بە خێر، هەر کەس لە ساتی پێنجەمدا بڕوات وەك ئەوە وایە هێلکەیەکی کردبێت بە خێر، کە ئیمام هاتە دەرەوە فریشتەکان ئامادە دەبن و گوێ لە زیکر دەگرن).

## ٦- دەروازەی: کاتی جومعە

١٤٦٩- (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم الْجُمُعَةَ ثُمَّ نَنْصَرِفُ، وَلَيْسَ لِلْحِيطَانِ ظِلٌّ نَسْتَظِلُّ فِيهِ. [خ٤١٦٨/ م٨٦٠]

(ق) لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە، وتی: نوێژمان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجام دەدا پاشان دەڕۆیشتین و دیوارەکان سێبەرێکیان نەبوو خۆمان بدەینە ژێر سێبەرەکەی[1].

- وفي رواية لمسلم: ثُمَّ نَرْجِعُ نَتَتَبَّعُ الْفَيْءَ.

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: پاشان دەگەڕاینەوە شوێنپێی سێبەرمان هەڵدەگرت.

١٤٧٠- (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُصَلِّي الْجُمُعَةَ حِينَ تَمِيلُ الشَّمْسُ. [خ٩٠٤]

(خ) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك خۆر لایدەدا[2] نوێژی جومعەی دەکرد.

---

[1] واتە: هێشتا سێبەر درێژ نەبووبوو و خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان ئەوەندە شۆڕ نەبووبوویەوە سێبەرەکان درێژ بن، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر زوو تەواوبوون و کورتی وتار و نوێژی جومعە—و

[2] واتە: خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان دەترازا—و

## ٧- دەروازەی: بانگ لە ڕۆژی جومعە

**١٤٧١-** (خ) عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قالَ: إِنَّ الأَذَانَ يَوْمَ الجُمُعَةِ كَانَ أَوَّلُهُ حِينَ يَجْلِسُ الإِمَامُ يَوْمَ الجُمُعَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ، فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رضي الله عنهما، فَلَمَّا كَانَ فِي خِلاَفَةِ عُثْمَانَ ﷺ، وَكَثُرُوا، أَمَرَ عُثْمانُ يَوْمَ الجُمُعَةِ بِالأَذَانِ الثَّالِثِ، فَأُذِّنَ بِهِ عَلَى الزَّوْرَاءِ، فَثَبَتَ الأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ. [خ٩١٦ (٩١٢)]

**(خ) لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە، وتی: بانگ لە ڕۆژی جومعە یەکەمیان کاتێك ئیمام لە ڕۆژی جومعە لەسەر مینبەر دادەنیشیٚ، لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر(خوایان لیٚ ڕازی بێت) بەو جۆرە بوو، کاتێك گەیشتە خەلافەتی عوسمان(خوا لێی ڕازی بێت) و زۆربوون، عوسمان فەرمانی کرد بە بانگی سێیەم لە ڕۆژی جومعە، لە "الزوراء[١]" بانگەکە دەدرا، کارەکە لەسەر ئەوە جێگیر بوو.**

## ٨- دەروازەی: خوتبە بۆ نوێژی جومعە

**١٤٧٢-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: كَانَتْ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم خُطْبَتَانِ يَجْلِسُ بَيْنَهُمَا، يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيُذَكِّرُ النَّاسَ. [م٨٦٢]

**(م) لە جابری کوڕی سەمورەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دوو خوتبەی هەبوو لە نێوانیان دادەنیشت، قورئانی دەخوێند و بیری خەڵکی دەخستەوە.**

**١٤٧٣-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ، وَعَلاَ صَوْتُهُ، وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ، حَتَّى كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ، يَقُولُ: صَبَّحَكُمْ وَمَسَّاكُمْ! وَيَقُولُ: (**بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ**) وَيَقْرُنُ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى. وَيَقُولُ: (**أَمَّا بَعْدُ؛ فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ، وَخَيْرُ الْهُدَى هُدَى مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ**). ثُمَّ يَقُولُ: (**أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ، مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلأَهْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْناً أَوْ ضَيَاعاً فَإِلَيَّ وَعَلَيَّ**). [م٨٦٧]

---

[١] واتە: شوێنێکە لە مەدینە خۆرئاوای مزگەوتی نەبەوی—و

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری دەدا چاوەکانی سوور دەبوون و دەنگی بەرز دەبوو و تووڕەبوونی توند دەبوو، تا وەك ترسێنەری سوپایەك بێت بڵێت: بەیانی و ئێوارە بەسەر ئێوەدا دەدات، دەیفەرموو: **(ڕەوانە کراوم و من و قیامەت وەك ئەم دوانەین)**، دوو پەنجەی شایەتمان و ناوەندی هاومل دەکرد، هەروەها دەیفەرموو: **(پاشان، باشترین قسە کتێبەکەی خودایە و باشترین هیدایەت هیدایەتی محەمەدە، خراپترینی کاروبارەکان داهێنراوەکانن، هەموو بیدعەیەك گومڕاییە)**، پاشان دەیفەرموو: **(من بە هەموو باوەڕدارێك لە نەفسی خۆی لەپێشترم، هەر کەس ماڵێکی بەجێهێلا بۆ خانەوادەکەی، هەر کەس قەرزێك یان منداڵی وردی لەشوێن جێما بۆ لای من و لەسەر منە)**.

**١٤٧٤-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. فَكَانَتْ صَلاَتُهُ قَصْداً، وَخُطْبَتُهُ قَصْداً. [م٨٦٦]

(م) لە جابری کوڕی سەموورەوە، وتی: لەدوای پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) نوێژم دەکرد، نوێژەکەی مامناوەند و وتارەکەی مامناوەند.

## ٩- دەروازەی: گوێگرتن لە خوتبە لە ڕۆژی جومعە

**١٤٧٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: أَنْصِتْ، وَالإِمَامُ يَخْطُبُ، فَقَدْ لَغَوْتَ ). [خ٩٣٤/ م٨٥١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر لە ڕۆژی جومعە بە هاوەڵەکەی خۆتت وت: بێدەنگ بە، و ئیمام وتاری دەدا لەغوت ئەنجامداوە)**.

**١٤٧٦-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنِ اغْتَسَلَ، ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ، فَصَلَّى مَا قُدِّرَ لَهُ، ثُمَّ أَنْصَتَ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ خُطْبَتِهِ، ثُمَّ يُصَلِّي مَعَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى، وَفَضْلُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ). [م٨٥٧]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(هەر کەس خۆی شۆری و پاشان هات بۆ جومعە، چەندی بۆ قەدەر کرابێت نوێژی کرد، پاشان گوێیگرێت تا لە خوتبەکە دەبێتەوە، پاشان نوێژی لەگەڵ بکات، خودا لە گوناهی نێوان ئەو و جومعەکەی تر و سێ ڕۆژ زیادە خۆشدەبێت).**

## ١٠- دەروازەی: نوێژی "تحية المسجد" و ئیمام وتار بدات

**١٤٧٧**-(ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ يَخْطُبُ (إِذَا جاءَ أَحَدُكُمْ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ . أَوْ قَدْ خَرَجَ . فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ).

[خ١١٧٠/ م٨٧٥]

(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری دەدا فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە هاتن و ئیمام وتاری دەدا-یان هاتبووە دەرەوە[1]- با دوو ڕکات نوێژ بکات).**

## ١١- دەروازەی: ئەوەی لە نوێژی جومعە دەخوێنرێت

**١٤٧٨**- (م) عَنِ النعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ وَفِي الْجُمُعَةِ، بـ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى۝١﴾[الأعلى: ١]، وَ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ۝١﴾[الغاشية: ١].

قَالَ: وَإِذَا اجْتَمَعَ الْعِيدُ وَالْجُمُعَةُ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ، يَقْرَأُ بِهِمَا أَيْضاً فِي الصَّلاَتَيْنِ. [م٨٧٨]

(م) لە نیعمانی کوڕی بەشیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە دوو جەژنەکە و لە جومعەدا: (﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى۝١﴾ [الأعلى: ١] و ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ۝١﴾ [الغاشية: ١])ی دەخوێند.

---

[1] واتە: ئیمام لە وتارەکەی هاتبووە دەرەوە-و

وتی: گەر جەژن و جومعە لە یەك ڕۆژدا كۆببنەوە لە هەردوو نوێژەكەدا ئەو دوانەی دەخوێند.

## ١٢- دەروازەی: ئەوەی لە فەجری جومعەدا دەخوێنرێت

**١٤٧٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَقْرَأُ فِي الجُمُعَةِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ﴾[السَّجْدَةَ: ١- ٢]، وَ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ﴾[الإنسان: ١].
[خ٨٩١/ م٨٨٠]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعە (﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ﴾ [السَّجْدَةَ: ١- ٢]) و (﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ﴾[الإنسان: ١])ی دەخوێند.**

## ١٣- دەروازەی: نوێژ لەدوای جومعە

**١٤٨٠-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمُ الجُمُعَةَ؛ فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعاً)**. [م٨٨١]

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەكێك لە ئێوە نوێژی جومعەی كرد با چوار ركات بەدوایدا بكات).**

- زاد في رواية: **(فَإِنْ عَجِلَ بِكَ شَيْءٌ، فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ فِي الْمَسْجِدِ، وَرَكْعَتَيْنِ إِذَا رَجَعْتَ)**.

**لە ریوایەتێكدا ئەمە زیادكراوە: (گەر شتێك پەلەی لێكردی با دوو ركات لە مزگەوت بكات و دوو ركات كە گەڕایەوە).**

**١٤٨١-** (م) عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُمَرُ بْنُ عَطَاءِ بْنِ أَبِي الْخُوَارِ: أَنَّ نَافِعَ بْنَ جُبَيْرٍ أَرْسَلَهُ إِلَى السَّائِبِ ابْنِ أُخْتِ نَمِرٍ، يَسْأَلُهُ عَنْ شَيْءٍ رَآهُ مِنْهُ مُعَاوِيَةُ فِي الصَّلاَةِ، فَقَالَ: نَعَمْ صَلَّيْتُ مَعَهُ الْجُمُعَةَ فِي الْمَقْصُورَةِ، فَلَمَّا سَلَّمَ الإِمَامُ قُمْتُ فِي مَقَامِي، فَصَلَّيْتُ، فَلَمَّا دَخَلَ أَرْسَلَ إِلَيَّ فَقَالَ:

لاَ تَعُدْ لِمَا فَعَلْتَ، إِذَا صَلَّيْتَ الْجُمُعَةَ فَلاَ تَصِلْهَا بِصَلاةٍ، حَتَّى تَكَلَّمَ أَوْ تَخْرُجَ؛ فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَمَرَنَا بِذَلِكَ، أَنْ لاَ تُوصَلَ صَلاَةٌ بِصَلاَةٍ، حَتَّى نَتَكَلَّمَ أَوْ نَخْرُجَ. [م٨٨٣]

**(م) لە ئیبن جورەیجەوە، وتی: عومەری کوڕی عەتای کوڕی ئەبی خوار هەواڵی پێدام: نافیعی کوڕی جوبەیر رەوانەی کردووە بۆ لای سائیبی کوڕی ئوخت نەمیر، پرسیاری لێ بکات لە شتێك موعاویە لە نوێژدا لەوی بینیوە، وتی: بەڵێ، لە "المقصورة– ژووری تایبەت[1]" لەگەڵی نوێژی جومعەم کرد، کاتێك ئیمام سەلامیدایەوە لە شوێنەکەم هەستام و نوێژم کرد، کاتێك هاتە ژوورەوە نامەی بۆ ناردم: مەگەڕێوە بۆ ئەوەی ئەنجامت دا، گەر نوێژی جومعەت کرد مەیلکێنە بە نوێژێکی ترەوە تا قسە دەکەی یان دەچییە دەرەوە، چونکە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردین بەو کارە، نوێژ نەلکێنرێ بە نوێژەوە، تا قسە دەکەین یان دەچینە دەرەوە.**

## ١٤- دەروازەی: مۆڵەت بۆ ئامادەنەبوونی جومعە لە باراندا

**١٤٨٢**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحارِثِ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ لِمُؤَذِّنِهِ فِي يَوْمٍ مَطِيرٍ: إِذَا قُلْتَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، فَلاَ تَقُلْ: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، قُلْ: صَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ، فَكَأَنَّ النَّاسَ اسْتَنْكَرُوا، قَالَ: فَعَلَهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي، إِنَّ الْجُمُعَةَ عَزْمَةٌ، وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أُحْرِجَكُمْ، فَتَمْشُونَ فِي الطِّينِ وَالدَّحَضِ. [خ٩٠١ (٦١٦)/ م٦٩٩]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی حاریسەوە، وتی: ئیبن عەباس بە بانگوێژەکەی خۆی وت لە رۆژێکی باران: گەر وتت: "أشهد أن محمدا رسول الله" مەڵێ: "حيّ على الصلاة"، بڵێ: "صلّوا في بيوتكم– لە ماڵەکانتان نوێژ بکەن"، وەك ئەوەی خەڵکی لایان ناپەسەند بێت، وتی: ئەو کەسەی لە من باشتر و چاکترە ئەنجامیدا[2]، جومعە**

---

[1] سوڵتانەکان لە مزگەوت ژوورێکیان بە خۆیان تایبەت کرد نوێژی جومعەیان تێدا ئەنجام دەدا–و.

[2] واتە: پێغەمبەر(ﷺ)ئەو کارەی ئەنجامداوە–و

ئەرکێکی پێ لەسەر داگیراوە من لام ناپەسەند بوو ئێوە بهێنمە دەرەوە و بە قوڕ و خلیسکاندا بڕۆن.

## ١٥- دەروازەی: واجیبوونی جومعە و توندکردنەوە لە وازلێهێنانی

١٤٨٣- (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ وَأَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّهُمَا سَمِعَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ عَلَى أَعْوَادِ مِنْبَرِهِ: (**لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ**). [م٨٦٥]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی عومەر و ئەبی هورەیرەوە: ئەوان لە پێغەمبەری خودایان(ﷺ) بیست لەسەر تەختەی مینبەرەکەی دەیفەرموو: (**کۆمەڵێك وازهێنان لە جومعەکانیان وازلێدەهێنن یان خودا مۆر دەدات لە دڵیان، و پاشان دەچنە ریزی بێئاگایانەوە**).

١٤٨٤- (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لِقَوْمٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الْجُمُعَةِ: (**لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ رَجُلاً يُصَلِّي بِالنَّاسِ، ثُمَّ أُحَرِّقَ عَلَى رِجَالٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الْجُمُعَةِ بُيُوتَهُمْ**). [م٦٥٢]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە: پێغەمبەر(ﷺ) بە کۆمەڵێکی فەرموو لە جومعە دوادەکەوتن: (**ئەوەم بۆ دروست بوو فەرمان بکەم بە پیاوێك نوێژ بە خەڵکی بکات پاشان ماڵەکان بەسەر پیاوانێکدا بسوتێنم لە جومعە دوادەکەون**).

١٤٨٥- عَنْ أَبِي الْجَعْدِ الضَّمْرِيِّ ـ وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ ـ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ تَرَكَ ثَلاَثَ جُمَعٍ تَهَاوُناً بِهَا طَبَعَ اللهُ عَلَى قَلْبِهِ**).

* حسن صحيح. [د١٠٥٢/ ت٥٠٠/ ن١٣٦٨/ جه ١١٢٥/ مي١٦١٢]

لە ئەبی جەعدی زەمرییەوە -هاوەڵی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) هەبوو- پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەرکەس سێ جومعە وازلێبهێنێت وەك کەم و سووك تەماشاکردنی خودا دڵی مۆر دەکات**).

**١٤٨٦**– عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ؛ إِلاَّ أَرْبَعَةً: عَبْدٌ مَمْلُوكٌ، أَوِ امْرَأَةٌ، أَوْ صَبِيٌّ، أَوْ مَرِيضٌ**). [د١٠٦٧]

* صحيح.

**لە تاریقی کوڕی شیهابەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (جومعە حەقێکی پێویستە لەسەر هەر موسڵمانێك لە کۆمەڵێکدا، جگە لە چوار: بەندەیەکی بەموڵککراو، یان ئافرەت، یان منداڵ، یان نەخۆش).**

## ١٦- دەروازەی: حەرام کردنی کڕین و فرۆشتن لە کاتی جومعە

**١٤٨٧**– (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: يَحْرُمُ الْبَيْعُ حِينَئِذٍ.

وعَنْ عَطَاءٍ قَالَ: تَحْرُمُ الصِّنَاعَاتُ كُلُّهَا.

وعَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: إِذَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَهُوَ مُسَافِرٌ، فَعَلَيْهِ أَنْ يَشْهَدَ. [خ. الجمعة، باب ١٨]

**(خـ) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: لەو کاتەدا فرۆشتن حەرام دەبێت.**

**لە عەتاوە وتی: هەموو پیشەکان حەرام دەبن.**

**لە زوهرییەوە، وتی: کە لە ڕۆژی جومعە بانگوێژ بانگ دەدات و ئەو موسافیرە لەسەریەتی ئامادەی جومعە ببێت.**

## ١٧- دەروازەی: ڕووکردنە ئیمام لە کاتێکدا ئەو وتار دەدات

**١٤٨٨**– عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا اسْتَوَى عَلَى الْمِنْبَرِ، اسْتَقْبَلْنَاهُ بِوُجُوهِنَا. [ت٥٠٩]

* صحيح.

**لە ئیبن مەسعوودەوە، وتی: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر مینبەر ڕاستدەبوویەوە ڕووی خۆمان تێدەکرد.**

## ١٨- دەروازەی: خۆڕازاندنەوە بۆ ڕۆژی جومعە

١٤٨٩- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلامٍ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَا عَلَى أَحَدِكُمْ إِنْ وَجَدَ. أَوْ إِنْ وَجَدْتُمْ. أَنْ يَتَّخِذَ ثَوْبَيْنِ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ، سِوَى ثَوْبَيْ مِهْنَتِهِ).

* صحيح. [د١٠٧٨/ جه١٠٩٥]

له عەبدوڵای كوڕی سەلامەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیەرموو: **(لەسەر یەكێك لە ئێوە چی دەبێت گەر هەیبێت-یان: هەتانبێت- بۆ ڕۆژی جومعە دوو پۆشاك بپۆشێ، جگە لە دوو پۆشاكی كار و پیشەكەی[1]).**

## ١٩- دەروازەی: ناپەسەندی هەنگاو هەڵگرتن بەسەر گەردنی خەڵكدا لە ڕۆژی جومعە

١٤٩٠- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالنَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَخْطُبُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (اجْلِسْ فَقَدْ آذَيْتَ).

* صحيح. [د١١١٨/ ن١٣٩٨]

له عەبدوڵای كوڕی بوسرەوە، وتی: پیاوێك لە ڕۆژی جومعە هات هەنگاوی هەڵدەگرت بەسەر گەردنی خەڵكدا، پێغەمبەر(ﷺ) وتاری دەدا، فەرمووی: **(دانیشە، ئازارتدان).**

---

(١) واتە: پۆشاكێكی تایبەتی هەبێت-جیا لە پۆشاكی ئیش و كار- لە ڕۆژی جومعە بیپۆشێ، ئەمەش گرنگیدانە بە پاك و خاوێنی لە ڕۆژی جومعە-و

## ٢٠- دەروازەی: خەوەنوسكێ لە نوێژی جومعەدا[١]

**١٤٩١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ؛ فَلْيَتَحَوَّلْ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ إِلَى غَيْرِهِ**). [د١١١٩/ ت٥٢٦]

* صحيح.

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو، دەیفەرموو: (**گەر یەكێك لە ئێوە خەوەنوسكێی برد و ئەو لە مزگەوت بوو، با دانیشتنەكەی ئاڵوگۆڕ بكات بە دانیشتنێكی تر**).

---

[١] دروستتر ئەوە بوو دەروازەكە بەم جۆرە بێت: (خەوەنوسكێ لە گوێگرتن لە وتاری جومعە، یان خەوە نوسكێ لە چاوەڕوانی بۆ نوێژی جومعە)، چونكە فەرموودەكە باس لە دانیشتن دەكات، نەك نوێژ كردن، خودا زاناترە—و

## بەشی دووەم

# نوێژی دوو جەژنەکە

### ١- نوێژی جەژن بەر لە وتار

**١٤٩٢-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرَ رضي الله عنهما، يُصَلُّونَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ. [خ٩٦٣/ م٨٨٨]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر(خوایان لێ رازی بێت) نوێژی دوو جەژنەکەیان بەر لە وتارەکە ئەنجام دەدا.**

- وفي رواية للبخاري: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُصَلِّي فِي الأَضْحَى وَالْفِطْرِ، ثُمَّ يَخْطُبُ بَعْدَ الصَّلاَةِ. [خ٩٥٧]

**لە ریوایەتێکی بوخاریدا: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی جەژنی قوربان و رەمەزانی دەکرد، پاشان لەدوای نوێژەکە وتاری دەدا.**

**١٤٩٣-** (ق) عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: قَامَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ الْفِطْرِ فَصَلَّى، فَبَدَأَ بِالصَّلاَةِ ثُمَّ خَطَبَ، فَلَمَّا فَرَغَ نَزَلَ فَأَتَى النِّسَاءَ، فَذَكَّرَهُنَّ وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى يَدِ بِلاَلٍ، وَبِلاَلٌ بَاسِطٌ ثَوْبَهُ، يُلْقِي فِيهِ النِّسَاءُ الصَّدَقَةَ.
قُلْتُ لِعَطَاءٍ: زَكَاةَ يَوْمِ الْفِطْرِ؟ قَالَ: لاَ، وَلكِنْ صَدَقَةً يَتَصَدَّقْنَ حِينَئِذٍ تُلْقِي فَتَخَهَا، وَيُلْقِينَ. قُلْتُ: أَتُرَى حَقّاً عَلَى الإِمَامِ ذلِكَ يأْتِيهِنَّ وَيُذَكِّرُهُنَّ؟ قَالَ: إِنَّهُ لَحَقٌّ عَلَيْهِمْ، وَمَا لَهُمْ لاَ يَفْعَلُونَهُ؟. [خ٩٧٨ (٩٥٨)/ م٨٨٥]

**(ق) لە ئیبن جورەیجەوە، وتی: عەتا لە جابری کوڕی عەبدولڵاوە هەواڵی پێدام، وتی: گوێم لێ بوو دەیوت: لە رۆژی جەژنی رەمەزان پێغەمبەر(ﷺ) هەستا و نوێژی کرد، بە نوێژەکە دەستی پێکرد پاشان وتاری دا، کاتێك تەواو بوو دابەزی و هات بۆ**

لای ئافرەتـان، ئامۆژگـاری و بیرخسـتنەوەی پێـدان و ئـەو لەسـەر دەسـتی بـیلال شانیدادابوو، بیلال پۆشاکەکەی راخستبوو ئافرەتان صەدەقەیان بۆ هەڵدەدا.

وتم بە عەتا: زەکـاتی رۆژی جـەژن؟ وتـی: نـەخێر، بـەڵکو صـەدەقەیەك بـوو لـەو کاتـەدا دەیـانکرد، ئەڵقەکـەی دەسـتی هەڵـدەدا و خشـڵەکانیان هەڵـدەدا، وتم: ئایـا پێتوایە ئەوە لەسەر ئیمام حەق بێت، ئەو بێت و بیرخستنەوە و ئامۆژگاری ئافرەتـان بکات؟ وتی: ئەوە حەقە لەسەریان، ئەوانە چییانە ئەو کارە ئەنجام نادەن؟.

## ٢- دەروازەی: لە جەژندا بانگ و قامەت نییە

**١٤٩٤-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالاَ: لَمْ يَكُنْ يُؤَذَّنُ يَوْمَ الْفِطْرِ وَلاَ يَوْمَ الأَضْحَى. [خ٩٦٠/ م٨٨٦]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە، و جابری کـوڕی عەبـدوڵای ئەنصـارییەوە، ئـەوان وتیـان: رۆژی جەژنی رەمەزان و رۆژی جەژنی قوربان بانگ نەدەدرا.**

- زاد في رواية مسلم: قَالَ: أَخْبَرَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ: أَنْ لاَ أَذَانَ لِلصَّلاَةِ يَوْمَ الْفِطْرِ، حِينَ يَخْرُجُ الإِمَامُ وَلاَ بَعْدَمَا يَخْرُجُ، وَلاَ إِقَامَةَ، وَلاَ نِدَاءَ، وَلاَ شَيْءَ. لاَ نِدَاءَ يَوْمَئِذٍ وَلاَ إِقَامَةَ.

**لە ریوایەتەکەی موسلیمدا ئەمـە زیـاد بـووە: جـابری کـوڕی عەبـدوڵای ئەنصـاری هەواڵی پێدام: بۆ رۆژی جەژنی قوربان بانگ نییە کاتێك ئیمام دێتە دەرەوە، هەر بەو جۆرە لە دوای ئەوەی هاتووەتە دەرەوە، نە ئیقامە و نەبانگ کردن و نە هیچ شـتێك. لەو رۆژەدا بانگکردن و قامەت کردن نییە.**

## ٣- دەروازەی: پێش نوێژی جەژن و دوای نوێژی جەژن نوێژ نییە

**١٤٩٥-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى يَوْمَ الفِطْرِ رَكْعَتَيْنِ، لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلاَلٌ، فَأَمَرَهُنَّ بالصَّدَقَةِ، فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ، تُلْقِي المَرْأَةُ خُرْصَهَا وَسِخَابَهَا. [خ٩٦٤ (٩٨)/ م٨٨٤ (١٣)]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان دوو ڕکات نوێژی کرد، بەر لەو دووڕکاتە و دوای ئەو دوو ڕکاتە نوێژی نەکرد، پاشان هات بۆ لای ئافرەتان و بیلالی لەگەڵ بوو، فەرمانی پێکردن بە صەدەقە، ئەوانیش صەدەقانیان هەڵدەدا، ئافرەت ئەڵقە و ملوانکەی خۆی هەڵدەدا.

## ٤- دەروازەی: ئەوەی لە نوێژی دوو جەژنەکە دەخوێنرێ

**١٤٩٦-** (م) عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ قَالَ: سَأَلَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: عَمَّا قَرَأَ بِهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي يَوْمِ الْعِيدِ؟ فَقُلْتُ: بـ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ﴾[القمر: ١]، وَ﴿قٓ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ①﴾[ق: ١]. [م٨٩١]
[وانظر: ١٤٧٨].

(م) لە ئەبی واقیدی لەیسییەوە، وتی: عومەری کوڕی خەتاب پرسیاری لێ کردم دەربارەی ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی جەژن خوێندوویەتی؟ وتم: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ﴾[القمر: ١] و ﴿قٓ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ①﴾[ق: ١].

## ٥- دەروازەی: چوونەدەرەوەی ئافرەتان بۆ نوێژگە(المصلى)[1]

**١٤٩٧-** (ق) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: أُمِرْنَا أَنْ نُخْرِجَ الْحُيَّضَ يَوْمَ الْعِيدَيْنِ، وَذَوَاتِ الْخُدُورِ، فَيَشْهَدْنَ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَدَعْوَتَهُمْ، وَيَعْتَزِلُ الْحُيَّضُ عَنْ مُصَلاَّهُنَّ. قَالَتِ امْرَأَةٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِحْدَانَا لَيْسَ لَهَا جِلْبَابٌ؟ قَالَ: (لِتُلْبِسْهَا صَاحِبَتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا). [خ٣٥١ (٣٢٤)/ م٨٩٠]

(ق) لە ئوم عەتییەوە، وتی: فەرمانمان پێکرا حەیزداران و کچان لە ڕۆژی دوو جەژنەکە ببەینە دەرەوە و کۆمەڵی موسڵمانان و دوعایان ببینن، حەیزداران لە

---

[1] نوێژگە(المصلى): شوێنێك بوو لە دەرەوەی شار خەڵکی بۆ نوێژی دوو جەژنەکە و نوێژە بارانە تیایدا کۆدەبوونەوە٠—و.

نوێژگەی خۆیان کەنارگیر بن، ئافرەتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، یەکێك لە ئێمە سەرپۆشی نییە؟ فەرمووی: **(با هاوەڵەکەی لە سەرپۆشی خۆی بە ئەو بپۆشێ)**.

## ٦- دەروازەی: یاری و گۆرانی لە ڕۆژەکانی جەژن

**١٤٩٨-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَعِنْدِي جارِيَتَانِ، تُغَنِّيَانِ بِغِنَاءِ بُعَاثَ، فَاضْطَجَعَ عَلَى الْفِرَاشِ وَحَوَّلَ وَجْهَهُ. وَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَانْتَهَرَنِي، وَقَالَ: مِزْمَارَةُ الشَّيْطَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم! فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: **(دَعْهُمَا)**. فَلَمَّا غَفَلَ غَمَزْتُهُمَا فَخَرَجَتَا.

وَكَانَ يَوْمَ عِيدٍ، يَلْعَبُ فيه السُّودَانُ بِالدَّرَقِ وَالحِرَابِ، فَإِمَّا سَأَلْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، وَإِمَّا قَالَ: **(تَشْتَهِينَ تَنْظُرِينَ)**، فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَأَقَامَنِي وَرَاءَهُ، خَدِّي عَلَى خَدِّهِ، وَهُوَ يَقُولُ: **(دُونَكُمْ يَا بَنِي أَرْفِدَةَ)**، حَتَّى إِذَا مَلِلْتُ، قَالَ: **(حَسْبُكِ)** ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: **(فَاذْهَبِي)**.

[خ٩٤٩ و٩٥٠ (٤٥٤)/ م٨٩٢]

**(ق) لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لام و دوو جاریەم لە لا بوو بە گۆرانی "بُعاث"[1] گۆرانیان دەوت، لەسەر جێگەکە ڕاکشا و ڕووی خۆی وەرچەرخان، ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە و هەڕشەی لێ کردم و وتی: گۆرانی شەیتان لای پێغەمبەر(ﷺ)! پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕووی لێکرد و فەرمووی: (لێیانگەڕێ)، کاتێك بێئاگا بوو چاوم لێ داگرتن هەردوو جاریەکە چوونە دەرەوە.**

**ئەو ڕۆژە جەژن بوو، ڕەشپێستان بە قەڵغان و حەربە یاریان دەکرد، یان داوام لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، یان خۆی فەرمووی: (حەز دەکەی تەماشا بکەی؟) وتم: بەڵێ، لەدوای خۆیەوە ڕایوەستاندم، گۆنام لەسەر گۆنای بوو، ئەو دەیفەرموو: (ئادەی، ئەی بەنی ئەرفیدە)، تا وەڕس بووم، فەرمووی: (بەستە؟)، وتم: بەڵێ، فەرمووی: (دە بڕۆ).**

---

[1] **"بُعاث": یان ڕۆژی "بُعاث": دوایین جەنگی نێوان ئەوس و خەزرەج بوو لە سەردەمی نەفامی—و.**

▪ وفي رواية لهما: قَالَتْ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ وَعِنْدِي جارِيَتَانِ مِنْ جَوَارِي الأَنْصَارِ، تُغَنِّيَانِ بِمَا تَقَاوَلَتِ الأَنْصَارُ يَوْمَ بُعَاثَ، قَالَتْ: وَلَيْسَتَا بِمُغَنِّيَتَيْنِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمَزَامِيرُ الشَّيْطَانِ فِي بَيْتِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ وَذلِكَ فِي يَوْمِ عِيدٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يَا أَبَا بَكْرٍ، إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيداً، وَهذَا عِيدُنَا). [خ٩٥٢]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان، عائیشە وتی: ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە دوو جاریەم لە جاریەکانی ئەنصار لە لا بوو، گۆرانیان دەوت بەوەی ئەنصار لە رۆژی "بعاث"دا دەیانوت، عائیشە وتی: ئەوان گۆرانیبێژ نەبوون، ئەبوبەکر وتی: ئایا گۆرانی شەیتان لەماڵی پێغەمبەری خودایە(ﷺ)؟ ئەوەش لە رۆژی جەژندا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی ئەبوبەکر، هەموو گەلێك جەژنێکی هەیە، ئەمە جەژنی ئێمەیە).**

**١٤٩٩**– (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَسْتُرُنِي بِرِدَائِهِ، وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى الحَبَشَةِ يَلْعَبُونَ فِي المَسْجِدِ، حَتَّى أَكُونَ أَنَا الَّتِي أَسْأَمُ، فَاقْدُرُوا قَدْرَ الجَارِيَةِ الحَدِيثَةِ السِّنِّ، الحَرِيصَةِ عَلَى اللَّهْوِ. [خ٥٢٣٦ (٤٥٤)/ م٨٩٢/١٨]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی بە کراسەکەی منی دادەپۆشی، من تەماشای حەبەشییەکانم دەکرد لە مزگەوت یاریان دەکرد، تا من وەڕس دەبووم، رەچاوی کچانی تەمەن منداڵ بکەن کە هێشتا حەز بە یاری دەکەن.**

## ٧- دەروازەی: خواردن لە رۆژی جەژن بەر لە دەرچوون

**١٥٠٠**– (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لاَ يَغْدُو يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَأْكُلَ تَمَرَاتٍ. وَيَأْكُلُهُنَّ وِتْراً. [خ٩٥٣]

**(خ) لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) رۆژی جەژنی رەمەزان بەیانی نەدەکردەوە تا چەند دەنکە خورمایەکی دەخوارد، بە ویتر دەیخواردن.**

**١٥٠١**– عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لاَ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ، وَلاَ يَطْعَمُ يَوْمَ الأَضْحَى حَتَّى يُصَلِّيَ. [ت٥٤٢/ جه١٧٥٦/ مي١٦٤١]

* صحيح.

لە بورەیدەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان نەدەچووە دەرەوە تا شتێکی دەخوارد، لە ڕۆژی جەژنی قوربانیش نەیدەخوارد تا نوێژی دەکرد.

## ٨- دەروازەی: ناپەسەندی هەڵگرتنی چەك لە جەژن و لە حەرەم

**١٥٠٢-** (خ) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ، حِينَ أَصَابَهُ سِنَانُ الرُّمْحِ فِي أَخْمَصِ قَدَمِهِ، فَلَزِقَتْ قَدَمُهُ بِالرِّكَابِ، فَنَزَلْتُ فَنَزَعْتُهَا، وَذَلِكَ بِمِنًى، فَبَلَغَ الحَجَّاجَ، فَجَعَلَ يَعُودُهُ، فَقَالَ الحَجَّاجُ: لَوْ نَعْلَمُ مَنْ أَصَابَكَ؟ فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَنْتَ أَصَبْتَنِي، قَالَ: وَكَيْفَ؟ قَالَ: حَمَلْتَ السِّلاَحَ فِي يَوْمٍ لَمْ يَكُنْ يُحْمَلُ فِيهِ، وَأَدْخَلْتَ السِّلاَحَ الحَرَمَ، وَلَمْ يَكُنِ السِّلاَحُ يُدْخَلُ الحَرَمَ. [خ٩٦٦]

(خ) لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: لەگەڵ ئیبن عومەر بووم، کاتێك نووکی تیرێك بەر چاڵایی ژێرپێی کەوت، پێی لە ئاوزەنگییەکە هەڵخلیسکا، دابەزیم دەرمهێنا، ئەوەش لە مینا بوو، ئەو هەواڵە بە حەجاج گەیشت، هات بۆ لای، حەججاج وتی: گەر بمانزانیبا کێ تۆی پێکاوە؟ ئیبن عومەر وتی: تۆ منت پێکاوە، وتی: چۆن؟ وتی: لە ڕۆژێکدا چەکت هەڵگرتووە چەکی تێدا هەڵنەدەگیرا، چەکت بردە ناو حەرەمەوە، چەك نەدەبرا حەرەمەوە.

## ٩- دەروازەی: ڕێگە گۆڕین لە ڕۆژی جەژن

**١٥٠٣-** (خ) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا كَانَ يَوْمُ عِيدٍ خَالَفَ الطَّرِيقَ. [خ٩٨٦]

(خ) لە جابرەوە، وتی: کە ڕۆژی جەژن دەبوو پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەکەی دەگۆڕی.

**١٥٠٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا خَرَجَ يَوْمَ الْعِيدِ فِي طَرِيقٍ، رَجَعَ فِي غَيْرِهِ. [ت٥٤١/ جه١٣٠١/ مي١٦٥٤]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: کە پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی جەژن بە ڕێگەیەکدا دەچووە دەرەوە بە ڕێگەیەکی تردا دەگەڕایەوە.

## ١٠- دەروازەی: فەزڵی دەی زیلحەجە

**١٥٠٥-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (**مَا الْعَمَلُ فِي أَيَّامِ الْعَشْرِ أَفْضَلَ مِنَ الْعَمَلِ فِي هذِهِ**)، قَالُوا: وَلاَ الْجِهَادُ؟ قَالَ: (**وَلاَ الْجِهَادُ، إِلاَّ رَجُلٌ خَرَجَ يُخَاطِرُ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَلَمْ يَرْجِعْ بِشَيءٍ**). [خ٩٦٩]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: (کار لە ڕۆژەکان باشتر و چاکتر نییە لە کار لەمانەدا[1])، وتیان جیهادیش؟ (فەرمووی جیهادیش، مەگەر پیاوێك نەفس و ماڵی خۆی بخاتە بەر مەترسی و بە شتێکەوە نەگەڕێتەوە).**

## ١١- دەروازەی: کۆبوونەوەی جەژن و جومعە

**١٥٠٦-** (ق) عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ ـ مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ ـ: أَنَّهُ شَهِدَ الْعِيدَ يَوْمَ الأَضْحَى مَعَ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ، فَصَلَّى قَبْلَ الخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَدْ نَهَاكُمْ عَنْ صِيَامِ هذَيْنِ الْعِيدَيْنِ: أَمَّا أَحَدُهُمَا فَيَوْمُ فِطْرِكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ، وَأَمَّا الآخَرُ فَيَوْمَ تَأْكُلُونَ نُسُكَكُمْ. [خ٥٥٧١ (١٩٩٠)/ م١١٣٧]

**(ق) لە ئەبی عوبەیدەوە -مەولای ئیبن ئەزهەر- ئەو لە ڕۆژی جەژنی قوربان لەگەڵ عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی ڕازی بێت) ئامادە بوو، بەر لە وتارەکە نوێژی کرد، پاشان وتاری بۆ خەڵك دا، وتی: ئەی خەڵکینە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی لێکردن لە ڕۆژووی ئەم دوو جەژنە: یەکێکیان ڕۆژی جەژنتانە لە ڕۆژووەکەتانەوە، ئەویتریان ڕۆژێکە قوربانییەکانی خۆتانی تێدا دەخۆن.**

- وعند البخاري قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: ثُمَّ شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، فَكَانَ ذلِكَ يَوْمَ الجُمُعَةِ، فَصَلَّى قَبْلَ الخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ هذَا يَوْمٌ قَدِ اجْتَمَعَ لَكُمْ فِيهِ عِيدَانِ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْتَظِرَ الجُمُعَةَ مِنْ أَهْلِ الْعَوَالِي فَلْيَنْتَظِرْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَرْجِع فَقَدْ أَذِنْتُ لَهُ. [خ٥٥٧٢]

---

[1] واتە: دە ڕۆژی یەکەمی زیلحەجە-و.

لای بوخاری، ئەبو عوبەید وتی: پاشان جەژنم لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەففان بینی، ئەوە لە رۆژی جومعەدا بوو، بەر لە خوتبەکە نوێژی کرد، پاشان وتاری دا و وتی: ئەی خەڵکینە، لەم رۆژەدا دوو جەژنتان بۆ کۆبووەتەوە، هەر کەس پێیخۆشە لە ئەهلی "العوالي[1]" با چاوەڕوان بێت، هەر کەسیش پێیخۆشە بگەڕێتەوە من مۆڵەتم داوە.

**١٥٠٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**قَدْ اجْتَمَعَ فِي يَوْمِكُمْ هَذَا عِيدَانِ؛ فَمَنْ شَاءَ أَجْزَأَهُ مِنَ الْجُمُعَةِ، وَإِنَّا مُجَمِّعُونَ**). [د١٠٧٣/ جه١٣١١]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە، فەرمووی: **(لەم رۆژەی ئێوەدا دوو جەژن کۆبوونەتەوە، هەر کەس بخوازێت جێگەی جومعەکەی بۆ دەگرێتەوە، ئێمە کۆمان کردوونەتەوە).**

## ١٢- دەروازەی: گەر جەژنی لەدەستچوو

**١٥٠٨-** (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أنه أَمَرَ مَوْلَاهُمْ ابْنَ أَبِي عُتْبَةَ بِالزَّاوِيَةِ، فَجَمَعَ أَهْلَهُ وَبَنِيهِ، وَصَلَّى كَصَلَاةِ أَهْلِ الْمِصْرِ وَتَكْبِيرِهِمْ. [خ. كتاب العيدين، باب ٢٥]

(خ) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: ئەو فەرمانی بە مەولاکەیان ئیبن ئەبی عوتبە کرد، خانەوادە و کوڕەکانی لە زاویەکە[2] کۆکردەوە، وەك نوێژ و تەکبیری ئەهلی مصر نوێژی کرد.

**١٥٠٩-** عَنْ أَبِي عُمَيْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ عُمُومَةٍ لَهُ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، أَنَّ رَكْباً جَاؤُوا إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يَشْهَدُونَ أَنَّهُمْ رَأَوْا الْهِلَالَ بِالْأَمْسِ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يُفْطِرُوا، وَإِذَا أَصْبَحُوا أَنْ يَغْدُوا إِلَى مُصَلَّاهُمْ. [د١١٥٧/ ن١٥٥٦/ جه١٦٥٣]

* صحيح.

---

[1] خەڵکی دەرەوەی مەدینە لە ئاراستەی رۆژهەڵات و رۆژهەڵاتی باشووری مەدینەوە-و.

[2] زاویە: مزگەوتێکی بچووك بووە لە ماڵەکەدا-و.

لە ئەبی عومەیری کوڕی ئەنەسەوە، لە مامێکییەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، دەستەیەك هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) شایەتیان دا ئەوان دوێنێ مانگیان بینی، فەرمانی پێکردن ڕۆژوو بشکێنن، کە ڕۆژیان لێبوویەوە بێن بۆ نوێژگە(مصلی)کانیان.

## ١٣- دەروازەی: ڕۆیشتن بۆ جەژن بەپێ

**١٥١٠**- عَنِ عَلِيٍّ قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ أَنْ تَخْرُجَ إِلَى الْعِيْدِ مَاشِياً، وأَنْ تَأْكُلَ قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ.

* حسن. [ت٥٣٠، جه١٢٩٦]

لە عەلییەوە، وتی: سوننەتە بە ڕۆیشتنی پێیان بچیت بۆ جەژن، هەروەها بەرلەوەی بچییە دەرەوە خواردن بخۆی[(١)].

## ١٤- دەروازەی: "الله أكبر" کردن لە نوێژی دوو جەژنەکەدا

**١٥١١**- عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُكَبِّرُ فِي الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى: فِي الْأُولَى: سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ، وَفِي الثَّانِيَةِ: خَمْساً. [د١١٤٩/ جه١٢٨٠]

* صحيح.

لە عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربانندا "الله أكبر"ی دەکرد، لە رکاتی یەکەمدا حەوت "الله أكبر"، لە دووەمیاندا پێنج.

**١٥١٢**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (التَّكْبِيرُ فِي الْفِطْرِ سَبْعٌ فِي الْأُولَى، وَخَمْسٌ فِي الْآخِرَةِ، وَالْقِرَاءَةُ بَعْدَهُمَا كِلْتَيْهِمَا). [د١١٥١]

* حسن.

---

(١) مەبەست خواردنە لە جەژنی ڕەمەزاندا وەك لە فەرموودەی (١٥٠٠ و ١٥٠١)دا هاتووە-و.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ("الله أكبر" لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان حەوت لە ڕکاتی یەکەم و پێنج لە ڕکاتی کۆتایی، لەدوای ئەو دوانە خوێندنەوەیە[1] لە هەردوو ڕکاتەکەدا).**

**١٥١٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّهُ كَانَ يُكَبِّرُ مِنْ غَدَاةِ عَرَفَةَ، إِلَى صَلاَةِ العَصْرِ مِنْ آخِرِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ. [ك١١١٣]

**لە ئیبن عەباسەوە: ئەو بەیانی عەرەفە "الله أكبر"ی دەکرد تا نوێژی عەصر لە دوایین ڕۆژ لە ڕۆژەکانی تەشریق.**

## ١٥- دەروازەی: وتاری جەژن

**١٥١٤-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم نُووِلَ يَوْمَ الْعِيدِ قَوْساً فَخَطَبَ عَلَيْهِ. [د١١٤٥]

* حسن.

**لە بەرائی کوڕی عازیبەوە: ڕۆژی جەژن کەوانێك درا بە پێغەمبەر(ﷺ) وتاری لەسەر دا[2].**

**١٥١٥-** عَنْ عُبَيْدِ الله بْنِ عَبْدِ الله بْنِ عُتْبَةَ قَالَ: السُّنَّةُ فِي تَكْبِيرِ يَوْمِ الأَضْحَى ÷ عَلَى الْمِنْبَرِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ: أَنْ يَبْتَدِئَ الإِمَامُ قَبْلَ الْخُطْبَةِ وَهُوَ قَائِمٌ عَلَى الْمِنْبَرِ بِتِسْعِ تَكْبِيرَاتٍ تَتْرَى لاَ يَفْصِلُ بَيْنَهَا بِكَلاَمٍ، ثُمَّ يَخْطُبُ، ثُمَّ يَجْلِسُ جَلْسَةً ثُمَّ يَقُومُ فِي الْخُطْبَةِ الثَّانِيَةِ فَيَفْتَتِحُهَا بِسَبْعِ تَكْبِيرَاتٍ تَتْرَى لاَ يَفْصِلُ بَيْنَهَا بِكَلاَمٍ ثُمَّ يَخْطُبُ.

**لە عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عوتبەوە، وتی: سوننەت لە "الله أكبر"ی ڕۆژی جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزان لەسەر مینبەر بەر لە خوتبە: ئەوەیە ئیمام**

---

[1] واتە: خوێندنی سورەتی فاتیحە و بڕێك قورئان لەدوای فاتیحە-و.

[2] واتە: کەوانەکەی گرت بە دەستەوە و خۆی دا بە سەریدا و وتاری دا-و.

بەر لە خوتبە-لە کاتێکدا ئەو بە پێوەیە و لەسەر مینبەرە- بە نۆ "الله أكبر"ی یەك لەدوای یەك دەست پێ بکات و قسە نەخاتە نێوانیانەوە، پاشان وتار بدات، پاشان دانیشتنێك دابنیشێت، پاشان هەستێت بۆ وتاری دووەم و دیسان بە نۆ "الله أكبر"ی یەك لەدوای یەك بیکاتەوە و قسە نەخاتە نێوانیانەوە، پاشان وتار بدات.

- وفي رواية: ثُمَّ يَدْعُو وَيُكَبِّرُ بَعْدُ مَا بَدَا لَهُ. [هق/٣/٢٩٩]

لە ریوایەتێکدا: پاشان دوعا بکات و چەند دەتوانێ "الله أكبر" بکات.

## ١٦- دەروازەی: دانیشتن بۆ گوێگرتن لە خوتبە

**١٥١٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ السَّائِبِ قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْعِيدَ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ قَالَ: (**إِنَّا نَخْطُبُ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَجْلِسَ لِلْخُطْبَةِ فَلْيَجْلِسْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَذْهَبَ فَلْيَذْهَبْ**). [د١١٥٥/ ن١٥٧٠/ جه١٢٩٠]

* صحيح مرسل.

لە عەبدوڵای کوڕی سائیبەوە، وتی: لە جەژندا لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئامادە بووم، کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: (**ئێمە خوتبە دەدەین، کێ پێیخۆشە بۆ خوتبەکە دابنیشێ با دابنیشێت، کێ پێیخۆشە بڕوات با بڕوات**).

## ١٧- دەروازەی: کاتی نوێژی جەژن

**١٥١٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ . صَاحِبِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم . أنه خرج مَعَ النَّاسِ فِي يَوْمِ عِيدِ فِطْرٍ أَوْ أَضْحَى، فَأَنْكَرَ إِبْطَاءَ الْإِمَامِ، فَقَالَ: إِنَّا كُنَّا قَدْ فَرَغْنَا سَاعَتَنَا هَذِهِ، وَذَلِكَ حِينَ التَّسْبِيحِ. [د١١٣٥/ جه١٣١٧]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی بوسرەوە-هاوەڵی پێغەمبەری خودا(ﷺ)- ئەو لە ڕۆژی جەژنی قوربان یان ڕەمەزان لەگەڵ خەڵك ڕۆیشتە دەرەوە، دواکەوتن و شێنەیی

ئیمامی لا ناپەسەند بوو، ئەو وتی: ئێمە لەم ساتە بووبووینەوە[1]، ئەوەش کاتی نوێژی چێشتنگاو.

## ١٨- دەروازەی: نوێژی جەژن لە مزگەوت لە ڕۆژی باراندا

١٥١٨- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ التَّيْمِيِّ قَالَ: مُطِرْنَا فِي إِمَارَةِ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ عَلَى الْمَدِينَةِ مَطَراً شَدِيداً لَيْلَةَ الْفِطْرِ، فَجَمَعَ النَّاسَ فِي الْمَسْجِدِ فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَى الْمُصَلَّى الَّذِي يُصَلَّى فِيهِ الْفِطْرُ وَالأَضْحَى، ثُمَّ قَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ: قُمْ فَأَخْبِرِ النَّاسَ مَا أَخْبَرْتَنِي، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَامِرٍ: إِنَّ النَّاسَ مُطِرُوا عَلَى عَهْدِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ فَامْتَنَعَ النَّاسُ الْمُصَلَّى، فَجَمَعَ عُمَرُ النَّاسُ فِي الْمَسْجِدِ فَصَلَّى بِهِمْ، ثُمَّ قَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَخْرُجُ بِالنَّاسِ إِلَى الْمُصَلَّى يُصَلِّي بِهِمْ لأَنَّهُ أَرْفَقُ بِهِمْ وَأَوْسَعُ عَلَيْهِمْ، وَإِنَّ الْمَسْجِدَ كَانَ لاَ يَسَعُهُمْ، قَالَ: فَإِذَا كَانَ هَذَا الْمَطَرُ فَالْمَسْجِدُ أَرْفَقُ. [هق٣/٣١٠]

لە عوسمانی کوڕی عبدالرحمنی تەیمییەوە، وتی: لە ئەمارەتی ئەبانی کوڕی عوسمان لەسەر مەدینە لە شەوی جەژنی ڕەمەزان بارانێکی توند و لێزمەمان بۆ باری، خەڵکی لە مزگەوت کۆبوونەوە و نەڕۆیشتنە دەرەوە بۆ ئەو نوێژگە(مصلى)ی نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربانی لێ دەکرا، پاشان بە عەبدوڵای کوڕی عامیری کوڕی ڕەبیعەی وت: هەستە ئەوەی هەواڵت بە مندا بە خەڵکی هەواڵ بدە، عەبدوڵای کوڕی عامیر وتی: لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی ڕازی بێت) خەڵکی بارانیان بۆ باری، بۆیە خەڵکی نەچوون بۆ نوێژگە، عومەر خەڵکی لە مزگەوت کۆکردەوە و نوێژی پێ کردن، پاشان لەسەر مینبەرەکە وەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەڵکی دەبردە دەرەوە بۆ نوێژگە و نوێژی پێ دەکردن، چونکە بۆ ئەوان لەسەریان باشتر و بەرینتر بوو، مزگەوت جێگەی ئەوانی تێدا نەدەبوویەوە، وتی: گەر ئەم بارانە هەبووایە مزگەوت بۆ ئەوان باشتر بوو.

---

[1] واتە: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەر لەم کاتەدا لە نوێژ بووبووینەوە، ئەو بە ناپەسەندی بینی ئیمامەکەیان داکەوتووە و لە نوێژەکە و وتارەکە شێنەییە—و.

## ١٩- دەروازەی: خۆشۆرین بۆ جەژن

**١٥١٩-** عَنْ مَالِك، عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَغْتَسِلُ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَغْدُوَ إِلَى الْمُصَلَّى. [ط٤٢٨]

* إسناده صحيح.

**لە مالیکەوە، لە نافیعەوە: لە ڕۆژی جەژنی قوربان ئیبن عومەر خۆی دەشۆری بەرلەوەی بەیانی بچێت بۆ نوێژگە(مصلی).**

## ٢٠- دەروازەی:جەژنەکانی موسڵمانان

**١٥٢٠-** عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْمَدِينَةَ وَلَهُمْ يَوْمَانِ يَلْعَبُونَ فِيهِمَا، فَقَالَ: (**مَا هَذَانِ الْيَوْمَانِ**) ؟ قَالُوا: كُنَّا نَلْعَبُ فِيهِمَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ اللهَ قَدْ أَبْدَلَكُمْ بِهِمَا خَيْراً مِنْهُمَا: يَوْمَ الْأَضْحَى، وَيَوْمَ الْفِطْرِ**). [د١١٣٤/ ن١٥٥٥]

* صحيح.

**لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ مەدینە، ئەوان دوو ڕۆژیان هەبوو یاریان تێدا دەکرد، فەرمووی: (ئەم دوو ڕۆژە چین؟)، وتیان: لە سەردەمی جاهیلیدا یاریمان تێدا دەکردن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودا بە باشتر و چاکتر بۆ ئێوەی ئاڵوگۆڕ کردووە: ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان).**

# بەشی سێیەم

## نوێژی ڕۆژگیران

### ١- خۆر و مانگ دوو ئایەتن

**١٥٢١-** (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ مِنَ النَّاسِ، وَلكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَقُومُوا فَصَلُّوا)**. [خ١٠٤١/ م٩١١].

**(ق) لە ئەبی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خۆر و مانگ بۆ مردنی هیچ کەس لە خەڵکی ناگیرێن، بەڵکو دوو ئایەتن لە ئایەتەکانی خودا، گەر ئەو دوانەتان بینی بگیرێن هەستن نوێژ بکەن.**

### ٢- دەروازەی: سیفەتی نوێژی خۆرگیران

**١٥٢٢-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالنَّاسِ، فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ما فَعَلَ فِي الأُولَى، ثُمَّ انْصَرَفَ، وَقَدِ انْجَلَتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ:

**(إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، لاَ يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذلِكَ فَادْعُوا اللهَ، وَكَبِّرُوا وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا)**. ثُمَّ قَالَ: **(يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، واللهِ، مَا مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرُ مِنَ اللهِ، أَنْ يَزْنِيَ عَبْدُهُ أَوْ تَزْنِيَ أَمَتُهُ. يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللهِ لَوْ تَعْلَمُونَ ما أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً)**. [خ١٠٤٤/ م٩٠١]

(ق) لــە عائیشــەوە، وتــی: لــە ســەردەمی پێغەمبــەری خــودا(ﷺ) خــۆر گــیرا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی بە خەڵك كرد، بە پێوە وەستا و وەستانی درێژ كردەوە، پاشان ركووعی برد و ركووعی درێژ كردەوە، پاشان بەرزبوویەوە و بە پێوە وەستا و درێژی كردەوە، كەمتر لە وەستانی یەكەمجاری، پاشان رۆیشتەوە ركووع و ركووعی درێژە پێدا، كەمتر لە ركووعی یەكەمی، پاشان سوژدەی برد و سوژدەی درێژ كردەوە، پاشان لە ركاتی دووەم ئەوەی ئەنجامدا لە ركاتی یەكەم ئەنجامی دابوو، پاشان سەلامیدایەوە، و خۆر رۆشن بووبوویەوە، وتاری بۆ خەڵكی دا، و حەمد و سەنای خودای كرد و پاشان فەرمووی:

**(خۆر و مانگ دوو ئایەتن لە ئایەتەكانی خودا، بۆ مردن و ژیانی هیچ كەس ناگیرێن، گەر ئەوەتان بینی داوا لە خودا بكەن و "الله أكبر" بكەن و نوێژ بكەن و صەدەقە بكەن)**، پاشان فەرمووی: **(ئەی ئومەتی محەمەد، سوێند بە خودا، هیچ كەس لە خودا بەغیرەتتر نییە، بەندەكەی، یان كەنیزەكەكەی زینا بكات، ئەی ئومەتی محەمەد، سوێند بە خودا گەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بیزانن كەم پێ دەكەنین و زۆر دەگریان)**.

**١٥٢٣-** (م) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَفَزِعَ، فَأَخْطَأَ بِدِرْعٍ، حَتَّى أُدْرِكَ بِرِدَائِهِ بَعْدَ ذَلِكَ. قَالَتْ: فَقَضَيْتُ حَاجَتِي، ثُمَّ جِئْتُ وَدَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَائِماً، فَقُمْتُ مَعَهُ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ، حَتَّى رَأَيْتُنِي أُرِيدُ أَنْ أَجْلِسَ، ثُمَّ أَلْتَفِتُ إِلَى الْمَرْأَةِ الضَّعِيفَةِ، فَأَقُولُ: هَذِهِ أَضْعَفُ مِنِّي، فَأَقُومُ، فَرَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، حَتَّى لَوْ أَنَّ رَجُلاً جَاءَ خُيِّلَ إِلَيْهِ أَنَّهُ لَمْ يَرْكَعْ. [م٩٠٦]

(م) لە ئەسمای كچی ئەبوبەكرەوە، وتی: لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) خۆرگیرا، ترس رووی لێكرد بە درعێك رووی خۆی داپۆشی تا لە دوای ئەوە بە كراسەی

پیاگەیشت، وتی: پێویستی خۆم جێبەجێ کرد و پاشان هاتم و چوومە ناو مزگەوت، پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی بە پێوە، منیش لەگەڵی بە پێوە وەستام، بەپێوە وەستانی درێژە پێدا تا منت دەبینی دەمویست دابنیشم، پاشان لام دەکردەوە بە لای ئافرەتە لاوازەکەدا و دەموت ئەمە لە من لاوازترە، بۆیە بە پێوە دەوەستام، رکووعی برد و رکووع بردنی درێژەپێدا، پاشان سەری بەرزکردەوە و بەپێوە وەستا و وەستان بە پێوەی درێژە پێدا، تا پیاوێك بهاتبایە خەیاڵی ئەوەی بۆ دروست دەبوو هێشتا پێغەمبەر رکووعی نەبردووە.

## ٣- دەروازەی: ئەو کەسەی دەڵێت زۆرتر لە رکووعێك هەیە لە رکاتێکدا

١٥٢٤- (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُ صَلَّى فِي كُسُوفٍ، قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ سَجَدَ. قَالَ: وَالأُخْرَى مِثْلُهَا. [م٩٠٩]

(م) لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): ئەو لە خۆرگیراندا نوێژی کرد، قورئانی خوێند و پاشان رکووعی برد، پاشان قورئانی خوێند و پاشان رکووعی بردەوە، پاشان قورئانی خوێند و پاشان رکووعی بردەوە، پاشان قورئانی خوێند و پاشان رکووعی بردەوە، پاشان سوژدەی برد، وتی: رکاتی دووەمیشیان هەر بە شێوەی ئەوە.

- وفي رواية قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، حِينَ كَسَفَتِ الشَّمْسُ، ثَمَانَ رَكَعَاتٍ، فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ. [م٩٠٨]

لە ریوایەتێکدا وتی: کاتێ خۆرگیرا پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کرد، هەشت رکووعی[1] لە چوار سوژدەدا برد.

---

[1] یان هەشت رکاتی لە چوار سوژدەدا برد-و.

## ٤- دەروازەی: ئەوەی لە کاروباری بەهەشت و ئاگر لە نوێژی خۆرگیران بۆ پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" خرایە روو

**١٥٢٥-** (خ) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى صَلاَةَ الْكُسُوفِ، فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ، فَسَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَقَالَ: (**قَدْ دَنَتْ مِنِّي الْجَنَّةُ، حَتَّى لَوِ اجْتَرَأْتُ عَلَيْهَا، لَجِئْتُكُمْ بِقِطَافٍ مِنْ قِطَافِهَا، وَدَنَتْ مِنِّي النَّارُ حَتَّى قُلْتُ: أَيْ رَبِّ، وَأَنَا مَعَهُمْ؟ فَإِذَا امْرَأَةٌ. حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ. تَخْدِشُهَا هِرَّةٌ، قُلْتُ: مَا شَأْنُ هذِهِ؟ قَالُوا: حَبَسَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ جُوعاً، لاَ أَطْعَمَتْهَا، وَلاَ أَرْسَلَتْهَا تَأْكُلُ. قَالَ نَافِعٌ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ. مِنْ خَشِيشِ أَوْ خَشَاشِ الأَرْضِ**). [خ٧٤٥]

(خ) لە ئەسمای کچی ئەبوبەکرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی خۆرگیرانی ئەنجامدا، بەپێوە وەستا و بەپێوەستانی درێژ کردەوە، پاشان رکووعی برد و رکووع بردنی درێژ کردەوە، پاشان بەرزبوویەوە و بەپێوەستانی درێژکردەوە، پاشان رکووعی برد و رکووع بردنی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرزکردەوە و پاشان سوژدەی برد و سوژدە بردنی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرزکردەوە، پاشان سوژدەی برد و سوژدە بردنی درێژ کردەوە، پاشان هەستایە سەر پێ و بە پێوەوەستانی درێژ کردەوە، پاشان رکووعی برد و رکووع بردنی درێژ کردەوە، پاشان بەرزبوویەوە و بەپێوەستانی درێژکردەوە، پاشان رکووعی برد و رکووع بردنی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرزکردەوە و پاشان سوژدەی برد و سوژدە بردنی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرزکردەوە، پاشان سوژدەی برد و سوژدە بردنی درێژ کردەوە، پاشان سەلامیدایەوە و فەرمووی: (**بەهەشت لە من نزیکبوویەوە تا ویستم دەستی بۆ ببەم و بۆڵێك لە بەری بەهەشتتان بۆ بهێنم، ئاگرم لێ نزیکبوویەوە، تا وتم: ئەی پەروەردگار، منیش لەگەڵ ئەوانم؟ بینیم ئافرەتێك**-وا دەزانم فەرمووی- **پشیلەکان چڕنووکی لێ دەگرت، وتم: کاروباری ئەمە چییە؟ وتیان: ئەو پشیلەی بەند کردووە تا**

لە برسان مردووە، نە خواردنی پێداوە نە بەرەڵای کردووە خواردن بخوات—نافع دەڵێت: پێموایە فەرمووی: —لە خاشاك و زبڵی زەوی بخوات).

## ٥- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی هەسارەکان هاتووە

**١٥٢٦**– عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: كُنَّا مَعَ أَبِي قَتَادَةَ عَلَى ظَهْرِ بَيْتِنَا، فَرَأَى كَوْكَباً انْقَضَّ، فَنَظَرُوا إِلَيْهِ، فَقَالَ أَبُو قَتَادَةَ: إِنَّا قَدْ نُهِينَا أَنْ نُتْبِعَهُ أَبْصَارَنَا. [حم٢٢٥٤٩]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

لە محەمەدی کوڕی سیرینەوە، وتی: لەسەرماڵەکەمان لەگەڵ ئەبو قەتادە بووین، هەسارەیەکی بینی کشا، تەماشایان کرد، ئەبو قەتادە وتی: ئێمە نەهیمان لێکرا بە چاو شوێنی بکەوین.

## بەشی چوارەم

## نوێژەبارانە

### ١- دەروازەی: هەڵگێڕانەوەی کراس

**١٥٢٧-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ إِلَى المُصَلَّى، فَاسْتَسْقَى، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَقَلَبَ رِدَاءَهُ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ. [خ١٠١٢ (١٠٠٥)/ م٨٩٤]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی یەزیدەوە: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتە دەرەوە بۆ نوێژگە(مصلی)، داوای بارینی بارانی کرد، ڕووی لە قیبلە کرد و کراسەکەی هەڵگێڕایەوە و دوو ڕکات نوێژی کرد.**

- وفِي رواية لهما: رَأَيْتُ النبيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ خَرَجَ يَسْتَسْقِي، فَحَوَّلَ إِلَى النَّاسِ ظَهْرَهُ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ يَدْعُو، ثُمَّ حَوَّلَ رِدَاءَهُ، ثُمَّ صَلَّى لنا رَكْعَتَيْنِ. زاد البخاري: جَهَرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ. [خ١٠٢٥]

**لە ڕیوایەتێکی هەردووکیان: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی ئەو ڕۆژەی ڕۆیشتە دەرەوە بۆ نوێژەبارانە، پشتی لە خەڵك کرد و ڕووی لە قیبلە کرد و دەستی بە دوعا کرد، پاشان کراسەکەی هەڵگێڕایەوە، پاشان دوو ڕکاتی پێ کردین، بوخاری ئەمەی زیاد کردووە: لە دوو ڕکاتەکەدا خوێندنەوەکەی بە دەنگی بەرز کرد.**

### ٢- دەروازەی: بەرزکردنەوەی دوو دەست بە دوعا لە داوای باران

**١٥٢٨-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لاَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ إِلاَّ فِي الاِسْتِسْقَاءِ، وَإِنَّهُ يَرْفَعُ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ إِبْطَيْهِ. [خ١٠٣١/ م٨٩٥]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە شتێك لە دوعاکانی دەستی بەرز نەدەکردەوە لە داوای باراندا نەبێت، ئەو ئەوەندە دەستی بەرز دەکردەوە سپێتی دوو بنباڵی دەبینران.

**١٥٢٩-** (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم اسْتَسْقَى، فَأَشَارَ بِظَهْرِ كَفَّيْهِ إِلَى السَّمَاءِ. [م٨٩٦]

(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەر(ﷺ) داوای بارانی کرد، بە پشتی دوو دەستی ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان.

**١٥٣٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أَتَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم بَوَاكِي، فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ اسْقِنَا غَيْثاً مُغِيثاً، مَرِيئاً مَرِيعاً نَافِعاً غَيْرَ ضَارٍّ، عَاجِلاً غَيْرَ آجِلٍ**) قَالَ: فَأَطْبَقَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ.
* صحيح. [د١١٦٩]

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: ئافرەتان بە گریانەوە هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: (**أللهم اسقنا غيثا مغيثا، مرئا مريعا، نافعا غير ضار، عاجلا غير آجل**)، وتی: ئاسمان بە لێزمە بارانی داباراند.

**١٥٣١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا اسْتَسْقَى قَالَ: (**اللَّهُمَّ اسْقِ عِبَادَكَ وَبَهَائِمَكَ، وَانْشُرْ رَحْمَتَكَ، وَأَحْيِ بَلَدَكَ الْمَيِّتَ**). [د١١٧٦]
* حسن.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوای بارانی بکردبایە دەیفەرموو: (**أللهم اسق عبادك وبهائمك، وانشر رحمتك، وأحي بلدك الميت**).

## ٣- دەروازەی: داوای باران لە وتاری هەینییدا

**١٥٣٢-** (ق) عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَجُلاً دَخَلَ المسْجِدَ يَوْمَ جُمُعَةٍ، مِنْ بَابٍ كَانَ نَحْوَ دَارِ الْقَضَاءِ، ورَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله

عليه وسلّم قائِماً، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسولَ اللهِ! هَلَكَتِ الأَمْوَالُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللهَ يُغِيْثُنَا، فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (**اللَّهُمَّ أَغِثْنَا، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا**).

قَالَ أَنَسٌ: وَلاَ وَاللهِ ما نَرَى فِي السَّمَاءِ مِنْ سَحَابٍ، وَلاَ قَزَعَةً، وَمَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ سَلْعٍ مِنْ بَيْتٍ وَلاَ دَارٍ. قَالَ: فَطَلَعَتْ مِنْ وَرَائِهِ سَحَابَةٌ مِثْلُ التُّرْسِ، فَلَمَّا تَوَسَّطَتِ السَّمَاءَ انْتَشَرَتْ، ثُمَّ أَمْطَرَتْ، فَلاَ وَاللهِ ما رَأَيْنَا الشَّمْسَ ستّاً. ثُمَّ دَخَلَ رَجُلٌ مِنْ ذلِكَ الْبَابِ فِي الجُمُعَةِ ـ يَعنِي: الثَّانية ـ ورَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَهُ قائِماً، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلَكَتِ الأَمْوَالُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللهَ يُمْسِكْهَا عَنَّا. قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (**اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا، اللَّهُمَّ عَلَى الآكامِ وَالظِّرَابِ، وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ، وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ**). قَالَ: فَأَقْلَعَتْ، وخَرَجْنَا نَمْشِي فِي الشَّمْسِ.

قَالَ شَرِيكٌ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مالِكٍ: أَهُوَ الرَّجُلُ الأَوَّلُ؟ فَقَالَ: مَا أَدْرِي.

[خ١٠١٤ (٩٣٢)/ م٨٩٧]

**(ق) لە شەریکەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: ڕۆژێکی جومعە پیاوێ هاتە ناو مزگەوت، لە دەروازەیەکەوە ڕوو بە "دار القضاء"، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستابوو وتاری دەدا، بەپێوە ڕوو بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەستا و پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ماڵ و سامان تیاچوو و ڕێگەکان بڕان، داوا لە خودا بکە بارانمان بۆ ببارێنێ، پێغەمبەر(ﷺ) دوو دەستی بەرزکردەوە و پاشان فەرمووی: (أللهم أغثنا، أللهم أغثنا، أللهم أغثنا-خودایە بارانمان بۆ ببارێنە).**

**ئەنەس دەڵێت: سوێند بە خودا هەور و پەڵە هەورمان بە ئاسمانەوە نەدەبینی، لە نێوان ئێمە و "سَلْع" ماڵ و خانوو نەبوو، وتی: لەودیویەوە وەك قەڵغان پەڵەهەورێك دەرکەوت کاتێ گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان بڵاوەی کرد، پاشان بارانی داباراند، سوێند بە خودا شەش ڕۆژ خۆرمان نەبینی، کاتێك لەو دەرگاوە پیاوێك هاتە ژوورەوە لە جومعە-واتە جومعەی دووەم- پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پێوە وتاری دەدا، بە پێوە ڕوو بە پێغەمبەر وەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ماڵ و سامان تیاچوو و ڕێگەکان بڕان، داوا لە خودا بکە بارانەکەمان لێبگرێتەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوو دەستی بەرزکردەوە و پاشان فەرمووی: (أللهم حوالينا ولا علينا، أللهم على الآكام**

**والظراب وبطون الأودية ومنابت الشجر)**، وتی: باران خۆشیکردەوە و هاتینە دەرەوە بە خۆرەتاودا دەڕۆیشتین.

شەریك دەڵێت: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیك کرد: ئایا ئەوە هەمان پیاوی یەکەم بوو؟ وتی: نازانم.

## ٤- دەروازەی: داوای بارانی عومەر(خوا لێی رازی بێت)

**١٥٣٣-** (خ) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﷺ: كانَ إِذَا قَحَطُوا اسْتَسْقَى بِالْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ المطَّلِبِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا فَتَسْقِينَا، وإنا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا، قَالَ: فَيُسْقَوْنَ. [خ١٠١٠]

**(خ) لە ئەنەسەوە: عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت): گەر سیاساڵی رووی لێکردبان بە عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب داوای بارانی دەکرد، وتی: (خودایە، ئێمە بە پێغەمبەرەکەت داوای بارانمان لە تۆ دەکرد و بارانت بۆ دەباراندین، ئێمە بە مامی پێغەمبەرەکەمان داوا لە تۆ دەکەین بارانمان بۆ ببارێنە)، وتی: بارانیان بۆ دەباری.**

## ٥- دەروازەی: بانگ بۆ نوێژەبارانە نییە

**١٥٣٤-** (خـ) وَقَالَ لَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، عَنْ زُهَيْرٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ: خَرَجَ عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ الْأَنْصَارِيُّ، وَخَرَجَ مَعَهُ الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ وَزَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ ﷺ، فَاسْتَسْقَى، فَقَامَ بِهِمْ عَلَى رِجْلَيْهِ عَلَى غَيْرِ مِنْبَرٍ، فَاسْتَغْفَرَ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ يَجْهَرُ بِالْقِرَاءَةِ، وَلَمْ يُؤَذِّنْ وَلَمْ يُقِمْ.

قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: وَرَأَى عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم. [خ معلق ١٠٢٢]

**(خـ) ئەبو نوعەیم بە ئێمەی وت، لە زوهەیرەوە، لە ئەبی ئیسحاقەوە: عەبدوڵای کوڕی یەزیدی ئەنصاری رۆیشتە دەرەوە و بەرائی کوڕی عازیب و زەیدی کوڕی ئەرقەمی لەگەڵ چوونە دەرەوە، داوای بارانیان دەکرد، لەسەر دوو پێی بە پێوە وەستاندی بەبێ بوونی مینبەر، داوای لێخۆشبوونی لە خودا کرد، پاشان دوو رکات نوێژی بە خوێندنەوەی دەنگی بەرز ئەنجامدا، نە بانگ درا و نە قامەت کرا.**

**ئەبو ئیسحاق دەڵێت: عەبدوڵای کوڕی یەزید پێغەمبەری(ﷺ) بینی بوو.**

## ٦- دەروازەی: ئەوەی لە کاتی باران دەیڵێت و ئەنجامی دەدا

**١٥٣٥-** (خ) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا رَأَى المطَرَ قَالَ: (**صَيِّباً نَافِعاً**). [خ١٠٣٢]

(خ) لە عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەر بارانی ببینیبا دەیفەرموو: (**بارانی لاتیر**[1] **و بەسوود**). .

■ ولفظ السنن: (**اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ صَيِّباً نَافِعاً**).

**لەفزەکەی ((السنن)): (خودایە بیکە بە بارانی لاتیر و بەسوود).**

**١٥٣٦-** (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أَصَابَنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَطَرٌ، قَالَ: فَحَسَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ثَوْبَهُ، حَتَّى أَصَابَهُ مِنَ الْمَطَرِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ لِمَ صَنَعْتَ هَذَا؟ قَالَ: (**لأَنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ تَعَالَى**). [م٨٩٨]

**(م) لە ئەنەسەوە، وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین باران لێیداین، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پۆشاکەکەی کردەوە تا بارانی بەربکەوێت، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، بۆ ئەو کارەت کرد؟ فەرمووی: (چونکە تازە لای پەروەردگارییەوە(تعالى) بەدیهاتووە**[2]**).**

## ٧- دەروازەی: پەناگرتن لە کاتی بینینی بارەش

**١٥٣٧-** (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا رَأَى مَخِيلَةً فِي السَّمَاءِ أَقْبَلَ وَأَدْبَرَ، وَدَخَلَ وَخَرَجَ، وَتَغَيَّرَ وَجْهُهُ، فَإِذَا أَمْطَرَتِ السَّمَاءُ سُرِّيَ عَنْهُ، فَعَرَّفَتْهُ عائِشَةُ

---

[1] (الصيب-بارانی لاتیر): ئەو بارانەیە تاوەکەی لەسەر لا بۆ سەر زەوی دادەبارێ و لێزمەی پێوە دیارە، لە تەفسیری تەبەریدا هاتووە: (الصيب) ماناکەی (إذا انحدر ونزل)-و

[2] لە دروستکردن و بەدیهاتن لای پەروەردگاری تازە و نزیکە -و.

ذلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (ما أَدْرِي لَعَلَّهُ كما قالَ قَوْمٌ: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ﴾ الآيَةَ [الأحقاف:٢٤]). [خ٣٢٠٦/ م٨٩٩]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەوری بروسکاوی لە ئاسمان ببینیبا دەهاتوو و دەچوو، دەهاتە ژوورەوە و دەچووە دەرەوە و روخساری دەگۆڕا، کە ئاسمان دایدەباراند ئەوەی دەڕەوییەوە، عائیشە ئەوەی ئەو حاڵەی پێ ناساند[1]، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(چووزانم، لەوانەیە بەو جۆرە بێت قەومێك[2] وتیان: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ﴾[الأحقاف:٢٤]).**

- وزاد عند مسلم فِي أولـه: قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا عَصَفَتِ الرِّيحُ قَالَ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا فِيهَا وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ).

لای موسلیم لە سەرەتاکەیەوە ئەمە زیاد کراوە: عائیشە وتی: کە با هەڵیدەکرد پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (خودایە من خێرەکەی و خێری ئەوەی تێیدایە و خێری ئەوەی بۆی رەوانە کراوە لە تۆ داوا دەکەم، پەنات پێ دەگرم لە شەڕی و شەڕی ئەوەی تێیدایە و شەڕی ئەوەی بۆی رەوانە کراوە).

- وفِي رواية أُخرى له ـ وأولها عند البخاري ـ: أَنَّهَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مُسْتَجْمِعاً ضَاحِكاً حَتَّى أَرَى مِنْهُ لَهَوَاتِهِ، إِنَّمَا كَانَ يَتَبَسَّمُ. قَالَتْ: وَكَانَ إِذَا رَأَى غَيْماً أَوْ رِيحاً، عُرِفَ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ. [خ٦٠٩٢]

لە ریوایەتێکی تری موسلیمدا-کە سەرەتاکەی لای بوخارییە- عائیشە وتی: پێغەمبەری خودام نەبینیوە لە بەپێکەنین قاقا لێبدات تا زمانە بچکۆلەی ببینم، بەڵکو

---

[1] واتە: لە پێغەمبەری خودای پرسی بۆچی حاڵت بەو جۆرەی لێ دێت؟-و.

[2] مەبەست قەومی عادە-و.

ئەو خەندەی هەبوو، عائیشە وتی: ئەو کاتێ هەورێ یان بایەکی توندی دەبینی ئـەوە لە روخساری دەزانرا[١].

**١٥٣٨**– عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: كَانَ إِذَا اشْتَدَّتِ الرِّيحُ يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ لِقْحاً لا عَقِيماً**). [حب١٠٠٨/ك٧٧٧٠]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە، بۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ) بـەرزی دەکاتـەوە، وتـی: کاتێ با قایم دەبوو دەیفەرموو: (خودایە بایەکی پەڕێنەر[٢] بێت نەك بایەکی نەزۆك).**

## ٨- دەوازەی: ئیبن عومەر نموونەی بە هۆنراوەی ئەبی تالب دەهێنایەوە

**١٥٣٩**– (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ يَتَمَثَّلُ بِشِعْرِ أَبِي طَالِبٍ:

**وَأَبْيَضُ يُسْتَسْقَى الْغَمَامُ بِوَجْهِهِ ثِمَالُ الْيَتَامَى عِصْمَةٌ لِلأَرَامِلِ**

[خ١٠٠٨]

**(خ) لە عەبدوڵای کوڕی دینارەوە، وتی: گوێم لـە ئـیبن عومـەر بـوو نموونـەی بـە هۆنراوەی ئەبی تالب دەهێنایەوە:**

**وأبيض يُستسقى الغمام بوجهه ثمال اليتامى عصمة للأرامل**

- وفي رواية معلقة: وَقَالَ عُمَرُ بْنُ حَمْزَةَ: حَدَّثَنَا سَالِمٌ، عَنْ أَبِيهِ: رُبَّمَا ذَكَرْتُ قَوْلَ الشَّاعِرِ، وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى وَجْهِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يَسْتَسْقِي، فَمَا يَنْزِلُ حَتَّى يَجِيشَ كُلُّ مِيزَابٍ.

[خ١٠٠٩]

---

[١] ترس و نیگەرانی رووی لێ دەکرد و لە روخساری دەبینـرا، لەبـەر ئـەو گشـتە هەڕەشـەی قورئان و ئەو گشتە بەربادبوونەی ئومەتانی پێشوو-و.

[٢] واتە: درەخت و دارخورما و گژوگیا لە یەکتر بپەڕێنێ-و.

لە ریوایەتێکی (معلق)دا: عومەری کوڕی حەمزە وتی: سالم بۆی باس کردین لە باوکییەوە: لەوانەیە قسەی شاعیرم بهاتبایەوە یاد کاتێک من تەماشای روخساری پێغەمبەرم(ﷺ) دەکرد داوای بارانی دەکرد، دانەدەبەزی تا هەموو پلوسکەکان ئاویان پیا دەرۆیشت.

## ٩- دەوازەی: سیاسالی ئەوە نییە باران نەبارێت

**١٥٤٠-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لَيْسَتِ السَّنَةُ بِأَنْ لاَ تُمْطَرُوا، وَلَكِنِ السَّنَةُ أَنْ تُمْطَرُوا وَتُمْطَرُوا، وَلاَ تُنْبِتُ الأَرْضُ شَيْئاً). [م٢٩٠٤]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سیاسالی ئەوە نییە بارانتان بۆ نەبارێت، بەڵکو سیاسالی ئەوەیە بارانتان بۆ ببارێت و بۆ ببارێت و زەوی شتێك سەوز نەکات).**

# بەشی پێنجەم

# نوێژی ترس

## ١- دەروازەی: هۆی رەوایەتی نوێژی ترس

**١٥٤١-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَوْماً مِنْ جُهَيْنَةَ، فَقَاتَلُونَا قِتَالاً شَدِيداً، فَلَمَّا صَلَّيْنَا الظُّهْرَ قَالَ الْمُشْرِكُونَ: لَوْ مِلْنَا عَلَيْهِمْ مَيْلَةً لاَقْتَطَعْنَاهُمْ، فَأَخْبَرَ جِبْرِيلُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ذلِكَ، فَذَكَرَ ذلِكَ لَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. قالَ وَقَالُوا: إِنَّهُ سَتَأْتِيهِمْ صَلاَةٌ هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنَ الأَوْلاَدِ.

فَلَمَّا حَضَرَتِ الْعَصْرُ، قَالَ: صَفَّنَا صَفَّيْنِ، وَالْمُشْرِكُونَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ. قَالَ: فَكَبَّرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَكَبَّرْنَا، وَرَكَعَ فَرَكَعْنَا، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدَ مَعَهُ الصَّفُّ الأَوَّلُ، فَلَمَّا قَامُوا سَجَدَ الصَّفُّ الثَّانِي، ثُمَّ تَأَخَّرَ الصَّفُّ الأَوَّلُ، وَتَقَدَّمَ الصَّفُّ الثَّانِي، فَقَامُوا مَقَامَ الأَوَّلِ، فَكَبَّرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَكَبَّرْنَا، وَرَكَعَ فَرَكَعْنَا، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدَ مَعَهُ الصَّفُّ الأَوَّلُ، وَقَامَ الثَّانِي، فَلَمَّا سَجَدَ الصَّفُّ الثَّانِي، ثُمَّ جَلَسُوا جَمِيعاً، سَلَّمَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [م٨٤٠]

**(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) غەزای کۆمەڵێکمان کرد لە "جُهَيْنة"، زۆر بە توندی دژمان جەنگان، کاتێ نوێژی نیوەڕۆمان کرد هاوەڵدانەران وتیان: گەر بە یەکجار بدەین بەسەریاندا بنبڕیان دەکەین، جیبریل(علیه السلام) بەوە هەواڵی دا بە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی بۆ ئێمە باسکرد، وتی: هەروەها وتیان: نوێژێکیان بۆ دێت لە منداڵەکانیان لایان شیرینترە.**

**کە نوێژی عەصر هاتە بەرەوە، ئێمەی کرد بە دوو ریز، هاوەڵدانەران لە نێوان ئێمە و قیبلە بوون، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) "الله أکبر"ی کرد و ئێمەش "الله أکبر"مان کرد، رکووعی برد و رکووعمان برد، پاشان سوژدەی برد و ریزی یەکەم**

لەگەڵی سوژدەیان برد، کاتێك ئەوان بەرزبوونەوە ریزی دووەم سوژدەیان برد، پاشان ریزی یەکەم هاتنە دواوە و ریزی دووەم چوونە پێشەوە و لە شوێنی ریزی یەکەم بە پێوە وەستان، پێغەمبەری خودا(ﷺ) "الله أكبر"ی کرد و ئێمەش "الله أكبر"مان کرد، رکووعی برد و رکووعمان برد، پاشان سوژدەی برد و ریزی یەکەم لەگەڵی سوژدەیان برد، ریزی دووەم بە پێوە وەستان، کاتێك ریزی دووەم سوژدەیان برد و هەموویان دانیشتن پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەلامی بەسەردا دانەوە.

## ٢- دەروازەی: چۆنێتی نوێژی ترس

**١٥٤٢-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليهِ وسلّم صَلَّى بِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ، وَالطَّائِفَةُ الْأُخْرَى مُوَاجِهَةُ الْعَدُوِّ، ثُمَّ انْصَرَفُوا، فَقَامُوا فِي مَقَامِ أَصْحَابِهِمْ أُولَئِكَ، فَجَاءَ أُولَئِكَ، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ سَلَّمَ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ قَامَ هَؤُلَاءِ، فَقَضَوْا رَكْعَتَهُمْ، وَقَامَ هَؤُلَاءِ، فَقَضَوْا رَكْعَتَهُمْ. [خ٤١٣٣ (٩٤٢)/ م٨٣٩]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە یەکێك لە دوو دەستەکە نوێژی کرد، دەستەکەی تر روو بە دوژمن بوون، پاشان رۆیشتن و لە جێگەی هاوەڵانیان بە پێوە وەستان، ئەوانەش هاتن و یەك رکاتی پێکردن، پاشان سەلامی بەسەردادانەوە، پاشان ئەوانە هەستانە سەر پێ و رکاتەکەی خۆیان تەواو کرد، ئەوانی تریش هەستان و رکاتەکەی خۆیان تەواو کرد.

**١٥٤٣-** (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ قَالَ: يَقُومُ الإمامُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، وَطَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَهُ، وَطَائِفَةٌ مِنْ قِبَلِ الْعَدُوِّ، وُجُوهُهُمْ إِلَى الْعَدُوِّ، فَيُصَلِّي بِالَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ يَقُومُونَ فَيَرْكَعُونَ لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً، وَيَسْجُدُونَ سَجْدَتَيْنِ فِي مَكَانِهِمْ، ثُمَّ يَذْهَبُ هؤُلَاءِ إِلَى مَقَامِ أُولئِكَ، فَيَجِيءُ أُولئِكَ فَيَرْكَعُ بِهِمْ رَكْعَةً، فَلَهُ ثِنْتَانِ، ثُمَّ يَرْكَعُونَ وَيَسْجُدُونَ سَجْدَتَيْنِ. [خ٤١٣١، م٨٤١]

(ق) لە سەهلی کوڕی ئەبی حەسمەوە، وتی: ئیمام روو بە قیبلە رادەوەستێ و دەستەیەکیش لەوان لەگەڵی، دەستەیەکیش روو بە دوژمن، رویان لە دوژمنە، رکاتێك

بەوانە دەکات لەگەڵ ئەون، پاشان ئەوانە هەڵدەستن و ڕکاتێك بۆ خۆیان دەکەن و لە شوێنی خۆیان دوو سوژدە دەبەن، پاشان ئەوانە دەچن بۆ شوێنی ئەوانیتر، ئەوانیتریش دێن ئیمام ڕکاتێکیان پێ دەکات، ئیمامەکە دوو ڕکاتی کردووە، پاشان ئەوانیش ڕکووع دەبەن و دوو سوژدە دەبەن.

**١٥٤٤-** (ق) عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ، عَمَّنْ شَهِدَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ ذَاتِ الرِّقَاعِ صَلَّى صَلاَةَ الخَوْفِ: أَنَّ طَائِفَةً صَفَّتْ مَعَهُ وَطَائِفَةٌ وِجاهَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّتِي مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ ثَبَتَ قَائِماً، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ ثُمَّ انْصَرَفُوا، فَصَفُّوا وِجاهَ الْعَدُوِّ، وَجَاءَتِ الطَّائِفَةُ الأُخْرَى فَصَلَّى بِهِمُ الرَّكْعَةَ الَّتِي بَقِيَتْ مِنْ صَلاَتِهِ ثُمَّ ثَبَتَ جالِساً، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ سَلَّمَ بِهِمْ. [خ٤١٢٩، م٨٤٢]

(ق) لە صاڵحی کوڕی خەوواتەوە، لە کەسێکەوە لە ڕۆژی "ذات الرِّقاع" "نوێژی ترس"ی پێغەمبەری خودای(ﷺ) بینیوە: دەستەیەك لەگەڵی ریزیان بەست، دەستەیەکیش بەرانبەر دوژمن، یەك ڕکاتی بەوانە کرد لەگەڵی بوون، پاشان بە پێوە وەستا، ئەوان بۆ خۆیان نوێژەکەیان تەواو کرد و سڵاویان دایەوە و ڕۆیشتن و ڕوو بە دوژمن وەستان، دەستەکەی تر هاتن ئەو ڕکاتەی مابووی لە نوێژەکە بەوانی کرد و پاشان دانیشت و ئەوان نوێژەکەی خۆیان تەواو کرد و پاشان سڵاوی پێدانەوە.

## بەشی یەكەم

# كورتكردنەوە و كۆكردنەوەی نوێژ

## ١- كورتكردنەوەی نوێژ

**١٥٤٥-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ المؤْمِنِينَ قَالَتْ: فَرَضَ اللهُ الصَّلاةَ حِينَ فَرَضَهَا، رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فِي الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ، فَأُقِرَّتْ صَلاَةُ السَّفَرِ، وَزِيدَ فِي صَلاَةِ الْحَضَرِ. [خ٣٥٠/ م٦٨٥]

**(ق) لە عائیشەوە، دایكی باوەڕداران، وتی: كاتێك خودا نوێژی فەرز كرد دوو ركات دوو ركات فەرزی كرد، لە نیشتەجێبوون و لە سەفەر، لە نوێژی سەفەر جێگیركرا و لە نوێژی نیشتەجێبوون زیاد كرا[١].**

**١٥٤٦-** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ الظُّهْرَ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِالمدِينَةِ أَرْبَعاً، وَالْعَصْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ. [خ١٠٨٩/ م٦٩٠]

**(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: لە مەدینە نوێژی نیوەڕۆم چوار ركات لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجامدا، لە "ذي الحُلَيْفَة"[٢] نوێژی عەصرم دوو ركات لەگەڵی ئەنجامدا.**

**١٥٤٧-** (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: فَرَضَ اللهُ الصَّلاَةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ صلّى الله عليه وسلّم فِي الْحَضَرِ أَرْبَعاً، وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً. [م٦٨٧]

**(م) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: خودا لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەتان لە نیشتەجێبوون بە چوار ركات نوێژی فەرز كرد و بە دوو ركات لە سەفەر و لە ترسیشدا ركاتێك.**

---

[١] واتە: بۆ سێ و چوار زیاد كرا-و.

[٢] "ذي الحليفة" چواردە كیلۆمەتر لە مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دوورە و میقاتی ئەهلی مەدینەیە بۆ بەستنی ئیحرام و دوورترین میقاتە لە مەككەوە-و.

١٥٤٨- (م) عَنْ يَحْيَى بْنِ يَزِيدَ الْهُنَائِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ عَنْ قَصْرِ الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا خَرَجَ مَسِيرَةَ ثَلاَثَةِ أَمْيَالٍ، أَوْ ثَلاَثَةِ فَرَاسِخَ ـ شُعْبَةُ الشَّاكُّ ـ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ. [م٦٩١]

**(م) لە یەحیای کوڕی یەزیدی هونائییەوە، وتی: لە ئەنەسی کوڕی مالیك پرسیاری کورتکردنەوەی نوێژم کرد، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) سێ میل ڕێگە، یان سێ فەرسەخ ڕێگە-شوعبە شکی بۆ دروست بووە- بڕۆیشتبایە دوو رکاتی دەکرد.**

١٥٤٩- (م) عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾[النساء:١٠١]، فَقَدْ أَمِنَ النَّاسُ! فَقَالَ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ ذٰلِكَ، فَقَالَ: (صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللهُ بِهَا عَلَيْكُمْ، فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ). [م٦٨٦]

**(م) لە یەعلای کوڕی ئومەیەوە، وتی: بە عومەری کوڕی خەتابم وت: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾[النساء:١٠١]، ئێستا خەڵك لە ئاسایشدان؟[١] وتی: منیش سەرمسوڕما لەوەی تۆ سەرت لێی سوڕماوە، دەربارەی ئەوە پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد، فەرمووی: (صەدەقەیەکە بەسەر ئێوەوە خودا کردوویەتی بە صەدەقە، ئێوەش صەدەقەکەی وەربگرن).**

١٥٥٠- عَنْ عُمَرَ بنِ الخطابِ قَالَ: (صَلاَةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ، وَصَلاَةُ الْفِطْرِ رَكْعَتَانِ، وَصَلاَةُ الْأَضْحَى رَكْعَتَانِ، وَصَلاَةُ السَّفَرِ رَكْعَتَانِ، تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ) عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم.

* صحيح. [ن١٤١٩/ جه١٠٦٣]

---

[١] **واتە: خەڵك لە ئاسایشدان و بۆچی نوێژی ترس ئەنجام دەدرێ-و.**

**لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: (نوێژی جومعە دوو ڕکاتە، و نوێـژی جـەژنی ڕەمەزان دوو ڕکاتە، و نوێژی جەژنی قوربان دوو ڕکاتە، و نوێژی سەفەر دوو ڕکاتە، تەواون و کورت نەکراونەتەوە)[1] لەسەر زمانی محەمەد(ﷺ).**

## ٢- دەروازەی: ماوەی کورتکردنەوە و دوورییەکەی

**١٥٥١-** (ق) عَنْ يَحْيى بْنِ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَساً يَقولُ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مِنَ المدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَكَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى رَجَعْنَا إِلَى المدِينَةِ. قُلْتُ: أَقَمْتُمْ بِمَكَّةَ شَيْئاً؟ قَالَ: أَقَمْنَا بِهَا عَشْراً. [خ١٠٨١/ م٦٩٣]

**(ق) لە یەحیای کوڕی ئـەبی ئیسـحاقەوە، وتـی: گـوێم لـە ئەنـەس بـوو دەیـوت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینەوە چووین بۆ مەککە، ئەو دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی دەکرد تا گەڕاینەوە بۆ مەدینـە، وتم: ئایا شتێك لـە مەککـە مانـەوە؟ وتـی: دە ڕۆژ تیایدا ماینەوە.**

**١٥٥٢-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَقَامَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم تِسْعَةَ عَشَرَ يَقْصُرُ، فَنَحْنُ إِذَا سَافَرْنَا تِسْعَةَ عَشَرَ قَصَرْنَا، وَإِنْ زِدْنَا أَتْمَمْنَا. [خ١٠٨٠]

**(خ) لە ئیبن عەباسـەوە(خوایان لـێ ڕازی بێـت)، وتـی: پێغەمبـەر(ﷺ) نـۆزدە ڕۆژ مایەوە و نوێژی کورت دەکردەوە، بۆیە ئێمە گـەر نـۆزدە ڕۆژ سـەفەر بکـەین کـورتی دەکەینەوە، گەر زیاترمان کرد نوێژەکان تەواو دەکەین.**

- وفي رواية له: قال: أَقام النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بمكةَ تسعةَ عشرَ يوماً يصلي ركعتين. [خ٤٢٩٨]

---

[1] **واتـە: نوێـژی سـەفەر-جگـە لـە مـەغریب- دوو ڕکاتـە، و کورتنەکراوەتـەوە، بۆیـە گـەر کەسـێك لـە سـەفەردا نوێـژی نیـوەڕۆ چـوار ڕکـات بکـات وەك ئـەوە وایـە لـە کـاتی نیشتەجێبوون لە جێگەی چوار ڕکات شەش ڕکات یان هەشت ڕکات نوێژی کرد بێت-و.**

لە ریوایەتێکیدا، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نۆزدە رۆژ لە مەککە مایەوە دوو رکاتی ئەنجام دەدا.

**١٥٥٣**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أَقَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِتَبُوكَ عِشْرِينَ يَوْماً يَقْصُرُ الصَّلاَةَ. [د١٢٣٥]

* صحيح.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بیست رۆژ لە تەبووك مایەوە نوێژی کورت دەکردەوە.

## ٣- دەروازەی: کورتکردنەوەی نوێژ لە مینا

**١٥٥٤**– (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِمِنى رَكْعَتَيْنِ، وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَمَعَ عُثْمَانَ صَدْراً مِنْ إِمَارَتِهِ، ثُمَّ أَتَمَّهَا. [خ١٠٨٢/ م٦٩٤]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت) وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر و سەرەتای ئەمارەتی عوسمان لە مینا بە دوو رکات نوێژم کرد، پاشان عوسمان بە تەواوی ئەنجامی دەدان.

**١٥٥٥**– (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: صَلَّى بِنَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﷺ بِمِنى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، فَقِيلَ ذَلِكَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ فَاسْتَرْجَعَ، ثُمَّ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِمِنى رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّيْتُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ ﷺ بِمِنى رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّيْتُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ بِمِنى رَكْعَتَيْنِ، فَلَيْتَ حَظِّي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ رَكْعَتَانِ مُتَقَبَّلَتَانِ. [خ١٠٨٤/ م٦٩٥]

(ق) لە عبدالرحمانی کوڕی یەزیدەوە، وتی: عوسمانی کوڕی عەففان(خوا لێی رازی بێت) لە مینا چوار رکات نوێژی پێکردین، ئەوە بۆ عەبدوڵای کوڕی مەسعوود(خوا لێی رازی بێت) باسکرا، "إنا لله وإنا إليه راجعون"ی کرد و پاشان وتی: لە مینا لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوو رکات نوێژم کرد، لە مینا لەگەڵ ئەبوبەکر(خوا لێی رازی بێت) دوو رکات نوێژم کرد، لە مینا لەگەڵ عومەری کوڕی

خەتاب(خوا لێی ڕازی بێت) دوو ركات نوێژم كرد، خۆزگە بەشی من لە چوار ركاتەكە دوو ركاتی قبووڵكراو بوایە.

## ٤- دەروازەی: نوێژی سوننەت لە سەفەردا

**١٥٥٦-** (ق) عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ قَالَ: سَافَرَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما فَقَالَ: صَحِبْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمْ أَرَهُ يُسَبِّحُ فِي السَّفَرِ، وَقَالَ اللهُ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[الأحزاب:٢١]. [خ١١٠١/ م٦٨٩]

**(ق) لە حەفصی كوڕی عاصمەوە، وتی: ئیبن عومەر(خوایان لێ ڕازی بێت) سەفەری كرد، وتی: هاوەڵی پێغەمبەرم(ﷺ) كرد نەمبینی لە سەفەر تەسبیح[1] بكات، خودا(جل ذكره) فەرمووی: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[الأحزاب:٢١].**

- ولمسلم: عن حفصِ بْنِ عاصمٍ قَالَ: صَحِبْتُ ابْنَ عُمَرَ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ. قَالَ: فَصَلَّى لَنَا الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَقْبَلَ وَأَقْبَلْنَا مَعَهُ حَتَّى جَاءَ رَحْلَهُ، وَجَلَسَ وَجَلَسْنَا مَعَهُ، فَحَانَتْ مِنْهُ الْتِفَاتَةٌ نَحْوَ حَيْثُ صَلَّى فَرَأَى نَاساً قِيَاماً، فَقَالَ: مَا يَصْنَعُ هَؤُلاءِ؟ قُلْتُ: يُسَبِّحُونَ، قَالَ: لَوْ كُنْتُ مُسَبِّحاً لأَتْمَمْتُ صَلاَتِي. يَا ابنَ أَخِي! إِنِّي صَحِبْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي السَّفَرِ، فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، وَصَحِبْتُ أَبَا بَكْرٍ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، وَصَحِبْتُ عُمَرَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ. ثُمَّ صَحِبْتُ عُثْمَانَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، وَقَدْ قَالَ اللهُ: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[الأحزاب:٢١].

[م٦٨٩، ١٨/٦٩٤]

**لە ڕیوایەتێكی موسلیمدا: لە حەفصی كوڕی عاصیمەوە، وتی: لە ڕێگەی مەككە لەگەڵ ئیبن عومەر هاوەڵیم كرد، وتی: نیوەڕۆ دوو ركاتی بۆ كردین، پاشان ڕووی لێكردین و ئێمەش ڕوومان لێكرد تا هات بۆ لای كۆڵ و بارەكەی، دانیشت و ئێمەش دانیشتین، لایەكی كردەوە بۆ ئەو شوێنەی نوێژی تێدا كرد خەڵكی بینی لە نوێژدابوون بە پێوە،**

[1] تەسبیح: واتە نوێژی سوننەت-و.

وتی: ئەوانە چی دەکەن؟ وتم: تەسبیح دەکەن، وتی: گەر تەسبیحکەر بوومایە نوێژەکەم تەواو دەکرد، برازای خۆم، من لە سەفەر هاوەڵی پێغەمبەری خودام(ﷺ) کرد لە دوو رکات زیادی نەکرد تا خودا مراندی، من هاوەڵی ئەبوبەکرم کرد لە دوو رکات زیادی نەکرد تا خودا مراندی، هاوەڵی عومەرم کرد لە دوو رکات زیادی نەکرد تا خودا مراندی، پاشان هاوەڵی عوسمانم کرد لە دوو رکات زیادی نەکرد تا خودا مراندی، خودا فەرموویەتی: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[الأحزاب:٢١].

## ٥- دەروازەی: نوێژی سوننەت لەسەر وڵاخی سواری لە سەفەردا

**١٥٥٧-** (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أَسِيرُ مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ بِطَرِيقِ مَكَّة، فَقَالَ سَعِيدٌ: فَلَمَّا خَشِيتُ الصُّبْحَ نَزَلْتُ، فَأَوْتَرْتُ، ثُمَّ لَحِقْتُهُ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: أَيْنَ كُنْتَ؟ فَقُلْتُ: خَشِيتُ الصُّبْحَ فَنَزَلْتُ فَأَوْتَرْتُ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: أَلَيْسَ لَكَ فِي رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أُسْوَةٌ حَسَنةٌ؟ فَقُلْتُ: بَلَى وَاللهِ! قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُوتِرُ عَلَى الْبَعِيرِ. [خ٩٩٩/ م٧٠٠]

(ق) لە سەعیدی کوڕی یەسارەوە، ئەو وتی: لە ڕێگەی مەککە لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڕۆیشتم، سەعید وتی: کاتێك ترسی هاتنی بەیانیم بوو دابەزیم و ویترم کرد، پاشان پێیگەیشتمەوە، عەبدوڵای کوڕی عومەر وتی: لە کوێ بووی؟ وتم: لە هاتنی بەیانی ترسام دابەزیم و ویترم کرد، عەبدوڵا وتی: ئایا لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) سەرمەشقی وەرناگری؟ وتم: با، سوێند بە خودا، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر حوشتر نوێژی دەکرد[1].

**١٥٥٨-** (خ) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ، فَإِذَا أَرَادَ الْفَرِيضَةَ، نَزَلَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ. [خ٤٠٠]

---

(١) واتە: نوێژی سوننەت-و.

(خ) لە جابرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر وڵاخی سوارییەکەی نوێـژی دەکرد رووی لە هەر کوێ بکردبایە[1]، گەر بیویستبا نوێژی فـەرز بکـات دادەبـەزی و رووی لە قیبلە دەکرد.

## ٦- دەروازەی: کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە سەفەردا

**١٥٥٩**- (خـ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَجْمَعُ بَيْنَ صَلاَةِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ إِذَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ سَيْرٍ، وَيَجْمَعُ بَيْنَ المغْرِبِ وَالْعِشَاءِ.
[خ١١٠٧ معلقاً]

(خـ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆ و عەصری کۆدەکردەوە گەر لەسەر پشـتی وڵاخ بوایـە لـە رۆیشـتن، هـەروەها مەغریب و عیشای کۆدەکردەوە.

**١٥٦٠**- (م) عَنْ مُعَاذٍ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَكَانَ يُصَلِّي الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعاً، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءِ جَمِيعاً. [م٧٠٦]

(م) لـە موعـازەوە وتـی: لـە غـەزای تـەبووک[2] لەگـەڵ پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) دەرچووین، نوێژی نیوەڕۆ و عەصری بە جەمع ئەنجام دەدا، هەروەها نوێژی مەغریب و عیشای بە جەمع ئەنجام دەدا.

## ٧- دەروازەی: کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە نیشتەجێبووندا

**١٥٦١**- (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعاً، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعاً، فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ سَفَرٍ. [م٧٠٥]

---

(١) واتە: وڵاخی سوارییەکە رووی لە هەر کوێ بوایە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژە سوننەتەکەی خـۆی دەکرد–و.

(٢) تەبوک دەکەوێتە باکووری شاری مەدینە بە دووری ٦٨٠ کیلۆمەتر–و.

(م) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) نوێژی نیوەڕۆ و عەصری جەمع کرد، و نوێژی مەغریب و عیشای جەمع کرد بەبێ بوونی ترس و بەبێ بوونی سەفەر[1].

- وفي رواية: بِالْمَدِينَةِ فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ مَطَرٍ. [م٧٠٥م]

لە ریوایەتێکدا لە مەدینە بەبێ بوونی ترس و بوونی باران.

## ٨- دەروازەی: هەر کەس نیشتەجێ ببێت نوێژ تەواو دەکات

**١٥٦٢**– عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ الله يَعْنِي ابْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا أَجْمَعُ الْمَقَامَ بِبَلَدٍ، أَتَمَّ الصَّلاَةَ. [هق٣/١٤٦]

لە نافیعەوە: عەبدوڵا واتە ئیبن عومەر گەر لە شارێك نیشتەجێ ببوایە نوێژی تەواو دەکرد.

**١٥٦٣**– عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: مَنْ أَجْمَعَ عَلَى إِقَامَةِ أَرْبَعِ لَيَالٍ وَهُوَ مُسَافِرٌ، أَتَمَّ الصَّلاَةَ. [هق٣/١٤٨]

لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە، وتی: هەر کەس بڕیاری چوار شەو مانەوە بدا و ئەو لە سەفەردا بوو نوێژی تەواو دەکات.

## ٩- دەروازەی: موسافیر ئیمامەت بۆ نیشتەجێبوان دەکات

**١٥٦٤**– عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ الله: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ إِذَا قَدِمَ مَكَّةَ صَلَّى لَهُمْ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ مَكَّةَ أَتِمُّوا صَلاَتَكُمْ فَإِنَّا قَوْمٌ سَفْرٌ. [هق٣/١٢٦]

---

[1] ئەوان لە سەفەردا بوون، بەڵام لە تەبووك نیشتەجێ بووبوون، واتە: لە رۆیشتندا نەبووین—و.

لە سالمی کوڕی عەبدوڵاوە، گەر عومەری کوڕی خەتاب بهاتبایە بۆ مەککە دوو ڕکاتی پێ دەکردن، پاشان دەیوت: ئەی ئەهلی مەککە نوێژەکەتان تەواو بکەن، ئێمە خەڵکانێکی موسافیرین.

## ١٠- دەروازەی: موسافیر لەدوای نیشتەجێبووەوە نوێژ دەکات

**١٥٦٥-** عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ: الْمُسَافِرُ يُدْرِكُ رَكْعَتَيْنِ مِنْ صَلاَةِ الْقَوْمِ، يَعْنِي الْمُقِيمِينَ، أَتُجْزِيهِ الرَّكْعَتَانِ أَوْ يُصَلِّي بِصَلاَتِهِمْ؟ قَالَ: فَضَحِكَ، وَقَالَ: يُصَلِّي بِصَلاَتِهِمْ.

[هق٣/١٥٧]

**لە ئەبی میجلەزەوە، وتی: وتم بە ئیبن عومەر: موسافیر دەگات بە دوو ڕکات لە نوێژی کۆمەڵێك، واتە نیشتەجێبوان، ئایا دوو ڕکات بەسە بۆ نوێژەکەی یان بە نوێژی ئەوان نوێژ دەکات؟ وتی: پێکەنی و وتی: بە نوێژی ئەوان نوێژ دەکات.**

**١٥٦٦-** عَنْ الشَّعْبِيِّ: أَنَّ ابْن عُمَر كَانَ إِذَا كَانَ بِمَكَّةَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، إِلاَّ أَنْ يَجْمَعَهُ إِمَامٌ فَيُصَلِّي بِصَلاَتِهِ، فَإِنْ جَمَعَهُ الإِمَامُ يُصَلِّي بِصَلاَتِهِ. [مە٤٩٥٤]

* إسناده صحيح.

**لە شەعبییەوە: گەر ئیبن عومەر لە مەککە بوایە دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی دەکرد، مەگەر ئیمامێك کۆی بکردبایەوە[1] و بە نوێژی ئەو نوێژی بکردبایە، گەر ئیمام کۆیبکردبایەوە بە نوێژی ئەو نوێژی دەکرد.**

## ١١- دەروازەی: کۆکردنەوەی نوێژ لە باراندا

**١٥٦٧-** عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا جَمَعَ الْأُمَرَاءُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي الْمَطَرِ جَمَعَ مَعَهُمْ. [ط٣٣٣]

---

[1] کۆی بکردبایەوە: واتە: لەگەڵ ئیمامێك نوێژی بکردبایە-و.

لە نافیعەوە: عەبدوڵای کوڕی عومەر گەر ئەمیران نوێـژی مـەغریب و عیشـایان لـە باراندا جەمع بکردبایە لەگەڵیان جەمعی دەکرد.

**١٥٦٨–** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ أَنَّ أَبَاهُ عُرْوَةَ وَسَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ وَأَبَا بَكْرِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامِ بْنِ الْمُغِيرَةِ الْمَخْزُومِي كَانُوا يَجْمَعُونَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ، إِذَا جَمَعُوا بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ وَلاَ يُنْكِرُونَ ذَلِكَ. [هق٣/١٦٨]

لـە هیشـامی کـوڕی عـوروە و سـەعیدی کـوڕی موسـەییەب و ئەبوبـەکری کـوڕی عبدالرحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی مەخزومیییەوە: ئـەوان لـە شـەوی بارانـاوی نوێـژی مـەغریب و عیشـایان کـۆدەکردەوە، گـەر دوو نوێـژیان کۆبکردبایەوە ئەوەیان لا ناپەسەند نەبوو.

## بەشی دووەم

## حوکمەکانی سەفەر

### ١- دەروازەی: سەفەر پارچەیەکە لە ئازار و سزا

**١٥٦٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَابِ، يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَنَوْمَهُ، فَإِذَا قَضى نَهْمَتَهُ؛ فَلْيُعَجِّلْ إِلَى أَهْلِهِ)**.

[خ١٨٠٤/ م١٩٢٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی:

**(سەفەر پارچەیەکە لە ئازار، خواردن و خواردنەوە و خەو لە یەکێك لە ئێوە قەدەغە دەکات، بۆیە گەر پێویستییەکەی جێبەجێ کرد با بۆ لای خانەوادەکەی پەلە بکات).**

### ٢- دەروازەی: ئافرەت تەنها لەگەڵ مەحرەم[1] سەفەر دەکات

**١٥٧٠-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ تُسَافِرِ الْمَرْأَةُ ثَلاَثاً؛ إِلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ)**. [خ١٠٨٧ (١٠٨٦)/ م١٣٣٨]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی:

**(ئافرەت سێ رۆژ رێگە سەفەر ناکات مەگەر لەگەڵ مەحرەمێك).**

**١٥٧١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، أَنْ تُسَافِرَ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ لَيْسَ مَعَهَا حُرْمَةٌ)**. [خ١٠٨٨/ م١٣٣٩]

---

[1] مەحرەمی ئافرەت ئەو کەسەیە هاوسەرگیری لەگەڵی دروست نییە، یان هاوسەرەکەی خۆی.

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ئافرەتێك ئیمانی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەبێت حەڵاڵ نییە بۆی شەو و ڕۆژێ ڕێگە بەبێ مەحرەم سەفەر بکات و مەحرەمێکی لەگەڵ نەبێت).**

## ٣- دەروازەی: پیاو بەتەنها سەفەر ناکات

**١٥٧٢-** (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ ما فِي الْوَحْدَةِ ما أَعْلَمُ، ما سَارَ رَاكِبٌ بِلَيْلٍ وَحْدَهُ).** [خ٢٩٩٨]

(خ) لە ئیبن عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(گەر ئەوەی من دەیزانم چی لە تەنهاییدایە خەڵکی بیزانن هیچ سوارێك بەتەنها بە شەو نەدەڕۆیشت).**

**١٥٧٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(الرَّاكِبُ شَيْطَانٌ، وَالرَّاكِبَانِ شَيْطَانَانِ، وَالثَّلاَثَةُ رَكْبٌ).** [د٢٦٠٧/ ت١٦٧٣]

* حسن.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سوارێك شەیتانێك، دوو سوار دوو شەیتان، سیان کۆمەڵن)**[1].

## ٤- دەروازەی: دوعای سەفەر

**١٥٧٤-** (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا اسْتَوَى عَلَى بَعِيرِهِ خَارِجاً إِلَى سَفَرٍ، كَبَّرَ ثَلاَثاً، ثُمَّ قَالَ: (﴿**سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ۝١٣ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ۝١٤**﴾[الزخرف: ١٣- ١٤]. **اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا**

---

[1] واتە: سوارێك شەیتانێکی لەگەڵە، دوو سوار دوو شەیتانیان لەگەڵە، سێ سوار دەبنە کۆمەڵ و یەکێکیان دەبێت بە ئەمیر و شەیتانیان لێ دوور دەکەوێتەوە، تەماشای فەرموودەی (١٥٨٥) بکە.

هَذَا الْبِرَّ والتَّقْوَى، وَمِنَ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى. اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرنَا هَذَا، وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ. اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمَنْظَرِ، وَسُوءِ الْمُنْقَلَبِ، فِي الْمَالِ وَالأَهْلِ). وَإِذَا رَجَعَ قَالَهُنَّ، وَزَادَ فِيهِنَّ: (آيِبُونَ، تَائِبُونَ، عَابِدُون، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ). [م١٣٤٢]

(م) لە ئیبن عومەرەوە: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) سواری حوشترەكەی بوایە و بۆ سەفەرێك بڕۆیشتبا سێ جار "الله أكبر"ی دەكرد و پاشان دەیفەرموو: (﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ۝١٣ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ۝١٤﴾ [الزخرف: ١٣- ١٤]، **أللهم إنا نسألك في سفرنا هذا البر والتقوى، ومن العمل ما ترضى، أللهم هوِّن علينا سفرنا هذا واطوِ عنا بُعده، أللهم أنت الصاحب في السفر والخليفة في الأهل، أللهم إنا نعوذ بك من وعثاء السفر وكآبة المنظر، وسوء المنقلَب في المال والأهل**)، كە دەگەڕایەوە ئەوەی دەفەرموو و ئەمەی بۆ زیاد دەكرد: (**آيبون، تائبون، عابدون، لربنا حامدون**).

## ٥- دەروازەی: چی دەڵێ گەر لە سەفەری حەج و سەفەری تر بگەڕێتەوە

**١٥٧٥**- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كانَ إِذَا قَفَلَ مِنْ غَزْوٍ أَوْ حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ يُكَبِّرُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ مِنَ الأَرْضِ ثَلاَثَ تَكْبِيرَاتٍ، ثُمَّ يَقُولُ: (**لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ تَائِبُونَ عابِدُونَ سَاجِدُونَ، لِرَبِّنَا حامِدُونَ، صَدَقَ اللهُ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ**). [خ١٧٩٧/ م١٣٤٤]

(ق) لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە غەزایەك یان حەجێك یان عەمرەیەك دەگەڕایەوە لەسەر هەر بەرزاییەكی زەوی سێ "الله أكبر"ی دەكرد، پاشان دەیفەرموو: (**لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، آيبون، تائبون عابدون ساجدون لربنا حامدون، صدق الله وعده، ونصر عبده، وهزم الأحزاب وحده**-خودا لە بەڵێنەكەی خۆی ڕاستی كرد، و بەندەكەی خۆی سەرخست، و بەتەنها ئەحزابی بەزاند).

## ٦- دەروازەی: پێشوازی موسافیر

**١٥٧٦-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مَكَّةَ، اسْتَقْبَلَتْهُ أُغَيْلِمَةُ بَنِي عَبْدِ المطَّلِبِ، فَحَمَلَ وَاحِداً بَيْنَ يَدَيْهِ، وَالآخَرَ خَلْفَهُ. [خ١٧٩٨]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لیّ رازی بێت)، وتی: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ مەککە منداڵەکانی بەنی عەبدولموتەلیب پێشوازیان لێکرد، یەکێکی لە پێش خۆیەوە سوار کرد و یەکێکیش لە پاشکۆی.**

**١٥٧٧-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂ قَالَتْ: أَقْبَلْنَا مِنْ مَكَّةَ فِي حَجٍّ. أَوْ عُمْرَةٍ. وَأُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ يَسِيرُ بَيْنَ يَدَي رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم، فَتَلَقَّانَا غِلْمَانٌ مِنَ الأَنْصَارِ، كَانُوا يَتَلَقَّوْنَ أَهَالِيَهُمْ إِذَا قَدِمُوا. [هق٥/٢٦٠]

**لە عائیشەوە، دایکی باوەڕداران، وتی: لە مەککەوە لە حەج-یان عومرە- هاتینەوە، ئوسەیدی کوڕی حوزەیر لە بەردەم پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەڕۆیشت، کۆمەڵێك مێردمنداڵی ئەنصار پێشوازییان لێکردین، ئەوان پێشوازی کەسوکاری خۆیان دەکرد کە دەهاتنەوە.**

## ٧- دەروازەی: نوێژ کە لە سەفەر دێتەوە

**١٥٧٨-** (ق) عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ لاَ يَقْدَمُ مِنْ سَفَرٍ إِلاَّ نَهَاراً، فِي الضُّحَى، فَإِذَا قَدِمَ، بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ، فَصَلَّى فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ جَلَسَ فِيهِ. هذا لفظ مسلم. [خ٣٠٨٨/ م٧١٦]

**(ق) لە کەعبی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەنها بە ڕۆژدا لە سەفەر دەگەڕایەوە، لە چێشتەنگاو، کە دەهاتەوە بە مزگەوت دەستی پێ دەکرد، دوو ڕکاتی تێدا دەکرد، پاشان تیایدا دادەنیشت. ئەمە لەفزەکەی موسلیمە.**

## ٨- دەروازەی: بە شەو تەقە نادات لە دەرگای خانەوادەکەی

**١٥٧٩-** (ق) عَنْ جابِرٍ ﷺ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَطْرُقَ أَهْلَهُ لَيْلاً. [خ١٨٠١ (٤٤٣)/ م. الإمارة: ٧١٥ (١٨٢ . ١٨٥)]

**(ق) لە جابرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد بە شەو تەقە لە دەرگای خانەوادەکەی بدات.**

- وفي رواية لمسلم قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَطْرُقَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ لَيْلاً، يَتَخَوَّنُهُمْ، أَوْ يَلْتَمِسُ عَثَرَاتِهِمْ.

**لە ڕیوایەتێکی موسلیمدا، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد پیاو لە شەودا تەقە لە دەرگای خانەوادەکەی بدات، بە ناپاکیان دەربکات، یان بەدوای هەڵە و ناتەواوی ئەواندا بگەڕێ.**

**١٥٨٠-** عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم حِينَ قَدِمَ مِنْ غَزْوِهِ قَالَ: (**لاَ تَطْرُقُوا النِّسَاءَ**)، وَأَرْسَلَ مَنْ يُؤْذِنُ النَّاسَ أَنَّهُ قَادِمٌ الْغَدَ. [هق٩/١٧٤]

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە غەزایەك دەهاتەوە فەرمووی: (تەقە مەدەن لە دەرگای ئافرەتەکان)، کەسێکی نارد بانگ بە ناو خەڵکیدا بدێرێ ئەو[1] سبەینێ دەگەڕێتەوە.**

## ٩- دەروازەی: دوعا گەر لە مەنزڵێك دابەزی

**١٥٨١-** عَنْ صُهَيْبٍ: أَنَّ مُحَمَّداً صلّى الله عليه وسلّم لَمْ يَرَ قَرْيَةً يُرِيدُ دُخُولَهَا إِلاَّ قَالَ حِيْنَ يَرَاهَا: (**اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَمَا أَظْلَلْنَ، وَرَبَّ الأَرَضِيْنَ السَّبْعِ وَمَا أَقْلَلْنَ، وَرَبَّ الشَّيَاطِيْنِ وَمَا أَضْلَلْنَ، وَرَبَّ الرِّيَاحِ وَمَا ذَرَيْنَ، فإنَّا نَسْأَلُكَ خَيْرَ هذِهِ القَرْيَةِ وَخَيْرَ أَهْلِهَا، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وشَرِّ أَهْلِهَا، وَشَرِّ مَا فيها**). [مخ ٨/٦٧ . ٦٩]

* إسناده صحيح.

---

[1] واتە: پێغەمبەر(ﷺ)-و.

لـە سـوهەیبەوە: محەمـەد(ﷺ) هـەر ئاوەدانییـەکی ببینیبـا و بیویسـتبایە بچـێتە ناویەوە کە دەیبینی دەیفەرموو: (أللهم رب السموات السبع وما أظللن، ورب الأرضين السبع وما أقللن، ورب الشياطين وما أضللن، ورب الرياح وما ذرين، فإنا نسألك خير هذه القرية وخير أهلها، ونعوذ بك من شرها وشر أهلها، وشر ما فيها).

## ١٠- دەروازەی: دوعا لە کاتی خواحافیزی

١٥٨١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أنه كَانَ يَقُولُ لِلرَّجُلِ إِذَا أَرَادَ سَفَراً، ادْنُ مِنِّي، أُوَدِّعْكَ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُوَدِّعُنَا؛ فَيَقُولُ: (أَسْتَوْدِعُ اللهَ دِينَكَ، وَأَمَانَتَكَ، وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ).

* صحيح. [د٢٦٠٠/ ت٣٤٤٣]

لە ئیبن عومەرەوە: گەر پیاو سەفەری بکردبا ئەو پێی دەوت: لێم نزیك ببـەرەوە، خواحافیزیت لێ بکەم وەك چۆن پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) خواحـافیزی لـێ دەکـردین، دەیفەرموو: (أسْتَوْدِعُ اللهَ دينَكَ، وأمانَتَك، وخواتيمَ عَمَلِك).

١٥٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: وَدَّعَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (أَسْتَوْدِعُكَ اللهَ الَّذِي لاَ تَضِيعُ وَدَائِعُهُ). [جه٢٨٢٥]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) خواحافیزی لێکردم و فەرمووی: (أسْتَوْدِعُكَ اللهَ الذي لا تَضيعُ ودائِعُهُ).

## ١١- دەروازەی: پەسەندی سەفەر لە ڕۆژی پێنجشەم

١٥٨٢م- (خ) في حديث توبة كعب: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ يَوْمَ الخَمِيسِ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، وَكَانَ يُحِبُّ أَنْ يَخْرُجَ يَوْمَ الخَمِيسِ. [خ٢٩٥٠]

(خ) لـە فـەرموودەی تەوبەکـەی کـەعب: پێغەمبـەر(ﷺ) ڕۆژی پێنجشـەم چـووە دەرەوە بۆ غەزوەی تەبووك، ئەو پێیخۆش بوو ڕۆژی پێنجشەم بچێتە دەرەوە.

## ١٢- دەروازەی: بەیانی زوو بەڕێکەوتن بۆ سەفەر و شتانی تر

**١٥٨٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**اللَّهُمَّ بَارِكْ لِأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا**).

* صحيح. [جه٢٢٣٨]

**لە ئیبن عومەرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خودایە لە سەرەتای ڕۆژەوە بەرەکەت بە ئومەتەکەم ببەخشە).**

## ١٣- دەروازەی: سیان یەکێکیان دەکەنە ئەمیر

**١٥٨٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا خَرَجَ ثَلَاثَةٌ فِي سَفَرٍ؛ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ**). [د٢٦٠٨]

* حسن صحيح.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر سیان ڕۆیشتنە دەرەوە بۆ سەفەرێك با یەکێکیان بکەنە ئەمیر).**

## ١٤- دەروازەی: خواردندان لە کاتی هاتنەوە لە سەفەر

**١٥٨٦-** (ق) عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ نَحَرَ جَزُوراً أَوْ بَقَرَةً. [خ٣٠٨٩/ م. المساقاة: ٧١٥ (١١٥، ١١٦)]

**(ق) لە جابرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتەوە بۆ مەدینە حوشترێکی گەنج یان مانگایەکی سەربڕی.**

## ١- دەروازەی: تەلقین کردنی مردوو بە (لا إله إلا الله)

**١٥٨٧-** (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)**. [م٩١٦]

**(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (تەلقینی مردووەکانتان[1] بکەن بە "لا إله إلا الله").**

**١٥٨٨-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ)**. [د٣١١٦]

* صحيح.

**لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس دوایین قسەی "لا إله إلا الله" بێت دەچێتە بەهەشتەوە).**

## ٢- دەروازەی: لە کاتی موسیبەت چی دەوترێت؟

**١٥٨٩-** (م) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(مَا مِنْ مُسْلِمٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ، فَيَقُولُ مَا أَمَرَهُ اللهُ: إِنَّا للهِ وإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، اللَّهُمَّ أجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْراً مِنْهَا؛ إِلاَّ أَخْلَفَ اللهُ لَهُ خَيْراً مِنْهَا)**.

قَالَتْ: فَلَمَّا مَاتَ أَبُو سَلَمَةَ قُلْتُ: أَيُّ الْمُسْلِمِينَ خَيْرٌ مِنْ أَبِي سَلَمَةَ؟ أَوَّلُ بَيْتٍ هَاجَرَ إِلَى رَسُولِ اللهِ، صلّى الله عليه وسلّم ثُمَّ إِنِّي قُلْتُهَا، فَأَخْلَفَ اللهُ لِي رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [م٩١٨]

**(م) لە ئوم سەلەمەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەر موسڵمانێك موسیبەتێکی تووشهات، ئەوە بڵێت خودا فەرمانی پێکردووە: "إنا لله وإنا إليه راجعون"، خودایە لەم موسیبەتەم پاداشتم بدەرەوە و باشتر و چاکتر لەوەم بۆ بکە بە جێگرەوەی" خودا باشتر و چاکتر لەوەی بۆ دەکاتە جێگرەوەی).**

---

[1] مەبەست بە (مردوو) کەسێکە لە سەرەمەرگدایە و لە مردن نزیکبووەتەوە -و.

وتی: کاتێك ئەبو سەلەمە مرد، وتم: کام لە موسڵمانان باشتر و چاکترە لە ئەبو سەلەمە؟ یەکەمین ماڵ و خانەوادە کۆچی کرد بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پاشان من ئەوەم وت[1]، خودا پێغەمبەری خودای(ﷺ) بۆ کردم بە جێگرەوە.

## ٣- دەروازەی: چاوداخستنی چاوی مردوو و دوعا بۆی

**١٥٩٠**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَلَمْ تَرَوْا الإِنْسَانَ إِذَا مَاتَ شَخَصَ بَصَرُهُ)**؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: **(فَذَلِكَ حِينَ يَتْبَعُ بَصَرُهُ نَفْسَهُ)**. [م٩٢١]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(مرۆڤ نابینن کاتێ دەمرێ چاوی ئەبڵەق دەبێت؟)**، وتیان: با، فەرمووی: **(ئەوە کاتێکە چاوی شوێن نەفسی خۆی دەکەوێت)**[2].

**١٥٩١**- عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا حَضَرْتُمْ مَوْتَاكُمْ، فَأَغْمِضُوا الْبَصَرَ، فَإِنَّ الْبَصَرَ يَتْبَعُ الرُّوحَ، وَقُولُوا خَيْراً، فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ تُؤَمِّنُ عَلَى مَا قَالَ أَهْلُ الْبَيْتِ)**. [جه١٤٥٥]

* حسن.

لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر لەسەر مردووانتان ئامادە بوون، چاویان دابخەن، چونکە چاو شوێنی ڕۆح دەکەوێ، هەروەها خێر بڵێن، چونکە فریشتەکان (ئامین) دەکەن لەسەر ئەوەی ئەهلی ئەو ماڵە وتویانە)**.

---

[1] واتە: وتم: (إنّا لله وإنّا إليه راجعون)-و.

[2] واتە: نەفسەکە(ڕۆحەکە)ی لە جەستە دەردەچێت و چاوی بەدوای نەفسەکەدا دەڕوانێت-و.

## ٤- فەرمان بە گومانی باش بە خودا(سبحانه وتعالى) لە کاتی مردن

**١٥٩٢-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَبْلَ مَوْتِهِ بِثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، يَقُولُ: (**لاَ يَمُوتَنَّ أَحَدُكُمْ إِلاَّ وَهُوَ يُحْسِنُ الظَّنَّ بِاللهِ عزّ وجل**). [م٢٨٧٧]

**(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵای ئەنصارییەوە، وتی: بەر لە مردنی بە سێ ڕۆژ گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: (هەر کەس لە ئێوە مرد با گومانی باش بە خودا(عز وجل) ببات).**

**١٥٩٣-** (م) وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ**). [م٢٨٧٨]

**(م) هەر لە جابرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەموو بەندەیەك زیندوو دەکرێتەوە لەسەر ئەوەی مردووە لەسەری).**

## ٥- دەروازەی: کە ڕۆحی مردوو چووە دەرەوە

**١٥٩٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا حُضِرَ الْمُؤْمِنُ، أَتَتْهُ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ بِحَرِيرَةٍ بَيْضَاءَ، فَيَقُولُونَ: اخْرُجِي رَاضِيَةً مَرْضِيّاً عَنْكِ، إِلَى رَوْحِ اللهِ وَرَيْحَانٍ وَرَبٍّ غَيْرِ غَضْبَانَ، فَتَخْرُجُ كَأَطْيَبِ رِيحِ الْمِسْكِ، حَتَّى أَنَّهُ لَيُنَاوِلُهُ بَعْضُهُمْ بَعْضاً، حَتَّى يَأْتُونَ بِهِ بَابَ السَّمَاءِ فَيَقُولُونَ: مَا أَطْيَبَ هَذِهِ الرِّيحَ الَّتِي جَاءَتْكُمْ مِنَ الأَرْضِ! فَيَأْتُونَ بِهِ أَرْوَاحَ الْمُؤْمِنِينَ، فَلَهُمْ أَشَدُّ فَرَحاً بِهِ مِنْ أَحَدِكُمْ بِغَائِبِهِ يَقْدَمُ عَلَيْهِ، فَيَسْأَلُونَهُ مَاذَا فَعَلَ فُلاَنٌ؟ مَاذَا فَعَلَ فُلاَنٌ؟ فَيَقُولُونَ: دَعُوهُ، فَإِنَّهُ كَانَ فِي غَمِّ الدُّنْيَا، فَإِذَا قَالَ: أَمَا أَتَاكُمْ؟ قَالُوا: ذُهِبَ بِهِ إِلَى أُمِّهِ الْهَاوِيَةِ. وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا احْتُضِرَ أَتَتْهُ مَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ بِمِسْحٍ، فَيَقُولُونَ: اخْرُجِي سَاخِطَةً مَسْخُوطاً عَلَيْكِ إِلَى عَذَابِ اللهِ عزّ وجل، فَتَخْرُجُ كَأَنْتَنِ رِيحِ جِيفَةٍ، حَتَّى يَأْتُونَ بِهِ بَابَ الأَرْضِ فَيَقُولُونَ: مَا أَنْتَنَ هَذِهِ الرِّيحَ؟ حَتَّى يَأْتُونَ بِهِ أَرْوَاحَ الْكُفَّارِ**). [ن١٨٣٢]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (گەر باوەڕدار کەوتە سەرەمەرگ، فریشتەی ڕەحمەت بە ئاورشمێکی سپییەوە دێن بۆ لای، دەڵێن: وەرە دەرەوە**

"راضية مرضية عنك–تۆ رازی و خوداش لە تۆ رازی" بۆ لای رەحمەتی خودا و رەیحان و پەروەردگارێکی ناتووڕە، لە خۆشترین بۆنی میسکدا دێتە دەرەوە، تا هەندێکیان لە دەستی یەکتری دەگرن[1]، تا دەیهێنن بۆ دەروازەی ئاسمان، دەڵێن: چەند ئەم بۆنە خۆشە کە لە زەوییەوە بۆ ئێوە هاتووە، دەیهێنن بۆ لای رۆحی باوەڕداران، ئەوان لە یەکێك لە ئێوە بزر و نادیارێك بۆ لای گەڕابێتەوە دڵخۆشترن بە ئەو، پرسیاری لێ دەکەن فلان چی کرد؟ فلان چی کرد؟ دەڵێن: وازیلێبهێنن، چونکە ئەو لەناو خەم و پەژارەی دنیادایە، گەر وتی: بۆچی نەهاتووە بۆ لای ئێوە؟ دەڵێن: براوە بۆ "أمه الهاوية–دۆزەخ"، کاتێ بێباوەڕ دەکەوێتە سەرەمەرگ فریشتەی سزا بە پۆشاکێك لە مووی زبر دێن بۆ لای و دەڵێن: وەرە دەرەوە "ساخطة مسخوطة عليك– خەشمگر و خەشملێگیراو" بۆ ناو سزای خودا(عز وجل)، وەك پیسترین بۆنی لاکەتۆپیو دێتە دەرەوە، تا دەیهێنن بۆ دەرگای زەوی و دەڵێن: چەند ئەم بۆنە بۆگەنە؟! تا دەیهێنن بۆ لای رۆحی بێباوەڕان).

## ٦- دەروازەی: گریان لەسەر مردوو

**١٥٩٥**– (ق) عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَرْسَلَتْ ابْنَةُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَيْهِ: إِنَّ ابناً لِي قُبِضَ فَائْتِنَا، فَأَرْسَلَ يُقْرِئُ السَّلاَمَ، وَيَقُولُ: (**إِنَّ للهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ ما أَعْطَى، وَكُلٌّ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ**). فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ تُقْسِمُ عَلَيْهِ لَيَأْتِيَنَّهَا، فَقَامَ وَمَعَهُ: سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، وَمَعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَرِجَالٌ، فَرُفِعَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الصَّبِيُّ وَنَفْسُهُ تَتَقَعْقَعُ ـ قَالَ: حَسِبْتُهُ أَنَّهُ قَالَ: كَأَنَّهَا شَنٌّ ـ فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسولَ اللهِ ما هذَا؟ فَقَالَ: (**هذِهِ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللهُ مِنَ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ**). [خ١٢٨٤/ م٩٢٣]

(ق) لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: کچەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ناردی لەدووی پێغەمبەر: کوڕێکم مردووە وەرە بۆ لامان، کەسێکی رەوانە

[1] واتە: هەندێکیان رۆحەکە(نەفسەکە) دەدەنە دەست هەندێکی تریان–و.

کرد سەلامیان پێ بگەیەنێت و بڵێت: **(ئەوەی دەیبات و ئەوەی دەیبەخشێ بۆ خودایە، هەموو شت بە وادایەکی دیاریکراوە، با ئارام بگرێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت).**

کچەکەی کەسێکی نارد بۆ لای سوێند دەخوات لەسەری دەبێ بێت بۆ لای، هەستا و سەعدی کوڕی عوبادە و مەعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی سابیت و کۆمەڵێك پیاوی لەگەڵ بوو، منداڵەکەیان بەرز کردەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و نەفسی لە غەرغەرەدا بوو، وتی: پێموابوو ئەو وتی: وەك جەوەندەیەکی کونبوو، چاوەکانی فرمێسکیان لێ دادەباری، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەمە چییە؟ فەرمووی: **(ئەمە ڕەحمەتێکە خودا لە دڵی بەندەکانیدا دایناوە، خودا ڕەحم دەکات بە بەندە خاوەن بەزەییەکانی).**

**١٥٩٦–** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: دَخَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى أَبِي سَيْفٍ الْقَيْنِ . وَكَانَ ظِئْراً لإِبْرَاهِيمَ عليه السلام . فَأَخَذَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِبْرَاهِيمَ فَقَبَّلَهُ وَشَمَّهُ، ثُمَّ دَخَلْنَا عَلَيْهِ بَعْدَ ذلِكَ، وَإِبْرَاهِيمُ يَجُودُ بِنَفْسِهِ، فَجَعَلَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تَذْرِفانِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ: وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ: **(يَا ابْنَ عَوْفٍ إِنَّهَا رَحْمَةٌ)**، ثُمَّ أَتْبَعَهَا بِأُخْرَى، فَقَالَ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ، وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ، وَلاَ نَقُولُ إِلاَّ ما يَرْضى رَبُّنَا، وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ).** [خ١٣٠٣/ م٢٣١٥]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشتین بۆ لای "أبي سيف القَيْن"، ئەو شیردەری ئیبراهیم(عليه السلام) بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیبراهیمی گرت و ماچی کرد و بۆنی کرد، پاشان لەدوای ئەوە چووینە ژوورەوە و ئیبراهیم گیانی دەدا و دوو چاوی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فرمێسکیان دادەباران، عبدالرحمانی کوڕی عەوف(خوا لێی ڕازی بێت) پێی وت: تۆش ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: **(ئەی کوڕی عەوف، ئەوە ڕەحم و بەزەییە)**، پاشان بەدوایدا ڕستەیەکی تری فەرموو: **(چاو فرمێسك دەڕێژێ و دڵ دڵتەنگ دەبێت و تەنها ئەوە دەڵێین پەروەردگارمان پێی ڕازییە، ئێمە بە جیابوونەوەت ئەی ئیبراهیم دڵتەنگین).**

## ٧- دەروازەی: مەزنی پاداشتی ئارامگرتن

**١٥٩٧-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: ما لِعَبْدِي الْمُؤْمِنِ عِنْدِي جَزَاءٌ، إِذَا قَبَضْتُ صَفِيَّهُ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، ثُمَّ احْتَسَبَهُ ؛ إِلاَّ الْجَنَّةُ**). [خ٦٤٢٤]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خودا(تعالى) دەفەرموێت: گەر خۆشەویستەکەی بەندەی باوەڕدارم—لە ئەهلی دنیا— مراند و بۆ پاداشت لای خودا ئارامی گرت، هیچ پاداشتێکم لا نییە بۆ ئەو جگە لە بەهەشت**).

## ٨- دەروازەی: مردوو بە گریانی خانەوادەکەی سزا دەخوات

**١٥٩٨-** (ق) عَنْ عُرْوَةَ قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَفَعَ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ فِي قَبْرِهِ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ**). فَقَالَتْ: وَهَلَ ابْنُ عُمَرَ رحمه الله، إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّهُ لَيُعَذَّبُ بِخَطِيئَتِهِ وَذَنْبِهِ، وَإِنَّ أَهْلَهُ لَيَبْكُونَ عَلَيْهِ الآنَ**). قَالَتْ: وَذَاكَ مِثْلُ قَوْلِهِ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَامَ عَلَى الْقَلِيبِ وَفِيهِ قَتْلَى بَدْرٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ لَهُمْ مِثْلَ مَا قَالَ: (**إِنَّهُمْ لَيَسْمَعُونَ مَا أَقُولُ**)، إِنَّمَا قَالَ: (**إِنَّهُمُ الآنَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّ مَا كُنْتُ أَقُولُ لَهُمْ حَقٌّ**)، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿**إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ**﴾[النمل:٨٠]، ﴿**وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي ٱلْقُبُورِ**﴾[فاطر:٢٢] تَقُولُ: حِينَ تَبَوَّؤُوا مَقَاعِدَهُمْ مِنَ النَّارِ. [خ٣٩٧٨، ٣٩٧٩، (١٣٧١) م٩٣٢]

(ق) لە عوروەوە، وتی: لای عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) باس ئەوە کرا ئیبن عومەر ئەم فەرموودەی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بەرزکردووەتەوە: (**مردوو لە گۆڕەکەی بە گریانی خانەوادەی سزا دەدرێت**)، وتی: ئیبن عومەر(خودا ڕەحمی پێ بکات) هەڵەی کردووە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئەو بە هەڵە و گوناهەکانی سزا دەدرێت، و خانەوادەکەی ئێستا بەسەریدا دەگرین**)، وتی: ئەوە وەك ئەو قسەیەتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر قولەیب—کە کوژراوەکانی بەدری هاوەڵدانەرانی تێدا بوو— وەستا و پێی فەرموون، وەك ئیبن عومەر دەڵێت: (**ئەوان ئەوەی من دەیڵێم دەیبیستن**)، بەڵکو فەرمووی: (**ئەوان ئێستا دەزانن ئەوەی پێم دەوتن حەق بوو**)، پاشان ئەمەی خوێندەوە:

﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾[النمل: ٨٠]، ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِى ٱلْقُبُورِ﴾[فاطر: ٢٢]، **عائیشە دەڵێت: کاتێك لە شوێن و جێگەی خۆیان لە ئاگر دامەزران.**

**١٥٩٩-** (ق) عَنْ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ فِي قَبْرِهِ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ**). [خ١٢٩٢/ م٩٢٧]

**(ق) لە عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (مردوو لە گۆڕەکەی سزا دەدرێت بەو شیوەن و لاواندنەوەی لەسەری کراوە).**

**١٦٠٠-** (م) عَنْ عُرْوَةَ قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ عَائِشَةَ قَوْلُ ابْنِ عُمَرَ: الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: رَحِمَ اللهُ أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، سَمِعَ شَيْئاً فَلَمْ يَحْفَظْهُ، إِنَّمَا مَرَّتْ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم جِنَازَةُ يَهُودِيٍّ، وَهُمْ يَبْكُونَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: (**أَنْتُمْ تَبْكُونَ، وَإِنَّهُ لَيُعَذَّبُ**). [م٩٣١]

**(م) لە عوروەوە، وتی: لای عائیشە قسەکەی ئیبن عومەر باسکرا: مردوو بە گریانی خانەوادەکەی سزا دەدرێت لەسەری، عائیشە وتی: خودا رەحم بە باوکی عبدالرحمن بکات، شتێکی بیستووە و لەبەری نەکردووە، جەنازەیەکی یەهوودی بە پاڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) گوزەری کرد، ئەوان بەسەریدا دەگریان، فەرمووی: (ئێوە دەگرین و ئەو سزا دەدرێت).**

## ٩- دەروازەی: توندکردنەوە لە شیوەن و لاواندنەوە

**١٦٠١-** (ق) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها قَالَتْ: أَخَذَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عِنْدَ الْبَيْعَةِ أَنْ لاَ نَنُوحَ، فَمَا وَفَتْ مِنَّا امْرَأَةٌ غَيْرُ خَمْسِ نِسْوَةٍ: أُمُّ سُلَيْمٍ، وَأُمُّ الْعَلاَءِ، وَابْنَةُ أَبِي سَبْرَةَ امْرَأَةُ مُعَاذٍ، وَامْرَأَتَانِ. أَوِ: ابْنَةُ أَبِي سَبْرَةَ، وَامْرَأَةُ مُعَاذٍ، وَامْرَأَةٌ أُخْرَى. [خ١٣٠٦/ م٩٣٦]

**(ق) لە ئوم عەتییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لە بەیعەتدا پێغەمبەر(ﷺ) پەیمانی لێ وەرگرتین مردوو نە لاوێنینەوە، تەنها پێنج ئافرەت لە ئێمە وەفای بە پەیمانەکەی کرد: (أم سليم، أم العلاء، امرأة معاذ(کچەکەی ئەبی سەبرە) و دوو ئافرەتی تر، یان کچەکەی ئیبن سەبرە و ژنەکەی مەعاز و ئافرەتێکی تر).**

**١٦٠٢-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ الخُدُودَ، وَشَقَّ الجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الجَاهِلِيَّةِ).** [خ١٢٩٤/ م١٠٣]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(لە ئێمە نییە ئەو کەسەی گۆنا دەرِنێت، و یەخە دادەدڕێ، و بە بانگ و هاواری نەفامی بانگ و هاوار دەکات).**

**١٦٠٣-** (خ) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنهما قَالَ: أُغْمِيَ عَلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ رَوَاحَةَ، فَجَعَلَتْ أُخْتُهُ عَمْرَةُ تَبْكِي: وَاجَبَلاَهْ، وَاكَذَا وَاكَذَا، تُعَدِّدُ عَلَيْهِ، فَقَالَ حِينَ أَفَاقَ: ما قُلْتِ شَيْئاً إِلاَّ قِيلَ لِي: أَأَنْتَ كَذَلِكَ؟. [خ٤٢٦٧]

(خ) لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: عەبدوڵای کوڕی رەواحە بورابوەوە، خوشکەکەی(عەمرە)[1] دەگریا: هاوار بۆ چیا، هاوار بۆ ئەوە و هاوار بۆ ئەوە، لەسەری دەژمارد، کاتێک بەئاگاهاتەوە وتی: تۆ هەرچییەکت وت: پێموترا ئایا تۆ بەو جۆرەی؟.

**١٦٠٤-** عَنْ أَسِيدِ بْنِ أَبِي أَسِيدٍ، عَنِ امْرَأَةٍ مِنَ الْمُبَايِعَاتِ، قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أَخَذَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي الْمَعْرُوفِ الَّذِي أَخَذَ عَلَيْنَا أَنْ لاَ نَعْصِيَهُ فِيهِ: **(أَنْ لاَ نَخْمُشَ وَجْهاً، وَلاَ نَدْعُوَ وَيْلاً، وَلاَ نَشُقَّ جَيْباً، وَأَنْ لاَ نَنْشُرَ شَعْراً).** [د٣١٣١]

* صحيح.

لە ئوسەیدی کوڕی ئەبی ئەسیدەوە، لە یەکێک لە ئافرەتە بەیعەتدەرەکانەوە، وتی: لەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە مەعرووف پەیمانی لێ وەرگرتین لەماندا لێی یاخی نەبین: **(رووی خۆمان نەرِنین، و واوەیلا نەکەین، و ئێخە دانەدڕین و قژ بڵاو نەکەینەوە[2]).**

---

[1] واتە: خوشکەکەی عەبدوڵای کوڕی رەواحە کە ناوی عەمرە بوو-و.

[2] واتە: سەر بەرەڵا نەکەین و قژ برِنین-و.

## ١٠- دەروازەی:ئارامگرتن لە كاتی موسیبەت

١٦٠٥- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِامْرَأَةٍ تَبْكِي عِنْدَ قَبْرٍ، فَقَالَ: **(اتَّقِي اللهَ وَاصْبِرِي)**. قَالَتْ: إِلَيْكَ عَنِّي فَإِنَّكَ لَمْ تُصَبْ بِمُصِيبَتِي، وَلَمْ تَعْرِفْهُ، فَقِيلَ لَهَا: إِنَّهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَتَتْ بَابَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمْ تَجِدْ عِنْدَهُ بَوَّابِينَ، فَقَالَتْ: لَمْ أَعْرِفْكَ، فَقَالَ: **(إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى)**. [خ١٢٨٣ (١٢٥٢)/ م٩٢٦]

**(ق) لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە پاڵ ئافرەتێكدا گوزەری كرد لای گۆڕێك دەگریا، فەرمووی: (لە خودا بترسە و ئارام بگرە)، وتی: وازملێبێنە تۆ موسیبەتی منت تووشنەهاتووە، ئەو پێغەمبەری نەناسی، پێی وترا: ئەوە پێغەمبەرە(ﷺ)، هات بۆ دەرگای ماڵی پێغەمبەر(ﷺ)، دەرگاوانانی لەبەر دەرگا نەبوو، وتی: تۆم نەناسی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئارامگرتن لە سەرەتای موسیبەتەوە).**

## ١١- دەروازەی: كفن كردنی مردوو

١٦٠٦- (ق) عَنْ عائِشَةَ ﷺ . زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم .: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حِينَ تُوُفِّيَ سُجِّيَ بِبُرْدٍ حِبَرَةٍ. [خ٥٨١٤/ م٩٤٢]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)-هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ): كاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) كۆچی دوایی كرد بە "بُرْد و حِبْرَة"[1] داپۆشرا[2].**

## ١٢- دەروازەی: شۆرینی مردوو

١٦٠٧- (ق) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الأَنْصَارِيَّةِ ﷺ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، حِينَ تُوُفِّيَتِ ابْنَتُهُ، فَقَالَ: **(اغْسِلْنَهَا ثَلاَثاً، أَوْ خَمْساً، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذلِكَ، بِمَاءٍ**

---

[1] "برد" جۆرە پۆشاكێك بووە لە یەمەنەوە هاتووە، خەت خەت بووە-و.

[2] واتە: كفن كرا-و.

وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُوراً، أَوْ شَيْئاً مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي). فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَعْطَانَا حِقْوَهُ، فَقَالَ: (أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ). تَعْنِي: إِزَارَهُ. [خ١٢٥٣ (١٦٧)/ م٩٣٩]

(ق) لە ئوم عەتییەی ئەنصارییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لامان کاتێك کچەکەی کۆچی دوایی کرد، فەرمووی: **(بە ئاو و سیدر سێ جار، یان پێنج جار، یان زیاتر لەوە بیشۆرن، گەر ئەوەتان بە باش بینی، دوایین شۆردنی کافوور بێت، یان شتێك لە کافوور، کە تەواوبوون ئاگادارم بکەنەوە)**، کە تەواوبووین ئاگادارمان کردەوە، ئەویش ئیزارەکەی[1] خۆی پێداین و فەرمووی: **(لێیەوە بپێچن)**، واتە ئیزارەکەی.

- وفي رواية لهما: قال لها: (ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا، وَمَوَاضِعِ الوضوءِ منها). [خ١٦٧]

لە ریوایەتێکی هەردووکیان: پێی فەرموو: **(بە لای راستی و شوێنەکانی دەستنوێژ دەستپێبکەن)**.

- وفي رواية لهما: قالت: ومشَطْنَاها ثَلاثَةَ قرونٍ. [خ١٢٥٤]

لە ریوایەتێکی تری هەردووکیان: ئوم عەتییە وتی: سێ پەلکەکەیمان شانە کرد.

## ١٣- دەروازەی: دەربارەی کفن کردنی مردوو

١٦٠٨- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كُفِّنَ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ يَمَانِيَةٍ، بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ مِنْ كُرْسُفٍ، لَيْسَ فِيهِنَّ قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ. [خ١٢٦٤/ م٩٤١]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە سێ پۆشاکی یەمانی سپی سوحلی[2] لە لۆکە کفنکرا، کراس و مێزەرەکەی تێدا نەبوو.

١٦٠٩- (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم خَطَبَ يَوْماً، فَذَكَرَ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِهِ قُبِضَ، فَكُفِّنَ فِي كَفَنٍ غَيْرِ طَائِلٍ، وَقُبِرَ لَيْلاً. فَزَجَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يُقْبَرَ الرَّجُلُ

---

[1] "إزار" بریتییە لە خوارپۆشاك، پۆشاکێ لە خوار ناوکەوە بۆ خوارەوە دەپۆشرێت–و.

[2] واتە لە ناوچەی "سحولية"ەوە هاتبوو، شارێکە لە یەمەن.

بِاللَّيْلِ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهِ؛ إِلاَّ أَنْ يُضْطَرَّ إِنْسَانٌ إِلَى ذَلِكَ، وَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا كَفَّنَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ؛ فَلْيُحَسِّنْ كَفَنَهُ**). [م٩٤٣]

**(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) وتاری دا، باسی یەکێك لە هاوەڵانی خۆی کرد مردبوو، لە کفێکدا کفنکرابوو درێژ نەبوو، و شەو لە گۆڕ نرابوو، پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردینەوە لەوەی پیاو بە شەو لە گۆڕ نەنرێت تا نوێژی لەسەر دەکرێت، مەگەر مرۆڤ ناچار بێت بەو کارە، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە براکەی خۆی کفن کرد با کفنەکەی باش و چاك بێت).**

**١٦١٠**– عَنْ سَمُرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ، فَإِنَّهَا أَطْهَرُ وَأَطْيَبُ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ**). وفي رواية: (**فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ**). [ت٢٨١٠/ ن١٨٩٥/ جه٣٥٦٧]

* صحيح.

**لە سەمورەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (لە پۆشاکەکانتان سپی بپۆشن، چونکە پاکتر و چاکترە، هەروەها مردووەکانتانی تێدا کفن بکەن)، لە ریوایەتێکدا: (چونکە ئەوە لە باشترین پۆشاکەکانی ئێوەیە).**

## ١٤- دەروازەی: چۆن کەسێك لە ئیحرامدا بێت کفن دەکرێ

**١٦١١**– (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ وَاقِفٌ بِعَرَفَةَ، إِذْ وَقَعَ عَنْ رَاحِلَتِهِ فَوَقَصَتْهُ . أَوْ قَالَ: فَأَوْقَصَتْهُ . قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْنِ، وَلاَ تُحَنِّطُوهُ، وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّياً**). [خ١٢٦٥/ م١٢٠٦]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پیاوێك لە عەرەفە وەستا بوو لە وڵاخی سوارییەکەی بەربوویەوە ملی شکاند، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بە ئاو و سیدر بیشۆرن و لە دوو پۆشاکدا کفنی بکەن، بۆنی لێ مەدەن و سەری دامەپۆشن، ئەو لە ڕۆژی قیامەت بە "لبيك اللهم لبيك" زیندوو دەکرێتەوە).**

■ وفي رواية لهما: (وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ، وَلاَ تَمَسُّوهُ بِطِيبٍ).	[خ١٨٥١]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیاندا: (لە دوو پۆشاکەکەیدا کفنی بکەن و بۆنی خۆشی لێ مەدەن).**

## ١٥- دەروازەی: کفنکردن بە پۆشاکی کۆن

**١٦١٢-** (خ) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلْتُ عَلَى أَبِي بَكْرٍ ﵁، فَقَالَ: فِي كَمْ كَفَّنْتُمُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَتْ: فِي ثلاثةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ. وَقَالَ لَهَا: فِي أَيِّ يَوْمٍ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَتْ: يَوْمَ الاثْنَيْنِ، قَالَ: فَأَيُّ يَوْمٍ هذَا؟ قَالَتْ: يَوْمُ الاثْنَيْنِ، قَالَ: أَرْجُو فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَ اللَّيْلِ. فَنَظَرَ إِلَى ثَوْبٍ عَلَيْهِ كَانَ يُمَرَّضُ فِيهِ، بِهِ رَدْعٌ مِنْ زَعْفَرَانٍ، فَقَالَ: اغْسِلُوا ثَوْبِي هَذَا، وَزِيدُوا عَلَيْهِ ثَوْبَيْنِ، فَكَفِّنُونِي فِيهَا، قُلْتُ: إِنَّ هَذَا خَلَقٌ؟ قَالَ: إِنَّ الحَيَّ أَحَقُّ بِالجَدِيدِ مِنَ المَيِّتِ، إِنَّمَا هُوَ لِلْمُهْلَةِ.

فَلَمْ يُتَوَفَّ حَتَّى أَمْسى مِنْ لَيْلَةِ الثُّلاَثَاءِ، وَدُفِنَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ.	[خ١٣٨٧ (١٢٦٤)]

**(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: چوومە ژوورەوە بۆ لای ئەبوبەکر(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لە چەندداᐧ[١] پێغەمبەرتان کفن کرد؟ وتی: لە سێ پۆشاکی سپی سەحولییەدا، کراس و مێزەرەکەی تێدا نەبوو، بە عائیشەی وت: لە چ رۆژێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد؟ وتی: لە رۆژی دووشەممە، وتی: ئەمرۆ چ رۆژێکە؟ وتی: رۆژی دووشەممەیە، وتی: رجام وایە لە ئێستاوە بۆ شەو، تەماشای ئەو پۆشاکەی کرد تیایدا نەخۆشدەکەوت، پەڵەی زەعفەرانی پێوە بوو، وتی: ئەم پۆشاکەم بشۆرن و دوو پۆشاکی تری بخەنە سەر و منیان تێدا کفن بکەن، وتم: ئەوە رزیوە؟ وتی: زیندوو لەپێشترە بە نوێ تا مردوو، ئەوە بۆ کیماوە[٢].**

**نەمرد تا ئێوارەی شەوی سێشەمەی بەسەردا هات، بەرلەوەی رۆژی لێبێتەوە ئەسپەردەی خاك کرا.**

---

[١] واتە: لە چەند پۆشاکدا(کفندا)-و.

[٢] واتە: بۆ جەستەیەك لە خاکدا دەرزێت و سەرەتا دەبێتە کیماو-و.

## ١٦- دەروازەی: خێراکردن لە جەنازە

١٦١٣- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ، فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا إِلَيْهِ، وَإِنْ يَكُ سِوَى ذلِكَ، فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ). [خ١٣١٥/ م٩٤٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(خێرا بکەن لە جەنازە، گەر صالح بێت باشترینێکە پێشیبخەن بۆ لای، گەر شتێکی تر بوو جگە لەوە، خراپترینێکە لە گەردنی خۆتانی بکەنەوە).**

١٦١٤- (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا وُضِعَتِ الْجِنَازَةُ، وَاحْتَمَلَهَا الرِّجَالُ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ، فَإِنْ كَانَتْ صَالِحَةً قَالَتْ: قَدِّمُونِي، وَإِنْ كَانَتْ غَيْرَ صَالِحَةٍ قَالَتْ: يَا وَيْلَهَا! أَيْنَ يَذْهَبُونَ بِهَا؟ يَسْمَعُ صَوْتَهَا كُلُّ شَيْءٍ إِلاَّ الإِنْسَان، وَلَو سَمِعَهُ صَعِقَ). [خ١٣١٤]

(خ) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کە جەنازە دانرا و پیاوان لەسەر شانیان هەڵیانگرت، گەر صالح بێت دەڵێت: پێشمبخەن، گەر ناصالح بێت دەڵێت: هاوار بە حاڵم بۆ کوێی دەبەن؟ هەموو شتێك جگە لە مرۆڤ دەنگی دەبیستێ، گەر مرۆڤ بیبیستێ دەبورێتەوە).**

## ١٧- دەروازەی: فەزڵی شوێنکەوتنی جەنازە

١٦١٥- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنِ اتَّبَعَ جَنَازَةَ مُسْلِمٍ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً وَكَانَ مَعَهُ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا وَيُفْرَغَ مِنْ دَفْنِهَا فَإِنَّهُ يَرْجِعُ مِنَ الأَجْرِ بِقِيرَاطَيْنِ، كُلُّ قِيرَاطٍ مِثْلُ أُحُدٍ. وَمَنْ صَلَّى عَلَيْهَا، ثُمَّ رَجَعَ قَبْلَ أَنْ تُدْفَنَ، فَإِنَّهُ يَرْجِعُ بِقِيرَاطٍ). [خ٤٧/ م٩٤٥]

(ق) لە ئەبی هورەیرە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس شوێنی جەنازەی موسڵمانێك بکەوێت، بە ئیمان و حساب کردنی پاداشت، لەگەڵی بێت تا نوێژی لەسەر دەکرێت و لە شارینەوەی تەواو دەبێت، ئەوە بە دوو "قیراط" پاداشتەوە دەگەڕێتەوە، هەر "قیراط"ێك وەك چیای ئوحدە، هەر کەس نوێژی لەسەر بکات و پاشان بگەڕێتەوە بەرلەوەی دفن بکرێت، ئەوە بە "قیراط"ێکەوە دەگەڕێتەوە).**

١٦١٦- (ق) عَنْ نَافِعٍ قَالَ: حُدِّثَ ابْنُ عُمَرَ: أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: مَنْ تَبِعَ جَنَازَةً فَلَهُ قِيرَاطٌ، فَقَالَ: أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَلَيْنَا! فَصَدَّقَتْ ـ يَعْنِي ـ عائِشَةَ أَبَا هُرَيْرَةَ، وَقَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُهُ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما: لَقَدْ فَرَّطْنَا فِي قَرَارِيطَ كَثِيرَةٍ. [خ١٣٢٣، ١٣٢٤/ م٩٤٥]

(ق) لە نافیعەوە، وتی: بۆ ئیبن عومەر باسکرا: ئەبو هورەیرە(خوا لێی رازی بێت) دەڵێت: هەر کەس شوێنی جەنازەیەك بکەوێت "قیراط"ێك خێری هەیە، ئیبن عومەر وتی: ئەبو هورەیرە لەسەری زۆر کردین، عائیشە تەصدیقی ئەبو هورەیرەی کرد و وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو ئەوەی دەفەرموو: ئیبن عومەر(خوایان لێ رازی بێت) وتی: "قراریط"ێکی[1] زۆرمان لەدەستچووە.

## ١٨- دەروازەی: داوای لێخۆشبوون بۆ مردوو

١٦١٧- عَنِ ابْنِ سِيرِينَ: أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ: شَهِدَ جِنَازَةَ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، قَالَ: فَأَظْهَرُوا الاِسْتِغْفَارَ، فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ أَنَسٌ. [حم٤٠٨٠]

* إسناده على شرطهما.

لە ئیبن سیرینەوە: ئەنەسی کوڕی مالیك لەسەر جەنازەی پیاوێك لە ئەنصار ئامادە بوو، وتی: داوای لێخۆشبوونیان ئاشکرا کرد[2] ئەنەس ئەوەی بە ناپەسەند لەوان تەماشا نەکرد.

## ١٩- دەروازەی: شوێنکەوتنی جەنازە لە لایەن ئافرەتانەوە

١٦١٨- (ق) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﷺ قَالَتْ: نُهِينَا عَنِ اتِّبَاعِ الجَنَائِزِ، وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا.
[خ١٢٧٨ (٣١٣)، م٩٣٨]

(ق) لە ئوم عەتییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: نەهیمان لێکرا لە شوێنکەوتنی جەنازە، و زۆر پێداگر نەبوون لەسەرمان.

---

(١) واتە: زۆرێك لە پاداشتی مەزنمان لەدەستچووە-و.
(٢) واتە: بە دەنگی بەرز داوای لێخۆشبوونیان کرد-و.

## ٢٠- دەروازەی: نوێژ لەسەر جەنازە

١٦١٩- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَعى النَّجَاشِيَّ في الْيَوْمِ الَّذِي ماتَ فِيهِ، خَرَجَ إِلَى المصَلَّى، فَصَفَّ بِهِمْ، وَكَبَّرَ أَرْبَعاً. [خ١٢٤٥/ م٩٥١]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەواڵی مردنی نەجاشی راگەیاند لەو رۆژەی تیایدا مردبوو، رۆیشتە دەرەوە بۆ نوێژگە(مصلی) و ریزی کردن و چوار "الله أكبر"ی کرد.**

١٦٢٠- (م) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: كَانَ زَيْدٌ يُكَبِّرُ عَلَى جَنَائِزِنَا أَرْبَعاً، وَإِنَّهُ كَبَّرَ عَلَى جِنَازَةٍ خَمْساً، فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُكَبِّرُهَا. [م٩٥٧]

**(م) لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبی لەیلاوە، وتی: زەید لەسەر جەنازەکانمان چوار "الله أكبر"ی دەکرد، لەسەر جەنازەیەك پێنج "الله أكبر"ی کرد، پرسیارم لێکرد، وتی: پێغەمبەری خودا پێنج "الله أكبر"ی دەکرد.**

١٦٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَبَّرَ عَلَى جَنَازَةٍ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ فِي أَوَّلِ تَكْبِيرَةٍ، وَوَضَعَ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى. [ت١٠٧٧]

* حسن. وقال شعيب: ضعيف.

**لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر جەنازەیەك "الله أكبر"ی کرد، لە یەکەمین "الله أكبر"دا دوو دەستی بەرزکردەوە و دەستی راستی خستە سەر دەستی چەپ.**

١٦٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ، فَكَبَّرَ عَلَيْهَا أَرْبَعاً، وَسَلَّمَ تَسْلِيمَةً. [ك١٣٣٢]

**لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر جەنازەیەك نوێژی کرد، چوار "الله أكبر"ی لەسەر کرد و یەك سەلامیدایەوە.**

## ٢١- دەروازەی: حوكمەكانی شەهید لە نوێژ و شتانی تر

١٦٢٣- (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ يَقُولُ: (**أَيُّهُمْ أَكْثَرُ أَخْذاً لِلْقُرْآنِ**)؟ فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلَى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ، وَقَالَ: (**أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ فِي دِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُغَسَّلُوا، وَلَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِمْ. [خ١٣٤٣]

**(خ) لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دوو پیاو لە كوژراوەكانی ئوحدی لە یەك پۆشاكدا كۆدەكردەوە، پاشان دەیفەرموو: (كامیان قورئانیان زۆرتر وەرگرتووە؟)، گەر ئاماژە بۆ یەكێكیان بكرابا لە دانانی لە گۆڕەكە پێشی دەخست و دەیفەرموو: (من لە ڕۆژی قیامەتدا شایەتم لەسەر ئەوانە)، فەرمانی دەكرد بە خوێنەكانیانەوە بیانشارنەوە و نەشۆرێن و نوێژیان لەسەر نەكرێت.**

## ٢٢- دەروازەی: نوێژ لەسەر جەنازە لە مزگەوت

١٦٢٤- (م) عَنْ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ: أَنَّ عَائِشَةَ أَمَرَتْ أَنْ يُمَرَّ بِجَنَازَةِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَتُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَأَنْكَرَ النَّاسُ ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: مَا أَسْرَعَ مَا نَسِيَ النَّاسُ! مَا صَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى سُهَيْلِ ابْنِ الْبَيْضَاءِ إِلاَّ فِي الْمَسْجِدِ. [م٩٧٣]

**(م) لە عەببادی كوڕی عەبدوڵای كوڕی زوبەیرەوە: عائیشە فەرمانی كرد جەنازەی سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص بە مزگەوتدا تێپەڕێنرێت، و نوێژی لەسەر بكرێت، خەڵكی ئەوەیان لە عائیشە بە ناپەسەند بینی، بۆیە وتی: چەند زوو خەڵكی لەبیریان دەچێت! پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەنها لە مزگەوت نوێژی لەسەر "سهیل ابن البیضاء" كرد.**

## ٢٣- دەروازەی: خوێندنەوەی فاتیحە لە نوێژی جەنازەدا

١٦٢٥- (خ) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عَلَى جَنَازَةٍ، فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، فَقَالَ: لِيَعْلَمُوا أَنَّهَا سُنَّةٌ. [خ١٣٣٥]

(خ) لـە تەلحـەی کـوڕی عەبـدوڵای کـوڕی عەوفـەوە، وتـی: لـەدوای ئـیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) نوێژم لەسەر جەنازەیەك كرد، "فاتحة الكتـاب"ی خوێند و وتی: با بزانن ئەوە سوننەتە.

**١٦٢٦**- عَنِ الزُّهْرِي قالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو أُمَامَةَ بْنُ سَهْلٍ: أَنَّهُ أَخْبَرَهُ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّ السُّنَّةَ فِي الصَّلاَةِ عَلَى الْجَنَازَةِ أَنْ يُكَبِّرَ الإِمَامُ، ثُمَّ يَقْرأُ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ بَعْدَ التَّكْبِيرَةِ الأُولَى سِرّاً فِي نَفْسِهِ، ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَيُخْلِصُ الدُّعَاءَ لِلْجَنَازَةِ فِي التَّكْبِيرَاتِ لاَ يَقْرأُ فِي شَيْءٍ مِنْهُنَّ، ثُمَّ يُسَلِّمُ سِرّاً فِي نَفْسِهِ. [هق٤/٣٩]

لـە زوهرییـەوە، وتـی: ئـەبو ئومامـەی کـوڕی سـەهل هـەواڵی پێـدام: پیاوێـك لـە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداوە: سوننەت لە نوێـژی جـەنازەدا ئەوەیـە ئیمـام "الله أكبر" بکات، پاشان لەدوای "الله أكبر"ی یەکەم "فاتحة الكتاب" بە نهێنی و لـە نەفسی خۆیدا بخوێنێـت، پاشـان صـەڵەوات لەسـەر پێغەمبـەر(ﷺ) بـدات و دوعـا بـۆ جەنازەکە بکات لە چەند "الله أكبر"ێکدا، لە شتێك لەوانەدا قورئان ناخوێنێت، پاشان بە نهێنی و لە نەفسی خۆدا سڵاو دەداتەوە.

## ٢٤- دەروازەی: دوعـا بۆ مـردوو لـە نوێژدا

**١٦٢٧**- (م) عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى جِنَازَةٍ، فَحَفِظْتُ مِنْ دُعَائِهِ وَهُوَ يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ، وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَاراً خَيْراً مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلاً خَيْراً مِنْ أَهْلِهِ، وَزَوْجاً خَيْراً مِنْ زَوْجِهِ، وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ . أَوْ مِنْ عَذَابِ النَّارِ**).
قَالَ: حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنْ أَكُونَ أَنَا ذَلِكَ الْمَيِّتَ. [م٩٦٣]

(م) لە عەوفی کوڕی مالیکەوە، وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) لەسـەر جەنازەیـەك نوێژی کرد، لە دوعاکەی ئەمەم لەبەرکرد، ئـەو دەیفـەرموو: (**خودایـە، لێیخۆشـبە و بەزەیی پێبکە و عافییەتی پێببەخشە و لێی ببوورە و میواندارییەکەی ڕێز لێ بنێ و**

**شوێن و جێگەی بەرین بکە و بە ئاو و بەفر و تەرزە بیشۆرە و لە گوناهـان پـاکی بکەرەوە وەك چۆن پۆشاکی سپی لە چڵك پاکدەکەیەوە، بۆی بگۆڕە بە ماڵێك باشتر لەم ماڵەی، خانەوادەیەك باشتر لە خانەوادەکەی، هاوسەرێك باشتر لە هاوسەرەکەی، بیبە ناو بەهەشتەوە و لە سزای گۆڕ-یان لە سزای ئاگر- بیپارێزە).**

وتی: ئاواتم خواست من ئەو مردووە بوومایە.

**١٦٢٨**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى جَنَازَةٍ فَقَالَ: **(اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا، وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا، وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا. اللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الْإِيمَانِ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الْإِسْلَامِ. اللَّهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلاَ تُضِلَّنَا بَعْدَهُ)**.

* صحيح.                                [د٣٢٠١/ ت١٠٢٤/ جه١٤٩٨]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر جەنازەیەك نوێژی کرد و فەرمووی: **(خودایە لە زیندووان و مردووان، و بچووکان و گەوران، و نێران و مێیان، و ئامادەبوان و نادیارانی ئێمە خۆشببە، خودایە هەر کەست لە ئێمە ژیان لەسەر ئیمان بیژێنە، هەر کەست لە ئێمە مراند لەسەر ئیسلام بیمرێنە، خودایە لە پاداشتی ئەو ئێمە بێبەش نەکەی و لەدوای ئەو گومڕامان نەکەی)**.

## ٢٥- دەروازەی: شوێنی ئیمام لە جەنازە

**١٦٢٩**- (ق) عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ وَرَاءَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى امْرَأَةٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا، فَقَامَ عَلَيْهَا وَسَطَهَا.                                [خ١٣٣١ (٣٣٢)/ م٩٦٤]

(ق) لە سەموورەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لەدوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەسەر ئافرەتێك نوێژم کرد لە زەیسانیدا مرد بوو، لە ناوەڕاستی جەنازەکەیەوە پێغەمبەر بە پێوە وەستا.

**١٦٣٠**- عَنْ أَبِي غَالِبٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَلَى جَنَازَةِ رَجُلٍ، فَقَامَ حِيَالَ رَأْسِهِ، ثُمَّ جَاؤُوا بِجَنَازَةِ امْرَأَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَقَالُوا: يَا أَبَا حَمْزَةَ! صَلِّ عَلَيْهَا، فَقَامَ حِيَالَ وَسَطِ السَّرِيرِ، فَقَالَ لَهُ

الْعَلاَءُ بْنُ زِيَادٍ: هَكَذَا رَأَيْتَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَامَ عَلَى الْجَنَازَةِ مُقَامَكَ مِنْهَا، وَمِنَ الرَّجُلِ مُقَامَكَ مِنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: احْفَظُوا.

**لە ئەبی غالبەوە، وتی: لەگەڵ ئەنەسی کوڕی مالیك لەسەر جەنازەی پیاوێك نوێژم کرد لای سەریەوە وەستا، پاشان جەنازەی ئافرەتێکیان لە قورەیش هێنا و وتیان: ئەی باوکی حەمزە، نوێژی لەسەر بکە، نزیك بە ناوەڕاستی تابووتەکە وەستا، عەلای کوڕی زیاد پێی وت: پێغەمبەرت(ﷺ) بەم جۆرە بینی لەسەر جەنازە بوەستێت کە تۆ وەستای لە جەنازەی ئەو پیاوە؟ وتی: بەڵێ، کە تەواو بوو وتی: لەبەریبکەن[1].**

■ ورواية ابن ماجه: فَأَقْبَلَ عَلَيْنَا فَقَالَ: احْفَظُوا. [د٣١٩٤/ ت١٠٣٤/ جه١٤٩٤]

* صحيح.

**ریوایەتەکەی ئیبن ماجە: ڕووی تێکردین و وتی: لەبەریبکەن.**

**١٦٣١–** عَنْ عَمَّارٍ ـ مَوْلَى الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ ـ: أَنَّهُ شَهِدَ جَنَازَةَ أُمِّ كُلْثُومٍ وَابْنِهَا، فَجُعِلَ الْغُلاَمُ مِمَّا يَلِي الإِمَامَ، فَأَنْكَرْتُ ذَلِكَ، وَفِي الْقَوْمِ: ابْنُ عَبَّاسٍ وَأَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ وَأَبُو قَتَادَةَ وَأَبُو هُرَيْرَةَ، فَقَالُوا: هَذِهِ السُّنَّةُ. [د٣١٩٣/ ن١٩٧٦]

* صحيح.

**لە عەممارەوە –مەولای حاریسی کوڕی نەوفەل– ئەو لەسەر جەنازەی ئوم کلسووم و کوڕەکەی ئوم کلسووم ئامادە بوو، غوڵامەکە لای ئیمامەوە دانرا، من ئەوەم لا ناپەسەند بوو، لەناو خەڵکەکە ئیبن عەباس و ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو قەتادە و ئەبو هورەیرە هەبوون، وتیان: ئەمە سوننەتە.**

## ٢٦- دەروازەی: زۆری نوێژگەران و شفاعەتیان بۆ مردووەکە

**١٦٣٢–** (م) عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَا مِنْ مَيِّتٍ يُصَلِّي عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَبْلُغُونَ مِائَةً، كُلُّهُمْ يَشْفَعُونَ لَهُ؛ إِلاَّ شُفِّعُوا فِيهِ**). [م٩٤٧]

---

[1] واتە: فێری ببن و لەبیری مەکەن–و.

(م) لە عائیشەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(هەر مردوویەك كۆمەڵێك لە موسڵمانان بگەنە سەد كەس و نوێژی لەسەر بكەن و هەموویان تكای بۆ بكەن تكایان بۆ ئەو گیرادەبێت)**.

**١٦٣٣-** (م) عَنْ كُرَيْبٍ - مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ -، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّهُ مَاتَ ابْنٌ لَهُ بِقُدَيْدٍ أَوْ بِعُسْفَانَ، فَقَالَ: يَا كُرَيْبُ! انْظُرْ مَا اجْتَمَعَ لَهُ مِنَ النَّاسِ. قَالَ: فَخَرَجْتُ، فَإِذَا نَاسٌ قَدِ اجْتَمَعُوا لَهُ، فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ: تَقُولُ هُمْ أَرْبَعُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَخْرِجُوهُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ، فَيَقُومُ عَلَى جِنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلاً، لاَ يُشْرِكُونَ بِاللهِ شَيْئاً، إِلاَّ شَفَّعَهُمُ اللهُ فِيهِ**). [م٩٤٨]

(م) لە كورەیبەوە -مەولای ئیبن عەباس- لە عەبدوڵای كوڕی عەباسەوە: كوڕێكی لە "قُدَيْد" یان "عَسَفان"[1] مرد، وتی: ئەی كورەیب، وردبەرەوە و بزانە خەڵكی بۆی كۆبوونەتەوە، منیش چوومە دەرەوە بینیم خەڵكی بۆی كۆبوونەتەوە، هەواڵم پێدا و ئەویش وتی: دەڵێی ئەوان چل كەس ببن؟ وتی: بەڵێ، وتی: كەوابوو بیبەنە دەرەوە، من لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست دەیفەرموو: **(هەر پیاوێكی موسڵمان بمرێ و چل پیاو لەسەر جەنازەكەی رابوەستن، ئەوان شتێكیان نەكردبێتە هاوەڵ بۆ خودا، خودا تكایان بۆ ئەو وەردەگرێت)**.

## ٢٧- دەروازەی: سەنای خەڵكی بۆ مردووەكە

**١٦٣٤-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قَالَ: مَرُّوا بِجَنَازَةٍ، فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْراً، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**وَجَبَتْ**). ثُمَّ مَرُّوا بِأُخْرَى، فَأَثْنَوا عَلَيْهَا شَرّاً، فَقَالَ: (**وَجَبَتْ**). فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ ﷺ: ما وَجَبَتْ؟ قَالَ: (**هذا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْراً فَوَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةُ، وَهذا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرّاً فَوَجَبَتْ لَهُ النَّارُ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللهِ فِي الأَرْضِ**). [خ١٣٦٧/ م٩٤٩]

---

[1] (قديد و عسفان) دوو شوێنی نزیكن لە مەككە.

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: جەنازەیەکیان تێپەڕاند سەنای خێریان کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(وَجَبَتْ)**، پاشان جەنازەیەکی تریان تێپەڕاند بە شەڕ ناویانهێنا، فەرمووی: **(وَجَبَتْ)**، عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) وتی: **"وَجَبَتْ"** چییە؟ فەرمووی: **(ئەوەیان بە خێر سەناتان کرد بەهەشتی بۆ واجب بوو، ئەمەشیان بە شەڕ سەناتان کرد ئاگری بۆ واجب بوو، ئێوە شایەتانی خودان لە زەوی)**.

**١٦٣٥**– (خ) عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ الدِّيْلِيِّ قَالَ: قَدِمْتُ المدِينَةَ، وَقَدْ وَقَعَ بِهَا مَرَضٌ، فَجَلَسْتُ إِلَى عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ، فَمَرَّتْ بِهِمْ جَنَازَةٌ، فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا خَيْراً، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: وَجَبَتْ، ثُمَّ مُرَّ بِأُخْرَى، فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا خَيْراً، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: وَجَبَتْ. ثُمَّ مُرَّ بِالثَّالِثَةِ، فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا شَرّاً، فَقَالَ: وَجَبَتْ. فَقَالَ أَبُو الأَسْوَدِ: فَقُلْتُ: وَمَا وَجَبَتْ يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ؟ قَالَ: قُلْتُ كما قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَيُّمَا مُسْلِمٍ، شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيْرٍ، أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةِ)**، فَقُلْنَا: وَثَلاَثَةٌ، قَالَ: **(وَثَلاَثَةٌ)**، فَقُلْنَا: وَاثْنَانِ، قَالَ: **(وَاثْنَانِ)**. ثُمَّ لَمْ نَسْأَلْهُ عَنِ الْوَاحِدِ. [خ١٣٦٨]

(خ) لە ئەبی ئەسوەدی زەیلییەوە، وتی: هاتم بۆ مەدینە نەخۆشییەك تیایدا سەریهەڵدابوو، لای عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) دانیشتم، جەنازەیەك بە پاڵیاندا تێپەڕی، سەنای خێری کەسەکە کرا، عومەر(خوا لێی رازی بێت) وتی: "وَجَبَتْ"، پاشان جەنازەیەکی تریان برد و سەنای خێری کەسەکە کرا، ئەو وتی: "وَجَبَتْ"، پاشان جەنازەی سێیەم تێپەڕێنرا و بە خراپ ناوی کەسەکە هێنرا، ئەو وتی: "وَجَبَتْ"، ئەبو ئەسوەد وتی: وتم: "وَجَبَتْ" چییە، ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ وتی: ئەوەم وت هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر موسڵمانێك چوار کەس بە خێر شایەتی بۆ بدەن خودا دەیباتە بەهەشتەوە)**، وتمان: سیانیش؟ فەرمووی: **(سیانیش)**، وتمان: دوانیش؟ فەرمووی: **(دوانیش)**، بەڵام پرسیاری یەکمان لێ نەکرد.

## ٢٨- دەروازەی: بۆ خۆی ئاسوودە و لە دەستی ئاسوودە

**١٦٣٦-** (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بْنِ رِبْعِيٍّ الأَنْصَارِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مُرَّ عَلَيْهِ بِجِنَازَةٍ، فَقَالَ: (**مُسْتَرِيحٌ وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ**). قَالُوا: يَا رَسولَ اللهِ، مَا المسْتَرِيحُ وَالمسْتَرَاحُ مِنْهُ؟ قَالَ: (**العَبْدُ المُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ مِنْ نَصَبِ الدُّنْيَا وَأَذَاهَا إِلَى رَحْمَةِ اللهِ، وَالْعَبْدُ الْفَاجِرُ يَسْتَرِيحُ مِنْهُ الْعِبَادُ وَالْبِلاَدُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ**). [خ٦٥١٢/ م٩٥٠]

**(ق) لە ئەبی قەتادەی کوڕی ریبعی ئەنصارییەوە: جەنازەیەك بە پاڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) تێپەڕێنرا، فەرمووی: (مستریح ومستراح منه)، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) "مستریح ومستراح منه" چییە؟ فەرمووی: (بەندەی باوەڕدار لە ماندووبوون و ئازاری دنیا بۆ لای رەحمەتی خودا ئاسوودە دەبێت، بەندەی خراپەکاریش بەندەکان و وڵات و درەخت و چوارپێ لە دەستی ئاسوودە دەبن).**

## ٢٩- دەروازەی: وازهێنان لە نوێژ کردن لەسەر ئەو کەسەی خۆی دەکوژێت

**١٦٣٧-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِرَجُلٍ قَتَلَ نَفْسَهُ بِمَشَاقِصَ، فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ. [م٩٧٨]

**(م) لە جابری کوڕی سەمورەوە، وتی: پیاوێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر بە نێزە خۆی کوشتبوو، بۆیە پێغەمبەر نوێژی لەسەر نەکرد.**

## ٣٠- دەروازەی: ئەوەی بە مردوو دەگات لە پاداشت

**١٦٣٨-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَثَةٍ: إِلاَّ مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ**). [م١٦٣١]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر مرۆڤ مرد کاری دەبڕێت جگە لە سێ ڕێگە: جگە لە صەدەقەیەکی جاری، یان زانستێك سوودی لێ ببینرێت، یان منداڵێکی صالح دوعای بۆ بکات).**

## ٣١- دەروازەی: نوێژ لەسەر گۆڕ

**١٦٣٩-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَرَّ بِقَبْرٍ قَدْ دُفِنَ لَيْلاً، فَقَالَ: (**مَتَى دُفِنَ هذَا**)؟ قَالُوا: الْبَارِحَةَ، قَالَ: (**أَفَلاَ آذَنْتُمُونِي**)؟ قَالُوا: دَفَنَّاهُ فِي ظُلْمَةِ اللَّيْلِ، فَكَرِهْنَا أَنْ نُوقِظَكَ، فَقَامَ فَصَفَفْنَا خَلْفَهُ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَأَنَا فِيهِمْ، فَصَلَّى عَلَيْهِ. [خ١٣٢١]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پاڵ گۆڕێکدا تێپەڕی شەو نێژرابوو، فەرمووی: (کەی ئەمە نێژراوە؟)، وتیان: دوێنێ، فەرمووی: (ئەی بۆچی ئاگادارتان نەکردمەوە؟)، وتیان: لە تاریکی شەو ناشتمان، پێمان خۆش نەبوو بەئاگات بهێنین، پێغەمبەر وەستا و ئێمەش لەدواوەی ریزمان بەست، ئیبن عەباس وتی: من لە ناویان بووم، نوێژی لەسەر کرد.**

## ٣٢- دەروازەی: وەستانی بەڕێکەرانی جەنازە لەسەر گۆڕەکە و دوعا بۆی

**١٦٤٠-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا فَرَغَ مِنْ دَفْنِ الْمَيِّتِ، وَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ: (**اسْتَغْفِرُوا لِأَخِيكُمْ، وَسَلُوا لَهُ بِالتَّثْبِيتِ، فَإِنَّهُ الْآنَ يُسْأَلُ**). [د٣٢٢١]

* صحيح.

[وانظر: ١٠].

**لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە، وتی: کە پێغەمبەر(ﷺ) لە ناشتنی مردوو دەبوویەوە لەسەری دەوەستا و دەیفەرموو: (داوای لێخۆشبوون بکەن بۆ براکەتان، داوای دامەزرانی بۆ بکەن، چونکە ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت).**

## ٣٣- دەروازەی: وەستان بۆ جەنازە

**١٦٤١-** (ق) عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ جِنَازَةً، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ مَاشِياً مَعَهَا فَلْيَقُمْ حَتَّى يُخَلِّفَهَا، أَوْ تُخَلِّفَهُ، أَوْ تُوضَعَ مِنْ قَبْلِ أَنْ تُخَلِّفَهُ**).

[خ١٣٠٨ (١٣٠٧)/ م٩٥٨]

(ق) لە عامری کوڕی رەبیعەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە جەنازەیەکی بینی، گەر لەگەڵی نەدەڕۆیشت با بە پێوە بوەستێت تا بەجێیدەهێڵێت، یان تا جەنازەکە ئەو بەجێدەهێڵێت، یان دادەنرێت بەرلەوەی جەنازەکە ئەو بەجێبهێڵێت).**

**١٦٤٢**– (م) عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: رَأَيْنَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَامَ فَقُمْنَا، وَقَعَدَ، فَقَعَدْنَا. يَعْنِي: فِي الْجِنَازَةِ. [م٩٦٢]

**(م) لە عەلییەوە، وتی: پێغەمبەری خودامان(ﷺ) بینی وەستا ئێمەش وەستاین، دانیشت، ئێمەیش دانیشتین، واتە: لە جەنازەدا.**

**١٦٤٣**– عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَلِيٍّ، فَمَرَّتْ بِهِ جَنَازَةٌ، فَقَامُوا لَهَا، فَقَالَ عَلِيٌّ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: أَمْرُ أَبِي مُوسَى، فَقَالَ: إِنَّمَا قَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِجَنَازَةِ يَهُودِيَّةٍ، وَلَمْ يَعُدْ بَعْدَ ذَلِكَ.
* صحيح. [ن١٩٢٢]

**لە ئەبی مەعمەرەوە، وتی: لای عەلی بووین، جەنازەیەك بە پاڵیدا گوزەری کرد بۆ جەنازەکە بە پێوە وەستان، عەلی وتی: ئەمە چییە؟ وتیان: ئەبو موسا فەرمانی کردووە، عەلی وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ جەنازەی ئافرەتێکی یەهوودی بە پێوە وەستا، لەدوای ئەوە نەگەڕایەوە سەری.**

## ٣٤- دەروازەی: حوکمەکانی گۆڕ

**١٦٤٤**– (م) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ: أَنَّه قَالَ فِي مَرَضِهِ الَّذِي هَلَكَ فِيهِ: الْحَدُوا لِي لَحْداً، وَانْصِبُوا عَلَيَّ اللَّبِنَ نَصْباً، كَمَا صُنِعَ بِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [م٩٦٦]

**(م) لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە: ئەو لەو نەخۆشییەی تیایدا مرد وتی: لاوانەیەکم بۆ لێبدەن و خشت لەسەرم دابنێن، وەك چۆن ئەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا.**

١٦٤٥- (م) عَنْ أَبِي الْهَيَّاجِ الأَسَدِيِّ قَالَ: قَالَ لِي عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ: أَلاَّ أَبْعَثُكَ عَلَى مَا بَعَثَنِي عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ أَنْ لاَ تَدَعَ تِمْثَالاً إِلاَّ طَمَسْتَهُ، وَلاَ قَبْراً مُشْرِفاً إِلاَّ سَوَّيْتَهُ. [م٩٦٩]

**(م) لە ئەبی هەییاجی ئەسەدییەوە، وتی: عەلی کوڕی ئەبی تالب پێی وتم: دەتەوێ ڕەوانەت بکەم بۆ سەر ئەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) منی ڕەوانەکرد بۆی؟ هەر پەیکەرێکت بینی بیسڕەوە[1]، هەر گۆڕێکت بینی بەرزبووبوویەوە تەختی بکە.**

١٦٤٦- (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يُجَصَّصَ الْقَبْرُ، وَأَنْ يُقْعَدَ عَلَيْهِ، وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهِ. [م٩٧٠]

**(م) لە جابرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد گۆڕ گەچکاری بکرێت، و لەسەری دابنیشن و بینای لەسەر بکەن.**

١٦٤٧- (م) عَنْ أَبِي مَرْثَدٍ الْغَنَوِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَجْلِسُوا عَلَى الْقُبُورِ، وَلاَ تُصَلُّوا إِلَيْهَا)**. [م٩٧٢]

**(م) لە ئەبی مەرسەدی غەنەوییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لەسەر گۆڕ دامەنیشن و نوێژی لە لا مەکەن).**

## ٣٥- دەروازەی: مردوو شوێنی خۆی پێ نیشان دەدرێت

١٦٤٨- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ، عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَيُقَالُ: هذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)**.
[خ١٣٧٩/ م٢٨٦٦]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کە یەکێك لە ئێوە دەمرێت بەیانیان و ئێواران شوێنەکەی خۆی پێ**

---

[1] واتە: وردوخاشی بکە یان ئاساری مەهێڵە-و.

**نیشان دەدرێت، گەر لە ئەهلی بەهەشت بوو لە ئەهلی بەهەشتە، گەر لە ئەهلی ئاگر بوو لە ئەهلی ئاگرە، دەوترێت: ئەوە شوێنەکەی تۆیە تا خودا رۆژی قیامەت زیندووت دەکاتەوە).**

## ٣٦- دەروازەی: پرسیاری گۆڕ

**١٦٤٩-** (ق) عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ، وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ . وَإِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ . أَتَاهُ مَلَكَانِ فَيُقْعِدَانِهِ فَيَقُولاَنِ**: ما كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ لِمُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ، فَيُقَالُ لَهُ: انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ، قَدْ أَبْدَلَكَ اللهُ بِهِ مَقْعَداً مِن الجَنَّةِ، فَيَرَاهُمَا جَمِيعاً). [خ١٣٧٤ (١٣٣٨)/ م٢٨٧٠]

(ق) لە قەتادەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بەندە نرایە ناو گۆڕەکەی و هاوەڵانی پشتیان هەڵکرد-ئەو گوێی لە دەنگی پێی نەعلەکانی ئەوانە- دوو فریشتە دێن بۆ لای و دایدەنیشێنن و دەڵێن: چی دەربارەی ئەو پیاوە، محەمەد(ﷺ) دەڵێی؟ باوەڕدار دەڵێت: شایەتی دەدەم ئەو بەندە و پێغەمبەری خودایە، پێی دەوترێت: تەماشای جێگەکەت بکە لە ئاگر، خودا بۆی ئاڵوگۆڕ کردیت بە جێگەیەك لە بەهەشت، هەردوو جێگەکە دەبینێت).**

- قَالَ قَتَادَةُ: وَذُكِرَ لَنَا: أَنَّهُ يُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ. زاد مسلم: سَبْعُونَ ذِرَاعاً، وَيُمْلأُ عَلَيْهِ خَضِراً إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ.

**قەتادە دەڵێت: بۆمان باسکراوە: گۆڕەکەی بۆ بەرین دەکرێت، موسلیم ئەمەی زیاد کردووە: حەفتا باڵ، و بۆی پڕ دەکرێت لە سەوزی تا ئەو رۆژەی زیندوو دەکرێنەوە.**

**١٦٥٠-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي جَنَازَةِ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَبْرِ وَلَمَّا يُلْحَدْ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ، كَأَنَّمَا عَلَى رُؤُوسِنَا الطَّيْرُ، وَفِي يَدِهِ عُودٌ يَنْكُتُ بِهِ فِي الْأَرْضِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: **(اسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ)** مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً.

زَادَ فِي حَدِيثِ جَرِيرٍ هَاهُنَا، وَقَالَ: (وَإِنَّهُ لَيَسْمَعُ خَفْقَ نِعَالِهِمْ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ حِينَ يُقَالُ لَهُ: يَا هَذَا، مَنْ رَبُّكَ، وَمَا دِينُكَ، وَمَنْ نَبِيُّكَ)؟

قَالَ هَنَّادٌ: قَالَ: (وَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللهُ، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا دِينُكَ؟ فَيَقُولُ: دِينِيَ الْإِسْلاَمُ، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ)؟ قَالَ: (فَيَقُولُ: هُوَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَيَقُولاَنِ: وَمَا يُدْرِيكَ؟ فَيَقُولُ: قَرَأْتُ كِتَابَ اللهِ، فَآمَنْتُ بِهِ وَصَدَّقْتُ).

زَادَ فِي حَدِيثِ جَرِيرٍ: (فَذَلِكَ قَوْلُ اللهِ عزّ وجل: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ الْآيَةُ[إبراهيم:٢٧]).

ثُمَّ اتَّفَقَا، قَالَ: (فَيُنَادِي مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ: أَنْ قَدْ صَدَقَ عَبْدِي، فَأَفْرِشُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَافْتَحُوا لَهُ بَاباً إِلَى الْجَنَّةِ، وَأَلْبِسُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ) قَالَ: (فَيَأْتِيهِ مِنْ رَوْحِهَا وَطِيبِهَا) قَالَ: (وَيُفْتَحُ لَهُ فِيهَا مَدَّ بَصَرِهِ).

قَالَ: (وَإِنَّ الْكَافِرَ . فَذَكَرَ مَوْتَهُ قَالَ: . وَتُعَادُ رُوحُهُ فِي جَسَدِهِ، وَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ فَيَقُولاَنِ له: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ، هَاهْ، لاَ أَدْرِي، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا دِينُكَ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ، هَاهْ، لاَ أَدْرِي، فَيَقُولاَنِ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ، هَاهْ، لاَ أَدْرِي. فَيُنَادِي مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ: أَنْ كَذَبَ، فَأَفْرِشُوهُ مِنَ النَّارِ، وَأَلْبِسُوهُ مِنَ النَّارِ، وَافْتَحُوا لَهُ بَاباً إِلَى النَّارِ). قَالَ: (فَيَأْتِيهِ مِنْ حَرِّهَا وَسَمُومِهَا). قَالَ: (وَيُضَيَّقُ عَلَيْهِ قَبْرُهُ حَتَّى تَخْتَلِفَ فِيهِ أَضْلاَعُهُ).

زَادَ فِي حَدِيثِ جَرِيرٍ قَالَ: (ثُمَّ يُقَيَّضُ لَهُ أَعْمَى أَبْكَمُ مَعَهُ مِرْزَبَّةٌ مِنْ حَدِيدٍ، لَوْ ضُرِبَ بِهَا جَبَلٌ لَصَارَ تُرَاباً). قَالَ: (فَيَضْرِبُهُ بِهَا ضَرْبَةً يَسْمَعُهَا مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ؛ إِلاَّ الثَّقَلَيْنِ، فَيَصِيرُ تُرَاباً). قَالَ: (ثُمَّ تُعَادُ فِيهِ الرُّوحُ). [د٤٧٥٣ (٣٢١٢)/ ن٢٠٠٠/ جه١٥٤٩]

* صحيح.

لە بەرائی کوڕی عازیبەوە، وتی: لە جەنازەی پیاوێکی ئەنصاردا لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشتینە دەرەوە، گەیشتینە گۆڕەکە، هێشتا گۆڕیچەی نەچنرابوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشت و ئێمەش بە دەوریدا دانیشتین، وەك ئەوەی باڵندە بەسەر سەرمانەوە نیشتبێتەوە، دارێك بە دەستییەوە بوو دەیدا لە زەوی، سەری بەرزکردەوە و فەرمووی: **(پەنابگرن بە خودا لە سزای گۆڕ)** دوو جار یان سێ جار.

له فەرموودەکەی جەریردا: "ئا لێرە" زیاد بووە، هەروەها فەرمووی: **(ئەو تەپەی نەعلەکانیان دەبیستێ کاتێك پشتهەڵدەکەن، ئەو دەمەی پێی دەوترێت: ئەی کابرا، پەروەردگاری تۆ کێیە، دینەکەی تۆ چییە، پێغەمبەرەکەت کێیە)؟.**

هەنناد دەڵێت: فەرمووی: **(دوو فریشتە دێن بۆ لای دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: پەروەردگاری تۆ کێیە؟ ئەویش دەڵێ: پەروەردگارم "الله"یە، پێی دەڵێن: دینەکەت چییە؟ دەڵێت: دینەکەم ئیسلامە، پێی دەڵێن: ئەو پیاوە چی، لەناو ئێوە رەوانە کرا؟** فەرمووی: **(دەڵێت: ئەو پێغەمبەری خودایە(ﷺ)، دەڵێن: چۆن دەزانی؟ دەڵێت: کتێبەکەی خودام خوێندەوە، ئیمانم پێ هێنا و بە راستم زانی).**

له فەرموودەکەی جەریر ئەمە زیاد بووە: **(ئەوە فەرموودەکەی خودایە(عز وجل):** ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ [إبراهيم:٢٧]، پاشان هەردووکیان رێکەوتوون، فەرمووی: **(بانگکەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات: بەندەکەم راستی کرد، لە بەهەشتی بۆ رابخەن و دەرگایەکی بۆ بکەنەوە بۆ بەهەشت و لە پۆشاکی بەهەشتی بکەن بەبەردا)**، فەرمووی: **(لە "رَوح و طِيب"[1]ی بەهەشتی بۆ دەهێنن)**، فەرمووی: **(هەتا چاو هانا بکات بۆی دەکرێتەوە).**

فەرمووی: **(کەسی بێباوەڕ–**باسی مردنەکەی کرد و فەرمووی:– **رۆحی دەگێڕێتەوە بۆ جەستەی و دوو فریشتە دێن بۆ لای و دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: پەروەردگاری تۆ کێیە؟ دەڵێت: ها، ها، نازانم، پێی دەڵێن: دینەکەت چییە؟ دەڵێت: ها، ها، نازانم، دەڵێن: ئەو پیاوە چی لە ناو ئێوە رەوانە کرا؟ دەڵێت: ها، ها، نازانم، بانگکەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات: درۆی کرد، لە ئاگر فەرشی بۆ رابخەن، پۆشاکی ئاگری لەبەریکەن، و دەرگایەکی بۆ بکەنەوە بۆ ئاگر)**، فەرمووی: **(لە گەرمی و ژەهری ئاگری بۆ دێت)**، فەرمووی: **(گۆڕەکەی لێ تەنگ دەکرێتەوە تا پەراسووەکانی دەچن بە ناو یەکدا).**

---

(1) واتە: ئاسوودەیی و خۆشی و بۆنی بەهەشتی بۆ دەهێنن–و.

لە فەرموودەکەی جەریر ئەمە زیاد بووە، فەرمووی: **(پاشان کونێکی لاڵی بۆ تەرخان دەکرێت گورزێکی لە ئاسن بە دەستەوەیە، گەر بیکێشێت بە چیادا دەبێت بە خۆڵ)**، فەرمووی: **(لێدانێکی لێ دەدات نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا دەیبیستن، جگە لە مرۆڤ و جنۆکە، بۆیە دەیکات بە خۆڵ)**، فەرمووی: **(پاشان رۆحی بۆ دەگەڕێتەوە)**.

## ٣٧- دەروازەی: سزای گۆڕ

**١٦٥١-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى قَبْرَيْنِ، فَقَالَ: **(إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ مِنْ كَبِيرٍ)**. وفي رواية (**فِي كبير**) ثُمَّ قَالَ: **(بَلَى، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ يَسْعَى بِالنَّمِيمَةِ، وَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ)**. قَالَ: ثُمَّ أَخَذَ عُوداً رَطْباً فَكَسَرَهُ بِاثْنَيْنِ، ثُمَّ غَرَزَ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى قَبْرٍ، ثُمَّ قَالَ: **(لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا ما لَمْ يَيْبِسَا)**. [خ١٣٧٨ (٢١٦)/ م٢٩٢]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە پاڵ دوو گۆڕدا تێپەڕی، فەرمووی: **(ئەو دوانە سزا دەدرێن و لە گوناهی گەورەوە(من کبیر) سزا نادرێن)**، لە ریوایەتێکدا (**في کبیر-لەپێناو گوناهی گەورە**)، پاشان فەرمووی: **(با، یەکێکیان هەوڵی دووزمانی دەدا، ئەویتریان لە میز خۆی پاك رانەدەگرت)**، وتی: پاشان چیلکەیەکی تەڕی گرت و شکاندی و کردی بە دوو بەشەوە هەریەکەیانی لەسەر یەکێك لە گۆڕەکان ناشت، پاشان فەرمووی: **(بەڵکو لەسەریان سووك بکەن تا وشك نەبوونەتەوە[1])**.

**١٦٥٢-** (ق) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَقَدْ وَجَبَتِ الشَّمْسُ، فَسَمِعَ صَوْتاً، فَقَالَ: **(يَهُودُ تُعَذَّبُ فِي قُبُورِهَا)**.

(ق) لە ئەبی ئەیوبەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە خۆر بزر بووبوو، ئەو گوێی لە دەنگێك بوو، فەرمووی: **(یەهود لە گۆڕەکانیان سزا دەدرێن)**.

---

[1] واتە: بەڵکو تا بە تەڕی ئەو دوو چڵە دارە کە تەسبیح دەکەن سزاکەیان لەسەر سووك بکەن-و.

▪ ولفظ مسلم: بَعْدَما غَرَبَتِ الشَّمْسُ. [خ١٣٧٥/ م٢٨٦٩]

لەفزەکەی موسلیم: لەدوای ئەوەی خۆرئاوابوو.

## ٣٨- دەروازەی: پەناگرتن لە سزای گۆڕ

**١٦٥٣-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ يَهُودِيَّةً دَخَلَتْ عَلَيْهَا، فَذَكَرَتْ عَذَابَ الْقَبْرِ، فَقَالَتْ لَهَا: أَعَاذَكِ اللهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، فَسَأَلَتْ عائِشَةُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، فَقَالَ: **(نَعَمْ، عَذَابُ الْقَبْرِ حَقٌّ)**. قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَعْدُ صَلَّى صَلاَةً إِلاَّ تَعَوَّذَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ. [خ١٣٧٢ (١٠٤٩)/ م٩٠٣]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت): ئافرەتێکی یەهوودی هاتە ژوورەوە بۆ لای و باسی سزای گۆڕی کرد و پێی وت: خودا لە سزای گۆڕ پەنات بدات، عائیشە پرسیاری سزای گۆڕی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد، فەرمووی: (بەڵێ، سزای گۆڕ حەقە)، عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: دواتر هەر کات پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینیبێت نوێژ بکات پەنای گرتووە لە سزای گۆڕ[1].**

**١٦٥٤-** (خ) عَنْ مُوسى بْنِ عُقْبَةَ قَالَ: حَدَّثَتْنِي ابْنَةُ خالِدِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ: أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ. [خ١٣٧٦]

**(خ) لە موسای کوڕی عوقبەوە، وتی: کچەکەی خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص بۆی باس کردم: ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بووە پەنای دەگرت لە سزا و ئازاری گۆڕ.**

**١٦٥٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَقُولُ: **(اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ)**. [ن٢٠٥٩]

* صحيح.

---

[1] **واتە: پەنای گرتووە بە خودا لە سزای گۆڕ و فەرموویەتی: (أللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر)-و.**

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، دەیفەرموو: **(أللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر، وأعوذ بك من عذاب النار، وأعوذ بك من فتنة المحيا وممات، وأعوذ بك من فتنة المسيح الدجال)**.

## ٣٩- دەروازەی: چی دەوترێت لە کاتی چوونەژوورەوە بۆ ناو قەبرستان

**١٦٥٦-** (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم -كُلَّمَا كَانَ لَيْلَتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم- يَخْرُجُ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ إِلَى الْبَقِيعِ، فَيَقُولُ: **(السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَأَتَاكُمْ مَا تُوعَدُونَ غَداً، مُؤَجَّلُونَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأَهْلِ بَقِيعِ الْغَرْقَدِ)**. [م٩٧٤]

(م) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)-هەرکات سەرەی ئەو بووە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)- لە کۆتایی شەو پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەچوو بۆ بەقیع و دەیفەرموو: **(السلام عليكم دار قوم مؤمنين، وأتاكم ما توعدون غدا، مؤجّلون، وإنا إنشاءالله بكم لاحقون، أللهم اغفر لاهل بقيع الغرقد)**.

**١٦٥٧-** (م) عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُعَلِّمُهُمْ إِذَا خَرَجُوا إِلَى الْمَقَابِرِ، فَكَانَ قَائِلُهُمْ يَقُولُ: **(السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ لَلاَحِقُونَ، أَسْأَلُ اللهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ)**. [م٩٧٥]

(م) لە بورەیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فێری دەکردن گەر چوونە دەرەوە بۆ گۆڕستان یەکێك لەوان دەیوت: **(السلام عليكم أهل الديار من المؤمنين والمسلمين، وإنا إن شاء الله بكم لاحقون، أسأل الله لنا ولكم العافية)**.

## ٤٠- دەروازەی: هاندان بۆ سەردانی گۆڕستان

**١٦٥٨-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: زَارَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم قَبْرَ أُمِّهِ، فَبَكَى وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ، فَقَالَ: **(اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي فِي أَنْ أَسْتَغْفِرَ لَهَا فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي، وَاسْتَأْذَنْتُهُ فِي أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا فَأُذِنَ لِي؛ فَزُورُوا الْقُبُورَ، فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ الْمَوْتَ)**. [م٩٧٦]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: **پێغەمبەر(ﷺ) زیارەتی گۆڕی دایکی کرد، ئەو گریا و ئەوانەی دەوروبەری گریان، فەرمووی: (داوام لە پەروەردگارم کرد داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم مۆڵەتی نەدام، داوای مۆڵەتم لێکرد سەردانی گۆڕەکەی بکەم مۆڵەتیدام، بۆیە سەردانی گۆڕستان بکەن، چونکە مردن بە بیر دەهێنێتەوە).**

## ٤١- دەروازەی: پەلکی دارخورما لەسەر گۆڕ

**١٦٥٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى قَبْرٍ فَقَالَ: (**ائْتُونِي بِجَرِيدَتَيْنِ**) فَجَعَلَ إِحْدَاهُمَا عِنْدَ رَأْسِهِ، وَالْأُخْرَى عِنْدَ رِجْلَيْهِ، فَقِيلَ: يَا نَبِيَّ الله، أَيَنْفَعُهُ ذَلِكَ؟ قَالَ: (**لَنْ يَزَالَ أَنْ يُخَفَّفَ عَنْهُ بَعْضُ عَذَابِ الْقَبْرِ مَا كَانَ فِيهِمَا نُدُوٌّ**). [حم٩٦٨٦]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پاڵ گۆڕێکدا گوزەری کرد، فەرمووی: **(دوو پەلکە دارخورمام بۆ بهێنن)**، یەکێکیانی لای سەریەوە دانا و ئەویتریان لای دوو قاچییەوە، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا ئەوە سوودی پێ دەگەیەنێت؟ فەرمووی: **(بەردەوام هەندێ لە سزای گۆڕی لەسەر سووک دەکات تا تەڕییان تێدا بێت).**

## ٤٢- دەروازەی: پاداشتی کەسێك منداڵێکی مردووە و چاوی لە پاداشتی خودایە

**١٦٦٠-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ يَمُوتُ لِمُسْلِمٍ ثَلاَثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ، فَيَلِجَ النَّارَ، إِلاَّ تَحِلَّةَ الْقَسَمِ**). [خ١٢٥١/ م٢٦٣٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(هەر موسڵمانێك سێ منداڵی بمرێت ناچێتە ئاگرەوە، جگە لە بەجێهێنانی سوێندەکە[1]).**

---

[1] مەبەست لە سوێندەکە ئەم ئایەتەیە: ﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا﴾[مريم: ٧١].

**١٦٦١-** (خ) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**ما مِنَ النَّاسِ مِنْ مُسْلِمٍ، يُتَوَفَّى لَهُ ثَلاَثٌ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ، إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ**). [خ١٢٤٨]

**(خ) له ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەر خەڵکێ لە موسڵمان سێ منداڵی بمرن و نەگەیشتبنە باڵغبوون خودا بە فەزڵی رەحمەتی خۆی بە ئەو دەیباتە بەهەشتەوە).**

## ٤٣- دەروازەی: تەزکییەی کەس ناکرێت

**١٦٦٢-** (خ) عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ: أَنَّ أُمَّ الْعَلاَءِ . امْرَأَةٌ مِنْ نِسَائِهِمْ قَدْ بَايَعَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم . أَخْبَرَتْهُ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ طَارَ لَهُمْ سَهْمُهُ فِي السُّكْنَى، حِينَ أَقْرَعَتِ الأَنْصَارُ سُكْنَى الْمُهَاجِرِينَ، قَالَتْ أُمُّ الْعَلاَءِ: فَسَكَنَ عِنْدَنَا عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ، فَاشْتَكَى فَمَرَّضْنَاهُ، حَتَّى إِذَا تُوُفِّيَ، وَجَعَلْنَاهُ فِي ثِيَابِهِ، دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقُلْتُ: رَحْمَةُ اللهِ عَلَيْكَ أَبَا السَّائِبِ، فَشَهَادَتِي عَلَيْكَ لَقَدْ أَكْرَمَكَ اللهُ، فَقَالَ لِي النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**وَمَا يُدْرِيكِ أَنَّ اللهَ أَكْرَمَهُ**)؟ فَقُلْتُ: لاَ أَدْرِي، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسولَ اللهِ! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَمَّا عُثْمَانُ فَقَدْ جَاءَهُ وَاللهِ الْيَقِينُ، وَإِنِّي لأَرْجُو لَهُ الْخَيْرَ. وَاللهِ ما أَدْرِي . وَأَنَا رَسُولُ اللهِ . ما يُفْعَلُ بِهِ**). قَالَتْ: فَوَاللهِ لاَ أُزَكِّي أَحَداً بَعْدَهُ أَبَداً. وَأَحْزَنَنِي ذلِكَ، قَالَتْ: فَنِمْتُ، فَأُرِيتُ لِعُثْمَانَ عَيْناً تَجْرِي، فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: (**ذلِكَ عَمَلُهُ**). [خ٢٦٨٧ (١٢٤٣)]

**(خ) لە خاریجەی کچی زەیدی ئەنصارییەوە: ئوم عەلا، ئافرەتێك بوو لە ئەنصارییەکان بەیعەتی بە پێغەمبەر(ﷺ) دابوو، ئەو هەواڵی پێداوە: عوسمانی کوڕی مەزعوون لە قورعەی نیشتەجێبووندا-کاتێ ئەنصار قورعەیان دەکرد بۆ نیشتەجێ کردنی کۆچکەران- قورعەکەی بۆ ئەوان دەرچوو، ئوم عەلا دەڵێت: عوسمانی کوڕی مەزعوون لای ئێمە نیشتەجێ بوو، نەخۆشکەوت و پەرستاریمان بۆ کرد، تا مرد و لە پۆشاکەکەی خۆیدا دامانا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لامان، وتم: رەحمەتی خودات لەسەر باوکی سائیب، شایاتی من لەسەر تۆ خودا رێزی لێناویت، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: (چون دەزانی خودا رێزی لێناوە؟)، وتم: دایك و باوکم**

فیدات بێت، ئەی پێغەمبەری خودا، نازانم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند به خودا، عوسمان یەقینی بۆ هات[1]، من رجای خێری بۆ دەکەم، سوێند بە خودا، من پێغەمبەری خودام و نازانم چی پێ دەکرێت)**، ئوم عەلا وتی: سوێند بە خودا، لەدوای ئەو هەرگیز تەزکییەی کەس ناکەم، و ئەوەش دڵتەنگی کردم، هەروەها وتی: خەوتم و چاوگەیەکیان بۆ عوسمان نیشاندام جاری دەبوو، هاتم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هەواڵم پێدا و فەرمووی: **(ئەوە کارەکەیەتی[2])**.

**١٦٦٣**- عَنْ أُمِّ العَلاَءِ فِي حَدِيثِها عَنْ عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُون وَثَنَائِهَا عَلَيْهِ عِنْدَ مَوْتِهِ وَقَوْلِهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي ذَلِكَ.

**له ئوم عەلاوە لە فەرموودەکەی دەربارەی عوسمانی کوڕی مەزعوون و سەنای ئەو لەسەری لە کاتی مردنی و فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لەو بارەیەوە.**

- وزاد في رواية: فَكَرِهَ المسْلِمُونَ مَا قَالَه صلّى الله عليه وسلّم لِعُثْمَانَ، حَتَّى تُوُفِيَتْ ابْنَةُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**الْحَقِي بِفَرَطِنَا عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُون**). [هق٤/٧٦]

**لە ریوایەتێکدا ئەمە زیاد بووە: ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی عوسمان فەرمووی موسڵمانان لایان گران بوو، تا کچەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، فەرمووی: (بگە بە پێشەنگی ئێمە، عوسمانی کوڕی مەزعوون).**

## ٤٤- دەروازەی: نەهی لە قسەوتن بە مردوو

**١٦٦٤**- (خ) عَنْ عائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ، فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى ما قَدَّمُوا**). [خ١٣٩٣]

**(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (قسە بە مردوو مەڵێن، ئەوان رۆیشتوون بۆ لای ئەوەی پێش خۆیان خست).**

---

[1] **یەقینی بۆ هات: واتە مردنی بۆ هات: ﴿حَتَّى أَتَانَا الْيَقِينُ﴾[المدثر: ٤٧].**

[2] **واتە: ئەو چاوگەی لە خەونەکە بینیوتە کارە چاکەکانی عوسمانە-و.**

**١٦٦٥**– عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم (**لاَ تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ فَتُؤْذُوا الأَحْيَاءَ**). [ت١٩٨٢]

* صحيح.

**له موغیرەی کوڕی شوعبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (قسە بە مردوو مەڵێن زیندوو ئازار دەدات).**

## ٤٥- دەروازەی: ڕۆیشتن و پشتهەڵکردن لە جەنازە

**١٦٦٦**– عَنْ ثَوْبَانَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، أُتِيَ بِدَابَّةٍ وَهُوَ مَعَ الْجَنَازَةِ، فَأَبَى أَنْ يَرْكَبَهَا، فَلَمَّا انْصَرَفَ أُتِيَ بِدَابَّةٍ فَرَكِبَ، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ: (**إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ كَانَتْ تَمْشِي، فَلَمْ أَكُنْ لِأَرْكَبَ وَهُمْ يَمْشُونَ، فَلَمَّا ذَهَبُوا رَكِبْتُ**). [د٣١٧٧]

* صحيح.

**له سەوبانەوە: وڵاخێکی سواری هێنرا بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەو لەگەڵ جەنازەیەك بوو، نەیویست سواری ببێت، کاتێك پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت وڵاخێکی سوارییان هێنا سواری بوو، لەو بارایەوە پرسیار کرا، فەرمووی: (فریشتەکان بەپێ دەڕۆیشتن، بۆیە من سوار نەبووم ئەوان بەپێ بڕۆن، کاتێك ئەوان ڕۆیشتن سواربووم).**

## ٤٦- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی گۆڕی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" هاتووە

**١٦٦٧**– (خ) عَنْ سُفْيَانَ التَّمَّارِ: أَنَّهُ رَأَى قَبْرَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مُسَنَّماً. [خ١٣٩٠]

**(خ) لە سوفیانی تەممارەوە: ئەو گۆڕی پێغەمبەری بینی بوو لە زەوی بەرزبووبویەوە.**

**١٦٦٨**– (خ) عَنْ عُرْوَةَ قال: لَمَّا سَقَطَ عَلَيْهِمُ الحَائِطُ في زمانِ الْوَلِيدِ بْنِ عَبْدِ الملِكِ، أَخَذُوا فِي بِنَائِهِ، فَبَدَتْ لَهُمْ قَدَمٌ، فَفَزِعُوا، وَظَنُّوا أَنَّهَا قَدَمُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَمَا وَجَدُوا أَحَداً يَعْلَمُ ذلِكَ، حَتَّى قَالَ لَهُمْ عُرْوَةُ: لاَ وَاللهِ، ما هِيَ قَدَمُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، ما هِيَ إِلاَّ قَدَمُ عُمَرَ رضي الله عنه. [خ١٣٩٠]

(خ) لە عورووەوە، وتی: کە لە سەردەمی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك دیوارەکە بەسەریاندا روخا، دەستیان بە بیناکردنەوەی کرد، پێیەکی بۆ دەرکەوت و ترسان و گومانیان برد پێی پێغەمبەر(ﷺ) بێت، هیچ کەسیان نەبینییەوە ئەوە بزانێت تا عوروە پێی وتن: نە، سوێند بە خودا، ئەو پێی پێغەمبەر(ﷺ) نییە، ئەوە پێی عومەرە(خوا لێی رازی بێت).

## ٤٧- دەروازەی: کۆمەڵێك کات نەهیکراوە مردووی تێدا دفن بکرێت

**١٦٦٩-** عَنْ مَالِك، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي حَرْمَلَةَ . مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ بْنِ حُوَيْطِبٍ .: أَنَّ زَيْنَبَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ تُوُفِّيَتْ، وَطَارِقٌ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ، فَأُتِيَ بِجَنَازَتِهَا بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، فَوُضِعَتْ بِالْبَقِيعِ. قَالَ: وَكَانَ طَارِقٌ يُغَلِّسُ بِالصُّبْحِ.

قَالَ ابْنُ أَبِي حَرْمَلَةَ: فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ لِأَهْلِهَا: إِمَّا أَنْ تُصَلُّوا عَلَى جَنَازَتِكُمُ الآنَ، وَإِمَّا أَنْ تَتْرُكُوهَا حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ. [ط٥٣٦]

* إسناده صحيح.

لە مالیکەوە، لە محەمەدی کوڕی ئەبی حەرمەلەوە–مەولای عبدالرحمانی کوڕی ئەبی سوفیانی کوڕی حوەیتیب–: زەینەبی کچی ئەبی سەلەمە کۆچی دوایی کرد، تاریق ئەمیری مەدینە بوو، لەدوای نوێژی بەیانی جەنازەکەیان هێنا و لە بەقیع دانرا، تاریق تاریکی بە بەرەبەیان تێکەڵ دەکرد.

ئیبن ئەبی حەرمەلە وتی: گوێم لە عەبدوڵای کوڕی عومەر بوو دەیوت بە خانەوادەی زەینەب: یان ئێستا لەسەر جەنازەکەی نوێژ بکەن، یان وازیلێبهێنن تا خۆر بەرزدەبێتەوە.

**١٦٧٠-** عَنْ مَالِك، عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ قَالَ: يُصَلَّى عَلَى الْجَنَازَةِ بَعْدَ الْعَصْرِ، وَبَعْدَ الصُّبْحِ إِذَا صُلِّيَتَا لِوَقْتِهِمَا. [ط٥٣٧]

لە مالیکەوە، لە نافیعەوە: عەبدوڵای کوڕی عومەر وتی: لەدوای عەصر و لە دوای بەیانی نوێژ لەسەر جەنازە دەکرێت، گەر ئەو دوو نوێژە بە کاتی خۆیان ئەنجامدرابن.

**١٦٧١**– عَنْ نَافِعٍ: أَنَّه صَلَّى مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَلَى عَائِشَةَ ﷺ زَوْجِ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم حِينَ صَلُّوا الصُّبْحَ. [هق٤٥٩/٢]

[وانظر: ١٠٥٤].

**لە نافیعەوە: ئەو لەگەڵ ئەبی هورەیرە(خوا لێی رازی بێت) لەسەر عائیشە، هاوسەری پێغەمبەر(خوا لێی رازی بێت) نوێژی کرد، کاتێ نوێژی بەیانیان ئەنجامدا.**

## ٤٨- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی تەنگانەی مردن هاتووە

**١٦٧٢**– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا أَغْبِطُ أَحَداً بِهَوْنِ مَوْتٍ بَعْدَ الَّذِي رَأَيْتُ مِنْ شِدَّةِ مَوْتِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [ت٩٧٩]

* صحيح.

**لە عائیشەوە، وتی: بە سووکی و ئاسانی مردنی هیچ کەس ئاوات ناخوازم لەدوای ئەوەی بینیم لە توندی و تەنگانەی مردنی پێغەمبەری خودا(ﷺ).**

**١٦٧٣**– عَنْ بُرَيْدَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْمُؤْمِنُ يَمُوتُ بِعَرَقِ الْجَبِينِ**).

* صحيح. [ت٩٨٢/ ١٨٢٧٥، ١٨٢٨/ جه١٤٥٢]

**لە بورەیدەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (باوەڕدار بە ئارەقەی نێوچاوان دەمرێت).**

## ٤٩- دەروازەی: دەربارەی هەواڵدان بە مردنی مردوو

**١٦٧٤**– عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ قَالَ: إِذَا مِتُّ فَلاَ تُؤْذِنُوا بِي أحداً، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ نَعْياً، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَنْهَى عَنِ النَّعْيِ. [ت٩٨٦/ جه١٤٧٦]

* حسن.

**لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە، وتی: گەر مردم کەس ئاگادار مەکەن، چونکە من دەترسم هەواڵدان بێت بە مردنی مردوو، چونکە من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو نەهی دەکرد لە هەواڵدان بە مردنی مردوو.**

**١٦٧٥**– عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنَ رَافِعٍ عَنْ جَدَّتِهِ: أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ مَاتَ بَعْدَ الْعَصْرِ، فَأُتِيَ ابْنُ عُمَرَ فَأُخْبِرَ بِمَوْتِهِ فَقِيلَ لَهُ: مَا تَرَى أَيُخْرَجُ بِجَنَازَتِهِ السَّاعَةَ؟ فَقَالَ: إِنَّ مِثْلَ رَافِعٍ لاَ يُخْرَجُ بِهِ حَتَّى يُؤْذَنَ بِهِ مَنْ حَوْلَنَا مِنَ الْقُرَى، فَأَصْبَحُوا فَاخْرجُوا بِجَنَازَتِهِ. [هق٤/٧٤]

**لە یەحیای کوڕی عبدالحمیدی کوڕی رافیعەوە، لە باپیرییەوە: رافیعی کوڕی خەدیج لەدوای عەصر مرد، هاتن بۆ لای ئیبن عومەر و هەواڵی مردنەکەیان پێدا، پێی وترا: چۆنی دەبینی، ئایا ئەم ساتە جەنازەکەی بهێنرێتە دەرەوە؟ وتی: نموونەی رافیع ناهێنرێتە دەرەوە تا هەواڵ دەدرێت بە ئاوەدانییەکانی دەوروبەرمان، رۆژیان لێبوویەوە جەنازەکەیان هێنا دەرەوە.**

## ٥٠- دەروازەی: نوێژ لەسەر منداڵ

**١٦٧٦**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وَسلّم قَالَ: **(الطِّفْلُ لاَ يُصَلَّى عَلَيْهِ، وَلاَ يَرِثُ، وَلاَ يُورَثُ، حَتَّى يَسْتَهِلَّ).** [ت١٠٣٢]

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (منداڵ نوێژی لەسەر ناکرێت و میرات ناگرێ، و میراتی لێ ناگیرێ تا بە زیندووی لەدایك دەبێت).**

- ولفظ ابن ماجه: **(إِذَا اسْتَهَلَّ الصَّبِيُّ، صُلِّيَ عَلَيْهِ، وَوُرِّثَ).** [جه١٥٠٨]

* صحيح. وقال شعيب: ضعيف جداً.

**لەفزەکەی ئیبن ماجە: (گەر منداڵ بە زیندووی لەدایك بوو نوێژی لەسەر دەکرێت و میراتی لێ دەگیرێت).**

## ٥١- دەروازەی: ماچکردنی مردوو

**١٦٧٧**– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُقَبِّلُ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ وَهُوَ مَيِّتٌ، حَتَّى رَأَيْتُ الدُّمُوعَ تَسِيلُ.

**لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی ماچی عوسمانی کوڕی مەزعوونی کرد و ئەو مردبوو، تا فرمێسکم بینی دەهاتە خوارەوە.**

■ وعند ابن ماجه: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى دُمُوعِهِ تَسِيلُ عَلَى خَدَّيْهِ. [د٣١٦٣/ ت٩٨٩/ جه١٤٥٦]

* صحيح.

[انظر: **٣٧١٥**].

**لای ئیبن ماجە: وەك ئەوەی تەماشای فرمێسكەكانی بكەم لەسەر دوو گۆنای دادەبارین.**

## ٥٢- دەروازەی: ڕۆیشتن لە پێشەوەی جەنازە

**١٦٧٨**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، يَمْشُونَ أَمَامَ الْجَنَازَةِ.

* صحيح. [د٣١٧٩/ ت١٠٠٧/ ن١٩٤٣/ جه١٤٨٢]

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەكر و عومەرم بینی لە پێش جەنازەوە دەڕۆیشتن.**

**١٦٧٩**- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**الرَّاكِبُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ، وَالْمَاشِي، حَيْثُ شَاءَ مِنْهَا، وَالطِّفْلُ يُصَلَّى عَلَيْهِ**). [د٣١٨٠/ ت١٠٣١/ ن١٩٤١/ جه١٤٨١]

**لە موغیرەی كوڕی شوعبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سوار لەدوای جەنازەوە دەڕوات، پیادەڕەو لە هەموو لایەكەوە لەگەڵی دەڕوات، منداڵ نوێژی لەسەر دەكرێت).**

■ ولفظ أبي داود: (**الرَّاكِبُ يَسِيرُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ، وَالْمَاشِي يَمْشِي خَلْفَهَا وَأَمَامَهَا، وَعَنْ يَمِينِهَا وَعَنْ يَسَارِهَا قَرِيباً مِنْهَا، وَالسِّقْطُ يُصَلَّى عَلَيْهِ، وَيُدْعَى لِوَالِدَيْهِ بِالْمَغْفِرَةِ وَالرَّحْمَةِ**).

* صحيح.

**لەفزەكەی ئەبی داود: (سوار لەدوای جەنازەوە دەڕوات، پیادەڕەو لە دواوە و لە پێشەوە و لە لای ڕاستەوە و لە لای چەپەوەی جەنازەوە دەڕوات و نزیك بە جەنازەكە، منداڵی لەبارچوو نوێژی لەسەر دەكرێت و بۆ دایك و باوكی داوای لێخۆشبوون و ڕەحمەت دەكرێت).**

## ٥٣- دەروازەی: دفنکردنی کۆمەڵێك لە یەك گۆڕدا

**١٦٨٠-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: شَكَوْنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ أُحُدٍ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! الْحَفْرُ عَلَيْنَا لِكُلِّ إِنْسَانٍ شَدِيدٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**احْفِرُوا وَأَعْمِقُوا وَأَحْسِنُوا، وَادْفِنُوا الاِثْنَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ فِي قَبْرٍ وَاحِدٍ**). قَالُوا: فَمَنْ نُقَدِّمُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**قَدِّمُوا أَكْثَرَهُمْ قُرْآناً**)، قَالَ: فَكَانَ أَبِي ثَالِثَ ثَلاَثَةٍ فِي قَبْرٍ وَاحِدٍ. [د٣٢١٥/ ت١٧١٣/ ن٢٠٠٩/ جه١٥٦٠]

* صحيح.

**لە هیشامی کوڕی عامیرەوە، وتی: ڕۆژی ئوحد سكالاّمان بردە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، و وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، چاڵێك بۆ هەر مردوویەك لەسەرمان گرانە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (چاڵەکە لێبدەن و قووڵی بکەن و باشی بکەن و دووان و سیان لە یەك گۆڕدا بنێژن)، وتیان: کامیان پێش بخەین، ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، فەرمووی: (کامەیان زۆرتر قورئانی لەبەربووە)، وتی: باوکم سێیەمی سیانەکە بوو لە یەك گۆڕدا.**

## ٥٤- ئەوەی دەوترێت گەر مردوو لە گۆڕ نرا

**١٦٨١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا وَضَعَ الْمَيِّتَ فِي الْقَبْرِ قَالَ: (**بِاسْمِ اللهِ، وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ**) صلّى الله عليه وسلّم. [د٣٢١٣/ ت١٠٤٦/ جه١٥٥٠]

* صحيح.

**لە ئیبن عومەرەوە: پێغەمبەر گەر مردووی لە گۆڕ بنابا دەیفەرموو: (باسم الله، وعلى سنة رسول الله) (ﷺ).**

## ٥٥- دەروازەی: تەعزیٚ(سەرەخۆشی)

**١٦٨٢-** عَنْ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (**مَا مِنْ مُؤْمِنٍ يُعَزِّي أَخَاهُ بِمُصِيبَةٍ؛ إِلاَّ كَسَاهُ اللهُ سُبْحَانَهُ مِنْ حُلَلِ الْكَرَامَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). [جه١٦٠١]

* حسن.

لە عەمری كوڕی حەزمەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر باوەڕدارێك سەرەخۆشی لە براكەی بكات بە هۆی موسیبەتێكەوە خودا لە ڕۆژی قیامەت پۆشاكێك لە پۆشاكی ڕێزی لەبەردەكات).**

## ٥٦- دەروازەی: خۆشۆرین لە شۆرینی مردوو

**١٦٨٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَيْسَ عَلَيْكُمْ فِي غَسْلِ مَيِّتِكُمْ غُسْلٌ إِذَا غَسَّلْتُمُوهُ، إِنَّ مَيِّتَكُمْ لَمُؤْمِنٌ طَاهِرٌ، وَلَيْسَ بِنَجِسٍ، فَحَسْبُكُمْ أَنْ تَغْسِلُوا أَيْدِيَكُمْ. [ك١٤٢٦/هق١/٣٠٦]

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: لە شۆرینی مردووتان شۆرینتان لەسەر نییە گەر مردووەكەتان شۆری، مردووی ئێوە باوەڕداری پاكە، و پیس نییە، ئەوەندەتان بەسە دەستی خۆتان بشۆرن.

- وهو مرفوع عند الحاكم.

**لای حاكم مرفوعە(بەرزكراوەتەوە).**

* قال الذهبي: على شرط البخاري مرفوعاً.

**١٦٨٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تُنَجِّسُوا مَوْتَاكُمْ، فَإِنَّ الْمُسْلِمَ لَيْسَ بِنَجِسٍ حَيّاً وَلاَ مَيِّتاً).** [ك١٤٢٢/هق١/٣٠٦]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(مردووەكانتان بە پیس مەزانن، باوەڕدار بە زیندووی و بە مردووی پیس نییە).**

## ٥٧- دەروازەی: ئامادە كردنی خواردن بۆ ئەهلی مردووەكە

**١٦٨٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم **(اصْنَعُوا لآلِ جَعْفَرٍ طَعَاماً، فَإِنَّهُ قَدْ أَتَاهُمْ أَمْرٌ يَشْغَلُهُمْ).** [د٣١٣٢/ ت٩٩٨/ جه١٦١٠]

* حسن.

لە عەبدوڵای کوڕی جەعفەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خواردن بۆ خانەوادەی جەعفەر دروست بکەن، چونکە دۆخێکیان بۆ هاتووەتە پێش سەرقاڵی کردوون).**

## ٥٨- دەروازەی: شاردنەوەی هاوەڵدانەر

**١٦٨٦**- عَنْ عَلِيٍّ عليه السلام قَالَ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: إِنَّ عَمَّكَ الشَّيْخَ الضَّالَّ قَدْ مَاتَ، قَالَ: (**اذْهَبْ فَوَارِ أَبَاكَ، ثُمَّ لاَ تُحْدِثَنَّ شَيْئاً حَتَّى تَأْتِيَنِي**)، فَذَهَبْتُ فَوَارَيْتُهُ، وَجِئْتُهُ، فَأَمَرَنِي فَاغْتَسَلْتُ، وَدَعَا لِي. [د٣٢١٤/ ن١٩٠]

* صحيح.

لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: بە پێغەمبەرم(ﷺ) وت: مامە پیرە گومڕاکەت مردووە، فەرمووی: **(برۆ باوکت بشارەوە، پاشان هیچ مەڵێ تا دێی بۆ لام)**، رۆیشتم و شاردمەوە و هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەر، فەرمانی پێکردم خۆم شۆری و دوعای بۆ کردم.

## ٥٩- دەروازەی: نیشانە لەسەر گۆڕ

**١٦٨٧**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَعْلَمَ قَبْرَ عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ بِصَخْرَةٍ.

* حسن صحيح. [جه١٥٦١]

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) قەبری عوسمانی کوڕی مەزعوونی بە بەردێك دیاری کرد.

## ٦٠- دەروازەی: شکاندنی ئێسکی مردوو

**١٦٨٨**- عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**كَسْرُ عَظْمِ الْمَيِّتِ كَكَسْرِهِ حَيّاً**).

* صحيح. [د٣٢٠٧/ جه١٦١٦]

لە عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویی: (شکاندنی ئێسکی مردوو وەك شکاندنی وایە بە زیندوویی).

## ٦١- دەروازەی: چۆن مردوو دەنرێنە گۆڕ

**١٦٨٩**- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ السَّبِيعِيِّ قَالَ: أَوْصَى الْحَارِثُ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ، فَصَلَّى عَلَيْهِ، ثُمَّ أَدْخَلَهُ الْقَبْرَ مِنْ قِبَلِ رِجْلَيِ الْقَبْرِ، وَقَالَ: هَذَا مِنَ السُّنَّةِ. [د٣٢١١]

* صحيح.

**لە ئەبی ئیسحاقی سەبیعییەوە، وتی: حاریس وەسێتی کرد عەبدوڵای کوڕی زەید نوێژی لەسەر بکات، ئەویش نوێژی لەسەر کرد، پاشان خستییە ناو گۆڕەکەوە لە ئاراستەی دوو قاچی گۆڕەکەوە، وتی: ئەمە لە سوننەتە.**

**١٦٩٠**- عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ أَنَسٍ فِي جِنَازَةٍ، فَأَمَرَ بِالْمَيِّتِ فَسُلَّ مِنْ قِبَلِ رِجْلِ الْقَبْرِ.

* إسناده صحيح على شرط الشيخين. [حم٤٠٨١]

**لە محەمەدەوە، وتی: لە جەنازەیەك لەگەڵ ئەنەس بووم فەرمانی کرد لە رووی قاچی گۆڕەکەوە داهێڵرا.**

## ٦٢- دەروازەی: کێ مردوو دەنێتە گۆڕ

**١٦٩١**- عَنْ عَامِرٍ الشَّعْبِيِّ قَالَ: غَسَّلَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلِيٌّ وَالْفَضْلُ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَهُمْ أَدْخَلُوهُ قَبْرَهُ.

قَالَ: وحدثني مَرْحَبٌ . أَوْ ابن أَبِي مَرْحَبٍ . أَنَّهُمْ أَدْخَلُوا مَعَهُمْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، فَلَمَّا فَرَغَ عَلِيٌّ قَالَ: إِنَّمَا يَلِي الرَّجُلَ أَهْلُهُ. [د٣٢٠٩]

* صحيح.

**لە عامر شەعبییەوە، وتی: عەلی و فەزڵ و ئوسامەی کوڕی زەید پێغەمبەری خودایان(ﷺ) شۆری، هەر ئەوانیش خستیانە ناو گۆڕەکەی.**

وتی: مەرحەب –یان ئیبن ئەبی مەرحەب– بۆی باسکردم: ئەوان عبدالرحمانی کوڕی عەوفیان تەك خۆیان خست[1]، کاتێك عەلی تەواو بوو وتی: پیاو خانەوادەکەی دەینێنە ناو گۆڕ.

## ٦٣- دەروازەی: ئاگر شوێنی جەنازە ناخرێت

**١٦٩٢**– عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: أَوْصَى أَبُو مُوسَى الْأَشْعَرِيُّ حِينَ حَضَرَهُ الْمَوْتُ، فَقَالَ: لاَ تُتْبِعُونِي بِمِجْمَرٍ، قَالُوا لَهُ: أَوَسَمِعْتَ فِيهِ شَيْئاً؟ قَالَ: نَعَمْ، مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [جه١٤٨٧]

* حسن.

**لە ئەبی بوردەوە، وتی: ئەبو موسای ئەشعەری کاتێ کەوتە سەرەمەرگ وەسێتی کرد و وتی: ئاگرم شوێن مەخەن، وتیان پێیی: ئایا لەو بارەیەوە شتێکت بیستووە؟ وتی: بەڵێ، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ).**

## ٦٤- دەروازەی: ناپەسەندی سەربڕین لەسەر گۆڕ

**١٦٩٣**– عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ عَقْرَ فِي الْإِسْلاَمِ**). [د٣٢٢٢]

* صحيح.

**لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە ئیسلامدا سەربڕین نییە[2]).**

---

[1] واتە: بۆ داهێڵانی کەسێکیان بۆ ناو گۆڕ عبدالرحمانی کوڕی عەوفیان تەك خۆیان خست –و.

[2] خەتابی دەڵێت: ئەهلی نەفامی حوشتریان لەسەر گۆڕی پیاوی بەخشندە سەردەبڕی، دەیانوت: لەسەر کارەکەی پاداشتی دەدەینەوە، چونکە ئەو لە ژیانیدا سەریدەبڕین، و دەرخواردی میوانانی دەدا، ئێمەش لای گۆڕەکەی سەریدەبڕین تاکو درندە و باڵندە بیخۆن، ئەوکات لە دوای مردنی کەسێکی ناندەر دەبێت وەك چۆن لە ژیانی کەسێکی ناندەر بوو. أهـ مختصرا.

## ٦٥- دەروازەی: خۆڵکردنە ناو گۆڕ

١٦٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى عَلَى جِنَازَةٍ، ثُمَّ أَتَى قَبْرَ الْمَيِّتِ فَحَثَى عَلَيْهِ مِنْ قِبَلِ رَأْسِهِ ثَلاَثاً. [جه١٥٦٥]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر جەنازەیەك نوێژی کرد، پاشان هات بۆ لای گۆڕی مردووەکە و لە لای سەریەوە سێ جار خۆڵی داکرد.**

## ٦٦- دەروازەی: گۆڕەوشار

١٦٩٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**هَذَا الَّذِي تَحَرَّكَ لَهُ الْعَرْشُ، وَفُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَشَهِدَهُ سَبْعُونَ أَلْفاً مِنَ الْمَلاَئِكَةِ، لَقَدْ ضُمَّ ضَمَّةً ثُمَّ فُرِّجَ عَنْهُ**).

* صحيح. [ن٢٠٥٤]

**لە ئیبن عومەرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: (ئەمە ئەو کەسەیە[1] عەرشی بۆ لەرزی، و دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرانەوە، و حەفتا هەزار لە فریشتەکان ئامادەی بوون، بە گوشینێك گوشرا و پاشان دەرووی لێکرایەوە).**

١٦٩٦- عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ لِلْقَبْرِ ضَغْطَةً، وَلَوْ كَانَ أَحَدٌ نَاجِياً مِنْهَا، نَجَا مِنْهَا سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ**). [حم٢٤٢٨٣]

* حديث صحيح.

**لە عائیشەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (گۆڕ فشاری هەیە، گەر یەکێك لێی رزگاربوایە سەعدی کوڕی مەعاز لێی رزگار دەبوو).**

---

[1] مەبەستی سەعدی کوڕی مەعاز بوو، حەسەن-وەك لە "دلائل البيهقي"دا هاتووە- دەڵێت: عەرش بۆی جوولا وەك خۆشحاڵی بە رۆحەکەی.

**١٦٩٧**– عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى عَلَى صَبِيٍّ أَوْ صَبِيَّةٍ، قَالَ: (**لَوْ نَجَا أَحَدٌ مِنْ ضِيْقَةِ . أَوْ ضَغْطَةِ . القَبْرِ لَنَجَا هَذَا الصَّبِيُّ**). [مخ٥/١٨٢٤ . ١٨٢٦]

* إسناده صحيح.

لە ئەنەسەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر منداڵێکی کوڕ یان کچ نوێژی کرد و فەرمووی: (**گەر یەکێك لە تەنگەلانی–گوشینی– گۆڕ رزگاری ببوایە ئەم منداڵە رزگاری دەبوو**).

**١٦٩٨**– عَنْ أَنَسٍ قَالَ: تُوُفِيَتْ زَيْنَبُ ابْنَةُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَكَانَتْ امْرَأَةً مِسْقَامَةً، فَتَبِعَها رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَسَاءَنَا حَالُه، فَلَمَّا دَخَلَ القَبْرَ، التَمَعَ وَجْهُهُ صُفْرَةً، ثُمَّ أَسْفَرَ وَجْهُهُ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، رَأَيْنا مِنْكَ أَمْراً سَاءَنَا، فَلَمَّا دَخَلْتَ القَبْرَ التَمَعَ وَجْهُكَ صُفْرَةً، ثُمَّ أَسْفَرَ وَجْهُكَ، فَمِمَّ ذَاكَ؟ قَالَ: (**ذَكَرْتُ ضَعْفَ بُنَيَّتِي، وَشِدَّةَ عَذَابِ القَبْرِ، فَأُخْبِرْتُ أَنَّهُ قَدْ خُفِّفَ عَنْها، وَلَقَدْ ضُغِطَتْ ضَغْطَةً سُمِعَ صَوْتُها مَا بَيْنَ الخَافِقَيْنِ**). [مخ٦/٢١٦٢]

* إسناده صحيح.

لە ئەنەسەوە، وتی: زەینەبی کچی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، ئەو ئافرەتێکی نەخۆش بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) شوێنیکەوت، حاڵی ئەو ئێمەی پەرێشان کرد، کاتێ پێغەمبەر چووە ناو گۆڕەکە، روخساری زەرد هەڵگەڕا، پاشان روخساری رۆشن بوویەوە، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، شتێکمان لە تۆ بینی پەرێشانی کردین، کاتێ رۆیشتییە گۆڕەکە رەنگت زەرد هەڵگەڕا، پاشان روخسارت رۆشن بوویەوە، ئەوانە لە چییەوە بوو؟ فەرمووی: (**بیرم لە لاوازی کچەکەم و توندی سزای گۆڕ کردەوە، هەواڵم پێدرا لەسەری سووککراوە، ئەو بە گوشینێك گوشرا نێوان ئاسۆی خۆرهەڵات و خۆرئاوا دەنگەکەی بیسترا**).

## ٦٧– دەروازەی: داکەندنی دوو نەعل لە گۆڕستان

**١٦٩٩**– عَنْ بَشِيرِ ابنِ الخَصَاصِيَةِ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أُمَاشِي رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، مَرَّ بِقُبُورِ الْمُشْرِكِينَ فَقَالَ: (**لَقَدْ سَبَقَ هَؤُلَاءِ خَيْراً كَثِيراً**) ثَلَاثاً، ثُمَّ مَرَّ بِقُبُورِ الْمُسْلِمِينَ فَقَالَ: (**لَقَدْ أَدْرَكَ**

هَؤُلاَءِ خَيْراً كَثِيراً). وَكَانَتْ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَظْرَةٌ، فَإِذَا رَجُلٌ يَمْشِي فِي الْقُبُورِ، عَلَيْهِ نَعْلاَنِ، فَقَالَ: (يَا صَاحِبَ السِّبْتِيَّتَيْنِ، وَيْحَكَ! أَلْقِ سِبْتِيَّتَيْكَ)، فَنَظَرَ الرَّجُلُ، فَلَمَّا عَرَفَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَلَعَهُمَا فَرَمَى بِهِمَا. [د٣٢٣٠/ ٢٠٤٧٥/ جه١٥٦٨]

* حسن.

لە بەشیری کوڕی خەصاصییەوە، وتی: لە کاتێکدا من بە ڕۆیشتنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەڕۆیشتم، بە پاڵ گۆڕی هاوەڵدانەراندا تێپەڕی، و فەرمووی: **(ئەوانە پێش خێرێکی زۆر کەوتن)**[1] سێ جار، پاشان بە پاڵ گۆڕستانی موسڵماناندا تێپەڕی و فەرمووی: **(ئەمانە بە خێرێکی زۆر گەیشتن)**، پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەرنجێکی دا بینی پیاوێك بەناو گۆڕەکاندا دەڕوات جوتێ نەعلی لەپێیە، فەرمووی: **(ئەی خاوەنی دوو نەعل، هاوار بە حاڵت، دوو نەعلەکەت لەپێ فڕێدە)**، پیاوەکە تەماشای کرد، کاتێك پێغەمبەری خودای(ﷺ) ناسی نەعلەکانی لە پێ داکەند و هەڵیدان.

## ٦٨- دەروازەی: کەسێك بە غەریبی بمرێت

**١٧٠٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: مَاتَ رَجُلٌ بِالْمَدِينَةِ مِمَّنْ وُلِدَ بِهَا، فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ثُمَّ قَالَ: (يَا لَيْتَهُ مَاتَ بِغَيْرِ مَوْلِدِهِ)، قَالُوا: وَلِمَ ذَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا مَاتَ بِغَيْرِ مَوْلِدِهِ، قِيسَ لَهُ مِنْ مَوْلِدِهِ إِلَى مُنْقَطَعِ أَثَرِهِ فِي الْجَنَّةِ). [ن١٨٣١/ جه١٦١٤]

* حسن.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پیاوێك لە مەدینە مرد، لەوانەی لە مەدینە لەدایکبووبوون، پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی لەسەر کرد، و پاشان فەرمووی: **(خۆزگە لە جێگەیەکی تر جیا لە شوێنی لەدایکبوونی بمردبایە)**، وتیان: ئەوە بۆچی، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: **(گەر پیاو لە جێگەیەك بمرێت شوێنی لەدایکبوونی خۆی نەبێت لە بەهەشت ئەو ماوەی نێوان شوێنی لەدایکبوونی بۆ ئەو شوێنەی تیایدا مردووە بۆ پێوانە دەکەن)**.

---

[1] واتە: بەرلەوەی خێرەکەیان پێ بگات -کە ئیسلامە- ئەوان مردن -و.

## ٦٩- دەروازەی: سەردانی كردنی ئافرەتان بۆ گۆڕستان

١٧٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم زَوَّارَاتِ الْقُبُورِ.

* حسن. [ت١٠٥٦/ جه١٥٧٦]

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەفرەتی كرد لەو ئافرەتانەی سەردانی گۆڕستان دەكەن.**

١٧٠٢- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ: أَنَّ عَائِشَةَ ﵂ أَقْبَلَتْ ذَاتَ يَوْمٍ مِنَ الْمَقَابِرِ، فَقُلْتُ لَهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَيْنَ أَقْبَلْتِ؟ قَالَتْ: مِنْ قَبْرِ أَخِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، فَقُلْتُ لَهَا: أَلَيْسَ كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ كَانَ نَهَى، ثُمَّ أَمَرَ بِزِيَارَتِهَا. [هق٤/٧٨]

**لە عەبدوڵای كوڕی ئەبی مولەیكەوە: ڕۆژێك عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) لە گۆڕستان گەڕایەوە، پێم وت: دایكی باوەڕداران، لە كوێ گەڕایتەوە؟ وتی: لای گۆڕی براكەم، عبدالرحمانی كوڕی ئەبوبەكر، پێم وت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی نەكرد لە سەردانی كردنی گۆڕستان؟ وتی: بەڵێ، نەهی كرد، پاشان فەرمانی كرد بە سەردانی كردنی.**

## ٧٠- دەروازەی: شاردنەوەی مردوو بە شەو

١٧٠٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَدْفِنُوا مَوْتَاكُمْ بِاللَّيْلِ؛ إِلاَّ أَنْ تُضْطَرُّوا).** [جه١٥٢١]

* صحيح.

**لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بە شەو مردووەكانتان مەشارنەوە، مەگەر ناچار بن).**

## ٧١- دەروازەی: مردنی لەناکاو

**١٧٠٤-** عَنْ عُبَيْدِ بْنِ خَالِدٍ السُّلَمِيِّ ـ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ رفعه مَرَّةً، ولم يرفعه أخرى قَالَ: (**مَوْتُ الْفَجْأَةِ أَخْذَةُ آسِفٍ**). [د ٣١١٠]

* صحيح.

**له عوبەیدی کوڕی خالیدی سولەمییەوە -پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)- جارێك بەرزی کردووە و جارێکیش بەرزی نەکردووەتەوە، فەرمووی: (مردنی لەناکاو "أخذة الأسف[١]"ە[٢]).**

---

[١] **"آسف" واتە: "الغضبان-تووڕە"، لەوەوە ئایەتی: ﴿فَلَمَّا آسَفُونَا انْتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَاهُمْ أَجْمَعِينَ﴾[الزخرف: ٥٥]، ماناکەی-خودا زاناترە-: ئەوان کارێکیان ئەنجامدا تووڕەیی خودا و تۆڵە لێکردنەوەیان بەسەردا سەپا. (خطابي).**

[٢] **واتە: مردنی لەناکاو مردنێکی باش نییە و گرتنی تووڕەییە لە لای خوداوە-و.**

# بەشی یەکەم

## زەکاتی واجب

### ١- زەکات لە پایەکانی ئیسلامە

**١٧٠٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، فَمَنْ قَالَهَا، فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي مالَهُ وَنَفْسَهُ إِلاَّ بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللهِ**)؟ فَقَالَ: وَاللهِ لأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلاَةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ المالِ. وَاللهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقاً كانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا. قَالَ عُمَرُ ﷺ: فَوَاللهِ ما هُوَ إِلاَّ أَنْ قَدْ شَرَحَ اللهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ. [خ١٣٩٩ و١٤٠٠/ م٢٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد و ئەبوبەکر(خوا لێی رازی بێت) هات و ئەوانەی بێباوەڕ بوون لە عەرەب بێباوەڕبوون، عومەر(خوا لێی رازی بێت) وتی: چۆن جەنگ لەگەڵ خەڵك دەکەی لە کاتێکدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (**فەرمانم پێکراوە دژ بە خەڵك بجەنگم تا دەڵێن: "لا إله إلا الله"، هەر کەس وتی، ماڵ و سامان و نەفسی خۆی لە من پاراستووە، مەگەر بە حەقی خۆی، حسابەکەی ئەو لەسەر خودایە**)، ئەبوبەکر وتی: سوێند بە خودا دژ بەو کەسە دەجەنگم جیاکاری دەکات لە نێوان نوێژ و زەکات، چونکە زەکات حەقی ماڵ و سامانە، سوێند بە خودا گەر خۆیان بگرنەوە لە دانی کاریلەیەك(عَناقا) بە من و کاتی خۆی بە پێغەمبەری خودایان دابێت لەسەر ئەو نەدانە دژ بەوان دەجەنگم، عومەر(خوا لێی رازی بێت) وتی: سوێند بە خودا ئەوە هیچی تر نەبوو جگە لە واڵاکردنی خودا بۆ سینەی ئەبوبەکر(خوا لێی رازی بێت)، بۆیە زانیم ئەوە حەقە.

▪ ولفظ مسلم: «لَوْ مَنَعُونِي عِقَالاً »، وهو رواية عند البخاري. [خ٧٢٨٤]

لەفزەکەی موسلیم: (گەر خۆیان بگرنەوە لە دانی "عِقال–گوریسێك، پەتێك"ێك بە من)، ئەوەش ریوایەتێکە لای بوخاری.

## ٢- دەروازەی: تاوانی ئەو کەسەی زەکات نادات

١٧٠٦– (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ آتَاهُ اللهُ مالاً فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ، مُثِّلَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعاً أَقْرَعَ، لَهُ زَبِيبَتَانِ، يُطَوَّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِلِهْزِمَيْهِ ـ يَعْنِي: شِدْقَيْهِ ـ ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا مَالُكَ، أَنَا كَنْزُكَ، ثُمَّ تَلاَ: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ﴾ الآية [آل عمران: ١٨٠]). [خ١٤٠٣]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس خودا ماڵ و سامانی پێبدات و زەکاتەکەی نەدات لە رۆژی قیامەت لە مارێکی کەچەڵدا بۆی بەرجەستە دەبێت، مارەکە دوو پەڵکەی هەیە، لە رۆژی قیامەت ئاباڵۆقەی دەدات، پاشان دوو لای دەمی–واتە دوو لەغاوەی– دەگرێت، پاشان دەڵێت: من ماڵەکەی تۆم، من گەنجینەکەی تۆم، پاشان ئەمەی خوێندەوە: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ﴾[آل عمران: ١٨٠].

١٧٠٧– عَنْ عَبْدِ الله بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (مَا نَقَضَ قَوْمٌ الْعَهْدَ قَطُّ إِلاَّ كَانَ الْقَتْلُ بَيْنَهُمْ، وَلاَ ظَهَرَتِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ إِلاَّ سَلَّطَ الله عَلَيْهِمُ الْمَوْتَ، وَلاَ مَنَعَ قَوْمٌ الزَّكَاةَ إِلاَّ حَبَسَ الله عَنْهُمُ الْقَطْرُ). [هق٩/٢٣١]

لە عەبدوڵای کوڕی بورەیدەوە، لە باوکییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر گەلێك پەیمان بشکێنن کوشتار دەکەوێتە نێوانیان، فاحیشە لە هەر گەلێکدا دەربکەوێت خودا مردنیان بەسەردا زاڵ دەکات، هەر گەلێك زەکات نەدەن خودا بارانیان لێ دەگرێتەوە).

## ٣- دەروازەی: ئەو برانەی زەکاتیان تێدا واجب دەبێت(النِّصاب- برِ و رادەی ماڵێك زەکاتی لێ بکەوێت)

١٧٠٨- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ). [خ١٤٠٥/ م٩٧٩]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(لە خوار پێنج "أواق"[1]"وە صەدەقە نییە، لە خوار پێنج "ذَوْد"[2]"وە صەدەقە نییە، لە خوار پێنج "أَوْسُق"[3]"وە صەدەقە نییە).**

- وفي رواية لهما: قال: (لَيْسَ فِيما دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنَ التَّمْرِ صَدَقَةٌ، وَلَيْس فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الْوَرِقِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ مِنَ الإِبْلِ صَدَقَةٌ). [خ١٤٥٩]

لە ریوایەتێکی هەردووکیاندا: فەرمووی: **(لە خوار پێنج (أوسُق) خورماوە صەدەقە نییە، لە خوار پێنج (أواق) لە زیو صەدەقە نییە، لە خوار پێنج (ذَوْد)ە لە حوشتر صەدەقە نییە).**

١٧٠٩- (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ أَوْ كَانَ عَثَرِيّاً الْعُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بالنَّضحِ نِصْفُ الْعُشْرِ). [خ١٤٨٣]

---

(١) (أواق)، کۆی وشەی (أوْقية)یە، ئەوەش بریتییە لە چل درهەم؟

(٢) (ذود) لە سێوە بۆ دە، وشەکە تاکی نییە، لە یەکدا دەوترێت: حوشترێك، پێنج (ذود) واتە: پێنج حوشتر.

(٣) (أوسق) کۆی وشەی (وسق)ە، یەك وەسەق بریتییە لە شەست (صاع)، یەك (صاع)، چوار لێوانلێوی دوو ناو لەپی دەستە، یەك لێوانلێوی دوو ناو لەپی دەست نزیك بە (٦٥٠) گرامە، کەوابوو یەك (صاع) نزیك بە دوو کیلۆ و نیوە.

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوەی ئاسمان و سەرچاوەکان ئاوی دەدەن یان وشکە دێمە[1]، دەیەك، ئەوەش ئاودانی بە هەڵکوزینە[2] نیوەی دەیەك).**

١٧١٠- (خ) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ، كَتَبَ لَهُ هَذَا الْكِتَابَ، لَمَّا وَجَّهَهُ إِلَى الْبَحْرَيْنِ: بسم الله الرحمن الرحيم، هذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى المسْلِمِينَ، وَالَّتِي أَمَرَ اللهُ بِهَا رَسُولَهُ، فَمَنْ سُئِلَهَا مِنَ المسْلِمِينَ عَلَى وَجْهِهَا فَلْيُعْطِهَا، وَمَنْ سُئِلَ فَوْقَهَا فَلاَ يُعْطِ:

**(فِي أَرْبَعٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الإِبِلِ فَمَا دُونَهَا، مِنَ الْغَنَمِ، مِنْ كلِّ خَمْسٍ شَاةٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْساً وَعِشْرِينَ إِلَى خَمْسٍ وَثَلاَثِينَ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ أُنْثَى، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتّاً وَثَلاَثِينَ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ أُنْثَى، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتّاً وَأَرْبَعِينَ إِلَى سِتِّينَ فَفِيهَا حِقَّةٌ طَرُوقَةُ الْجَمَلِ، فَإِذَا بَلَغَتْ وَاحِدَةً وَسِتِّيْنَ إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ فَفِيهَا جَذَعَةٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ . يَعْنِي: . سِتّاً وَسَبْعِينَ إِلَى تِسْعَيِنَ فَفِيهَا بِنْتَا لَبُونٍ، فَإِذَا بَلَغَتْ إِحْدَى وَتِسْعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِيهَا حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا الْجَمَلِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ، وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ إِلاَّ أَرْبَعٌ مِنَ الإِبِلِ فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ؛ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْساً مِنَ الإِبِلِ فَفِيهَا شَاةٌ.**

**وَفِي صَدَقَةِ الْغَنَمِ: فِي سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ شَاةٌ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ إِلَى مِائَتَيْنِ شَاتَانِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى مِائَتَيْنِ إِلَى ثَلاَثِمَائَةٍ فَفِيهَا ثَلاَثُ شِيَاهٍ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى ثَلاَثِمَائَةٍ فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ، فَإِذَا كَانَتْ سَائِمَةُ الرَّجُلِ نَاقِصَةً مِنْ أَرْبَعِينَ شَاةً وَاحِدَةً، فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا.**

**وَفِي الرِّقَةِ رُبُعُ الْعُشْرِ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ إِلاَّ تِسْعِينَ وَمِائَةً فَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ؛ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا).**
[خ١٤٥٤ (١٤٤٨)]

(خ) لە ئەنەسەوە: ئەبوبەکر(خوا لێی ڕازی بێت) ئەم نوسراوەی بۆ نووسی، کاتێك ڕەوانەی کرد بۆ بەحرەین:

---

[1] واتە: بۆ خۆی بە ڕەگەکانی ئاو وەردەگرێت و پێویستی بە ئاودان نییە-و.

[2] واتە: بە وڵاخ و حوشتر ئاوەکە هەڵدەگۆزرێ یان بە جەنجەڕ لە بیر ئاوی بۆ هەڵدەگۆزرێ-و.

بسم الله الرحمن الرحيم، ئەمە فەرزی صەدەقەیە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر موسڵمانان فەرزی كردووە، ئەوەی خودا فەرمانی بە پێغەمبەرەكەی كردووە، هەر كەس لە موسڵمانان داوای لێكرا با لەسەر رووی خۆی[1] بیدات، هەر كەس لەسەروو ئەوە داوای لێكرا با نەیدات:

**(لە بیست و چوار حوشتر و خوار ئەوە لە مەڕ، لە هەر پێنج سەرێك سەرێك، گەر گەیشتە بیست و پێنج یان سی و پێنج تیایدا "بنت مخاض"ێكی مێینە** لەسەر رووی خۆی[2]**، گەر گەیشتە سی و شەش بۆ چل و پێنج تیایدا "بنت لبون"ێكی مێینە"**[3]**، گەر گەیشتە چل و شەش بۆ شەست تیایدا "حِقَّة طَرُوقة الجمل"**[4]**، گەر گەیشتە شەست و یەك بۆ حەفتا و پێنج تیایدا "جَذَعَة"یەك**[5]**، گەر گەیشتە –واتە– حەفتا و شەش بۆ نەوەد تیایدا "بنتا لبون**[6] **"، گەر گەیشتە نەوەد و یەك بۆ سەد و بیست تیایدا "حِقتان طروقتا الجمل**[7]**"، گەر لە سەد و بیست زیاتر بوو لە هەر چل سەرێك "بنت لبون"ێك و لە هەر پەنجا سەرێك "حِقة"یەك، هەر كەس تەنها چوار حوشتری لە لابوو صەدەقەی تێدا نییە جگە لەوەی خاوەنەكەی بخوازێت، گەر گەیشتە چوار حوشتر "شاة"ێكی**[8] **تێدایە.**

[1] واتە: بەو جۆرەی خودا و پێغەمبەر دیارییان كردووە و بەیانیان كردووە–و.

[2] "بنت المخاض" حوشترێكە ساڵێكی تەواو كردووە و پێی ناوە لە دوو ساڵ–و.

[3] "بنت لبون" ئەو حوشترەیە دوو ساڵی تەواو كردووە و پێی لە سێ ناوە–و.

[4] "حِقّة طروقة الجمل" ئەوەیە سێ ساڵی تەواو كردووە و پێی لە چوار ناوە–و.

[5] "جَذعة": ئەو حوشترەیە چوار ساڵی تەواو كردووە و پێی لە پێنج ناوە –و.

[6] "بنتا لبون" دوو حوشتر دوو ساڵیان تەواو كردبێت و پێیان لە سێ نابێت–و.

[7] "حِقّتان طروقتا الجمل": دوو حوشتر سێ ساڵیان تەواو كردبێت پێیان لە چوار نابێت –و.

[8] "شاة" مەڕێك یان بزنێك–و.

له صەدەقەی مەڕ و بزندا: له "سائمة[1]"ی مەڕ و بزن گەر چل سەر بوو بۆ سەد و بیست سەر "شاة"یکە، گەر له سەد و بیست زیادی کرد تا دووسەد دوو "شاة"ە، گەر له دووسەد زیادی کرد تا سێسەد تیایدا سێ "شاة"ە، گەر له سێسەد زیاتر بوو له هەر سەد دانەیەك "شاة"ێك، گەر "سائمة"ی پیاوێك له چل سەر کەمتر بوو صەدەقەی تێدا نییە مەگەر خاوەنەکەی بخوازێت.

له "الرقة[2]" چارەکی دەیەك، گەر تەنها سەد و نەوەد بوو شتێکی تێدا نییە، مەگەر خاوەنەکەی بخوازێت).

## ٤- دەروازەی: له "الركاز"دا پێنجیەك هەیە

١٧١١- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الْعَجْمَاءُ جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ). [خ١٤٩٩/ م١٧١٠]

(ق) لـه ئـەبی هورەیرەوە(خـوا لێـی رازی بێـت): پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: ("العجماء جُبار"[3] و "البئر جُبار[4]" و "المَعْدِن جُبـار[5]" لـه "الرِّكـاز"دا پێنجیـەك هەیە).

▪ وفِي رواية لهما: (الْعَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ..). [خ٦٩١٢]

له ریوایەتێکی هەردووکیانـدا: ("العجماء جُرْحُهـا جُبـار-گیانـداران برینـەکانیان بەهەدەر رۆیشتوون"..).

---

[1] "سائمة" بەرەڵاکراوی ناو لەوەڕگا -و.

[2] "الرِّقة" زیوی پاڵفتە -و.

[3] "العجماء جبار" "العجماء" هەموو گیاندارێك جگە له مرۆڤ، "جُبار" واتە "هَدْر-بـە هـەدر دەڕوات"-و.

[4] "البئر جبار" بیر-گەر له ناو زەوی خۆیدا لێـی دابێـت- گـەر یـەکێکی تێبکـەوێت و مـرد خوێنەکەی بە هەدەر رۆیشتووە-و.

[5] "المعـدن جبـار" کـانێکی لێـدابێت و یـەکێکی تێبکـەوێ و بمـرێ یـان کرێـی بـۆ بگـرێ و کانەکەی بەسەردا برمێ خوێنەکەی بە هەدەر رۆیشتووە-و.

**١٧١٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (فِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ).
* صحيح. [جه ٢٥١٠]

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە "الرِّكاز"[1]دا پێنجیەك هەیە).**

## ٥- دەروازەی: رازیکردنی "السعاة[2]"

**١٧١٣-** (م) عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنَ الأَعْرَابِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالُوا: إِنَّ نَاساً مِنَ الْمُصَدِّقِينَ، يَأْتُونَنَا فَيَظْلِمُونَنَا، قالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَرْضُوا مُصَدِّقِيكُمْ). [م٩٨٩]

**(م) لە جەریری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: خەڵکانێك لە ئەعراب هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتیان: خەڵکانێك لە "المُصَدِّقین" دێن بۆ لامان و ستەممان لێ دەکەن، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ("المُصَدِّقین"ی خۆتان رازی بکەن).**

## ٦- دەروازەی: مۆری حوشتری صەدەقە

**١٧١٤-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قَالَ: غَدَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِعَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ لِيُحَنِّكَهُ، فَوَافَيْتُهُ فِي يَدِهِ الْمِيسَمُ، يَسِمُ إِبِلَ الصَّدَقَةِ. [خ١٥٠٢/ م٢١١٩]
[وانظر: ٢٩٦٥، ٢٩٦٦].

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: سەر لە بەیانی بە عەبدوڵای کوڕی ئەبی تەلحەوە چووم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) تا شیرینی لە دەم بنێت، بینیم مۆرێکی بەدەستەوەیە حوشتری صەدەقەی پێ مۆر دەکرد.**

---

[1] "الرِّكاز" بریتییە لە گەنجینەی ناو زەوی-و.

[2] "السعاة یان المصدِّقین" بریتین لەو کەسانەی لەسەر زەکات و صەدەقە کار دەکەن -و.

## ٧- دەروازەی: زەکات لە بەندە و ئەسپدا نییە

١٧١٥- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي فَرَسِهِ وغلاَمِهِ صَدَقَةٌ). [خ١٤٦٣/ م٩٨٢]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لە ئەسپ و غوڵامی موسڵماندا صەدەقە نییە).**

## ٨- دەروازەی: پەلە پێ کردنی زەکات

١٧١٦- عَنْ عَلِيٍّ: أَنَّ الْعَبَّاسَ سَأَلَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فِي تَعْجِيلِ صَدَقَتِهِ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ، فَرَخَّصَ لَهُ فِي ذَلِكَ. [د١٦٢٤/ ت٦٧٨/ جه١٧٩٥/ مي١٦٧٦]

* حسن.

**لە عەلییەوە: عەباس پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد دەربارەی خێرا کردنی صەدەقەکەی[1] بەر لە هاتنی، لەوەدا مۆڵەتی دا.**

١٧١٧- وَعَنْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لِعُمَرَ: (إِنَّا قَدْ أَخَذْنَا زَكَاةَ الْعَبَّاسِ عَامَ الْأَوَّلِ لِلْعَامِ). [ت٦٧٩]

* حسن.

**هەر لە عەلییەوە: پێغەمبەر(ﷺ) بە عومەری فەرموو: (ئێمە زەکاتی عەباسمان ساڵی یەکەم بۆ ئەم ساڵ وەرگرتووە[2]).**

---

[1] خێراکردنی صەدەقەکەی: واتە پێشخستنی، بەرلەوەی وادەی دەرکردنی زەکاتی ماڵ و سامانەکەی بێتە بەرەوە کە هاتنەوەی ساڵە بەسەریدا-و.

[2] واتە: دانی زەکاتەکەی پێشخستووە-و.

## ٩- دەروازەی: دوعا بۆ ئەو کەسەی صەدەقەکەی دەهێنێت

**١٧١٨-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَتِهِمْ قَالَ: (**اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ فُلاَنٍ**)، فَأَتَاهُ أَبِي بِصَدَقَتِهِ، فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى**). [خ١٤٩٧/ م١٠٧٨]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە، وتی: گەر هۆزێك صەدەقەی خۆیان بهێنابا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (أللهم صل على آل فلان)، باوکم صەدەقەکەی خۆی بۆ هێنا، فەرمووی: (أللهم صل على آل أبي أوفى).**

## ١٠- دەروازەی: کار و پاداشتی صەدەقەکار

**١٧١٩-** عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَطَاءٍ . مَوْلَى عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ .، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ زِيَاداً . أَوْ بَعْضَ الْأُمَرَاءِ . بَعَثَ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَلَمَّا رَجَعَ قَالَ لِعِمْرَانَ: أَيْنَ الْمَالُ؟ قَالَ: وَلِلْمَالِ أَرْسَلْتَنِي؟ أَخَذْنَاهَا مِنْ حَيْثُ كُنَّا نَأْخُذُهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَوَضَعْنَاهَا حَيْثُ كُنَّا نَضَعُهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [د١٦٢٥/ جه١٨١١]

* صحيح.

**لە ئیبراهیمی کوڕی عەتاوە -مەولای عیمرانی کوڕی حوصەین- لە باوکییەوە: زیاد -یان یەکێك لە ئەمیران- عیمرانی کوڕی حوصەینی ڕەوانە کرد بۆ سەر صەدەقە، کاتێ گەڕایەوە بە عیمرانی وت: کوا ماڵەکە؟ وتی: بۆچی بۆ ماڵ منت ڕەوانە کرد بوو؟ لێمان وەرگرتن بەو جۆرەی لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لێمان وەردەگرتن، دابەشمان کرد بەو جۆرەی لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دابەشمان دەکرد.**

**١٧٢٠-** عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**الْعَامِلُ عَلَى الصَّدَقَةِ بِالْحَقِّ، كَالْغَازِي فِي سَبِيلِ اللهِ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ**). [د٢٩٣٦/ ت٦٤٥/ جه١٨٠٩]

* حسن.

لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(کارکەر لەسەر صەدەقە بە حەق وەك غەزاکەر وایە لە رێگەی خودا تا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی).**

**١٧٢١**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم بَعَثَ سَعْدَ بْنِ عُبَادَةَ مُصَدِّقاً وَقَالَ: (**إِيَّاكَ يَا سَعْدُ أَنْ تَجِيءَ يَوْمَ القِيَامَةِ بِبَعِيرٍ لَهُ رُغَاءٌ**) فَقَالَ: لا أَجِدُهُ وَلا أَجِيءُ بِهِ، فَأَعْفَاهُ.

* إسناده على شرطهما. [حب٣٢٧٠/ك١٤٥١]

لە ئیبن عومەرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) سەعدی کوڕی عوبادەی وەك کۆکەرەوەی صەدەقە رەوانە کرد و فەرمووی: **(ئەی سەعد، ئاگادارت دەکەمەوە لەوەی رۆژی قیامەت حوشترێك بهێنی باعەی[1] بێت)**، ئەویش وتی: نایبینمەوە و نایهێنم، بۆیە رەوانەی نەکرد.

## ١١- دەروازەی: جیاکردنەوەی حەقی زەکات

**١٧٢٢**– عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَبْعَثُ عَبْدَ الله بْنَ رَوَاحَةَ فَيَخْرُصُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ يَهُودَ قَالَ: فَجَمَعُوا لَهُ حُلِيّاً مِنْ حُلِيِّ نِسَائِهِمْ فَقَالُوا: هَذَا لَكَ، وَخَفِّفْ عَنَّا، وَتَجَاوَزْ فِي الْقَسْمِ، فَقَالَ عَبْدُ الله بْنُ رَوَاحَةَ ﷺ: يَا مَعْشَرَ يَهُودَ وَاللهِ إِنَّكُمْ لِمَنْ أَبْغَضِ خَلْقِ الله إِلَيَّ، وَمَا ذَلِكَ بِحَامِلِي عَلَى أَنْ أَحِيفَ عَلَيْكُمْ، فَأَمَّا الذي عَرَّضْتُمْ مِنَ الرِّشْوَةِ، فَإِنَّهَا سُحْتٌ، وَإِنَّا لاَ نَأْكُلُهَا، قَالُوا: بِهَذَا قَامَتِ السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ. [هق٤/١٢٢]

لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەبدولای کوڕی رەواحەی رەوانە کرد تا لە نێوان خۆی و یەهوود حەقی زەکات جیابکاتەوە، وتی: خشڵیان لە خشڵی ئافرەتانیان بۆ کۆکردەوە و وتیان: ئەمە بۆ تۆیە، لەسەرمان سووك بکە و

[1] باعە: یان بارەی بێت–و.

چاوپۆشی بکە لە دیاریکردن، عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: ئەی کۆمەڵی یەهوود، سوێند بە خودا، لە هەرچی خەڵك زیاتر رقم لە ئێوەیە، ئەوەش[1] وام لێ ناکات ستەمتان لێ بکەم، ئەوەی خستانە ڕوو لە بەرتیل بریتییە لە حەرام و ئێمە نایخۆین، وتیان: بەمە[2] ئاسمانەکان و زەوی ڕاگیراوە.

**١٧٢٣**– عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ بَعَثَهُ عَلَى خَرْصِ التَّمْرِ، وَقَالَ: إِذَا أَتَيْتَ أَرْضاً فَاخْرُصْهَا، وَدَعْ لَهُمْ قَدْرَ مَا يَأْكُلُونَ. [ك١٤٦٥/هق٤/١٢٤]

لە سەهلی کوڕی ئەبی حەسمەوە: عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی ڕازی بێت) ئەوی ڕەوانە کرد بۆ جیاکردنەوەی حەقی زەکات لە خورمادا، و وتی: گەر چوویتە زەوییەك حەقی زەکاتەکەی دیاری بکە و بڕی ئەوەی دەیخۆن بۆیان بەجێبهێڵە.

## ١٢- دەروازەی: شوێنی وەرگرتنی صەدەقە

**١٧٢٤**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**تُؤْخَذُ صَدَقَاتُ الْمُسْلِمِينَ عَلَى مِيَاهِهِمْ**). [جه١٨٠٦]

* حسن صحيح.

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**صەدەقەی موسڵمانان لەسەر ئاوەکانیان لێیان وەردەگیرێت**)[3].

---

[1] ئەوەش: واتە ئەو ڕقە–و.

[2] بەمە: واتە بەم عەدالەتە–و.

[3] مەبەست زەکاتی وڵاخ و حوشتر و مەڕ و بزنە، دەبێ کاتێ لێیان وەربگیرێت ئەو ئاژەڵانە لەسەر ئاو کۆدەبنەوە، چونکە ژماردنیان ئاسانترە و دەرکەوتن و کۆبوونەوەیان باشترە–و.

## ١٣- دەروازەی: ئەوەی زەکاتی تێدا واجب دەبێت لە ماڵ و سامان

**١٧٢٥**- عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ قَالَ: عِنْدَنَا كِتَابُ مُعَاذٍ عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُ إِنَّمَا أَخَذَ الصَّدَقَةَ مِنَ الْحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ وَالزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ. [حم٢١٩٨٩]

* إسناده صحيح، رجاله رجال الشيخين.

**لە موسای کوڕی تەلحەوە، وتی: نوسراوەکەی موعازمان هەیە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): ئەو صەدەقەی لە گەنم و جۆ و مێوژ و خورما وەرگرتووە.**

**١٧٢٦**- عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ كَتَبَ إِلَى عَامِلِهِ عَلَى دِمَشْقَ فِي الصَّدَقَةِ: إِنَّمَا الصَّدَقَةُ فِي الْحَرْثِ وَالْعَيْنِ وَالْمَاشِيَةِ. [ط٥٧٧]

**لە مالیکەوە، پێیگەیشتووە: عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆ کاربەدەستەکەی خۆی لە دیمەشق لە صەدەقەدا نووسی: صەدەقە لە کشتوکاڵ و زێڕ و زیو(پارە) و ئاژەڵدایە.**

**١٧٢٧**- عَنْ مَالِك: أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ عَنِ الزَّيْتُونِ، فَقَالَ: فِيهِ الْعُشْرُ. [ط٦١٠]

**لە مالیکەوە، ئەو پرسیاری لە ئیبن شیهاب کرد دەربارەی زەیتوون، وتی: دەیەکی تێدایە.**

## ١٤- دەروازەی: زەکاتی زێڕ و زیو

**١٧٢٨**- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(قَدْ عَفَوْتُ عَنْ صَدَقَةِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، فَهَاتُوا صَدَقَةَ الرِّقَةِ، مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَماً دِرْهَماً، وَلَيْسَ فِي تِسْعِينَ وَمِائَةٍ شَيْءٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ مِائَتَيْنِ فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ)**. [د١٥٧٤/ ت٦٢٠/ ٢٤٧٦ن/ جه١٧٩٠/ مي١٦٦٩]

* صحيح.

[وانظر: ١٧١٠].

**لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە صەدەقەی ئەسپ و کۆیلە بووراوم، صەدەقەی زیو بدەن، لە هەر چل درهەمێك یەك**

**درهەم، لە سەد و نەوەددا شتێك لە صەدەقە نییە، گەر گەیشتە دووسەد پێنج درهەمی تێدایە).**

## ١٥- دەروازەی: زەکاتی خشڵ

**١٧٢٩–** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَلْبَسُ أَوْضَاحاً مِنْ ذَهَبٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَكَنْزٌ هُوَ؟ فَقَالَ: (**مَا بَلَغَ أَنْ تُؤَدَّى زَكَاتُهُ، فَزُكِّيَ فَلَيْسَ بِكَنْزٍ**). [د١٥٦٤]

* حسن.

**لە ئوم سەلەمەوە، وتی: خشڵی زێڕم دەپۆشی، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا ئەمە گەنجینە کردنە[1]؟ فەرمووی: (ئەوەی گەیشتە رادەی زەکاتدان زەکاتەکەی بدرێت بریتی نییە لە گەنجینەکردن).**

**١٧٣٠–** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَدَّادِ بْنِ الْهَادِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَرَأَى فِي يَدَيَّ فَتَخَاتٍ مِنْ وَرِقٍ، فَقَالَ: (**مَا هَذَا يَا عَائِشَةُ**)؟ فَقُلْتُ: صَنَعْتُهُنَّ أَتَزَيَّنُ لَكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**أَتُؤَدِّينَ زَكَاتَهُنَّ**)؟ قُلْتُ: لاَ، أَوْ مَا شَاءَ اللهُ، قَالَ: (**هُوَ حَسْبُكِ مِنَ النَّارِ**). [د١٥٦٥]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی شەدادی کوڕی ئەلهادەوە، وتی: چووینە ژوورەوە بۆ لای عائیشە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لام چەندین ئەنگوستیلەی گەورەی زیوم لەدەست بوو، فەرمووی: (ئەوە چییە، ئەی عائیشە؟)، وتم: دروستم کردوون، خۆمی پێ دەڕازێنمەوە بۆ تۆ، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (ئایا زەکاتیان دەردەکەی؟)، وتم: نەخێر، یان ئەوەی خودا ویستی، فەرمووی: (ئەوە بەسە بۆ تۆ لە ئاگر).**

---

[1] ئاماژەیە بە ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[ التوبة: ٣٤]، واتە: ئایا ئەم خشڵەی من بەر هەڕەشەی ئەو ئایەتە دەکەوێت؟–و.

**١٧٣١**– عَنِ الْقَاسِمِ: أَنَّ عَائِشَةَ. زَوْجَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم. كَانَتْ تَلِي بَنَاتِ أَخِيهَا، يَتَامَى فِي حَجْرِهَا، لَهُنَّ الْحَلْيُ، فَلاَ تُخْرِجُ مِنْ حُلِيِّهِنَّ الزَّكَاةَ. [ط٥٨٤]

* إسناده صحيح.

**لە قاسمەوە: عائیشە–هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)– سەرپەرشتی کچەکانی براکەی خۆی دەکرد، بێباوك بوون و لە ئامێزی ئەو بوون، خشڵیان هەبوو، لە خشڵەکەیان زەکاتی دەرنەدەکرد.**

**١٧٣٢**– عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يُحَلِّي بَنَاتِهِ وَجَوَارِيَهُ الذَّهَبَ، ثُمَّ لاَ يُخْرِجُ مِنْ حُلِيِّهِنَّ الزَّكَاةَ. [ط٥٨٥]

* إسناده صحيح.

**لە نافیعەوە: ئیبن عومەر خشڵی زێڕی دەدا بە کچەکانی و جاریەکانی، پاشان لە خشڵەکانیان زەکاتی دەرنەدەکرد.**

## ١٦– دەروازەی: زەکاتی هەنگوین

**١٧٣٣**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(فِي الْعَسَلِ، فِي كُلِّ عَشَرَةِ أَزُقٍّ، زِقٌّ)**. [ت٦٢٩]

* صحيح، وقال الترمذي: في إسناده مقال.

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە هەنگویندا لە هەر دە (أَزُقّ[1]) یەك (زِقّ)).**

**١٧٣٤**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ كِتَابٌ مِنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ إِلَى أَبِي وَهُوَ بِمِنًى: أَنْ لاَ يَأْخُذَ مِنَ الْعَسَلِ، وَلاَ مِنَ الْخَيْلِ صَدَقَةً. [ط٦١٤]

---

[1] **"أزُقّ" كۆی وشەی "زِقّ"ە، دەفرێکی چەرم بووە وەك هیزە–و.**

لە عەبدوڵای کوڕی ئەبوبەکری کوڕی عەمری کوڕی حەزمەوە، وتی: نوسراوێك لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هات بۆ بۆ باوکم ئەو لە مینا بوو: لە هەنگوین و لە ئەسپ صەدەقە وەرنەگرێت.

**١٧٣٥**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَتَبَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ، أَنْ يُؤْخَذَ مِنَ الْعَسَلِ الْعُشْرُ. [هق٤/١٢٦]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نووسی بۆ ئەهلی یەمەن لە هەنگوین دەیەك وەربگیرێت.

## ١٧- دەروازەی: ئایا جگە لە زەکات لە ماڵ و ساماندا حەقێکی تر هەیە؟

**١٧٣٦**– عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِي أَنَّهُ سَمِعَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: إِنَّ الله فَرَضَ عَلَى الأَغْنِيَاءِ فِي أَمْوَالِهِمْ بِقَدْرِ مَا يكْفِي فُقَرَاءَهُمْ، فَإِنْ جَاعُوا وَعُرُوا وَجُهِدُوا فَبِمَنْعِ الأَغْنِيَاءِ، وَحَقٌّ عَلَى الله أَنْ يُحَاسِبَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيُعَذِّبَهُمْ عَلَيْهِ. [هق٧/٢٣]

لە محەمەدی کوڕی عەلییەوە، ئەو گوێی لە عەلی کوڕی ئەبی تالب(خوا لێی ڕازی بێت) بوو وتی: بە بڕی ئەوەی بەشی هەژاران بکات خودا لەسەر ماڵ و سامانی دەوڵەمەندان فەرزی کردووە، گەر برسی بوون و ڕووت بوون و شەکەت و ماندوو بوون بەهۆی ڕێگری دەوڵەمەندانەوەیە، حەقە لەسەر خودا لە ڕۆژی قیامەت موحاسەبەیان بکات و لەسەری سزایان بدات.

## ١٨- دەروازەی: سزای ئەو کەسەی زەکات نادات

**١٧٣٧**– عَنْ معاوية بْنِ حَيْدَةَ الْقُشَيْرِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**فِي كُلِّ إِبِلٍ سَائِمَةٍ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ: ابْنَةُ لَبُونٍ، لاَ يُفَرَّقُ إِبِلٌ عَنْ حِسَابِهَا، مَنْ أَعْطَاهَا مُؤْتَجِراً فَلَهُ أَجْرُهَا، وَمَنْ أَبَى فَإِنَّا آخِذُوهَا وَشَطْرَ إِبِلِهِ، عَزْمَةٌ مِنْ عَزَمَاتِ رَبِّنَا، لاَ يَحِلُّ لآلِ مُحَمَّدٍ مِنْهَا شَيْءٌ**).

[د١٥٧٥/ ن٢٤٤٣/ مي١٧١٩]

لە موعاویەی کوڕی حەیدەتی قوشەیرییەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(لە هەر چل حوشترێکی "سائمة[1]" یەك "ابنة لبون[2]"[3]، هیچ حوشترێك لە حساب کردنی جیاناکرێتەوە[4]، هەر کەس بۆ داوای پاداشت بیدات پاداشتی بۆ هەیە، هەر کەسیش نەیدات ئێمە نیوەی حوشترەکانی دەبەین، ئەوەش وەك حەقێك لە حەقەکانی پەروەردگارمان، بۆ ئالی محەمەد شتێك لەوە حەڵاڵ نییە).**

- ولفظ أبي داود والدارمي: (وَمَنْ مَنَعَهَا، فَإِنَّا آخِذُوهَا وَشَطْرَ مَالِهِ).

* حسن.

لەفزەکەی ئەبی داود و داریمی: **(هەر کەس زەکاتی نەدا ئێمە زەکاتەکەی و نیوەی ماڵ و سامانەکەی دەبەین).**

## ١٩- دەروازەی: زەکاتی ماڵی منداڵی بێباب و بازرگانی تیایدا

**١٧٣٨-** عَنِ الْقَاسِمِ أَنَّهُ قَالَ: كَانَتْ عَائِشَةُ تَلِينِي وَأَخاً لِي يَتِيمَيْنِ فِي حَجْرِهَا، فَكَانَتْ تُخْرِجُ مِنْ أَمْوَالِنَا الزَّكَاةَ. [ط٥٨٧]

* إسناده صحيح.

**لە قاسمەوە، وتی: من و برایەکم وەك دوو منداڵی بێباب عائیشە لەخۆی گرتبووین و سەرۆکاری دەکردین، ئەو لە ماڵ و سامانی ئێمە زەکاتی دەردەکرد.**

---

[1] "سائمة" گیاندارێکە بەرەڵای لەوەڕگا کرابێت و زۆربەی ڕۆژەکانی ساڵ لە لەوەڕاندن تێچوونی نەبێت–و.

[2] "ابنة لبون" حوشترێکە دوو ساڵی تەواو کردبێت پێی لە سێ ساڵ نابێت–و.

[3] لە هەر چل حوشتر یەك حوشتر دوو ساڵی تەواو کردبێت و پێی لە سێ نابێت کاتێکە ژمارەی حوشترەکان لە سەد و بیست زیاتر بن، تەماشای فەرموودەی (١٧١٠) بکە–و.

[4] واتە: قەڵە و لات و گەورە و بچووك سەرژمێر دەکرێن–و.

**١٧٣٩**– عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: ابْتَغُوا بِأَمْوَالِ الْيَتَامَى لاَ تَأْكُلْهَا الصَّدَقَةُ. [هق٤/١٠٧]

* إسناده صحيح.

**لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە، عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) وتی: ماڵ و سامانی منداڵی بێباب بخەنەگەڕ[1] تا صەدەقە[2] نەیخوات.**

## ٢٠- دەروازەی: زەکات لە قەرز

**١٧٤٠**– عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ كَانَ يَقُولُ: هَذَا شَهْرُ زَكَاتِكُمْ، فَمَنْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ؛ فَلْيُؤَدِّ دَيْنَهُ، حَتَّى تَحْصُلَ أَمْوَالُكُمْ، فَتُؤَدُّونَ مِنْهُ الزَّكَاةَ. [ط٥٩١]

* إسناده صحيح.

**لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە: عوسمانی کوڕی عەففان دەیوت: ئەمە مانگی زەکاتی ئێوەیە، هەر کەس قەرزێکی لەسەرە با قەرزەکەی بداتەوە تا ماڵ و سامانەکەتان دەمێنێتەوە و زەکاتی لێ دەدەن.**

**١٧٤١**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: زَكُّوا مَا كَانَ فِي أَيْدِيكُمْ، وَمَا كَانَ مِنْ دَيْنٍ فِي ثِقَةٍ فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ مَا فِي أَيْدِيكُم، وَمَا كَانَ مِنْ دَيْنٍ ظَنُونَ فَلاَ زَكَاةَ فِيهِ حَتَّى يَقْبِضَهُ. [هق٤/١٥٠]

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: ئەوەی لەدەستی ئێوەدایە زەکاتی لێ بدەن، ئەوەش لە قەرزێکی متمانەداردایە وەك ئەوە وایە لە دەستی خۆتاندا بێت[3]، ئەوەی لە قەرزێکی گومانئامێزدایە زەکاتی تێدا نیە تا دێتەوە دەستتان.**

---

[1] واتە: بازرگانی پێوە بکەن و بەرهەمی بهێنن–و.

[2] واتە: زەکات–و.

[3] واتە: زەکاتی ئەوەش بدەن–و.

## ٢١- دەروازەی: زەکات نییە تا ساڵێکی بەسەردا دێتەوە

**١٧٤٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنِ اسْتَفَادَ مَالاً، فَلاَ زَكَاةَ عَلَيْهِ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الحَوْلُ عِنْدَ رَبِّهِ**)، وفي رواية: (**فَلاَ زَكَاةَ فِيْهِ**). [ت٦٣١]

* صحيح.

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس ماڵێکی بەدەستهێنا زەکاتی لەسەر نییە تا لای پەروەردگاری ساڵێکی بەسەردا دێتەوە). لە ریوایەتێکدا: (زەکاتی تێدا نییە).**

**١٧٤٣-** عَنْ عَلِي ﷺ قَالَ: إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَالٌ اسْتَفَدْتَهُ فَلَيْسَ عَلَيْكَ زَكَاةٌ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الحَوْلِ. [هق٤/١٠٣]

**لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: گەر ماڵێکت لە لایە و بەدەستتهێناوە زەکاتت لەسەر نییە تا ساڵێکی بەسەردا دێتەوە.**

**١٧٤٤-** عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: لَمْ يَكُنْ أَبُو بَكْرٍ ﷺ يَأْخُذُ مِنْ مَالٍ زَكَاةً حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الحَوْلُ. [هق٤/١٠٣]

**لە قاسمی کوڕی محەمەدەوە، وتی: ئەبوبەکر(خوا لێی رازی بێت) لە ماڵێک زەکاتی نەدەبرد تا ساڵێکی بەسەردا دەهاتەوە.**

## ٢٢- دەروازەی: گواستنەوەی زەکات لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر

**١٧٤٥-** عَنْ أَسْلَمَ: أَنَّهُ لَمَّا كَانَ عَامُ الرَّمَادَةِ وَأَجْدَبَتْ بِبِلادِ الأَرْضُ، كَتَبَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ إِلى عَمْرِو بْنِ العَاصِ: مِنْ عَبْدِ اللهِ عُمَرَ أَمِيْرِ المُؤْمِنِينَ إِلَى العَاصِ بْنِ العَاصَ: لَعَمْرِي مَا تُبَالِي إِذَا سَمِنْتَ، وَمَنْ قِبَلَكَ، أَنْ أَعْجَفَ أَنَا وَمَنْ قِبَلِي وَيَا غَوْثَاهُ.

فَكَتَبَ عَمْرٌو: سَلامٌ، أَمَا بَعْدُ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، أَتَتْكَ عِيْرٌ أَوَّلُهَا عِنْدَكَ وَآخِرُهَا عِنْدِي، مَعْ أَنِّي أَرْجُو أَنْ أَجِدَ سَبِيلاً أَنْ أَحْمِلَ فِي البَحْرِ.

فَلَمَّا قَدِمَتْ أَوَّلُ عِيْرٍ دَعَا الزُّبَيْرَ فَقَالَ: اخْرُجْ فِي أَوَّلِ هذِهِ العِيْرِ فَاسْتَقْبِلْ بِهَا نَجْداً فَاحْمِلْ إِلى كُلِّ أَهْلِ بَيْتٍ قَدَرْتَ عَلَى أَنْ تَحْمِلَهُمْ إِلَيَّ، وَمَنْ لَمْ تَسْتَطِعْ حَمْلَهُ فَمُرْ لِكُلِّ أَهْلِ بَيْتٍ بِبَعِيرٍ بِمَا عَلَيْهِ، وَمُرْهُمْ فَلْيَلْبِسُوا كِيَاسَ الذِينَ فِيهِمُ الحِنْطَةَ، وَلْيَنْحَروا البَعِيرَ فَلْيَجْمِلُوا شَحْمَهُ وَلْيَقِدُّوا لَحْمَهُ، وَلْيَحْذُوا جِلْدَهُ، ثُمَّ لِيَأْخُذُوا كَمْيَّةً مِنْ قَدِيْدٍ وَكَمْيَّةً مِنْ شَحْمٍ وَحَفْنَةً مِنْ دَقِيقٍ، فَيَطْبُخُوا فَيَأْكُلُوا حَتَّى يَأْتِيَهُمُ اللهُ بِرِزْقٍ.

فَأَبَى الزُّبَيرُ أَنْ يَخْرُجَ، فَقَالَ: أَمَا وَاللهِ لا تَجِدُ مِثْلَهَا حَتَّى تَخْرُجَ مِنَ الدُّنْيا، ثُمَّ دَعَا آخَرَ أَظُنُّهُ طَلْحَةَ فَأَبَى.

ثُمَّ دَعَا أَبَا عُبَيْدَةَ بْنِ الجَرَّاحِ فَخَرَجَ فِي ذَلِكَ، فَلَمَّا رَجَعَ بَعَثَ إِلَيْهِ بِأَلْفِ دِينَارٍ، فَقَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ: إِنِّي لَمْ أَعْمَلْ لَكَ يَا ابْنَ الخَطَّابِ إِنَّمَا عَمِلْتُ للهِ وَلَسْتُ آخُذُ فِي ذَلِكَ شَيْئاً، فَقَالَ عُمَرُ: قَدْ أَعْطَانَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي أَشْيَاءَ بَعَثَنَا لَهَا فَكَرِهْنَا، فَأَبَى ذَلِكَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَاقْبَلْها أَيُّها الرَّجُل، فَاسْتَعِنْ بِهَا عَلَى دُنْيَاكَ وَدِينِكَ، فَقَبِلَهَا أَبُو عُبَيْدَةَ بْنِ الجَرَّاحِ. ثم ذكر الحديث. [مه٢٣٦٧/ك١٤٧١/هق٦/٣٥٥]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**لە ئەسلەمەوە: لە "عام الرمادة[1]"دا و وڵات و زەوی بە سیاساڵی وشکەهەڵگەڕا، عومەری کوڕی خەتاب بۆ عەمری کوڕی عاصی نووسی: لە عەبدوڵاوە عومەر ئەمیری باوەڕداران بۆ "العاص بن العاص": بە گیانم، باکێکت نییە گەر خۆت و ئەوانەی دەووروبەرت قەڵەو ببن و من و ئەوانەی دەووروبەرم لات ببین، هاوار بۆ هانا و پەنا.**

**عەمر نووسی: سەلام، پاشان: "لبیك، لبیك"، کاروانییەکت بۆ دێت سەرەتاکەی لای تۆ بێت و کۆتاییەکەی لای من، لەگەڵ ئەوەی رجام وایە رێگەیەك بدۆزمەوە لە دەریاوە باری بکەم.**

---

[1] **"عام الرمادة": لە خەلافەتی عومەردا(خوا لێی رازی بێت) برسێتی و گرانییەك لە مەدینە و دەووروبەری سەریهەڵدا، نۆ مانگ باران نەباری، تا زەوی رەشهەڵگەڕا و وەك "رماد-خۆڵەمێش"ی لێهات، بۆیە ناونرا (عام الرمادة-ساڵی خۆڵەمێش)-و.**

کاتێ سەرەتای قافڵەکە گەیشت عومەر زوبەیری بانگ کرد و وتی: سەرەتای ئەم قافڵەیە ببە و رووی بکەرە نەجد هەر خانەوادەیەك توانیت هەڵیانبگری بیانهێنە بۆ لام، توانای هەڵگرتنی هەر کەست نەبوو فەرمان بکە هەر خانەوادەیە حوشترێك و ئەوەی لە سەریەتی لە کۆڵ و بار پێی بدە، فەرمانیان پێ بکە ئەو گوێنوانەی گەنمەکانیان تێدایە بپۆشن، حوشترەکان سەرببڕن و بەزەکەی بتوێننەوە و گۆشتەکەی وشك بکەنەوە و پێستەکەی بکەن بە پێڵاو، پاشان هەندێ گۆشتی وشککراو و هەندێ چەوری و دوو مشت ئارد لێبنێن و بیخۆن تا خودا رۆزییان بۆ دەهێنێت.

زوبەیر(خوا لێی رازی بێت) نەیویست بڕوات، بۆیە عومەر وتی: سوێند بە خودا نموونەی ئەوە نابینییەوە تا لە دنیا دەردەچی، پاشان عومەر یەکێکی تری بانگ کرد–وا گومان دەبەم تەلحە بوو– ئەویش نەیویست بڕوات.

پاشان ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحی بانگ کرد، ئەو رۆیشت بۆ ئەو کارە، کاتێك گەڕایەوە هەزار دیناری بۆ نارد، ئەبو عوبەیدە وتی: من بۆ تۆ ئەو کارەم نەکردووە، ئەی کوڕی خەتاب، بەڵکو بۆ خودام ئەنجامداوە، بۆیە شتێك لەو پارە وەرناگرم، عومەر وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ هەندێ شت ئێمەی رەوانە دەکرد پارەی پێ دەداین، ئێمە لامان گران بوو، بەڵام پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی بەسەردا دەسەپاندین، بۆیە وەریبگرە، ئەی پیاو، کۆمەکی لێ وەربگرە بۆ سەر دین و دنیات، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح قبووڵی کرد، پاشان فەرموودەکەی باس کرد.

## بەشی دووەم

## زەكاتی سەرفیترە

### ١- دەروازەی: واجبوونی زەكاتی سەرفیترە و حوكمەكانی

**١٧٤٦-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم زَكَاةَ الْفِطْرِ، صَاعاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، عَلَى الْعَبْدِ وَالحُرِّ، وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى، وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، مِنَ المسْلِمِينَ. [خ١٥٠٣/ م٩٨٤]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) زەكاتی فیتری فەرز كرد"صاع[1]"ێك لە خورما یان "صاع"ێك لە جۆ لەسەر بەندە و ئازاد، و نێر و مێ، و بچووك و گەورە لە موسڵمانان.**

**١٧٤٧-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ، صَاعاً مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعاً مِن زَبِيبٍ.
[خ١٥٠٦ (١٥٠٥)/ م٩٨٥]

**(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ئێمە زەكاتی فیترمان دەردەكرد، "صاع"ێك لە خۆراك، یان "صاع"ێك لە جۆ، یان "صاع"ێك لە خورما، یان "صاع"ێك لە كەشك، یان"صاع"ێك لە مێوژ.**

**١٧٤٨-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَمَرَ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ، قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاَةِ. [خ١٥٠٩/ م٩٨٦]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی كرد بەدانی زەكاتی فیتر بەر لە دەرچوونی خەڵك بۆ نوێژ.**

---

[1] یەك (صاع) دوو كیلۆ و شەشسەد گرامە—و.

## ٢- دەروازەی: دەربارەی "الصاع"

١٧٤٩- (خ) عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: كَانَ الصَّاعُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مُدّاً وَثُلُثاً بِمُدِّكُمُ الْيَوْمَ، فَزِيدَ فِيهِ فِي زَمَنِ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ. [خ٦٧١٢]

**(خ) له سائیبی کوڕی یەزیدەوە، وتی: "صاع"ێك لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) "مُدّ"ێك و سێیەکی "مُدّ"ێك بوو بە "مُدّ"ی ئەمڕۆی ئێوە، لە سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز تیایدا زیاد کرا.**

١٧٥٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**الْوَزْنُ وَزْنُ أَهْلِ مَكَّةَ**، وَ**الْمِكْيَالُ مِكْيَالُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ**). [د٣٣٤٠/ ن٢٥١٩]

* صحيح.

**له ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کێشان کێشانی ئەهلی مەککەیە، پێوانە پێوانەی ئەهلی مەدینەیە)[1].**

## ٣- دەروازەی: کاتی دەرکردنی صەدەقە

١٧٥١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ، وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ، مَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ الصَّلاَةِ؛ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ، وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلاَةِ؛ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ. [د١٦٠٩/ جه١٨٢٧]

* حسن.

[وانظر: ١٧٤٨].

---

[1] **یەکەی پێوانەی (میکیال) بریتی بوو لە (رطل و صاع)، یەکەی پێوانەی (وزن) بریتی بوو لە کێشی دینار و درهەم، جیاوازی هەبوو لە کێشانە و پێوانەدا، بۆیە پێغەمبەر دیاری کرد، لە دەرکردنی زەکاتی دینار و درهەم کار بە کێشانەی ئەهلی مەککە دەکرێت، لە دەرکردنی زەکاتی گەنم و جۆ و خورما و مێوژ، هتد.. کار بە پێوانەی ئەهلی مەدینە دەکرێت-و.**

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) زەكاتی فیتری فەرز كرد وەك پاكبوونەوەی ڕۆژووگر لە لەغو و خراپە، هەروەها وەك خۆراكێك بۆ هەژاران، هەر كەس بەر لە نوێژ زەكاتەكەی دا بریتییە لە زەكاتێكی قبوولكراو، هەر كەس دوای نوێژ زەكاتەكەی دا بریتییە لە صەدەقەیەك لە صەدەقەكان.

**١٧٥٢**– عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَبْعَثُ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ إِلَى الَّذِي تُجْمَعُ عِنْدَهُ قَبْلَ الْفِطْرِ بِيَوْمَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةٍ. [ط٦٣٠]

لە نافیعەوە: عەبدوڵای كوڕی عومەر بە دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ بەر لە جەژن زەكاتی فیتری دەنارد بۆ لای ئەو كەسەی لای كۆدەبوویەوە.

## ٤- دەروازەی: زەكاتی فیتر بەر لە زەكات فەرزكرا

**١٧٥٣**– عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ تَنْزِلَ الزَّكَاةُ، فَلَمَّا نَزَلَتِ الزَّكَاةُ لَمْ يَأْمُرْنَا وَلَمْ يَنْهَنَا، وَنَحْنُ نَفْعَلُهُ. [ن٢٥٠٦/ جه١٨٢٨]

* صحيح.

لە قەیسی كوڕی سەعدەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێكردین بە زەكاتی فیتر بەرلەوەی زەكات دابەزێت، كاتێك زەكات دابەزی نە فەرمانی پێكردین نە نەهی لێكردین، ئێمە ئەنجاممان دەدا.

## بەشی سێیەم

## صەدەقەکان

### ١- دەروازەی: فەزڵی صەدەقە و هاندان بۆ سەری

**١٧٥٤-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ تَصَدَّقَ بِعَدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ، وَلاَ يَقْبَلُ اللهُ إِلاَّ الطَّيِّبَ، فَإِنَّ اللهَ يَتَقَبَّلُهَا بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يُرَبِّيها لِصَاحِبِهَا، كَما يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ، حَتَّى تَكونَ مِثْلَ الجَبَلِ). [خ١٤١٠/ م١٠١٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بە هاوتای دەنکە خورمایەك لە کەسابەتی پاك و حەڵاڵ بکات بە صەدەقە-خودا تەنها پاك و حەڵاڵ وەردەگرێت- ئەواخودا بە دەستی راستی وەریدەگرێت و پاشان بۆ خاوەنەکەی زیاد دەکات، وەك چۆن یەکێك لە ئێوە جوانوەکەی[١] گەورە دەکات تا وەك ئەسپی لێ دێت).**

**١٧٥٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (ما مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلاَّ مَلَكَانِ يَنْزِلاَنِ، فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقاً خَلَفاً، وَيَقُولُ الآخَرُ: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكاً تَلَفاً). [خ١٤٤٢/ م١٠١٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خـوا لێـی رازی بێـت): پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: **(هـەر رۆژێك بەندەکان رۆژی تیادەکەنەوە دوو فریشتە لە ئاسمانەوە دادەبەزن، یەکێکیان دەڵێت: خودایە، جێگرەوە بە خەرجکەر[٢] بدە، ئەویتریان دەڵێت: خودایە، تیابردن بە دەستگرەوە[٣] بدە).**

---

[١] جوانوو بەچکەی ماین و ئەسپە-و.

[٢] واتە: خەرجکەر بۆ ماڵ و منداڵ و بۆ هەژاران لە پێناوی خودا-و.

[٣] دەستگرەوە: بریتییە لە کەسی دەستنوقاو-و.

١٧٥٦– عَنْ مَالِكِ بْنِ نَضْلَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**الْأَيْدِي ثَلاَثَةٌ: فَيَدُ اللهِ الْعُلْيَا، وَيَدُ الْمُعْطِي الَّتِي تَلِيهَا، وَيَدُ السَّائِلِ السُّفْلَى، فَأَعْطِ الْفَضْلَ، وَلاَ تَعْجِزْ عَنْ نَفْسِكَ**).

* صحيح. [د١٦٤٩]

**لە مالیکی کوڕی نەزلەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دەست سیانە: دەستی خودا بەرز و بالایە، و دەستی بەخشەر ئەو دەستەیە بەدوایدا دێت، و دەستی داواکەریش نزمە).**

١٧٥٧– عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّهُمْ ذَبَحُوا شَاةً، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا بَقِيَ مِنْهَا**)؟ قَالَتْ: مَا بَقِيَ مِنْهَا إِلاَّ كَتِفُهَا، قَالَ: (**بَقِيَ كُلُّهَا غَيْرَ كَتِفِهَا**). [ت٢٤٧٠]

* صحيح.

**لە عائیشەوە: ئەوان کاوڕێکیان سەربڕی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (چی لێ ماوەتەوە؟)، وتی: تەنها دەستەکەی ماوەتەوە، پێغەمبەر فەرمووی: (هەمووی ماوەتەوە جگە لە دەستەکەی).**

١٧٥٨– عَنْ مَالِك قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ مِسْكِيناً اسْتَطْعَمَ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، وَبَيْنَ يَدَيْهَا عِنَبٌ، فَقَالَتْ لِإِنْسَانٍ: خُذْ حَبَّةً فَأَعْطِهِ إِيَّاهَا، فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَيَعْجَبُ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَتَعْجَبُ؟ كَمْ تَرَى فِي هَذِهِ الْحَبَّةِ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ! [ط١٨٧٩]

* اسناده منقطع

**لە مالیکەوە، وتی: پێمگەیشتووە گەدایەک داوای خواردنی لە عائیشە، دایکی باوەڕداران کرد، لەبەردەستی ترێ هەبوو، وتی بە مرۆڤێ: دەنکێك ببە و پێی بدە، ئەویش تەماشای عائیشەی دەکرد و سەری لێی سوڕما، عائیشە وتی: سەرت سوڕدەمێنێ؟ ئەو دەنکە ترێ چەند "مثقال ذرة"ی تێدایە؟.**

**١٧٥٩-** عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**كُلُّ امْرِئٍ فِي ظِلِّ صَدَقَتِهِ، حَتَّى يُفْصَلَ بَيْنَ النَّاسِ، أَوْ قَالَ حَتَّى يُحْكَمَ بَيْنَ النَّاسِ**). [هق٤/١٧٧]

* قال الذهبي: إسناده قوي.

[وانظر: **٣٣٣٦** (والصدقة برهان).

وانظر: **٣٣٣٧** (ما نقصت صدقة من مال).

وانظر: **٣١٣٣** (في عدم شراء ما تصدق به)

**لە عوقبەی کوڕی عامرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەموو مرۆیەك لەژێر سێبەری صەدەقەکەی خۆیدایە، تا لە نێوان خەڵك دادگایی دەکرێت-یان وتی:- تا لەناو خەڵك حوکم دەدرێت).**

## ٢- دەروازەی: لەسەر هەموو موسڵمانێك صەدەقە هەیە

**١٧٦٠-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ**). قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قالَ: (**فَيَعْمَلُ بِيَدَيْهِ، فَيَنْفَعُ نَفْسَهُ وَيَتَصَدَّقُ**). قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، أَوْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قالَ: (**فَيُعِينُ ذَا الحَاجَةِ المَلْهُوفَ**). قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: (**فَلْيَأْمُرْ بِالْخَيْرِ، أَوْ قَالَ: بِالمَعْرُوفِ**). قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: (**فَلْيُمْسِكْ عَنِ الشَّرِّ، فَإِنَّهُ لَهُ صَدَقَةٌ**).

[خ٦٠٢٢ (١٤٤٥)/ م١٠٠٨]

(ق) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(لەسەر هەموو موسڵمانێك صەدەقە هەیە)**، وتیان: ئەی ئەگەر نەیبوو؟ فەرمووی: **(با بە دەستی کار بکات و سوود بە خۆی بگەیەنێت و صەدەقە بکات)**، وتیان: ئەی ئەگەر نەیتوانی، یان ئەنجامی نەدا؟ فەرمووی: **(با کۆمەکی کەسێکی خاوەن پێویستی بەگیرهاتوو بکات)**، وتیان: ئەی گەر ئەوەی ئەنجام نەدا؟ فەرمووی: **(با فەرمان بکات بە خێر-یان فەرمووی- بە چاکە)**، وتی: ئەی گەر ئەوەی نەکرد؟ **فەرمووی: (با خۆی لە شەڕ بگرێتەوە، چونکە ئەوە بۆ ئەو صەدەقەیە).**

**١٧٦١**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(كُلُّ سُلاَمى مِنَ النَّاسِ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ، كُلَّ يَوْمٍ تَطْلُعُ فِيهِ الشَّمْسُ: يَعْدِلُ بَيْنَ الاِثْنَيْنِ صَدَقَةٌ، وَيُعِينُ الرَّجُلَ عَلَى دَابَّتِهِ فَيَحْمِلُ عَلَيْهَا . أَوْ يَرْفَعُ عَلَيْهَا . مَتَاعَهُ صَدَقَةٌ، وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ خُطْوَةٍ يَخْطُوهَا إِلَى الصَّلاَةِ صَدَقَةٌ، وَيُمِيطُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ)**. [خ٢٩٨٩ (٢٧٠٧)/ م١٠٠٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەموو جومگەیەك لە جەستەی خەڵك صەدەقەیەكی لەسەرە، هەموو ڕۆژێ خۆری تێدا هەڵدێت: نێوانی دوو كەس ڕێكدەخات صەدەقەیەكە، یارمەتی پیاو دەدات بۆ سەر وڵاخی سوارییەكەی و كۆڵ و بارەكەی دەخاتە سەری–یان بەرزی دەكاتەوە بۆ سەری– صەدەقەیەكە، قسەیەكی پاك و چاك صەدەقەیەكە، هەر هەنگاوێك هەڵیدەگرێت بۆ نوێژ صەدەقەیەكە، ئازار لە ڕێگە لادەبات صەدەقەیەكە)**.

- وفي رواية للبخاري: **(ودَلُّ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ)**. [خ٢٨٩١]

لە ڕیوایەتێكی بوخاریدا: **(ڕێگە نیشاندان صەدەقەیەكە)**.

## ٣- دەروازەی: هەموو چاكەیەك صەدەقەیەكە

**١٧٦٢**– (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ)**. [خ٦٠٢١]

(خ) لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەموو چاكەیەك صەدەقەیەكە)**.

**١٧٦٣**– (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ: أَنَّ نَاساً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالُوا لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: يَا رَسُولَ اللهِ، ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالأُجُورِ، يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ، وَيَتَصَدَّقُونَ بِفُضُولِ أَمْوَالِهِمْ! قَالَ: **(أَوَ لَيْسَ قَدْ جَعَلَ اللهُ لَكُمْ مَا تَصَدَّقُونَ؟ إِنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ، وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ)**. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيَأْتِي أَحَدُنَا

شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ؟ قَالَ: (أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ، أَكَانَ عَلَيْهِ فِيهَا وِزْرٌ؟ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلاَلِ كَانَ لَهُ أَجْرٌ). [م١٠٠٦]

(م) لە ئەبی زەڕەوە: خەڵکانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بە پێغەمبەریان(ﷺ) وت: ئەی پێغەمبەری خودا، دەوڵەمەندان پاداشتەکانیان بۆ خۆیان بردووە، نوێژ دەکەن وەك چۆن ئێمە نوێژ دەکەین، ڕۆژوو دەگرن وەك چۆن ئێمە ڕۆژوو دەگرین، زیادەی ماڵ و سامانیشیان دەکەن بە صەدەقە، پێغەمبەر فەرمووی: **(بۆ مەگەر خودا شتی بە ئێوە نەداوە بیکەن بە صەدەقە؟ هەموو "سبحان الله"یەك صەدەقەیەکە، هەموو "الله أكبر"ێك صەدەقەیەکە، هەموو "الحمد لله"یەك صەدەقەیەکە، هەموو "لا إله إلا الله"یەك صەدەقەیەکە، فەرمان بە چاکە صەدەقەیەکە، نەهی لە خراپە صەدەقەیە، لە دانانی تۆوی یەکێکتان صەدەقەیەکە)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا یەکێك لە ئێمە حەزی خۆی جێبەجێ بکات تیایدا پاداشتی بۆ هەیە؟ فەرمووی: **(باشە گەر لە حەرامدا دایبنێت ئایا گوناهی لەسەرە؟ هەر بە جۆرە گەر لە حەڵاڵدا دایبنێ پاداشتی بۆ هەیە)**.

## ٤- دەروازەی: فەزڵی صەدەقەی لەشساغی دەستنوقاو

١٧٦٤- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَعْظَمُ أَجْراً؟ قَالَ: (أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ، تَخْشَى الْفَقْرَ، وَتَأْمُلُ الْغِنَى، وَلاَ تُمْهِلُ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ، قُلْتَ: لِفُلانٍ كَذَا، وَلِفُلانٍ كَذَا، وَقَدْ كَانَ لِفُلانٍ). [خ١٤١٩/ م١٠٣٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، کام صەدەقە مەزنترین پاداشتی هەیە؟ فەرمووی: **(صەدەقە بکەی و تۆ لەشت ساغ بێت و دەستنوقاو بیت، ترسی هەژاریت**

**هەبێت و هیوای دەوڵەمەندبوونت هەبێت، دوای ناخات تا گیان دەگاتە قوڕگی، ئەوکات بڵێ: ئەوە بۆ فلان، و ئەوە بۆ فلان، ئەوە بووە بە موڵکی فلان[1]).**

## ٥- دەروازەی: جێگیربوونی پاداشتی صەدەقە با بەر کەسی ناشایستەش کەوتبێت

**١٧٦٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(قَالَ رَجُلٌ: لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ، فَوَضَعَهَا فِي يَدِ سَارِقٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ عَلَى سَارِقٍ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ، لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدَيْ زَانِيَةٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ اللَّيْلَةَ عَلَى زَانِيَةٍ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ، عَلَى زَانِيَةٍ، لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ، فَوَضَعَهَا فِي يَدَيْ غَنِيٍّ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ عَلَى غَنِيٍّ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ عَلَى سَارِقٍ، وَعَلَى زَانِيَةٍ، وَعَلَى غَنِيٍّ.**

**فَأُتِيَ: فَقِيلَ لَهُ: أَمَّا صَدَقَتُكَ عَلَى سَارِقٍ: فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعِفَّ عَنْ سَرِقَتِهِ، وَأَمَّا الزَّانِيَةُ: فَلَعَلَّهَا أَنْ تَسْتَعِفَّ عَنْ زِنَاهَا، وَأَمَّا الْغَنِيُّ: فَلَعَلَّهُ يَعْتَبِرُ، فَيُنْفِقُ مِمَّا أَعْطَاهُ اللهُ).** [خ١٤٢١/ م١٠٢٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پیاوێك وتی: هەڵدەستم بە ئەنجامدانی صەدەقەیەك، صەدەقەکەی دەرکرد و خستییە ناو دەستی دزێك، ڕۆژیان لێبوویەوە و کەوتنە قسەکردن: صەدەقە بە دز دەکات[2]، ئەویش وتی: خودایە، حەمد بۆ تۆ، ئەمجارە صەدەقەیەك ئەنجام دەدەم، صەدەقەکەی دەرکرد و خستییە ناو دوو دەستی ئافرەتێکی زیناکەر، ڕۆژیان لێبوویەوە و کەوتنە قسەکردن: ئەم شەو صەدەقەی بە ئافرەتێکی زیناکەر کردووە، ئەویش وتی: خودایە، حەمد بۆ تۆ، هەڵدەستم بە ئەنجامدانی صەدەقەیەك،**

---

[1] واتە: پێویست ناکات لە سەرەمەرگدا بڵێی: ئەوە بۆ فلان و ئەوە بۆ فلان، چونکە تۆ مردووی و ئەوە بە میرات بووە بە موڵکی فلان، هەوڵبدە بەر لە مردنت خێر و صەدەقە ئەنجام بدەی-و.

[2] واتە: ڕۆژیان لێ بوویەوە و خەڵکی کەوتنە تانە و تەشەر لێدانی و وتیان: صەدەقە بە دز دەکات-و.

صەدەقەكەی دەركرد و خستییە ناو دوو دەستی دەوڵەمەندێك، ڕۆژیان لێبوویەوە كەوتنە قسەكردن: صەدەقە بە دەوڵەمەند دەكات، ئەویش وتی: خودایە حەمد بۆ تۆ لەسەر دزێك و لەسەر ئافرەتێكی زیناكەر و لەسەر دەوڵەمەندێك.

هاتنە لای و پێی وترا: صەدەقەكەت بە دزەكە لەوانەیە لە دزییەكە خۆی پاك ڕابگرێت[1]، ئافرەتە زیناكەرەكە: بەڵكو لە زیناكە خۆی پاك ڕابگرێت، دەوڵەمەندەكەش: بەڵكو پەند و ئامۆژگاری وەربگرێت و لەوەی خودا پێیداوە ببەخشێت).

## ٦- دەروازەی: ئەوەی ژن و خزمەتكار دەیكەن بە صەدەقە

**١٧٦٦-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ طَعَامِ بَيْتِهَا، غَيْرَ مُفْسِدَةٍ، كانَ لَهَا أَجْرُهَا بِمَا أَنْفَقَتْ، وَلِزَوْجِهَا أَجْرُهُ بِمَا كَسَبَ، وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذلِكَ، لاَ يَنْقُصُ بَعْضُهُمْ أَجْرَ بَعْضٍ شَيْئاً). [خ١٤٢٥/ م١٠٢٤]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئافرەت لە خۆراكی ماڵەكەی بەخشی، تێكدەر و تیابەر نەبێت، پاداشتی بۆ هەیە بەوەی خەرجی كردووە، بۆ مێردەكەشی پاداشت هەیە بەوەی بەدەستی هێناوە، بۆ گەنجینەداریش بەهەمان شێوە، یەكێكیان لە پاداشتی ئەویتریان كەم ناكاتەوە).**

## ٧- دەروازەی: صەدەقە بەپێی توانا و نەژماردنی

**١٧٦٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (سَبَقَ دِرْهَمٌ مِائَةَ أَلْفٍ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَكَيْفَ؟ قَالَ: (رَجُلٌ لَهُ دِرْهَمَانِ، فَأَخَذَ أَحَدَهُمَا فَتَصَدَّقَ بِهِ، وَرَجُلٌ لَهُ مَالٌ كَثِيرٌ، فَأَخَذَ مِنْ عُرْضِ مَالِهِ مِائَةَ أَلْفٍ فَتَصَدَّقَ بِهَا). [ن٢٥٢٦، ٢٥٢٧]

* حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(درهەمێك پێش سەد هەزار درهەم كەوت)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن؟ فەرمووی: **(پیاوێك دوو**

---

[1] واتە: وازبهێنێ لە دزی كردن-و.

**درهەمی هەیە، یەکێك دەبات و دەیکات بە صەدەقە، پیاوێکیش ماڵ و سامانێکی گەورەی هەیە و لە ماڵەکەی سەد هەزار دەبات و دەیکات بە صەدەقە).**

١٧٦٨- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ: كُنَّا يَوْماً فِي الْمَسْجِدِ جُلُوساً وَنَفَرٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ، فَأَرْسَلْنَا رَجُلاً إِلَى عَائِشَةَ لِيَسْتَأْذِنَ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهَا، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ سَائِلٌ مَرَّةً وَعِنْدِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَمَرْتُ لَهُ بِشَيْءٍ، ثُمَّ دَعَوْتُ بِهِ فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَمَا تُرِيدِينَ أَنْ لاَ يَدْخُلَ بَيْتَكِ شَيْءٌ، وَلاَ يَخْرُجَ إِلاَّ بِعِلْمِكِ)؟** قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: **(مَهْلاً، يَا عَائِشَةُ! لاَ تُحْصِي، فَيُحْصِيَ اللهُ عزّ وجل عَلَيْكِ).** [ن٢٥٤٨]

* حسن.

لە ئەبی ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفەوە، وتی: ڕۆژێك لە مزگەوت لەگەڵ چەند کەسێك لە کۆچکەران و یاریدەدەران دانیشتبووین، پیاوێکمان نارد بۆ لای عائیشە مۆڵەتی لێ وەربگرێت، چووینە ژوورەوە بۆ لای، وتی: جارێکیان سواڵکەرێك هاتە ژوورەوە بۆ لام و پێغەمبەری خودام(ﷺ) لە لا بوو، فەرمانم کرد شتێکی پێ بدرێت، پاشان بانگم کرد شتەکەم بۆ بهێنن و تەماشام کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ناتەوێ شتێك بێتە ناو ماڵەکەت و شتێك لە ماڵەکەت دەربچێت بە زانینی تۆ نەبێت؟)**، وتم: بەڵێ، فەرمووی: **(هێواش، ئەی عائیشە، مەیبژێرە، چونکە خوداش(عز وجل) لەسەر تۆ دەیبژێرێت).**

## ٨- دەروازەی: صەدەقە لە "ظهر الغنى"وە[1]

١٧٦٩- (ق) عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ، وَخَيْرُ الصَّدَقَةِ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ).** [خ١٤٢٧/ م١٠٣٤]

---

[1] "ظهر الغنى" صەدەقەیەکە لەدوای ئەنجامدانی صەدەقەکە خاوەنەکەی ئاتاج نەبێت، بەڵکو صەدەقە بکات و هەیبێت، واتە: لە ماڵ و منداڵی خۆیەوە دەست بە صەدەقە بکات-و.

(ق) لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(دەستی باڵا باشتر و چاکترە لە دەستی نزم، بەوانە دەست پێ بکە بەخێویان دەکەی، باشترین صەدەقە ئەو صەدەقەیە لە "ظهر الغنی"ەوە بێت، هەرکەس خۆی پاك ڕابگرێت خودا پاك ڕایدەگرێت، هەر کەس بێنیاز بێت خودا بێنیازی دەکات).**

## ٩- دەروازەی: کەسێك کرێکاری دەکات و پاشان کرێکەی دەکات بە صەدەقە

**١٧٧٠-** (خ) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أَمَرَ بِالصَّدَقَةِ، انْطَلَقَ أَحَدُنَا إِلَى السُّوقِ فَيُحَامِلُ فَيُصِيبُ المدَّ، وَإِنَّ لِبَعْضِهِمْ لَمِائَةَ أَلْفٍ. قَالَ: ما نَرَاهُ إِلاَّ نَفْسَهُ. [خ٢٢٧٣ (١٤١٥)]

(خ) لە ئەبی مەسعوودی ئەنصارییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی بە صەدەقە کردن بکردبایە، یەکێك لە ئێمە دەچوو بۆ بازاڕ و حەماڵی دەکرد و "مشتێك"ی بەدەستدەهێنا، هەندێك لەوان[1] خاوەن سەد هەزار بوون، وتی: بەڵام ئێمە تەنها نەفسی خۆمان دەبینی.

**١٧٧١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (**جُهْدُ الْمُقِلِّ، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ**). [د١٦٧٧]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، ئەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، چ صەدەقەیەك باشترینە؟ فەرمووی: **(کۆششانی دەست تەنگ، بەوانە دەست پێ بکە بەخێویان دەکەی).**

(١) واتە: هاوەڵانی پێغەمبەر-و.

## ١٠- دەروازەی: صەدەقە بۆ کەسوکار

**١٧٧٢**–(ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَكْثَرَ الأَنْصَارِ بِالمدِينَةِ مالاً مِنْ نَخْلٍ، وَكَانَ أَحَبَّ أَمْوَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرُحَاءُ، وَكَانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ المسْجِدِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَدْخُلُهَا، وَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهَا طَيِّبٍ.

قَالَ أَنَسٌ: فَلَمَّا أُنْزِلَتْ هـذِهِ الآيَةُ: **﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ﴾** [آل عمران:٩٢] قامَ أَبُو طَلْحَةَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَقُولُ: **﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ﴾**، وَإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بَيْرُحَاءُ، وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ للهِ، أَرْجُو بِرَّهَا وَذُخْرَهَا عِنْدَ اللهِ، فَضَعْهَا يَا رَسُولَ اللهِ حَيْثُ أَرَاكَ اللهُ.

قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**بَخٍ، ذلِكَ مالٌ رَابِحٌ، ذلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، وَقَدْ سَمِعْتُ ما قُلْتَ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِينَ**). فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللهِ. فَقَسَمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِهِ وَبَنِي عَمِّهِ. [خ١٤٦١/ م٩٩٨]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ئەبو تەلحە لە ئەنصار زۆرترین ماڵی لە دارخورما هەبوو، خۆشەویستترین ماڵ و سامانی بریتی بوو لە "بَیْرُحاء"، رووی لە مزگەوتەکە دەکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەرۆیشتە ناوی و تیایدا لە ئاوێکی خۆش دەیخواردەوە.**

**ئەنەس وتی: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ﴾** [آل عمران:٩٢]**، ئەبو تەلحە هەستا بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، خودا(تبارك وتعالى) دەفەرموێت: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ﴾، خۆشەویستترین ماڵ و سامان لام بریتییە لە "بَیْرُحاء"، ئەوە بۆ خودا صەدەقەیە، رجای چاکە و پاداشتی دەکەم لای خودا، ئەی پێغەمبەری خودا چۆن خودا نیشانت دەدا وای لێبکە.**

**وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەخ، ئەوە ماڵێکی پڕ قازانجە، ئەوە ماڵێکی پڕ قازانجە، ئەوەی تۆ وتت من بیستم، من پێمباشە بەسەر کەسە نزیکەکاندا دابەشی بکەی)، ئەبو تەلحە وتی: ئەوە دەکەم ئەی پێغەمبەری خودا، ئەبو تەلحە بەسەر خزمە نزیکەکان و ئامۆزاکانیدا دابەشی کرد.**

**١٧٧٣-** (ق) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قالتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلِيَ أَجْرٌ أَنْ أُنْفِقَ عَلَى بَنِي أَبِي سَلَمَةَ، إِنَّمَا هُمْ بَنِيَّ؟ فَقَالَ: (**أَنْفِقي عَلَيْهِمْ، فَلَكِ أَجْرُ ما أَنْفَقْتِ عَلَيْهِمْ**). [خ١٤٦٧/ م١٠٠١]

**(ق) لە ئوم سەلەمەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا پاداشتم بۆ هەیە خەرجی بکەم بۆ منداڵەکانی ئەبی سەلەمە، ئەوان منداڵی منن؟ فەرمووی: (بۆیان خەرج بکە، پاداشتی ئەوەت بۆ هەیە لەسەریان خەرج دەکەی).**

- وفي رواية لهما: ولستُ بِتَارِكَتِهِمْ هكذا وهكذا، إِنَّما هم بَنِيَّ. [خ٥٣٦٩]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان: بەم جۆرە و بەو جۆرە وازیان لێ ناهێنم، ئەوان منداڵی منن... .**

**١٧٧٤-** (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: جاءَت زَيْنَبُ، امْرَأَةُ ابْنِ مَسْعُودٍ، تَسْتَأْذِنُ عَلَيْهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! هذِهِ زَيْنَبُ، فَقَالَ: (**أَيُّ الزَّيَانِبِ**)؟ فَقِيلَ: امْرَأَةُ ابْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: (**نَعَمْ، ائْذَنُوا لَهَا**). فَأُذِنَ لَهَا، قَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ! إِنَّكَ أَمَرْتَ الْيَوْمَ بِالصَّدَقَةِ، وَكَانَ عِنْدِي حُلِيٌّ لِي، فَأَرَدْتُ أَنْ أَتَصَدَّقَ بِهِ، فَزَعَمَ ابْنُ مَسْعُودٍ: أَنَّهُ وَوَلَدَهُ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**صَدَقَ ابْنُ مَسْعُودٍ، زَوْجُكِ وَوَلَدُكِ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتِ بِهِ عَلَيْهِمْ**). [خ١٤٦٢ (٣٠٤)]

**(خ) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: زەینەب، ژنەکەی ئیبن مەسعوود هات و داوای مۆڵەتی بینینی پێغەمبەری(ﷺ) کرد، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوە زەینەبە، فەرمووی: (کامە زەینەب؟)، وترا: ژنەکەی ئیبن مەسعوود، فەرمووی: (بەڵێ، مۆڵەتی بدەن)، مۆڵەتی پێدرا، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، تۆ ئەمڕۆ فەرمانت کرد بە صەدەقە، منیش خشڵێکم لە لایە، ویستم بیکەم بە صەدەقە، ئیبن مەسعوود پێیوابوو: ئەو و کوڕەکەی لەپێشترن لە هەر کەسێکی تر صەدەقەکەی پێ بدەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئیبن مەسعوود راست دەکات، مێردەکەت و کوڕەکەت لەپێشترن بیکەی بە صەدەقە لەسەریان).**

**١٧٧٥-** عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ الصَّدَقَةَ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَعَلَى ذِي الرَّحِمِ اثْنَتَانِ: صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ)**.

* صحيح. [ت٦٥٨/ ن٢٥٨١/ جه١٨٤٤/ مي١٧٢٢، ١٧٢٣]

**لە سەلمانی کوڕی عامیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: (صەدەقە لەسەر هەژار یەك صەدەقەیە، لەسەر خزم و کەسوکار دوو صەدەقەیە: صەدەقە و سیلەی رەحم).**

## ١١- دەروازەی: گەیشتنی پاداشتی صەدەقە بە مردوو

**١٧٧٦-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ ﷺ تُوُفِّيَتْ أُمُّهُ وَهُوَ غائِبٌ عَنْهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ أُمِّي تُوُفِّيَتْ وَأَنَا غائِبٌ عَنْهَا، أَيَنْفَعُهَا شَيءٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَنْهَا؟ قَالَ: **(نَعَمْ)**. قَالَ: فَإِنِّي أُشْهِدُكَ أَنَّ حائِطِيَ المِخْرَافَ صَدَقَةٌ عَلَيْهَا. [خ٢٧٥٦]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): دایکی سەعدی کوڕی عوببادە کۆچی دوایی کرد و ئەو لەسەری ئامادە نەبوو، بۆیە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، دایکم کۆچی دوایی کرد و من لەسەری ئامادە نەبووم، ئایا شتێك سوودی پێ دەگات گەر من لە ئەوەوە صەدەقە بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ)، وتی: من تۆ دەگرم بە شایەت باخە بەبەرەکەم صەدەقەیە بۆ ئەو.**

**١٧٧٧-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِلنبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: إِنَّ أَبِي مَاتَ وَتَرَكَ مَالاً وَلَمْ يُوصِ، فَهَلْ يُكَفِّرُ عَنْهُ أَنْ أَتَصَدَّقَ عَنْهُ؟ قَالَ: **(نَعَمْ)**. [م١٦٣٠]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پیاوێك وتی: بە پێغەمبەر(ﷺ): باوکم مردووە و ماڵ و سامانی بەجێهێڵاوە و وەسێتی نەکردووە، ئایا گوناهی لێ دەشۆرێتەوە گەر من لە ئەوەوە صەدەقە بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ).**

## ١٢- دەروازەی: فەزڵی صەدەقە بە ئاو

**١٧٧٨**– عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أُمَّ سَعْدٍ مَاتَتْ، فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (**الْمَاءُ**)، قَالَ: فَحَفَرَ بِئْراً وَقَالَ: هَذِهِ لِأُمِّ سَعْدٍ. [د١٦٨١]

* حسن.

**لە سەعدی کوڕی عوبادەوە، ئەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، دایکی سەعد[1] کۆچی دوایی کرد، چ صەدەقەیەك باشترینە؟ فەرمووی: (ئاو)، وتی: بیرێکی لێدا و وتی: ئەمە بۆ دایکی سەعد.**

## ١٣- دەروازەی: دەربارەی مافی داواکەر

**١٧٧٩**– عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ بُجَيْدٍ، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ بُجَيْدٍ . وَكَانَتْ مِمَّنْ بَايَعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم . أَنَّهَا قَالَتْ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْكَ إِنَّ الْمِسْكِينَ لَيَقُومُ عَلَى بَابِي، فَمَا أَجِدُ لَهُ شَيْئاً أُعْطِيهِ إِيَّاهُ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنْ لَمْ تَجِدِي لَهُ شَيْئاً تُعْطِينَهُ إِيَّاهُ، إِلاَّ ظِلْفاً مُحْرَقاً، فَادْفَعِيهِ إِلَيْهِ فِي يَدِهِ**). [د١٦٦٧/ ت٦٦٥/ ن٢٥٦٤]

* صحيح.

**لە عبدالرحمانی کوڕی بوجەیدەوە، لە داپیرییەوە ئوم بوجەید–لەو ئافرەتانە بوو بەیعەتی بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد–ئەو بە پێغەمبەری خودای وت: ئەی پێغەمبەری خودا، صەڵەواتی خودات لەسەر، هەژارێك لەبەردەرگاکەم دەوەستێ، شتێك شك نابەم پێی بدەم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: (گەر شتێك نەبینییەوە پێی بدەی جگە لە سمێکی سوتاوی وڵاخ بیخە ناو دەستی).**

[1] واتە: دایکی سەعدی کوڕی عوبادە–و.

## ١٤- دەروازەی: کەسێك بە خودا(سبحانه وتعالى) داوا بکات

**١٧٨٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنِ اسْتَعَاذَ بِاللهِ فَأَعِيذُوهُ، وَمَنْ سَأَلَ بِاللهِ فَأَعْطُوهُ، وَمَنْ دَعَاكُمْ فَأَجِيبُوهُ، وَمَنْ صَنَعَ إِلَيْكُمْ مَعْرُوفاً فَكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مَا تُكَافِئُونَهُ، فَادْعُوا لَهُ حَتَّى تَرَوْا أَنَّكُمْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ).** [د١٦٧٢/ ن٢٥٦٦]

* صحيح.

له عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەرکەس بە خودا داوای پەنای کرد پەنای بدەن، هەر کەس بە خودا داوای کرد پێی بدەن، هەر کەس بانگهێشی کردن وەڵامی بدەنەوە، هەر کەس چاکەیەکی لەگەڵ کردن پاداشتی بدەنەوە، گەر شتێکتان نەبوو پاداشتی بدەنەوە دوعای بۆ بکەن تا ببینن ئێوە پاداشتی ئەوتان داوەتەوە).**

## ١٥- دەروازەی: صەدەقە بە ماڵی خراپ و حەرام

**١٧٨١-** عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْمَسْجِدَ وَبِيَدِهِ عَصَا، وَقَدْ عَلَّقَ رَجُلٌ قَناً حَشَفاً، فَطَعَنَ بِالْعَصَا فِي ذَلِكَ الْقِنْوِ، وَقَالَ: **(لَوْ شَاءَ رَبُّ هَذِهِ الصَّدَقَةِ تَصَدَّقَ بِأَطْيَبَ مِنْهَا)** ! وَقَالَ: **(إِنَّ رَبَّ هَذِهِ الصَّدَقَةِ يَأْكُلُ الْحَشَفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).**

* صحيح. [د١٦٠٨/ ن٢٤٩٢/ جه١٨٢١]

له عەوفی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لامان لە مزگەوت، ئەو عەسایەکی بەدەستەوە بوو، پیاوێك بۆڵێ خورمای وشکی خراپی هەڵواسی بوو، بە عەساکەی دای لە بۆڵە خورماکە و فەرمووی: **(گەر خاوەن ئەم صەدەقە بیویستبا بە باشتر لەمە صەدەقەی دەکرد)**، هەروەها فەرمووی: **(خاوەن ئەم صەدەقەیە لە ڕۆژی قیامەت خورمای وشکی خراپ دەخوات).**

**١٧٨٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ جَمَعَ مَالاً حَرَاماً، ثُمَّ تَصَدَّقَ بِهِ، لَمْ يَكُنْ لَهُ فِيهِ أَجْرٌ، وَكَانَ إِصْرُهُ عَلَيْهِ).** [حب٣٢١٦/ك١٤٤٠]

*إسناده حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس ماڵێکی حەرامی کۆکردەوە، و پاشان کردی بە صەدەقە تیایدا هیچ پاداشتێك بۆ ئەو نییە، بەڵکو گوناهەکەی بە ملییەتی).**

## ١٦- دەروازەی: شایستە بە صەدەقە

**١٧٨٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ سَأَلَ وَلَهُ مَا يُغْنِيهِ، جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ خُمُوشٌ . أَوْ خُدُوشٌ، أَوْ كُدُوحٌ . فِي وَجْهِهِ)**، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا الْغِنَى؟ قَالَ: **(خَمْسُونَ دِرْهَماً أَوْ قِيمَتُهَا مِنَ الذَّهَبِ)**.

* صحيح.		[د١٦٢٦/ ت٦٥٠/ ن٢٥٩١/ جه١٨٤٠/ مي١٦٨٠]

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس داوا بکات و ئەوەندەی هەبێت بێنیازی بکات لە ڕۆژی قیامەت دێت و ("خموش" یان – "خدوش" یان "کدوح")[1] لە ڕوخساری هەیە)**، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، بێنیازبوون چییە؟ فەرمووی: **(پەنجا درهەم یان بەهای ئەوە لە زێڕ)**.

---

[1] خموش، خدوش، کدوح: بە مانای ڕوشان و بریندارببوون دێن–و.

## بەشی چوارەم

## حوکمەکانی داواکردن

### ١- دەروازەی: هاندان بۆ کار و خۆپاکراگرتن لە داواکردن

**١٧٨٤-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ: إِنَّ نَاساً مِنَ الأَنْصَارِ، سَأَلُوا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، حَتَّى نَفِدَ ما عِنْدَهُ، فَقَالَ: **(ما يَكُونُ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً خَيْراً وَأَوْسَعَ مِنَ الصَّبْرِ)**. [خ١٤٦٩/ م١٠٥٣]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت): خەڵکانێ لە ئەنصار داوایان کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەویش پێی بەخشین، پاشان داوایان کرد و پێی بەخشین، تا ئەوەی لە لای بوو تەواو بوو، فەرمووی: **(هەر خێرێکم لە لا بێت پاشەکەوتی ناکەم لە ئێوە، هەر کەس عیففەتی بوێت خودا عیففەتی پێ دەدات، هەر کەس بێنیازیی بوێت خودا بێنیازی دەکات، هەر کەس ئارامگری بوێت خودا ئارامگری پێ دەبەخشێت، هیچ کەس بەخشینێکی پێ نەبەخشراوە باشتر و بەرینتر لە ئارامگرتن)**.

**١٧٨٥-** (ق) عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ قَالَ: **(يَا حَكِيمُ! إِنَّ هَذَا المَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كالَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ، الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى)**. [خ١٤٧٢/ م١٠٣٥]

(ق) لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: داوام لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد و پێی بەخشیم، پاشان داوام لێکرد و پێی بەخشیم، پاشان فەرمووی: **(ئەی حەکیم، ئەم ماڵ و سامانە سەوز و شیرینە، هەر کەس بە سەخاوەتی نەفس وەریبگرێت بۆ ئەو بەرەکەتی دەکەوێتە ناو، هەر کەس بە چاوتێبڕینی نەفس**

**وەربیگرێت بۆ ئەو بەرەکەتی ناکەوێتە ناو، وەك ئەو کەسەی دەخوات و تێر نابێت، دەستی باڵا باشتر و چاکترە لە دەستی نزم).**

١٧٨٦- (خ) عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ، فَيَأْتِيَ بِحُزْمَةِ الحَطَبِ عَلَى ظَهْرِهِ فَيَبِيعَهَا، فَيَكُفَّ اللهُ بِهَا وَجْهَهُ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ النَّاسَ، أَعْطَوْهُ أَوْ مَنَعُوهُ**). [خ١٤٧١]

(خ) لە زوبەیری کوڕی عەوامەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە پەتەکەی هەڵبگرێت و لەسەر پشتی کۆڵە دارێك بهێنێت و بیفرۆشێت و خودا بەوە رووسووری بکات، باشترە بۆ ئەو لەوەی داوا لە خەڵکی بکات، پێیبدەن، یان پێینەدەن).**

## ٢- دەروازەی: نەهیکردن لە زۆر داواکردن

١٧٨٧- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**ما يَزَالُ الرَّجُلُ يَسْأَلُ النَّاسَ، حَتَّى يَأْتِيَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ**). [خ١٤٧٤/ م١٠٤٠]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(بەردەوام پیاو داوا لە خەڵك دەکات تا رۆژی قیامەت دێت و روخساری گۆشتی پێوە نییە).**

١٧٨٨- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ سَأَلَ النَّاسَ أَمْوَالَهُمْ تَكَثُّراً، فَإِنَّمَا يَسْأَلُ جَمْراً؛ فَلْيَسْتَقِلَّ أَوْ لِيَسْتَكْثِرْ**). [م١٠٤١]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس زۆرخوازانە داوای ماڵ و سامان لە خەڵك بکات، ئەو داوای پشکۆیەك دەکات، با کەم داوا بکات، یان با زۆر داوا بکات).**

## ٣- دەروازەی: کێ داواکردنی بۆ حەڵاڵە

١٧٨٩- (م) عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ الْهِلاَلِيِّ قَالَ: تَحَمَّلْتُ حَمَالَةً، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَسْأَلُهُ فِيهَا، فَقَالَ: (أَقِمْ حَتَّى تَأْتِينَا الصَّدَقَةُ، فَنَأْمُرَ لَكَ بِهَا). قَالَ: ثُمَّ قَالَ: (يَا قَبِيصَةُ، إِنَّ الْمَسْأَلَةَ لاَ تَحِلُّ إِلاَّ لأَحَدِ ثَلاَثَةٍ: رَجُلٌ تَحَمَّلَ حَمَالَةً فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَهَا، ثُمَّ يُمْسِكُ. وَرَجُلٌ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ اجْتَاحَتْ مَالَهُ فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَاماً مِنْ عَيْشٍ . أَوْ قَالَ: سِدَاداً مِنْ عَيْشٍ . وَرَجُلٌ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ حَتَّى يَقُومَ ثَلاَثَةٌ مِنْ ذَوِي الْحِجَا مِنْ قَوْمِهِ: لَقَدْ أَصَابَتْ فُلاناً فَاقَةٌ، فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ، حَتَّى يُصِيبَ قِوَاماً مِنْ عَيْشٍ . أَوْ قَالَ: سِدَاداً مِنْ عَيْشٍ . فَمَا سِوَاهُنَّ مِنَ الْمَسْأَلَةِ يَا قَبِيصَةُ سُحْتاً! يَأْكُلُهَا صَاحِبُهَا سُحْتاً). [م١٠٤٤]

(م) لە قەبیزەی کوڕی موخاریقی هیلالییەوە، وتی: شانمدایە ژێر قەرزێك، هاتم و تیایدا داوام لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد، فەرمووی: **(بمێنەرەوە تا صەدەقەمان بۆ دێت و فەرمان دەکەین پێتبدرێ)**، وتی: پاشان فەرمووی: **(ئەی قەبیزە، داواکردن بۆ هەریەك لەم سیانە حەڵاڵە: پیاوێك شانی داوەتە ژێر قەرزێ داواکردنی بۆ حەڵاڵە تا دەیداتەوە و پاشان خۆی لە داواکردن دەگرێتەوە، پیاوێك ئافەتێکی تووش هاتبێت و ماڵ و سامانەکەی تیابردبێت داواکردنی بۆ حەڵاڵە تا گوزەرانی دێتە راستە**-یان فەرمووی: **-تا گوزەرانی باش دەبێت، پیاوێکیش هەژاری تووشدێت تا سێ کەسی خاوەن ژیری لە هۆزەکەی راستدەبنەوە: بەڕاستی فلان تووشی هەژاری هاتووە[1]، ئەویش داواکردنی بۆ حەڵاڵە، تا گوزەرانی دێتە راستە**-یان فەرمووی: **-تا گوزەرانی باش دەبێت، ئەی قەبیزە، جگە لەمانە داواکردن حەرامە، خاوەنەکەی وەك حەرام دەیخوات)**.

١٧٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ، وَلاَ لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ). [ن٢٥٩٦/ جە١٨٣٩]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(صەدەقە بۆ دەوڵەمەند و کەسی بەهێز و لەشساغ حەڵاڵ نییە)**.

---

[1] واتە سێ کەسی خاوەن ژیری لە هۆزەکەی راستدەبنەوە و دەڵێن: بەڕاستی فلان...-و.

**١٧٩١**– عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَدِيِّ بْنِ الْخِيَارِ قَالَ: أَخْبَرَنِي رَجُلاَنِ أَنَّهُمَا أَتَيَا النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، وَهُوَ يَقْسِمُ الصَّدَقَةَ، فَسَأَلاَهُ مِنْهَا، فَرَفَّعَ فِينَا الْبَصَرَ وَخَفَّضَهُ، فَرَآنَا جَلْدَيْنِ، فَقَالَ: **(إِنْ شِئْتُمَا أَعْطَيْتُكُمَا، وَلاَ حَظَّ فِيهَا لِغَنِيٍّ وَلاَ لِقَوِيٍّ مُكْتَسِبٍ)**.

* صحيح. [د١٦٣٣/ ٢٥٩٧ن]

**لە عوبەیدوڵای کوڕی عەدیی کوڕی خیارەوە، وتی: دوو پیاو هەواڵیان پێدام، ئەوان لە حەجیماڵئاواییدا هاتوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو صەدەقەی دابەش کردووە، لەو صەدەقەیان داوا کردووە، پێغەمبەر چاوی بۆمان هەڵبڕی و چاوی داخستەوە، ئێمەی بینی بەهێز بووین، فەرمووی: (گەر دەخوازن پێتان دەبەخشم، ئەم صەدەقەیە بەشی کەسی دەوڵەمەند و بەشی بەهێزی کاسبکاری تێدا نییە).**

## ٤- دەروازەی: ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾

**١٧٩٢**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِي يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ، تَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ، وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، وَلكِنِ الْمِسْكِينُ: الَّذِي لاَ يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ، وَلاَ يُفْطَنُ بِهِ فَيُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ، وَلا يَقُومُ فَيَسْأَلُ النَّاسَ)**.

[خ١٤٧٩ (١٤٧٦)/ م١٠٣٩]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەدا[1] ئەو کەسە نییە بەسەر خەڵکیدا دەگەڕێت، پارووێك یان دوو پاروو، دەنکێك خورما یان دوو دەنك خورمای پێ دەدرێت، بەڵکو گەدا: ئەو کەسەیە ئەوەندەی نییە بێنیازی بکات، و پێی نازانرێت تا صەدەقەی پێ بکرێت، ناچێت داوا لە خەڵك بکات).**

**١٧٩٣**– عَن عبدِ اللهِ بنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ سَأَلَ وَلَهُ أَرْبَعُونَ دِرْهَماً، فَهُوَ الْمُلْحِفُ)**. [ن٢٥٩٣]

* صحيح.

---

[1] مەبەست بە "گەدا" وشەی (المسكين)ە–و.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس چل درهەمی هەبێت و داوا بکات بریتییە لە "المُلْحِف"[1])**.

## ٥- دەروازەی: کەسێك بەبێ داواکردن پێی بدرێت

١٧٩٤- عَنْ خَالِدِ بْنِ عَدِيٍّ الْجُهَنِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(مَنْ بَلَغَهُ مَعْرُوفٌ عَنْ أَخِيهِ مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ، وَلاَ إِشْرَافِ نَفْسٍ؛ فَلْيَقْبَلْهُ وَلاَ يَرُدَّهُ، فَإِنَّمَا هُوَ رِزْقٌ سَاقَهُ اللهُ عزّ وجل إِلَيْهِ)**. [حم١٧٩٣٦]

* إسناده صحيح.

لە خالیدی کوڕی عەدیی جوهەنییەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس لە براکەیەوە-بەبێ داواکردن و چاوتێبڕینی نەفس- چاکەیەکی پێگەیشت با قبووڵی بکات و ڕەدی نەکاتەوە، چونکە ئەوە ڕۆزییەکە خودا(عز وجل) بۆ ئەوی ڕەوانە کردووە)**.

١٧٩٥- عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ: أَنَّ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ أَعْطَى ابْنَ السَّعْدِيِّ أَلْفَ دِينَارٍ، فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَهَا وَقَالَ: أَنَا عَنها غَنِيٌّ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: إِنِّي قَائِلٌ لَكَ مَا قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا سَاقَ اللهَ إِلَيْكَ رِزْقاً مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ وَلا إِشْرَافِ نَفْسٍ؛ فَخُذْهُ، فَإِنَّ اللهَ أَعْطَاكَهُ)**.

* إسناده صحيح على شرط مسلم. [حب٣٤٠٣]

[وانظر: ١٧٤٥].

لە قەبیزەی کوڕی زوئەیبەوە: عومەری کوڕی خەتاب هەزار دیناری دا بە ئیبن سەعدی، نەیویست وەریبگرێت و وتی: من لێی بێنیازم، عومەر پێی وت: من ئەوە بە تۆ دەڵێم پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە منی فەرموو: **(گەر خودا-بەبێ داواکردن و چاوتێبڕینی نەفس- ڕۆزییەکی بۆ ڕەوانە کردی وەریبگرە، چونکە خودا بە تۆی داوە)**.

---

[1] "المُلْحِف" واتە: پێداگر لە داواکردن و سواڵکردن-و.

# بەشی پێنجەم

## حوكمەكانی صەدەقە تایبەت بە ئالی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

### ١- دەروازەی: گەر صەدەقەكە بگۆڕێ و تێكبچێت

**١٧٩٦–** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أُتِيَ بِلَحْمٍ، تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، فَقَالَ: (**هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَهُوَ لَنَا هَدِيَّةٌ**). [خ١٤٩٥/ م١٠٧٤]

(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت): گۆشت هێنرا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) كرابوو بە صەدەقە و بۆ بەریرە[1] هێنرابوو، فەرمووی: (**بۆ ئەو صەدەقەیە، بۆ ئێمە هەدیەیە**).

### ٢- دەروازەی: حەرامكردنی صەدەقە لەسەر پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" و ئالی پێغەمبەر

**١٧٩٧–** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَخَذَ الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ رضي الله عنهما تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ، فَجَعَلَهَا فِي فِيهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (كِخْ كِخْ). لِيَطْرَحَهَا، ثُمَّ قَالَ: (**أَمَا شَعَرْتَ أَنَّا لاَ نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ**). [خ١٤٩١ (١٤٨٥)/ م١٠٦٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: حەسەنی كوڕی عەلی دەنكە خورمایەكی لە خورمای صەدەقە هەڵگرت و خستییە ناو دەمییەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (كخ كخ)، بۆئەوەی تفی بكاتەوە، پاشان فەرمووی: (**هەستت نەكرد ئێمە صەدەقە ناخۆین**).

---

[1] بەریرە: كەنیزەكێكی خاتوو عائیشە بوو لە ماڵی پێغەمبەر، بە ئەسڵ خەڵكی مصر بووە ـ و.

**١٧٩٨–** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِتَمْرَةٍ فِي الطَّرِيقِ، قَالَ: **(لَوْلاَ أَنِّي أَخاف أَن تكُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ لأَكَلْتُهَا)**. [خ٢٤٣١ (٢٠٥٥)/ م١٠٧١]

(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە رێگەیەك بە پاڵ دەنكە خورمایەكدا تێپەڕی، فەرمووی: **(گەر ترسی ئەوەم نەبوایە صەدەقە بێت دەمخوارد)**.

**١٧٩٩–** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أُتِيَ بِطَعَامٍ سَأَلَ عَنْهُ: **(أَهْدِيَّةٌ أَمْ صَدَقَةٌ)**؟ فَإِنْ قِيلَ صَدَقَةٌ، قالَ لأَصْحَابِهِ: **(كلُوا)**، وَلَمْ يَأْكُلْ، وَإِنْ قِيلَ هَدِيَّةٌ، ضَرَبَ بِيَدِهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَكَلَ مَعَهُمْ. [خ٢٥٧٦/ م١٠٧٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: گەر خواردنێك بهاتبایە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاری دەربارە دەكرد: **(ئایا هەدیەیە یان صەدەقە؟)**، گەر بوترابا صەدەقەیە، دەیفەرموو بە هاوەڵانی: **(بیخۆن)**، ئەو نەیدەخوارد، گەر بوترابا هەدیەیە بە دەستی خۆیدا دەكێشا و لەگەڵی دەخواردن.

## ٣- دەروازەی: ئالی پێغەمبەر "صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" لەسەر صەدەقە بەكارناهێنرێن

**١٨٠٠–** عَنْ أَبِي رَافِعٍ مولى النبي صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم بَعَثَ رَجُلاً عَلَى الصَّدَقَةِ مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ، فَقَالَ لِأَبِي رَافِعٍ: اصْحَبْنِي، فَإِنَّكَ تُصِيبُ مِنْهَا، قَالَ: حَتَّى آتِيَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَأَسْأَلَهُ، فَأَتَاهُ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: **(مَوْلَى الْقَوْمِ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، وَإِنَّا لاَ تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ)**. [د١٦٥٠/ ت٦٥٧/ ن٢٦١١]

* صحيح.

لە لە ئەبی رافیع مەولای پێغەمبەرەوە(ﷺ): پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێكی لە بەنی مەخزووم رەوانە كرد بۆ سەر صەدەقە، وتی بە ئەبی رافیع: هاوەڵیم بكە تۆ لێی بەهرەمەند دەبی، وتی: تا دێمەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پرسیاری لێ دەكەم، هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر و پرسیاری لێكرد، فەرمووی: **(مەولای قەومێك لەوانە، ئێمە صەدەقەمان بۆ حەڵاڵ نییە)**.

## بەشی یەکەم

## ڕۆژووی ڕەمەزان

### ١- دەروازەی: فەرزی ڕۆژوو و پلە و پایەکەی

[انظر في فرض الصيام: ١، ٤٩، ٥٨٧-٥٨٩]

**١٨٠١**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**قَالَ اللهُ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلاَّ الصِّيَامَ، فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَالصِّيامُ جُنَّةٌ ، وَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَصْخَبْ ، فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ: إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ. لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا: إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ، وَإِذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ**). [خ١٩٠٤ (١٨٩٤)/ م١١٥١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خودا فەرمووی: هەموو کارێکی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتی جگە لە ڕۆژوو، ڕۆژوو بۆ منە و من بەهۆیەوە پاداشت دەدەمەوە، ڕۆژوو پۆشەرە[1]، گەر ڕۆژی ڕۆژووی یەکێك لە ئێوە بوو با قسەی خراپ نەکات و هاوار نەکات، گەر یەکێك جنێوی پێدا یان لەگەڵی جەنگا با بڵێت: من کەسێکم بەڕۆژووم، سوێند بەو کەسەی نەفسی محەمەدی بەدەستە، بۆنی دەمی ڕۆژووان لای خودا لە بۆنی میسك خۆشترە، بۆ ڕۆژووان دوو دڵخۆشی هەن پێیان دڵخۆش دەبێت: کاتێ ڕۆژوو دەشکێنێ دڵخۆش دەبێت، و کاتێ بە پەروەردگاری دەگات بە ڕۆژووەکەی دڵخۆش دەبێت**).

---

[1] واتە: بەربەست و ڕێگرە لە وتنی خراپ و کاری خراپ-و.

١٨٠٢- (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّ فِي الجَنَّةِ بَاباً يُقَالُ لَهُ: الرَّيَّانُ، يَدْخُلُ مِنْهُ الصَّائِمُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لاَ يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ، يُقَالُ: أَيْنَ الصَّائِمُونَ، فَيَقُومُونَ لاَ يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ، فَإِذَا دَخَلُوا أُغْلِقَ، فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ أَحَدٌ).

[خ١٨٩٦/ م١١٥٢]

(ق) لە سەهلی کوڕی سەعدەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(لە بەهەشت دەروازەیەك هەیە پێی دەوترێت "الريّان"[1] لە ڕۆژی قیامەت ڕۆژووگران لێیەوە دەچنە ژوورەوە، هیچ کەس جگە لەوان لێیەوە ناچێتە ژوورەوە، دەوترێت: ڕۆژووگران لە کوێن؟ ئەوانیش راستدەبنەوە و هیچ کەس جگە لەوان لێیەوە ناچێتە ژوورەوە کە چوونە ژوورەوە دادەخرێت، بۆیە هیچ کەس لێیەوە ناچێتە ژوورەوە).**

١٨٠٣- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ).　　[خ٣٨ (٣٥)/ م٧٦٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بە ئیمان و تەمای پاداشت ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت لێخۆشبوون بۆ ئەو گوناهانە دەردەکرێت لێی پێشکەوتوون).**

١٨٠٤- وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَتَاكُمْ رَمَضَانُ شَهْرٌ مُبَارَكٌ، فَرَضَ اللهُ عزّ وجل عَلَيْكُمْ صِيَامَهُ، تُفْتَحُ فِيهِ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَتُغْلَقُ فِيهِ أَبْوَابُ الْجَحِيمِ، وَتُغَلُّ فِيهِ مَرَدَةُ الشَّيَاطِينِ ، لِلَّهِ فِيهِ لَيْلَةٌ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ، مَنْ حُرِمَ خَيْرَهَا فَقَدْ حُرِمَ).　　[ن٢١٠٥]

* صحيح.

هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ڕەمەزان، مانگی موبارەت هات بۆ لای ئێوە، خودا(عز وجل) ڕۆژووی ئەم مانگەی لەسەر ئێوە فەرز**

---

(١) واتە: پاراو-و.

**کردووە، تیایدا دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوە و دەرگاکـانی دۆزەخ دادەخـرێن و شەیتانە یاخییەکان تیایدا کۆت و بەند دەکرێن، تیایدا بۆ خودا شەوێك هەیە لە هەزار مانگ خێرترە، هەر کەس لە خێری ئەو شەوە بێبەش بکرێت ئەوا بێبەش کراوە).**

١٨٠٥- وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ، فَلاَ يَرْفُثْ يَوْمَئِذٍ وَلاَ يَصْخَبْ، فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ، أَوْ قَاتَلَهُ أَحَدٌ، فَلْيَقُلْ: إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ)**. [حم٢٦٠٦٩]

*إسناده صحيح على شرط الشيخين.

هەر لە ئـەبی هـورەیرەوە، وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: **(گـەر ڕۆژی ڕۆژووی یەکێك لە ئێوە بوو قسەی خراپ نەکات و هاوار نەکات، گەر یەکێك جنێوی پێدا، یان یەکێك لەگەڵی جەنگا با بڵێت: من کەسێکی بەڕۆژووم).**

## ٢- دەروازەی: فەزڵی مـانگی ڕەمـەزان

١٨٠٦- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا دَخَلَ رَمَضَانُ فُتِحَتْ أَبْوَابُ الجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ جَهَنَّمَ، وَسُلْسِلَتِ الشَّيَاطِينُ)**.

[خ٣٢٧٧ (١٨٩٨)/ م١٠٧٩]

(ق) لـە ئـەبی هورەیرەوە(خـوا لێـی رازی بێـت)، وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: **(کە ڕەمەزان دێتە بەرەوە دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە و دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیتانەکان کۆت و زنجیر دەکرێن).**

١٨٠٧- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ، وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ، وَكَانَ جِبْرِيلُ عليه السلام يَلْقَاهُ كُلَّ لَيْلَةٍ فِي رَمَضَانَ حَتَّى يَنْسَلِخَ، يَعْرِضُ عَلَيْهِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم الْقُرْآنَ، فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ عليه السلام كَانَ أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ المُرْسَلَةِ.		[خ١٩٠٢ (٦)/ م٢٣٠٨]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لـێ رازی بێـت)، وتـی: **پێغەمبـەر(ﷺ) لـە خێـردا بەخشندەتر بوو لە خەڵکی، بەخشندەترین کات لە ڕەمەزاندا بوو کاتێك جیبریلی پـێ**

دەگەیشت، جیبریل(علیه السلام) هەموو شەوێك لە ڕەمەزان بە پێغەمبەر دەگەیشت تا ڕەمەزان تەواو دەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) قورئانی بۆ دەخستەڕوو، کاتێ جیبریلی(علیه السلام) پێ بگەیشتبایە لە بای ڕەوانەکراو بە خێر[1] خێراتر بوو.

**١٨٠٨-** عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**احْضُرُوا المِنْبَرَ**)، فَحَضَرْنَا، فَلَمَّا ارْتَقَى دَرَجَةً قَالَ: (**آمِينْ**)، فَلَمَّا ارْتَقَى الدَّرَجَةَ الثَّانِيَةَ قَالَ: (**آمِينْ**)، فَلَمَّا ارْتَقَى الدَّرَجَةَ الثَّالِثَةَ قَالَ: (**آمِينْ**).

فَلَمَّا نَزَلَ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَقَدْ سَمِعْنَا مِنْكَ اليَوْمَ شَيْئاً مَا كُنَّا نَسْمَعُهُ! قَالَ: (**إِنَّ جِبْرِيلَ صلّى الله عليه وسلّم عَرَضَ لِيْ فَقَالَ: بُعْداً لِمَنْ أَدْرَكَ رَمَضَانَ فَلَمْ يُغْفَرْ لَهُ، قُلْتُ**: آمِيْن، **فَلَمَّا رَقِيْتُ الثَّانِيَةَ قَالَ: بُعْداً لِمَنْ ذُكِرْتَ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْكَ، قُلْتُ**: آمِيْن، **فَلَمَّا رَقِيْتُ الثَّالِثَةَ قَالَ: بُعْداً لِمَنْ أَدْرَكَ أَبَوَاهُ الكِبَرُ عِنْدَهُ أَوْ أَحَدُهُمَا فَلَمْ يُدْخِلاَهُ الجَنَّةَ، قُلْتُ**: آمِيْن). [ك٧٢٥٦]

* قال الذهبي: صحيح.

لە کەعبی کوڕی عوجرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**مینبەرەکە ئامادە بکەن**)، ئێمەش ئامادەمان کرد، کاتێ پلەیەك سەرکەوت فەرمووی: (**ئامین**)، کاتێ سەرکەوتە سەر پلەی دووەم فەرمووی: (**ئامین**)، کاتێ سەرکەوتە سەر پلەی سێیەم فەرمووی: (**ئامین**).

کاتێك دابەزی وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەمڕۆ شتێکمان لێ بیستی پێشتر نەمانبیستبوو، فەرمووی: (**جیبریل خۆی بۆ دەرخستم و وتی: دووری بۆ ئەو کەسەی دەگاتە ڕەمەزان و لێیخۆش نابن، منیش وتم: ئامین، کاتێك سەرکەوتمە سەر پلەی دووەم وتی: دووری بۆ ئەو کەسەی ناوی تۆی لا دەهێنرێت و صەڵەواتت لەسەر نادات، منیش وتم: ئامین، کاتێ سەرکەوتمە سەر پلەی سێیەم وتی: دووری بۆ ئەو کەسەی دەگات بە دایك و باوکی پیری-یان دەگات بە یەکێکیان- و ئەو نابەنە بەهەشتەوە، منیش وتم: ئامین**).

---

[1] بە خێر: واتە: بە ئەنجامدانی خێر-و.

## ٣- دەروازەی: (بە بینینی بەڕۆژو بن و بە بینینی جەژن بکەن[١])

**١٨٠٩-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ**).

[خ١٩٠٠/ م١٠٨٠]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (گەر مانگتان بینی بەڕۆژوو بن و گەر مانگتان بینی جەژن بکەن، گەر هەور و تەم و مژ لە ئێوەی شاردەوە خەملاندنی بۆ بکەن[٢]).**

**١٨١٠-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم . أَوْ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم .: (**صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ غُبِّيَ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا عِدَّةَ شَعْبَانَ ثَلاَثِينَ**).

[خ١٩٠٩/ م١٠٨١]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ)-یان وتی ئەبو قاسم فەرمووی:- فەرمووی: (گەر مانگتان بینی بەڕۆژوو بن و گەر بینیتان جەژن بکەن، گەر لێتان شارایەوە سی رۆژی شەعبان تەواو بکەن).**

**١٨١١-** عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: لَمَا صُمْنَا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم تِسْعاً وَعِشْرِينَ، أَكْثَرُ مِمَّا صُمْنَا مَعَهُ ثَلاَثِينَ.

[د٢٣٢٢/ ت٦٨٩]

* صحيح.

**لە ئیبن مەسعوودەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بیست و نۆ رۆژ رەمەزانمان گرت، زۆرترینێك بەڕۆژوو بووین لەگەڵی سی رۆژ بووە.**

---

(١) واتە: بە بینینی مانگ-و.

(٢) "القاضي عياض" دەڵێت: "خەملاندنی بۆ بکەن" ماناکەی: سی رۆژ بۆ مانگەکە سەرژمێر بکەن تا تەواو و کامڵ ببێت، وەك چۆن لە ریوایەتێکی تردا هاتووە: (سی رۆژ بژمێرن)، ئەمە قسەی جمهووری ئەهلی زانستە.

**١٨١٢-** عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: اخْتَلَفَ النَّاسُ فِي آخِرِ يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ، فَقَدِمَ أَعْرَابِيَّانِ، فَشَهِدَا عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِاللهِ: لَأَهَلاَّ الْهِلاَلَ أَمْسِ عَشِيَّةً، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم النَّاسَ أَنْ يُفْطِرُوا. زَادَ خَلَفٌ فِي حَدِيثِهِ: وَأَنْ يَغْدُوا إِلَى مُصَلاَّهُمْ. [د٢٣٣٩]

* صحيح.

**لە ریبعی کوڕی حیراشەوە، لە پیاوێکەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، وتی: خەڵکی لە دوایین ڕۆژی مانگی ڕەمەزان جیاوازییان کەوتە نێوان، دوو ئەعرابی هاتنە بەرەوە و لای پێغەمبەر(ﷺ) شایەتیان بە خودا دا: ئەوان دوێنێ ئێوارە مانگیان بینیوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد خەڵکی ڕۆژووەکانیان بشکێنن. "خَلَف" لە فەرموودەکەیدا ئەمەی زیاد کردووە: بەیانی ڕوو لە نوێژگەیان بکەن.**

## ٤- دەروازەی: هەموو شار و وڵاتێك بینینی خۆی هەیە

**١٨١٣-** (م) عَنْ كُرَيْبٍ: أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ بِنْتَ الْحَارِثِ بَعَثَتْهُ إِلَى مُعَاوِيَةَ بِالشَّامِ، قَالَ: فَقَدِمْتُ الشَّامَ فَقَضَيْتُ حَاجَتَهَا، وَاسْتُهِلَّ عَلَيَّ رَمَضَانُ وَأَنَا بِالشَّامِ، فَرَأَيْتُ الْهِلاَلَ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، ثُمَّ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فِي آخِرِ الشَّهْرِ، فَسَأَلَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، ثُمَّ ذَكَرَ الْهِلاَلَ، فَقَالَ: مَتَى رَأَيْتُمُ الْهِلاَلَ؟ فَقُلْتُ: رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: أَنْتَ رَأَيْتَهُ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، وَرَآهُ النَّاسُ، وَصَامُوا وَصَامَ مُعَاوِيَةُ. فَقَالَ: لَكِنَّا رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ السَّبْتِ، فَلاَ نَزَالُ نَصُومُ حَتَّى نُكْمِلَ ثَلاَثِينَ، أَو نَرَاهُ. فَقُلْتُ: أَوَ لاَ تَكْتَفِي بِرُؤْيَةِ مُعَاوِيَةَ وَصِيَامِهِ؟ فَقَالَ: لاَ، هَكَذَا أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [م١٠٨٧]

**(م) لە کورەیبەوە: ئوم فەزڵی کچی حاریس ڕەوانەی کرد بۆ لای موعاویە لە شام، وتی: هاتم بۆ شام پێویستییەکانیم بۆ جێبەجێ کرد و ڕەمەزانم بەسەردا هات و من لە شام بووم، مانگی یەکشەوەم لە شەوی هەینیدا بینی، پاشان هاتمەوە بۆ مەدینە لە کۆتایی مانگەکەدا، عەبدوڵای کوڕی عەباس(خوایان لێ ڕازی بێت) پرسیاری لێکردم، پاشان باسی مانگی یەکشەوەی بۆ کرد، پرسی: کەی مانگی**

یەکشەوەتان بینی؟ وتم: شەوی جومعە بینیمان، وتی: تۆ بینیت؟ وتم: بەڵێ، خەڵکیش بینییان، خەڵکی بەڕۆژوو بوون و موعاویەش بەڕۆژوو بوو، عەبدوڵا وتی: بەڵام ئێمە شەوی شەممە بینیمان، بەردەوام بەڕۆژوو دەبین تا سییەکە تەواو دەکەین، یان مانگ دەبینین، وتم: بینینی موعاویە و ڕۆژووەکەی بۆ ئێمە بەس نییە؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەم جۆرە فەرمانی پێکردووین.

## ٥- دەروازەی: دوو مانگی جەژن کەم ناکەن[1]

١٨١٤- (ق) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**شَهْرَانِ لاَ يَنْقُصَانِ، شَهْرَا عِيدٍ: رَمَضَانُ، وَذُو الحِجَّةِ**). [خ١٩١٢/ م١٠٨٩]

(ق) لە ئەبی بەکرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)[2]، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(دوو مانگ کەم ناکەن، دوو مانگی جەژن: ڕەمەزان، و زولحەججە).**

## ٦- دەروازەی: دەستپێکردنی ڕۆژوو لە فەجرەوە

١٨١٥- (ق) عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿**حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ**﴾[البقرة:١٨٧] عَمَدْتُ إِلَى عِقَالٍ أَسْوَدَ وَإِلَى عِقَالٍ أَبْيَضَ، فَجَعَلْتُهُمَا تَحْتَ وِسَادَتِي، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ فِي اللَّيْلِ فَلاَ يَسْتَبِينُ لِي، فَغَدَوْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَذَكَرْتُ لَهُ ذلِكَ، فَقَالَ: (**إِنَّمَا ذلِكَ سَوَادُ اللَّيْلِ وَبَيَاضُ النَّهَارِ**).

[خ١٩١٦/ م١٠٩٠]

(ق) لە عەدی کوڕی حاتەمەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: کاتێك: ﴿**حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ**﴾[البقرة:١٨٧]، دابەزی، پەتێکی سپی و

---

[1] ئەوەوی دەڵێت: پاداشتەکەیان کەم ناکات با ژمارەی ڕۆژەکانیشیان کەم بکات–و.

[2] ئەبی بەکرە جیایە لە ئەبوبەکری صدیق(خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)–و.

پەتێکی ڕەشم هێنا و خستنمە ژێر سەرینەکەم، تەماشای شەوم دەکرد و بۆم ڕۆشن نەدەبوونەوە، بەیانی ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەوەم بۆ باس کرد، فەرمووی: **(ئەوە[1] بریتییە لە ڕەشی شەو و سپێتی ڕۆژ)**.

**١٨١٦**– (ق) عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: **(إِنَّ بِلالاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ)**. [خ٦٢٢/ م١٠٩٢]

(ق) لە عائیشەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، ئەو فەرمووی: **(بیلال بە شەو بانگ دەدات، بخۆن و بخۆنەوە تا ئیبن ئوم مەکتووم بانگ دەدات)**.

## ٧- دەروازەی: کەی ڕۆژووگر ڕۆژوو دەشکێنێت

**١٨١٧**– (ق) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ مِنْ هَاهُنَا، وَأَدْبَرَ النَّهَارُ مِنْ هَاهُنَا، وَغَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ)**.
[خ١٩٥٤/ م١١٠٠]

(ق) لە عومەری کوڕی خەتابەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئا لەوێوە شەو داهات، و ئا لەوێوە پشتی هەڵکرد و خۆر ئاوابوو ڕۆژووگر ڕۆژوو دەشکێنێت)**.

## ٨- دەروازەی: پەسەندی پارشێو و دواخستنی

**١٨١٨**– (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(تَسَحَّرُوا، فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً)**. [خ١٩٢٣/ م١٠٩٥]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە)**.

---

[1] ئەوە: واتە ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ﴾[البقرة:١٨٧]–تا دەزووی سپی لە دەزووی ڕەش بۆ ئێوە ڕۆشن دەبێتەوە–و.

**١٨١٩**– (خ) عَنْ سهلِ بنِ سعدٍ قال: كُنْتُ أَتَسَحَّرُ فِي أَهْلِي، ثُمَّ يَكُونُ سُرْعَةٌ بِي أَنْ أُدْرِكَ صَلاَةَ الْفَجْرِ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٥٧٧]

**(خ) لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، وتی: لەناو خانەوادەکەم پارشێوم دەکرد، پاشان پەلەکردنم پێوە دیار بوو تا بگەم بە نوێژی بەیانیدا لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ)[1].**

**١٨٢٠**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّا مَعْشَرَ الأَنْبِيَاءِ أُمِرْنَا أَنْ نُؤَخِّرَ سُحُورَنَا وَنُعَجِّلَ فِطْرَنَا، وَأَنْ نُمْسِكَ بِأَيْمَانِنَا عَلَى شَمَائِلِنَا فِي صَلاتِنَا**). [حب١٧٧٠]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئێمە کۆمەڵی پێغەمبەران فەرمانمان پێکراوە پارشێومان دوابخەین و ڕۆژوو شکاندنمان پێشبخەین و لە نوێژدا بە دەستی ڕاستمان دەستی چەپمان بگرین).**

## ٩- دەروازەی: پەسەندی پەلەکردن لە ڕۆژووشکاندن

**١٨٢١**– (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ**). [خ١٩٥٧/ م١٠٩٨]

**(ق) لە سەهلی کوڕی سەعدەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەردەوام خەڵك لە خێردان گەر پەلە بکەن لە ڕۆژوو شکاندن).**

**١٨٢٢**– وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لا تَزَالُ أُمَّتِي عَلَى سُنَّتِي مَا لَمْ تَنْتَظِرْ بِفِطْرِهَا النُّجُومَ**). قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا كَانَ صَائِماً، أَمَرَ رَجُلاً فَأَوْفَى عَلَى شَيْءٍ، فَإِذَا قَالَ: غَابَتِ الشَّمْسُ، أَفْطَرَ. [مه٢٠٦١/حب٣٥١٠/ك١٥٨٤]

* إسناده صحيح.

---

[1] **واتە: کاتی پارشێوەکەی ئەوەندە دواخستووە هەندێ پەلەی کردووە لە خواردنەکە تا بە نوێژی جەماعەتدا بگات لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)–و.**

هەر لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بەردەوام ئومەتەکەم لەسەر سوننەتی منن گەر بۆ ڕۆژوو شکاندنیان چاوەڕوانی ئەستێرە نەبن)**. وتی: گەر پێغەمبەر(ﷺ) بەڕۆژوو بوایە فەرمانی بە پیاوێك دەکرد لەسەر شتێك بڕوانێت، گەر وتی: خۆر ئاوابوو ڕۆژووی دەشکاند.

## ١٠- دەروازەی: کەسێ بە لەبیرچوونەوە بخوات

**١٨٢٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ أَكَلَ نَاسِياً . وَهُوَ صَائِم . فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللهُ وَسَقَاهُ)**. [خ٦٦٦٩ (١٩٣٣)/ م١١٥٥]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بەڕۆژوو بێت و لەبیری بچێت و بخوات با ڕۆژووەکەی تەواو بکات، چونکە خودا خواردنی پێداوە و خواردنەوەی پێ نۆش کردووە)**.

**١٨٢٤-** وعَنْه: أَنَّ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَن أَفْطَرَ في رَمَضَانَ نَاسِياً فَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهِ، وَلاَ كَفَّارَةَ)**. [مه١٩٩٠/حب٣٥٢١/ك١٥٦٩]

* إسناده حسن.

هەر لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بە لەبیرچوونەوە لە ڕەمەزان ڕۆژووی شکاند نە قەزاکردنەوەی لەسەرە نە کەفارەت)**.

## ١١- دەروازەی: بە ڕۆژوو پێش ڕەمەزان ناکەوێت

**١٨٢٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ يَتَقَدَّمَنَّ أَحَدُكُمْ رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ؛ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمَهُ، فَلْيَصُمْ ذلِكَ الْيَوْمَ)**.

[خ١٩١٤/ م١٠٨٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: **(یەکێك لە ئێوە بە ڕۆژووی ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ پێش ڕەمەزان نەکەوێت، مەگەر پیاوێك بێت پێشتر ڕۆژووی ئەو ڕۆژانەی گرتبێت[1]، ئەو با ئەو ڕۆژە بگرێت).**

## ١٢- دەروازەی: نەهی لە ڕۆژووی ویصال[2]

١٨٢٦- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الْوِصَالِ في الصَّوْمِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَ المسْلِمِينَ: إِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(وَأَيُّكُمْ مِثْلِي! إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِ)**. فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ الْوِصَالِ، وَاصَلَ بِهِمْ يَوْماً، ثُمَّ يَوْماً، ثُمَّ رَأَوُا الْهِلالَ، فَقَالَ: **(لَوْ تَأَخَّرَ لَزِدْتُكُمْ)**. كالتَّنْكِيلِ لَهُمْ حِينَ أَبَوا أَنْ يَنْتَهُوا. [خ١٩٦٥/ م١١٠٣]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد لە ڕۆژووی ویصال، پیاوێك لە موسڵمانان پێی وت: تۆ خۆت ڕۆژووی ویصال ئەنجام دەدەی، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: **(کێ لە ئێوە وەك منە، من شەو دەکەمەوە و پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم پێدەدات)**، کاتێ نەیانویست دەستهەڵبگرن لە ڕۆژووی ویصال، ڕۆژێك و پاشان ڕۆژێکی تر[3] ڕۆژووی ویصالی پێگرتن، پاشان مانگی یەکشەوەیان بینی، فەرمووی: **(گەر مانگی یەکشەوە دوابکەوتبایە بۆم زیاد دەکردن)**، وەك سزادانیان کاتێ نەیانویست دەستهەڵبگرن.

---

(١) بۆ نموونە: لەسەر خۆی دانابێت هەموو دووشەم یان پێنجشەمێك بەڕۆژوو بێت و ڕۆژووەکەی کەوتبێتە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ بەر لە ڕەمەزان، یان کەسێك بێت کەفارەتی لەسەر بێت-و.

(٢) ڕۆژووی ویصال: ئەوەیە چەند ڕۆژ بەبێ شکاندن بەڕۆژوو بێت-و.

(٣) واتە: دوو ڕۆژ لەسەر یەك-و.

## ١٣- دەروازەی: ویصال تا بەرەبەیان

١٨٢٧- (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**لا تُوَاصِلُوا، فَأَيُّكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُوَاصِلَ؛ فَلْيُوَاصِلْ حَتَّى السَّحَرِ**). قَالوا: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (**إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ، إِنِّي أَبِيتُ لِي مُطْعِمٌ يُطْعِمُنِي وَسَاقٍ يَسْقِينِ**). [خ١٩٦٣]

(خ) لە ئەبی سەعیدەوە(خوا لێی ڕازی بێت): ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**ڕۆژووی ویصال مەگرن، گەر یەکێك لە ئێوە ویستی بیگرێت با تا بەرەبەیان بەردەوام بێت**[1])، وتیان: بەلام تۆ ڕۆژووی ویصال دەگری، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (**من وەك ئێوە نیم، من شەو دەکەمەوە و خواردنپێدەرێك خواردنم پێ دەدات و ساقییەك ئاوم پێ نۆش دەکات**).

## ١٤- دەروازەی: دەستلێدان و ماچ کردن بۆ ڕۆژووگر

١٨٢٨- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُقَبِّلُ وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لِإِرْبِهِ. [خ١٩٢٧/ م١١٠٦]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری(ﷺ) ماچی دەکرد و دەستلێدانی هەبوو ئەو بەڕۆژوو بوو، ئەو بەتواناترین کەس بوو بەسەر هێنی خۆیدا[2].

١٨٢٩- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: هَشَشْتُ فَقَبَّلْتُ وَأَنَا صَائِمٌ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! صَنَعْتُ الْيَوْمَ أَمْراً عَظِيماً، قَبَّلْتُ وَأَنَا صَائِمٌ، قَالَ: (**أَرَأَيْتَ لَوْ مَضْمَضْتَ مِنَ الْمَاءِ وَأَنْتَ صَائِمٌ**)؟ قُلْتُ: لاَ بَأْسَ، قَالَ: (**فَمَهْ**). [د٢٣٨٥/ مي١٧٦٥]

* صحيح.

---

(١) واتە: ڕۆژوو شکاندنەکەی بکاتە پارشێو، هەرچەند باشتر و چاکتر-وەك لە فەرموودەدا هاتووە- شکاندنی ڕۆژووە لەگەڵ ئاوابوونی خۆر-و.

(٢) هێنی خۆی: حەزی جیماع، یان ئەندامی نێرینەی خۆی، زانایان دەڵێن: دەبێ خۆ لە ماچکردن و دەستلێدان بەدوور بگیرێ چونکە دڵنیایی نییە لە حەز خۆ و کەس وەك پێغەمبەری پێ ناکرێت-و.

لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: هوروژام و ماچم کرد و من بەڕۆژوو بووم، بۆیە وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەمڕۆ کارێکی زۆر خراپم کرد، ماچم کرد و من بەڕۆژوو بووم، فەرمووی: **(باشە گەر ئاو رابدەی لە دەمت و تۆ بەڕۆژوو بیت؟)**، وتم: خراپ نییە، فەرمووی: **(ئیتر بۆچی لات گەورەیە؟)**.

## ١٥- دەروازەی: ڕۆژووگر لەشگران ببێت

**١٨٣٠-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ جُنباً فِي رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ حُلْمٍ، فَيَغْتَسِلُ وَيَصُومُ. [خ١٩٣٠ (١٩٢٥)/ م١١٠٩]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕەمەزان فەجری پیادەگەیشت و ئەو لەشگران بوو بەبێ شەیتانی بوون، خۆی دەشۆری و بەڕۆژوو دەبوو.

## ١٦- دەروازەی: گەر لە ڕەمەزان جیماعی کرد یان بەبێ هۆیەك ڕۆژووی شکاند

**١٨٣١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ هَلَكْتُ! قَالَ: **(مَا لَكَ)**؟ قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي وَأَنَا صَائِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(هَلْ تَجِدُ رَقَبَةً تُعْتِقُهَا)**؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: **(فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ)**؟ قَالَ: لاَ. فَقَالَ: **(فَهَلْ تَجِدُ إِطْعَامَ سِتِّينَ مِسْكِيناً)**؟ قَالَ: لا. قَالَ: فَمَكَثَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذلِكَ أُتِيَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ. وَالْعَرَقُ الْمِكْتَلُ. قَالَ: **(أَيْنَ السَّائِلُ)**؟ فَقَالَ: أَنَا. قَالَ: **(خُذْ هذَا فَتَصَدَّقْ بِهِ)**، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَعَلَى أَفْقَرَ مِنِّي يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَوَاللهِ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا . يُرِيدُ: الحَرَّتَيْنِ . أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي. فَضَحِكَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: **(أَطْعِمْهُ أَهْلَكَ)**.

[خ١٩٣٦/ م١١١١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: وەختانێ ئێمە لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین، پیاوێك هات بۆ لای و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، تیاچووم، فەرمووی: **(چیتە؟)**، وتی: کەوتم بەسەر ژنەکەمدا و من بەڕۆژوو بووم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بەندەیەك شکدەبەی ئازادی بکەی؟)**، وتی: نەخێر، فەرمووی: **(دەتوانی دوو مانگی سەرومڕ بەڕۆژوو ببیت؟)**، وتی: نەخێر، فەرمووی: **(هەتە نانی شەست هەژار بدەی؟) وتی: نەخێر، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە، لە کاتێکدا ئێمە لەو حاڵەدا بووین زەمیلەیەك(عرق) خورمایان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هێنا-** "عرق" بریتییە لە "المکتل-قووڵینە"[1]، فەرمووی: **(پرسیارکەرەکە لە کوێیە؟)** وتی: منم، فەرمووی: **(ئەمە بگرە و بیکە بە صەدەقە)**، پیاوەکە وتی: ئایا بەسەر هەژارتر لە خۆمدا، ئەی پێغەمبەری خودا؟ لە نێوان دوو "لابة"کەی مەدینە- مەبەستی دوو گەڕەکەکەی مەدینەیە- خانەوادەیەکی تێدا نییە لە خانەوادەکەی من هەژارتر بێت، پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی تا ددانەکانی دەرکەوتن، پاشان فەرمووی: **(دەرخواردی خانەوادەکەتی بدە)**.

## ١٧- دەروازەی: کەڵەشاخ بۆ ڕۆژووگر

**١٨٣٢-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: احْتَجَمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ صَائِمٌ. [خ١٩٣٩ (١٨٣٥)]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) کەڵەشاخی گرت و ئەو بەڕۆژوو بوو.**

**١٨٣٣-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى: حَدَّثَنِي رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنِ الْحِجَامَةِ وَالْمُوَاصَلَةِ، وَلَمْ يُحَرِّمْهُمَا إِبْقَاءً عَلَى

[1] زەمیلە و قووڵینە لە تووڵی دار دروست دەکرێن، بۆ هەڵگرتن و گواستنەوەی میوە بەکاردەهێنرێن-و.

أَصْحَابِهِ، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ تُوَاصِلُ إِلَى السَّحَرِ، فَقَالَ: (**إِنِّي أُوَاصِلُ إِلَى السَّحَرِ، وَرَبِّي يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِي**). [د٢٣٧٤]

* صحيح.

**لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبی لەیلاوە: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆی باس کردم: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە کەڵەشاخ و ڕۆژووی ویصال و حەرامی نەکردن وەك هێڵانەوە لەسەر هاوەڵانی، پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، تۆ تا سەحەر ڕۆژووی ویصال دەکەی، فەرمووی: (من تا سەحەر ویصال دەکەم و پەروەردگارم خواردنم پێ دەدات و خواردنەوەم پێ نۆش دەکات).**

## ١٨- دەروازەی: ڕۆژووی منداڵ

**١٨٣٤**– (ق) عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ قَالَتْ: أَرْسَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم غَدَاةَ عَاشُورَاءَ إِلَى قُرَى الأَنْصَارِ: (**مَنْ أَصْبَحَ مُفْطِراً فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ، وَمَنْ أَصْبَحَ صَائِماً فَلْيَصُمْ**). قَالَتْ: فَكُنَّا نَصُومُهُ بَعْدُ، وَنُصَوِّمُ صِبْيَانَنَا، وَنَجْعَلُ لَهُمُ اللُّعْبَةَ مِنَ الْعِهْنِ، فَإِذَا بَكَى أَحَدُهُمْ عَلَى الطَّعَامِ أَعْطَيْنَاه ذَاكَ حَتَّى يَكُون عِنْدَ الإِفْطَارِ. [خ١٩٦٠/ م١١٣٦]

**(ق) لە ڕوبەیعی کچی موعەویزەوە، وتی: بەیانی عاشورا پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ ئاوەدانییەکانی ئەنصار: (هەر کەس بەیانی لێبووەتەوە و بەڕۆژوو نەبووە با ئەوەی ماوەتەوە لە ڕۆژەکە تەواو بکات، هەر کەسیش ڕۆژی لێبووەتەوە و بەڕۆژوو بووە با بەڕۆژوو بێت)، وتی: دواتر عاشورا بەڕۆژوو دەبووین و منداڵەکانمان بەڕۆژوو دەکرد و لە خوری شیکراوە یاریمان بۆ دروست دەکردن[1]، گەر یەکێك لەوان بۆ خواردن بگریایا ئەو یاریەمان پێ دەدا تا کاتی ڕۆژوو شکاندن.**

---

[1] **ئەو تۆپانەی لە خوری و کوڵك بۆ منداڵان دروست دەکرا لە کوردەواریدا پێی دەوترا "تۆپە گاولکێ"–و.**

## ١٩- دەروازەی: قەزای ڕەمەزان

١٨٣٥- (ق) عَنْ يَحْيى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﵂ تَقُولُ: كَانَ يَكُونُ عَلَيَّ الصَّوْمُ مِنْ رَمَضَانَ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقْضِيَ إِلاَّ فِي شَعْبَانَ. [خ١٩٥٠/ م١١٤٦]

**(ق) لە یەحیاوە، لە ئەبی سەلەمەوە، وتی: گوێم لە عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) بوو دەیوت: ڕۆژووی ڕەمەزانم لەسەر دەبوو تەنها لە شەعباندا دەمتوانی قەزای بکەمەوە.**

١٨٣٦- عَنِ الْقَاسِمِ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ كَانَ عَلَيْهِ قَضَاءُ رَمَضَانَ فَلَمْ يَقْضِهِ، وَهُوَ قَوِيٌّ عَلَى صِيَامِهِ، حَتَّى جَاءَ رَمَضَانُ آخَرُ، فَإِنَّهُ يُطْعِمُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِيناً مُدّاً مِنْ حِنْطَةٍ، وَعَلَيْهِ مَعَ ذَلِكَ الْقَضَاءُ.

وَعَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ.. مِثْلُ ذَلِكَ. [ط٦٨٥]

* إسناده صحيح.

**لە قاسمەوە، ئەو دەیوت: هەر کەس قەزای ڕەمەزانی لەسەر بوو و قەزای نەکردبووەوە تا ڕەمەزانەکەی تر دێت و ئەو بەهێز بوو لە گرتنی ڕۆژووەکە، لە جێگەی هەموو ڕۆژێك نانی هەژارێك دەدات، یەك "مُـدّ"[1] لە گەنم، لەگەڵ ئەوەش قەزاکردنەوەی ڕۆژووەکەی لەسەرە.**

**لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە: هەروەك ئەوە.**

## ٢٠- دەروازەی: کەسێك بمرێت و ڕۆژووی لەسەر بێت

١٨٣٧- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ، صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ). [خ١٩٥٢/ م١١٤٧]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس مرد و ڕۆژووی لەسەر بوو سەرپەرشتیارەکەی ڕۆژووەکەی بۆ دەگرێتەوە).**

---

[1] "مُدّ" بریتییە لە لێوان لێوی دوو ناو لەپی دەست—و.

**١٨٣٨-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ، أَفَأَقْضِيهِ عَنْهَا؟ قَالَ: (**نَعَمْ، فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضى**). [خ١٩٥٣/ م١١٤٨]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، دایکم مرد و ڕۆژووی مانگێکی لەسەرە، ئایا بۆی قەزا بکەمەوە؟ فەرمووی: (بەڵێ، قەرزی خودا لەپێشترە بە گێڕانەوە).**

## ٢١- دەروازەی: هەر کەس بە هەڵە ڕۆژوو بشکێنێت

**١٨٣٩-** (خ) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قَالَتْ: أَفْطَرْنَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ غَيْمٍ، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ. قِيلَ لِهِشَامٍ: فَأُمِرُوا بِالْقَضَاءِ؟ قَالَ: بُدٌّ مِنْ قَضَاءٍ؟. وَقَالَ مَعْمَرٌ: سَمِعْتُ هِشَاماً: لا أَدْرِي أَقْضَوْا أَمْ لاَ. [خ١٩٥٩]

**(خ) لە ئەسمای کچی ئەبوبەکرەوە(خوا لێیان رازی بێت)، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژێکی هەوروهەڵادا ڕۆژووەکەمان شکاند، پاشان خۆر هاتە دەرەوە. بە هیشام وترا: ئایا فەرمانیان پێکرا بە قەزاکردنەوە؟ وتی: هەردەبێت قەزا بکرێتەوە؟ مەعمەر وتی: گوێم لە هیشام بوو وتی: نازانم ئایا قەزایان کردەوە یان نە.**

## ٢٢- دەروازەی: ڕۆژوو و شکاندن بۆ کەسی موسافیر

**١٨٤٠-** (ق) عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنَ المدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَرَفَعَه إِلى يَدَيْهِ لِيُرِيَهُ النَّاسَ، فَأَفْطَرَ حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ، وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ.

فَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقُولُ: قَدْ صَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَفْطَرَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ. [خ١٩٤٨ (١٩٤٤)/ م١١١٣]

(ق) لە تاووسەوە، لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مەدینەوە دەرچوو بۆ مەککە، بەڕۆژوو بوو تا گەیشتە عوسفان[1]، پاشان داوای ئاوی کرد و بە دوو دەستی بەرزی کردەوە تاکو خەڵك بیبینێت، ڕۆژووی شکاند تا هاتە مەککە، ئەوەش لە ڕەمەزاندا.

ئیبن عەباس دەیوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەڕۆژوو بووە و ڕۆژووشی شکاندووە، هەر کەس ویستبێتی بەڕۆژوو بووە و هەر کەس خواستبێتی شکاندوویەتی.

١٨٤١- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنَّا نُسَافِرُ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى المفْطِرِ، وَلاَ المفْطِرُ عَلى الصَّائِمِ. [خ١٩٤٧/ م١١١٨]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) سەفەرمان دەکرد، کەسی بەڕۆژوو و لە ڕۆژووشکێن و کەسی ڕۆژووشکێن لە کەسی بەڕۆژوو عەیبی نەدەگرت.

## ٢٣- دەروازەی: نیێت لە ڕۆژوودا

١٨٤٢- عَنْ حَفْصَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ لَمْ يُجْمِعْ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ، فَلاَ صِيَامَ لَهُ).

* صحيح. [د٢٤٥٤/ ت٧٣٠/ ن٢٣٠٠/ جه١٧٠٠/ مي١٧٤٠]

لە حەفصەوە -هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)-: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بەر لە فەجر ڕۆژووەکەی دانەمەزرێنێ، ڕۆژووی بۆ نییە).**

## ٢٤- دەروازەی: ڕۆژووی شکەڕۆژ

١٨٤٣- عَنْ صِلَةَ بْنِ زُفَرَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَمَّارٍ فِي الْيَوْمِ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ، فَأُتِيَ بِشَاةٍ، فَتَنَحَّى بَعْضُ الْقَوْمِ، فَقَالَ عَمَّارٌ: مَنْ صَامَ هَذَا الْيَوْمَ، فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم.

* صحيح. [د٢٣٣٤/ ت٦٨٦/ ن٢١٨٧/ جه١٦٤٥/ مي١٧٢٤]

---

[1] عوسفان: دەکەوێتە باکوری خۆرئاوای مەککە بە دووری هەشتا کیلۆمەتر لە مەککەوە -و.

لە سیلەی کوڕی زوفرەوە، وتی: لەو ڕۆژەی شکی تێدا دروست دەبێت لای عەممار بووین، کاوڕێکیان بۆ هێنا، هەندێ لە خەڵکەکە کەناری گرت، عەممار وتی: هەر کەس ئەمڕۆ بەڕۆژووە لە ئەبا قاسم(ﷺ) یاخی بووە.

## ٢٥- دەروازەی: گەر خەڵك مانگی یەکشەوەیان لێ هەڵە بوو

**١٨٤٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (وَفِطْرُكُمْ يَوْمَ تُفْطِرُونَ، وَأَضْحَاكُمْ يَوْمَ تُضَحُّونَ، وَكُلُّ عَرَفَةَ مَوْقِفٌ، وَكُلُّ مِنًى مَنْحَرٌ، وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ مَنْحَرٌ، وَكُلُّ جَمْعٍ مَوْقِفٌ).

* صحيح. [د٢٣٢٤/ ت٦٩٧/ جه١٦٦٠]

لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(جەژنی ڕەمەزانتان ئەو ڕۆژەیە ڕۆژو دەشکێنن، جەژنی قوربانتان ئەو ڕۆژەیە قوربانییەکان سەردەبڕن، هەموو عەرەفە "مَوْقِف"ە، هەموو مینا "مَوْقِف"ە، هەموو شیو و دۆڵەکانی مەککە جێسەربڕینن، هەموو کۆبوونەوەیە[1] "مَوْقِف"ە[2])**.

## ٢٦- دەروازەی: ئەوەی ڕۆژووان ڕۆژووی لەسەر دەکاتەوە

**١٨٤٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُفْطِرُ عَلَى رُطَبَاتٍ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ رُطَبَاتٌ فَعَلَى تَمَرَاتٍ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ حَسَا حَسَوَاتٍ مِنْ مَاءٍ.

* حسن صحيح. [د٢٣٥٦/ ت٦٩٦]

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر چەند دەنکە خورمایەکی تازە پێگەیو ڕۆژووی دەشکاند بەرلەوەی نوێژ بکات، گەر خورمای تازە

---

(١) مەبەست بە کۆبوونەوە بریتییە لە "جمع"، ئەوەش بریتییە لە موزدەلیفە، واتە: هەموو موزدەلیفە وەستانە و شوێنێك بە وەستان تیایدا تایبەت ناکرێت، موزدەلیفە بە "جمع" ناودەبرێت چونکە خەڵکی تیایدا کۆدەبنەوە-و.

(٢) "موقف" واتە: شوێن وەستان-و.

پێگەیو نەبوایە ئەوا لەسەر چەند دەنکە خورمایەکی تر، گەر ئەوەش نەبوایە چەند قومە ئاوێك.

## ٢٧- دەروازەی: چی دەڵێ لە کاتی ڕۆژووشکاندن

١٨٤٦- عَنْ مَرْوَانَ بْنِ سَالِمٍ الْمُقَفَّعِ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ يَقْبِضُ عَلَى لِحْيَتِهِ، فَيَقْطَعُ مَا زَادَ عَلَى الْكَفِّ، وَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أَفْطَرَ قَالَ: (**ذَهَبَ الظَّمَأُ، وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ، وَثَبَتَ الْأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللهُ**). [د٢٣٥٧]

* حسن.

لە مەروانی کوڕی سالمی موقەفەعەوە، وتی: ئیبن عومەرم بینی ریشی خۆی دەگرت و ئەوەی لە مشتی زیاد بوو دەیبڕی، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە ڕۆژووی دەشکاند دەیفەرموو: (**تینوێتی ڕۆیشت و ڕەگەکان تەڕبوونەوە و إنشاءالله پاداشت جێگیر بووە**).

## ٢٨- دەروازەی: دوعای ڕۆژووان بۆ کەسێك لای بەربانگ دەکاتەوە

١٨٤٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا أَفْطَرَ عِنْدَ أُنَاسٍ قَالَ: (**أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الْأَبْرَارُ، وَتَنَزَّلَتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ**). [مي١٨١٣]

* إسناده صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەر(ﷺ) گەر لای خەڵکانێك بەربانگی بکردبایەوە دەیفەرموو: (**ڕۆژووان لە لاتان بەربانگ بکاتەوە و چاکان لە خواردنتان بخۆن و فریشتە دابەزن بۆ سەرتان**).

## ٢٩- دەروازەی: ئەوەی لە کاتی بینینی مانگی یەکشەوە دەوترێت

١٨٤٨- عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا رَأَى الْهِلاَلَ قَالَ: (**اللَّهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالْيُمْنِ وَالْإِيمَانِ، وَالسَّلاَمَةِ وَالْإِسْلاَمِ، رَبِّي وَرَبُّكَ اللهُ**).

لە تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵاوە: گەر پێغەمبەر(ﷺ) مانگی یەکشەوەی ببینیبایە دەیفەرموو: **(خودایە بە بەرەکەت و ئیمان، و سەلامەتی و ئیسلام بەسەر ئێمەدا هەڵیبهێنە، پەروەردگاری من و تۆ "الله"یە).**

- وعند الدارمي: (بِالْأَمْنِ وَالْإِيمَانِ). [ت٣٤٥١/ مي١٧٣٠]

* صحيح.

لای "الدارمي": **(بالأمْنِ والإيمان–بە ئاسایش و ئیمانەوە).**

## ٣٠- دەروازەی: هەر کەس بە ڕۆژووانێك بەربانگ بکاتەوە

**١٨٤٩-** عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ فَطَّرَ صَائِماً كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ، غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئاً).**

* صحيح. [ت٨٠٧/ جه١٧٤٦/ مي١٧٤٤]

لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بەربانگ بە ڕۆژووانێك بکاتەوە وەك پاداشتەکەی ئەو پاداشتی بۆ هەیە، بەڵام هیچ لە پاداشتی ڕۆژووانەکە کەم ناکرێتەوە).**

## ٣١- دەروازەی: ڕۆژووشکاندن بۆ ئافرەتی سکپڕ و شیردەر

**١٨٥٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ: رُخِّصَ لِلشَّيْخِ الْكَبِيرِ وَالْعَجُوزِ الْكَبِيرَةِ فِي ذَلِكَ، وَهُمَا يُطِيقَانِ الصَّوْمَ أَنْ يُفْطِرَا إِنْ شَاءَا، وَيُطْعِمَا مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِيناً، ثُمَّ نُسِخَ ذَلِكَ فِي هَذِهِ الآيَةِ **﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾**[البقرة: ١٨٥] وَثَبَتَ لِلشَّيْخِ الْكَبِيرِ وَالْعَجُوزِ الْكَبِيرَةِ: إِذَا كَانَا لاَ يُطِيقَانِ الصَّوْمَ، وَالْحَامِلُ وَالْمُرْضِعُ إِذَا خَافَتَا أَفْطَرَتَا، وَأَطْعَمَتَا مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِيناً. [هق٤/٢٣٠]

لە ئیبن عەباسەوە، ئەو وتی: لەوەدا مۆڵەت دراوە بە پیاوی پیر و ژنی پیر، ئەوان توانای ڕۆژووگرتنیان هەبێت و بیانەوێت ڕۆژوو نەگرن، لە جێگەی هەر ڕۆژێك نانی

هەژارێك بدەن، پاشان لەم ئایەتەدا ئەوە نەسخ کرایەوە:﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُ﴾ [البقرة: ١٨٥]، بۆ پیرە پیاو و پیرەژن جێگیر بوو: گەر نەتوانن ڕۆژوو بگرن، هەروەها بۆ ئافرەتی سکپڕ و شیردەر گەر بترسن[١] ڕۆژوو دەشکێنن، و لە جێگەی هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدەن.

**١٨٥١**– عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ سُئِلَ عَنِ الْمَرْأَةِ الْحَامِلِ إِذَا خَافَتْ عَلَى وَلَدِهَا، فَقَالَ: تُفْطِرُ وَتُطْعِمُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكيناً مُدّاً مِنْ حِنْطَةٍ.　　　[هق٤/٢٣٠]

لە نافیعەوە: پرسیار لە ئیبن عومەر کرا دەربارەی ئافرەتی سکپڕ گەر لە منداڵەکەی بترسێت، وتی: ڕۆژووەکەی دەشکێنێ و لە جێگەی هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدات "مُدّ"ێك[٢] لە گەنم.

## ٣٢- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی حوکمی ڕشانەوە هاتووە بۆ ڕۆژووان

**١٨٥٢**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ ذَرَعَهُ قَيْءٌ وَهُوَ صَائِمٌ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ، وَإِنِ اسْتَقَاءَ؛ فَلْيَقْضِ).　　　[د٢٣٨٠/ ت٧٢٠/ جه١٦٧٦/ مي١٧٧٠]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس ڕشانەوە تەنگەتاوی کرد و ئەو بەڕۆژوو بوو، قەزاکردنەوەی لەسەر نییە، گەر خۆی هەوڵی ڕشانەوەی دا با قەزای بکاتەوە).**

- ولفظ الترمذي: (وَمَنِ اسْتَقَاءَ عَمْداً؛ فَلْيَقْضِ).

* صحيح.

لەفزەکەی "الترمذي": **(هەر کەس بە ئەنقەست خۆی ڕشاندنەوە با قەزای بکاتەوە).**

---

[١] واتە: گەر بترسن منداڵەکانیان یان خۆیان تووشی زیان ببن–و.

[٢] "مُدّ"ێك پڕ بە ناو لەپی دوو دەستە–و.

## بەشی دووەم

# تەراویح و شەوی قەدر

## ١- دەروازەی: فەزڵی نوێژی تەراویح

**١٨٥٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ قَامَ رَمَضَانَ، إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ**). [خ٢٠٠٩ (٣٥)/ م٧٥٩]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس رەمەزانی گرت بە ئیمان و تەمای پاداشت خودا لەو گوناهانەی خۆشدەبێت پێشکەوتوون).**

**١٨٥٤-** (ق) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمنِ: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﵂: كَيْفَ كَانَتْ صَلاَةُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي رَمَضَانَ؟ فَقَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلاَ فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً: يُصَلِّي أَرْبعاً، فَلاَ تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعاً، فَلاَ تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلاَثاً. قَالَتْ عائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ فَقَالَ: (**يَا عَائِشَةُ إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلاَ يَنَامُ قَلْبِي**).

[خ١١٤٧/ م٧٣٨]

**(ق) لە ئەبی سەلەمەی کوڕی عبدالرحمانەوە: ئەو پرسیاری لە عائیشە(خوا لێی رازی بێت) کرد: نوێژی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە رەمەزان چۆن بوو؟ عائیشە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە رەمەزان و کاتەکانی تریش لە یازدە رکات زیاتری نەدەکرد، چوار رکاتی دەکرد، پرسیار مەکە لە جوانی و باشی و درێژییان، پاشان چواری تری دەکرد پرسیار مەکە لە جوانی و باشی و درێژییان، پاشان سێ رکاتی تری دەکرد، عائیشە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا بەرلەوەی ویتر بکەی دەخەوی؟ فەرمووی: (ئەی عائیشە، دوو چاوم دەخەون و دڵم ناخەوێت).**

**١٨٥٥**- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ ذَاتَ لَيْلَةٍ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، فَصَلَّى فِي المسْجِدِ، فَصَلَّى رِجَالٌ بِصَلاتِهِ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ فَتَحَدَّثُوا، فَاجْتَمَعَ أَكْثَرُ مِنْهُمْ فَصَلُّوا مَعَهُ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ فَتَحَدَّثُوا، فَكَثُرَ أَهْلُ المسْجِد مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَصَلَّوْا بِصَلاتِهِ، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الرَّابِعَةُ، عَجَزَ المسْجد عَنْ أَهْلِهِ، حَتَّى خَرَجَ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ، فَلَمَّا قَضى الْفَجْرَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَتَشَهَّدَ، ثُمَّ قَالَ: **(أَمَّا بَعْدُ؛ فَإِنَّهُ لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ مَكَانُكُمْ، لكِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ، فَتَعْجِزُوا عَنْهَا)**. [خ٩٢٤ (٧٢٩)/ م٧٦١]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): شەوێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نیوەی شەو چووە دەرەوە، لە مزگەوت نوێژی كرد، پیاوانێك بە نوێژەكەی ئەو نوێژیان كرد، خەڵكی بەیانیان لێبوویەوە و باسیان كرد، زۆرتر لەوان كۆبوونەوە و نوێژیان لەگەڵ كرد، دیسان خەڵكی بەیانیان لێبوویەوە و باسیان كرد، لە شەوی سێیەم ئەهلی مزگەوت زۆر بوون، پێغەمبەری خودا(ﷺ) چووە دەرەوە و بە نوێژەكەی نوێژیان كرد، كاتێ شەوی چوارەم هاتە بەرەوە مزگەوت لە ئەهلی مزگەوت هەراسان بوو[1] تا پێغەمبەر بۆ نوێژی بەیانی چووە دەرەوە[2]، كاتێ نوێژی بەیانی كرد رووی لە خەڵكەكە كرد و شایەتمانی هێنا و فەرمووی: (پاشان، من هاتنتان بۆ ئەم شوێنە نەیترساندم، بەڵام ترسام لەسەرتان فەرز ببێت و ئێوە لێی دەستەوسان بن).**

- وفي رواية لهما: وذلكَ فِي رَمَضَانَ. [خ١١٢٩]

**لە ریوایەتێكی هەردووكیان: ئەوەش لە رەمەزاندا.**

**١٨٥٦**- (خ) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَبْدِ الْقَارِيِّ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الخطَّابِ رضي الله عنه لَيْلَةً فِي رَمَضَانَ إِلَى المسْجِدِ، فَإِذَا النَّاسُ أَوْزَاعٌ مُتَفَرِّقُونَ، يُصَلِّي الرَّجُلُ لِنَفْسِهِ، وَيُصَلِّي الرَّجُلُ فَيُصَلِّي بِصَلاَتِهِ الرَّهْطُ، فَقَالَ عُمَرُ: إِنِّي أَرَى لَوْ جَمَعْتُ هؤُلاءِ عَلَى قَارِىءٍ وَاحِدٍ لَكَانَ

---

**(١) واتە: ئەوەندە خەڵكەكە زۆربوو جێیان نەدەبوویەوە-و.**

**(٢) واتە: پێغەمبەر شەوی چوارەم بۆ شەونوێژ نەچووە دەرەوە بۆ مزگەوت، بەڵكو بۆ نوێژی بەیانی چووە دەرەوە-و.**

أَمْثَلَ، ثُمَّ عَزَمَ فَجَمَعَهُمْ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ. ثُمَّ خَرَجْتُ مَعَهُ لَيْلَةً أُخْرَى وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاَةِ قَارِئِهِمْ، قَالَ عُمَرُ: نِعْمَ الْبِدْعَةُ هذِهِ، وَالَّتِي يَنَامُونَ عَنْهَا أَفْضَلُ مِنَ الَّتِي يَقُومُونَ. يُرِيدُ آخِرَ اللَّيْلِ. وَكَانَ النَّاسُ يقُومُونَ أَوَّلَهُ. [خ٢٠١٠]

(خ) لە عبدالرحمان کوڕی عبدولقاریئەوە، وتی: شەوێك لە ڕەمەزان لەگەڵ عومەری کوڕی خەتاب چوومە دەرەوە بۆ مزگەوت، خەڵکی دابەش بووبوون و پەرش و بڵاو لێی وەستابوون، پیاو بۆ خۆی نوێژی دەکرد، پیاوێ نوێژی دەکرد و دەستەیەك بە نوێژەکەی ئەو نوێژیان دەکرد، عومەر وتی: من وادەبینم گەر ئەوانە لەسەر خوێنەرێکی قورئان کۆبکەمەوە باشتر بێت، پاشان بڕیاریدا و لەسەر ئوبەی کوڕی کەعب کۆیکردنەوە، پاشان شەوێکی تر لەگەڵی ڕۆیشتمە دەرەوە و خەڵکی بە نوێژی قاریئەکەیان نوێژیان دەکرد، عومەر وتی: ئەمە باشترین بیدعەیە، ئەوەی لێی دەخەون باشتر و چاکترە لەوەی پێیهەڵدەستن–مەبەستی بەشی کۆتایی شەو بوو– خەڵکی لە سەرەتای شەوەوە پێی هەڵدەستان.

## ٢- دەروازەی: فەزڵی شەوی قەدر و هاندان بۆ سەری

١٨٥٧– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ القَدْرِ إِيمَاناً واحْتِساباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ من ذَنْبِهِ)**.
[خ٢٠١٤ (٣٥)/ م٧٦٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەرکەس ڕەمەزانی گرت بە ئیمان و تەمای پاداشت خودا لەو گوناهانەی خۆشدەبێت پێشکەوتوون، هەرکەس بە ئیمان و تەمای پاداشت شەوی قەدر هەستا خودا لەو گوناهانەی خۆشدەبێت پێشکەوتوون)**.

١٨٥٨– (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْوِتْرِ مِنَ العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ)**. [خ٢٠١٧/ م١١٦٩]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە شەوە تاکەکانی دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان بۆ شەوی قەدر بگەڕێن).**

**١٨٥٩**– (م) عَنْ زِرِ بنِ حُبَيْشٍ قَالَ: سَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ، فَقُلْتُ: إِنَّ أَخَاكَ ابْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: مَنْ يَقُمِ الْحَوْلَ يُصِبْ لَيْلَةَ الْقَدْرِ. فَقَالَ: رحمه الله، أَرَادَ أَنْ لاَ يَتَّكِلَ النَّاسُ، أَمَّا إِنَّهُ قَدْ عَلِمَ أَنَّهَا فِي رَمَضَانَ، وَأَنَّهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ، وَأَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ. ثُمَّ حَلَفَ لاَ يَسْتَثْنِي، أَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، فَقُلْتُ: بِأَيِّ شَيْءٍ تَقُولُ ذَلِكَ يا أَبَا الْمُنْذِرِ؟ قَالَ: بِالْعَلاَمَةِ، أَوْ بِالآيَةِ الَّتِي أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهَا تَطْلُعُ يَوْمَئِذٍ، لاَ شُعَاعَ لَهَا.

[م: الصيام ٧٦٢ (٢٢٠)]

**(م) لە زەری کوڕی حوبەیشەوە، وتی: پرسیارم لە ئوبەی کوڕی کەعب(خوا لێی ڕازی بێت) کرد و وتم: براکەت ئیبن مەسعوود دەڵێت: هەر کەس ساڵەکە هەڵبستێت تووشی شەوی قەدر دەبێت، وتی: ڕەحمەتی خودای لێ بێت، مەبەستی ئەوە بووە خەڵکی پاڵنەدەنەوە، ئەو دەزانێت لە ڕەمەزاندایە و لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزانە، و شەوی بیست و حەوتی ڕەمەزان، پاشان سوێندی خوارد و هەڵواردنی بۆ نەکرد[1] شەوی بیست و حەوتە، منیش وتم: ئەی باوکی مونزیر، بە چیدا ئەوە دەڵێی؟ وتی: بە نیشانەدا، یان بەو ئایەتەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەواڵی پێداین لەو ڕۆژەدا خۆر هەڵدێت و تیشکی نییە.**

## ٣- دەروازەی: دوعای شەوی قەدر

**١٨٦٠**– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ عَلِمْتُ أَيَّ لَيْلَةٍ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، مَا أَقُولُ فِيهَا؟ قَالَ: (**قُولِي: اللَّهُمَّ إِنَّكَ عُفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ، فَاعْفُ عَنِّي**). [ت٣٥١٣/ جه٣٨٥٠]

* صحيح.

---

[1] **واتە: لە سوێندەکەیدا نەیوت "إن شاء الله".**

لە عائیشەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، باشە گەر زانیم شەوی قەدر چ شەوێكە، چی تێدا بڵێم؟ فەرمووی: **(بڵێ: خودایە تۆ لێبوردەی و لێبوردنت پێخۆشە، لێم ببوورە).**

## ٤- دەروازەی: نوێژی پیاوان بە ژنان لە تەراویحدا

**١٨٦١**– عَنْ عُرْوَةَ: أَنَّ ذَكْوَانَ أَبَا عَمْرٍو . وَكَانَ عَبْداً لِعَائِشَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَعْتَقَتْهُ عَنْ دُبُرٍ مِنْهَا .كَانَ يَقُومُ يَقْرَأُ لَهَا فِي رَمَضَانَ. [ط٢٥٦م]

**لە عورووەوە: زەكوان، ئەبو عەمر–بەندەیەكی عائیشە(هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)) بوو– لە پشتەوە ئازادی كرد بوو، ئەو هەڵدەستا و لە رەمەزان لە نوێژدا قورئانی بۆ دەخوێند.**

**١٨٦٢**– عَنْ عُرْوَةَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ جَمَعَ النَّاسَ عَلَى قِيَامِ شَهْرِ رَمَضَانَ، الرِّجَالَ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَالنِّسَاءَ عَلَى سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ. [هق٢/٤٩٣ . ٤٩٤]

**لە عورووەوە: عومەری كوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) خەڵكی لەسەر تەراویحی مانگی رەمەزان كۆكردەوە، پیاوان لەسەر ئوبەی كوڕی كەعب، و ئافرەتان لەسەر سولەیمانی كوڕی ئەبی حەسمە.**

## ٥- دەروازەی: ژمارەی ركاتەكانی تەراویح

**١٨٦٣**– عَنْ يَزِيدَ بْنِ رُومانَ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَقُومُونَ فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ فِي رَمَضَانَ بِثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ رَكْعَةً. [هق٢/٤٩٦]

**لە یزیدی كوڕی رومانەوە، وتی: لە سەردەمی عومەری كوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) خەڵكی لە رەمەزان بیست و سێ ركاتیان دەكرد.**

**١٨٦٤-** عَنْ أَبِي الْخَصِيبِ قَالَ: كَانَ يَؤُمُّنَا سُوَيْدُ بْنُ غَفَلَةَ فِي رَمَضَانَ فَيُصَلِّي خَمْسَ تَرْوِيحَاتٍ عِشْرِينَ رَكْعَةً. [هق٢/٤٩٦]

**لە ئەبی خەصیبەوە، وتی: سوەیدی کوڕی غەفلە لە ڕەمەزان ئیمامەتی بۆ دەکردین و پێنج پشووی پێ دەداین بیست رکات.**

## بەشی سێیەم

## ئیعتیکاف

### ١- دەروازەی: ئیعتیکاف لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان

**١٨٦٥-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ. [خ٢٠٢٥/ م١١٧١]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان ئیعتیکافی دەکرد.**

**١٨٦٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَلَمْ يَعْتَكِفْ عَاماً، فَلَمَّا كَانَ فِي الْعَامِ الْمُقْبِلِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ. [ت٨٠٣]

* صحيح.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە دەی کۆتایی ڕەمەزان ئیعتیکافی دەکرد، ساڵێك ئیعتیکافی نەکرد، کاتێ ساڵی داهاتوو هات بیست ڕۆژ ئیعتیکافی کرد.**

### ٢- دەروازەی: تەنها بۆ پێویستی دەچووە ماڵەوە

**١٨٦٧-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ - زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم - قَالَتْ: وَإِنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَيُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ، وَهوَ فِي المسْجِدِ، فَأُرَجِّلهُ، وَكَانَ لاَ يَدْخُلُ الْبَيْتَ؛ إِلاَّ لِحَاجَةٍ إِذَا كَانَ مُعْتَكِفاً. [خ٢٠٢٩ (٢٩٥)/ م٢٩٧]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)-هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)- وتی: جاری وا هەبوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەری بۆ لام دەهێنایە ژوورەوە و ئەو لە مزگەوت**

بوو، منیش سەریم دادەهێنا، ئەو گەر لە ئیعتیکافدا بوایە تەنها بە پێویستییەك دەچووە ماڵەکان.

**١٨٦٨-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: السُّنَّةُ عَلَى الْمُعْتَكِفِ أَنْ لاَ يَعُودَ مَرِيضاً، وَلاَ يَشْهَدَ جَنَازَةً، وَلاَ يَمَسَّ امْرَأَةً، وَلاَ يُبَاشِرَهَا، وَلاَ يَخْرُجَ لِحَاجَةٍ إِلاَّ لِمَا لاَ بُدَّ مِنْهُ، وَلاَ اعْتِكَافَ إِلاَّ بِصَوْمٍ، وَلاَ اعْتِكَافَ إِلاَّ فِي مَسْجِدٍ جَامِعٍ. [د٢٤٧٣]

* حسن صحيح.

لە عائیشەوە، وتی: سوننەت لەسەر کەسی ئیعتیکافکار دەبێ سەردانی نەخۆش نەکات، و لەسەر جەنازە ئامادە نەبێت، و دەست لە ئافرەتێك نەدات، و لەگەڵی جووت نەبێت، بۆ پێویستییەك نەچێتە دەرەوە، مەگەر هەر دەبێت بچێتە دەرەوە، ئیعتیکاف تەنها بە ڕۆژووەوەیە و ئیعتیکاف تەنها لە مزگەوتێکی کۆکەرەوەدایە[1].

## ٣- دەروازەی: ئیعتیکافی ئافرەتان

**١٨٦٩-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَكُنْتُ أَضْرِبُ لَهُ خِبَاءً، فَيُصَلِّي الصُّبْحَ ثُمَّ يَدْخُلُهُ، فَاسْتَأْذَنَتْ حَفْصَةُ عَائِشَةَ أَنْ تَضْرِبَ خِبَاءً فَأَذِنَتْ لَهَا، فَضَرَبَتْ خِبَاءً، فَلَمَّا رَأَتْهُ زَيْنَبُ بِنْتُ جَحْشٍ ضَرَبَتْ خِبَاءً آخَرَ، فَلَمَّا أَصْبَحَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم رَأَى الأَخْبِيَةَ، فَقَالَ: (مَا هٰذَا)؟ فَأُخْبِرَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (آلْبِرَّ تُرَوْنَ بِهِنَّ)؟ فَتَرَكَ الاِعْتِكَافَ ذَلِكَ الشَّهْرَ، ثُمَّ اعْتَكَفَ عَشْراً مِنْ شَوَّالٍ.

[خ٢٠٣٣ (٢٠٢٩)/ م١١٧٣]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە دەی کۆتایی ڕەمەزان ئیعتیکافی دەکرد، خێمەیەکم بۆ هەڵدەدا، نوێژی بەیانی دەکرد و پاشان دەچووە ناویەوە، حەفصە داوای مۆڵەتی لە عائیشە کرد خێمەیەك هەڵبدات، ئەویش مۆڵەتی دا، بۆیە خێمەیەکی هەڵدا، کاتێ زەینەبی کچی جەحش بینی ئەویش

[1] واتە: گەورە مزگەوتێکی گەورە و کۆکەرەوەی خەڵك نەك لە ماڵەوە-و.

**خێمەیەکی هەڵدا، کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی لێبوویەوە و خێمەکانی بینی، فەرمووی: (ئەمە چییە؟)، هەواڵی پێدرا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئایا چاکە بەوانە دەبینن؟)، بۆیە ئیعتیکافی ئەو مانگەی وازلێهێنا، پاشان دە ڕۆژ لە شەوال ئیعتیکافی کرد.**

■ ولفظ مسلم: (آلْبِرَّ تُرِدْنَ)؟

**لەفزەکەی موسلیم: (ئایا چاکەیان دەوێت؟).**

■ وللبخاري: (آلْبِرَّ أَرَدْنَ بِهَذَا)؟ [خ٢٠٤٥]

**هەروەها بۆ بوخاری: (ئایا بەمە چاکەیان دەوێت؟).**

**١٨٧٠-** (خ) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: اعْتَكَفَتْ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم امْرَأَةٌ مِنْ أَزْوَاجِهِ مُسْتَحَاضَةٌ، فَكَانَتْ تَرَى الحُمْرَةَ وَالصُّفْرَةَ، فَرُبَّمَا وَضَعْنَا الطَّسْتَ تَحْتَهَا وَهيَ تُصَلِّي. [خ٢٠٣٧ (٣٠٩)]

**(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت): لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئافرەتێك لە ژنەکانی-کە شێوە حەیزی هەبوو- ئیعتیکافی کرد، ئەو سووری و زەردی دەبینی، لەوانەیە تەشتێکمان لە ژێری دابنابا کاتێ ئەو نوێژی دەکرد.**

## ٤- دەروازەی: ئایا کەسی ئیعتیکافکار دەچێتە دەرەوە بۆ پێویستی خۆی

**١٨٧١-** (ق) عَنْ عَلِيِّ بْنِ الحُسَيْنِ رضي الله عنهما: أَنَّ صَفِيَّةَ ـ زَوْجَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ أَخْبَرَتْهُ: أَنَّهَا جَاءَتْ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تَزُورُهُ فِي اعْتِكَافِهِ فِي المسْجِدِ، فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَتَحَدَّثَتْ عِنْدَهُ سَاعَةً، ثُمَّ قَامَتْ تَنْقَلِبُ، فَقَامَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مَعَهَا يَقْلِبُهَا، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ بَابَ المسْجِدِ عِنْدَ بَابِ أُمِّ سَلَمَةَ، مَرَّ رَجُلاَنِ مِنَ الأَنْصَارِ، فَسَلَّمَا عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ لَهُمَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**عَلَى رِسْلِكُمَا، إِنَّمَا هِيَ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ**)، فَقَالا: سُبْحَانَ اللهِ يَا رَسُولَ اللهِ! وَكَبُرَ عَلَيْهِمَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ الشَّيْطَانَ يَبْلُغُ مِنَ الإِنْسَانِ مَبْلَغَ الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُما شَيْئاً**). [خ٢٠٣٥/ م٢١٧٥]

(ق) لە عەلی کوڕی حوسەینەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): صەفییەی ژنی پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداوە: ئەو هاتووە بۆ سەردانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مزگەوت لە کاتی ئیعتیکافیدا، ساتێك لای قسەی کردووە، پاشان هەستاوە و گەڕاوەتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵی هەستاوە بەڕێی بکات تا گەیشتووەتە دەرگای مزگەوتەکە لای دەرگای ئوم سەلەمەوە، دوو پیاو لە ئەنصار گوزەر دەکەن و سەلام لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەکەن، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون: **(هێواش بن، ئەمە صوفییەی کچی حوییە)**، وتیان: سبحان الله، ئەی پێغەمبەری خودا، لەسەریان گران بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(شەیتان لە گەیشتن بە مرۆڤ دەگاتە خوێنی، من ترسام شەیتان شتێك بۆ دڵتان هەڵبدات)**.

## ٥- دەروازەی: کۆشان لە دەی کۆتایی

**١٨٧٢-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ، شَدَّ مِئْزَرَهُ، وَأَحْيَا لَيْلَهُ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ. [خ٢٠٢٤/ م١١٧٤]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) کە دەگەیشتە دەی کۆتایی "شدّ مأزره"[(١)] و شەوەکەی زیندوو دەکردەوە و خانەوادەکەی بەئاگا دەهێنا.

- وعند مسلم: وَجَدَّ وَشَدَّ الْمِئْزَرَ.

لای موسلیم: سوور و لێبڕاو دەبوو و "شدّ المأزر"[(٢)].

---

(١) "المأزر": بریتییە لەو پۆشاکەی خوار ناوك دادەپۆشێت، واتە ئەو پۆشاکەی توند دەکردەوە، لە زمانی کوردیدا دەوترێت (خۆی لێ هەڵدەکرد، یان قۆڵی لێ هەڵدەکرد، یان چاکی لێ دەکرد بە لادا)-و.

(٢) "المأزر": بریتییە لەو پۆشاکەی خوار ناوك دادەپۆشێت، واتە ئەو پۆشاکەی توند دەکردەوە، لە زمانی کوردیدا دەوترێت (خۆی لێ هەڵدەکرد، یان قۆڵی لێ هەڵدەکرد، یان چاکی لێ دەکرد بە لادا)-و.

- وفي رواية لمسلم: قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَجْتَهِدُ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ، مَا لا يَجْتَهِدُ فِي غَيْرِهِ. [م١١٧٥]

له ریوایەتێکی موسلیمدا هاتووه: عائیشه وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) له دەی کۆتایی به جۆرێك دەکۆشا که له کاتەکانی تر بەو جۆرە نەدەکۆشا.

## بەشی چوارەم

## ڕۆژووی سوننەت

### ١- دەروازەی: ڕۆژووی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" جگە لە رەمەزان

١٨٧٣- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَصُومُ حَتَّى نَقولَ لاَ يُفْطِرُ، وَيفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ لاَ يَصُومُ، فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم اسْتَكْمَلَ صِيَامَ شَهْرٍ إِلاَّ رَمَضَانَ، وَمَا رَأَيْتُهُ أَكْثَرَ صِيَاماً مِنْهُ فِي شَعْبَانَ. [خ١٩٦٩/ م١١٥٦]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەڕۆژوو دەبوو تا دەمانوت نایشکێنێت، بەڕۆژوو نەدەبوو تا دەمانوت بەڕۆژوو نابێت، پێغەمبەری خودام(ﷺ) نەبینیوە ڕۆژووی مانگێکی تەواو کردبێت جگە لە رەمەزان، نەمبینیوە زۆرتر لە شەعبان ڕۆژوو بگرێت[(١)].

### ٢- دەروازەی: نەهی لە ڕۆژووی دەهر و ڕۆژووی دوو جەژنەکە و ڕۆژەکانی تەشریق

١٨٧٤- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العاصِ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يَا عَبْدَ اللهِ، أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ النَّهَارَ، وَتَقُومُ اللَّيْلَ)؟ فَقُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (فَلاَ تَفْعَلْ، صُمْ وَأَفْطِرْ، وَقُمْ وَنَمْ، فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَإِنَّ لِعَيْنِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَإِنَّ لِزَوْرِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَإِنَّ بِحَسْبِكَ أَنْ تَصُومَ كُلّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنَّ لَكَ بِكُلِّ حسَنةٍ عَشْرَ أَمْثَالِهَا، فَإِنّ ذلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّهِ).

---

(١) واتە: زۆرترین ڕۆژووی سوننەتی لە مانگی شەعباندا بوو-و.

فَشَدَّدْتُ فَشُدِّدَ عَلَيّ. قُلْت: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِي أَجِدُ قُوَّةً؟ قَالَ: **(فَصُمْ صِيَامَ نَبِيِّ اللهِ دَاوُدَ عليه السلام وَلاَ تَزِدْ عَلَيْهِ)**. قُلْت: وَمَا كَانَ صِيَامُ نَبِيِّ اللهِ دَاوُدَ عليه السلام؟ قَالَ: **(نِصْفَ الدَّهْرِ)**. فَكَانَ عَبْدُ اللهِ يَقُولُ بَعْدَمَا كَبِرَ: يَا لَيْتَنِي قَبِلْتُ رُخْصَةَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم.

[خ١٩٧٥ (١١٣١)/ م١١٥٩]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: **(ئەی عەبدوڵا، ئایا هەواڵم پێ نەدرا تۆ بە ڕۆژ بەڕۆژوو دەبیت و شەو هەڵدەستیت؟)**، وتم: با، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(ئەوە ئەنجام مەدە، بەڕۆژوو ببە و بشکێنە، شەو هەستە و بخەوە، چونکە بۆ جەستەت لەسەر تۆ مافێك هەیە، بۆ چاوت لەسەر تۆ مافێك هەیە، بۆ ژنەکەت لەسەر تۆ مافێك هەیە، بۆ سەردانیکەرانت لەسەر تۆ مافێك هەیە، بەسە بۆ تۆ لە مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بیت، بۆ هەموو چاکەیەك دە بەرانبەر بۆ تۆ هەیە، چونکە ئەوە ڕۆژووی هەموو دەهرە)**.

من توندم کردەوە و لەسەرم توند بوویەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، من هێزێك لە خۆمدا دەبینم؟ فەرمووی: **(کەوابوو ڕۆژووی پێغەمبەر داود(علیه السلام) بگرە و لەوە زیاتر مەکە)**، وتم: ڕۆژووی پێغەمبەری خودا داود(علیه السلام) چییە؟ فەرمووی: **(نیوەی دەهر)**، لەدوای ئەوەی عەبدوڵا پیر بوو دەیوت: خۆزگە ڕوخسەتەکەی پێغەمبەرم(ﷺ) وەربگرتبایە.

**١٨٧٥-** (خ) عَنْ عَائِشَةَ، وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالاَ: لَمْ يُرَخَّصْ فِي أَيَّامِ التَّشْرِيقِ أَنْ يُصَمْنَ؛ إِلاَّ لِمَنْ لَمْ يَجِدِ الْهَدْيَ. [خ١٩٩٧، ١٩٩٨]

(خ) لە عائیشەوە، هەروەها لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتیان: ڕوخسەت نەدراوە لە ڕۆژەکانی تەشریق بەڕۆژوو بن، مەگەر کەسێك "الهَدْي"[1] نەبێت.

[1] "الهدي": بریتییە لەو گیاندارەی پێشکەشی ماڵی خودا دەکرێت-و.

**١٨٧٦-** (م) عَنْ نُبَيْشَةَ الْهُذَلِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَيَّامُ التَّشْرِيقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ)**. [م١١٤١]

(م) لە نوبەیشەی هوزەلییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ڕۆژەکانی تەشریق ڕۆژی خواردن و خواردنەوەن)**.

**١٨٧٧-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنْ صِيَامِ يَوْمَيْنِ: يَوْمِ الأَضْحَى، وَيَوْمِ الْفِطْرِ. [م١١٣٨]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە ڕۆژووی دوو ڕۆژ: ڕۆژی قوربان و ڕۆژی جەژنی ڕەمەزن.**

**١٨٧٨-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ فُلاَناً لاَ يُفْطِرُ نَهَاراً الدَّهْرَ، قَالَ: **(لاَ صَامَ وَلاَ أَفْطَرَ)**. [ن٢٣٧٨]

* صحيح.

لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە، وتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، فلان بە درێژایی ڕۆژگار ڕۆژوو ناشکێنێ، فەرمووی: **(نە بەڕۆژوو بووە و نەشکاندوویەتی)**.

## ٣- دەروازەی: کەراهەتی ڕۆژووی ڕۆژی جومعە بەتەنها

**١٨٧٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(لاَ يَصُومُ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الجُمُعَةِ؛ إِلاَّ يَوْماً قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ)**. [خ١٩٨٥/ م١١٤٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(یەکێك لە ئێوە ڕۆژووی جومعە بەڕۆژوو نەبێت، مەگەر لەگەڵ ڕۆژێکی پێش جومعە یان ڕۆژێکی دوای جومعە)**.

**١٨٨٠-** (خ) عَنْ جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الحَارِثِ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم دَخَلَ عَلَيْهَا يَوْمَ الجُمُعَةِ، وَهِيَ صَائِمَةٌ، فَقَالَ: **(أَصُمْتِ أَمْسِ)**؟ قَالَتْ: لاَ، قَالَ: **(تُرِيدِينَ أَنْ تَصُومِي غَداً)**؟ قَالَتْ: لاَ، قَالَ: **(فَأَفْطِرِي)**. [خ١٩٨٦]

(خ) لە جویرییەی کچی حاریسەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی جومعە هاتە ژوورەوە بۆ لای، و جویرییە بەڕۆژوو بوو، فەرمووی: **(ئایا دوێنێ بەڕۆژوو بووی؟)**، وتی: نەخێر، فەرمووی: **(دەتەوێ سبەی بەڕۆژوو بیت؟)**، وتی: نەخێر، فەرمووی: **(کەوابوو بیشکێنە)**.

## ٤- دەروازەی: ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا

**١٨٨١-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَصُومُهُ فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا قَدِمَ المَدِينَةَ صَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، فَلَمَّا فُرِضَ رَمَضَانُ تَرَكَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ.

[خ٢٠٠٢ (١٥٩٢)/ م١١٢٥]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لە جاهیلییەت قورەیش ڕۆژووی عاشورای دەگرت، پێغەمبەری خوداش(ﷺ) لە سەردەمی جاهیلییەتدا دەیگرت، کاتێک هات بۆ مەدینە دەیگرت و فەرمانی کرد بە گرتنی، کاتێک ڕەمەزان فەرزکرا وازیهێنا لە ڕۆژی عاشورا، هەر کەس بیویستبا دەیگرت و هەر کەس بیویستبا وازیلێدەهێنا.**

**١٨٨٢-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ تَعُدُّهُ الْيَهُودُ عِيداً، قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(فَصُومُوهُ أَنْتُمْ)**. [خ٢٠٠٥/ م١١٣١]

**(ق) لە ئەبی موساوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: یەهوود ڕۆژی عاشورایان بە جەژن دادەنا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئێوە بیکەن بە ڕۆژوو).**

**١٨٨٣-** (م) عَنْ أَبِي غطفانَ بنِ طريفٍ المريّ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما يَقُولُ: حِينَ صَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ عَاشُورَاءَ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهُ يَوْمٌ تُعَظِّمُهُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(فَإِذَا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ، إِنْ شَاءَ اللهُ، صُمْنَا الْيَوْمَ التَّاسِعَ)**. قَالَ: فَلَمْ يَأْتِ الْعَامُ الْمُقْبِلُ، حَتَّى تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [م١١٣٤]

(م) لە ئەبی عەتفانی کوڕی تەریفی مورییەوە، وتی: گوێم لە عەبدوڵای کوڕی عەباس(خوایان لێ ڕازی بێت) بوو دەیوت: کاتێ پێغەمبەری خودا ڕۆژووی عاشورای گرت و فەرمانی کرد بە گرتنی، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوە ڕۆژێکە یەهوود و نەصارا بە مەزن تەماشای دەکەن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کە ساڵی داهاتوو هات، إن شاء الله، ڕۆژی نۆیەمیش دەگرین)**، وتی: ساڵی داهاتوو نەهات تا پێغەمبەری خودا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد.

**١٨٨٤**– عَنْ أَبِي قَتَادَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ)**. [ت٧٥٢/ جه١٧٣٨]

* صحيح.

**لە ئەبی قەتادەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا لای خودا وایدادەنێم گوناهی ساڵێکی پێش خۆی بسڕێتەوە).**

## ٥- دەروازەی: ڕۆژووی سێ ڕۆژ لە هەر مانگێك

**١٨٨٥**– (م) عَنْ مُعَاذَةَ الْعَدَوِيَّةِ: أَنَّهَا سَأَلَتْ عَائِشَةَ ـ زَوْجَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ: أَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَصُومُ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، فَقُلْتُ لَهَا: مِنْ أَيِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ كَانَ يَصُومُ؟ قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ يُبَالِي مِنْ أَيِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ يَصُومُ. [م١١٦٠]

**(م) لە موعازەی عەدەوییەوە: ئەو پرسیاری لە عائیشە –هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)– کرد: ئایا پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە هەموو مانگێك سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو؟ وتی: بەڵێ، پێم وت: لە چ ڕۆژێکی مانگەکەدا بەڕۆژوو دەبوو؟ وتی: باکی نەبوو لە کام لە ڕۆژەکانی مانگدا بەڕۆژوو ببێت.**

**١٨٨٦**– عَنْ هُنَيْدَةَ بْنِ خَالِدٍ، عَنِ امْرَأَتِهِ، عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَصُومُ تِسْعَ ذِي الْحِجَّةِ، وَيَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، أَوَّلَ اثْنَيْنِ مِنَ الشَّهْرِ وَالْخَمِيسَ والْخَمِيسَ. [د٢٤٣٧/ ن٢٣٧١]

* صحيح.

لە هونەیدەی کوڕی خالیدەوە، لە ژنەکەی خۆیەوە، لە یەکێك لە هاوسەرەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نۆی زیلحەججە و ڕۆژی عاشورا و سێ ڕۆژ لە هەر مانگێك و یەکەمین دووشەممەی هەموو مانگێك و پێنج شەممان و پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبوو.

**١٨٨٧**– عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ صَامَ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ، فَذَلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ**). فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل تَصْدِيقَ ذَلِكَ فِي كِتَابِهِ: ﴿**مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا**﴾ [الأنعام: ١٦٠]، الْيَوْمُ بِعَشْرَةِ أَيَّامٍ.

* صحيح. [ت٧٦٢/ ن٢٤٠٨/ جه١٧٠٨]

لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس هەموو مانگێك سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت ئەوە بریتییە لە ڕۆژووی دەهر)**، خودا لە کتێبەکەی بەڕاستگێڕانی ئەوەی دابەزاند: ﴿**مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا**﴾ [الأنعام: ١٦٠]، ڕۆژێك بە دە ڕۆژ[1].

**١٨٨٨**– وعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَا أَبَا ذَرٍّ، إِذَا صُمْتَ مِنَ الشَّهْرِ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ، فَصُمْ: ثَلاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ**). [ت٧٦١/ ن٢٤٢١]

* حسن.

هەر لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی ئەبا زەڕ، گەر لە مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بووی: سیازدە و چواردە و پازدە بەڕۆژوو بە)**.

## ٦- دەروازەی: فەزڵی ڕۆژوو لە ڕێگەی خودا

**١٨٨٩**– (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللهِ، بَعَّدَ اللهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفاً**). [خ٢٨٤٠/ م١١٥٣]

---

(١) واتە: سێ ڕۆژەکە هەر ڕۆژێك بە دە ڕۆژە دەکات سێسەد ڕۆژ، نزیك بە ساڵێك–و.

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس ڕۆژێك لەبەر خودا بەڕۆژوو ببێت خودا حەفتا پایز ڕووی لە ئاگر دوور دەخاتەوە)**.

## ٧- دەروازەی: پەسەندی ڕۆژووی شەش ڕۆژ لە شەوال

**١٨٩٠-** (م) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتّاً مِنْ شَوَّالٍ، كَانَ كَصِيَامِ الدَّهْرِ)**. [م١١٦٤]

(م) لە ئەبی ئەیوبی ئەنصارییەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس ڕەمەزان بگرێت و پاشان شەش ڕۆژ لە شەوال بەدوایدا بگرێت وەك ڕۆژووی دەهر وایە[1])**.

## ٨- دەروازەی: فەزڵی ڕۆژووی موحەڕەم

**١٨٩١-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللهِ الْمُحَرَّمُ، وَأَفْضَلُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلاَةُ اللَّيْلِ)**. [م١١٦٣]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(باشترین ڕۆژوو لەدوای ڕەمەزان مانگی موحەڕەمی خودایە، باشترین نوێژ لەدوای فەرزەکان شەونوێژە)**.

## ٩- دەروازەی: نیێتی ڕۆژوو لە ڕۆژدا و دروستی ڕۆژوو شکاندن لە نافیلەدا

**١٨٩٢-** (م) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ذَاتَ يَوْمٍ: **(يَا عَائِشَةُ هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ)؟** قالتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا عِنْدَنَا شَيْءٌ، قَالَ:

---

[1] واتە: سی ڕۆژ ڕەمەزان و شەش ڕۆژ شەوال، هەر چاکەیەك بە دە چاکەیە کەوابوو سێسەد و شەست ڕۆژ ڕۆژوو دەکات، بۆیە وەك ڕۆژووی هەموو ساڵەکە وایە-و.

(فَإِنِّي صَائِمٌ). قَالَتْ: فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ . أَوْ جَاءَنَا زَوْرٌ . قَالَتْ: فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ . أَوْ جَاءَنَا زَوْرٌ . وَقَدْ خَبَأْتُ لَكَ شَيْئاً، قَالَ: (مَا هُوَ)؟ قُلْتُ: حَيْسٌ، قَالَ: (هَاتِيهِ)، فَجِئْتُ بِهِ فَأَكَلَ، ثُمَّ قَالَ: (قَدْ كُنْتُ أَصْبَحْتُ صَائِماً). [م١١٥٤]

(م) لە عائیشەوە، دایکی باوەڕداران(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: ڕۆژێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: **(ئەی عائیشە، شتێکتان لە لایە؟)**[1]، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هیچمان لە لا نییە، فەرمووی: کەوابوو من بەڕۆژووم، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشتە دەرەوە، و هەدیەیەکمان هەدیە کرا-یان سەردانیکەرێك هات بۆ لامان- وتی: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەڕایەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، هەدیەیەکمان هەدیە کراوە-یان سەردانیکەرێك هاتووە بۆ لامان- شتێکم بۆ هەڵگرتووی، فەرمووی: **(چییە؟)**، وتم: "الحيس"ە، فەرمووی: **(بیهێنە)**، بۆم هێنا و خواردی، پاشان فەرمووی: **(ڕۆژم لێبوویەوە بەڕۆژوو بووم)**.

- وفي رواية: (فَإِنِّي إِذاً صَائِمٌ)، وفيها: (أَرِينِيهِ، فَلَقَدْ أَصْبَحْتُ صَائِماً).

لە ریوایەتێکدا: **(کەوابوو من بەڕۆژووم)**، هەروەها تیایدا هاتووە: **(نیشانم بدە، چونکە من ڕۆژم لێبوویەوە بەڕۆژوو بووم)**.

## ١٠- دەروازەی: ڕۆژووان بانگهێش دەکرێت بۆ خواردن با بڵێ: من بەڕۆژووم

**١٨٩٣**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ، وَهُوَ صَائِمٌ، فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ). [م١١٥٠]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە بانگهێش کرا بۆ خواردنێك و ئەو بەڕۆژوو بوو با بڵێت: من بەڕۆژووم)**.

[1] واتە: شتێك خواردن-و.

## ١١- دەروازەی: ڕۆژووی دەی زیلحەجە و عەرەفە

**١٨٩٤**- (م) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم صَائِماً فِي الْعَشْرِ قَطُّ. [م١١٧٦]

**(م) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: هەرگیز پێغەمبەری خودام نەبینیوە لە "دە"دا[1] بەڕۆژوو بێت.**

**١٨٩٥**- (م) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ، إِنِّي أَحْتَسِبُ على اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ والَّتِي بَعْدَهُ**). لفظ ابن ماجه.

* صحيح. [م١١٦٢/د٢٤٢٥/جه١٧٣٠]

**(م) لە ئەبی قەتادەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە لای خودا وایدادەنێم گوناهی ساڵێکی پێش خۆی و ساڵێکی دوای خۆی بسڕێتەوە).**

## ١٢- دەروازەی: ڕۆژوو لە شەعباندا

**١٨٩٦**- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ أَحَبَّ الشُّهُورِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَصُومَهُ شَعْبَانُ، ثُمَّ يَصِلُهُ بِرَمَضَانَ. [د٢٤٣١/ ت٧٣٧/ ن٢٣٤٩/ جه١٦٤٩]

* صحيح.

**لە عائیشەوە، وتی: خۆشەویستترین مانگ لای پێغەمبەری خودا ڕۆژووی تێدا بگرێت[2] شەعبان بوو، پاشان دەیگەیاندە ڕەمەزان.**

**١٨٩٧**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا انْتَصَفَ شَعْبَانُ، فَلاَ تَصُومُوا**). [د٢٣٣٧/ ت٧٣٨/ جه١٦٥١/ مي١٧٨١]

* صحيح.

---

[1] واتە: دەی زیلحەجە-و.

[2] واتە: ڕۆژووی سوننەت-و.

لە ئەبی هورەیرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: گەر شەعبان گەیشتە نیوە بەڕۆژوو مەبن.

## ١٣- دەروازەی: دەربارەی ڕۆژووی دووشەممە و پێنجشەممە

**١٨٩٨**- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَتَحَرَّى صَوْمَ الاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ.
* صحيح. [ت٧٤٥/ ن٢٣٥٩/ جه١٧٣٩]

**لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژووی دووشەممە و پێنجشەممەی بەمەبەست دەگرت.**

**١٨٩٩**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**تُعْرَضُ الْأَعْمَالُ يَوْمَ الاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ، فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ**). [ت٧٤٧/ مي١٧٩٢]
* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ڕۆژی دووشەمم و پێنجشەمم کار و کردەوەکان دەخرێنە ڕوو، پێمخۆشە کارەکانم بخرێنە ڕوو و من بەڕۆژوو بم).**

## ١٤- دەروازەی: کەسێك ڕۆژووی سوننەت بگرێت و ڕۆژووی واجیبی لەسەر بێت

**١٩٠٠**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ نَذَرَ صِيَامَ شَهْرٍ، هَلْ لَهُ أَنْ يَتَطَوَّعَ؟ فَقَالَ سَعِيدٌ: لِيَبْدَأْ بِالنَّذْرِ قَبْلَ أَنْ يَتَطَوَّعَ. وعَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ...مِثْلُ ذَلِكَ. [ط٦٧٤]

**لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە: ئەو پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێ نەزری ڕۆژووی مانگێکی کردووە، ئایا بۆی هەیە سوننەت ئەنجام بدات؟ سەعید وتی: با بە نەزرەکە دەست پێ بکات بەرلەوەی سوننەت ئەنجام بدات.. لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە... بەهەمان شێوە.**

## بەشی یەکەم

# کارەکانی حەج و حوکمەکانی

### ١- دەروازەی: فەرزی حەج و فێرکردنی بە شێوەیەکی کرداری

١٩٠١- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(أَيُّهَا النَّاسُ! قَدْ فَرَضَ اللهُ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ؛ فَحُجُّوا)**، فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللهِ؟! فَسَكَتَ، حَتَّى قَالَهَا ثَلاَثاً. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ)**. ثُمَّ قَالَ: **(ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ وَاخْتِلاَفِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ؛ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ؛ فَدَعُوهُ)**. [م١٣٣٧]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاری بۆ داین و فەرمووی: **(خەڵکینە، خودا حەجی لەسەر ئێوە فەرز کردووە، بۆیە حەج بکەن)**، پیاوێك وتی: هەموو ساڵێك، ئەی پێغەمبەری خودا؟ پێغەمبەر بێدەنگ بوو، تا پیاوەکە سێ جار پرسی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بموتبایە بەڵێ واجب دەبوو و لە توانای ئێوەدا نەدەبوو)**، پاشان فەرمووی: **(لێمگەڕێن لەوەی ئێوەم لەسەر بەجێهێڵاوە، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە بە زۆریی پرسیار و ناکۆکییان لەسەر پێغەمبەرانیان تیاچوون، گەر بە شتێك فەرمانم پێکردن چەند دەتوانن ئەوەندەی لێ ئەنجام بدەن، گەر نەهیم لە شتێك لێکردن وازیلێبهێنن)**[1].

١٩٠٢- (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَرْمِي عَلَى رَاحِلَتِهِ يَوْمَ النَّحْرِ، وَيَقُولُ: (لِتَأْخُذُوا مَنَاسِكَكُمْ، فَإِنِّي لاَ أَدْرِي لَعَلِّي لاَ أَحُجُّ بَعْدَ حَجَّتِي هَذِهِ). [م١٢٩٧]

---

(١) واتە: ئەنجامدانی فەرمان بەپێی تاقە و توانایە، بەڵام نەهی دەبێ هەمووی وازلێبهێنرێت-و.

(م) لە جابرەوە، وتی: لە ڕۆژی جەژنی قوربان پێغەمبەرم بینی لەسەر ولاخی سوارییەکەی بەردی هەڵدەدا و دەیفەرموو: **(مەناسیکی[1] خۆتان وەرگرن، من نازانم لەوانەیە لەدوای ئەم حەجەم حەجی تر نەکەم).**

**١٩٠٣**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ أَرَادَ الْحَجَّ؛ فَلْيَتَعَجَّلْ). [د١٧٣٢/ جه٢٨٨٣/ مي١٨٢٥]

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس حەجی دەوێت با پەلە بکات).**

- وزاد ابن ماجه: (فَإِنَّهُ قَدْ يَمْرَضُ الْمَرِيضُ، وَتَضِلُّ الضَّالَّةُ، وَتَعْرِضُ الْحَاجَةُ).

* حسن.

ئیبن ماجە ئەمەی زیاد کردووە: **(چونکە هەندێ جار نەخۆش نەخۆشدەکەوێت[2] و ونبوو وندەبێت[3] و پێویستی دێتە بەرەوە).**

**١٩٠٤**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَيْسَ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَعَلَيْهِ حِجَةٌ وَعُمْرَةٌ وَاجِبَتَانِ لا بُدَّ مِنْهُمَا، فَمَنْ زَادَ بَعْدَ ذَلِكَ، خَيْرٌ وَتَطَوُّعٌ. [مه٣٠٦٦/ك١٧٣٢]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە ئیبن عومەرەوە، وتی: هەموو کەس حەجێك و عومرەیەکی واجبی لەسەرە و هەردەبێت ئەنجامیان بدات، هەر کەس دوای ئەوە زیادی کرد خێر و خۆبەخشییە.**

**١٩٠٥**– عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَيُّمَا صَبِيٍّ حَجَّ ثُمَّ أَدْرَكَ؛ فَعَلَيْهِ أَنْ يَحُجَّ حِجَّةً أُخْرى، وَأَيُّمَا أَعْرَابِيٍّ حَجَّ ثُمَّ هَاجَرَ؛ فَعَلَيْهِ أَنْ يَحُجَّ حِجَّةً أُخْرَى، وأَيُّمَا عَبْدٍ حَجَّ ثُمَّ أُعْتِقَ؛ فَعَلَيْهِ أَنْ يَحُجَّ حِجَّةً أُخْرَى). [مخ٩/٥٣٧، ٥٣٨]

* إسناده صحيح.

---

[1] "مناسك" بریتییە شوێنی پەرستش لە حەج و کارەکانی حەج–و.

[2] واتە: نەخۆشی پەلە دەکات بۆی و نەخۆش دەکەوێت–و.

[3] واتە: هۆکارە فەراهەمبووەکان بۆ حەج لە دەستی دەچن–و.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر منداڵێك حەجی کرد و پاشان پیاگەیشت لەسەریەتی حەجێکی تر بکات، هەر ئەعرابییەك حەجی کرد و پاشان کۆچی کرد[1] لەسەریەتی حەجێکی تر بکات، هەر بەندەیەك حەجی کرد و پاشان ئازاد کرا لەسەریەتی حەجێکی تر بکات).**

## ٢- دەروازەی: فەزڵی حەج و عومرە

١٩٠٦- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ حَجَّ هَذَا الْبَيْتَ، فَلَمْ يَرْفُثْ، ولَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ). [خ١٨١٩ (١٥٢١)/ م١٣٥٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس حەجی ئەم ماڵەی کرد و گوناه و یاخیبوونی ئەنجام نەدا دەگەڕێتەوە وەك ئەوەی لەدایك بووبێت).**

١٩٠٧- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالحَجُّ المَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ؛ إلا الجَنَّةُ). [خ١٧٧٣/ م١٣٤٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(عومرە بۆ عومرە کەفارەتی نێوانیانە، حەجی مەبروور پاداشتێکی بۆ نییە جگە لە بەهەشت).**

١٩٠٨- (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أَنْ يُعْتِقَ اللهُ فِيهِ عَبْداً مِنَ النَّارِ، مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ. وَإِنَّهُ لَيَدْنُو، ثُمَّ يُبَاهِي بِهِمُ الْمَلاَئِكَةَ، فَيَقُولُ: مَا أَرَادَ هَؤُلاءِ)؟. [م١٣٤٨]

(م) لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هیچ رۆژێك نییە وەك رۆژی عەرەفە خودا زۆرترین بەندەی تێدا لە ئاگر ئازاد بکات، ئەو لێیان نزیك**

---

[1] واتە: کۆچی کرد بۆ مەدینە-و.

**دەبێتەوە، پاشان شانازیان پێ دەکات بەسەر فریشتەکاندا، و دەفەرموێت: ئەوانە چییان ویست)؟.**

**١٩٠٩**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (تَابِعُوا بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَإِنَّهُمَا يَنْفِيَانِ الْفَقْرَ وَالذُّنُوبَ، كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ). [ن٢٦٢٩]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (حەج و عومرە بەدوای یەکتردا ئەنجام بدەن، چونکە ئەو دوانە هەژاری و گوناه لادەبەن، وەك چۆن پیسی و خەڵتەی ئاسن لادەبات).**

**١٩١٠**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (وَفْدُ اللهِ عزّ وجل ثَلاثَةٌ: الْغَازِي، وَالْحَاجُّ، وَالْمُعْتَمِرُ). [ن٢٦٢٤]

* صحيح.

[انظر: ٢٠٣٨].

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (وەفدی خودا(عز وجل) سیانن: غەزاکەر، و حەجکەر، و عومرەکار).**

## ٣- دەروازەی: "المواقيت"

**١٩١٢**[2]– (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لأَهْلِ المدِينَةِ ذَا الحُلَيْفَةِ، وَلأَهْلِ الشَّامِ الجُحْفَةَ، وَلأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنَ المَنَازِلِ، وَلأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ، فَهُنَّ لَهُنَّ، وَلِمنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهِنَّ، لمنْ كَانَ يُرِيدُ الحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَمَنْ كَانَ دُونَهُنَّ فَمُهَلُّهُ مِنْ أَهْلِهِ، وَكَذَاكَ حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِنْهَا. [خ١٥٢٦ (١٥٢٤)/ م١١٨١]

---

[1] كوورە: ئەو جێگەیە ئاگری تێدا خۆشدەکرێت و ئاسنەکەی تێدا سوور دەکرێتەوە–و.

[2] (١٩١١) نەهاتووە جا یان فەرموودەکە پەڕیوە یان ژمارەکان هەڵەیان تێدا کراوە.

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ ئەهلی مەدینە "ذي الحُليفة"[1]ی دیاریکرد، بۆ ئەهلی شام "الجحفة"[2]ی دیاری کرد، بۆ ئەهلی نەجد "قرن المنازل"[3]ی دیاری کرد، بۆ ئەهلی یەمەن "يَلَمْلَم"[4]ی دیاری کرد، ئەو شوێنانە بۆ ئەوان و ئەو کەسانەیە پیایاندا دێن و ئەهلی ئەو شوێنانە نەبن، بۆ کەسێك حەج و عومرەی دەوێت، هەر کەس لە خوار ئەوانەوەیە شوێن و وادەکەی لە خانەوادەکەی خۆیەوە، هەروەك ئەوەی ئەهلی مەککە لێیەوە شوێن و وادە دەگرن.

- وفي رواية لمسلم: وقال صلّى الله عليه وسلّم: (هُنَّ لَهُمْ..).

لە ریوایەتێکی موسلیمدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەو شوێنانە بۆ ئەوانە..).

**١٩١٣-** (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا فُتِحَ هذَانِ الْمِصْرَانِ، أَتَوْا عُمَرَ، فَقَالُوا: يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ! إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَدَّ لأَهْلِ نَجْدٍ قَرْناً، وَهُوَ جَوْرٌ عَنْ طَرِيقِنَا، وَإِنَّا إِنْ أَرَدْنَا قَرْناً شَقَّ عَلَيْنَا. قَالَ: فَانْظُرُوا حَذْوَهَا مِنْ طَرِيقِكُمْ، فَحَدَّ لَهُمْ ذَاتَ عِرْقٍ. [خ١٥٣١]

(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: کاتێ ئەو دوو شوێنە فەتح کران، هاتن بۆ لای عومەر و وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران، پێغەمبەری خودا(ﷺ) "قرن"ی بۆ ئەهلی نەجد دیاری کرد، ئەوەش لادانە لە ڕێگەکەی ئێمە، ئێمە گەر ڕێگەی "قرن" بگرینەبەر لەسەرمان گران و دژوارە، وتی: لە ڕێگەکەتان وردببنەوە لە تەنیشت ئەو شوێنە، بۆیە "ذات عرق"[5]ی بۆ دیاری کردن.

---

[1] "ذي الحليفة" چواردە کیلۆمەتر لە مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دوورە و میقاتی ئەهلی مەدینەیە بۆ بەستنی ئیحرام و دوورترین میقاتە لە مەککەوە—و.

[2] "الجحفة" نزیك بە ١٨٠ کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە—و.

[3] "قرن المنازل" ٧٥ کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە—و.

[4] واتە: "يلملم" ١٠٢ کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە—و.

[5] "ذات عرق" ١١٠ کیلۆمەتر باکووری مەککە—و.

**١٩١٤**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لا يُحْرِمُ بِالحَجِّ إِلاَّ في أَشْهُرِ الحَجِّ، فَإِنَّ مِنْ سُنَّةِ الحَجِّ أَنْ تُحْرِمَ بِالحَجِّ فِي أَشْهُرِ الحَجِّ. [مه ٢٥٩٦/ك١٦٤٢]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: تەنها لە مانگەكانی حەجدا ئیحرام بۆ حەج دەبەسترێ، چونكە لە سوننەتی حەج ئەوەیە لە مانگەكانی حەجدا ئیحرام بۆ حەج ببەسترێ.**

## ٤- دەروازەی: پۆشاكی ئەو كەسەی ئیحرام دەبەستێ و ئەوەی بۆی موباحە لە كار و كردار

**١٩١٥**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ قَالَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لا يَلْبَسُ الْقُمُصَ، وَلاَ الْعَمَائِمَ، وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ، وَلاَ الْبَرَانِسَ، وَلاَ الْخِفَافَ؛ إِلاَّ أَحَدٌ لاَ يَجِدُ نَعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئاً مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ، أَوْ وَرْسٌ)**. [خ١٥٤٢ (١٣٤)/ م١١٧٧]

(ق) لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، كەسی ئیحرامگر چی دەپۆشێت لە پۆشاك؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(كراس ناپۆشێت، عەمامە لەسەر نانێت، شەرواڵ و دەرەدامان لەبەر ناكات، خوف لەپێ ناكات مەگەر كەسێك جووتە نەعلەكەی نەبێت، ئەوكات با جوتێ خوف لەپێ بكات و لە خوار قولاپێوە بیانبڕێت، لە پۆشاك شتێك مەپۆشن زەعفەران یان "وَرَس"[1]ی بەركەوتبێت).**

- وفي رواية للبخاري: (ولا تَنْتَقِبِ المرأَةُ المحْرِمَةُ، وَلاَ تَلْبَسِ القُفَّازَيْنِ). [خ١٨٣٨]

لە ریوایەتێكی بوخاریدا: **(ئافرەتی ئیحرامگر نیقاب ناپۆشێت و دەستكێش لەدەست ناكات).**

[1] "ورس" ڕووەكێكی زەردە بۆیاخی پێ دەكرێت–و.

١٩١٦- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَخْطُبُ بِعَرَفَاتٍ: (مَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَاراً، فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ لِلْمُحْرِمِ). [خ١٨٤١ (١٧٤٠)/ م١١٧٨]

**(ق) لە لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو لە عەرەفات وتاری دەدا: (هەر کەس جووتە نەعلەکەی نییە با جووتێ خوف لەپێ بکات، هەرکەس ژێرپۆشاکی نییە با شەرواڵ لەپێ بکات بۆ ئیحرامگر).**

## ٥- دەروازەی: خۆشۆرین بۆ ئیحرامگر

١٩١٧- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ حُنَيْنٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ الْعَبَّاسِ وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ اخْتَلَفَا بِالأَبْوَاءِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ: يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، وَقَالَ الْمِسْوَرُ: لاَ يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، فَأَرْسَلَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ الْعَبَّاسِ إِلَى أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصارِيِّ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ بَيْنَ الْقَرْنَيْنِ، وَهُوَ يُسْتَرُ بِثَوبٍ، فَسَلَّمتُ علَيْهِ، فَقَالَ: مَنْ هذَا؟ فَقُلْتُ: أَنَا عَبْدُ اللهِ بنُ حُنَينٍ، أَرْسَلَنِي إِلَيْكَ عَبْدُ اللهِ بنُ العَبَّاسِ، أَسْأَلُكَ كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَغْسِلُ رَأْسَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ؟ فَوَضَعَ أَبُو أَيُوبَ يَدَهُ عَلَى الثَّوبِ فَطَأْطَأَهُ حَتَّى بَدَا لِي رَأْسُهُ، ثُمَّ قَالَ لإِنْسَانٍ يَصُبُّ عَلَيْهِ: اصْبُبْ، فَصَبَّ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ حَرَّكَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُهُ صلّى الله عليه وسلّم يَفْعَلُ. [خ١٨٤٠/ م١٢٠٥]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی حونەینەوە: عەبدوڵای کوڕی عەباس و میسوەری کوڕی مەخرەمە لە "الأبواء"[1] جیاوازییان بۆ دروست بوو، عەبدوڵای کوڕی عەباس وتی: کەسی ئیحرامگر سەری خۆی دەشۆرێت، میسوەر وتی: کەسی ئیحرامگر سەری خۆی ناشۆرێت، عەبدوڵای کوڕی عەباس منی رەوانە کرد بۆ لای ئەبو ئەیوبی ئەنصاری، بینیم لە نێوان دوو پایەی دارینەدا[2] خۆی دەشۆرێت، ئەو بە پۆشاکێك پەردەی کرد**

---

[1] شوێنێکە لە نێوان مەککە و مەدینە-و.

[2] پایەی دارینە: مەبەست ئەو دوو دارەیە بەسەر بیرەوە دایدەمەزرێنن و پەتی دۆڵچەی بیرکە بە دەوریدا لوول دەخوات-و.

بوو، سەلامم لێکرد، وتی: ئەوە کێیە؟ وتم: منم، عەبدوڵای کوڕی حونەین، عەبدوڵای کوڕی عەباس منی ڕەوانە کردووە بۆ لای تۆ، پرسیارت لێ بکەم پێغەمبەری خودا(ﷺ) چۆن سەری خۆی دەشۆری و ئەو لە ئیحرامدا بوو؟ ئەبو ئەیوب دەستی خۆی خستە سەر پۆشاکەکە و سەری نەوی کرد تا سەریم بۆ دەرکەوت، پاشان بە یەکێکی وت کە ئاوی دەکرد بەسەریدا: ئاو بکە بە سەرمدا، ئەویش ئاوی کرد بە سەریدا، پاشان بە دوو دەستی سەری خۆی جوڵاند و بۆ پێشەوە و بۆ دواوە دەستی بەسەردا هێنا، و وتی: بەم جۆرە پێغەمبەرم(ﷺ) بینی ئەنجامی دەدا.

## ٦- دەروازەی: کەسی ئیحرامگر چارەسەری چاوی خۆی بکات

**١٩١٨-** (م) عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ أَبَانَ بنِ عُثْمَانَ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِمَلَلٍ، اشْتَكَى عُمَرُ بنُ عُبَيْدِ اللهِ عَيْنَيْهِ. فَلَمَّا كُنَّا بِالرَّوْحَاءِ اشْتَدَّ وَجَعُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَى أَبَانِ بنِ عُثْمَانَ يَسْأَلُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ أَنِ اضْمِدْهُمَا بِالصَّبِرِ، فَإِنَّ عُثْمَانَ ﷺ حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فِي الرَّجُلِ إذا اشْتَكَى عَيْنَيْهِ، وَهُوَ مُحْرِمٌ، ضَمَّدَهُمَا بِالصَّبِرِ. [م١٢٠٤]

(م) لە نوبەیهی کوڕی وەهبەوە، وتی: لەگەڵ ئەبانی کوڕی عوسمان چووینە دەرەوە تا گەیشتینە "مَلَل"[1]، چاوەکانی عومەری کوڕی عوبەیدوڵا داهاتن، کاتێ گەیشتینە "الروحاء"[2] ئازارەکەی توند بوو، کەسێکی نارد بۆ لای ئەبانی کوڕی عوسمان پرسیاری لێ بکات، ئەویش ڕەوانەی کردەوە بۆ لای: "الصَّبِر"[3]ی لێبدە، چونکە عوسمان(خوا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) باسی پیاوێکی کرد چاوی ئێشاوە و ئەو لە ئیحرامدا بووە، "الصَّبِر" لێداوە.

---

[1] "ملل" شوێنێکە ٢٨ میل لە مەدینەوە دوورە.

[2] شوێنێکە لە نێوان مەککە و مەدینە بە دووری ٤٠ میل لە مەدینەوە.

[3] "الصَّبِر" دەوایەکی زۆر تاڵە دەدرا لە دەرەوەی چاو.

## ٧- دەروازەی: مەرجی شکاندنی ئیحرام بە عوزرێك بۆ ئیحرامگر

**١٩١٩-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى ضُبَاعَةَ بِنْتِ الزُّبَيْرِ، فَقَالَ لَهَا: (**لَعَلَّكِ أَرَدْتِ الحَجَّ**)؟ قَالَتْ: وَاللهِ! لاَ أَجِدُنِي إِلاَّ وَجِعَةً، فَقَالَ لَهَا: (**حُجِّي وَاشْتَرِطِي، قُولِي: اللَّهُمَّ! مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي**). وَكَانَتْ تَحْتَ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ.

[خ٥٠٨٩/ م١٢٠٧]

**(ق) لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ لای "ضُباعة بنت الزبیر" و پێی فەرموو: (لەوانەیە بتەوێ حەج بکەی؟)، وتی: سوێند بە خودا، هەردەم بە ئازارم[1]، پێی فەرموو: (حەج بکە و مەرج دابنێ و بڵێ: خودایە، ئیحرام شکاندنم ئەو شوێنە بێت ڕامدەگریت[2])، ئەو هاوسەری میقدادی کوڕی ئەسوەد بوو.**

## ٨- دەروازەی: ئیحرامی زەیسان و حەیزدار

**١٩٢٠-** عَنْ أَبِي بَكْرٍ: أَنَّهُ خَرَجَ حَاجّاً مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَجَّةَ الْوَدَاعِ، وَمَعَهُ امْرَأَتُهُ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ الْخَثْعَمِيَّةُ، فَلَمَّا كَانُوا بِذِي الْحُلَيْفَةِ، وَلَدَتْ أَسْمَاءُ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَتَى أَبُو بَكْرٍ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَأَخْبَرَهُ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَأْمُرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ، ثُمَّ تُهِلَّ بِالْحَجِّ وَتَصْنَعَ مَا يَصْنَعُ النَّاسُ؛ إِلاَّ أَنَّهَا لاَ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ.

* صحيح. [ن٢٦٦٣/ جه٢٩١٢]

**لە ئەبوبەکرەوە: ئەو لە ساڵی حەجیماڵئاوایی لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشت بۆ حەج، ژنەکەی خۆی -ئەسمای کچی عومەیسی خەسعەمی- لەگەڵ بوو، کاتێ گەیشتنە "ذي الحُلَيفة[3]" ئەسما محەمەدی کوڕی ئەبوبەکری بوو، ئەبوبەکر هات بۆ لای**

---

[1] واتە: ئازارم زۆرە -و.

[2] واتە: ئازار و نەخۆشییەکە لە حەج ڕامدەگرێت -و.

[3] "ذي الحليفة" چواردە کیلۆمەتر لە مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دوورە و میقاتی ئەهلی مەدینەیە بۆ بەستنی ئیحرام و دوورترین میقاتە لە مەککەوە -و.

پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵی پێدا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکرد فەرمانی پێ بکات خۆی بشۆرێت و دەست بە حەج بکات، تەنها ئەوەندە هەیە تەواف بەیت ناکات.

## ٩- دەروازەی: بۆنی خۆش و قژداهێنان لە کاتی ئیحرامدا

**١٩٢١-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂. زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم. قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِإِحْرَامِهِ حِينَ يُحْرِمُ، وَلِحِلِّهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ.

[خ١٥٣٩/ م١١٨٩ و١١٩١]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)-هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)- وتی: بۆنی خۆشم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەدا بۆ ئیحرامەکەی کاتێ ئیحرامی دەپۆشی، هەروەها کاتێ ئیحرامی دەشکاند بەرلەوەی تەواف بەیت بکات.**

**١٩٢٢-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبيصِ الطِّيبِ، فِي مَفْرِقِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ مُحْرِمٌ. [خ٢٧١/م١١٩١]

**(ق) لە عائیشەوە، وتی: وەك ئەوەی تەماشای بریقانەوەی بۆنەکە بکەم لە سەر سەری پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ ئەو لە ئیحرامدا بوو.**

**١٩٢٣-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنَّا نَخْرُجُ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى مَكَّةَ، فَنُضَمِّدُ جِبَاهَنَا بِالسُّكِّ الْمُطَيَّبِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ، فَإِذَا عَرِقَتْ إِحْدَانَا سَالَ عَلَى وَجْهِهَا، فَيَرَاهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَلاَ يَنْهَاهَا. [د١٨٣٠]

* صحيح.

**لە عائیشەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەککە دەچووین ناوچاوانمان بە بۆنی خۆشی "السُّك[1]" دەهەنوی، پێغەمبەر(ﷺ) دەیبینی و نەهی لێ نەدەکردین.**

---

[1] جۆرێکە لە بۆنی خۆش-و.

## ١٠- دەروازەی: کەڵەشاخ و سەرتاشین و بۆ کەسی ئیحرامگر و ڕۆشنکردنەوەی فیدیە

**١٩٢٤-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ مُحْرِمٌ. [خ١٨٣٥/ م١٢٠٢]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەڵەشاخی گرت و لە ئیحرامدا بوو.**

**١٩٢٥-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ مَعْقِلٍ قَالَ: قَعَدْتُ إِلَى كَعْبِ بنِ عُجْرَةَ فِي هذَا المسْجِدِ . يَعْنِي: مَسْجِدَ الكُوْفَةِ . فَسَأَلْتُهُ عَنْ: ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ﴾[البقرة: ١٩٦]؟ فَقَالَ: حُمِلْتُ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهِي، فَقَالَ: (**مَا كُنْتُ أُرَى أَنَّ الجَهْدَ قَدْ بَلَغَ بِكَ هَذَا، أَمَا تَجِدُ شَاةً**)؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: (**صُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَطْعِمْ سِتَّةَ مَسَاكِينَ لِكُلِّ مِسْكِينٍ نِصْفُ صَاعٍ مِنْ طَعَامٍ، وَاحْلِقْ رَأْسَكَ**). فَنَزَلَتْ فِيَّ خَاصَّةً، وَهِيَ لَكُمْ عامَّةً.

[خ٤٥١٧ (١٨١٤)/ م١٢٠١]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەعقیلەوە، وتی: لەم مزگەوتە-واتە: مزگەوتی کوفە- لای کەعبی کوڕی عوجرە دانیشتم پرسیاری ئەمەم کرد: ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ﴾[البقرة: ١٩٦]؟ وتی: هەڵیانگرتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەسپێ بە ڕوخسارمدا بڵاوەی کرد بوو، فەرمووی: (پێموانەبوو شەکەتیت گەیشتبێتە ئەم ڕادەیە، ئایا مەڕی(بزنی) شك دەبەی؟)، وتم: نەخێر، فەرمووی: (سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە، یان شەش هەژار نان بدە، بۆ هەر هەژارێك نیو صاع[1] لە خۆراك و سەرت بتاشە)، بۆیە تایبەت بە من دابەزی و بۆ ئێوەیە بەگشتی.**

---

[1] یەك "صاع" نزیك بە دوو کیلۆ و نیوە-و.

**١٩٢٦**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَنْ نَسِيَ مِنْ نُسُكِهِ شَيْئاً أَوْ تَرَكَهُ؛ فَلْيُهْرِقْ دَماً. قَالَ أَيُّوبُ: لاَ أَدْرِي، قَالَ: تَرَكَ أَوْ نَسِيَ. [ط٩٥٧]

* إسناده صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە، وتی: هەر کەس شتێك لە "نُسُك"ی خۆی لەبیرکرد یان وازلێهێنا با خوێنبڕێژێت[1].**

**ئەیوب دەڵێ: نازانم وتی: وازلێبهێنێ یان لەبیربکات[2].**

**١٩٢٧**– عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: الصِّيَامُ لِمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، لِمَنْ لَمْ يَجِدْ هَدْياً، مَا بَيْنَ أَنْ يُهِلَّ بِالْحَجِّ إِلَى يَوْمِ عَرَفَةَ، فَإِنْ لَمْ يَصُمْ صَامَ أَيَّامَ مِنًى. [ط٩٧٢]

* إسناده صحيح.

**لە عائیشەوە –دایکی باوەڕداران– ئەو دەیوت: بۆ ڕۆژوو کەسێکە خۆشی بە عومرە وەرگرتووە تا حەج، هەروەها بۆ کەسێك هەدیی نەبێت، گەر لە نێوان دەستکردن بە حەج و ڕۆژی عەرەفە بەڕۆژوو نەبوویێت ڕۆژەکانی مینا بەڕۆژوو دەبێت.**

## ١١- دەروازەی: حەرامکردنی راو لەسەر کەسی ئیحرامگر

**١٩٢٨**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: انْطَلَقَ أَبِي عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ، فَأَحْرَمَ أَصْحَابُهُ وَلَمْ يُحْرِمْ، وَحُدِّثَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّ عَدُوّاً يَغْزُوهُ بِغَيْقَةَ، فَانْطَلَقَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَبَيْنَمَا أَنَا مَعَ أَصْحَابِهِ يَضْحَكُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا أَنَا بِحِمَارِ وَحْشٍ، فَحَمَلْتُ عَلَيْهِ فَطَعَنْتُهُ فَأَثْبَتُّهُ، وَاسْتَعَنْتُ بِهِمْ فَأَبَوْا أَنْ يُعِينُونِي، فَأَكَلْنَا مِنْ لَحْمِهِ، وَخَشِينَا أَنْ نُقْتَطَعَ، فَطَلَبْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، أَرْفَعُ فَرَسِي شَأْواً وَأَسِيرُ شَأْواً، فَلَقِيتُ رَجُلاً مِنْ بَنِي غِفَارٍ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ قُلْتُ: أَيْنَ تَرَكْتَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَ: تَرَكْتُهُ بِتَعْهَنَ، وَهوَ قَائِلٌ السُّقْيَا، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَهْلَكَ يَقْرَؤُونَ عَلَيْكَ السَّلاَمَ وَرَحْمَةَ الله، إِنَّهُمْ قَدْ خَشُوا

---

[1] **واتە: حەیوان سەرببڕێت–و.**

[2] **بە مەبەست وازلێبهێنێ یان لەبیری بچێت، راوییەکە شکی هەیە–و.**

أَنْ يُقْتَطَعُوا دُونَكَ فَانْتَظِرْهُمْ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَصَبْتُ حِمَارَ وَحْشٍ، وَعِنْدِي مِنْهُ فاضِلَةٌ؟ فَقَالَ لِلْقَوْمِ: (كُلُوا)، وَهُمْ مُحْرِمُونَ. [خ١٨٢١/ م١١٩٦]

**(ق) لە عەبدوڵای كوڕی ئەبی قەتادەوە، وتی: ساڵی حودەیبیە باوكم بەڕێكەوت و دەرچوو[1]، هاوەڵانی ئیحرامیان بەست و ئەو نەیبەست، بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسكرا دوژمنێك لە "غیقة[2]" خۆی دەیەوێ هێرشی بۆ بهێنێ، پێغەمبەر(ﷺ) بەڕێكەوت، لە كاتێكدا من لەگەڵ هاوەڵانی هەندێكیان بە هەندێكیان پێدەكەنین، وردبوومەوە گوێدرێژێكی وەحشیم بینی هەڵمكوتا سەری و برینداریم كرد و رامگرت، داوای یارمەتیم لێكردن نەیانویست یارمەتیم بدەن، لە گۆشتەكەیمان خوارد، ترسمان هەبوو دابڕێین، هەوڵمدا بە پێغەمبەرم(ﷺ) بگەم، هەندێ كات غارم بە ئەسپەكەم دەكرد و هەندێ كاتیش بە ئاسایی دەڕۆیشتم، نیوەی شەو گەیشتم بە پیاوێك لە بەنی غیفار، وتم: پێغەمبەرت(ﷺ) لە كوێ بەجێلا؟ وتی: لە "تَعْهَن[3]" بەجێمهێلا، دەیەوێ لە "السُّقیا[4]" قەیلوولە بكات، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خانەوادەكەت[5] سەلام و رەحمەتیان هەبوو لەسەر تۆ، ئەوان ترسان لە تۆ دابڕێن چاوەڕوانیان بە، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، گوێدرێژێكی وەحشیم راوكردووە و هەندێكی لێماوەتەوە؟ وتی: بە خەڵكەكە: (بخۆن) لە كاتێكدا ئەوان لە ئیحرامدا بوون.**

**١٩٢٩**– (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَهْدَى الصَّعْبِ بنُ جَثَّامَةَ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم حِمَارَ وَحْشٍ، وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ، وَقَالَ: **(لَوْلا أَنَّا مُحْرِمُونَ، لَقَبِلْنَاهُ مِنْكَ)**. [م١١٩٤]

---

[1] واتە: بە مەبەستی عومرە لە مەدینە دەرچوو-و.

[2] شوێنێكە لە نێوان مەككە و مەدینە.

[3] سەرچاوەیەكی ئاوە لە دووری ٣ میل لە "السقیا"وە.

[4] شارە دێیەكی نێوان مەككە و مەدینە بووە.

[5] واتە: هاوەڵانت.

(م) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: صەعبی کوڕی جوسامە گوێدرێژێکی وەحشی هەدیەی پێغەمبەر(ﷺ) کرد، ئەو لە ئیحرامدا بوو، بۆیە رەدی کردەوە و فەرمووی: **(گەر ئێمە لە ئیحرامدا نەبووینایە لێمان قبووڵ دەکردی).**

## ١٢- دەروازەی: شت هەڵواسین بە هەدییدا و نیشانەکردنی لە ئیحرام بەستندا

**١٩٣٠-** (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الظُّهْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، ثُمَّ دَعَا بِنَاقَتِهِ فَأَشْعَرَهَا فِي صَفْحَةِ سَنَامِهَا الأَيْمَنِ، وَسَلَتَ الدَّمَ، وَقَلَّدَهَا نَعْلَيْنِ، ثُمَّ رَكِبَ رَاحِلَتَهُ، فَلَمَّا اسْتَوَتْ بِهِ عَلَى الْبَيْدَاءِ، أَهَلَّ بَالحَجِّ. [م١٢٤٣]

(م) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە "ذي الحُلَيْفَة[1]" نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان داوای حوشترە مێیەکەی کرد و لە لای راستی گەردەملەکەیەوە نیشانەی کرد، خوێنی لێ رۆیشت و جووتێ نەعلی پیاهەڵواسی، پاشان سواری وڵاخی سوارییەکەی خۆی بوو، کاتێک بە سواری وڵاخەکەی گەیشتە "البَيْداء[2]" دەستی بە حەج کرد[3].

- زاد في رواية للنسائي: وَأَحْرَمَ عِنْدَ الظُّهْرِ، وَأَهَلَّ بِالْحَجِّ.

لە ریوایەتێکی نەسائیدا ئەمە زیاد بووە: نیوەڕۆ ئیحرامی بەست، و دەستی بە حەج کرد

**١٩٣١-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: فَتَلْتُ قَلاَئِدَ هَدْيِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ أَشْعَرَهَا وَقَلَّدَهَا، أَوْ قَلَّدْتُهَا، ثُمَّ بَعَثَ بِهَا إِلَى الْبَيْتِ، وَأَقَامَ بِالمدِينَةِ، فَمَا حَرُمَ عَلَيْهِ شَيْءٌ كَانَ لَهُ حِلٌّ. [خ١٦٩٩ (١٦٩٦)/ م١٣٢١]

---

[1] "ذي الحليفة" چواردە کیلۆمەتر لە مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دوورە و میقاتی ئەهلی مەدینەیە بۆ بەستنی ئیحرام و دوورترین میقاتە لە مەککەوە-و.

[2] شوێنێکە.

[3] "لبيك اللهم لبيك"ی دەست پێ کرد-و.

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ملوانکەی هەدی پێغەمبەرم(ﷺ) پچڕاند، پاشان نیشانەی کرد و شتی پیاهەڵواسی، یان شتم پیاهەڵواسی، پاشان ڕەوانەی بەیتی کرد، لە مەدینە مایەوە، شتێکی لەسەر حەرام نەکرا پێشتر بۆی حەڵاڵ بووبێت.

- وفي رواية لهما: ثُمَّ قَلَّدَهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِيَدِيه، ثُمَّ بَعَثَ بِهَا مَعَ أَبِي. [خ٢٣١٧]

لە ریوایەتێکی هەردووکیان: پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە هەردوو دەستی شتی پیاهەڵواسی و پاشان بە باوکمدا ڕەوانەی کرد.

## ١٣- دەروازەی: چی بە هەدی دەکرێت گەر پەکی بکەوێت

**١٩٣٢-** (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ ذُؤَيْباً أَبَا قَبِيصَةَ حَدَّثَهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَبْعَثُ مَعَهُ بِالْبُدْنِ، ثُمَّ يَقُولُ: **(إِنْ عَطِبَ مِنْهَا شَيْءٌ، فَخَشِيتَ عَلَيْهِ مَوْتاً، فَانْحَرْهَا. ثُمَّ اغْمِسْ نَعْلَهَا فِي دَمِهَا، ثُمَّ اضْرِبْ بِهِ صَفْحَتَهَا، وَلاَ تَطْعَمْهَا أَنْتَ وَلاَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ رُفْقَتِكَ)**. [م١٣٢٦]

(م) لە ئیبن عەباسەوە: زوئەیب، ئەبو قوبەیصە بۆی باس کردووە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) حوشتری دابەستەی بەودا ڕەوانە دەکرد و دەیفەرموو: **(گەر یەکێك لەوانە پەکیکەوت و ترسی مردنت لێی هەبوو سەریبڕە، پاشان نەعلەکەی[1] لە خوێنەکە هەڵبژەنە، پاشان بیکێشە بە لاتەنیشتی حوشترەکەدا، نە تۆ و نە هیچ کەس لە هاوەڵانت لێی نەخۆن)**.

## ١٤- دەروازەی: دروستی سواربوونی پشتی حوشتری هەدیەکراو بە بەیت

**١٩٣٣-** (م) عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بنَ عَبْدِ اللهِ سُئِلَ عَنْ رُكُوبِ الْهَدْيِ؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(ارْكَبْهَا بِالْمَعْرُوفِ إِذَا أُلْجِئْتَ إِلَيْهَا، حَتَّى تَجِدَ ظَهْراً)**. [م١٣٢٤]

---

[1] ئەو نەعلەی بە حوشترەکەدا هەڵواسراوە وەك نیشانەکردنی گیانداری هەدی ماڵی خودا-و.

(م) لە ئەبی زوبەیرەوە، وتی: گوێم لە جابری کوڕی عەبدوڵا بوو، پرسیاری سواربوونی هەدی لێکرا؟ وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: **(بە چاکە سواریە، گەر ناچاربووی بە سواربوون، تا وڵاخێکی سواری دەبینییەوە)**.

## ١٥- دەروازەی: دەستکردن بە تەلبییە (ئیحرام)

**١٩٣٤-** (خ) عَنْ جَابِرِ بنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: أَنَّ إِهْلاَلَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ ذِي الحُلَيْفَةِ، حِينَ اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ. [خ١٥١٥]

**(خ) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوا لێی رازی بێت): ئیحرام بەستنی پێغەمبەر(ﷺ) لە "ذي الحُلَيْفَة"[1] بوو، کاتێ وڵاخی سوارییەکەی راستدەبوویەوە و بەرزی دەکردەوە.**

**١٩٣٥-** (خ) عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما: إِذَا أَرَادَ الخُرُوجَ إِلَى مَكَّةَ ادَّهَنَ بِدُهْنٍ لَيْسَ لَهُ رَائِحَةٌ طَيِّبَةٌ، ثُمَّ يَأْتِي مَسْجِدَ ذِي الْحُلَيْفَةِ فَيُصَلِّي، ثُمَّ يَرْكَبُ، وَإِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ قَائِمَةً أَحْرَمَ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَفْعَلُ. [خ١٥٥٤ (١٥٥٣)]

**(خ) لە نافیعەوە، وتی: گەر ئیبن عومەر(خوایان لێ رازی بێت) بیویستبا دەرچێت بۆ مەککە، بە رۆنێك خۆی دەهەنوو بۆنی خۆشی نەبوو[2]، پاشان دەهات بۆ مزگەوتی "ذي الحُلَيْفَة"[3] و نوێژی دەکرد، پاشان سوار دەبوو، کاتێ وڵاخی سوارییەکەی راستدەبوویەوە و بەرزی دەکردەوە ئیحرامی دەبەست، پاشان دەیوت: پێغەمبەرم(ﷺ) بەم جۆرە بینی ئەنجامی دەدا.**

---

[1] "ذي الحليفة" چواردە کیلۆمەتر لە مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دوورە و میقاتی ئەهلی مەدینەیە بۆ بەستنی ئیحرام و دوورترین میقاتە لە مەککەوە–و.

[2] واتە: بێ بۆن بوو–و.

[3] سەیری پەراوێزی ژمارە یەك بکە.

١٩٣٦- (خ) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَنَحْنُ مَعَهُ، بِالمدِينَةِ الظُّهْرَ أَرْبَعاً، وَالْعَصْرَ بِذِي الحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ بَاتَ بِهَا حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ رَكِبَ حَتَّى اسْتَوَتْ بِهِ عَلَى الْبَيْدَاءِ، حَمِدَ اللهَ وَسَبَّحَ وَكَبَّرَ، ثُمَّ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ، وَأَهَلَّ النَّاسُ بِهِمَا، فَلَمَّا قَدِمْنَا، أَمَرَ النَّاسَ فَحَلُّوا، حَتَّى كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ أَهَلُّوا بالحَجِّ. قَالَ: وَنَحَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بَدَنَاتٍ بِيَدِهِ قِيَاماً، وَذَبَحَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالمدِينَةِ كَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ. [خ١٥٥١ (١٠٨٩)]

**(خ) لە ئەنەسەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین لە مەدینە چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆی کرد و لە "ذي الحليفة "[1] نوێژی عەصری بە دوو ڕکات کرد، پاشان تیایدا مایەوە تا ڕۆژی لێبوویەوە، پاشان سوار بوو تا بە سواری گەیشتە "البيداء"، حەمدی خودای کرد و تەسبیحی کرد و تەکبیری لێدا، پاشان دەستی کرد بە حەج و عومرە، خەڵکیش دەستیان کرد بە حەج و عومرە، کاتێك گەیشتینە بەرەوە فەرمانی کرد بە خەڵك ئیحرام بشکێنن تا ڕۆژی "التروية" دەستیان کردەوە بە حەج، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) چەند حوشترێکی دابەستەی بە پێوە سەربڕی، لە مەدینەش پێغەمبەری خودا دوو بەرانیی مارۆی سەربڕی.**

## ١٦- دەروازەی: تەلبییە

١٩٣٧- (خ) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: إِنِّي لأَعْلَمُ كَيْفَ كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُلَبِّي: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ). [خ١٥٥٠]

**(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: من دەزانم چۆن پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەلبییەی دەکرد: (لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، إن الحمد والنعمة لك).**

---

[1] "ذي الحليفة" چواردە کیلۆمەتر لە مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دوورە و میقاتی ئەهلی مەدینەیە بۆ بەستنی ئیحرام و دوورترین میقاتە لە مەککەوە-و.

**١٩٣٨–** عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**جَاءَنِي جِبْرِيلُ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! مُرْ أَصْحَابَكَ فَلْيَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّلْبِيَةِ، فَإِنَّهَا مِنْ شِعَارِ الْحَجِّ**). [جه٢٩٢٣]

* صحيح.

**لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (جیبریل هات بۆ لام و فەرمووی: ئەی محەمەد، فەرمان بە هاوەڵانت بکە دەنگی خۆیان بە تەلبییە بەرز بکەنەوە، چونکە ئەوە لە دروشمی حەجە).**

## ١٧- دەروازەی: تەمەتوع(یەکێك لە ڕووەکانی ئیحرام)

**١٩٣٩–** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَأَهْلَلْنَا بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيُهِلَّ بالْحَجِّ مَعَ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ لاَ يَحِلَّ حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعاً**). فَقَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنَا حَائِضٌ، وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ، فَشَكَوْتُ ذلِكَ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**انْقُضِي رَأْسَكِ، وَامْتَشِطِي، وَأَهْلِي بِالحَجِّ، وَدَعِي الْعُمْرَةَ**). ففَعَلْتُ، فَلَمَّا قَضَيْنَا الحَجَّ، أَرْسَلَنِي النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مَعَ عَبْدِ الرحمنِ بنِ أَبِي بَكْرٍ إِلَى التَّنْعِيمِ، فَاعْتَمَرْتُ، فَقَالَ: (**هذِهِ مَكَانَ عُمْرَتِكِ**).

قَالَتْ: فَطَافَ الَّذِينَ كَانُوا أَهَلُّوا بِالْعُمْرَةِ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ ثُمَّ حَلُّوا، ثُمَّ طَافُوا طَوَافاً وَاحِداً بَعْدَ أَنْ رَجَعُوا مِنْ مِنى، وأَمَّا الَّذِينَ جَمَعُوا الحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَإِنَّمَا طَافُوا طَوَافاً وَاحِداً.

[خ١٥٥٦ (٢٩٤)/ م١٢١١]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)–هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)– وتی: لە حەجی ماڵئاوایی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتین، بە عومرە دەستمان پێکرد، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس هەدی لەگەڵە با بە حەج لەگەڵ عومرە دەست پێ بکات، پاشان ئیحرام ناشکێنێت تا لە هەردووکیان تەواو دەبێت)، هاتم بۆ مەککە و من لە حەیزدا بووم، تەوافی بەیتم نەکرد، هەر بەو جۆرە نێوان صەفا و مەروە،**

سکاڵای ئەوەم بردە لای پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: **(سەرت بکەرەوە**[1] **و شانەی بکە، و دەست بە حەج بکە و واز لە عومرە بهێنە)**، منیش ئەوەم ئەنجامدا، کاتێ حەجمان تەواو کرد، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ عبدالرحمانی کوڕی ئەبی بەکر ناردمی بۆ "التنعیم" و عەمرەم کرد، و فەرمووی: **(ئەمە جێگەی عومرەکەتە)**.

وتی: ئەوانەی بە عومرە دەستیان پێکرد بوو تەوافی بەیتیان کرد، هەروەها نێوان صەفا و مەروە و پاشان ئیحرامیان شکاند، پاشان تەنها یەك تەوافیان ئەنجامدا لەدوای گەڕانەوە لە مینا، بەڵام ئەوانەی حەج و عومرەیان کۆکردبووەوە تەنها یەك تەوافیان کرد.

- وفي رواية لهما: وأهلَّ رسول الله صلّى الله عليه وسلّم بالحَجِّ. [خ١٥٦٢]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە حەج دەستی پێکرد.**

- وفي رواية لهما أيضاً: قَالَتْ: خَرَجْنَا مُوَافِينَ لِهِلاَلِ ذِي الْحِجَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ فَلْيُهْلِلْ، فَإِنِّي لَوْلاَ أَنِّي أَهْدَيْتُ لأَهْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ)**. فَأَهَلَّ بَعْضُهُمْ بِعُمْرَةٍ، وَأَهَلَّ بَعْضُهُمْ بِحَجٍّ. [خ٣١٧]

**لە ریوایەتێکی تری هەردووکیان: عائیشە وتی: تەبا لەگەڵ مانگی یەکشەوەی زیلحەجە دەرچووین، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس پێیخۆشە بە عومرە دەست پێ بکات با دەست پێ بکات، چونکە گەر من هەدیم پێشکەش نەکردبایە بە عومرە دەستم پێ دەکرد)، بۆیە هەندێکیان بە عومرە دەستیان پێکرد و هەندێکی تریان بە حەج دەستیان پێ کرد.**

**١٩٤٠**– (ق) عَنْ عَطَاءٍ: سَمِعْتُ جَابِرَ بنَ عَبْدِ اللهِ فِي أُنَاسٍ مَعَهُ قَالَ: أَهْلَلْنَا أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي الحَجِّ خَالِصاً لَيْسَ مَعَهُ عُمْرَةٌ. قَالَ عَطَاءٌ: قالَ جَابِرٌ: فَقَدِمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم صُبْحَ رَابِعَةٍ مَضَتْ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ، فَلَمَّا قَدِمْنَا أَمَرَنَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ نَحِلَّ، وَقَالَ: (أَحِلُّوا، وَأَصِيبُوا مِنَ النِّسَاءِ). قَالَ عَطَاءٌ: قَالَ جَابِرٌ: وَلَمْ يَعْزِمْ عَلَيْهِمْ، وَلكِنْ أَحَلَّهُنَّ لَهُمْ.

---

[1] واتە: کردنەوەی پەلکە و شانەکردنی –و.

فَبَلَغَهُ أَنَّا نَقُولُ: لَمَّا لَمْ يَكُنْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ عَرَفَةَ إِلاَّ خَمْسٌ، أَمَرَنَا أَنْ نَحِلَّ إِلَى نِسَائِنَا، فَنَأْتِي عَرَفَةَ تَقْطُرُ مَذَاكِيرُنَا الْمَنِيَّ، قَالَ: وَيَقُولُ جَابِرٌ بِيَدِهِ هكَذَا، وَحَرَّكَهَا.

فَقَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**قَدْ عَلِمْتُمْ أَنِّي أَتْقَاكُمْ للهِ، وَأَصْدَقُكُمْ وَأَبَرُّكُمْ، وَلَوْلاَ هَدْيِي لَحَلَلْتُ كَمَا تَحِلُّونَ؛ فَحِلُّوا، فَلَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ**). فَحَلَلْنَا وَسَمِعْنَا وَأَطَعْنَا. [خ٧٣٦٧ (١٥٥٧)/ م١٢١٦]

**(ق) لە عەتاوە: گوێم لە جابری کوڕی عەبدوڵا بوو لەناو خەڵکانێك لەگەڵی دەیوت: هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە حەجی پاڵفتە دەستمان پێکرد عومرەی لەگەڵ نەبوو، عەتا وتی: جابر وتی: بەیانی ڕۆژی چوارەمی زیلحەجە پێغەمبەر(ﷺ) هات، کاتێ ئێمەش هاتین پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردین ئیحرام بشکێنین و فەرمووی: (ئیحرام بشکێنن و بچنە لای ژنەکانتان)، عەتا وتی: جابر وتی: پێداگری نەکرد لەسەریان، بەڵام بۆی حەڵاڵ کردن.**

**ئەو قسەی پێگەیشتەوە ئێمە دەمانوت: لەبەرئەوەی لە نێوان ئێمە و عەرەفە تەنها پێنج ڕۆژ مابوو بۆیە فەرمانی پێکردین بچینە لای ژنەکانمان، نەوەك بێین بۆ عەرەفە و زەکەرمان مەنی لێبچۆڕێ، وتی: جابر بە دەستی بەم جۆرەی دەکرد، دەستی خۆی جوڵاند.**

**پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستا و فەرمووی: (ئێوە دەزانن من لە هەمووتان بۆ خودا تەقوادارترو ڕاستگۆترو چاکترم، گەر هەدیەکەم نەبوایە ئیحرامم دەشکاند وەك چۆن ئێوە دەیشکێنن، بۆیە ئیحرام بشکێنن، گەر ئەوەی تێپەڕی لە داهاتوو پێشوازیم کردبا هەدیم پێشکەش نەدەکرد)، ئێمەش ئیحرامەمان شکاند و گوێمانگرت و گوێڕایەڵ بووین.**

**١٩٤١**– (ق) عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قالَ: كَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ الْعُمْرَةَ فِي أَشْهُرِ الحَجِّ مِنْ أَفْجَرِ الْفُجُورِ فِي الأَرْضِ، وَيَجْعَلُونَ الْمُحَرَّمَ صَفَراً، وَيَقُولُونَ: إِذَا بَرَا الدَّبَرْ، وَعَفَا الأَثَرْ، وَانْسَلَخَ صَفَرْ، حَلَّتِ العُمْرَةُ لِمَنِ اعْتَمَرَ. قَدِمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَصْحَابُهُ صَبِيحَةَ رَابِعَةٍ مُهِلِّينَ بِالحَجِّ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً، فَتَعَاظَمَ ذلِكَ عِنْدَهُمْ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ الْحِلِّ؟ قَالَ: (**حِلٌّ كُلُّه**). [خ١٥٦٤ (١٠٨٥)/ م١٢٤٠]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: ئەوان[1] پێیانوابوو عومرە لە مانگەکانی حەجدا خراپترین بەدرەفتارییە لە زەوی، موحەڕەمیان دەکرد بە صەفەر، و دەیانوت: "إذا برا الدَّبَرْ، وعفا الأثَرْ، وانْسَلَخَ صَفَرْ، حَلَّتِ العُمرةُ لِمَنِ اعْتَمَرْ"-کە پشتی حوشتر خۆشبوویەوە و ئەسەری پێی سڕایەوە و صەفەر تێپەڕی عومرە حەلاڵە بۆ کەسێك عومرە بکات"، بۆیە فەرمانی پێکردن بیکەن بە عومرە، ئەوەش لای ئەوان گران بوو، بۆیە وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، چ حەلاڵێ؟ فەرمووی: **(هەمووی حەلاڵە)**.

**١٩٤٢-** (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(هَذِهِ عُمْرَةٌ اسْتَمْتَعْنَا بِهَا، فَمَنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ الْهَدْيُ فَلْيَحِلَّ الْحِلَّ كُلَّهُ، فَإِنَّ الْعُمْرَةَ قَدْ دَخَلَتْ فِي الْحَجِّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)**. [م١٢٤١]

(م) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەمە عومرەیەکە خۆشیمان لێوەرگرتووە، هەر کەس هەدی نییە با هەموو حەلاڵێك حەلاڵ بکات، چونکە تا ڕۆژی قیامەت عومرە چووەتە ناو حەج)**.

## ١٨- دەروازەی: دەربارەی "القارن"[2]

**١٩٤٣-** (ق) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما أَرَادَ الحَجَّ عَامَ نَزَلَ الحَجَّاجُ بِابْنِ الزُّبَيْرِ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ النَّاسَ كَائِنٌ بَيْنَهُمْ قِتَالٌ، وَإِنَّا نَخَافُ أَنْ يَصُدُّوكَ، فَقَالَ: ﴿**لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ**﴾[الأحزاب: ٢١] إِذاً أَصْنَعُ كما صَنَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، إِنِّي أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ عُمْرَةً.

ثُمَّ خَرَجَ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِظَاهِرِ الْبَيْدَاءِ، قَالَ: ما شَأْنُ الحَجِّ وَالْعُمْرَةِ إِلاَّ وَاحِدٌ، أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ حَجّاً مَعَ عُمْرَتِي، وَأَهْدَى هَدْياً اشْتَرَاهُ بِقُدَيْدٍ، وَلَمْ يَزِدْ عَلَى ذلِكَ، فَلَمْ يَنْحَرْ، وَلَمْ

---

[1] ئەوان: واتە عەرەبی سەردەمی نەفامی-و.

[2] "قارن" ئەو کەسەیە ئیحرام دەبەستێت بۆ حەج و عومرە پێکەوە و لە یەك نوسکدا و دەڵێت: "لبيك اللهم عمرة في حجة"-و.

يَحِلَّ مِنْ شيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ، وَلَمْ يَحْلِقْ وَلَمْ يُقَصِّرْ، حَتَّى كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ، فَنَحَرَ وَحَلَقَ، وَرَأَى أَنْ قَدْ قَضى طَوَافَ الحَجِّ وَالْعُمْرَةِ بِطَوَافِهِ الأَوَّلِ. وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما: كَذَلِكَ فَعَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [خ١٦٤٠ (١٦٣٩)/ م١٢٣٠]

(ق) لە نافیعەوە: ئەو ساڵەی حەجاج دابەزی بۆ جەنگ لەگەڵ ئیبن زوبەیر ئیبن عومەر(خوایان لێ ڕازی بێت) ویستی حەج بکات، پێی ترا: خەڵکی جەنگ لە نێوانیان بەرپا بووە ئێمە دەترسین ڕێگریت لێ بکەن، وتی: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[الأحزاب:٢١]، کەوابوو ئەوە ئەنجام دەدەم پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەنجامیدا، من ئێوە دەکەم بە شایەت من عومرەیەکم واجب کردووە.

پاشان دەرچوو تا گەیشتە "ظاهر البیداء"، وتی: کاروباری حەج و عومرە یەکێکە، من ئێوە دەکەم بە شایەت لەگەڵ عومرەکەم حەجێکم واجب کردووە[1]، هەدیەکی پێشکەش کرد کە لە "قدید[2]" کڕی بووی، لەوە زیاتری نەکرد و سەرنەبڕی، لە شتێك لێی حەرام بووبوو نەهاتە دەرەوە، سەری نەتاشی و ریشی کورت نەکردەوە تا ڕۆژی سەربڕین، قوربانی کرد و سەری تاشی و پێیوابوو تەواف حەج و عومرەی بە تەواف یەکەم ئەنجامداوە، ئیبن عومەر(خوایان لێ ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەم جۆرەی کرد.

١٩٤٤- عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَرَنَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَطَافَ لَهُمَا طَوَافاً وَاحِداً. [ت٩٤٧]

* صحيح.

لە جابرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) حەج و عومرەی هاوەڵ کرد و یەك تەواف بۆ هەردووکیان کرد

---

[1] واتە: حەج و عومرەکەی هاوەڵ کرد-و.

[2] "قدید" شوێنێکە ١٥٠ کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە-و.

١٩٤٥– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَمْ يَطُفْ هُوَ وَأَصْحَابُهُ لِعُمْرَتِهِمْ وَحَجَّتِهِمْ، حِينَ قَدِمُوا؛ إِلاَّ طَوَافاً وَاحِداً. [جه٢٩٧٢]

* صحيح.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵا و ئیبن عومەر و ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ)– ئەو و هاوەڵانی– کاتێك هاتن بۆ عومرە و حەجیان تەنها یەك تەوافیان کرد.**

## ١٩- دەروازەی: تەنهاکردنەوە بە حەج و جۆرەکانی نوسك

١٩٤٦– (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: أَهْلَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالْحَجِّ مُفْرَداً.
وَفِي رِوَايَةٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَهَلَّ بِالْحَجِّ مُفْرَداً. [م١٢٣١]

**(م) لە ئیبن عومەرەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەنها بە حەج دەستمان پێکرد، لە ریوایەتێکدا: پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەنها بە حەج دەستی پێکرد.**

١٩٤٧– (م) عَنِ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَفْرَدَ الحَجَّ. [م١٢١١/ ١٢٢]

**(م) لە عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) حەجی تەنها کردەوە.**

- وفي رواية: قَالَتْ: مِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ مُفْرَداً، وَمِنَّا مَنْ قَرَنَ، وَمِنَّا مَنْ تَمَتَّعَ. [م١٢١١/ ١٢٤]

**لە ریوایەتێکدا: عائیشە وتی: هەمانبوو تەنها بە حەج دەستی پێکرد، هەمانبوو هاوملی دەکرد، هەمانبوو تەمەتوعی دەکرد.**

١٩٤٨– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِلْحَجِّ عَلَى أَنْوَاعٍ ثَلاثَةٍ: فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ مَعاً، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ مُفْرَدٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ مُفْرَدَةٍ، فَمَنْ كَانَ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ مَعاً، لَمْ يَحْلِلْ مِنْ شَيْءٍ مِمَّا حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى يَقْضِيَ مَنَاسِكَ الْحَجِّ، وَمَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ مُفْرَداً، لَمْ يَحْلِلْ مِنْ شَيْءٍ مِمَّا حَرُمَ مِنْهُ، حَتَّى يَقْضِيَ مَنَاسِكَ الْحَجِّ، وَمَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ مُفْرَدَةٍ فَطَافَ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، حَلَّ مَا حَرُمَ عَنْهُ، حَتَّى يَسْتَقْبِلَ حَجّاً. [جه٣٠٧٥]

* حسن الإسناد.

لە عائیشەوە: بە سێ جۆر لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشتین بۆ حەج: هەمانبوو بە حەج و عەمرە پێکەوە دەستی پێکرد، هەمانبوو تەنها بە حەج دەستی پێکرد، هەمانبوو تەنها بە عومرە دەستی پێکرد، ئەوەی بە حەج و عەمرە پێکەوە دەستی پێکرد بوو شتێك لەوەی لێی حەرام بوو حەڵاڵی نەکرد تا مەناسیکی حەجی تەواو کرد، ئەو کەسەی تەنها بە عومرە دەستی پێکرد بوو تەوافی بەیتی کرد و صەفا و مەروەی کرد، ئەوەی لێی حەرام بووبوو بۆی حەڵاڵ بوو تا روو لە حەج دەکات.

## ٢٠- دەروازەی: واجبوونی خوێن لەسەر "المتمتع[١]"

**١٩٤٩-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: تَمَتَّعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم في حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الحَجِّ، وَأَهْدَى، فَسَاقَ مَعَه الهَدْيَ مِنْ ذِي الحُلَيْفَةِ، وَبَدأَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ، ثُمَّ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، فَتَمَتَّعَ النَّاسُ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِالْعُمْرَةِ إِلَى الحجِّ، فَكَانَ مِنَ النَّاسِ مَنْ أَهْدَى فَسَاقَ الْهَدْيَ، وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ يُهْدِ، فَلَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مَكَّةَ، قالَ لِلنَّاسِ: **(مَنْ كَانَ مِنْكُمْ أَهْدَى، فَإِنَّهُ لا يَحِلُّ لشَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ، حَتَّى يَقْضِيَ حَجَّهُ، وَمَنْ لَمْ يكنْ مِنكُمْ أَهْدَى؛ فَلْيَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَبِالصَّفَا وَالمَرْوَةِ، وَلْيُقَصِّرْ وَلْيَحْلِلْ، ثُمَّ لِيُهِلَّ بِالحَجِّ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ هَدْياً؛ فَلْيَصُمْ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ فِي الحجِّ وَسَبْعَةً إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ)**. [خ١٦٩١/ م١٢٢٧]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: لە حەجی ماڵئاوایی پێغەمبەری خودا تەمەتوعی کرد بە عومرە تا حەج، و هەدی پێشکەش کرد، لە "ذي الحُلَيْفَة"[٢]ەوە هەدیەکانی لەگەڵ خۆی دایەبەر، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی بە عومرە کرد تا حەج، لە خەڵك کەسانێك هەبوون هەدییان پێشکەش کرد و هەدییەکەیان دایەبەر، هەیانبوو هەدیان پێشکەش نەکرد، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ مەککە بە خەڵکی فەرموو: (هەر

---

[١] ئەو کەسەی لە مانگەکانی حەرامدا بۆ عومرە ئیحرام دەبەستێت و پاشان ئیحرام دەشکێنێ و پاشان بۆ حەج ئیحرام دەبەستێت-و.

[٢] "ذي الحليفة" چواردە کیلۆمەتر لە مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دوورە و میقاتی ئەهلی مەدینەیە بۆ بەستنی ئیحرام و دوورترین میقاتە لە مەککەوە-و.

**کەس هەدی پێشکەش کردووە شتێك لەوەی لێی حەرامکراوە بۆی حەڵاڵ نییە تا حەجەکەی تەواو دەکات، هەر کەس لە ئێوە هەدی پێشکەش نەکردووە با تەوافی بەیت بکات، هەروەها صەفا و مەروە بکات و سەر و ریش کورتبکاتەوە و ئیحرام بشکێنێت، یان با دەست بە حەج کردن بکات، هەر کەس هەدی نەبینییەوە با سێ ڕۆژ لە حەج بەڕۆژوو بێت و حەوت ڕۆژیش کاتێ دەگەڕێتەوە بۆ لای خانەوادەکەی).**

## ٢١- دەروازەی: تەوافی "القدوم[١]" و دوو رکاتەکەی تەواف

**١٩٥٠-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا طَافَ بِالْبَيْتِ الطَّوَافَ الأَوَّلَ، يَخُبُّ ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ، وَيَمْشِي أَرْبَعَةً، وَأَنَّهُ كَانَ يَسْعى بَطْنَ المَسِيلِ، إِذَا طَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ. [خ١٦١٧ (١٦٠٣)/ م١٢٦١]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) تەوافی یەکەمی بەیتی دەکرد سێ تەوافیان تەکانی دەدا[٢] و چواریان ئاسایی دەڕۆیشت، ئەو گەر تەوافی صەفا و مەروەی بکردبایە لە ناوەڕاستیان[٣] تەکانی دەدا(نەرمە راکردنی دەکرد).**

- وفي رواية لهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا طَافَ فِي الحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ، أَوَّلَ مَا يَقْدَمُ: سَعى ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ، وَمَشى أَرْبَعَةً، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ يَطُوفُ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ. [خ١٦١٦]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ تەوافی حەج یان عومرەی دەکرد، یەکەمجار کە دەهات: سێ سوڕانەوە تەکانی دەدا و چوار سوڕانەوە ئاسایی دەڕۆیشت، پاشان دوو سوژدەی دەبرد[٤]، و پاشان تەوافی صەفا و مەروەی دەکرد.**

---

[١] "طواف القدوم" ئەو کەسەی دێت بۆ مەککەی موشەڕەف و دەگاتە مەسجیدولحەرام هەڵدەستێك بە حەوت جار تەواف بە دەوری کەعبەدا-و.

[٢] واتە: سێ سوڕانەوەی یەکەم بە دەوری کەعبەدا-و.

[٣] واتە: لە ناوەڕاستی گردی صەفا و گردی مەروە-و.

[٤] واتە: دوو رکات نوێژی دەکرد-و.

**١٩٥١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَصْحَابَهُ اعْتَمَرُوا مِنَ الْجِعْرَانَةِ، فَرَمَلُوا بِالْبَيْتِ، وَجَعَلُوا أَرْدِيَتَهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ، قَدْ قَذَفُوهَا عَلَى عَوَاتِقِهِم الْيُسْرَى. [د١٨٨٤]

**لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هاوەڵانی لە "الجِعْرانَة"[1] دەستیان بە عومرە کرد، لە تەوافی بەیت تەکانیان بە خۆیان دا، پۆشاکی ئیحرامیان خستبووە بنباڵیان و هەڵیاندابوو بۆ سەر شانی چەپیان.**

- وفي رواية: فَرَمَلُوا بِالْبَيْتِ ثَلاَثاً، وَمَشَوْا أَرْبَعاً. [د١٨٩٠]

* صحيح.

**لە ریوایەتێکدا: سێ جار تەکانیان دا بە دەوری بەیتدا، و چوار جاریش رۆیشتنی ئاسایی.**

**١٩٥٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ السَّائِبِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ مَا بَيْنَ الرُّكْنَيْنِ: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾[البقرة:٢٠١]. [د١٨٩٢]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی سائیبەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو لە نێوان دوو روکنەکە[2] دەیفەرموو: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾[البقرة:٢٠١].**

**١٩٥٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ الله قَالَ: لَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ طَوَافِ الْبَيْتِ، أَتَى مَقَامَ إِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا مَقَامُ أَبِينَا إِبْرَاهِيمَ الَّذِي قَالَ اللهُ سُبْحَانَهُ: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ [البقرة:١٢٥]. [جه٢٩٦٠]

* صحيح.

---

[1] "الجعرانة" بە دووری ٢٠ کیلۆمەتر لە باکووری خۆرهەڵاتی مەککەوەیە-و.

[2] واتە: روکنی یەمانی و روکنی بەردە رەشەکە-و.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە تەواف بەیت لێبوویەوە، هات بۆ لای مەقامی ئیبراهیم، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەمە مەقامی باوکمان ئیبراهیمە کە خودا(سبحانە وتعالى) دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ﴾ [البقرة:١٢٥].

**١٩٥٤**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَمَلَ ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ مِنَ الْحَجَرِ إِلَى الْحَجَرِ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ عَادَ إِلَى الْحَجَرِ، ثُمَّ ذَهَبَ إِلَى زَمْزَمَ فَشَرِبَ مِنْهَا وَصَبَّ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ رَجَعَ فَاسْتَلَمَ الرُّكْنَ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الصَّفَا، فَقَالَ: (**ابْدَؤوا بِمَا بَدَأَ اللهُ عزّ وجل بِهِ**).

* إسناده صحيح على شرط مسلم. [حم١٥٢٤٣]

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەر(ﷺ) سێ خولی تەواف[1] لە بەردەکەوە بۆ بەردەکە تەکانی دا، و دوو رکات نوێژی کرد[2]، پاشان گەڕایەوە بۆ لای بەردەکە، پاشان رۆیشت بۆ لای زەمزەم و لێی خواردەوە و ئاوی لێکرد بەسەر خۆدا، پاشان گەڕایەوە بۆ روکن و دەستی بە بەردەکەدا هێنا، پاشان گەڕایەوە بۆ صەفا و فەرمووی: (**بەوە دەست پێ بکەن خودا(عز وجل) دەستی پێکردووە**[3]).

**١٩٥٥**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم طَافَ بِالْبَيْتِ فَرَمَلَ مِنَ الْحَجَرِ الأَسْوَدِ ثَلاَثاً، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ قَرَأَ فِيهِمَا: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ①﴾ و﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ①﴾. [هق٥/٩١]

---

[1] واتە: سێ خولی یەکەمی تەواف–و.

[2] واتە: پاشان چوار خولی تر بەدوای سێ خولەکەدا بە رۆیشتنی ئاسایی ئاسایی تەوافی کرد، ئەوجا دوو رکات نوێژی کرد–و.

[3] مەبەستەکە ئەوەیە خودا لە ئایەتەکەدا بە (صەفا) دەستی پێکردووە ئێوەش لە تەوافی صەفا و مەروە لە صەفاوە دەست پێ بکەن: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ﴾[البقرة:١٥٨]–و.

له جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەوافی بەیتی کرد لە بەردە ڕەشەکەوە سێ جار تەکانی دا، پاشان دوو ڕکاتی کرد و تیایاندا: (﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾)ی خوێند.

## ٢٢- دەروازەی: دەستهێنان بە بەردەکەدا و ماچکردنی

**١٩٥٦-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: لَمْ أَرَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَسْتَلِمُ مِنَ الْبَيْتِ؛ إلاَّ الرُّكْنَيْنِ الْيَمَانِيَيْنِ. [خ١٦٠٩ (١٦٦)/ م١٢٦٧]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: نەمبینیوە پێغەمبەر(ﷺ) دەستبهێنێت بە بەیتدا جگە لە دوو ڕوکنە یەمانییەکە[1].

- وفي رواية لهما: قَالَ: ما تَرَكْتُ اسْتِلاَمَ هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ، فِي شِدَّةٍ وَلاَ رَخَاءٍ، مُنْذُ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَسْتَلِمُهُمَا. [خ١٦٠٦/ م١٢٦٨]

لە ڕیوایەتێکی هەردووکیان، وتی: لەو کاتەوەی بینیومە پێغەمبەر(ﷺ) دەستی بەم دوو ڕوکنەدا هێناوە لە تەنگانە و فەرعانە[2] دەستهێنانم بەم دوو ڕوکنەدا وازلێنەهێناوە.

- وفي رواية للبخاري: قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنِ اسْتِلاَمِ الحَجَرِ، فَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَسْتَلِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ. قالَ: قُلْتُ: أَرَأَيْتَ إِنْ زُحِمْتُ، أَرَأَيْتَ إِنْ غُلِبْتُ؟ قَالَ: اجْعَلْ أَرَأَيْتَ بِالْيَمَنِ، رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَسْتَلِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ. [خ١٦١١]

لە ڕیوایەتێکی بوخاریدا: وتی: پیاوێك دەربارەی دەستهێنان بە بەردەکەدا لە ئیبن عومەر(خوایان لێ ڕازی بێت) پرسیاری کرد، ئەویش وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی دەستی بە بەردەکەدا دەهێنا و ماچی دەکرد، وتی: وتم: ئەی ئەگەر بە

---

[1] واتە: ڕوکنی یەمانی و ڕوکنی بەردە ڕەشەکە-و.

[2] واتە: لە قەرەباڵغی و لە چۆڵیدا-و.

قەرەباڵغی تەنگەتاو کرام، ئەی ئەگەر ژێرکەوتم؟ وتی: "ئەی ئەگەر" لە یەمەن دابنێ، من پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی دەستی بە بەردەکەدا دەهێنا و ماچی دەکرد.

- ولمسلم: قَالَ نَافِعٌ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَبَّلَ يَدَهُ...

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: نافیع وتی: ئیبن عومەرم بینی دەستی دەهێنا بە بەردەکەدا، پاشان دەستی خۆی ماچ کرد...

**١٩٥٧-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: طَافَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى بَعِيرٍ، يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنٍ. [خ١٦٠٧/ م١٢٧٢]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: لە حەجیماڵئاوایی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر حوشترێك تەواف کرد و بە گۆچانەکەی دەستی بە بەردەکەدا دەهێنا[1].

- وفي رواية للبخاري: أَن رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم طَافَ بِالْبَيْتِ، وَهُوَ عَلَى بَعِيرٍ، كُلَّمَا أَتَى عَلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ فِي يَدِهِ، وَكَبَّرَ. [خ١٦٣٢]

لە ریوایەتێکی بوخاریدا: پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەوافی بەیتی کرد و ئەو لەسەر حوشترێك بوو، هەرکات دەهات بۆ لای روکن بە شتێکی دەستی ئاماژەی بۆ دەکرد و تەکبیری لێ دەدا.

## ٢٣- دەروازەی: کۆشانی نێوان صەفا و مەروە

**١٩٥٨-** (ق) عَنْ عَاصِمِ بْنِ سُلَيْمَانَ الأَحْوَلِ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَكُنْتُمْ تَكْرَهُونَ السَّعْيَ بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ، لِأَنَّهَا كَانَتْ مِنْ شَعَائِرِ الجَاهِلِيَّةِ، حَتَّى أَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۚ﴾ [البقرة:١٥٨]. [خ١٦٤٨/ م١٢٧٨]

---

[1] یان بە گۆچانەکەی ئاماژەی بۆ دەکرد-و.

(ق) لە عاصیمی کوڕی سولەیمانی ئەحوەلەوە، وتی: بە ئەنەسی کوڕی مالیکم(خوا لێی ڕازی بێت) وت: ئایا کۆشانتان لە نێوان صەفا و مەروە لا گران بوو؟ وتی: بەڵێ، چونکە لە دروشمەکانی سەردەمی نەفامی بوو، تا خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ﴾ [البقرة:١٥٨].

**١٩٥٩-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: لَمْ يَطُفِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَلاَ أَصْحَابُهُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ إِلاَّ طَوَافاً وَاحِداً. [م١٢٧٩]

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی تەنها یەك جار تەواف نێوان صەفا و مەروەیان کرد[1].

- وزاد في رواية: إلا طوافاً واحداً، طوافه الأول.

لە ڕیوایەتێکدا ئەمە زیاد بووە: جگە لە یەك تەواف، تەوافی یەکەمی.

**١٩٦٠-** عَنْ كَثِيرِ بْنِ جُمْهَانَ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنِّي أَرَاكَ تَمْشِي وَالنَّاسُ يَسْعَوْنَ، قَالَ: إِنْ أَمْشِ فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَمْشِي، وَإِنْ أَسْعَ فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَسْعَى، وَأَنَا شَيْخٌ كَبِيرٌ.

* صحيح. [د١٩٠٤/ ت٨٦٤/ ن٢٩٧٦/ جه٢٩٨٨]

لە کەسیری کوڕی جومهانەوە: لە نێوان صەفا و مەروە پیاوێك بە عەبدوڵای کوڕی عومەری وت: ئەی باوکی عبدالرحمن، من دەبینم تۆ بە ڕۆیشتنی ئاسایی دەڕۆی و

---

[1] چونکە لە حەجیماڵئاوایی پێغەمبەر(ﷺ) و هەندێ لە هاوەڵانی حەج و عومرەیان کۆکردبووەوە و هەدیان لەگەڵ خۆیان هێنا بوو بۆ ماڵی خودا، بۆیە یەك سەعیان کرد لە نێوان صەفا و مەروە، ئەوەش بریتی بوو لەو سەعیەی لەگەڵ تەوافی قدومدایە، ئەوانەی تەمەتوعیان کرد بە عومرە دوو سەعی(کۆشانیان) لەسەرە، سەعیەك بۆ عومرەکەیان و سەعیەك بۆ حەجەکەیان ڕۆژی قوربان-و.

خەڵکی تەکان دەدەن، وتی: گەر بە ڕۆیشتنی ئاسایی بڕۆم پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی بە ڕۆیشتنی ئاسایی دەڕۆیشت، گەر تەکان بدەم پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی تەکانی دەدا، من پیرێکی بەتەمەنم

**١٩٦١**– عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ، عَنِ امْرَأَةٍ قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَسْعَى فِي بَطْنِ الْمَسِيلِ، وَيَقُولُ: (**لاَ يُقْطَعُ الْوَادِي إِلاَّ شَدّاً**). [ن٢٩٨٠]

* صحيح.

**لە صەفییەی کچی شەیبەوە، لە ئافرەتێکەوە وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی لە ناوەڕاستی دوو گردەکە دەیفەرموو: (تەنها بە تەکان شیوەکە[1] دەبڕێت).**

**١٩٦٢**– عَنْ نَافِعٍ: أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ وَهُوَ عَلَى الصَّفَا يَدْعُو يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنَّكَ قُلْتَ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ، وَإِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ، وَإِنِّي أَسْأَلُكَ كَمَا هَدَيْتَنِي لِلإِسْلاَمِ أَنْ لاَ تَنْزِعَهُ مِنِّي حَتَّى تَتَوَفَّانِي وَأَنَا مُسْلِمٌ. [ط٨٣٧]

* إسناده صحيح.

**لە نافیعەوە: ئەو گوێی لە عەبدوڵای کوڕی عومەر بوو لەسەر گردی صەفا دەیوت: خودایە تۆ فەرمووتە: داوام لێ بکەن وەڵامتان دەدەمەوە[2]، تۆ بەڵێنەکانی خۆت ناشکێنی، من داوات لێ دەکەم وەك چۆن هیدایەتی منت دا بۆ ئیسلام لێم وەرنەگریەوە تا دەمرێنی و من موسڵمان بم[3].**

---

[1] ناوەڕاستی نێوان گردی صەفا و گردی مەروە–و.

[2] ئاماژەیە بە ئایەتی: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾[غافر: ٦٠]–و.

[3] واتە: بە موسڵمانی بمرێنە–و.

## ٢٤- دەروازەی: ڕۆژی "التروية[1]"

**١٩٦٣-** (ق) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الثَّقَفِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَساً. وَنَحْنُ غَادِيَانِ مِنْ مِنى إِلَى عَرَفَاتٍ. عَنِ التَّلْبِيَةِ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَ: كَانَ يُلَبِّي الْمُلَبِّي لاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ، وَيُكَبِّرُ الْمُكَبِّرُ فَلاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ. [خ٩٧٠/ م١٢٨٥]

**(ق) لە محەمەدی کوڕی ئەبی بەکری سەقەفییەوە، وتی: دەربارەی "التلبیة[2]" پرسیارم لە ئەنەس کرد-ئێمە لە میناوە دەچووین بۆ عەرەفات-: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چیتان دەکرد؟ وتی: تەلبییەکارێك تەلبییەی دەکرد و بە ناپەسەند لێی نەدەگیرا، تەکبیرکارێك تەکبیری دەکرد و بە ناپەسەند لێی نەدەگیرا.**

**١٩٦٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الظُّهْرَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ وَالْفَجْرَ يَوْمَ عَرَفَةَ بِمِنًى. [د١٩١١/ ت٨٧٩/ جه٣٠٠٤]

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: ڕۆژی تەرویە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی کرد، بەیانی ڕۆژی عەرەفەش لە مینا نوێژی بەیانی کرد[3].**

- وفي رواية للترمذي، وهي رواية ابن ماجه: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِمِنًى: الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ، وَالْفَجْرَ، ثُمَّ غَدَا إِلَى عَرَفَاتٍ.

---

[1] **"یوم الترویة" بریتییە لە ڕۆژی هەشتی زیلحەجە، لەو ڕۆژەدا حاجیان ڕوو لە مینا دەکەن-و.**

[2] **واتە وتنی "لبیك اللهم لبیك"-و.**

[3] **واتە: سوننەتە حاجی بەیانی ڕۆژی تەرویە(هەشتی زیلحەجە) لەگەڵ هەڵهاتنی خۆر بەڕێبکەوێت بۆ مینا، پێغەمبەر نوێژی نیوەڕۆ و عەصر و مەغریب و عیشای لە مینا کردووە، بەیانی ڕۆژی نۆی زیلحەجەش(ڕۆژی عەرەفە) نوێژی بەیانی لە مینا کردووە و لەگەڵ خۆرهەڵهاتن فەرمانی کردووە لە نەمیرە خێمەیەکی لە موو(دەوارێك)ی بۆ هەڵبدەن و بەڕێکەوتووە بۆ عەرەفە-و.**

**لە ریوایەتێکی ترمیزیدا کە ریوایەتێکی ئیبن ماجەیە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆ و عەصر و مەغریب و عیشا و بەیانی لە مینا پێکردین، پاشان بەیانییەکەی رووی لە عەرەفات کرد.**

- وعند الدارمي: صَلَّى بِمِنًى خَمْسَ صَلَوَاتٍ. [مي١٩١٣]

* صحيح.

**لای داریمی: لە مینا پێنج نوێژی کرد.**

**١٩٦٥**– عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَت: قُلتُ: يا رسولَ اللهِ، أَلَا نَبني لك بِمِنًى بَيتًا، أو بِناءً، يُظِلُّكَ من الشمسِ؟ فقال: **(لا، إنَّما هو مُناخُ مَن سبَقَ إليه)**. [د٢٠١٩/ ت٨٨١/ جه٣٠٠٦/ مي١٩٨٠]

* ضعيف، وقال الترمذي: حسن صحيح.

**لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا لە مینا ماڵێك یان بینایەکت بۆ دروست نەکەین لە خۆر سێبەرت بۆ بکات؟ فەرمووی: (نەخێر، ئەوە هەوارگەی ئەو کەسەیە پێشتر دەیگاتێ).**

## ٢٥- دەروازەی: وەستان لە عەرەفە

**١٩٦٦**– (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: كَانَتْ قُرَيْشٌ وَمَنْ دَانَ دِينَهَا يَقِفُونَ بِالمُزْدَلِفَةِ، وَكَانُوا يُسَمَّوْنَ الحُمْسَ، وَكَانَ سَائِرُ الْعَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَاتٍ، فَلَمَّا جَاءَ الإِسْلَامُ، أَمَرَ اللهُ نَبِيَّهُ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَأْتِيَ عَرَفَاتٍ، ثُمَّ يَقِفَ بِهَا، ثُمَّ يُفِيضَ مِنْهَا، فَذلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿**ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ**﴾[البقرة:١٩٩]. [خ٤٥٢٠/ م١٢١٩]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): قورەیش و ئەوانەی لەسەر دینی قورەیش بوون لە موزدەلیفە دەوەستان بە "الحُمْس" ناودەبران، عەرەبەکانی تر لە عەرەفات دەوەستان، کاتێك ئیسلام هات خودا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کرد بێت بۆ عەرەفات و پاشان تیایدا بوەستێت، پاشان لێیەوە شۆڕببێتەوە، ئەوەش بریتییە لە فەرموودەی خودا(سبحانه وتعالی): ﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ﴾[البقرة:١٩٩].**

**١٩٦٧-** (م) عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(نَحَرْتُ هَاهُنَا، وَمِنى كُلُّهَا مَنْحَرٌ، فَانْحَرُوا فِي رِحَالِكُمْ. وَوَقَفْتُ هَاهُنَا، وَعَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ. وَوَقَفْتُ هَاهُنَا، وَجَمْعٌ كُلُّهَا مَوْقِفٌ)**. [م١٢١٨/ (١٤٩)]

(م) لە جابرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لێرە سەرمبڕی، مینا هەمووی جێسەربڕینە، لای کۆڵ و بارەکانتان سەرببڕن، لێرەدا وەستام، عەرەفە هەمووی جێوەستانە، لێرەدا وەستام "جمع"[1] هەمووی جێوەستانە)**.

**١٩٦٨-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ الطَّائِيِّ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالْمَوْقِفِ ـ يَعْنِي: بِجَمْعٍ ـ قُلْتُ: جِئْتُ يَا رَسُولَ اللهِ مِنْ جَبَلِ طَيِّئٍ، أَكْلَلْتُ مَطِيَّتِي، وَأَتْعَبْتُ نَفْسِي، وَاللهِ مَا تَرَكْتُ مِنْ حَبْلٍ إِلاَّ وَقَفْتُ عَلَيْهِ، فَهَلْ لِي مِنْ حَجٍّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ أَدْرَكَ مَعَنَا هَذِهِ الصَّلاَةَ، وَأَتَى عَرَفَاتٍ قَبْلَ ذَلِكَ لَيْلاً أَوْ نَهَاراً، فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ وَقَضَى تَفَثَهُ)**.
* صحيح. [د١٩٥٠/ ت٨٩١/ ن٣٠٣٩/ جه٣٠١٦/ مي١٨٨]

لە عوروەی کوڕی موزەڕیسەوە، وتی: لە جێوەستان-واتە: لە "جمع" هاتم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، وتم: لە "جبل طيء[2]"وە هاتم وڵاخی سوارییەکەم ماندوو کرد و نەفسی خۆم شەکەت کرد، سوێند بە خودا گردێکی ڕەملێنم بەجێنەهێڵاوە لەسەری نەوەستم، ئایا حەجم بۆ هەیە؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لەگەڵمان بەم نوێژە گەیشتبێت و پێشتر شەوەکەی یان ڕۆژەکەی هاتبێت بۆ عەرەفات حەجەکەی تێر و تەواو بووە و چڵك و چەپەڵییەکەی ڕۆیشتووە)**.

**١٩٦٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(خَيْرُ الدُّعَاءِ دُعَاءُ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَخَيْرُ مَا قُلْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّونَ مِنْ قَبْلِي: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)**. [ت٣٥٨٥]
* حسن.

---

[1] واتە: موزدەلیفە.

[2] "جبل طيئ" چیایەکە لە باکووری جەزیرەی عەرەبی-و.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (باشترین دوعا دوعای ڕۆژی عەرەفەیە، باشترینێك من و پێغەمبەرانی پێش من وتبێتمان: "لا إلـه إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير").**

**١٩٧٠**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: اعْلَمُوا أَنَّ عَرَفَةَ كُلَّهَا مَوْقِفٌ؛ إِلاَّ بَطْنَ عُرَنَةَ، وَأَنَّ الْمُزْدَلِفَةَ كُلَّهَا مَوْقِفٌ؛ إِلاَّ بَطْنَ مُحَسِّرٍ. [ط ٨٨٤]

* إسناده صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی زوبەیرەوە، ئەو دەیوت: بزانن هەموو عەرەفە جێوەستانە، جگە لە "بطن عُرْنَة[١]"، هەروەها موزدەلیفە هەمووی جێوەستانە، جگە لە "بطن مُحَسِّر[٢]".**

## ٢٦- دەروازەی: ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە لە عەرەفە

**١٩٧١**– (ق) عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ بِنْتِ الحَارِثِ: أَنَّ نَاسًا اخْتَلَفُوا عِنْدَهَا يَوْمَ عَرَفَةَ فِي صَوْمِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: هُوَ صَائِمٌ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ بِصَائِمٍ، فَأَرْسَلْتُ إِلَيْهِ بِقَدَحِ لَبَنٍ، وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى بَعِيرِهِ، فَشَرِبَهُ. [خ١٦٦١ (١٦٥٨)/ م١١٢٣]

**(ق) لە ئوم فەزڵی کچی حاریسەوە: خەڵکانێك جیاوازییان بۆ دروست بوو لە ڕۆژووی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی عەرەفە لە عەرەفە، هەندێکیان وتیان: ئەو بەڕۆژوو بوو، و هەندێکی تر وتیان: ئەو بەڕۆژوو نەبوو، کوپێ شیرم بۆ ڕەوانە کرد، ئەو لەسەر حوشترەکەی بوو، خواردییەوە.**

## ٢٧- دەروازەی: نوێژ و وتار لە ڕۆژی عەرەفە

**١٩٧٢**– (خ) عَنْ سَالِمٍ قَالَ: كَتَبَ عَبْدُ المَلِكِ إِلَى الحَجَّاجِ: أَنْ لاَ يُخَالِفَ ابْنَ عُمَرَ فِي الحَجِّ، فَجَاءَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ وَأَنَا مَعَهُ يَوْمَ عَرَفَةَ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ، فَصَاحَ عِنْدَ سُرَادِقِ الحَجَّاجِ،

---

[١] "بطن عرنة" یەکێکە لە شیوەکانی مەککە دەکەوێتە خۆرئاوای عەرەفاتەوە—و.

[٢] "بطن محسر" یەکێکە لە شیوەکانی مەککە دەکەوێتە نێوان موزدەلیفە و مینا، بە دۆڵی (محسّر) ناونراوە، چونکە فیلەکانی ئەبرەهەی تێدا وەستان—و.

فَخَرَجَ وَعَلَيْهِ مِلْحَفَةٌ مُعَصْفَرَةٌ، فَقَالَ: مَا لَكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمنِ؟ فَقَالَ: الرَّوَاحَ إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ السُّنَّةَ، قَالَ: هذِهِ السَّاعَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْظِرْنِي حَتَّى أُفِيضَ عَلَى رَأْسِي ثُمَّ أَخْرُجَ. فَنَزَلَ حَتَّى خَرَجَ الحَجَّاجُ، فَسَارَ بَيْنِي وَبَيْنَ أَبِي، فَقُلْتُ: إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ السُّنَّةَ فَاقْصُرِ الخُطْبَةَ وَعَجِّلِ الْوُقُوف. فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَى عَبْدِ اللهِ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ قَالَ: صَدَقَ. [خ١٦٦٠]

**(خ) لە سالمەوە، وتی: عەبدولمەلیك[1] بۆ حەجاجی[2] نووسی: لە حەجدا سەرپێچی نەکات لە ئیبن عومەر، کاتێ خۆر لایدا ئیبن عومەر(خوایان لێ رازی بێت) لە رۆژی عەرەفە هات و منی لەگەڵ بووم، لە گەیشتن بە بارگە و بنەی حەجاج هاواری کرد، حەجاج هاتە دەرەوە و دەرەدامانێکی زەردکراوی لەبەر بوو، وتی: چیتە، ئەی باوکی عبدالرحمن؟ عەبدوڵا وتی: رۆیشتن[3]، گەر سوننەتت دەوێ، وتی: بەم کاتە؟ وتی: بەڵێ، وتی: کەوابوو چاوەڕوانم بە تا ئاو دەکەم بەسەر خۆمدا و پاشان دێمە دەرەوە، عەبدوڵا دابەزی تا حەجاج هاتە دەرەوە، لە نێوان من و باوکم دەرۆیشت، وتم: گەر سوننەتت دەوێ با وتارەکەت کورت بێت و وەستانەکە خێرا بێت، ئەویش تەماشای عەبدوڵای دەکرد، کاتێ عەبدوڵا ئەوەی بینی وتی: راست دەکات.**

**١٩٧٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: سَارَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ، فَوَجَدَ الْقُبَّةَ قَدْ ضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةَ، فَنَزَلَ بِهَا حَتَّى إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ، أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ فَرُحِلَتْ لَهُ، حَتَّى إِذَا انْتَهَى إِلَى بَطْنِ الْوَادِي خَطَبَ النَّاسَ، ثُمَّ أَذَّنَ بِلاَلٌ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئاً. [ن٦٠٣، ٦٥٤]

* صحيح.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) رۆیشت تا گەیشتە عەرەفە، بینی لە "نَمِرَة" خێمەیەکیان بۆ هەڵداوە، تیایدا مایەوە تا خۆر لە**

---

[1] **عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان، خەلیفەی ئومەوی.**

[2] **حەجاجی کوڕی یوسف، والی حیجاز.**

[3] **واتە: کاتی رۆیشتنە.**

ناوەڕاستی ئاسمان لایدا، فەرمانی کرد "القصواء"[1]ی بۆ ئامادە بکەن و بۆی ئامادە کرا، تا گەیشتە تەختی دۆڵەکە وتاری بۆ خەڵك دا، پاشان بیلال بانگی دا، پاشان قامەتی کرد و نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان قامەتی کرد و نوێژی عەصری کرد، لە نێوان ئەو دوو نوێژە هیچ نوێژێکی نەکرد.

## ٢٨- دەروازەی: شۆڕبوونەوە لە عەرەفاتەوە

١٩٧٤- (ق) عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عن أَبِيه أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ أُسَامَةُ وَأَنَا جَالِسٌ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَسِيرُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ حِينَ دَفَعَ؟ قَالَ: كَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ، فَإِذَا وَجَدَ فَجْوَةً نَصَّ.

قَالَ هِشَامٌ: وَالنَّصُّ فَوْقَ الْعَنَقِ. [خ١٦٦٦/ م١٢٨٦]

(ق) لە هیشامی کوڕی عوروەوە، لە باوکییەوە، ئەو وتی: من دانیشتبووم پرسیار لە ئوسامە کرا: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە حەجیماڵئاوایی چۆن دەڕۆیشت کاتێك پاڵی دەنا، وتی: ڕۆیشتنی مامناوەند(العَنَق) بوو، گەر بۆشییەکی ببینیبایەوە بە خێرایی بۆی دەچوو(نصَّ).

هیشام وتی: "النَّصّ" لەسەرو "العَنَق"ەوەیە[2].

١٩٧٥- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّهُ دَفَعَ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ عَرَفَةَ، فَسَمِعَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَرَاءَهُ زَجْراً شَدِيداً، وَضَرْباً وَصَوْتاً لِلإِبِلِ، فَأَشَارَ بِسَوْطِهِ إِلَيْهِمْ، وَقَالَ: (أَيُّهَا النَّاسُ، عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ، فَإِنَّ الْبِرَّ لَيْسَ بِالإِيضَاعِ). [خ١٦٧١]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): ئەو لە ڕۆژی عەرەفە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) پاڵیدەنا، پێغەمبەر(ﷺ) لەدوایەوە گوێی لە دەکردنی توند و لێدان و

---

[1] "القصواء" بریتی بوو لە حوشترە مێیەکەی پێغەمبەر(ﷺ).

[2] واتە: لە خێرایی ڕۆیشتندا.

دەنگدانی حوشتر بوو، بە قەمچییەکەی ئاماژەی بۆ کردن و فەرمووی: **(ئەی خەڵکینە، ئارامی و لەسەرخۆیی بپارێزن، چاکە بە ڕۆیشتنی خێرا نییە).**

**١٩٧٦-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: جَمَعَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بَيْنَ المَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ، كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا بِإِقَامَةٍ، وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا، وَلاَ عَلَى إِثْرِ كُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا.
[خ١٦٧٣، م١٢٨٨]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە "جمع[1]" مەغریب و عیشای کۆکردەوە، هەریەکەیان بە قامەتێکی سەربەخۆ، لە نێوانیان تەسبیحی نەکرد[2]، لەدوای هەردووکیشیان تەسبیحی نەکرد.**

## ٢٩- دەروازەی: نوێژی بەیانی لە موزدەلیفە و پاڵنان لێیەوە

**١٩٧٧-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى صَلاَةً بِغَيْرِ مِيقَاتِهَا إِلاَّ صَلاَتَيْنِ: جَمَعَ بَيْنَ المَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، وَصَلَّى الْفَجْرَ قَبْلَ مِيقَاتِهَا.
[خ١٦٨٢ (١٦٧٥)/ م١٢٨٩]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) نەبینیوە بەبێ میقاتی خۆی[3] نوێژ بکات جگە لە دوو نوێژ: نوێژی مەغریب و عیشای کۆکردەوە[4]، و نوێژی فەجریش بەر لە میقاتەکەی ئەنجامی دا[5].**

- ولفظ مسلم: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم صَلَّى صَلاَةً إِلاَّ لِمِيقَاتِهَا؛ إِلاَّ صَلاَتَيْنِ: صَلاَةَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ، وَصَلَّى الْفَجْرَ يَوْمَئِذٍ قَبْلَ مِيقَاتِهَا.

---

(١) واتە: موزدەلیفە.

(٢) واتە: نوێژی سوننەتی نەکرد.

(٣) واتە کاتی دیاریکراوی خۆی-و.

(٤) مەغریبی هێنا بۆ لای عیشا-و.

(٥) واتە: لە تاریك و لێڵەی بەرەبەیان.

لەفزەکەی موسلیم: پێغەمبەری خودام(ﷺ) نەبینیوە نوێژێك ئەنجام بدات بەبێ میقاتی خۆی جگە لە دوو نوێژ: نوێژی مەغریب و عیشا بە کۆکردنەوە، ئەو ڕۆژەش نوێژی بەیانی بەر لە میقاتی خۆی ئەنجامدا.

**١٩٧٨-** (خ) عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ قَالَ: شَهِدْتُ عُمَرَ ﷺ صَلَّى بِجَمْعٍ الصُّبْحَ، ثُمَّ وَقَفَ فَقَالَ: إِنَّ المُشْرِكِينَ كَانُوا لاَ يُفِيضُونَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَيَقُولُونَ: أَشْرِقْ ثَبِيرُ، وَأَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم خَالَفَهُمْ، ثُمَّ أَفَاضَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ. [خ١٦٨٤]

(خ) لە عەمری کوڕی مەیموونەوە، وتی: عومەرم بینی لە "جمع[1]" نوێژی بەیانی کرد، پاشان وەستا و وتی: هاوەڵدانەران لێشاویان نەدەهێنا تا خۆر هەڵدەهات، دەیانوت: "أشرِقْ ثبيرُ[2]"، پێغەمبەر(ﷺ) سەرپێچی لەوان کرد و پاشان بەر لە هەڵهاتنی خۆر لێشاوی هێنا.

## ٣٠- دەروازەی: پێشخستنی لاوازان لە موزدەلیفەوە بۆ مینا

**١٩٧٩-** (ق) عَنْ سَالِمٍ قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما يُقَدِّمُ ضَعَفَةَ أَهْلِهِ، فَيَقِفُونَ عِنْدَ المَشْعَرِ الحَرَامِ بِالْمُزْدَلِفَةِ بِلَيْلٍ، فَيَذْكُرُونَ اللهَ مَا بَدَا لَهُمْ، ثُمَّ يَرْجِعُونَ قَبْلَ أَنْ يَقِفَ الإِمَامُ وَقَبْلَ أَنْ يَدْفَعَ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَقْدَمُ مِنىً لِصَلاَةِ الْفَجْرِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَقْدَمُ بَعْدَ ذلِكَ، فَإِذَا قَدِمُوا رَمَوْا الجَمْرَةَ. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما يَقُولُ: أَرْخَصَ فِي أُولئِكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [خ١٦٧٦/ م١٢٩٥]

(ق) لە سالمەوە، وتی: عەبدوڵای کوڕی عومەر(خوایان لێ ڕازی بێت) لاوازانی خانەوادەکەی پێشدەخست لە موزدەلیفە لای "المشعر الحرام" لە مەنزڵەکەی دەوەستان، چەندیان بویستبا یادی خودایان دەکرد، پاشان دەگەڕانەوە بەرلەوەی

[1] واتە: موزدەلیفە.

[2] واتە: ئەی چیای "ثبیر" ڕووناك بەرەوە، مەبەستیان چیای موزدەلیفە بوو لای چەپی ئەو ئەو کەسانەی ڕوو لە مینا دەکەن، ئەوەش مەزنترین چیای مەککەیە-و.

ئیمام بوەستێ و بەرلەوەی پاڵبنێ[(١)]، هەیانبوو بۆ نوێژی بەیانی دەهات بۆ مینا، هەشیانبوو دوای ئەوە دەهات، گەر بهاتنایە بەردەکانیان هەڵدەدا، ئیبن عومەر(خوایان لێ رازی بێت) دەیوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) مۆڵەتی ئەوانەی داوە.

١٩٨٠- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَنَا مِمَّنْ قَدَّمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم ليلة المُزْدَلِفَةِ فِي ضَعَفَةِ أَهْلِهِ. [خ١٦٧٨ (١٦٧٧)/ م١٢٩٣]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: من لەو لاوازانەی خانەوادەکەی بووم پێغەمبەر(ﷺ) شەوی موزدەلیفە پێشیخستن.

## ٣١- دەروازەی: تەلبییە تا هەڵدان(الرمي)

١٩٨١- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ رضي الله عنهما كَانَ رِدْفَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ عَرَفَةَ إِلَى المُزْدَلِفَةِ، ثُمَّ أَرْدَفَ الْفَضْلَ مِنَ المُزْدَلِفَةِ إِلَى مِنىً. قَالَ: فَكِلاَهُمَا قَالاَ: لَمْ يَزَلِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ.
[خ١٥٤٣ و١٥٤٤/ م١٢٨١]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): ئوسامەی کوڕی زەید(خوایان لێ رازی بێت) لە عەرەفەوە بۆ موزدەلیفە لە پاشکۆی پێغەمبەردا(ﷺ) سواربووبوو، پاشان لە موزدەلیفەوە بۆ مینا فەزلی پاشکۆ خست، وتی: هەردووکیان وتیان: بەردەوام پێغەمبەر(ﷺ) تەلبییەی دەکرد تا هەڵدانی بەردی عەقەبە.

## ٣٢- دەروازەی: هەڵدانی بەرد (رمي الجمار)

١٩٨٢- (ق) عَنْ عَبْدِ الرحْمنِ بْنِ يَزِيدَ: أَنَّهُ حَجَّ مَعَ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، فَرَآهُ يَرْمِي الجَمْرَةَ الْكُبْرَى بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، فَجَعَلَ الْبَيْتَ عَنْ يَسَارِهِ، وَمِنىً عَنْ يَمِينِهِ، ثُمَّ قَالَ: هذَا مَقَامُ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ. [خ١٧٤٩ (١٧٤٧)/ م١٢٩٦]

---

(١) مەبەست بە پاڵنان بریتییە لە (دفع) بەهۆی لێشاوی خەڵکەوە-و.

(ق) لە عبدالرحمانی كوڕی یەزیدەوە: لەگەڵ ئیبن مەسعوود(خوا لێی رازی بێت) حەجی كرد، بینی بە حەوت چەو هەڵدانی بەردی گەورەی ئەنجام دا، بەیتی خستە لای چەپییەوە و مینا لای راستییەوە، پاشان وتی: ئەمە ئەو شوێنەیە سورەتی "البقرة"ی تیا دابەزێنرا.

**١٩٨٣**– (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ كَانَ يَرْمِي الجَمْرَةَ الدُّنْيَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ عَلَى إِثْرِ كُلِّ حَصَاةٍ، ثُمَّ يَتَقَدَّمُ حَتَّى يُسْهِلَ، فَيَقُومُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، فَيَقُومُ طَوِيلاً، وَيَدْعُو وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ، ثُمَّ يَرْمِي الْوُسْطَى، ثُمَّ يَأْخُذُ ذَاتَ الشِّمَالِ فَيُسْهِلُ، وَيَقُومُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبَلَةِ، فَيَقُومُ طَوِيلاً، وَيَدْعُو وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ، وَيَقُومُ طَوِيلاً، ثُمَّ يَرْمِي جَمْرَةَ ذَاتِ الْعَقَبَةِ مِنْ بَطْنِ الْوَادِي، وَلاَ يَقِفُ عِنْدَهَا، ثُمَّ يَنْصَرِفُ، فَيَقُولُ: هَكَذَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَفْعَلُهُ. [خ١٧٥١]

(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): ئەو هەڵدانی بەردی بچووكی بە حەوت چەو هەڵدەدا، لەدوای هەر چەوێك تەكبیری دەكرد پاشان پێشدەكەوت تا ئاسانی بكات، روو بە قیبلە دەوەستا، بەدوور و درێژی دەوەستا، دوعای دەكرد و دوو دەستی بەرز دەكردەوە، پاشان ناوەندی هەڵدەدا، پاشان لای چەپەوەی دەگرت تا ئاسانی بكات، روو بە قیبلە دەوەستا، بەدروور و درێژی دەوەستا و دوعای دەكرد و دوو دەستی بەرز دەكردەوە، پاشان لە قووڵی دۆڵەكەدا بەردی عەقەبەی هەڵدەدا و لای نەدەوەستا، پاشان دەڕۆیشت و دەیوت: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی بەم جۆرەی ئەنجامدا.

**١٩٨٤**– (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: رَمَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْجَمْرَةَ يَوْمَ النَّحْرِ ضُحىً، وَأَمَّا بَعْدُ، فَإِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ. [م١٢٩٩]

(م) لە جابرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) رۆژی قوربانی كردن چێشتەنگاوەكەی بەردی هەڵدا، ئەوانەی دواتر كاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا.

**١٩٨٥**– عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ أَنْ نَرْمِيَ الْجَمْرَةَ بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ. [مي١٩٣٩]

* إسناده صحيح.

**لە عبدالرحمانی کوڕی عوسمانی تەیمییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە حەجی ماڵئاواییدا فەرمانی پێکردین بەردەکان–بە نموونەی چەوی بچووك– هەڵبدەین.**

**١٩٨٦–** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: رَجَعْنَا فِي الْحَجَّةِ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَبَعْضُنَا يَقُولُ: رَمَيْتُ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، وَبَعْضُنَا يَقُولُ: رَمَيْتُ بِسِتٍّ، فَلَمْ يَعِبْ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ.
* صحيح الإسناد. [ن٣٠٧٧]

**لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، وتی: لە حەجەکە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) گەڕاینەوە، هەندێکمان دەمانوت: حەوت بەردم هەڵدا، و هەندێکمان دەمانوت: شەشم هەڵدا، هەندێکیان لە هەندێکی تریان نەنگییان نەگرت.**

**١٩٨٧–** عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يُكَبِّرُ عِنْدَ رَمْيِ الْجَمْرَةِ، كُلَّمَا رَمَى بِحَصَاةٍ.
* إسناده صحيح. [ط ٩٣٠]

**لە نافیعەوە: عەبدوڵای کوڕی عومەر لە هەڵدانی بەردەکان تەکبیری دەکرد، هەرکات چەوێکی هەڵدەدا.**

## ٣٣- دەروازەی: سەرتاشین و کورتکردنەوە لە کاتی ئیحرام شکاندن

**١٩٨٨–** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَلَقَ رَأْسَهُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ. [خ٤٤١٠ (١٧٢٦)/ م١٣٠٤]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە حەجی ماڵئاوایی سەری خۆی تاشی.**

▪ وفي رواية لهما: قَالَ: حَلَقَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَطَائِفَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَقَصَّرَ بَعْضُهُمْ. [خ١٧٢٩ (١٦٣٩)، ٤٤١١/ م١٣٠١]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) و دەستەیە لە هاوەڵانی سەریان تاشی و هەندێکیان کورتیان کردەوە.**

■ وفي رواية لهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ**). قَالُوا: وَالمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ**). قَالُوا: وَالمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**وَالمُقَصِّرِينَ**). [خ١٧٢٧/ م١٣٠١]

**هەروەها لە ریوایەتێکی هەردووکیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودایە رەحم بەوانە بکە سەریان دەتاشن)، وتیان: ئەی ئەوانەی کورتیان کردەوە، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: (ئەوانەش کورتیان کردەوە).**

**١٩٨٩–** (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَتَى مِنًى، فَأَتَى الْجَمْرَةَ فَرَمَاهَا، ثُمَّ أَتَى مَنْزِلَهُ بِمِنًى وَنَحَرَ، ثُمَّ قَالَ لِلْحَلاَّقِ: (**خُذْ**)، وَأَشَارَ إِلَى جَانِبِهِ الأَيْمَنِ، ثُمَّ الأَيْسَرِ، ثُمَّ جَعَلَ يُعْطِيهِ النَّاسَ. [م١٣٠٥]

**(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ مینا، هات بۆ لای بەردەکان و هەڵیدان، پاشان هات بۆ لای مەنزڵەکەی لە مینا و قوربانی کرد، پاشان بە سەرتاشەکەی فەرموو: (بگرە[1])، ئاماژەی بە لای راستی خۆی کرد، پاشان بە لای چەپی، پاشان مووەکانی دا بە خەڵك.**

■ وفي رواية: نَاوَلَ الْحَالِقَ شِقَّهُ الأَيْمَنَ فَحَلَقَهُ، ثُمَّ دَعَا أَبَا طَلْحَةَ الأَنْصَارِيَّ، فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ الشِّقَّ الأَيْسَرَ، فَقَالَ: (**احْلِقْ**)، فَحَلَقَهُ، فَأَعْطَاهُ أَبَا طَلْحَةَ، فَقَالَ: (**اقْسِمْهُ بَيْنَ النَّاسِ**).

**لە ریوایەتێکدا: لای راستی خۆی کردە سەرتاشەکە و سەری تاشی، پاشان ئەبو تەلحەی ئەنصاری بانگ کرد مووەکانی پێدا، پاشان لای چەپی کردە حەلاقەکە و فەرمووی: (بتاشە)، ئەویش تاشی و مووەکانی دا بە ئەبو تەلحە و فەرمووی: (لە نێوان خەڵك دابەشی بکە).**

**١٩٩٠–** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ حَلْقٌ، إِنَّمَا عَلَى النِّسَاءِ التَّقْصِيرُ**). [د١٩٨٤/ مي١٩٤٦]

* صحيح.

---

[1] واتە: بە سەرتاشەکەی فەرموو: سەرەتا لای راستی بتاشێ ئەوجا لای چەپی–و.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لەسەر ئافرەتان سەرتاشین نییە، لەسەر ئافرەتان کورتکردنەوە هەیە).**

## ٣٤- دەروازەی: پێشخستن و دواخستن لە هەڵدانی بەرد و سەربڕین و سەرتاشین

**١٩٩١-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قِيلَ لَهُ: فِي الذَّبْحِ وَالحَلْقِ وَالرَّمْيِ، وَالتَّقْدِيمِ وَالتَّأْخِيرِ، فَقَالَ: **(لاَ حَرَجَ)**. [خ١٧٣٤ (٨٤)/ م١٣٠٧]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): بە پێغەمبەر(ﷺ) وترا: لە سەربڕین و سەرتاشین و هەڵدانی بەردەکان و پێشخستن و پاشخستن[1]، فەرمووی: **(حەرەجی تێدا نییە).**

**١٩٩٢-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَقَفَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِمِنىً لِلنَّاسِ يَسْأَلُونَهُ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: لَمْ أَشْعُرْ فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ؟ فَقَالَ: **(اذْبَحْ وَلاَ حَرَجَ)**. فَجَاءَ آخَرُ فَقَالَ: لَمْ أَشْعُرْ فَنَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ قَالَ: **(ارْمِ وَلاَ حَرَجَ)**. فَمَا سُئِلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلاَ أُخِّرَ إِلاَّ قَالَ: **(افْعَلْ وَلاَ حَرَجَ)**. [خ٨٣/ م١٣٠٦]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە حەجیماڵئاوایی لە مینا بۆ خەڵکی وەستا و پرسیاریان لێ دەکرد، پیاوێك هات بۆ لای و وتی: نەمزانی سەرمتاشی بەرلەوەی سەربڕم؟ فەرمووی: **(سەربڕە و هیچ حەرەجی تێدا نییە)**، یەکێکی تر هات و وتی: نەمزانی و بەر لە هەڵدانی بەردەکان ئاژەڵم سەربڕی؟ فەرمووی: **(هەڵبدە و هیچ حەرەجی تێدا نییە)**، هەر پرسیارێك لە پێغەمبەر(ﷺ) بکرابا دەربارەی پێشخستن و دواخستن دەیفەرموو: **(ئەنجامی بدە و هیچ حەرەجی تێدا نییە).**

---

[1] واتە: پێشخستن و پاشخستنی ئەوانە چۆنە؟-و.

## ٣٥- دەروازەی: سەربڕینی هەدی و خواردن و صەدەقەکردن لێی

**١٩٩٣-** (ق) عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَمَرَه أَنْ يَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ، وَأَنْ يَقْسِمَ بُدْنَهُ كُلَّهَا، لُحُومَهَا وَجُلُودَهَا وَجِلاَلَهَا، وَلاَ يُعْطِيَ فِي جِزَارَتِهَا شَيْئاً. [خ١٧١٧ (١٧٠٧)/ م١٣١٧]

**(ق) لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد لەسەر حوشترە دابەستەکەی لە مینا بوەستێ و هەموو حوشترەکە دابەش بکات، گۆشتەکەی و پێستەکەی و سەرجلەکەی، لە سەربڕینی شتێك لە گۆشتی حوشترەکە نەدات بە پاککەرەکەی[1].**

- وفي رواية للبخاري قال: أَهْدَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مِائَةَ بَدَنَةٍ، فَأَمَرَنِي بِلُحُومِهَا فَقَسَمْتُهَا... الحديث. [خ١٧١٨]

**لە ریوایەتێکی بوخاریدا، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) سەد حوشتری دابەستەی هەدیە کرد، فەرمانی پێکردم بە گۆشتەکەی و دابەشم کرد...فەرموودەکە.**

**١٩٩٤-** (ق) عَنْ زِيَادِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما أَتَى عَلَى رَجُلٍ قَدْ أَنَاخَ بَدَنَتَهُ يَنْحَرُهَا، قَالَ: ابْعَثْهَا قِيَاماً مُقَيَّدَةً، سُنَّةَ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم. [خ١٧١٣/ م١٣٢٠]

**(ق) لە زیادی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: ئیبن عومەرم(خوایان لێ رازی بێت) بینی هات بەسەر پیاوێکدا حوشترەکەی پاڵخستبوو سەریدەبڕی، وتی: بەپێوە و بە کۆت و بەند کردن رەوانەی بکە[2]، ئەوە سوننەتی محەمەدە(ﷺ).**

**١٩٩٥-** (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: كُنَّا لاَ نَأْكُلُ مِنْ لُحُومِ بُدْنِنَا فَوْقَ ثَلاَثِ مِنىً، فَرَخَّصَ لَنَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**كُلُوا وَتَزَوَّدُوا**)، فَأَكَلْنَا وَتَزَوَّدْنَا. [خ١٧١٩/ م١٩٧٢]

---

(١) **واتە: ئەو کەسەی حوشترەکە پاك دەکات و قەسابییەکە دەکات، چونکە ئەو کرێی خۆی وەردەگرێ-و.**

(٢) **واتە: سەریببڕە و رەوانەکەی بکە بۆ لای خودا، واتە پاداشتەکەی، یان نیێتی سەربڕینەکەی-و.**

(ق) لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: لەسەرو سێ رۆژ لە گۆشتی حوشترەكانی خۆمان نەدەخوارد، پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتیداین و فەرمووی: (**بخۆن و توێشوویان لێ بگرن**)، ئێمەش خواردمان و توێشوومان لێگرتن.

## ٣٦- دەروازەی: هاوبەشی لە هەدیدا

**١٩٩٦**- (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: نَحَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ، الْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ. [م١٣١٨]

**(م) لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە، وتی: ساڵی حودەیبییە لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاژەڵمان سەربڕی، حوشتری گۆشت بۆ حەوت كەس، و گا و مانگا بۆ حەوت كەس.**

**١٩٩٧**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: ذَبَحَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَمَّنِ اعْتَمَرَ مِنْ نِسَائِهِ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بَقَرَةً بَيْنَهُنَّ. [د١٧٥١/ جە٣١٣٣]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە حەجیماڵئاوایی مانگایەكی سەربڕی لە نێوان ژنەكانی.**

## ٣٧- دەروازەی: تەوافی "الإفاضة[1]" و حوكمەكانی

**١٩٩٨**- (ق) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: شَكَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنِّي أَشْتَكِي، قَالَ: (**طُوفِي مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ**). فَطُفْتُ وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي إِلَى جَنْبِ الْبَيْتِ، يَقْرَأُ بِالطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ. [خ٤٦٤/ م١٢٧٦]

---

[1] "طواف الإفاضة" يەكێكە لە پایەكانی حەج، ئەو تەوافەیە رۆژی قوربان حاجی ئەنجامی دەدات لەدوای بە لێشاو هاتنیان لە میناوە، تەواف دەكات و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ مینا-و.

(ق) لە ئوم سەلەمەوە، وتی: سکاڵام بردە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەخۆشم، فەرمووی: **(بە سواری لەدوای خەڵکەوە تەواف بکە)**، تەوافم کرد و پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە تەنیشتی بەیت نوێژی دەکرد، و "وطور وكتاب مسطور"ی دەخوێند.

**١٩٩٩**– (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم مَرَّ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ بِإِنْسَانٍ رَبَطَ يَدَهُ إِلَى إِنْسَانٍ بِسَيْرٍ. أَوْ بِخَيْطٍ، أَوْ بِشَيْءٍ غَيْرِ ذَلِكَ. فَقَطَعَهُ النَّبِيُّ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَالَ: **(قُدْهُ بِيَدِهِ)**. [خ١٦٢٠]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) تەوافی کەعبەی دەکرد بە پاڵ مرۆڤێکدا تێپەڕی دەستی خۆی بە پەتێك–یان بە داوێك یان بە شتێك جگە لەوانە– بە مرۆڤێکی ترەوە گرێ دابوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستی خۆی پچڕاندی، پاشان فەرمووی: **(بە دەستی[1] رێنموونی بکە)**.

**٢٠٠٠**– (خ) عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٍ. إِذْ مَنَعَ ابْنُ هِشَامٍ النِّسَاءَ الطَّوَافَ مَعَ الرِّجَالِ. قَالَ: كَيْفَ يَمْنَعُهُنَّ، وَقَدْ طَافَ نِسَاءُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مَعَ الرِّجَالِ؟ قُلْتُ: أَبَعْدَ الْحِجَابِ أَوْ قَبْلُ؟ قَالَ: إِي لَعَمْرِي! لَقَدْ أَدْرَكْتُهُ بَعْدَ الْحِجَابِ. قُلْتُ: كَيْفَ يُخَالِطْنَ الرِّجَالَ؟ قَالَ: لَمْ يَكُنَّ يُخَالِطْنَ، كَانَتْ عَائِشَةُ ﵂ تَطُوفُ حَجْرَةً مِنَ الرِّجَالِ، لاَ تُخَالِطُهُمْ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ: انْطَلِقِي نَسْتَلِمْ يَا أُمَّ المؤْمِنِينَ، قَالَتْ: انْطَلِقِي عَنْكِ، وَأَبَتْ، وَكُنَّ يَخْرُجْنَ مُتَنَكِّرَاتٍ بِاللَّيْلِ، فَيَطُفْنَ مَعَ الرِّجَالِ، وَلكِنَّهُنَّ كُنَّ إِذَا دَخَلْنَ الْبَيْتَ، قُمْنَ، حَتَّى يَدْخُلْنَ، وَأُخْرِجَ الرِّجَالُ. [خ١٦١٨]

(خ) لە ئیبن جورەیجەوە، وتی: عەتا هەواڵی پێدام–کاتێ ئیبن هیشام رێگری کرد ژنان لەگەڵ پیاوان تەواف بکەن– وتی: چۆن رێگرییان لێ دەکات، لە کاتێکدا ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ پیاوان تەوافیان کرد؟ وتم: ئایا دوای حیجاب یان پێش حیجاب؟ وتی: بەڵێ، بە گیانی خۆم، من لەدوای حیجاب پیاگەیشتم، وتم: چۆن تێکەڵ بە پیاوان دەبوون؟ وتی: ئەوان تێکەڵاو نەدەبوون، عائیشە لە تەنیشت پیاوانەوە تەوافی دەکرد و

[1] واتە: بە گرتنی دەستی، نەك بە پەتەکە.

پێیان تێکەڵ نەدەبوو، ئافرەتێك وتی: ئەی دایکی باوەڕداران با بڕۆین دەست بە بەردە ڕەشەکە بهێنین، عائیشە وتی: خۆت کەنار بدە، نەیویست ئەوە بکات، شەو خۆیان دەگۆڕی و دەهاتنە دەرەوە و لەگەڵ پیاوان تەوافیان دەکرد، بەڵام بچوونایەتە ناو بەیت بە پێوە دەوەستان تا بچنە ژوورەوە و پیاوان بێنە دەرەوە.

٢٠٠١- (خ) عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما يَطُوفُ بَعْدَ الْفَجْرِ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ. [خ١٦٣٠]

(خ) لە عەبدولعەزیزی کوڕی ڕوفەیعەوە، وتی: عەبدوڵای کوڕی زوبەیرم(خوایان لێ ڕازی بێت) بینی لەدوای فەجر تەوافی دەکرد و دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

٢٠٠٢- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، اسْمَعُوا مِنِّي مَا أَقُولُ لَكُمْ، وَأَسْمِعُونِي مَا تَقُولُونَ، وَلاَ تَذْهَبُوا فَتَقُولُوا: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ؛ فَلْيَطُفْ مِنْ وَرَاءِ الْحِجْرِ، وَلاَ تَقُولُوا الحَطِيمُ، فَإِنَّ الرَّجُلَ فِي الجَاهِلِيَّةِ كَانَ يَحْلِفُ، فَيُلْقِي سَوْطَهُ أَوْ نَعْلَهُ أَوْ قَوْسَهُ. [خ٣٨٤٨]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: ئەی خەڵکینە، ئەوەم لێ ببیستن پێتان دەڵێم و ئەوەش ئێوە دەیڵێن بە منی ببیستن، مەڕۆن و بڵێن: ئیبن عەباس وتی، ئیبن عەباس وتی، هەر کەس تەوافی بەیت دەکات بە لە پشت حیجرەوە تەواف بکات، مەڵێن "الحطیم"[1]، لە سەردەمی نەفامیدا پیاو هاوپەیمانی دەبەست بۆیە قەمچییەکەی یان نەعلەکەی یان کەوانەکەی هەڵدەدا.

---

[1] "الحُطم من الجبل" بریتییە لە تەنگە(مضیق) بە جۆرێك (یزحم الناس بعضهم بعضا)، حیجریش ئەو شوێنەیە وەك تەنگەیەك وایە و خەڵکی ئیزدیحام دەخەنە سەر یەکتر، لە سەردەمی نەفامی گەر هەندێکیان هاوپەیمانییان لەگەڵ هەندێکیان ببەستبایە هاوپەیمانەکە نەعلێك یان قەمچییەکی هەڵدەدا ناو حیجری ئیسماعیل بۆ مەبەستی هاوپەیمانییەکەیان، بۆیە بەوە بە "الحطیم" ناونرا چونکە کەلوپەلەکانیان تێکدەشکێت-و.

**٢٠٠٣**– (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَفَاضَ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ رَجَعَ فَصَلَّى الظُّهْرَ بِمِنىً.

قَالَ نَافِعٌ: فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُفِيضُ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيُصَلِّي الظُّهْرَ بِمِنىً. وَيَذْكُرُ أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَعَلَهُ. [م١٣٠٨]

**(م) لە ئیبن عومەرەوە: لە ڕۆژی سەربڕین پێغەمبەری خودا تەواف "الإفاضة"[1]ی کرد و پاشان گەڕایەوە و نوێژی نیوەڕۆی لە مینا کرد.**

**نافیع دەڵێت: ئیبن عومەر لە ڕۆژی سەربڕین تەوافی "الإفاضة"ی دەکرد و پاشان دەگەڕایەوە و نوێژی نیوەڕۆی لە مینا دەکرد. ئەوەی باس دەکرد پێغەمبەر(ﷺ) ئەو کارەی کردووە.**

**٢٠٠٤**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم طَافَ طَوَافاً وَاحِداً.
* صحيح. [ن٢٩٣٤]

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەر(ﷺ) یەك تەوافی ئەنجامدا.**

**٢٠٠٥**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم لَمْ يَرْمُلْ فِي السَّبْعِ الَّذِي أَفَاضَ فِيهِ.
* صحيح. [د٢٠٠١/ جه٣٠٦٠]

**لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لەو حەوتەی تیایدا تەوافی "الإفاضة"ی کرد نەرمە قونەی نەکرد[2].**

**٢٠٠٦**– وعَنه: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الطَّوَافُ حَوْلَ الْبَيْتِ مِثْلُ الصَّلاَةِ، إِلاَّ أَنَّكُمْ تَتَكَلَّمُونَ فِيهِ، فَمَنْ تَكَلَّمَ فِيهِ فَلاَ يَتَكَلَّمَنَّ إِلاَّ بِخَيْرٍ**). [ت٩٦٠/ مي١٨٨٩]
* صحيح.

---

[1] "طواف الإفاضة" یەکێکە لە پایەکانی حەج، ئەو تەوافەیە ڕۆژی قوربان حاجی ئەنجامی دەدات لەدوای بە لێشاو هاتنیان لە میناوە، تەواف دەکات و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ مینا–و.

[2] واتە: تەکان بە خۆدان.

**هەر لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (تەواف بە دەوری بەیتدا وەك نوێژوایە، جگە لەوەی ئێوە دەتوانن قسەی تێدا بکەن، هەر کەس قسەی تێدا کرد با تەنها قسەی خێری تێدا بکات).**

**٢٠٠٧-** عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لاَ تَمْنَعُوا أَحَداً يَطُوفُ بِهَذَا الْبَيْتِ وَيُصَلِّي، أَيَّ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ).

* صحيح. [د١٨٩٤/ ت٨٦٨/ ن٥٨٤٠/ جه١٢٥٤/ مي١٩٦٧]

**لە جوبەیری کوڕی موتیعمەوە، دەیگەیەنێت بە پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: (ئەی بەنی عەبد مەناف، ڕێگری مەکەن لە هیچ کەس تەوافی ئەم بەیتە بکات و نوێژ بکات، هەر ساتێك لە شەو یان لە ڕۆژ بخوازێت).**

**٢٠٠٨-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ الْقَارِيِّ: أَنَّهُ طَافَ بِالْبَيْتِ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، فَلَمَّا قَضَى عُمَرُ طَوَافَهُ، نَظَرَ فَلَمْ يَرَ الشَّمْسَ طَلَعَتْ، فَرَكِبَ حَتَّى أَنَاخَ بِذِي طُوًى، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ. [ط ٨٢٦]

* إسناده صحيح.

**لە عبدالرحمانی کوڕی عەبد قاریئەوە: ئەو لەدوای نوێژی بەیانی لەگەڵ عومەری کوڕی خەتاب تەوافی بەیتی کرد، کاتێ عومەر تەوافەکەی تەواو کرد، تەماشای کرد خۆر هەڵنەهاتووە، سوار بوو تا لە "ذي طوى"[1] حوشترەکەی یەخدا و دوو رکات نوێژی کرد.**

## ٣٨- دەروازەی: مانەوە لە مینا لە شەوانی "أيام التشريق" و کاروباری ئاودان

**٢٠٠٩-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: اسْتَأْذَنَ الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ رضي الله عنه رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ، فَأَذِنَ لَهُ. [خ١٦٣٤/ م١٣١٥]

[1] "ذي طوى" دۆڵێکە لە باکووری مەسجیدولحەرام-و.

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت) وتی: عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب(خوا لێی رازی بێت) داوای مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە شەوەکانی مینا ئەو لە مەککە بمێنێتەوە لەپێناو ئاودان، ئەویش مۆڵەتی دا.**

**٢٠١٠-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم جَاءَ إِلَى السِّقَايَةِ فَاسْتَسْقَى، فَقَالَ الْعَبَّاسُ: يَا فَضْلُ، اذْهَبْ إِلَى أُمِّكَ، فَأْتِ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِشَرَابٍ مِنْ عِنْدِهَا، فَقَالَ: **(اسْقِنِي)**. قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهُمْ يَجْعَلُونَ أَيْدِيَهُمْ فِيهِ، قَالَ: **(اسْقِنِي)** فَشَرِبَ مِنْهُ. ثُمَّ أَتَى زَمْزَمَ، وَهُمْ يَسْقُونَ وَيَعْمَلُونَ فِيهَا، فَقَالَ: **(اعْمَلُوا، فَإِنَّكُمْ عَلَى عَمَلٍ صَالِحٍ)**، ثُمَّ قَالَ: **(لَوْلاَ أَنْ تُغْلَبُوا لَنَزَلْتُ حَتَّى أَضَعَ الحَبْلَ عَلَى هذِهِ)**؛ يَعْنِي: عَاتِقَهُ، وَأَشَارَ إِلَى عَاتِقِهِ. [خ١٦٣٥]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ لای ئاودان و داوای ئاو پێدانی کرد، عەباس وتی: ئەی فەزڵ، بڕۆ بۆ لای دایکت، خواردنەوەیەك لای ئەوەوە بهێنە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەر فەرمووی: (پێم نۆش بکە)، عەباس وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوان دەستی خۆیان تێ دەکرد، فەرمووی: (پێم نۆش بکە)، لێی خواردەوە.**

**پاشان هات بۆ زەمزەم، ئەوان ئاویان دەدا و کاریان تێدا دەکرد، فەرمووی: (کار بکەن، چونکە ئێوە لەسەر کارێکی چاکەن)، پاشان فەرمووی: (گەر بەسەرتاندا زاڵ نەبووبنایە[1]، دادەبەزیم تا پەتەکە لەسەر ئەمەم دادەنا)، واتە: سەرشانی، ئاماژەی بەسەرشانی خۆی کرد.**

**٢٠١١-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُعَاذٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: خَطَبَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم النَّاسَ بِمِنًى، وَنَزَّلَهُمْ مَنَازِلَهُمْ، فَقَالَ: **(لِيَنْزِلِ الْمُهَاجِرُونَ هَاهُنَا)** وَأَشَارَ إِلَى مَيْمَنَةِ الْقِبْلَةِ، **(وَالأَنْصَارُ هَاهُنَا)** وَأَشَارَ إِلَى مَيْسَرَةِ الْقِبْلَةِ، **(ثُمَّ لِيَنْزِلِ النَّاسُ حَوْلَهُمْ)**.
* صحيح. [د١٩٥١]

[وانظر قصر الصلاة بمنى: **١٥٥٤، ١٥٥٥**].

---

[1] واتە: خەڵکی چاو لە من بکات کاتێ کارەکەی ئێوە دەکەم، ئەوەش قەرەباڵغی بۆ سەر ئێوە دروست بکات و ژێربکەون-و.

له عبدالرحمانی کوڕی مەعازەوە، له پیاوێك له هاوەڵانی پێغەمبەرەوە(ﷺ)، وتی: لە مینا پێغەمبەر(ﷺ) وتاری دا بۆ خەڵك، و لە پلە و پایەی خۆیاندا داینان و فەرمووی: **(با کۆچکەران هۆ ئا لەو جێگە دابنیشن)**، ، ئاماژەی کرد بۆ لای راستی قیبلە، **(با ئەنصار هۆ ئا لەو جێگە دابنیشن)**، ئاماژەی کرد بۆ لای چەپی قیبلە، **(پاشان خەڵکی بە دەوریاندا دابنیشن)**.

## ٣٩- دەروازەی: تەوافی وەداع[١]

**٢٠١٢-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أُمِرَ النَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ؛ إِلاَّ أَنَّهُ خُفِّفَ عَنِ الحَائِضِ. [خ١٧٥٥ (٣٢٩)/ م١٣٢٨)]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: فەرمان بە خەڵکی کرا دوایین دیداریان لەگەڵ بەیت بێت، بەڵام لەسەر ئافرەتی حەیزدار سووك کرا.**

- وفي رواية للبخاري: قال: رُخِّصَ للحائض أن تنفر إذا حاضت. [خ٣٢٩]

**لە ریوایەتێکی بوخاریدا: مۆڵەتی حەیزدار درا بگەڕێتەوە گەر کەوتە حەیزەوە.**

**٢٠١٣-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ أَنَّهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ قَدْ حَاضَتْ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لَعَلَّهَا تَحْبِسُنَا، أَلَمْ تَكُنْ طَافَتْ مَعَكُنَّ)**؟ فَقَالُوا: بَلَى، قَالَ: **(فَاخْرُجِي)**.
[خ٣٢٨ (٢٩٤)/ م١٢١١]

(ق) لە عائیشەوە –هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)– ئەو بە پێغەمبەری خودای(ﷺ) وت: ئەی پێغەمبەری خودا، صەفییەی کچی حویی کەوتووەتە حەیزەوە؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لەوانەیە رامانبگرێت، ئایا لەگەڵ ئێوە تەوافی نەکرد؟)**، وتیان: با، فەرمووی: **(کەوابوو بچۆ دەرەوە)**.

---

[١] "طـواف الـوداع" دوایـین نوسـکی حەجـە، بـەو نـاوە نـاونراوە چـونکە وەك ماڵئـاوایی و خواحافیزی وایە لە ماڵەکەی خودا–و.

**٢٠١٤–** عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ كَانَتْ إِذَا حَجَّتْ، وَمَعَهَا نِسَاءٌ تَخَافُ أَنْ يَحِضْنَ، قَدَّمَتْهُنَّ يَوْمَ النَّحْرِ فَأَفَضْنَ، فَإِنْ حِضْنَ بَعْدَ ذَلِكَ لَمْ تَنْتَظِرْهُنَّ، فَتَنْفِرُ بِهِنَّ وَهُنَّ حُيَّضٌ إِذَا كُنَّ قَدْ أَفَضْنَ. [ط ٩٤٤]

* إسناده صحيح.

**لە عمرەی کچی عبدالرحمانەوە: عائیشە –دایکی باوەڕداران– گەر حەجی بکردبا و ئافرەتی لەگەڵ بوایە و بترسابا بکەونەوە حەیزەوە ڕۆژی سەربڕین پێشی دەخستن تا تەوافی ئیفازە بکەن، گەر لە دوای ئەوە بکەوتبانایە ناو حەیزەوە چاوەڕانیان نەدەبوو و سەفەری پێ دەکردن و ئەوان لە حەیزدا بوون گەر تەوافی ئیفازەیان کردبێت.**

## ٤٠- دەروازەی: مانەوەی کۆچکەر لە مەککە لەدوای نوسك

**٢٠١٥–** (ق) عَنِ العَلاءِ بْنِ الحَضْرَمِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**ثَلاَثٌ لِلْمُهَاجِرِ بَعْدَ الصَّدَرِ**). [خ٣٩٣٣/ م١٣٥٢]

(ق) لە عەلای کوڕی حەزرەمییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لەدوای تەوافی "الصَّدَر"[1] سێ شەو بۆ کۆچکەر هەیە).**

- وفي رواية لمسلم: (مُكْثُ الْمُهَاجِرِ بِمَكَّةَ، بَعْدَ قَضَاءِ نُسُكِهِ، ثَلاَثاً).

**لە ڕیوایەتێکی موسلیمدا: (مانەوەی کۆچکەر لە مەککە لەدوای ئەنجامدانی نوسکی خۆی سێ شەوە).**

## ٤١- دەروازەی: خاکیبوون(تەوازوع) لە حەجدا

**٢٠١٦–** (خ) عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَنَسٍ قَالَ: حَجَّ أَنَسٌ عَلَى رَحْلٍ، وَلَمْ يَكُنْ شَحِيحاً، وَحَدَّثَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَجَّ عَلَى رَحْلٍ، وَكَانَتْ زَامِلَتَهُ. [خ١٥١٧]

---

**[1] لەدوای تەوافی "الصدر": واتە دوای ئەوەی لە مینا دەگەڕێتەوە و بە تەوافی ڕوکن تەوافی بەیت دەکات، مەبەست کۆتاهاتنی کارەکانی حەجە، بۆیە لەپاش ئەوە زیاتر لە سێ شەو دروست نییە لە مەککە بمێنێتەوە.**

**(خ) لە سومامەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەنەسەوە، وتی: ئەنەس لەسەر سەرجلی حوشترەکەی حەجی کرد، ئەو کەسێکی دەستنوقاو نەبوو، باسی ئەوەی کرد پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر سەرجلی حوشترەکەی حەجی کرد و حوشتری کۆڵ و بارەکەی بوو.**

■ ولفظ ابن ماجه: قَالَ أَنَسٌ: حَجَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى رَحْلٍ رَثٍّ، وَقَطِيفَةٍ تُسَاوِي أَرْبَعَةَ دَرَاهِمَ أَوْ لاَ تُسَاوِي، ثُمَّ قَالَ: (**اللَّهُمَّ حَجَّةٌ لاَ رِيَاءَ فِيهَا وَلاَ سُمْعَةَ**). [جه٢٨٩٠]

**لەفزەکەی ئیبن ماجە: ئەنەس وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر سەرجلێکی کۆنی حوشترێك حەجی کرد، و قەتیفەیەك چوار درهەم دەژیا یان نەدەژیا، پاشان فەرمووی: (خودایە، حەجێك بێت ریا و ناوبانگی تێدا نەبێت).**

## ٤٢- دەروازەی: بەندبوون و گیرخواردن

**٢٠١٧-** (خ) عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: قَدْ أُحْصِرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَحَلَقَ رَأْسَهُ، وَجَامَعَ نِسَاءَهُ، وَنَحَرَ هَدْيَهُ، حَتَّى اعْتَمَرَ عَاماً قَابِلاً. [خ١٨٠٩]

**(خ) لە عیکریمەوە، وتی: ئیبن عەباس(خوایان لێ رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) گیریخوارد، بۆیە سەری تاشی، و رۆیشتە لای هاوسەرەکانی، و هەدیەکەی خۆی سەربڕی تا ساڵی داهاتوو عومرەی کرد.**

**٢٠١٨-** عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ الْحَجَّاجَ بْنَ عَمْرٍو الْأَنْصَارِيَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ كُسِرَ، أَوْ عَرِجَ؛ فَقَدْ حَلَّ، وَعَلَيْهِ الْحَجُّ مِنْ قَابِلٍ**). قَالَ عِكْرِمَةُ: فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ وَأَبَا هُرَيْرَةَ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالاَ: صَدَقَ.

* صحيح. [د١٨٦٢/ ت٩٤٠/ ن٢٨٦٠/ جه٣٠٧٧/ مي١٩٣٦]

**لە عیکریمەوە، وتی: گوێم لە حەجاجی کوڕی عەمری ئەنصاری بوو وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس بشکێ، یان شەل بێت ئیحرامی شکاوە و حەجی ساڵی داهاتووی لەسەرە)، عیکریمە وتی: پرسیارم لە ئیبن عەباس و ئەبو هورەیرە کرد دەربارەی ئەوە، وتیان: راست دەکات.**

## ٤٣- دەروازەی: حەجی ژنان و منداڵان

**٢٠١٩-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**لاَ يَخْلُوَنَّ رجل بِامْرَأَةٍ، ولا تُسَافِرَنَّ امرأةٌ إِلاَّ وَمَعَهَا مَحْرَمٌ**). فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، اكْتَتَبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا، وَخَرَجَتِ امْرَأَتِي حاجَّةً، قالَ: (**اذْهَبْ، فَاحْجُجْ مَعَ امْرَأَتِكَ**).
[خ٣٠٠٦ (١٨٦٢)/ م١٣٤١]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(پیاوێك ناکەوێتە خەڵوەوە لەگەڵ ئافرەتێك، ئافرەت سەفەر ناکات مەگەر مەحرەمی لەگەڵ بێت)**، پیاوێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، غەزای ئەوە و ئەوەم لەسەر نوسرابوو، ژنەکەم لەبەر پێویستی رۆیشت، فەرمووی: **(برۆ و حەج لەگەڵ ژنەکەت بکە)**.

**٢٠٢٠-** (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: لَقِيَ رَكْباً بِالرَّوْحَاءِ، فَقَالَ: (**مَنِ الْقَوْمُ**)؟ قَالُوا: الْمُسْلِمُونَ، فَقَالُوا: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: (**رَسُولُ اللهِ**)، فَرَفَعَتْ إِلَيْهِ امْرَأَةٌ صَبِيّاً فَقَالَتْ: أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: (**نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ**). [م١٣٣٦]

(م) لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): لە "الروحاء"[١] گەیشت بە کۆمەڵێك سوار، فەرمووی: **(ئەمانە کێن؟)**، وتیان: موسڵمانان، وتیان: تۆ کێی؟ فەرمووی: **(پێغەمبەری خودا)**، ئافرەتێك منداڵێکی بۆ بەرزکردەوە و وتی: ئایا حەج بۆ ئەمە هەیە؟ فەرمووی: **(بەڵێ، بۆ تۆش پاداشت هەیە)**.

## ٤٤- دەروازەی: حەج لە جێگەی کەسی دەستەوسان و مردوو

**٢٠٢١-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ رَدِيفَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَجَاءَتِ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ، فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ، وَجَعَلَ

---

[١] "الروحاء" شوێنێکە ٨٠ کیلۆمەتر لە مەدینەوە دوورە —و.

النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي الحَجِّ، أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخاً كَبِيراً، لاَ يَثْبُتُ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: (نَعَمْ). وَذلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ. [خ١٥١٣/ م١٣٣٤]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: فەزڵ لە پاشکۆی پێغەمبەری خودادا(ﷺ) بوو ئافرەتێك لە "خثعم[1]"وە هات، فەزڵ تەماشای دەکرد و ئەویش تەماشای فەزڵی دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) رووی فەزڵی وەردەگێڕا بۆ لایەکەی تر، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، حەج فەرزی خودایە لەسەر بەندەکانی، حەج لەسەر باوکم پێویست بووە و ئەو پیرێکی ئەفتادەیە و خۆی لەسەر وڵاخ راناگرێ، ئایا لە ئەوەوە حەج بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ)، ئەوەش لە حەجیماڵئاواییدا.**

**٢٠٢٢-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ امْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ، جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: إِنَّ أُمِّي نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ، فَلَمْ تَحُجَّ حَتَّى مَاتَتْ، أَفَأَحُجُّ عَنْهَا؟ قَالَ: **(نَعَمْ، حُجِّي عَنهَا، أَرَأَيْتِ لَو كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ، أَكُنْتِ قَاضِيَتَهُ؟ اقْضُوا اللهَ، فَاللهُ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ).** [خ١٨٥٢]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): ئافرەتێك لە "جُهَيْنَة[2]" هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: دایکم نەزری کرد بوو حەج بکات، حەجی نەکرد تا مرد، ئایا لە ئەوەوە حەج بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ، حەج لە ئەوەوە بکە، گەر قەرزێك لەسەر دایکت بوایە ئایا قەرزەکەت دەدایەوە؟ قەرزی خودا بگێڕنەوە، خودا لەپێشترە بە گێڕانەوە بۆی).**

**٢٠٢٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم سَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ: لَبَّيْكَ عَنْ شُبْرُمَةَ، قَالَ: **(مَنْ شُبْرُمَةُ)**؟ قَالَ: أَخٌ لِي ـ أَوْ قَرِيبٌ لِي ـ قَالَ: **(حَجَجْتَ عَنْ نَفْسِكَ)**؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: **(حُجَّ عَنْ نَفْسِكَ، ثُمَّ حُجَّ عَنْ شُبْرُمَةَ).** [د١٨١١/ جه٢٩٠٣]

* صحيح.

---

[1] قەبیلەیەك بوو لە خوارووی جەزیرەی عەرەبی-و.

[2] قەبیلەیەك بوو لە نێوان حیجاز و توهامە-و.

له ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) گوێی له پیاوێك بوو دەیوت: لە "شُبْرُمَة"وە لەبەیکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**"شُبْرُمَة" کێیە؟**)، وتی: برایەکمە یان خزمێکمە، فەرمووی: (**حەجت بۆ خۆت کرد؟**)، وتی: نەخێر، فەرمووی: (**حەج بۆ خۆت بکە، پاشان حەج بۆ "شُبْرُمَة" بکە**).

## ٤٥- دەروازەی: وتاری حەجی ماڵئاوایی

**٢٠٢٤**- (ق) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (**الزَّمَانُ قَدِ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ، السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْراً مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ: ثَلاَثَةٌ مُتَوَالِيَاتٌ: ذُو الْقَعْدَةِ وَذُو الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمُ، وَرَجَبُ مُضَرَ، الَّذِي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ. أَيُّ شَهْرٍ هَذَا**)؟

قُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: (**أَلَيْسَ ذَا الْحِجَّةِ**)؟ قُلْنَا: بَلَى.

قَالَ: (**فَأَيُّ بَلَدٍ هَذَا**)؟ قُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: (**أَلَيْسَ الْبَلْدَةَ**)؟ قلنا: بَلَى.

قَالَ: (**فَأَيُّ يَوْمٍ هَذَا**)؟ قُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: (**أَلَيْسَ يَوْمَ النَّحْرِ**)؟ قُلْنَا: بَلَى.

قَالَ: (**فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ** - قَالَ مُحَمَّدٌ: وَأَحْسِبُهُ قالَ: **وَأَعْرَاضَكُمْ - عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، وَسَتَلْقَوْنَ رَبَّكُمْ، فَسَيَسْأَلُكُمْ عَنْ أَعْمَالِكُمْ، أَلاَ فَلاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي ضُلاَّلاً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، أَلاَ لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَلَعَلَّ بَعْضَ مَنْ يُبَلَّغُهُ أَنْ يَكُونَ أَوْعَى لَهُ مِنْ بَعْضِ مَنْ سَمِعَهُ**) - فَكَانَ مُحَمَّدٌ إِذَا ذَكَرَهُ يَقُولُ: صَدَقَ مُحَمَّدٌ صلّى الله عليه وسلّم - ثُمَّ قالَ: (**أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ**) مَرَّتَيْنِ.　　　　[خ٤٤٠٦ (٦٧)/ م١٦٧٩]

(ق) له "ئەبی بەکرە"وە، له پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: (**ڕۆژگار گەڕاوەتەوە شوێنی دەستپێکردنی ڕۆژێك خودا ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد، ساڵ دوازدە مانگە و چوار لەو مانگانە حەرامن، سیانیان بەدوای یەکتردا:ی "ذو القعدة و ذو الحجة و المحرّم" و ڕەجەب موزەر کە لە نێوان جەمادی و شەعباندایە. ئەم مانگە چ مانگێکە؟**)

وتمان: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، بێدەنگ بوو تا گومانمان برد بە ناوێکی تر ناوی دەنێت، فەرمووی: (**زیلحەجە نییە؟**)، وتمان: با،

فەرمووی: (**ئەم شارە چ شارێکە**)، وتمان: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، بێدەنگ بوو تا گومانمان برد بە ناوێکی تر ناوی دەنێت، فەرمووی: (**"البلدة" نییە؟**)، وتمان: با،

فەرمووی: (**ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە**)، وتمان: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، بێدەنگ بوو تا گومانمان برد بە ناوێکی تر ناوی دەنێت، فەرمووی: (**ئەمڕۆ ڕۆژی سەربڕین نییە؟**)، وتمان با،

فەرمووی: (**خوێن و ماڵ**–محەمەد وتی: پێموایە وتی: **ناموستان– لەسەر ئێوە حەرامە، وەك حەرامی ئەم ڕۆژەتان و ئەم شارەتان و ئەم مانگەتان، ئێوە بە پەروەردگاری خۆتان دەگەنەوە و پرسیاری کار و کردەوەکانتان لێ دەکات، ئاگادار بن لەدوای من گومڕایانە پاشگەز نەبنەوە، هەندێکتان لە گەردنی هەندێکتان بدەن، ئاگادار بن با ئامادە بە نائامادەی بگەیەنێت، لەوانەیە هەندێ لەو کەسانەی پێیان دەگات حاڵیتر بن لە هەندێ لەوانەی بیستوویانە**)، محەمەد کە باسی دەکرد دەیوت: محەمەد(ﷺ) ڕاستی فەرموو، پاشان فەرمووی: (**ئاگادار بن ئایا گەیاندم**)، دوو جار.

## ٤٦- دەروازەی: حوکمەکانی عومرە و پلە و پایەی عومرە

**٢٠٢٥**– (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا رَجَعَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ حَجَّتِهِ، قَالَ لأُمِّ سِنَانٍ الأَنْصَارِيَّةِ: (**مَا مَنَعَكِ مِنَ الحَجِّ**)؟ قَالَتْ: أَبُو فُلاَنٍ ـ تَعْنِي: زَوْجَهَا ـ، كَانَ لَهُ نَاضِحَانِ: حَجَّ عَلَى أَحَدِهِمَا، والآخَرُ يَسْقِي أَرْضاً لَنَا. قَالَ: (**فَإِنَّ عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ، تَقْضِي حَجَّةً مَعِي**). [خ١٨٦٣ (١٧٨٢)/ م١٢٥٦]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە حەجەکەی گەڕایەوە، بە ئوم سینانی ئەنصاری فەرموو: (**چ شتێك ڕێگری لێکردی لە حەج کردن؟**)، وتی: باوکی فلان–مەبەستی هاوسەرەکەی بوو– دوو وڵاخی ئاوکێشی

هەبوو، لەسەر یەکێکیان حەجی کرد و ئەویتریان زەوییەکمان بۆ ئاو دەدات، فەرمووی: (عومرە لە رەمەزان قەزای حەجێك دەکاتەوە لەگەڵ من کرابێت).

٢٠٢٦- (ق) عَنْ قَتَادَةَ: أَنَّ أَنَساً ﷺ أَخْبَرَهُ قَالَ: اعْتَمَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَرْبَعَ عُمَرٍ، كُلُّهُنَّ فِي ذِي الْقَعْدَةِ؛ إِلاَّ الَّتِي كَانَتْ مَعَ حَجَّتِهِ: عُمْرَةً مِنَ الحُدَيْبِيَةِ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مِنَ الْعَامِ المُقْبِلِ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مِنَ الجِعْرَانَةِ، حَيْثُ قَسَمَ غَنَائِمَ حُنَيْنٍ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مَعَ حَجَّتِهِ. [خ٤١٤٨ (١٧٧٨)/ م١٢٥٣]

(ق) لە قەتادەوە: ئەنەس(خوا لێی رازی بێت) هەواڵی پێدا، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) چوار عومرەی کرد، هەموویان لە زیلقەعیدە بوو، جگە لەوەی لەگەڵ حەجەکەی بوو: عومرەیەك لە حودەیبییە لە زیلقەعیدە، و عومرەیەك لە ساڵی داهاتوو لە زیلقەعیدە، و عومرەیەك لە "الجِعْرانـة" کاتێك غەنیمەتی حونەینی لە زیلقەعیدە دابەش کرد، عومرەیەکیش لەگەڵ حەجەکەی.

- وفي رواية لهما: قُلْتُ: كَمْ حَجَّ؟ قَالَ: وَاحِدَةً. [خ١٧٧٨]

لە ریوایەتێکی هەردووکیان: وتم: چەند حەجی کرد؟ وتی: یەك.

٢٠٢٧- (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بنِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَمَرَهُ أَنْ يُرْدِفَ عَائِشَةَ وَيُعْمِرَهَا مِنَ التَّنْعِيمِ. [خ١٧٨٤/ م١٢١٢]

(ق) لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبوبەکرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد عائیشە لە پاشکۆ بگرێ و لە "التنعیم"[١] عومرەی پێ بکات[٢].

٢٠٢٨- (خ) قَالَ ابْنُ عُمَرَ: لَيْسَ أَحَدٌ إِلاَّ وَعَلَيْهِ حَجَّةٌ وَعُمْرَةٌ.

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّهَا لَقَرِينَتُهَا فِي كِتَابِ اللهِ ﴿ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾[البقرة:١٩٦].

[خ. العمرة، باب١]

---

[١] "التنعيم" ئەو شوێنەی ئیحرامی لێ دەبەسترێ، حەوت کیلۆمەتر لە حەرەمەوە دوورە—و.

[٢] واتە: بە نێتی عومرە لەو جێگە ئیحرام ببەستێ—و.

(خـ) ئیبن عومەر وتی: هەموو کەس حەج و عومرەیەکی لەسەرە.

ئیبن عەباس وتی: لە قورئاندا عومرە هاوملی حەج کراوە: ﴿ٱلۡحَجَّ وَٱلۡعُمۡرَةَ لِلَّهِۚ﴾[البقرة:١٩٦].

**٢٠٢٩**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَا أَعْمَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَائِشَةَ لَيْلَةَ الْحَصْبَةِ؛ إِلاَّ قَطْعاً لِأَمْرِ أَهْلِ الشِّرْكِ، فَإِنَّهُمْ كَانُوا يَقُولُونَ: إِذَا بَرَأَ الدَّبَرْ، وَعَفَا الْأَثَرْ، وَدَخَلَ صَفَرْ؛ فَقَدْ حَلَّتِ الْعُمْرَةُ لِمَنِ اعْتَمَرْ. [حم٢٣٦١]

* صحيح، وإسناده حسن.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: عومرە پێکردنی عائیشە لە لایەن پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لە شەوی "الحَصْبَة"[1] تەنها ڕێگەبڕینەوە بوو لە ئەهلی هاوەڵدانان[2]، ئەوان دەیانوت: کە پشتی حوشتر خۆشبوویەوە ئەسەری پێی سڕایەوە و صەفەر هاتە بەرەوە عومرە حەلاڵە بۆ کەسێك عومرە بکات.

## ٤٧- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی ڕۆژی حەجی مەزن(الحج الأكبر) هاتووە

**٢٠٣٠**– عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ يَوْمِ الْحَجِّ الْأَكْبَرِ؟ فَقَالَ: (يَوْمُ النَّحْرِ). [ت٩٥٧]

* صحيح.

لە عەلییەوە، وتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی ڕۆژی حەجی مەزن؟ فەرمووی: (ڕۆژی سەربڕین).

---

[1] واتە: شەوی مانەوە لە "المحصب" کە شوێنێکە نزیك بە مینا، هەروەها مانای "ليلة النفْر"ی هەیە بۆ ڕەمی–و.

[2] تێکشکاندنی بەند و باوی سەردەمی نەفامی بوو،–و.

## ٤٨- دەروازەی: پلە و پایەی تەواف

**٢٠٣١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، كَانَ كَعِتْقِ رَقَبَةٍ). [جه٢٩٥٦]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەر کەس تەوافی بەیت بکات، و دوو رکات نوێژ بکات، وەك ئازاد کردنی گەردنێك وایە).**

## ٤٩- دەروازەی: ئاوی زەمزەم

**٢٠٣٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّهَا كَانَتْ تَحْمِلُ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ. وَتُخْبِرُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَحْمِلُهُ. [ت٩٦٣]

* صحيح.

**لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، ئەو لە ئاوی زەمزەمی هەڵدەگرت، هەواڵی دەدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) لێی هەڵدەگرت.**

**٢٠٣٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَاءُ زَمْزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ). [جه٣٠٦٢]

* صحيح.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (ئاوی زەمزەم بۆ ئەوەیە بۆی دەخورێتەوە).**

## ٥٠- دەروازەی: کەسێ بچێتە لای هاوسەرەکەی و لە ئیحرامدا بێت یان بەر لە تەوافی "الإفاضة"

**٢٠٣٤-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى عَبْدَ الله بْنَ عَمْرٍو يَسْأَلُهُ عَنْ مُحْرِمٍ وَقَعَ بِامْرَأَةٍ، فَأَشَارَ إِلَى عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ فَقَالَ: اذْهَبْ إِلَى ذَلِكَ فَسَلْهُ. قَالَ: شُعَيْبٌ: فَلَمْ يَعْرِفْهُ

الرَّجُلُ، فَذَهَبْتُ مَعَهُ فَسَأَلَ ابْنَ عُمَرَ فَقَالَ: بَطَلَ حَجُّكَ، فَقَالَ الرَّجُلُ: فَمَا أَصْنَعُ؟ قَالَ: اخْرُجْ مَعَ النَّاسِ وَاصْنَعْ مَا يَصْنَعُونَ، فَإِذَا أَدْرَكْتَ قَابِلاً فَحُجَّ وَأَهْدِ. فَرَجَعَ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو وَأَنَا مَعَهُ فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ: اذْهَبْ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَسَلْهُ. قَالَ شُعَيْبٌ: فَذَهَبْتُ مَعَهُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ ابْنُ عُمَرَ، فَرَجَعَ إِلَى عَبْد اللهِ بْنِ عَمْرٍو وَأَنَا مَعَهُ، فَأَخْبَرَهُ بِمَا قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ثُمَّ قَالَ: مَا تَقُولُ أَنْتَ؟ فَقَال: قَوْلِي مِثْلَ مَا قَالاَ. [ك٢٢٧٥/هق٥/١٦٧١]

* قال الذهبي: صحيح.

**لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە: پیاوێك هات بۆ لای عەبدوڵای کوڕی عەمر پرسیاری کەسێکی لێ کرد لە ئیحرامدا بێت و بچێتە لای ژنێکی، ئەویش ئاماژەی بۆ عەبدوڵای کوڕی عومەر کرد، و وتی: بڕۆ بۆ لای ئەو و پرسیاری لێ بکە، شوعەیب وتی: پیاوەکە ئەوی نەدەناسی، بۆیە لەگەڵی ڕۆیشتم و پرسیاری لە ئیبن عومەر کرد، ئەویش وتی: حەجەکەت بەتاڵ بووەتەوە، پیاوەکە وتی: ئەی چی بکەم؟ وتی: لەگەڵ خەڵکی بڕۆ و ئەوەی ئەوان دەیکەن تۆش بیکە، گەر بە ساڵی داهاتوو گەیشتی حەج بکە و هەدی پێشکەش بکە، گەڕایەوە بۆ لای عەبدوڵای کوڕی عەمر و من لەگەڵی بووم و هەواڵی پێدا، وتی: بڕۆ بۆ لای ئیبن عەباس و پرسیاری لێ بکە، شوعەیب وتی: لەگەڵی ڕۆیشتم بۆ لای ئیبن عەباس و پرسیاری لێکرد، ئەوەی پێ وت کە ئیبن عومەر پێی وتبوو، گەڕایەوە بۆ لای ئیبن عەمر و منی لەگەڵ بووم و هەواڵی پێدا بەوەی ئیبن عەباس وتی، پاشان وتی: تۆ چی دەڵێی؟ وتی: قسەی منیش وەك ئەوەیە ئەوان وتیان.**

**٢٠٣٥**– عَنْ عِكْرِمَةَ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَجُلاً وَامْرَأَتَهُ مِنْ قُرَيْشٍ لَقِيَا ابْنَ عَبَّاسٍ بِطَرِيقِ الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: أَصَبْتُ أَهْلِي، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَمَّا حَجُّكُمَا هَذَا فَقَدْ بَطَلَ، فَحُجَّا عَاماً قَابِلاً ثُمَّ أَهِلاً مِنْ حَيْثُ أَهْلَلْتُمَا، حَتَّى إِذَا بَلَغْتُمَا حَيْثُ وَقَعْتَ عَلَيْهَا فَفَارِقْهَا، فَلاَ تَرَاكَ وَلاَ تَرَاهَا حَتَّى تَرْمِيَا الْجَمْرَةَ وَأَهْدِ نَاقَةً وَلْتُهْدِ نَاقَةً. [هق٥/١٦٨]

* قال الذهبي: صحيح.

لە عیکریمەوە، مەولای ئیبن عەباس: پیاوێك و ژنێك لە رێگەی مەدینە بە ئیبن عەباس گەیشتن، وتی: چوومەتە لای ژنەکەم، ئیبن عەباس وتی: ئەم حەجەتان بەتاڵ بووەتەوە، ساڵی داهاتوو حەج بکەن و لەو شوێنەوە دەست پێ بکەن دەستتان پێکردووە، تا دەگەنە ئەوەی رۆیشتییە لای ژنەکەت، لێی جیابەرەوە و نە ئەو تۆ ببینێ و نە تۆ ئەو ببینی تا بەردەکان هەڵدەدەن، تۆ حوشترێکی مێیە بکە هەدی و ئەویش حوشترێکی مێیە بکاتە هەدی.

**٢٠٣٦-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: جَاءَ ابْنَ عَبَّاسٍ رَجُلٌ فَقَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي قَبْلَ أَنْ أَزُورَ، فَقَالَ: إِنْ كَانَتْ أَعَانَتْكَ فَعَلَى كُلِّ وَاحِدٍ مِنْكُمَا نَاقَةٌ حَسْنَاءُ جَمْلاَءُ، وَإِنْ كَانَت لَمْ تُعِنْكَ فَعَلَيْكَ نَاقَةٌ حَسْنَاءُ جَمْلاَءُ. [هق٥/١٦٨]

* قال النووي في المجموع (٣٨٧/٧): إسناده صحيح.

لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای ئیبن عەباس و وتی: بەرلەوەی زیارەت بکەم چوومە لای ژنەکەم، وتی: گەر ژنەکەت کۆمەکی کردووی[1] ئەوا لەسەر هەریەکەتان حوشترێکی مێیەی باش و جوانتان لەسەرە، گەر کۆمەکی نەکردووی حوشترێکی مێیەی باشی جوانت لەسەرە.

## ٥١- دەروازەی: کەسێ حەجی لەدەستبچێت

**٢٠٣٧-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ: أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيَّ خَرَجَ حَاجّاً، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالنَّازِيَةِ مِنْ طَرِيقِ مَكَّةَ أَضَلَّ رَوَاحِلَهُ، وَإِنَّهُ قَدِمَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ يَوْمَ النَّحْرِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ عُمَرُ: اصْنَعْ كَمَا يَصْنَعُ الْمُعْتَمِرُ، ثُمَّ قَدْ حَلَلْتَ، فَإِذَا أَدْرَكَكَ الْحَجُّ قَابِلاً فَاحْجُجْ، وَأَهْدِ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ. [ط ٨٧٠]

* إسناده صحيح.

[1] واتە: گەر ژنەکەت هەروەك تۆ ویستبێتی ئەو کارە ئەنجام بدەن و بچنە لای یەك ئەوا هەردووکتان هەدیتان لەسەرە، بەڵام گەر تۆ ئەوت ناچار کردبێت تەنها تۆ هەدیت لەسەرە-و.

لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ڕۆیشت بۆ حەج، تا گەیشتە "النازية"[1] لە ڕێگەی مەککە قافڵەکەی خۆی بزر کرد، ئەو ڕۆژی سەربڕین هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب و ئەوەی بۆ باس کرد، عومەر وتی: ئەوەی عومرەکار دەیکات تۆش بیکە، پاشان ئیحرام بشکێنە، گەر ساڵی داهاتوو حەجت پیا گەیشت حەج بکە و چەند دەتوانی هەدی پێشکەش بکە.

## ٥٢- حەجکردن هەموو پێنج ساڵ جارێك

**٢٠٣٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(قَالَ اللهُ: إِنَّ عَبْداً صَحَّحْتُ لَهُ جِسْمَهُ، وَوَسَّعْتُ عَلَيْهِ فِي المَعِيْشَةِ، يَمْضِي عَلَيْهِ خَمْسَةُ أَعْوَامٍ لا يَفِدُ إِلَيَّ لَمَحْرُومٌ)**.

* حديث صحيح. [حب٣٧٠٣/ هق٢٦٢/٥]

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا فەرمووی: جەستەی بەندەیەکم ساغڵەم کرد و ژیان و گوزەرانم بەسەردا بەرین کرد، پێنج ساڵی بەسەردا تێدەپەڕێ و نایەت بۆ لام[2]، ئەو کەسە بێبەشە)**.

## ٥٣- دەروازەی: کەسێك لە نوسکی خۆی شتێك لەبیربکات

**٢٠٣٩-** عن عَبْدِ الله بْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ نَسِيَ مِنْ نُسُكِهِ شَيْئاً أَوْ تَرَكَهُ، فَلْيُهْرِقْ دَماً.

* قال النووي: صحيح موقوفاً. [هق١٥٢/٥]

لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە، ئەو وتی: هەر کەس شتێك لە نوسکەکەی لەبیرکرد یان وازلێهێنا با خوێن بڕێژێت[3].

---

[1] "النازية" شیو و دۆڵێکە-و.

[2] واتە: حەجی ماڵی خودا ناکات-و.

[3] واتە: حەیوان سەربڕێت-و.

## ٥٤- دەروازەی: حەجی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٢٠٤٠**- (م) عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، فَسَأَلَ عَنِ الْقَوْمِ حَتَّى انْتَهَى إِلَيَّ، فَقُلْتُ: أَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، فَأَهْوَى بِيَدِهِ إِلَى رَأْسِي فَنَزَعَ زِرِّي الأَعْلَى، ثُمَّ نَزَعَ زِرِّي الأَسْفَلَ، ثُمَّ وَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ ثَدْيَيَّ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ غُلاَمٌ شَابٌّ، فَقَالَ: مَرْحَباً بِكَ يَا ابْنَ أَخِي! سَلْ عَمَّا شِئْتَ. فَسَأَلْتُهُ وَهُوَ أَعْمَى، وَحَضَرَ وَقْتُ الصَّلاَةِ، فَقَامَ فِي نِسَاجَةٍ مُلْتَحِفاً بِهَا، كُلَّمَا وَضَعَهَا عَلَى مَنْكِبِهِ رَجَعَ طَرَفَاهَا إِلَيْهِ مِنْ صِغَرِهَا، وَرِدَاؤُهُ إِلَى جَنْبِهِ، عَلَى الْمِشْجَبِ، فَصَلَّى بِنَا.

فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ حَجَّةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ بِيَدِهِ، فَعَقَدَ تِسْعاً، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَكَثَ تِسْعَ سِنِينَ لَمْ يَحُجَّ، ثُمَّ أَذَّنَ فِي النَّاسِ فِي الْعَاشِرَةِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَاجٌّ. فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ بَشَرٌ كَثِيرٌ، كُلُّهُمْ يَلْتَمِسُ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَيَعْمَلَ مِثْلَ عَمَلِهِ.

فَخَرَجْنَا مَعَهُ، حَتَّى أَتَيْنَا ذَا الْحُلَيْفَةِ، فَوَلَدَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: كَيْفَ أَصْنَعُ؟ قَالَ: (**اغْتَسِلِي، وَاسْتَثْفِرِي بِثَوْبٍ، وَأَحْرِمِي**).

فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ، حَتَّى إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ نَاقَتُهُ عَلَى الْبَيْدَاءِ، نَظَرْتُ إِلَى مَدِّ بَصَرِي بَيْنَ يَدَيْهِ مِنْ رَاكِبٍ وَمَاشٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ مِثْلَ ذلِكَ، وَعَنْ يَسَارِهِ مِثْلَ ذلِكَ، وَمِنْ خَلْفِهِ مِثْلَ ذلِكَ، وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَيْنَ أَظْهُرِنَا، وَعَلَيْهِ يَنْزِلُ الْقُرْآنُ، وَهُوَ يَعْرِفُ تَأْوِيلَهُ، وَمَا عَمِلَ بِهِ مِنْ شَيْءٍ عَمِلْنَا بِهِ.

فَأَهَلَّ بِالتَّوْحِيدِ (**لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ**). وَأَهَلَّ النَّاسُ بِهَذَا الَّذِي يُهِلُّونَ بِهِ، فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَيْهِمْ شَيْئاً مِنْهُ، وَلَزِمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تَلْبِيَتَهُ.

قَالَ جَابِرٌ ﷺ: لَسْنَا نَنْوِي إِلاَّ الْحَجَّ، لَسْنَا نَعْرِفُ الْعُمْرَةَ، حَتَّى إِذَا أَتَيْنَا الْبَيْتَ مَعَهُ، اسْتَلَمَ الرُّكْنَ، فَرَمَلَ ثَلاَثاً، وَمَشَى أَرْبَعاً، ثُمَّ نَفَذَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ عليه السلام، فَقَرَأَ: ﴿**وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى**﴾ [البقرة:١٢٥] فَجَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ، فَكَانَ أَبِي يَقُولُ ـ وَلاَ أَعْلَمُهُ ذَكَرَهُ إِلاَّ عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ: كَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ ﴿**قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ①**﴾، وَ﴿**قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ①**﴾، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الرُّكْنِ فَاسْتَلَمَهُ.

ثُمَّ خَرَجَ مِنَ الْبَابِ إِلَى الصَّفَا، فَلَمَّا دَنَا مِنَ الصَّفَا قَرَأَ: ﴿**إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ**﴾ [البقرة:١٥٨] (**أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللهُ بِهِ**). فَبَدَأَ بِالصَّفَا، فَرَقِيَ عَلَيْهِ حَتَّى رَأَى الْبَيْتَ، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَوَحَّدَ اللهَ وَكَبَّرَهُ، وَقَالَ: (**لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ**). ثُمَّ دَعَا بَيْنَ ذلِكَ، قَالَ مِثْلَ هَذَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. ثُمَّ نَزَلَ إِلَى الْمَرْوَةِ، حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ فِي بَطْنِ الْوَادِي سَعَى، حَتَّى إِذَا صَعِدَتَا مَشَى، حَتَّى أَتَى الْمَرْوَةَ، فَفَعَلَ عَلَى الْمَرْوَةِ كَمَا فَعَلَ عَلَى الصَّفَا.

حَتَّى إِذَا كَانَ آخِرُ طَوَافِهِ عَلَى الْمَرْوَةِ فَقَالَ: (**لَوْ أَنِّي اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ لَمْ أَسُقِ الْهَدْيَ، وَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً، فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ لَيْسَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلْيَحِلَّ، وَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً**).

فَقَامَ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلِعَامِنَا هَذَا أَمْ لِأَبَدٍ؟ فَشَبَّكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَصَابِعَهُ وَاحِدَةً فِي الأُخْرَى، وَقَالَ: (**دَخَلَتِ الْعُمْرَةُ فِي الْحَجِّ**) مَرَّتَيْنِ (**لاَ، بَلْ لِأَبَدِ أَبَدٍ**).

وَقَدِمَ عَلِيٌّ مِنَ الْيَمَنِ بِبُدْنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَوَجَدَ فَاطِمَةَ ﵂ مِمَّنْ حَلَّ، وَلَبِسَتْ ثِيَاباً صَبِيغاً، وَاكْتَحَلَتْ، فَأَنْكَرَ ذلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: إِنَّ أَبِي أَمَرَنِي بِهَذَا. قَالَ: فَكَانَ عَلِيٌّ يَقُولُ بِالْعِرَاقِ: فَذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مُحَرِّشاً عَلَى فَاطِمَةَ لِلَّذِي صَنَعَتْ، مُسْتَفْتِياً لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِيمَا ذَكَرَتْ عَنْهُ، فَأَخْبَرْتُهُ أَنِّي أَنْكَرْتُ ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: (**صَدَقَتْ صَدَقَتْ، مَاذَا قُلْتَ حِينَ فَرَضْتَ الْحَجَّ**)؟ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أُهِلُّ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُكَ، قَالَ: (**فَإِنَّ مَعِيَ الْهَدْيَ، فَلاَ تَحِلُّ**).

قَالَ: فَكَانَ جَمَاعَةُ الْهَدْيِ الَّذِي قَدِمَ بِهِ عَلِيٌّ مِنَ الْيَمَنِ وَالَّذِي أَتَى بِهِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مِائَةً.

قَالَ: فَحَلَّ النَّاسُ كُلُّهُمْ وَقَصَّرُوا؛ إِلاَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَمَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ. فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ تَوَجَّهُوا إِلَى مِنىً، فَأَهَلُّوا بِالْحَجِّ، وَرَكِبَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَصَلَّى بِهَا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ وَالْفَجْرَ، ثُمَّ مَكَثَ قَلِيلاً حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، وَأَمَرَ بِقُبَّةٍ مِنْ شَعْرٍ تُضْرَبُ لَهُ بِنَمِرَةَ.

فَسَارَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَلاَ تَشُكُّ قُرَيْشٌ إِلاَّ أَنَّهُ وَاقِفٌ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ، كَمَا كَانَتْ قُرَيْشٌ تَصْنَعُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَجَازَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ، فَوَجَدَ الْقُبَّةَ قَدْ ضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةَ، فَنَزَلَ بِهَا.

حَتَّى إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ، فَرُحِلَتْ لَهُ، فَأَتَى بَطْنَ الْوَادِي، فَخَطَبَ النَّاسَ وَقَالَ:

**(إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَيَّ مَوْضُوعٌ، وَدِمَاءُ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ، وَإِنَّ أَوَّلَ دَمٍ أَضَعُ مِنْ دِمَائِنَا دَمُ ابْنِ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ، كَانَ مُسْتَرْضِعاً فِي بَنِي سَعْدٍ فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ. وَرِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، وَأَوَّلُ رِباً أَضَعُ رِبَانَا، رِبَا عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ. فَاتَّقُوا اللهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللهِ، وَلَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لاَ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَداً تَكْرَهُونَهُ، فَإِنْ فَعَلْنَ ذَلِكَ فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْباً غَيْرَ مُبَرِّحٍ، وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ. وَقَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ مَا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ إِنِ اعْتَصَمْتُمْ بِهِ: كِتَابُ اللهِ، وَأَنْتُمْ تُسْأَلُونَ عَنِّي، فَمَا أَنْتُمْ قَائِلُونَ)**؟.

قَالُوا: نَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ وَأَدَّيْتَ وَنَصَحْتَ.

فَقَالَ بِإِصْبَعِهِ السَّبَّابَةِ، يَرْفَعُهَا إِلَى السَّمَاءِ وَيَنْكُتُهَا إِلَى النَّاسِ: **(اللَّهُمَّ اشْهَدْ. اللَّهُمَّ اشْهَدْ)** ثَلاَثَ مَرَّاتٍ.

ثُمَّ أَذَّنَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئاً.

ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، حَتَّى أَتَى الْمَوْقِفَ، فَجَعَلَ بَطْنَ نَاقَتِهِ الْقَصْوَاءِ إِلَى الصَّخَرَاتِ، وَجَعَلَ حَبْلَ الْمُشَاةِ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفاً حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَذَهَبَتِ الصُّفْرَةُ قَلِيلاً حَتَّى غَابَ الْقُرْصُ، وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ خَلْفَهُ، وَدَفَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَقَدْ شَنَقَ لِلْقَصْوَاءِ الزِّمَامَ حَتَّى إِنَّ رَأْسَهَا لَيُصِيبُ مَوْرِكَ رَحْلِهِ، وَيَقُولُ بِيَدِهِ الْيُمْنَى: **(أَيُّهَا النَّاسُ، السَّكِينَةَ السَّكِينَةَ)** كُلَّمَا أَتَى حَبلاً مِنَ الْحِبَالِ أَرْخَى لَهَا قَلِيلاً، حَتَّى تَصْعَدَ.

حَتَّى أَتَى الْمُزْدَلِفَةَ، فَصَلَّى بِهَا الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ، وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا شَيْئاً، ثُمَّ اضْطَجَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، وَصَلَّى الْفَجْرَ، حِينَ تَبَيَّنَ لَهُ الصُّبْحُ، بِأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ.

ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ، حَتَّى أَتَى الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَدَعَاهُ وَكَبَّرَهُ وَهَلَّلَهُ وَوَحَّدَهُ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفاً حَتَّى أَسْفَرَ جِدّاً، فَدَفَعَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَأَرْدَفَ الْفَضْلَ بْنَ عَبَّاسٍ، وَكَانَ رَجُلاً حَسَنَ الشَّعْرِ أَبْيَضَ وَسِيماً. فَلَمَّا دَفَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَرَّتْ بِهِ ظُعُنٌ يَجْرِينَ، فَطَفِقَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهِنَّ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَدَهُ عَلَى وَجْهِ الْفَضْلِ، فَحَوَّلَ الْفَضْلُ

وَجْهَهُ إِلى الشِّقِّ الآخَرِ يَنْظُرُ، فَحَوَّل رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَدَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ عَلَى وَجْهِ الْفَضْلِ، يَصْرِفُ وَجْهَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ يَنْظرُ، حَتَّى أَتَى بَطْنَ مُحَسِّرٍ، فَحَرَّكَ قَلِيلاً.

ثُمَّ سَلَكَ الطَّرِيقَ الْوُسْطَى الَّتِي تَخْرُجُ عَلَى الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى، حَتَّى أَتَى الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الشَّجَرَةِ، فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ مِنْهَا، حَصَى الْخَذْفِ، رَمَى مِنْ بَطْنِ الْوَادِي.

ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمَنْحَرِ، فَنَحَرَ ثَلاَثاً وَسِتِّينَ بِيَدِهِ، ثُمَّ أَعْطَى عَلِيّاً، فَنَحَرَ مَا غَبَرَ، وَأَشْرَكَهُ فِي هَدْيِهِ. ثُمَّ أَمَرَ مِنْ كُلِّ بَدَنَةٍ بِبَضْعَةٍ، فَجُعِلَتْ فِي قِدْرٍ، فَطُبِخَتْ، فَأَكَلاَ مِنْ لَحْمِهَا وَشَرِبَا مِنْ مَرَقِهَا. ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَفَاضَ إِلَى الْبَيْتِ، فَصَلَّى بِمَكَّةَ الظُّهْرَ، فَأَتَى بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ يَسْقُونَ عَلَى زَمْزَمَ، فَقَالَ: (**انْزِعُوا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ! فَلَوْلاَ أَنْ يَغْلِبَكُمُ النَّاسُ عَلَى سِقَايَتِكُمْ، لَنَزَعْتُ معَكُمْ**)، فَنَاوَلُوهُ دَلْواً، فَشَرِبَ مِنْهُ. [م١٢١٨]

**(م) لە جەعفەری کوڕی محەمەدەوە، لە باوکییەوە: چووینە ژوورەوە بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵا، پرسیاری لە خەڵکەکە کرد تا گەیشتە من، وتم: من محەمەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینم، دەستی هێنا بە سەرمدا، قۆپچەی سەرەوەی کردمەوە و پاشان قۆپچەی خوارەوەمی کردەوە و پاشان دەستی خستە نێوان دوو مەمکم، من لەو رۆژەدا هەرزەکارێك بووم، وتی: مەرحەبات لێ بێت، برازای خۆم، هەرچی دەخوازی بپرسە، منیش پرسیارم لێکرد و ئەو نابینا بوو، کاتی نوێژ هاتە بەرەوە، لە چنراوێکدا کە خۆی پێ پێچابوویەوە هەستایە سەرپێ، هەرکات هەڵیدەدایە سەر شانی دوو لاکەی لە بچووکیدا بۆی دەگەڕانەوە، و کراسەکەی لە تەنیشتی بوو لەسەر توڵێنەیەك[(١)]، و نوێژی بۆ کردین.**

**وتم: هەواڵم پێ بدە دەربارەی حەجەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، بە دەستی نۆی ژمارد و وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نۆ ساڵ مایەوە و حەجی نەکرد، پاشان لە دەیەمدا بانگی دێرا بەناو خەڵکدا: پێغەمبەری خودا(ﷺ) حەج دەکات، خەڵکێکی زۆر لە مەدینە هاتن، هەموویان دەیانویست چاو لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بکەن، و وەك کارەکەی ئەو کار بکەن.**

---

**(١) توڵێنە: لە توڵەدار دروست دەکرێت–و.**

لەگەڵی دەرچووین تا هاتین بۆ "ذو الحُلَيْفَة[1]"، ئەسمای کچی عومەیس محەمەدی کوڕی ئەبوبەکری بوو، ناردی بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) چی بکەم؟ فەرمووی: **(خۆت بشۆرە و بە پۆشاکێك ناوەندت بپێچە و ئیحرام بپۆشە)**.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مزگەوت نوێژی کرد، پاشان سواری "القصواء[2]" بوو، تا حوشترەکەی گەیاندییە "البيداء[3]" تەماشام کرد تا چاو هانا بکات سوار و پیادەڕەو لەپێشەوەی پێغەمبەری خوداوەن، لای ڕاستییەوە هەر بەو جۆرە و لای چەپییەوە هەر بەو جۆرە و لەدواوەی بەهەمان شێوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ناوەڕاستمان بوو و قورئانی بۆ سەر دادەبەزی و ئەو تەئویلەکەی دەزانی و هەر شتێکی دەکرد بە کردار ئێمەش دەمانکرد.

بە یەکتایی دەستی پێکرد: **(لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، إنَّ الحمد والنعمة لك والملك، لا شريك لك)**، خەڵکیش بەوەی دەستی پێ دەکەن دەستیان پێکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) شتێك لەوەی لێ ڕەد نەکردنەوە و پێغەمبەری خودا(ﷺ) پابەندی تەلبییەکەی بوو.

جابر وتی: تەنها بۆ حەج نێتمان هێنا بوو، عومرەمان نەدەزانی، تا لەگەڵی هاتین بۆ بەیت، دەستی هێنا بە بەردەڕەشەکەدا، سێ جار تەکانی دا و چوار جار ڕۆیشتنی ئاسایی[4]، پاشان ڕۆیشت بۆ لای مەقامی ئیبراهیم و ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ [البقرة:١٢٥]، مەقامی خستە نێوان خۆی و بەیتەوە، باوکم دەیوت[5]-وا دەزانم لە پێغەمبەرەوە باسی دەکرد-: لە دوو

---

[1] میقاتی ئەهلی مەدینە-و.

[2] "القصواء" حوشترێکی مێیەی پێغەمبەر بوو-و.

[3] ناوی شوێنێکە-و.

[4] واتە: حەوت دەورەی بەیتی کرد، سیانی یەکەم بە تەکان و چوارەکەی تر بە ڕۆیشتنی ئاسایی-و.

[5] جەعفەر دەڵێ: محەمەدی باوکم دەیوت-و.

﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ۝١﴾ و ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ۝١﴾ دەخوێند، پاشان گەڕایەوە بۆ روکن دەستی پێداهێنا.

پاشان لە دەرگاکەوە رۆیشتە دەرەوە بۆ صەفا کاتێ لە صەفا نزیکبوویەوە ئەمەی خوێند: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ﴾ [البقرة:١٥٨]، (**بەوە دەستپێبکە خودا دەستی پێکردووە**)، بە "الصفا" دەستی پێکردووە، بەسەریدا سەرکەوت تا بەیتی بینی، رووی لە قیبلە کرد، خودای بە تاك و تەنها راگرت و مەزنی و شکۆمەندی دایەپاڵ و فەرمووی: (**لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، لا إله إلا الله وحده، بەڵێنەکەی خۆی هێنا دی و بەندەکەی خۆی سەرخست و بەتەنها ئەحزابی بەزاند**)، پاشان لە نێوان ئەوە دوعای کرد، سێ جار وەك ئەوەی فەرموو، پاشان دابەزی بۆ مەروە، کاتێ پێیەکانی گەیشتنە قوڵایی دۆڵەکە تەکانیدا، تا کەوتنە بەرزبوونەوە بە رۆیشتنی ئاسایی رۆیشت، تا گەیشتە مەروە، ئەوەی لەسەر صەفا کردبووی لەسەر مەروەش کردی.

تا دوایین تەواف لەسەر مەروە فەرمووی: (**گەر ئەوەی گوزەری کرد رووم لێکردبا هەدیم رەوانە نەدەکرد**[1] **و دەمکرد بە عومرە، هەر کەس لە ئێوە هەدی پێ نییە با ئیحرام بشکێنێ و بیکات بە عومرە**).

سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوم هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا تەنها بۆ ئەم ساڵەمان یان بۆ هەتاهەتا؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) پەنجەکانی یەك لەدوای یەك هەڵپێکا و فەرمووی: (**عومرە چووەتە ناو حەجەوە**)، دوو جار (**نەخێر، بەڵکو بۆ هەتاهەتایە**).

عەلی لای راستەوە حوشترەکانی پێغەمبەری(ﷺ) پێشخست بینی فاتیمە لەو کەسانەیە ئیحرامی شکاندووە و پۆشاکێکی بۆیاخکراوی لەبەرە و چاوی خۆی رشتووە، ئەوەی لێ بە ناپەسەند بینی، فاتیمە وتی: باوکم فەرمانی پێکردم بەوە، وتی: عەلی لە عێراق دەیوت: رۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ شکات لە

[1] پێغەمبەر هەدی پێشکەش کرد بوو بۆیە ئیحرامی نەشکاند–و.

فاتیمە بۆ ئەو شتەی ئەنجامیداوە و داوای فتوا لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بکەم بۆ ئەو شتەی فاتیمە لە ئەوەوە باسی کرد، هەواڵم پێدا من ئەو کارەم لە ئەو ناپەسەند بینی، فەرمووی: (**راستی کرد، راستی کرد، چیت وت کاتێ حەجت بۆ خۆت فەرز کرد؟**)، وتی: وتم: خودایە، من بەوە دەست پێدەکەم پێغەمبەرەکەت دەستی پێ دەکات، فەرمووی: (**هەدیم لەگەڵە بۆیە حەلاڵ نابێت**[1]).

وتی: ئەو کۆمەڵە هەدیەی عەلی لای راستەوە پێشیخست و ئەوەی هێنای بۆ پێغەمبەر(ﷺ) سەد دانە بوو.

وتی: هەموو خەڵکی ئیحرامی شکاند و سەریان کورتکردەوە جگە لە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوانەی هەدیان لەگەڵ بوو، کاتێ رۆژی "التروية[2]" هاتە بەرەوە روویان لە مینا کرد و دەستیان بە حەج کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوار بوو و نوێژی نیوەڕۆ و عەصر و مەغریب و عیشای لەوێ کرد، پاشان کەمێك مایەوە تا خۆرهەڵهات، فەرمانی کرد دەوارێکی لە "نمرة" بۆ هەڵبدەن.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) رۆیشت، قورەیش شکی لەوە نەبوو ئەو لە "المشعر الحرام" دەوەستێ، وەك چۆن قورەیش لە سەردەمی نەفامیدا ئەوەیان دەکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) تێپەڕاند تا هات بۆ عەرەفە، بینی لە "نمرة" دەوارەکەیان بۆهەڵداوە، تیایدا دابەزی.

تا خۆر لاربوویەوە، فەرمانی کرد "القصواء"ی بۆ بهێنن، بۆیان ئامادە کرد، هات بۆ ناو دۆڵەکە و وتاری بۆ خەڵك دا و فەرمووی: (**خوێن و ماڵ و سامانتان لە یەکتر حەرامە، وەك حەرامی ئەم رۆژەتان و ئەم مانگەتان و لەم شارەتان، دەزانن هەرچی شتە لە کاروباری نەفامی لەژێر پێم نێژراون، خوێنی سەردەمی نەفامی نێژراوە، یەکەمین خوێنێك لە خوێنی ئێمە دەنێژرێ خوێنی رەبیعەی کوڕی حاریسەیە، ئەو لە بەنی سەعد شیری دەخواست و هوزەیل کوشتیان، سووی سەردەمی نەفامی نێژراوە، یەکەمین سوویەك دەینێژم سووی ئێمەیە، سووی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب،**

---

[1] کەسێك هەدی پێ بێت حەلاڵ نییە ئیحرام بشکێنێت-و.

[2] واتە: هەشتی زیلحەجە-و.

**هەموو ئەو سووانە نێژراون، لە خودا بترسن دەربارەی ئافرەتان، ئێوە بە ئەمانەتی خودا ئەوانتان وەرگرتووە و بە کەلیمەی خودا داوێنی ئەوانتان بۆ حەلاڵ بووە، بۆ ئێوە لەسەر ئەوانە[1] کەسێك پێ لەسەر فەرشتان دانەنێت رقتان لێیەتی، گەر ئەو کارەیان کرد لێیان بدەن بە لێدانێکی بێ ئازار، بۆ ئەوان لەسەر ئێوە رۆزی و پۆشاك هەیە بە چاکە، لەناو ئێوە شتێکم بەجێهێڵاوە گەر دەستی پێوە بگرن هەرگیز لە پشتییەوە گومڕا نابن: کتێبەکەی خودا، ئێوەش پرسیارتان لێ دەکرێت دەربارەی من، ئێوە چی دەڵێن؟).**

وتیان: شایەتی دەدەین پەیامەکە و ئەمانەتەکەت گەیاند و ئامۆژگاریت ئەنجامدا.

بە پەنجەی شایەتمانی کە بۆ ئاسمان بەرزی دەکردەوە و بۆ خەڵکی دایدەنەواند، فەرمووی: (**خودایە، تۆ شایەت بە، خودایە تۆ شایەت بە**) سێ جار.

پاشان بانگیدا، و پاشان قامەتی کرد و نوێژی نیوەڕۆی کرد و پاشان قامەتی کرد و نوێژی عەصری کرد، لە نێوان ئەو دوو نوێژە نوێژی تری نەکرد.

پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوار بوو، تا هات بۆ "الموقف"، سکی حوشترەکەی-القصواء- کردە بەردەکان[2] و پەتی لێخوڕینەکەی خستە بەردەمی و رووی لە قیبلە کرد، بەردەوام بەپێوە وەستا بوو تا خۆر بەرەو ئاوا بوو رۆیشت و کەمێك لە زەردەپەڕ رۆیشت و تەنی خۆر بزر بوو، ئوسامەی لە پاشکۆی نا، و پێغەمبەری خودا کەوتە رۆیشتن، بە جۆرێك جڵەوی "القصواء"ی توند کرد بوو تا سەری لە بەرزی کۆڵەکەی توند بووبوو، بە دەستی راستی دەیفەرموو: (**خەڵکینە، سەکینەت، سەکینەت**)، هەرکات پەتێ لە پەتانی بۆ دەهات کەمێك جڵەوەکەی شل دەکرد تا سەربکەوێت.

تا هاتە موزدەلیفە، نوێژی مەغریب و عیشای لەو شوێنە کرد، بە یەك بانگ و دوو قامەت و لە نێوانیان تەسبیحی نەکرد، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) راکشا تا فەجر هەڵهات بە یەك بانگ و قامەت نوێژی بەیانی کرد کاتێ بەیانی لا رۆشن بوویەوە.

---

[1] واتە: مافی پیاوان لەسەر ژنان-و.

[2] واتە: لە تەنیشتی کۆمەڵێك بەرد رایگرت-و.

پاشان سواری "القصواء" بوو تا هاتە "المشعر الحرام"، رووی لە قیبلە کرد، دوعای کرد و تەکبیر و تەهلیلی کرد و خودای بە تاك و تەنها راگرت، بەردەوام لەو شوێنە بەپێوە وەستا بوو تا بەتەواوی دنیا زەردهەڵگەڕا، کەوتەوە رۆیشتن بەر لە هەڵاتنی خۆر، فەزڵی کوڕی عەباسی لە پاشکۆ نابوو، ئەو پیاوێکی پرچ جوانی سپیکاری جوانخاس بوو، کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەوتەوە رۆیشتن چەند ئافرەتێك بە پاڵیدا گوزەریان کرد، فەزڵ تەماشای ئافرەتەکانی دەکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی نا بە روخساری فەزڵدا، فەزڵ رووی خۆی وەرچەرخان بۆ لایەکەی تر و تەماشای دەکرد، لە لاکەی ترەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی خۆی نا بە روخساری فەزڵدا، ئەو روخساری فەزڵی لە لاکەی تریشەوە لە تەماشاکردن لا دەدا، تا هات بۆ "بَطْنَ مُحَسِّرٍ"[1] و کەمێك جوڵا.

پاشان رێگەی ناوەندی گرتەبەر کە دەردەچێت بۆ "الجمرة الكبرى" تا هات بۆ لای "الجمرة" کە لای دارەکەیە، بە حەوت دانە چەو هەڵدانی کرد، لەگەڵ هەر دەنکە چەوێك تەکبیری دەکرد، چەوی نێوان پەنجە، لە قولایی دۆڵەکەوە هەڵدانی کرد.

پاشان رۆیشت بۆ جێسەربڕینەکە(المنحر)، شەست و سێ دانەی بە دەستی خۆی سەربڕی، پاشان دایە دەست عەلی و ئەوانی تری سەربڕی و لە هەدیەکەی خۆی ئەوی بەشدار کرد، پاشان فەرمانی کرد لە هەر حوشترێك پارچەیەك بکەنە مەنجەڵێکەوە و لێنرا، هەردووکیان لە گۆشتەکەیان خوارد و لە گۆشتاوەکەیان نۆش کرد.

پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوار بوو و کەوتە بەر لێشاوی رۆیشتن بۆ بەیت، نوێژی نیوەڕۆی لە مەککە کرد، هات بۆ لای بەنی عەبدولموتەلیب کە لەسەر زەمزەم ئاویان دەبەخشییەوە، فەرمووی: **(ئاو هەڵکێشن ئەی بەنی عەبدولموتەلیب، گەر خەڵکی لەسەر ئاوهەڵکێشان بەسەر ئێوەدا زاڵ نەبوایە[2] ئاوم لەگەڵ هەڵدەکێشان)**.

---

[1] ناوی شیوێکە–و.

[2] واتە: خەڵکی لەبەر سوننەتەکە چاو لە پێغەمبەر بکەن و بێن و ئاوهەڵبکێشن و بە قەرەباڵغییەکەیان بەسەر ئێوەدا زاڵ ببن–و.

## بەشی دووەم

## فەزڵەكانی مەككە

### ١- دەروازەی: چوونە ژوورەوەی مەككە و هاتنە دەرەوە لێی

**٢٠٤١-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم لَمَّا جاءَ إِلَى مَكَّةَ، دَخَلَ مِنْ أَعْلاَهَا، وَخَرَجَ مِنْ أَسْفَلِهَا. [خ١٥٧٧/ م١٢٥٨]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): كاتێ پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ مەككە لە سەرەوەی مەككەوە چووە ژوورەوە و لە خوارەوەی چووە دەرەوە.**

**٢٠٤٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم دَخَلَ مَكَّةَ نَهَاراً.

* صحيح. [ت٨٥٤/ جه٢٩٤١]

**لە ئیبن عومەرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) بە رۆژ چووە ناو مەككە.**

### ٢- دەروازەی: چوونە ناوەوەی مەككە بەبێ ئیحرام

**٢٠٤٣-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم دَخَلَ مَكَّةَ. وَقَالَ قُتَيْبَةُ: دَخَلَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ. وعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ. [م١٣٥٨]

**(م) لە جابری كوڕی عەبدوڵای ئەنصارییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) چووە ناو مەككەوە-قوتەیبە وتی: رۆژی فەتحی مەككە چووە ژوورەوە- مێزەرەیەكی رەشی لەسەر بوو بەبێ ئیحرام.**

**٢٠٤٤-** عَنْ مَالِك، عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ أَقْبَلَ مِنْ مَكَّةَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِقُدَيْدٍ، جَاءَهُ خَبَرٌ مِنَ الْمَدِينَةِ فَرَجَعَ فَدَخَلَ مَكَّةَ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ. [ط ٩٦٥]

* إسناده صحيح.

لە مالیکەوە، لە نافیعەوە: عەبدوڵای کوڕی عومەر لە مەککە گەڕایەوە تا گەیشتە "قُدَيْد[1]" هەواڵێکی لە مەدینەوە بۆ هات، بۆیە گەڕایەوە و بەبێ ئیحرام چووە ناو مەککە.

## ٣- دەروازەی: حورمەتی مەککە

**٢٠٤٥-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ افْتَتَحَ مَكَّةَ: **(لاَ هِجْرَةَ، ولكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا، فَإِنَّ هَذَا بَلَدٌ حَرَّمَهُ اللهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّماوَاتِ وَالأَرْضَ، وَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَإِنَّهُ لَمْ يَحِلَّ الْقِتَالُ فِيهِ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَلَمْ يَحِلَّ لِي إِلاَّ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، لاَ يُعْضَدُ شَوْكُهُ، وَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهُ، وَلاَ يَلْتَقِطُ لُقَطَتَهُ إِلاَّ مَنْ عَرَّفَهَا، وَلاَ يُخْتَلَى خَلاَهَا)**. قَالَ العَبَّاسُ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِلاَّ الإِذْخِرَ، فَإِنَّهُ لِقَيْنِهِمْ وَلِبُيُوتِهِمْ، قَالَ: قَالَ: **(إِلاَّ الإِذْخِرَ)**. [خ١٨٣٤ (١٣٤٩)/ م١٣٥٣]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی فەتحی مەککە فەرمووی: **(کۆچ نەما، بەڵام جیهاد و نیێت[2]، گەر داوای غەزاتان لێکرا بڕۆن، ئەمە شارێکە خودا حەرامی کردووە ڕۆژێك ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد، ئەم شوێنە حەرامە بە حەرام کردنی خودا تا ڕۆژی قیامەت، بۆ کەسێك بەر لە من جەنگی تێدا حەڵاڵ نەبووە، تەنها ساتێك لە ڕۆژ بۆ من حەڵاڵ کرا، ئەم شوێنە حەرامە بە حەرامکردنی خودا تا ڕۆژی قیامەت، دڕکی نابڕڕێت و نێچیری ناترسێنرێ، لێکەوتەی(ونبووی) هەڵناگیرێتەوە مەگەر بۆ کەسێك بیناسێتەوە، لەوەڕگای دروێنە ناکرێت)**.

عەباس وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، جگە لە "الإذْخِر[3]" ئەوە بۆ ئاسنگەر و ماڵەکانیانە، وتی: فەرمووی: **(جگە لە "الإذْخِر")**.

---

[1] یەکێکە لە شیوەکانی ناوچەی مەککە-و.

[2] واتە: جیهاد و نیێت ماوە-و.

[3] ڕووەکێکی بۆنخۆشە-و.

## ٤- دەروازەی: نەهی كردن لە هەڵگرتنی چەك لە مەككە

٢٠٤٦- (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**لاَ يَحِلُّ لأَحَدِكُمْ أَنْ يَحْمِلَ بِمَكَّةَ السِّلاَحَ**). [م١٣٥٦]

[وانظر: ١٥٠٢].

(م) لە جابرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**بۆ یەكێك لە ئێوە حەڵاڵ نییە لە مەككە چەك هەڵبگرێت**).

## ٥- دەروازەی: بینای كەعبە

٢٠٤٧- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ . زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم .: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لَهَا: (**أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ قَوْمَكِ لَمَّا بَنَوُا الْكَعْبَةَ، اقْتَصَرُوا عَنْ قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ**)، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلاَ تَرُدُّهَا عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ؟ قَالَ: (**لَوْلاَ حِدْثَانُ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ؛ لَفَعَلْتُ**). فَقَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: لَئِنْ كَانَتْ عَائِشَةُ ﷺ سَمِعَتْ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، ما أُرَى رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تَرَكَ اسْتِلاَمَ الرُّكْنَيْنِ اللَّذَيْنِ يَلِيَانِ الحِجْرَ، إِلاَّ أَنَّ الْبَيْتَ لَمْ يُتَمَّمْ عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ. [خ١٥٨٣ (١٢٦)/ م١٣٣٣]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)-هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)- پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: (**نابینی كاتێ هۆزەكەت كەعبەیان بیناكردەوە لە بناغەكەی ئیبراهیم كورتیان كردەوە**)، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، نایگێڕییەوە سەر بناغەكەی ئیبراهیم؟ فەرمووی: (**گەر تازە وازلێهێنانی هۆزەكەت نەبوایە لە بێباوەڕی ئەو كارەم دەكرد**).

عەبدوڵا(خوا لێی رازی بێت)[1] وتی: گەر عائیشە(خوا لێی رازی بێت) ئەمەی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیستبێت پێموانییە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیستیلامی

---

[1] عەبدوڵای كوڕی عومەر.

دوو گۆشەکەی رووی حیجری وازلێبێنابا، چونکە بەیت لەسەر بناغەکەی ئیبراهیم تەواو نەکراوە.

- وفي رواية لهما: قَالَتْ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الجَدْرِ، أَمِنَ الْبَيْتِ هُوَ؟ قَالَ: (نَعَمْ). قُلْتُ: فَمَا لَهُمْ لَمْ يُدْخِلُوهُ فِي الْبَيْتِ؟ قَالَ: (إِنَّ قَوْمَكِ قَصَّرَتْ بِهِمُ النَّفَقَةُ). قُلْتُ: فَمَا شَأْنُ بَابِهِ مُرْتَفِعاً؟ قَالَ: (فَعَلَ ذلِكَ قَوْمُكِ، لِيُدْخِلُوا مَنْ شَاؤُوا وَيَمْنَعُوا مَنْ شَاؤُوا، وَلَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِالْجَاهِلِيَّةِ، فَأَخَافُ أَنْ تُنْكِرَ قُلُوبُهُمْ، أَنْ أُدْخِلَ الجَدْرَ فِي الْبَيْتِ، وَأَنْ أُلْصِقَ بَابَهُ بِالأَرْضِ). [خ١٥٨٤]

لە ریوایەتێکی هەردووکیان: عائیشە وتی: پرسیارم لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد دەربارەی "الجَدْر"[١]، ئایا ئەوە لە بەیتە؟ فەرمووی: (بەڵێ)، وتم: ئەی بۆچی نەیانخستووەتە ناو بەیتەوە؟ فەرمووی: (هۆزەکەت خەرجی ئەوەیان نەبووە)، وتم: ئەی بۆچی دەرگاکەی بەرزە؟ فەرمووی: (هۆزەکەت ئەوەی کردووە تاکو هەرکەس بخوازن بیکەنە ژوورەوە و رێگری بکەن لە هەر کەس بیانەوێت، گەر هۆزەکەت تازە سەردەم نەبوونایە بە نەفامی، و ترسی ئەوەم نەبوایە دڵیان بە خراپی بزانێت ئەوا "الجدر"م دەخستە ناو بەیتەوە و دەرگاکەیم دەلکاند بە زەوییەوە).

- وفي رواية لمسلم: عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: لَمَّا احْتَرَقَ الْبَيْتُ زَمَنَ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ، حِينَ غَزَاهَا أَهْلُ الشَّامِ، فَكَانَ مِنْ أَمْرِهِ مَا كَانَ، تَرَكَهُ ابْنُ الزُّبَيْرِ، حَتَّى قَدِمَ النَّاسُ الْمَوْسِمَ، يُرِيدُ أَنْ يُجَرِّئَهُمْ. أَوْ يُحَرِّبَهُمْ . عَلَى أَهْلِ الشَّامِ. فَلَمَّا صَدَرَ النَّاسُ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَشِيرُوا عَلَيَّ فِي الْكَعْبَةِ، أَنْقُضُهَا ثُمَّ أَبْنِي بِنَاءَهَا، أَوْ أُصْلِحُ مَا وَهَى مِنْهَا؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَإِنِّي قَدْ فُرِقَ لِي رَأْيٌ فِيهَا، أَرَى أَنْ تُصْلِحَ مَا وَهَى مِنْهَا، وَتَدَعَ بَيْتاً أَسْلَمَ النَّاسُ عَلَيْهِ، وَأَحْجَاراً أَسْلَمَ النَّاسُ عَلَيْهَا، وَبُعِثَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم. فَقَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ: لَوْ كَانَ أَحَدُكُمُ احْتَرَقَ بَيْتُهُ، مَا رَضِيَ حَتَّى يُجِدَّهُ، فَكَيْفَ بَيْتُ رَبِّكُمْ؟ إِنِّي مُسْتَخِيرٌ رَبِّي ثَلاَثاً، ثُمَّ عَازِمٌ عَلَى أَمْرِي. فَلَمَّا مَضَى الثَّلاَثُ أَجْمَعَ رَأْيَهُ عَلَى أَنْ يَنْقُضَهَا، فَتَحَامَاهُ النَّاسُ أَنْ يَنْزِلَ بِأَوَّلِ النَّاسِ يَصْعَدُ فِيهِ أَمْرٌ مِنَ السَّمَاءِ، حَتَّى صَعِدَهُ رَجُلٌ فَأَلْقَى مِنْهُ حِجَارَةً، فَلَمَّا لَمْ يَرَهُ النَّاسُ أَصَابَهُ شَيْءٌ تَتَابَعُوا، فَنَقَضُوهُ حَتَّى

---

[١] بریتییە لە حیجری کەعبە-و.

بَلَغُوا بِهِ الأَرْضَ، فَجَعَلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ أَعْمِدَةً، فَسَتَّرَ عَلَيْهَا السُّتُورَ، حَتَّى ارْتَفَعَ بِنَاؤُهُ.وَقَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ: إِنِّي سَمِعْتُ عَائِشَةَ تَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لَوْلاَ أَنَّ النَّاسَ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِكفرٍ، وَلَيْسَ عِنْدِي مِنَ النَّفَقَةِ مَا يُقَوِّي عَلَى بِنَائِهِ، لَكُنْتُ أَدْخَلْتُ فِيهِ مِنَ الْحِجْرِ خَمْسَ أَذْرُعٍ، وَلَجَعَلْتُ لَهَا بَاباً يَدْخُلُ النَّاسُ مِنْهُ، وَبَاباً يَخْرُجُونَ مِنْهُ**). قَالَ: فَأَنَا الْيَوْمَ أَجِدُ مَا أُنْفِقُ، وَلَسْتُ أَخَافُ النَّاسَ. قَالَ: فَزَادَ فِيهِ خَمْسَ أَذْرُعٍ مِنَ الْحِجْرِ، حَتَّى أَبْدَى أُساً نَظَرَ النَّاسُ إِلَيْهِ، فَبَنَى عَلَيْهِ الْبِنَاءَ. وَكَانَ طُولُ الْكَعْبَةِ ثَمَانِيَ عَشْرَةَ ذِرَاعاً، فَلَمَّا زَادَ فِيهِ اسْتَقْصَرَهُ، فَزَادَ فِي طُولِهِ عَشَرَ أَذْرُعٍ، وَجَعَلَ لَهُ بَابَيْنِ: أَحَدُهُمَا يُدْخَلُ مِنْهُ، وَالآخَرُ يُخْرَجُ مِنْهُ. فَلَمَّا قُتِلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ كَتَبَ الْحَجَّاجُ إِلَى عَبْدِ الْمَلْكِ بْنِ مَرْوَانَ يُخْبِرُهُ بِذَلِكَ، وَيُخْبِرُهُ أَنَّ ابْنَ الزُّبَيْرِ قَدْ وَضَعَ الْبِنَاءَ عَلَى أُسٍّ نَظَرَ إِلَيْهِ الْعُدُولُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ. فَكَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ الْمَلِكِ: إِنَّا لَسْنَا مِنْ تَلْطِيخِ ابْنِ الزُّبَيْرِ فِي شَيْءٍ؛ أَمَّا مَا زَادَ فِي طُولِهِ فَأَقِرَّهُ، وَأَمَّا مَا زَادَ فِيهِ مِنَ الْحِجْرِ فَرُدَّهُ إِلَى بِنَائِهِ، وَسُدَّ الْبَابَ الَّذِي فَتَحَهُ. فَنَقَضَهُ، وَأَعادَهُ إِلَى بِنَائِهِ. [م١٣٣٣ (٤٠٢)]

**لە ریوایەتێکی موسلیمدا، لە عەتاوە وتی: کە لە سەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویە بەیت سووتا ئەو دەمەی ئەهلی شام غەزویان کرد، کاروباری بەو جۆرە بوو کە هەبوو، ئیبن زوبەیر وازیلێهێنا تا خەڵکی لە مەوسیمی حەج هاتن، دەیویست هانیان بدات-یان بیانجەنگێنێ- دژ بە ئەهلی شام، کاتێ خەڵکی کۆبوونەوە وتی: خەڵکینە، راوێژتان پێ دەکەم دەربارەی کەعبە، بیڕوخێنم و پاشان بیناکەی دروست بکەمەوە، یان ئەوەی لێی کەمکراوە چاکی بکەمەوە؟**

**ئیبن عەباس وتی: من رام لەو کارە رۆشن بوویەوە، پێموایە ئەوەی لێی روخاوە چاك بکرێتەوە بەیتێك خەڵکی لەسەر موسڵمان بووە و بەردگەلێك خەڵکی لەسەر موسڵمان بووە و پێغەمبەری(ﷺ) لەسەر رەوانە کراوە وازلێبهێنێت.**

**ئیبن زوبەیر وتی: گەر یەکێك لە ئێوەماڵەکەی سووتا رازی نابێت تا نوێی دەکاتەوە، ئەی بەیتی پەروەردگارتان دەبێ چۆن بێت؟ من سێ جار ئیستیخارەی پەروەردگارم کردووە، پاشان لەسەر کارەکەم سووربوون و لێبڕانم بۆ دروست بووە، کە سێ رۆژ تێپەڕی رای لەسەر ئەوە کۆبوویەوە بیڕوخێنێت، خەڵکی خۆیان لێ پاراست نەبادا یەکەمین کەس سەردەکەوێتە سەری فەرمانێکی لە ئاسمانەوە بۆ دەربچێت، تا**

پیاوێك سەرکەوت و بەردێکی لێ خستە خوارەوە کاتێ خەڵکی بینییان هیچی تووش نەبوو بەدوایدا هاتن، روخاندیان تا گەیشتنە سەر زەوییەکە، ئیبن زوبەیر کۆمەڵێك کۆڵەکەی چەقاند و پەردەی بە دەوردا هێنان[1] تا بیناکەی بەرزبوویەوە.

ئیبن زوبەیر وتی: من گوێم لە عائیشە بوو دەیوت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**گەر خەڵك تازە سەردەم نەبوونایە بە بێباوەڕی، ئەوەندەش خەرجیم نییە بەشی بیناکردنەوەی بکات، لە حیجر پێنج باڵم دەدایە دەم و دەرگایەکم بۆ دادەنا خەڵکی لێیەوەی بچووبانە ژوورەوە و دەرگایەکیش لێیەوەی بچووبانە دەرەوە**).

وتی: من ئەمڕۆ خەرجی ئەو کارەم لە لایە و لە خەڵکیش ناترسم، وتی: پێنج باڵی لە حیجرەوە بۆ زیاد کرد، تا بناغەکە دەرکەوت و خەڵکی تەماشایان کرد و بیناکەی لەسەر کردەوە، درێژی کەعبە هەژدە باڵ بوو، کە ئەوەی بۆ زیاد کرد بە کەمی بینی، بۆیە لە درێژییەکەی دە باڵ زیادی کرد و دوو دەرگای بۆ دانا: یەکێکیان بۆ چوونە ژوورەوە و ئەویتریان بۆ چوونە دەرەوە.

کاتێ ئیبن زوبەیر کوژرا حەججاج دەربارەی ئەوە بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانی نووسی، و هەواڵی پێدا ئیبن زوبەیر بیناکەی لەسەر بناغەیەك داناوە کە راستەوانی ئەهلی مەککە بینیویانە، عەبدولمەلیك بۆی نووسی: ئێمە چیماندا وە لە کارە قێزەونەکانی ئیبن زوبەیر، ئەوەی لەسەر درێژییەکەی زیادی کردووە جێگیری بکە، ئەوەش لە حیجر زیادی کردووە بیگێڕەوە بۆ بیناکەی خۆی، ئەو دەرگایەی ئەو کردوویەتەوە دایبخە، حەجاج روخاندی و گێڕایەوە بۆ بیناکەی خۆی.

## ٦- دەروازەی: روخانی کەعبە

٢٠٤٨- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يُخَرِّبُ الْكَعْبَةَ ذُو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنَ الحَبَشَةِ**). [خ١٥٩١/ م٢٩٠٩]

---

[1] بۆئەوەی خەڵك بە روخاوی کەعبە نەبینن-و.

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ("ذو السُّوَيْقَتَيْن"[1] لە حەبەشە کەعبە دەڕوخێنێت).

## ٧- دەروازەی: فەزڵی بەردە ڕەشەکە

٢٠٤٩- (ق) عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه: أَنَّهُ جاءَ إِلَى الحَجَرِ الأَسْوَدِ فَقَبَّلَهُ، فَقَالَ: إِنِّي أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لاَ تَضُرُّ وَلاَ تَنْفَعُ، وَلَوْلاَ أَنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يُقَبِّلُكَ ما قَبَّلْتُكَ.
[خ١٥٩٧/ م١٢٧٠]

(ق) لە عومەرەوە(خوا لێی رازی بێت): هات بۆ لای بەردە ڕەشەکە و ماچی کرد و وتی: من دەزانم تۆ بەردێکی نە زیان دەگەیەنی نە قازانج، گەر پێغەمبەرم(ﷺ) نەبینیبا ماچت دەکات ماچم نەدەکردی.

٢٠٥٠- (خ) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخطَّابِ رضي الله عنه قَالَ لِلرُّكْنِ: أَمَا وَاللهِ، إِنِّي لأَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لاَ تَضُرُّ وَلاَ تَنْفَعُ، وَلَوْلاَ أَنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم اسْتَلَمَكَ ما اسْتَلَمْتُكَ، فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ قَالَ: فَمَا لَنَا وَلِلرَّمَلِ، إِنَّمَا كُنَّا رَاءَيْنَا بِهِ المشْرِكِينَ، وَقَدْ أَهْلَكَهُمُ اللهُ، ثُمَّ قَالَ: شَيْءٌ صَنَعَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَلاَ نُحِبُّ أَنْ نَتْرُكَهُ. [خ١٦٠٥ (١٥٩٧)]

(خ) لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، لە باوکییەوە: عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) بە ڕوکنی وت: من دەزانم تۆ بەردێکی نە زیان دەگەیەنی نە قازانج، گەر پێغەمبەرم نەبینیبا دەستت پیادا دەهێنێ منیش دەستم پیادا نەدەهێنای، بۆیە دەستی پیادا هێنا و پاشان وتی: ئێمە چیمانداوە لە سێ تەکانی یەکەمی تەواف، ئێمە بەوە نیشانی هاوەڵدانەرانمان دا[2]، خودا ئەوانی تیابردووە، پاشان وتی: شتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجامی دابێت پێمانخۆش نییە وازیلێبهێنین.

---

(١) دەرکەوتنی ئەم کەسە لە نیشانەکانی قیامەتە، کەعبە لەسەر دەستی ئەو دەڕوخێت، کەسێکی ڕەشپێستە و خاوەن دوو لاقی باریك و بڵاوە-و.

(٢) بە تەکاندان لە سێ خولی یەکەمی تەواف نیشانی هاوەڵدانەرانمان دا خەڵکانێکی بەهێزین، تا وا نەزانن ئێمە لاوازین و پەلامارمان بدەن-و.

**٢٠٥١–** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**نَزَلَ الْحَجَرُ الْأَسْوَدُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَهُوَ أَشَدُّ بَيَاضاً مِنَ اللَّبَنِ، فَسَوَّدَتْهُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ**). [ت٨٧٧/ ن٢٩٣٥]

* صحيح.

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەردە رەشەکە لە بەهەشتەوەیە، ئەو لە شیر سپیتر بوو، گوناهەکانی ئادەمیزاد رەشیهەڵگەڕاند).**

**٢٠٥٢–** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَيَأْتِيَنَّ هَذَا الْحَجَرُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا، وَلِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ، يَشْهَدُ عَلَى مَنْ يَسْتَلِمُهُ بِحَقٍّ**).

* صحيح. [ت٩٦١/ جه٢٩٤٤/ مي١٨٨١]

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەم بەردە لە رۆژی قیامەت دێت و دوو چاوی هەیە پێی دەبینێت و زمانێکی هەیە قسەی پێ دەکات، شایەتی دەدات بۆ ئەو کەسەی بە حەق دەستی پیادا هێناوە).**

## ٨- دەروازەی: ماڵ و سامانی کەعبە

**٢٠٥٣–** (خ) عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: جَلَسْتُ مَعَ شَيْبَةَ عَلَى الْكُرْسِيِّ فِي الْكَعْبَةِ، فَقَالَ: لَقَدْ جَلَسَ هَذَا الْمَجْلِسَ عُمَرُ ﷺ، فَقَالَ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ لاَ أَدَعَ فِيهَا صَفْرَاءَ وَلاَ بَيْضَاءَ؛ إِلاَّ قَسَمْتُهُ. قُلْتُ: إِنَّ صَاحِبَيْكَ لَمْ يَفْعَلاَ، قَالَ: هُمَا الْمَرْآنِ أَقْتَدِي بِهِمَا. [خ١٥٩٤]

**(خ) لە ئەبی وائیلەوە، وتی: لەگەڵ شەیبە لە کەعبە لەسەر کورسییەك دانیشتم، وتی: عومەر(خوا لێی رازی بێت) لەم شوێنەدا دانیشت و وتی: ئەوەم بۆ دروستبووە هەرچی تێدایە لە زەرد و سپی[1] دابەش بکەم، وتم: دوو هاوەڵەکەت ئەوەیان نەکرد، وتی: ئەو دوانە دوو کەسن شوێنیان دەکەوم.**

(١) زەرد و سپی: واتە: زیو و زێڕ–و.

## ٩- دەروازەی: دەرکردنی وێنە و بت لە کەعبە

**٢٠٥٤-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَمَّا قَدِمَ، أَبَى أَنْ يَدْخُلَ الْبَيْتَ وَفِيهِ الآلِهَةُ، فَأَمَرَ بِهَا فَأُخْرِجَتْ، فَأَخْرَجُوا صُورَةَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ فِي أَيْدِيهِمَا الأَزْلاَمُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(قَاتَلَهُمُ اللهُ! أَمَا وَاللهِ قَدْ عَلِمُوا أَنَّهُمَا لَمْ يَسْتَقْسِمَا بِهَا قَطُّ)**. فَدَخَلَ الْبَيْتَ، فَكَبَّرَ فِي نَوَاحِيهِ، وَلَمْ يُصَلِّ فِيهِ. [خ١٦٠١ (٣٩٨)]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات، نەیویست بچێتە ژوورەوە بۆ ناو بەیت و بتەکانی تێدا بێت، فەرمانی کرد کرانە دەرەوە، وێنەی ئیبراهیم و ئیسماعیل کە لە دەستیاندا ئەزلام[١] هەبوو دەرکرایە دەرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودا بیانکوژێت، سوێند بە خودا ئەوان دەیانزانی هەرگیز ئەو دوانە[٢] بە ئەزلام هەوڵی دابەش کردنی شتیان نەداوە)، هاتە ژوورەوە بۆ ناو بەیت و لە لاکانییەوە تەکبیری کرد و نوێژی تێدا نەکرد.**

## ١٠- دەروازەی: چوونە ناو کەعبە و نوێژکردن تیایدا

**٢٠٥٥-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم دَخَلَ الْكَعْبَةَ، وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَبِلاَلٌ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ الْحَجَبِيُّ، فَأَغْلَقَهَا عَلَيْهِ، وَمَكَثَ فِيهَا. فَسَأَلْتُ بِلاَلاً، حِينَ خَرَجَ: مَا صَنَعَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَ: جَعَلَ عَمُوداً عَنْ يَسَارِهِ، وَعَمُوداً عَنْ يَمِينِهِ، وَثَلاَثَةَ أَعْمِدَةٍ وَرَاءَهُ. وَكَانَ الْبَيْتُ يَوْمَئِذٍ عَلَى سِتَّةِ أَعْمِدَةٍ. ثُمَّ صَلَّى.

[خ٥٠٥ (٣٩٧)/ م١٣٢٩]

---

[١] **"أزلام" نەریتێکی نەفامی بوو، گەر کەسێك بیویستبا کارێك ئەنجام بدا، چەند پشکێکیان دەهێنا لەسەر یەکێکیان نوسرابوو ئەنجامی بدە و لەسەر یەکێکی تریان نوسرابوو ئەنجامی مەدە، ئەوەیان دەخستە ناو شتێك، کەسەکە دەستی دەکرد بە ناویدا و یەکێکیانی هەڵدەبژارد، گەر ئەوەی بۆ دەرچووبا نوسراوبوو بیکە کارەکەی ئەنجام دەدا، گەر ئەویتریان بوایە کارەکەی ئەنجام نەدەدا-و.**

[٢] **واتە: ئیبراهیم و ئیسماعیل(علیهما السلام)-و.**

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئوسامەی کوڕی زەید و بیلال و عوسمانی کوڕی تەلحەی حەجەبی[1] ڕۆیشتنە ناو کەعبەوە، دەرگاکەی لەسەر داخست و تیایدا مایەوە، پرسیارم کرد لەبیلال کاتێ هاتە دەرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) چی کرد؟ وتی: پایەیەکی خستە لای چەپی و پایەیەکی تری خستە لای ڕاستی و سێ پایەش لە دواوەی-ئەو ڕۆژە بەیت لەسەر شەش پایە بوو- و پاشان نوێژی کرد.

- وفي رواية لمسلم: قَالَ: أَقبَلَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم عَامَ الْفَتْحِ، عَلَى نَاقَةٍ لأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، حَتَّى أَنَاخَ بِفِنَاءِ الْكَعْبَةِ. ثُمَّ دَعَا عُثْمَانَ بْنَ طَلْحَةَ فَقَالَ: (**ائْتِنِي بِالْمِفْتَاحِ**)، فَذَهَبَ إِلَى أُمِّهِ، فَأَبَتْ أَنْ تُعْطِيَهُ، فَقَالَ: وَالله لَتُعْطِينِيهِ، أَوْ لَيَخْرُجَنَّ هَذَا السَّيْفُ مِنْ صُلْبِي! قَالَ: فَأَعْطَتْهُ إِيَّاهُ، فَجَاءَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَدَفَعَهُ إِلَيْهِ، فَفَتَحَ الْبَابَ.

لە ڕیوایەتێکی موسلیمدا: وتی: لە ساڵی فەتح پێغەمبەری خودا لەسەر حوشترێکی ئوسامەی کوڕی زەید هات، تا لە پەنای کەعبە چۆکی دادا، پاشان عوسمانی کوڕی تەلحەی بانگ کرد و فەرمووی: (**کلیلەکەم بۆ بهێنە**)، ئەویش ڕۆیشت بۆ لای دایکی، دایکی نەیویست پێیبدات، عوسمان وتی: سوێند بە خودا دەبێ کلیلەکەی پێ بدەی، یان ئەم شمشێرە لە پشتمەوە دەردەکەم، وتی: بۆیە کلیلەکەی پێدا و هێنای بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێیدا و دەرگاکەی کردەوە.

## ١١- دەروازەی: دابەزین لە "المحصب[2]"

**٢٠٥٦**- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَيْسَ التَّحْصِيبُ بِشَيءٍ، إِنَّمَا هُوَ مَنْزِلٌ نَزَلَهُ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم. [خ١٧٦٦/ م١٣١٢]

---

[1] عوسمانی کوڕی تەلحە دەرگاوانی کەعبە بووە، سەرپەرشتیاری و کردنەوە و داخستنی بەدەستی ئەو بووە، بۆیە نازناوی دەرگاوان(الحَجَبيّ)یان پێداوە-و.

[2] شوێنێکە لە نێوان مەککە و مینا-و.

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لیٚ رازی بێت)، وتی: مانەوە لە "المحصب" شتێك نییە[1]، تەنها شوێنێك بوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) تیایدا دابەزی.**

**٢٠٥٧-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: إِنَّمَا كَانَ مَنْزِلٌ يَنْزِلُهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، لِيَكُونَ أَسْمَحَ لِخُرُوجِهِ. تَعْنِي: بِالأَبْطَحِ. [خ١٧٦٥/ م١٣١١]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ئەوە شوێنێك بوو پێغەمبەر(ﷺ) لێی دابەزی، تا بۆ دەرچوونەکەی خۆشتر بێت. واتە: لە "الأبطح[2]".**

**٢٠٥٨-** (م) عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: قَالَ أَبُو رَافِعٍ: لَمْ يَأْمُرْنِي رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم أَنْ أَنْزِلَ الأَبْطَحَ حِينَ خَرَجَ مِنْ مِنًى، وَلكِنِّي جِئْتُ فَضَرَبْتُ فِيهِ قُبَّتَهُ، فَجَاءَ فَنَزَلَ. [م١٣١٣]

**(م) لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە، وتی: ئەبو رافیع وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پیٚ نەکردم لە "الأبطح" دابەزم کاتیٚ لە مینا دەرچوو، بەڵام هاتم و چادرێکم تێدا هەڵدا، ئەویش هات و دابەزی.**

## ١٢- دەروازەی: ئەوەی ئیحرامگر دەیکوژێت لە گیاندار

**٢٠٥٩-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ، مَنْ قَتَلَهُنَّ وَهُوَ مُحْرِمٌ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ: الْعَقْرَبُ، وَالفَأْرَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ، وَالْغُرَابُ، وَالْحِدَأَةُ). [خ٣٣١٥ (١٨٢٦)/ م١١٩٩]

**(ق) لە عەبدولڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لیٚ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (پێنج لە گیانداران، هەر کەس لە ئیحرامدا بێت و بیانکوژێت هیچی لەسەر نییە: دووپشك، مشك، سەگی گازگر، قەلەڕەش، و داڵی دڕندە).**

**٢٠٦٠-** (م) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَسعودٍ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم أَمَرَ مُحْرِماً بِقَتْلِ حَيَّةٍ بِمِنًى. [م٢٢٣٥]

---

[1] واتە: کارێك نییە لە مەناسیکی حەج بێت-و.

[2] "الأبطح" ناوێکی تری "المحصب"ە-و.

(م) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی کرد بە کەسێك ئیحرامی بەستبوو مارێك بکوژێت[1] لە مینا.

## ١٣- دەروازەی: فەزڵی نوێژ لە مەسجیدولحەرام

[أنظر: ١٠٧٩-١٠٨١].

## ١٤- دەروازەی: کرێیماڵەکانی مەککە

**٢٠٦١**- عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَكَّةُ مُنَاخٌ، لا تُبَاعُ رِبَاعُها، وَلا تُؤَاجَرُ بُيُوتُها)**. [ك٢٣٢٦، ٢٣٢٧]

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(مەککە شوێنی ئیقامەیە خانووەکانی نافرۆشرێن و ماڵەکانی بە کرێ ناگیرێن.**

- وفي رواية: (مَكَّةُ حَرَامٌ، وَحَرَامٌ بَيْعُ رِبَاعِها، وَحَرَامٌ أَجْرُ بُيُوتِها).

* قال الذهبي: صحيح.

لە ریوایەتێکدا: **(مەککە حەرامە، و خانووەکانی نافرۆشرێن و ماڵەکانی بە کرێ ناگیرێن)**.

## ١٥- دەروازەی: لەدوای فەتح مەککە غەزو ناکرێ

**٢٠٦٢**- عَنِ الحَارِثِ بْنِ مَالِكِ بْنِ الْبَرْصَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ يَقُولُ: **(لاَ تُغْزَى هَذِهِ بَعْدَ الْيَوْمِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)**. [ت١٦١١]

* صحيح.

لە حارسی کوڕی مالیکی کوڕی بەرصائەوە، وتی: لە ڕۆژی فەتحی مەککە گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(ئەم شوێنە لەمڕۆ بەدواوە هەتا ڕۆژی قیامەت غەزو ناکرێت)**.

---

[1] کەوابوو ژمارەیان بوو بە شەش-و.

# بەشی سێیەم

## فەزڵی مەدینە

### ١- دەروازەی: حەرام کردنی مەدینە و دوعای پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" بۆی

**٢٠٦٣-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: (أَنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ وَدَعَا لَهَا، وَحَرَّمْتُ الْمَدِينَةَ كما حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ، وَدَعَوْتُ لَهَا فِي مُدِّهَا وَصَاعِهَا مِثْلَ مَا دَعَا إِبْرَاهِيمُ عليه السلام لِمَكَّةَ). [خ٢١٢٩/ م١٣٦٠]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی زەیدەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): **(ئیبراهیم مەککەی حەرام کرد و دوعای بۆ کرد، منیش مەدینە حەرام دەکەم وەك چۆن ئیبراهیم مەککەی حەرام کرد، و لە "مُدّ و صاع[1]"ی دوعام بۆ کردووە وەك چۆن ئیبراهیم(علیه السلام) دوعای بۆ مەککە کرد).**

- وفي رواية لمسلم: (بِمِثْلَيْ مَا دَعَا بِهِ إِبْرَاهِيمُ لِأَهْلِ مَكَّةَ).

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: **(دوو ئەوەندەی ئەوەی ئیبراهیم دوعای پێکرد بۆ ئەهلی مەککە).**

**٢٠٦٤-** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مِنْ كَذَا إِلَى كَذَا، لاَ يُقْطَعُ شَجَرُهَا، وَلاَ يُحْدَثُ فِيهَا حَدَثٌ، مَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثاً فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ). [خ١٨٦٧/ م١٣٦٦]

(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(مەدینە لەوێوە بۆ ئەوێ حەرەمە، درەختی نابڕدرێت و رووداوی تێدا بەرپا ناکرێت، هەرکەس تیایدا رووداوێك بەرپا بکات نەفرەتی خودا و فریشتە و هەموو خەڵکی لەسەرە).**

---

[1] یەکەی پێوانە و کێشانەی ئەو سەردەمەن-و.

٢٠٦٥- (م) عَنْ سَعدِ بنِ أَبِي وقاصٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (إِنِّي أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ لاَبَتَيِ الْمَدِينَةِ؛ أَنْ يُقْطَعَ عِضَاهُهَا، أَوْ يُقْتَلَ صَيْدُهَا). وَقَالَ: (الْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، لاَ يَدَعُهَا أَحَدٌ رَغْبَةً عَنْهَا؛ إِلاَّ أَبْدَلَ الله فِيهَا مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ، وَلاَ يَثْبُتُ أَحَدٌ عَلَى لأْوَائِهَا وَجَهْدِهَا؛ إِلاَّ كُنْتُ لَهُ شَفِيعاً، أَوْ شَهِيداً، يَوْمَ الْقِيَامَةِ). [م١٣٦٣]

(م) لە سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(من نێوان دوو لاكەی مەدینە حەرام دەكەم، درەختەكانی ببڕرێن یان نێچیرەكانی بكوژرێن)، هەروەها فەرمووی: (مەدینە باشترە بۆ ئەوان گەر بزانن، هەركەس وەك بێنیازبوون وازیلێبهێنێت خودا تیایدا باشتر و چاكتر لە ئەو ئاڵوگۆڕ دەكات، هەر كەس لەسەر ناڕەحەتی و مەینەتییەكانی دامەزراو بێت من دەبم بە تكاكاری، یان شایەتی لە ڕۆژی قیامەت).**

٢٠٦٦- (م) عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ: أَهْوَى رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم بِيَدِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: (إِنَّهَا حَرَمٌ آمِنٌ). [م١٣٧٥]

(م) لە سەهلی كوڕی حونەیفەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی هەڵدا بۆ مەدینە و فەرمووی: **(ئەوە حەرەمێكی ئامینە).**

## ٢- دەروازەی: ئیمان دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە

٢٠٦٧- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّ الإِيمَانَ لَيَأْرِزُ إِلَى المَدِينَةِ، كما تَأْرِزُ الحَيَّةُ إِلَى جُحْرِهَا). [خ١٨٧٦/ م١٤٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئیمان دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە وەك چۆن مار دەگەڕێتەوە بۆ كونەكەی).**

## ٣- دەروازەی: هاندان بۆ نیشتەجێبوون لە مەدینە

٢٠٦٨- (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، عَنِ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّهَا طَيْبَةُ، تَنْفِي الخَبْثَ كَمَا تَنْفِي النَّارُ خَبَثَ الفِضَّةِ). [خ٤٥٨٩ (١٨٨٤)/ م١٣٨٤]

(ق) لە زەدی کوڕی سابیتەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(مەدینە "طَيْبَة"یە، پیسی لادەبات وەك چۆن ئاگر پیسی زیو لادەبات).**

**٢٠٦٩-** (م) عَنْ يُحَنَّسَ مَوْلَى الزُّبَيْرِ: أَنَّهُ كَانَ جَالِساً عِنْدَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ فِي الْفِتْنَةِ، فَأَتَتْهُ مَوْلاَةٌ لَهُ تُسَلِّمُ عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: إِنِّي أَرَدْتُ الْخُرُوجَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمنِ، اشْتَدَّ عَلَيْنَا الزَّمَانُ، فَقَالَ لَهَا عَبْدُ اللهِ: اقْعُدِي لَكَاعِ! فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(لاَ يَصْبِرُ عَلَى لأْوَائِهَا وَشِدَّتِهَا أَحَدٌ، إِلاَّ كُنْتُ لَهُ شَهِيداً، أَوْ شَفِيعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ).** [م١٣٧٧]

**(م) لە یوحەننەسەوە، مەولای زوبەیر: ئەو لە فیتنەکەدا لای عەبدولڵای کوڕی عومەر دانیشتبوو، کەنیزەکێکی هات بۆ لای سەلامی لێکرد و وتی: من دەرچوونم دەوێت، ئەی باوکی عبدالرحمن، ڕۆژگار لەسەرمان توندبووەتەوە، عەبدوڵا پێی وت: گەمژە دانیشە، من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەر کەس لەسەر ناڕەحەتی و مەینەتییەکانی[1] ئارام بگرێت لە ڕۆژی قیامەت دەبمە شایەتی یان تکاکاری).**

**٢٠٧٠-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَدْعُو الرَّجُلُ ابْنَ عَمِّهِ وَقَرِيبَهُ: هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ، هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ. وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ يَخْرُجُ مِنْهُمْ أَحَدٌ رَغْبَةً عَنْهَا، إِلاَّ أَخْلَفَ اللهُ فِيهَا خَيْراً مِنْهُ. أَلاَ إِنَّ الْمَدِينَةَ كَالْكِيرِ تُخْرِجُ الْخَبِيثَ، لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَنْفِيَ الْمَدِينَةُ شِرَارَهَا، كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ).** [م١٣٨١]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ڕۆژگارێك بەسەر خەڵکیدا دێت پیاو بانگ دەکات لە ئامۆزاکەی یان خزمەکەی خۆی: وەرن بۆ خۆشگوزەرانی، وەرن بۆ خۆشگوزەرانی، مەدینە بۆ ئەوان باشترە گەر بزانن، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هەر کەس لە مەدینە بچێتە دەرەوە وەك بێنیازبوون لێی خودا باشتر و چاکتر لە ئەو دەکاتە جێنشینی[2]، دەزانن مەدینە وەك**

[1] واتە: مەینەتییەکانی شاری مەدینە-و.

[2] واتە: باشتر و چاکتر لە ئەو کەسە دەکاتە جێنشینی شاری مەدینە-و.

**کورە وایە پیسی دەردەکات، قیامەت نایەت تا مەدینە خراپەکارانی نەفی دەکات، وەك چۆن کورە پیسی ئاسن لادەبات).**

**٢٠٧١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنِ اسْتَطَاعَ أَنْ يَمُوتَ بِالْمَدِينَةِ فَلْيَمُتْ بِهَا، فَإِنِّي أَشْفَعُ لِمَنْ يَمُوتُ بِهَا**). [ت٣٩١٧/ جه٣١١٢]

له ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەر کەس دەتوانێ لە مەدینە بمرێت با لەوێ بمرێت، من شفاعەت دەکەم بۆ کەسێك تیایدا بمرێت**).

وعند ابن ماجه: (**فَإِنِّي أَشْهَدُ لِمَنْ مَاتَ بِهَا**).

* صحيح.

لای ئیبن ماجە: (**من شایەتی دەدەم بۆ کەسێك تیایدا بمرێت**).

## ٤- دەروازەی: پارێزگاری مەدینە لە دەجال و تاعوون

**٢٠٧٢-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (**عَلَى أَنْقَابِ الْمَدِينَةِ مَلاَئِكَةٌ، لاَ يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ وَلاَ الدَّجَّالُ**). [خ١٨٨٠/ م١٣٧٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**لەسەر کەلەبەرەکانی مەدینە فریشتە هەن، تاعوون و دەجالی تێناچن**).

**٢٠٧٣-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلاَّ سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ؛ إِلاَّ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ، لَيْسَ لَهُ مِنْ نِقَابِهَا نَقْبٌ؛ إِلاَّ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ صَافِّينَ يَحْرُسُونَهَا، ثُمَّ تَرْجُفُ الْمَدِينَةُ بِأَهْلِهَا ثَلاَثَ رَجَفَاتٍ، فَيُخْرِجُ الله كُلَّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ**). [خ١٨٨١/ م٢٩٤٣]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**وڵاتێ نییە دەجال پێی لێ نەنێت، جگە لە مەککە و مەدینە، کەلەبەرێك نییە لە کەلەبەرەکانی فریشتەی ریزبووی لەسەر نەبێت پاسەوانی لێ بکەن، پاشان**

مەدینە سێ هەژان بە ئەهلەکەی دەکات و هەرچی بێباوەڕ و دووڕووە خودا دەریاندەکات).

## ٥- دەروازەی: گوناهی ئەو کەسەی پیلانگێڕی لە ئەهلی مەدینە دەکات

**٢٠٧٤-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ أَرَادَ أَهْلَ هَذِهِ الْبَلْدَةِ بِسُوءٍ ـ يَعْنِي: الْمَدِينَةَ ـ أَذَابَهُ الله كَمَا يَذُوبُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ). [م١٣٨٦]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: ئەبو قاسم(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس بە خەڵکی ئەم شارە-واتە مەدینە- ویستی خراپە بگرێت خودا دەیتوێنێتەوە وەك چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە).**

## ٦- دەروازەی: خۆشەویستی مەدینە

**٢٠٧٥-** (ق) عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: أَقْبَلْنَا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكٍ، حَتَّى إِذَا أَشْرَفْنَا عَلَى المدِينَةِ قَالَ: (هذِهِ طَابَةُ، وَهذَا أُحُدٌ، جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ).

[خ٤٤٢٢ (١٤٨١)/ م١٣٩٢]

**(ق) لە ئەبی حومەیدی ساعیدییەوە، وتی: لە غەزوەی تەبووك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) گەڕاینەوە تا روانیمان بەسەر مەدینەدا فەرمووی: (ئەمە "طابة"یە، ئەمەش ئوحودە، چیایەکە خۆشیدەوێین و خۆشماندەوێت).**

**٢٠٧٦-** (خ) عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ، فَنَظَرَ إِلَى جُدُرَاتِ المدِينَةِ، أَوْضَعَ رَاحِلَتَهُ، وَإِنْ كَانَ عَلَى دَابَةٍ حَرَّكَهَا، مِنْ حُبِّهَا. [خ١٨٨٦ (١٨٠٢)]

**(خ) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت): گەر پێغەمبەر(ﷺ) لە سەفەرێك بگەڕابایەوە تەماشای دیوارەکانی مەدینەی دەکرد و وڵاخی کۆڵ و بارەکەی خێرا دەکرد، گەر لەسەر وڵاخی سواریش بوایە تەکانی پێ دەدا، لەبەر خۆشەویستی ئەو بۆ مەدینە.**

▪ وفي رواية: فَأَبْصَرَ دَرَجَاتِ الْمَدِينَةِ. [خ١٨٠٢]

**لە ریوایەتێکدا: رێگە بەرزەکانی مەدینەی دەبینی.**

**٢٠٧٧-** (خ) عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: اللَّهُمَّ ارْزُقْنِي شَهَادَةً فِي سَبِيلِكَ، وَاجْعَلْ مَوْتِي فِي بَلَدِ رَسُولِكَ صلّى الله عليه وسلّم. [خ١٨٩٠]

**(خ) لە عومەرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: خودایە شەهادەتم، لە رێگەی خۆت پێببەخشە و مردنم لە شاری پێغەمبەرەکەت(ﷺ) بێت.**

## ٧- دەروازەی: فەزڵی نوێژ لە مزگەوتی پێغەمبەر و مزگەوتی قوبا

[أنظر: ١٠٧٤، ١٠٧٥، ١٠٧٩- ١٠٨١].

## ٨- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی خانووەکانی مەدینە هاتووە

**٢٠٧٨-** عَنْ زَيْنَبَ: أَنَّهَا كَانَتْ تَفْلِي رَأْسَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَعِنْدَهُ امْرَأَةُ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، وَنِسَاءٌ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ، وَهُنَّ يَشْتَكِينَ مَنَازِلَهُنَّ، أَنَّهَا تَضِيقُ عَلَيْهِنَّ وَيُخْرَجْنَ مِنْهَا، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ تُوَرَّثَ دُورَ الْمُهَاجِرِينَ النِّسَاءُ، فَمَاتَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ فَوُرِّثَتْهُ امْرَأَتُهُ دَاراً بِالْمَدِينَةِ. [د٣٠٨٠]

**لە زەینەبەوە: ئەو سەری پێغەمبەری خودای(ﷺ) دەدۆزی و ژنەکەی عوسمانی کوڕی عەففان[1] و چەند ئافرەتێکی کۆچکەری لە لابوو، ئەوان سکاڵایان هەبوو لەدەست ماڵەکانیان، خانووەکان لەسەریان بەرتەسکن و لێیان دەچنە دەرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی کرد خانووەکانی پیاوە کۆچکەرەکان لە لایەن**

---

[1] **لە ریوایەتێکدا: ژنەکەی عوسمانی کوڕی مەزعوون، لەوانەیە ئەوە راستتر بێت، چونکە ژنی عوسمانی کوڕی عەففان کچی پێغەمبەر(ﷺ) بووە، بۆیە لە جێگەی ئەوەی بڵێ ژنەکەی عوسمانی کوڕی عەففان دەیوت: روقییە، یان ئوم کلسوومی کچی پێغەمبەر-و.**

ژنەکانیانەوە بە میرات بگیرێن، عەبدوڵای کوڕی مەسعوود کۆچی دوایی کـرد ژنەکـەی خانووەکەی مەدینەی بە میرات وەرگرت.

- ولفظ المسند: كَانَتْ زَيْنَبُ تَفْلِي رَأْسَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَعِنْدَهُ امْرَأَةُ عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ، وَنِسَاءٌ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ يَشْكُونَ مَنَازِلَهُنَّ، وَأَنَّهُنَّ يَخْرُجْنَ مِنْهُ، وَيُضَيَّقُ عَلَيْهِنَّ فِيهِ، فَتَكَلَّمَتْ زَيْنَبُ وَتَرَكَتْ رَأْسَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّكِ لَسْتِ تَكَلَّمِينَ بِعَيْنَيْكِ، تَكَلَّمِي وَاعْمَلِي عَمَلَكِ**). فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَئِذٍ أَنْ يُوَرَّثَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ النِّسَاءُ، فَمَاتَ عَبْدُ اللهِ فَوَرِثَتْهُ امْرَأَتُهُ دَاراً بِالْمَدِينَةِ. [٢٧٠٥٠]

*صحيح الإسناد.

**لەفزەکەی "المسند": زەینەب سەری پێغەمبەری خودای(ﷺ) دەدۆزی و ژنەکـەی عوسمانی کوڕی مەزعوون و چەند ئافرەتێکی کۆچکەری لە لابوو، سکاڵایان هەبوو لە شوێنی نیشتەجێبوونیان و ئەوان لێی دەچنە دەرەوە و تیایدا لەسـەریان بەرتەسکە، زەینەب قسەی کرد و وازیهێنا لە سەری پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (تۆ بە دوو چاوت قسە ناکەی، قسە بکە و خەریکی کارەکەی خۆت بە)، ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی کرد ئافرەتان لە پیاوە کۆچکەرەکان مـیرات بگرن، عەبدوڵا مرد و ژنەکەی خانوویەکی لە مەدینە لێوە بە میرات گرت.**

## ٩- دەروازەی: سەردانی گۆڕی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٢٠٧٩**- عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ، دَخَلَ الْمَسْجِدَ ثُمَّ أَتَى الْقَبْرَ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ الله، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا أَبَا بَكْرٍ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا أَبَتَاهُ. [هق٥/٢٤٥]

**لە نافیعەوە: گەر ئیبن عومەر لە سـەفەر بگەڕابایـەوە دەچـووە نـاو مزگەوتـەوە و پاشان دەهات بـۆ لای گۆڕەکـە و دەیـوت: "السـلام عليـك" ئـەی پێغەمبـەری خـودا، "السلام عليك" ئەی ئەبوبەکر، "السلام عليك" ئەی باوکی خۆم.**

**٢٠٨٠**– عَنْ عَبْدِ الله بْنِ دِينَارٍ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ الله بْنَ عُمَرَ يَقِفُ عَلَى قَبْرِ النبي صلّى الله عليه وسلّم ثُمَّ يُسَلِّمُ عَلَى النبي صلّى الله عليه وسلّم وَيَدْعُو، ثُمَّ يَدْعُو لأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ رضي الله عنهما. [هق٥/٢٤٥]

**لە عەبدوڵای کوڕی دینارەوە، ئەو وتی: عەبدوڵای کوڕی عومەرم بینی لای گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ) دەوەستا، پاشان سەلامی لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد و دوعای دەکرد، پاشان دوعای بۆ ئەبوبەکر و عومەر(خوایان لێ رازی بێت) دەکرد.**

## بەشی یەکەم

# حوکمەکانی جیهاد

### ١- دەروازەی: بەردەوام دەستەیەك لە ئومەتەکەم پاڵپشتی دەکرێن

**٢٠٨٢**[١]- (ق) عَنِ المغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ يَزَالُ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ، حَتَّى يَأْتِيَهُمْ أَمْرُ الله وَهُمْ ظَاهِرُونَ). [خ٣٦٤٠/ م١٩٢١]

(ق) لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(بەرداوام خەڵکانێك لە ئومەتەکەم پاڵپشتی دەکرێن، تا ئەمری خودا دێت و ئەوان سەردەکەون).**

**٢٠٨٣**- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا فَسَدَ أَهْلُ الشَّامِ فَلاَ خَيْرَ فِيكُمْ، لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي مَنْصُورِينَ، لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ). [ت٢١٩٢/ جه٦]

لە موعاویەی کوڕی قورەوە، لە باوکییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئەهلی شام فەسادی تێکەوت خێر لە ئێوەدا نییە، بەردەوام دەستەیەك لە ئومەتەکەم سەرخراون، ئەوانەی شەرمەزاریان دەکەن[٢] زیانیان پێ ناگەیەنن تا ڕۆژی قیامەت هەڵدەستێ).**

- ولم يذكر ابن ماجه: أَهْلَ الشَّامِ.

* صحيح.

**ئیبن ماجە باسی "ئەهلی شام"ی نەکردووە.**

---

[١] ژمارە(٢٠٨١) بە هەڵە پەڕیوە.

[٢] واتە: ئەوانەی سەریان ناخەن-و.

٢٠٨٤- عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (لَيَبْلُغَنَّ هَذَا الْأَمْرُ مَا بَلَغَ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ، وَلاَ يَتْرُكُ اللهُ بَيْتَ مَدَرٍ وَلاَ وَبَرٍ؛ إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللهُ هَذَا الدِّينَ، بِعِزِّ عَزِيزٍ، أَوْ بِذُلِّ ذَلِيلٍ، عِزّاً يُعِزُّ اللهُ بِهِ الْإِسْلاَمَ، وَذُلاًّ يُذِلُّ اللهُ بِهِ الْكُفْرَ).

وَكَانَ تَمِيمٌ الدَّارِيُّ يَقُولُ: قَدْ عَرَفْتُ ذَلِكَ فِي أَهْلِ بَيْتِي، لَقَدْ أَصَابَ مَنْ أَسْلَمَ مِنْهُمُ الخَيْرُ وَالشَّرَفُ وَالْعِزُّ، وَلَقَدْ أَصَابَ مَنْ كَانَ مِنْهُمْ كَافِراً الذُّلُّ وَالصَّغَارُ وَالْجِزْيَةُ. [حم١٦٩٥٧]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

لە تەمیمی دارییەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(ئەم ئەمرە دەگاتە ئەو جێگەی شەو و ڕۆژی پێ دەگات، خودا خانوویەکی لە قوڕ دروستکراو و لە کوڵك دروستکراو[1] بەجێناهێڵێت تا خودا ئەم دینەی دەباتە ناو، بە عیززەتی عەزیز یان بە زەلیلی زەلیل، عیززەتێك خودا ئیسلامی پێ بە عیززەت دەکات، زەلیلییەك خودا بێباوەڕی پێ زەلیل دەکات).**

تەمیمی داری دەیوت: من ئەوەم لە خانەوادەکەم بینی، ئەوانەی موسڵمانبوون خێر و شەرفمەندی و عیززەتیان تووشهات، ئەوانەش بێباوەڕ بوون لەوان زەلیلی و بچووکی و جزییەیان تووشهات.

## ٢- دەروازەی: فەزڵی جیهاد و ئامانجەکەی

٢٠٨٥- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يَعْدِلُ الْجِهَادَ، قَالَ: (لاَ أَجِدُهُ). قَالَ: (هَلْ تَسْتَطِيعُ إِذَا خرَجَ الْمُجَاهِدُ أَنْ تَدْخُلَ مَسْجِدَكَ، فَتَقُومَ وَلاَ تَفْتُرَ، وَتَصُومَ وَلاَ تُفْطِرَ)؟ قَالَ: وَمَنْ يَسْتَطِيعُ ذَلِكَ؟

[خ٢٧٨٥/ م١٨٧٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: کارێکم پێ نیشان بدە هاوتای جیهاد بێت، فەرمووی:

[1] لە قوڕ دروستکراو: مەبەست پێی خەڵکی نیشتەجێیە لە شار و لادێ، لە کوڵك دروستکراو: مەبەست پێی خەڵکی کۆچەری ناو چادر و دەوارە—و.

**(شك نابەم)**، هەروەها فەرمووی: **(گەر موجاهید رۆیشت بۆ جیهاد تۆ دەتوانی بچییە ناو مزگەوتەکەت و نوێژ بکەی و خاوەنبییەوە و رۆژوو بگری و نەیشکێنی؟)**، وتی: جا کێ ئەوە دەتوانێت؟.

**٢٠٨٦**- (ق) وَعَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (انْتَدَبَ اللهُ عزّ وجل لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ، لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ إِيمَانٌ بِي وَتَصْدِيقٌ بِرُسُلِي، أَنْ أُرْجِعَهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ، أَوْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ. وَلَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي مَا قَعَدْتُ خَلْفَ سَرِيَّةٍ، وَلَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللهِ، ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ). [خ٣٦/ م١٨٧٦]

(ق) هەر لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خـودا(عز وجـل) پەلە دەکات لە پاداشتی کەسێك لە رێگەی ئەو دەچێتە دەرەوە، تەنها ئیمان بە من و بەڕاست زانینی پێغەمبەرانم بۆ جیهادی ناردووە، بیگێڕمەوە بەوەی بەدەستی هێناوە لە پاداشت یان غەنیمەت، یان بیبەمە ناو بەهەشتەوە، گەر لەسەر ئومەتەکەم گران نەبوایە لە پشت سریەیەکەوە دانەدەنیشتم[1]، ئاواتم دەخواست لە رێگـەی خـودا بکوژرێم و پاشان زیندوو بکرێمەوە و پاشان بکوژرێم و پاشان زیندوو بکرێمەوە و پاشان بکوژرێم)**.

**٢٠٨٧**- (خ) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ جَبْرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (ما اغْبَرَّتْ قَدَما عَبْدٍ فِي سَبِيلِ اللهِ فَتَمَسَّهُ النَّارُ). [خ٢٨١١ (٩٠٧)]

[وانظر: (حتى يقولوا: لا إله إلا الله) **٢٢**].

(خ) لە عبدالرحمانی کوڕی جەبرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دوو پێی بەندەیەك تۆزی لێ بنیشێت[2] ئاگریان بەرناکەوێت)**.

---

[1] واتە: هەمیشە لە پێشەوە و لە بەرەی جەنگدا بووم-و.

[2] واتە: لە رێگەی جیهاد تۆزیان لێ بنیشێت-و.

## ٣- دەروازەی: فەزڵی سەنگەگیری(الرباط) لە ڕێگەی خودا

**٢٠٨٨-** (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ الله خَيْرٌ منَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا، وَمَوْضِعُ سَوْطِ أَحَدِكُمْ منَ الجَنَّةِ خَيْرٌ منَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا، وَالرَّوْحَةُ يَرُوحُهَا الْعَبْدُ في سَبِيلِ الله أَوِ الْغَدْوَةُ، خير مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا).

[خ٢٨٩٢ (٢٧٩٤)/ م١٨٨١]

(ق) لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سەنگەگیری ڕۆژێك لە ڕێگەی خودا باشترە لە دنیا و ئەوەی لەسەر ڕووی دنیایە، جێ قەمچی یەکێك لە ئێوە لە بەهەشت باشترە لە دنیا و ئەوەی لەسەر ڕووی دنیایە، تاقێکی ئێوارە ڕۆیشتن لە ڕێگەی خودا یان تاقێکی بەیانی ڕۆیشتن لە ڕێگەی خودا باشترە لە دنیا و ئەوەی لەسەر ڕووی دنیایە)**.

- واقتصر مسلم على ذكر الغدوة والروحة.

موسلیم لەسەر باس کردنی تاقێکی بەیانی و تاقێکی ئێوارە کورتهەڵهاتووە.

**٢٠٨٩-** (م) عَنْ سَلْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (رِبَاطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ، وَإِنْ مَاتَ جَرَى عَلَيْهِ عَمَلُهُ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُهُ، وَأُجْرِيَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ، وَأَمِنَ الْفَتَّانَ). [م١٩١٣]

(م) لە سەلمانەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(سەنگەرگیری ڕۆژ و شەوێ باشترە لە ڕۆژوو و شەونوێژی مانگێك، گەر مرد ئەو کارەی ئەنجامی دەدا بەسەریدا جاری دەبێت[1]، و ڕۆزییەکەی بۆ جاری دەبێت و لە "الفَتّان[2]" لە ئاسایشدا دەبێت)**.

---

[1] واتە: بۆی دەبێتە خێرێکی بەردەوام-و.

[2] "الفتان": واتە: فیتنەی ناو گۆڕ-و.

## ٤- دەروازەی: پلەی موجاهیدان

**٢٠٩٠-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ آمَنَ بالله وَبِرَسُولِهِ، وَأَقَامَ الصَّلاَةَ، وَصَامَ رَمَضَانَ، كانَ حَقّاً عَلَى الله أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، جاهَدَ فِي سَبِيلِ الله أَوْ جَلَسَ فِي أَرْضِهِ الَّتِي وُلِدَ فِيهَا)**. فَقَالُوا: يَا رَسُولَ الله، أَفَلاَ نُبَشِّرُ النَّاسَ؟ قَالَ: **(إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ، أَعَدَّهَا الله لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِ الله، ما بَيْنَ الدَّرَجَتينِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ الله فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ، وَأَعْلَى الْجَنَّةِ . أُرَاهُ قالَ: وفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمنِ . وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ)**. [خ٢٧٩٠]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەرکەس ئیمان بە خودا و پێغەمبەرەکەی بهێنێ، و نوێژ ئەنجام بدات، و رەمەزان بەڕۆژوو بێت حەقە لەسەر خودا بیباتە بەهەشتەوە، لە رێگەی خودا جیهادی کرد یان دانیشت لەو زەوییەی تیایدا لەدایك بوو)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، مژدە نەدەین بە خەڵکی؟ فەرمووی: **(لە بەهەشت سەد پلە هەن، خودا بۆ تێکۆشەران لەپێناوی خودا ئامادەی کردوون، لە نێوان هەر دوو پلەیەك وەك نێوان ئاسمان و زەوییە، گەر داواتان لە خودا کرد داوای فیردەوسی لێ بکەن، چونکە ئەوە ناوەڕاستی بەهەشت و بالاترینی بەهەشتە-پێموایە فەرمووی:- سەرەوەی بریتییە لە عەرشی رەحمان، لەوێوە رووبارەکانی بەهەشت جاری دەبن)**.

**٢٠٩١-** (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(يَا أَبَا سَعِيدٍ، مَنْ رَضِيَ بالله رَبّاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيّاً، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ)**، فَعَجِبَ لَهَا أَبُو سَعِيدٍ، فَقَالَ: أَعِدْهَا عَلَيَّ يَا رَسُولَ الله! ففَعَلَ. ثُمَّ قَالَ: **(وَأُخْرَى يُرْفَعُ بِهَا الْعَبْدُ مِائَةَ دَرَجَةٍ فِي الْجَنَّةِ، مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ)**، قَالَ: وَمَا هِيَ يَا رَسُولَ الله؟ قَالَ: **(الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ الله، الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ الله)**. [م١٨٨٤]

(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی ئەبو سەعید، هەرکەس رازی بێت بەوەی "الله" پەروەردگاری بێت، و ئیسلام دینی بێت، و محەمەد پێغەمبەری بێت، بەهەشتی بۆ واجب بووە)**، ئەبو سەعید پێی سەرسام بوو و

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆم دووبارە بکەرەوە، ئەویش بۆی دووبارە کردەوە و پاشان فەرمووی: **(شتێکی تریش بەهۆیەوە سەد پلەی لە بەهەشت بۆ بەرز دەکرێتەوە، نێوان هەر دوو پلەیەك وەك نێوان ئاسمان و زەوییە)**، وتی: ئەوە چییە، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: **(جیهاد لە ڕێگەی خودا، جیهاد لە ڕێگەی خودا)**.

## ٥- دەروازەی: فەزڵی شەهیدبوون و پەسەندی هەوڵبۆدانی

**٢٠٩٢-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَا مِنْ عَبْدٍ يَمُوتُ، لَهُ عِنْدَ الله خَيْرٌ، يَسُرُّهُ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا، وَأَنَّ لَهُ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا؛ إِلاَّ الشَهِيدُ، لِمَا يَرَى مِنْ فَضْلِ الشَّهَادَةِ، فَإِنَّهُ يَسُرُّهُ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا، فَيُقْتَلَ مَرَّةً أُخْرَى)**. [خ٢٧٩٥/ م١٨٧٧]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر بەندەیەك بمرێت و لای خودا خێرێکی هەبێت، پێیخۆش نییە بگەڕێتەوە بۆ دنیا، با دنیا و ئەوەی لە دنیادایە بۆ ئەو بێت، جگە لە شەهید، لەبەر ئەوەی دەیبینێ[1] لە پلە و پایەی شەهیدی، ئەو پێیخۆشە بگەڕێتەوە بۆ دنیا و جارێکی تر بکوژرێتەوە)**.

**٢٠٩٣-** (م) عَنْ سَهلِ بنِ حُنَيْفٍ: أَنَّ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ سَأَلَ الله الشِّهَادَةَ بِصِدْقٍ، بَلَّغَهُ الله مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ، وإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ)**. [م١٩٠٩]

(م) لە سەهلی کوڕی حونەیفەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس ڕاستگۆیانە داوای شەهادەت بکات، خودا ئەو دەگەیەنێ بە پلە و پایەی شەهیدی با لەسەر جێگەکەشی مردبێت)**.

**٢٠٩٤-** عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لِلشَّهِيدِ عِنْدَ اللهِ سِتُّ خِصَالٍ: يُغْفَرُ لَهُ فِي أَوَّلِ دَفْعَةٍ، وَيَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَيُجَارُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَيَأْمَنُ مِنَ**

---

[1] واتە: لەبەر بینینی مەزنی پلە و پایەی شەهید-و.

الْفَزَعِ الأَكْبَرِ، وَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ تَاجُ الْوَقَارِ، الْيَاقُوتَةُ مِنْهَا خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَيُزَوَّجُ اثْنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ زَوْجَةً مِنَ الْحُورِ الْعِينِ، وَيُشَفَّعُ فِي سَبْعِينَ مِنْ أَقَارِبِهِ). [ت١٦٦٣/ جه٢٧٩٩]

لە میقدامی کوڕی مەعدیکەریب، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بۆ شەهید لای خودا شەش خەسڵەت هەیە: هەر لە یەکەمجارەوە لە گوناهەکانی خۆش دەبن، و شوێنی خۆی لە بەهەشت دەبینێت، و لە سزای گۆڕ پەنا دەدرێت، و لە ترسی مەزن لە ئاسایشدا دەبێت، و تاجی ویقار لەسەر سەری دەنرێت، یاقووتێك لەو تاجە باشترە لە دنیا و ئەوەی لە دنیادایە، حەفتا و دوو حۆرلعەینی لە بەهەشت پێ دەدرێت، و شفاعەت بۆ حەفتا لە نزیکەکانی دەکات)**.

- والذي عند ابن ماجه: (وَيُحَلَّى حُلَّةَ الإِيمَانِ، وَيُزَوَّجُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ)، ولم يذكر التاج، وكذا عدد الزوجات.

  * صحيح.

ئەوەی لای ئیبن ماجەیە: **(بە خشڵی ئیمان دەڕازێتەوە، و هاوسەری لەگەڵ حۆرلعەین دەکات)**، باسی تاجی نەکردووە، هەر بەو جۆرە باسی ژمارەی هاوسەرەکان.

## ٦- دەروازەی: شەهیدەکان لای پەروەردگاریان زیندوون

**٢٠٩٥-** (م) عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: سَأَلْنَا عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ عَنْ هذِهِ الآيةِ: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ [آل عمران: ١٦٩]؟ قَالَ: أَمَا إِنَّا قَدْ سَأَلْنَا عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: (أَرْوَاحُهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ، تَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ، ثُمَّ تَأْوِي إِلى تِلْكَ الْقَنَادِيلِ. فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ ربهم اطِّلاَعَةً، فَقَالَ: هَلْ تَشْتَهُونَ شَيئاً؟ قَالُوا: أَيَّ شَيْءٍ نَشْتَهِي؟ وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا! فَفَعَلَ ذَلِكَ بِهِمْ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لَنْ يُتْرَكُوا مِنْ أَنْ يُسْأَلُوا، قَالُوا: يَا رَبِّ، نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا حَتَّى نُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى، فَلَمَّا رَأَى أَنْ لَيْسَ لَهُمْ حَاجَةٌ، تُرِكُوا). [م١٨٨٧]

(م) لە مەسرووقەوە، وتی: لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوود پرسیاری ئەم ئایەتەمان کرد: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًاۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ١٦٩﴾ [آل عمران: ١٦٩]؟ وتی: ئێمەش پرسیاری ئەوەمان لە پێغەمبەر کرد و فەرمووی: **(ڕۆحیان لە جەستەی باڵندەی سەوزدایە، هێلانەیان بۆ کراوە بە عەرشەوە هەڵواسراون، چۆن بخوازن بەیانیان بە بەهەشتدا دەگەڕێن، پاشان دەگەڕێنەوە بۆ ناو ئەو هێلانانە، پەروەردگار تەماشایەکی کردن و فەرمووی: ئایا حەز لە شتێك دەکەن؟ وتیان: حەزمان لە چ شتێك بێت؟ لە کاتێکدا ئێمە چۆن بخوازین بە بەهەشتدا گەشت دەکەین، سێ جار ئەوەی لەگەڵ کردن، کاتێ بینییان وازیان لێ ناهێنرێت لەوەی پرسیارییان لێ دەکرێت، وتیان: ئەی پەروەردگار، دەمانەوێ ڕۆحمان بگەڕێتەوە بۆ جەستەکان تا جارێکی تر لە ڕێگەی تۆ بکوژرێین، کاتێ بینی ئەوان پێویستییەکیان نییە وازیانلێهێنرا)**.

## ٧- دەروازەی: بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێردایە

**٢٠٩٦-** (م) عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ أنه قَالَ وَهُوَ بِحَضْرَةِ الْعَدُوِّ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ أَبْوَابَ الْجَنَّةِ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ)**، فَقَامَ رَجُلٌ رَثُّ الْهَيْئَةِ، فَقَالَ: يَا أَبَا مُوسَى، آنْتَ سَمِعْتَ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ هذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَرَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَقْرَأُ عَلَيْكُمُ السَّلَامَ، ثُمَّ كَسَرَ جَفْنَ سَيْفِهِ، فَأَلْقَاهُ، ثُمَّ مَشَى بِسَيْفِهِ إِلَى الْعَدُوِّ، فَضَرَبَ بِهِ حَتَّى قُتِلَ. [م١٩٠٢]

(م) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، ئەو لە ئامادەبوونی دوژمندا بوو، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دەروازەکانی بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێردان)**، پیاوێکی شڕ و شێواو هەستا و وتی: ئەی ئەبو موسا، تۆ بیستت پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمە بفەرموێت؟ وتی: بەڵێ، گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵانی و وتی: سەلامتان بەسەردا دەخوێنم، پاشان کێلانی شمشێرەکەی شکاند و فڕێی دا و پاشان بە شمشێرەکەیەوە بەرەو دوژمن ڕۆیشت، وەشاندی تا کوژرا.

## ٨- دەروازەی: شەهادەت گوناه هەڵدەوەرێنێت جگە لە قەرز

**٢٠٩٧-** (م) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ الله يُكَفِّرُ كُلَّ شَيْءٍ إِلاَّ الدَّيْنَ**). [م١٨٨٦]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(کوژران لە ڕێگەی خودا هەرچی شتە هەڵدەوەرێنێت جگە لە قەرز).**

- وفِي رواية: (يُغْفَرُ للشهيدِ كلُّ ذَنْبٍ إِلاَّ الدَّيْنَ).

لە ریوایەتێکدا: (**هەرچی گوناهی شەهیدە لێخۆشبوون دەیگرێتەوە جگە لە قەرز**).

## ٩- دەروازەی: هەر کەس لەسەر ماڵ و سامانەکەی بکوژرێت شەهیدە

**٢٠٩٨-** (ق) عَنْ عَبْدِ الله بْن عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ**). [خ٢٤٨٠/ م١٤١]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (هەر کەس لەسەر ماڵ و سامانەکەی بکوژرێت شەهیدە).**

**٢٠٩٩-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ الله، أَرَأَيْتَ إِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَخذَ مَالِي؟ قَالَ: (**فَلاَ تُعْطِهِ مَالَكَ**). قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَاتَلَنِي؟ قال: (**قَاتِلْهُ**). قال: أرأيتَ إنْ قَتَلَنِي؟ قَالَ: (**فَأَنْتَ شَهِيد**). قال: أرأيتَ إنْ قَتَلْتُهُ؟ قَالَ: (**هُوَ فِي النَّار**). [م١٤٠]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، باشە گەر پیاوێك هات و ویستی ماڵ و سامانەکەم ببات؟ فەرمووی: (**ماڵ و سامانەکەی خۆتی پێ مەدە**)، وتی: باشە گەر لەگەڵم جەنگا؟ فەرمووی: (**دژ بە ئەو بجەنگە**)، وتی: باشە گەر کوشتمی؟ فەرمووی: (**تۆ شەهیدی**)، وتی باشە گەر من ئەوم کوشت؟ فەرمووی: (**ئەو لە ئاگردایە**).

**٢١٠٠**– عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ، أَوْ دُونَ دَمِهِ، أَوْ دُونَ دِينِهِ؛ فَهُوَ شَهِيدٌ)**.

* صحيح. [د٤٧٧٢/ ت١٤٢١/ ن٤١٠١/ جه٢٥٨٠]

لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لەسەر ماڵەکەی بکوژرێت ئەو شەهیدە، هەر کەس لەسەر خانەوادەکەی، یان لەسەر خوێنەکەی[1]، یان لەسەر دینەکەی بکوژرێت ئەو شەهیدە)**.

## ١٠- دەروازەی: کەسێك بجەنگێ بۆ ئەوەی کەلیمەی خودا بەرز و بڵند بێت

**٢١٠١**– (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ أَعْرَابِيٌّ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: الرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِلْمَغْنَمِ، وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُذْكَرَ، وَيُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ، مَنْ فِي سَبِيلِ الله؟ فَقَالَ: **(مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ الله هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ الله)**. [خ ٣١٢٦ (١٢٣)/ م١٩٠٤]

(ق) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: ئەعرابییەك بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: پیاوێك بۆ غەنیمەت دەجەنگێ، و پیاوێکیش بۆئەوەی ناوی بهێنرێ دەجەنگێ، و پیاوێکی تریش بۆئەوەی جێگە دەستی دیاربێت دەجەنگێ، کامیان لە ڕێگەی خودایە؟ فەرمووی: **(کەسێك بجەنگێ بۆئەوەی کەلیمەی خودا بەرز و بڵند بێت ئەوە لە ڕێگەی خودایە)**.

- وفي رواية لهما: قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: الرَّجُلُ يُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً، فَأَيُّ ذلِكَ فِي سَبِيلِ الله؟ قَالَ: **(مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ الله هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ الله)**. [خ٧٤٥٨]

لە ڕیوایەتێکی هەردووکیان: وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: پیاوێك بۆ دەمارگیری دەجەنگێ، و یەکێك بۆ ئازایەتی دەجەنگێ، و یەکێك بۆ ریا دەجەنگێ، کام لەمانە بۆ ڕێگەی خودایە؟ فەرمووی: **(هەر کەس بجەنگێ بۆ ئەوەی کەلیمەی خودا بەرز و بڵند بێت ئەوە لە ڕێگەی خودایە)**.

---

[1] واتە: لە بەرگری لە گیانی خۆی بکوژرێت–و.

**٢١٠٢-** (م) عَنْ جُنْدَبِ بْنِ عَبْدِ اللهِ البَجَلِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ قُتِلَ تَحْتَ رَايَةٍ عُمِّيَّةٍ، يَدْعُو عَصَبِيَّةً، أَوْ يَنْصُرُ عَصَبِيَّةً، فَقِتْلَةٌ جَاهِلِيَّةٌ). [م١٨٥٠]

(م) لە جوندوبی کوڕی عەبدولڵای بەجلییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لەژێر بەیداخێکی کوێرانەدا بکوژرێت کە بانگ بۆ دەمارگیری دەکات یان دەمارگیری سەردەخات کوژرانێکی نەفامییە).**

## ١١- دەروازەی: ڕۆشنکردنەوەی شەهیدان

**٢١٠٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ: المَطْعُونُ، وَالمَبْطُونُ، وَالْغَرِقُ، وَصَاحِبُ الْهَدْمِ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ الله).

[خ٢٨٢٩ (٦٥٣)/ م١٩١٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(شەهیدان پێنجن: تاعووندار، و سکئێشە، و نوقمبوون، و ژێر هەرەس، و شەهید لە ڕێگەی خودا).**

**٢١٠٤-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (خَمْسٌ مَنْ قُبِضَ فِي شَيْءٍ مِنْهُنَّ فَهُوَ شَهِيدٌ: الْمَقْتُولُ فِي سَبِيلِ اللهِ شَهِيدٌ، وَالْغَرِقُ فِي سَبِيلِ اللهِ شَهِيدٌ، وَالْمَبْطُونُ فِي سَبِيلِ اللهِ شَهِيدٌ، وَالْمَطْعُونُ فِي سَبِيلِ اللهِ شَهِيدٌ، وَالنُّفَسَاءُ فِي سَبِيلِ اللهِ شَهِيدٌ). [ن٣١٦٣]

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پێنج شت هەر کەس لەوانەدا گیان بسپێرێ ئەو شەهیدە: کوژراو لە ڕێگەی خودا شەهیدە، نوقمبوو لە ڕێگەی خودا شەهیدە، تاعووندار لە ڕێگەی خودا شەهیدە، زەیسان لە ڕێگەی خودا شەهیدە).**

## ١٢- دەروازەی: هەر کەس بۆ ریا بجەنگێ

**٢١٠٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولُ اللهِ، أَخْبِرْنِي عَنِ الجِهَادِ والغَزْوِ؟ فَقَالَ: (يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو، إِنْ قَاتَلْتَ صَابِراً مُحْتَسِباً، بَعَثَكَ اللهُ صَابِراً مُحْتَسِباً، وَإِنْ قَاتَلْتَ مُرائِياً

**مُكَاثِراً بَعَثَكَ اللهُ مُرائِياً مُكَاثِراً. يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو، عَلَى أَيِّ حَالٍ قَاتَلْتَ أَوْ قُتِلْتَ، بَعَثَكَ اللهُ عَلَى تِلْكَ الحَالِ).** [ك٢٤٣٧، ٢٥٢٩]

* قال الذهبي: صحيح.

[وانظر: ٥، ٧].

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، ئەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، هەواڵم پێ بدە دەربارەی جیهاد و غەزا؟ فەرمووی: **(ئەی عەبدوڵای کوڕی عەمر، گەر ئارامگرانە و چاوەڕوانی پاداشت لای خودا جەنگای خودا بە ئارامگری و چاوەڕوانی پاداشت زیندووت دەکاتەوە، گەر بۆ ریا و زۆرخوازی جەنگای خودا ریاکارانە و زۆرخوازانە زیندووت دەکاتەوە، ئەی عەبدوڵای کوڕی عەمر، لەسەر هەر حاڵێك بجەنگی و بکوژرێی خودا لەسەر ئەو حاڵە زیندووت دەکاتەوە).**

## ١٣- دەروازەی: حەرامکردنی کوشتنی بێباوەڕ گەر موسڵمان بوو

**٢١٠٦-** (ق) عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيدِ بْنِ حَارِثَةَ رضي الله عنهما قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى الْحُرَقَةِ مِنْ جُهَيْنَةَ، قَالَ: فَصَبَّحْنَا الْقَوْمَ فَهَزَمْنَاهُمْ، قَالَ: وَلَحِقْتُ أَنَا وَرَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ رَجُلاً مِنْهُمْ، قَالَ: فَلَمَّا غَشِيْنَاهُ قَالَ: لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، قَالَ: فَكَفَّ عَنْهُ الأَنْصَارِيُّ، فَطَعَنْتُهُ بِرُمْحِي حَتَّى قَتَلْتُهُ. قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا بَلَغَ ذلِكَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، قال: فَقَالَ لِي: (**يَا أُسَامَةُ، أَقَتَلْتَهُ بَعْدَمَا قَالَ: لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ**)؟ قالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّمَا كَانَ مُتَعَوِّذاً، قَالَ: (**أَقَتَلْتَهُ بَعْدَمَا قَالَ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ**)؟ قَالَ: فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا عَلَيَّ، حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ أَسْلَمْتُ قَبْلَ ذلِكَ الْيَوْمِ. [خ٦٨٧٢ (٤٢٦٩)/ م٩٦]

(ق) لە ئوسامەی کوڕی زەدی کوڕی حاریسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) رەوانەی کردین بۆ "الحرقة" لە جوهەینە، وتی: بەیانی دامان بەسەر هۆزەکەدا و شکستمان پێ هێنان، وتی: من و پیاوێك لە ئەنصار شوێنی پیاوێك لەوان کەوتین، وتی: کاتێك هەڵمانکوتییە سەری وتی: "لا إله إلا الله" وتی: ئەنصارییەکە دەستی لێ هەڵگرت، من بە نێزەکەم لێمدا تا مرد، وتی: کاتێ هاتینەوە

ئەوە بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتەوە، وتی: پێی فەرمووم: **(ئەی ئوسامە ئایا دوای ئەوەی وتی "لا إله إلا الله" کوشتت؟)**، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو بەوە خۆی پەنادەدا، فەرمووی: **(ئایا لەدوای ئەوەی وتی "لا إله إلا الله" کوشتت؟)**، بەردەوام لەسەری دووبارە دەکردمەوە، تا ئاواتم خواست بەر لەو ڕۆژە موسڵمان نەبوومایە.

## ١٤- دەروازەی: نەهیکردن لە بەسەرداداان[1] گەر بانگ بیسترا

**٢١٠٧-** (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم يُغِيرُ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ، وَكَانَ يَسْتَمِعُ الأَذَانَ، فَإِنْ سَمِعَ أَذَاناً أَمْسَكَ؛ وَإِلاَّ أَغَارَ. فَسَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ: الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(عَلَى الْفِطْرَةِ)**، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ الله، فقالَ رسول الله صلّى الله عليه وسلّم: **(خَرَجْتَ مِنَ النَّارِ)**، فَنَظَرُوا فَإِذا هُوَ رَاعِي مِعْزَى. [م٣٨٢]

(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە بەیانی هەڵدەهات دەیدا بەسەردا، ئەو گوێی لە بانگ دەگرت، گەر گوێی لە بانگ بوایە دەستی دەگرتەوە، ئەگەر نە، دەیدا بەسەریاندا، گوێی لە پیاوێك بوو دەیوت: "الله أكبر، الله أكبر" پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لەسەر فیترەت)**، پاشان وتی: "أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمدا رسول الله"، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە ئاگر هاتییە دەرەوە)**، وردبوونەوە شوانێکی بزنە.

## ١٥- دەروازەی: بانگکردن بۆ ئیسلام بەر لە جەنگان

**٢١٠٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: مَا قَاتَلَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم قَوْماً قَطُّ حَتَّى يَدْعُوهُمْ. [مي٢٤٨٨/هق٩/١٠٧]

* صحيح.

---

[1] بەسەرداداان(الإغارة) ئەوەیە سوپایەك ئاوەدانییەك غافلگیر دەکات و بەسەریدا دەدات—و.

لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: هەرگیز پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) دژ بە کۆمەڵێك نەجەنگاوە تا بانگی نەکردبن.

## ١٦- دەروازەی: کۆمەکی لە هاوەڵدانەر وەرناگیرێت

**٢١٠٩-** (م) عَنْ عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم قِبَلَ بَدْرٍ، فَلَمَّا كَانَ بِحَرَّةِ الْوَبَرَةِ أَدْرَكَهُ رَجُلٌ، قَدْ كَانَ يُذْكَرُ مِنْهُ جُرْأَةٌ وَنَجْدَةٌ، فَفَرِحَ أَصْحَابُ رَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم حِينَ رَأَوْهُ، فَلَمَّا أَدْرَكَهُ قَالَ لِرَسُولِ الله صلّى الله عليه وسلّم: جِئْتُ لأَتَّبِعَكَ وَأُصِيبَ مَعَكَ، قَالَ لَهُ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(تُؤْمِنُ بِالله وَرَسُولِهِ)**؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: **(فَارْجِعْ، فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ)**.

قَالَتْ: ثُمَّ مَضَى، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالشَّجَرَةِ أَدْرَكَهُ الرَّجُلُ، فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ؛ قَالَ: **(فَارْجِعْ، فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ)**. قَالَ: ثُمَّ رَجَعَ فَأَدْرَكَهُ بِالْبَيْدَاءِ، فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ: **(تُؤْمِنُ بالله وَرَسُولِهِ)**؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(فَانْطَلِقْ)**. [م١٨١٧]

(م) لە عائیشەوە-هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)- ئەو وتی: بەر لە بەدر پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەرچوو، کاتێ گەیشتە "حرّة الوَبَرَة"[١] پیاوێکی پێ گەیشت، بوێری و بە هاناوەچوونی لێوە باس دەکرا، هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دڵخۆشبوون کاتێ بینییان، کاتێ بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشت وتی بە پێغەمبەری خودا(ﷺ): هاتووم شوێنت بکەوم و لەگەڵت شت بەدەستبهێنم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: **(ئایا ئیمانت هەیە بە خودا و پێغەمبەرەکەی؟)**، وتی: نەخێر، فەرمووی: **(بگەڕێوە من کۆمەکی لە هاوەڵدانەر وەرناگرم)**.

عائیشە وتی: پاشان پێغەمبەر ڕۆیشت تا گەیشتینە دار و درەخت پیاوێکی پێگەیشت هەمان ئەو شتەی وت کە ئەوەی یەکەم وتی، پێغەمبەر(ﷺ) هەمان ئەو شتەی پێ فەرموو کە بە یەکەمی فەرموو: **(بگەڕێوە من کۆمەکی لە هاوەڵدانەر**

[١] ناوی شوێنێکە-و.

**وەرناگرم)**، وتی: پاشان پیاوەکە گەڕایەوە و لە "البيداء"[1] گەیشتەوە بە پێغەمبەر، بۆیە هەمان ئەو شتەی پێ فەرموو یەکەمجار پێی فەرموو: **(ئیمانت هەیە بە خودا و پێغەمبەر)**، وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کەوابوو بەڕێکەوە[2])**.

## ١٧- دەروازەی: دەرکردنی ناموسڵمان لە جەزیرە

**٢١١٠-** (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(لأُخْرِجَنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، حَتَّى لاَ أَدَعَ إِلاَّ مُسْلِماً)**. [م١٧٦٧]

**(م) لە عومەری کوڕی خەتابەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (یەهوود و نەصارا لە جەزیرەی عەرەب دەردەکەم تا تەنها موسڵمان دەمێڵمەوە).**

## ١٨- دەروازەی: سزای جاسووس

**٢١١١-** (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَيْنٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ وَهُوَ فِي سَفَرٍ، فَجَلَسَ عِنْدَ أَصْحَابِهِ يَتَحَدَّثُ، ثُمَّ انْفَتَلَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(اطْلُبُوهُ وَاقْتُلُوهُ)**. فَقَتَلْتُهُ، فَنَفَّلَهُ سَلَبَهُ. [خ ٣٠٥١/ م١٧٥٤]

**(ق) لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە، وتی: جاسووسێك لە هاوەڵدانەران هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێ ئەو لە سەفەردا بوو، لای هاوەڵانی پێغەمبەر دانیشت و قسەی دەکرد پاشان پێچی لێدا[3]، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بچن بەدوایدا و بیکوژن)، من کوشتم، پێغەمبەر شتومەکەکانی کرد بە ئەنفال.**

- ولفظ مسلم: قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم هَوَازِنَ، فَبَيْنَا نَحْنُ نَتَضَحَّى مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذْ جَاءَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ أَحْمَرَ، فَأَنَاخَهُ، ثُمَّ انْتَزَعَ طَلَقاً مِنْ

---

[1] **ناوی شوێنێکە–و.**

[2] **واتە: وەرە لەگەڵمان–و.**

[3] **واتە: بەدزییەوە ڕۆیشت–و.**

حَقَبِهِ، فَقَيَّدَ بِهِ الْجَمَلَ. ثُمَّ تَقَدَّمَ يَتَغَدَّى مَعَ الْقَوْمِ، وَجَعَلَ يَنْظُرُ، وَفِينَا ضَعْفَةٌ وَرِقَّةٌ فِي الظَّهْرِ، وَبَعْضُنَا مُشَاةٌ. إِذْ خَرَجَ يَشْتَدُّ، فَأَتَى جَمَلَهُ فَأَطْلَقَ قَيْدَهُ، ثم أَنَاخَهُ وَقَعَدَ عَلَيْهِ، فَأَثَارَهُ، فَاشْتَدَّ بِهِ الْجَمَلُ، فَاتَّبَعَهُ رَجُلٌ عَلَى نَاقَة وَرْقَاءَ.

قَالَ سَلَمَةُ: وَخَرَجْتُ أَشْتَدُّ، فَكُنْتُ عِنْدَ وَرِكِ النَّاقَةِ، ثُمَّ تَقَدمْتُ، حَتَّى كُنْتُ عِنْدَ وَرِكِ الْجَمَلِ، ثُمَّ تَقَدَّمْتُ حَتَّى أَخَذْتُ بِخِطَامِ الْجَمَلِ فَأَنَخْتُهُ، فَلَمَّا وَضَعَ رُكْبَتَهُ فِي الأَرْضِ، اخْتَرَطْتُ سَيْفِي، فَضَرَبْتُ رَأْسَ الرَّجُلِ، فَنَدَرَ، ثُمَّ جِئْتُ بِالْجَمَلِ أَقُودُهُ، عَلَيْهِ رَحْلُهُ وَسِلاَحُهُ، فَاسْتَقْبَلَنِي رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم وَالنَّاسُ مَعَهُ، فَقَالَ: **(مَنْ قَتَلَ الرَّجُلَ)**؟ قَالُوا: ابْنُ الأَكْوَعِ. قَالَ: **(لَهُ سَلَبُهُ أَجْمَعُ)**.

**لەفزەكەی موسلیم: وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) غەزای هەوازینمان كرد، كاتێ ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) خواردنمان دەخوارد پیاوێك بەسەر حوشترێكی سوورەوە هات، چۆكی بە حوشترەكە دادا، پاشان پەتێكی دەرهێنا و حوشترەكەی پێ بەستەوە، پاشان هاتە بەرەوە و لەگەڵ خەڵكەكە دەستی بە خواردن كرد، تەماشای دەكرد و وردەبوویەوە، لە ناوماندا لاواز و لەڕ هەبوو و هەندێ لە حوشترەكان لاواز و بێتین بوون و هەندێك لە ئێمە پیادەڕەو بووین، بە پەلە ڕۆیشت و هات بۆ لای حوشترەكەی و پەتەكەی كردەوە و پاشان چۆكی پێ دادا و لەسەری دانیشت و تەكانی پێدا و حوشترەكە تاویدایە، پیاوێك لەسەر حوشترێكی مێیەی خۆڵەمێشی شوێنیكەوت.**

**سەلەمە وتی: بە پەلە و غاردان بۆی دەرچووم، من لەسەر سمتی حوشترە مێیەكە سواربووبووم، پاشان چوومە بەرەوە تا گەیشتمە لای سمتی حوشترە نێرەكە[1]، پاشان پێشكەوتم تا ڕەشۆی حوشترە نێرەكەم گرت و هێنام بە چۆكدا، كاتێ دوو ئەژنۆی لەسەر زەوی دانا، شمشێرم بۆ دەرهێنا و دام لە سەری پیاوەكە و بەربوویەوە، پاشان حوشترەكەیم ڕاكێشا و هێنام، كۆڵ و بار و چەكەكەی ئەوی لەسەر بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێشوازی لێ كردم و خەڵكانێكی لەگەڵ بوون،**

---

[1] **ئەو حوشترەی پیاوە ناپاكەكەی سوار بووبوو-و.**

فەرمووی: (**كێ پیاوەكەی كوشت؟**)، وتیان: ئیبن ئەكوەع، فەرمووی: (**هەموو شتەكانی بۆ ئەوە**).

## ١٩- دەروازەی: وەسێتی ئیمام بە ئادابی جیهاد

**٢١١٢-** (م) عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أَمَّرَ أَمِيراً عَلَى جَيْشٍ أَوْ سَرِيَّةٍ، أَوْصَاهُ فِي خَاصَّتِهِ بِتَقْوَى اللهِ، وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْراً. ثُمَّ قَالَ: (**اغْزُوا بِاسْمِ اللهِ، فِي سَبِيلِ اللهِ، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللهِ. اغْزُوا وَلاَ تَغُلُّوا، وَلاَ تَغْدِرُوا، وَلاَ تَمْثُلُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيداً. وَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلاَثِ خِصَالٍ . أَوْ خِلاَلٍ . فَأَيَّتُهُنَّ مَا أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ.**

**ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ، فَإِنْ أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ. ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى التَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ، وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ إِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ، فَلَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ وعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ. فإِنْ أَبَوْا أَنْ يَتَحَوَّلُوا مِنْهَا، فَأَخْبِرْهُمْ: أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسلِمِينَ، يَجْرِي عَلَيْهِمْ حُكْمُ اللهِ الَّذِي يَجْرِي عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، وَلاَ يَكُونُ لَهُمْ فِي الْغَنِيمَةِ وَالْفَيْءِ شَيْءٌ؛ إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ.**

**فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَسَلْهُمُ الجِزْيَةَ، فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ. فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَاسْتَعِنْ بِاللهِ وَقَاتِلْهُمْ.**

**وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ، فَأَرَادُوكَ أَنْ تَجْعَلَ لَهُمْ ذِمَّةَ اللهِ وَذِمَّةَ نَبِيِّهِ، فَلاَ تَجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّةَ اللهِ وَلاَ ذِمَّةَ نَبِيِّهِ، وَلكِنِ اجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّتَكَ وَذِمَّةَ أَصْحَابِكَ. فَإِنَّكُمْ، أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَمَكُمْ وَذِمَمَ أَصْحَابِكُمْ، أَهْوَنُ مِنْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَّةَ اللهِ وَذِمَّةَ رَسُولِهِ.**

**وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ، فَأَرَادُوكَ أَنْ تُنْزِلَهُمْ عَلَى حُكْمِ اللهِ، فَلا تُنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِ اللهِ، وَلكِنْ أَنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِكَ؛ فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي أَتُصِيبُ حُكْمَ اللهِ فِيهِمْ أَمْ لاَ**). [م١٧٣١]

(م) لە بورەیدەوە، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمیرێكی لەسەر سوپایەك یان سریەیەك دابنابایە بەتایبەت وەسێتی بۆ دەكرد بە تەقوای خودا، و چاكە لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵی بوون لە موسڵمانان، پاشان دەیفەرموو: (**بە ناوی خوداوە غەزا بكەن و لە رێگەی خودا، لەگەڵ هەموو ئەوانە بجەنگن بێباوەڕن بە خودا، غەزا بكەن و ناپاكی لە غەنیمەت مەكەن و پەیمان مەشكێنن و كوژراو مەشێوێنن و منداڵ مەكوژن،**

گەر بە دوژمنەکەت لە هاوەڵدانەر گەیشتی بانگیان بکە بۆ سێ خەسڵەت یان ئاکار، وەڵامی هەر کام لەو سیانەیان دایەوە لێیان قبووڵ بکە و دەستیان لەسەر هەڵبگرە.

بانگیان بکە بۆ ئیسلام، گەر وەڵامی تۆیان دایەوە لێیان قبووڵ بکە و دەستیان لەسەر هەڵبگرە، پاشان بانگیان بکە بۆ گواستنەوە لە خانەی خۆیانەوە بۆ خانەی کۆچکەران، هەواڵیان پێ بدە گەر ئەوان ئەو کارە ئەنجام بدەن ئەوەی بۆ کۆچکەران هەیە بۆ ئەوانیش هەیە و ئەوەی لەسەر کۆچکەرانە لەسەر ئەوانیشە، گەر نەیانویست لێیەوە بگوێزنەوە[1] هەواڵیان پێ بدە ئەوان وەك ئەعرابی موسڵمان وان، حوکمی خودایان بەسەردا جاری دەبێت کە بەسەر موسڵماناندا جاری دەبێت، لە غەنیمەت و "الفيء[2]" شتێکیان بۆ نییە، مەگەر لەگەڵ موسڵمانان بجەنگن[3].

گەر نەیانویست داوای جیزیەیان لێ بکە، گەر وەڵامیان دانەوە لێیان قبووڵ بکە و دەستیان لەسەر هەڵبگرە، گەر نەیانویست داوای کۆمەکی لە خودا بکە و دژ بەوان بجەنگە.

گەر ئابلۆقەی ئەهلی قەڵایەکت دا ویستیان پەیمانی خودا و پەیمانی پێغەمبەریان پێ بدەی پەیمانی خودا و پەیمانی پێغەمبەریان پێ مەدە، بەڵکو پەیمانی خۆت و پەیمانی هاوەڵانی خۆتیان پێ بدە، چونکە گەر پەیمانی خۆتان و هاوەڵانتان بشکێنن ئاسانترە لەوەی پەیمانی خودا و پەیمانی پێغەمبەرەکەی بشکێنن.

گەر ئەهلی قەڵایەکت ئابلۆقە دا و ویستیان دایانبەزێنیت بۆ سەر حوکمی خودا، ئەوا دایانمەبەزێنە بۆ سەر حوکمی خودا، بەڵکو دایانبەزێنە بۆ سەر حوکمی خۆت، چونکە تۆ نازانی ئایا حوکمی خودا دەپێکی یان نە).

---

[1] واتە: گەر نەیانویست لە شوێنی خۆیان کۆچ بکەن و بگوێزنەوە بۆ مەدینە-و.

[2] ئەوەی بێ ئەرك و کۆشان و جەنگان دەستی موسڵمانان دەکەوێت-و.

[3] واتە: مەگەر شان بە شانی موسڵمان دژ بە بێباوەڕان بجەنگن-و.

**٢١١٢ م**- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ بَعَثَ جُيُوشاً إِلَى الشَّامِ، فَخَرَجَ يَمْشِي مَعَ يَزِيدَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، وَكَانَ أَمِيرَ رُبْعٍ مِنْ تِلْكَ الْأَرْبَاعِ، فَزَعَمُوا أَنَّ يَزِيدَ قَالَ لِأَبِي بَكْرٍ: إِمَّا أَنْ تَرْكَبَ، وَإِمَّا أَنْ أَنْزِلَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَا أَنْتَ بِنَازِلٍ، وَمَا أَنَا بِرَاكِبٍ، إِنِّي أَحْتَسِبُ خُطَايَ هَذِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ.

ثُمَّ قَالَ لَهُ: إِنَّكَ سَتَجِدُ قَوْماً زَعَمُوا أَنَّهُمْ حَبَّسُوا أَنْفُسَهُمْ لِلَّهِ، فَذَرْهُمْ وَمَا زَعَمُوا أَنَّهُمْ حَبَّسُوا أَنْفُسَهُمْ لَهُ. وَسَتَجِدُ قَوْماً فَحَصُوا عَنْ أَوْسَاطِ رُؤُوسِهِمْ مِنَ الشَّعْرِ، فَاضْرِبْ مَا فَحَصُوا عَنْهُ بِالسَّيْفِ. وَإِنِّي مُوصِيكَ بِعَشْرٍ: لاَ تَقْتُلَنَّ امْرَأَةً، وَلاَ صَبِيّاً، وَلاَ كَبِيراً هَرِماً، وَلاَ تَقْطَعَنَّ شَجَراً مُثْمِراً، وَلاَ تُخَرِّبَنَّ عَامِراً، وَلاَ تَعْقِرَنَّ شَاةً، وَلاَ بَعِيراً إِلاَّ لِمَأْكَلَةٍ، وَلاَ تَحْرِقَنَّ نَحْلاً، وَلاَ تُفَرِّقَنَّهُ، وَلاَ تَغْلُلْ، وَلاَ تَجْبُنْ. [ط٩٨٢/ هق٩/٨٩]

* فيه انقطاع. يحيى لم يدرك أبابكر.

**(م) لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە: ئەبوبەکری صدیق چەند سوپایەکی نارد بۆ شام، هاتە دەرەوە و لەگەڵ یەزیدی کوڕی ئەبی سوفیان دەڕۆیشت، ئەو ئەمیری چارەکێك لە چوار چارەکی سوپاکە بوو، وا بانگەشە دەکرێت یەزید بە ئەبوبەکری وتبێت: یان تۆش سوار بە یان من دادەبەزم، ئەبوبەکر وتی: تۆ دانابەزی و منیش سوار نابم، من بەتەمای پاداشتی ئەم هەنگاوانەم لە لای خودا.**

**پاشان وتی: تۆ کۆمەڵێك دەبینی بانگەشەی ئەوە دەکەن نەفسی خۆیان بۆ خودا بەند کردووە، وازبهێنە لەوان و ئەوەی بانگەشەی دەکەن نەفسی خۆیان بۆ بەند کردووە، کۆمەڵێك دەبینی لە ناوەڕاستی سەر قژیان گرمۆڵە کردووە، ئەوەی گرمۆڵەیان کردووە بە شمشێر لێی بدە، من وەسێتت بۆ دەکەم بە دە شت: ئافرەتێك، منداڵێك، پیرێکی ئەفتادە نەکوژی، درەختی بەردار نەبڕی، ئاوەدانییەك وێران نەکەی، مەڕێك، حوشترێك نەکوژی بۆ خواردن، دارخورمایەك نەسووتێنی، و نوقمی ئاوی نەکەی، لە غەنیمەت ناپاکی نەکەی، و ترسنۆکی رووت لێ نەکات.**

## ٢٠- دەروازەی: سەرکردە سەربازەکانی بەسەردەکاتەوە

**٢١١٣-** (م) عَنْ أَبِي بَرْزَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ فِي مَغْزًى لَهُ، فَأَفَاءَ الله عَلَيْهِ، فَقَالَ لأَصْحَابِهِ: (**هَلْ تَفْقِدُونَ مِنْ أَحَدٍ**)؟ قَالُوا: نَعَمْ، فُلاَناً وَفُلاناً وَفُلاناً. ثُمَّ قَالَ: (**هَلْ تَفْقِدُونَ مِنْ أَحَدٍ**)؟ قَالُوا: نَعَمْ، فُلاَناً وَفُلاَناً وَفُلاَناً. ثُمَّ قَال: (**هَلْ تَفْقِدُونَ مِنْ أَحَدٍ**)؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: (**لَكِنِّي أَفْقِدُ جُلَيْبِيباً، فَاطْلُبُوهُ**). فَطُلِبَ فِي الْقَتْلَى، فَوَجَدُوهُ إِلَى جَنْبِ سَبْعَةٍ قَدْ قَتَلَهُمْ، ثُمَّ قَتَلُوهُ. فَأَتَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَوَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ: (**قَتَلَ سَبْعَةً، ثُمَّ قَتَلُوهُ! هذا مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ، هَذَا مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ**). قَالَ: فَوَضَعَهُ عَلَى سَاعِدَيْهِ، لَيْسَ لَهُ إِلاَّ سَاعِدَا النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم. قَالَ: فَحُفِرَ لَهُ وَوُضِعَ فِي قَبْرِهِ، وَلَمْ يَذْكُرْ غَسْلاً. [م٢٤٧٢]

**(م) لە ئەبی بەرزەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لە سەفەری غەزایەکیدا بوو، خودا غەنیمەتی دەسگیر کرد، فەرمووی بە هاوەڵانی: (ئایا کەس شك دەبەن لێرە ئامادە نەبێت؟)، وتیان: بەڵێ، فلان و فلان و فلان، پاشان فەرمووی: (ئایا کەس شك دەبەن لێرە ئامادە نەبێت؟)، وتیان: نەخێر، فەرمووی: (بەڵام من جولەیبیب نابینم، بۆی بگەڕێن)، لە کوژراوەکان بۆی گەڕان، بینیان لە تەنیشت حەوت کەس بوو کوشتبوونی، پێغەمبەر(ﷺ) هات و لەسەری وەستا و فەرمووی: (حەوتی کوشت و پاشان کوشتیان، ئەمە لە منە و من لەوم، ئەمە لە منە و من لەوم)، وتی: پێغەمبەر جولەیبیبی خستە سەر دوو باڵی خۆی، تەنها دوو باڵی پێغەمبەری(ﷺ) هەبوو، وتی: چاڵێکیان بۆ هەڵکەند و نرایە گۆڕەکەی، باسی شۆرینی نەکرد.**

**٢١١٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَتَخَلَّفُ فِي الْمَسِيرِ، فَيُزْجِي الضَّعِيفَ، وَيُرْدِفُ، وَيَدْعُو لَهُمْ. [د٢٦٣٩]

* صحيح.

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ڕۆیشتنی سوپا خۆی دوادەخست، لاوازی بەڕێدەکرد و پاشکۆی دەخست و دوعای بۆ دەکردن[1].**

---

[1] واتە: گەر کەسێکی لاواز دوابکەوتبایە کۆمەکی دەکرد، گەر لەپێبکەوتبایە لە پاشکۆی خۆی سواری دەکرد و دوعای بۆ دەکردن-و.

## ٢١- دەروازەی: ئاواتی گەیشتن بە دوژمن مەخوازن

**٢١١٥-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ تَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا**). [م١٧٤١]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئاوات مەخوازن بۆ گەیشتن بە دوژمن، گەر پێیان گەیشتن ئارام بگرن)**.

- وفي رواية لأحمد: (**لاَ تَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْرُونَ مَا يَكُونُ فِي ذَلِكَ**). [حم٩١٩٦]

لە ڕیوایەتێکی ئەحمەدا: **(ئاواتی گەیشتن بە دوژمن مەخوازن، چونکە ئێوە نازانن لەوەدا چی هەیە)**.

## ٢٢- دەروازەی: زەمی ئەو کەسەی دەمرێت و غەزای نەکردووە

**٢١١٦-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ، مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ**). [م١٩١٠]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەرکەس بمرێت و غەزا نەکات، و نەفسی باسی ئەوەی بۆ نەکات، لەسەر بەشێك لە دووڕوویی دەمرێت)**.

## ٢٣- دەروازەی: کەسێ بە عوزرێك بەندبووبێت لە غەزا

**٢١١٧-** (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَجَعَ مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَدَنَا مِنَ المدِينَةِ، فَقَالَ: (**إِنَّ بِالْمَدِينَةِ أَقْوَاماً، ما سِرْتُمْ مَسِيراً، وَلاَ قَطَعْتُمْ وَادِياً إِلاَّ كَانُوا مَعَكُمْ**)، قَالُوا: يا رَسُولَ اللهِ! وَهُمْ بِالمدِينَةِ؟ قَالَ: (**وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ، حَبَسَهُمُ الْعُذْرُ**). [خ٤٤٢٣ (٢٨٣٨)]

(خ) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە غەزوەی تەبووك گەڕایەوە و لە مەدینە نزیکبوویەوە و فەرمووی: **(خەڵکانێك لە مەدینە هەن بە ڕێگەیەکدا نەڕۆیشتوون و دۆڵێکتان نەبڕیوە ئەوانتان لەگەڵ**

**نەبووبێت)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوان لە مەدینەش بوون؟ فەرمووی: **(ئەوان لە مەدینەبوون، عوزر بەندی کردبوون)**.

## ٢٤- دەروازەی: پلە و پایەی ئەو کەسەی پێویستی غەزاکەرێك ئامادە دەکات یان بە خێر دەبێتە جێنشینی

**٢١١٨-** (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ خالِدٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ جَهَّزَ غازِياً في سَبِيلِ الله فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَ غازِياً في سَبِيلِ الله بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا)**. [خ٢٨٤٣/ م١٨٩٥]

(ق) لە زەیدی کوڕی خالیدەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەرکەس پێویستی غەزاکەرێك لە ڕێگەی خودا ئامادە بکات غەزای کردووە، هەرکەس بە خێر ببێتە جێنشینی[1] غەزاکەرێك لە ڕێگەی خودا غەزای کردووە)**.

## ٢٥- دەروازەی: پلە و پایەی خەرج کردن لە ڕێگەی خودا

**٢١١٩-** (م) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ بِنَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ فَقَالَ: هذِهِ فِي سَبِيلِ الله، فَقَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(لَكَ بِهَا، يَوْمَ الْقِيَامَةِ: سَبْعُمائَةِ نَاقَةٍ، كُلُّهَا مَخْطُومَةٌ)**. [م١٨٩٢]

**(م) لە ئەبی مەسعوودی ئەنصارییەوە، وتی: پیاوێك حوشترێکی مێیەی لووت ڕەشۆکراوی هێنا و وتی: ئەمە لە ڕێگەی خودا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەمە لە ڕۆژی قیامەت حەوتسەد حوشتری مێیەت بۆ هەیە، هەموویان لووت ڕەشۆکراون)**.

**٢١٢٠-** عَنْ خُرَيْمِ بْنِ فَاتِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً فِي سَبِيلِ اللهِ، كُتِبَتْ لَهُ بِسَبْعِمائَةِ ضِعْفٍ)**. [ت١٦٢٥/ ن٣١٨٦]

* صحيح.

---

[1] واتە: سەرۆکاری ماڵ و منداڵ و کاروبارەکانی بکات و ناپاکی لێ نەکات-و.

لە خورەیمی کوڕی فاتیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە ڕێگەی خودا خەرجییەك بکات حەوتسەد بەرانبەری بۆ دەنوسرێت)**.

## ٢٦- دەروازەی: حورمەتی ئافرەتە تێکۆشەرەکان

**٢١٢١-** (م) عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلّى الله عليه وسلّم: **(حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ، كَحُرْمَةِ أُمَّهَاتِهِمْ. وَمَا مِنْ رَجُلٍ مِنَ الْقَاعِدِينَ يَخْلُفُ رَجُلاً مِنَ الْمُجَاهِدِينَ فِي أَهْلِهِ، فَيَخُونُهُ فِيهِمْ؛ إِلاَّ وُقِفَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَأْخُذُ مِنْ عَمَلِهِ مَا شَاءَ. فَمَا ظَنُّكُمْ)**؟. [م١٨٩٧]

(م) لە بورەیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(حورمەتی ئافرەتە تێکۆشەرەکان لەسەر پاڵدەرەوەکان[1] لە جیهاد وەك حورمەتی دایکیان وایە، هەر پیاوێك لە پاڵدەرەوان ببێتە جێنشینی پاوێك لە تێکۆشەران لەناو خانەوادەکەی و ناپاکییان لێ بکات لە ڕۆژی قیامەت رادەوەستێنرێ و لە کارەکەی چەند بخوازێت وەردەگرێت، دەبێ گومانتان چی بێت؟[2])**.

## ٢٧- دەروازەی: بەشداری کردنی ئافرەت لە جیهاد

**٢١٢٢-** (خ) عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ قَالَتْ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم نَسْقِي وَنُدَاوِي الجَرْحَى، وَنَرُدُّ الْقَتْلَى إِلَى المدِينَةِ. [خ٢٨٨٢]

(خ) لە روبەیعی کچی موعەویزەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین ئاومان پێ دەدان و بریندارەکانمان چارەسەر دەکرد و کوژراوەکانمان بۆ مەدینە دەگێڕایەوە.

---

[1] پاڵدەرەوەکان(القاعدين) ئەوانەن توانای جیهادیان نییە، لە پیر و منداڵ و نەخۆش-و.

[2] واتە: پێتان وایە شتێك لە کاری چاکەی بمێنێتەوە؟ چونکە ناپاکی لە کەسی موجاهید ئەوەندە خراپە چاکە بۆ کەسە ناپاکەکە ناهێڵێتەوە-و.

**٢١٢٣-** (م) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الأَنْصَارِيَّةِ قَالَتْ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم سَبْعَ غَزَوَاتٍ، أَخْلُفُهُمْ فِي رِحَالِهِمْ، فَأَصْنَعُ لَهُمُ الطَّعَامَ، وَأُدَاوِي الْجَرْحَى، وَأَقُومُ عَلَى الْمَرْضَى.
[م: الجهاد ١٨١٢ (١٤٢)]

**(م) لە ئوم عەتییەی ئەنصارییەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) حەوت غەزام کرد، لای کۆڵ و بارەکانیان دەبووم و خواردنم بۆ دروست دەکردن و بریندارەکانم چارەسەر دەکرد و چاودێری نەخۆشەکانم دەکرد.**

## ٢٨- دەروازەی: پلە و پایەی غەزاکردن لە دەریا

**٢١٢٤-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ فَتُطْعِمُهُ، وَكَانَتْ أُمُّ حَرَامٍ تَحْتَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَطْعَمَتْهُ، وَجَعَلَتْ تَفْلِي رَأْسَهُ، فَنَامَ رَسُولُ اللهِ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، قَالتْ: فَقُلْتُ: وَمَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولُ اللهِ؟ قَالَ: (**نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللهِ، يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ مُلُوكاً عَلَى الأَسِرَّةِ. أَوْ: مِثْلَ الْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ**) شَكَّ إِسْحاقُ. قالتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَدَعَا لَهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم.

ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقُلْتُ: وَمَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قالَ: (**نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي، عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللهِ**). كما قالَ في الأَوَّلِ، قالتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: (**أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ**).

فَرَكِبَتِ الْبَحْرَ فِي زَمَانِ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، فَصُرِعَتْ عَنْ دَابَّتِهَا حِينَ خَرَجَتْ مِنَ الْبَحْرِ، فَهَلَكَتْ.
[خ٢٧٨٨، ٢٧٨٩/ م١٩١٢]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەڕۆیشتە ژوورەوە بۆ لای ئوم حەرامی کچی میلحان، ئەویش خواردنی پێ دەدا، ئوم حەرام هاوسەری عوبادەی کوڕی صامیت بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) چووە ژوورەوە بۆ لای و ئەویش خواردنی پێدا و سەری دەدۆزی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەوی لێکەوت و بەئاگا هات و ئەو پێدەکەنی، ئوم حەرام وتی: وتم: چی تۆی هێناوەتە پێکەنین، ئەی پێغەمبەری**

خودا؟ فەرمووی: **(خەڵكانێك لە ئومەتەکەم بۆ خرانەڕوو، ئەوان غەزاکاربوون لە ڕێگەی خودا، سواری پشتی ئەم دەریا دەبوون مەلیکی سەر جێگەی پاڵدانەوە**، یان: **وەك مەلیکی سەر جێگەی پاڵدانەوە)**، ئیسحاق شکی بۆ دروستبووە، ئوم حەرام وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، داوا لە خودا بکە من لەوان بم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوعای بۆ کرد.

پاشان سەرینایەوە و پاشان بەئاگاهات و پێدەکەنی، وتم: چی دەتهێنێتە پێکەنین، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: **(خەڵكانێك لە ئومەتەکەم بۆ خرانەڕوو، ئەوان غەزاکاربوون لە ڕێگەی خودا)**، وەك چۆن یەکەمجار فەرمووی، ئوم حەرام وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، داوا لە خودا بکە من لەوان بم، فەرمووی: **(تۆ لە پێشینەکانی)**.

ئوم حەرام لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان سواری دەریا بوو و کاتێ لە دەریا هاتە دەرەوە لە وڵاخەکەی بەربوویەوە و تیاچوو[1].

## ٢٩- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی جەنگی ڕۆم و فارس هاتووە

**٢١٢٥-** (خ) عَنْ عُمَيْرِ بْنِ الأَسْوَدِ الْعَنْسِيِّ: أَنَّهُ أَتَى عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ، وَهُوَ نَازِلٌ فِي سَاحَةِ حِمْصَ، وَهُوَ فِي بِنَاءٍ لَهُ، وَمَعَهُ أُمُّ حَرَامٍ. قَالَ عُمَيْرٌ: فَحَدَّثَتْنَا أُمُّ حَرَامٍ: أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ الْبَحْرَ قَدْ أَوْجَبُوا)**. قَالَتْ أُمُّ حَرَامٍ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَنَا فِيهِمْ؟ قَالَ: **(أَنْتِ فِيهِمْ)**. ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ مَدِينَةَ قَيْصَرَ، مَغْفُورٌ لَهُمْ)**، فَقُلْتُ: أَنَا فِيهِمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: **(لاَ)**.

[خ٢٩٢٤ (٢٧٨٩)]

(خ) لە عومەیری کوڕی ئەسوەدی عەنسییەوە: ئەو هات بۆ لای عەبادەی کوڕی صامت، ئەو لە مەیدانی حیمص دابەزی بوو، لە بینایەکی خۆیدا بوو و ئوم حەرامی لەگەڵ بوو، عومەیر وتی: ئوم حەرام بۆی باس کردین، ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بووە دەیفەرموو: **(یەکەمین سوپایەك لە ئومەتم غەزای بەحر دەکەن بۆیان واجب**

---

[1] واتە: مرد-و.

**بووه)**، ئوم حەرام وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، منیان لەناودایە؟ فەرمووی: **(تۆیان لەناودایە)**، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(یەکەمین سوپایەك لە ئومەتەکەم شاری قەیصەر غەزو دەکەن، خودا لە گوناهەکانیان خۆشبووە)**، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، من لەناو ئەوانم؟ فەرمووی: **(نەخێر)**.

## ٣٠- دەروازەی: نەهی لە کوشتنی ئافرەت و منداڵ

**٢١٢٦-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: وُجِدَتِ امْرَأَةٌ مَقْتُولَةً فِي بَعْضِ مَغَازِي رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَنَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ.
[خ٣٠١٥ (٣٠١٤)/ م١٧٤٤]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: لە یەکێك لە غەزاکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئافرەتێکی کوژراو بینرایەوە، بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە کوشتنی ئافرەت و منداڵ.**

## ٣١- دەروازەی: کوشتنی ئافرەت و منداڵ بەبێ مەبەست

**٢١٢٧-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ ﷺ قَالَ: مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِالأَبْوَاءِ ـ أَوْ بِوَدَّانَ ـ وَسُئِلَ عَنْ أَهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ مِنَ المشْرِكِينَ، فَيُصَابُ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ، قَالَ: (هُمْ مِنْهُمْ). [خ٣٠١٢، ٣٠١٣/ م١٧٤٥]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە، لە صەعبی کوڕی جەسسامەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لە "الأبواء"[1] یان لە "ودّان"[2] پێغەمبەر(ﷺ) بە پاڵمدا تێپەڕی، پرسیاری لێکرا دەربارەی تیرەیەك لە هاوەڵدانەران شەو بەسەریاندا دەدرێت و ژنان و منداڵانیان دەکوژرێن، فەرمووی: (ئەوان لەوانن).**

---

[1] ناوی شوێنێکە-و.

[2] ناوی شوێنێکە-و.

- وفي رواية لمسلم: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قِيلَ لَهُ: لَوْ أَنَّ خَيْلاً أَغَارَتْ مِنَ اللَّيْلِ، فَأَصَابَتْ مِنْ أَبْنَاءِ الْمُشْرِكِينَ؟ قَالَ: (**هُمْ مِنْ آبَائِهِمْ**).

لە ڕیوایەتێکی موسلیمدا: بە پێغەمبەر(ﷺ) وترا: گەر ئەسپسوار بە شەو بدات بەسەردا و لە ڕۆڵەکانی هاوەڵدانەران بکوژێت؟ فەرمووی: (**ئەوان لە باوکانیانن**).

## ٣٢- دەروازەی: پیاوێك پیاوێکی تر دەکوژێت و دەچێتە بەهەشتەوە

**٢١٢٨-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**يَضْحَكُ اللهُ إِلَى رَجُلَيْنِ، يَقْتُلُ أَحَدُهُما الآخَرَ، يَدْخُلاَنِ الجَنَّةَ: يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيلِ اللهِ فَيُقْتَلُ، ثُمَّ يَتُوبُ اللهُ عَلَى الْقَاتِلِ، فَيُسْتَشْهَدُ**). [خ٢٨٢٦/ م١٨٩٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا بە دوو پیاو پێدەکەنێ، یەکێکیان ئەویتریانی کوشتووە و دەچنە بەهەشتەوە: ئەمەیان لە ڕێگەی خودا دەجەنگێ و دەکوژرێ، پاشان خودا تەوبە لە بکوژەکە قبووڵ دەکات و شەهید دەکرێت).**

## ٣٣- دەروازەی: کارێکی کەمی ئەنجامداوە و پاداشتێکی زۆری دراوەتەوە

**٢١٢٩-** (خ) عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلٌ مُقَنَّعٌ بِالحَدِيدِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أُقَاتِلُ وَأُسْلِمُ؟ قَالَ: (**أَسْلِمْ ثُمَّ قَاتِلْ**). فَأَسْلَمَ ثُمَّ قَاتَلَ فَقُتِلَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**عَمِلَ قَلِيلاً وَأُجِرَ كَثِيراً**). [خ٢٨٠٨]

(خ) لە بەرائەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پیاوێك ڕووپۆشی ئاسنی پۆشی بوو هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، دەجەنگم و موسڵمان دەبم؟ فەرمووی: (**موسڵمان بە و پاشان بجەنگە**)، کەسەکە موسڵمان بوو و پاشان جەنگا و کوژرا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**کەمێك کاری کرد و پاداشتێکی زۆری درایەوە**).

## ٣٤- دەروازەی: تەسبیح و تەکبیر لە کاتی ڕۆیشتن

**٢١٣٠-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: لَمَّا غَزَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَيْبَرَ .أَوْ قَالَ: لَمَّا تَوَجَّهَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم .أَشْرَفَ النَّاسُ عَلَى وَادٍ، فَرَفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّكْبِيرِ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، إِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِباً، إِنَّكُمْ تَدْعُونَ سَمِيعاً قَرِيباً، وَهُوَ مَعَكُمْ)**. وَأَنَا خَلْفَ دَابَّةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَسَمِعَنِي وَأَنَا أَقُولُ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ، فَقَالَ لِي: **(يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ قَيْسٍ)**، قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: **(أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَلِمَةٍ مِنْ كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الجَنَّةِ)**؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي! قَالَ: **(لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ)**.

[خ٤٢٠٥ (٢٩٩٢)/ م٢٧٠٤]

(ق) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) غەزای خەیبەری کرد-یان وتی: کاتێك پێغەمبەری خودا ڕووی لە خەیبەر کرد- خەڵکی ڕوانییان بەسەر دۆڵێکدا و دەنگی خۆیان بە تەکبیر بەرزکردەوە: الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لەگەڵ خۆتان هێواش بن، ئێوە بانگ لە کەڕێك و نادیارێك ناکەن، ئێوە بانگ لە بیسەری نزیك دەکەن و ئەو لەگەڵ ئێوەیە)**، من لەدوای وڵاخی سوارییەکەی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بووم، گوێی لێم بوو دەموت: لا حول ولا قوة إلا بالله، پێی فەرمووم: **(ئەی عەبدوڵای کوڕی قەیس)**[1]، وتم: لبيك، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(دەتەوێ کەلیمەیەکت پێ نیشان بدەم گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی بەهەشت؟)**، وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، باوك و دایکم فیدات بێت، فەرمووی: **(لا حول ولا قوة إلا بالله)**.

[1] ئەبو موسای ئەشعەری ناوی عەبدوڵای کوڕی قەیس بووە، ئەبو موسا کونییەکەی بووە-و.

## ٣٥- دەروازەی: بە ترس و تۆقین سەرخراوم

٢١٣١- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**بُعِثْتُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، فَبَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِمَفَاتِيحِ خَزَائِنِ الأَرْضِ فَوُضِعَتْ فِي يَدِي**). قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَقَدْ ذَهَبَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَنْتُمْ تَنْتَثِلُونَهَا. [خ٢٩٧٧/ م٥٢٣]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بە کۆکەرەوەی ماناوە(جوامع الکلم) رەوانە کرام، بە ترس و تۆقین(الرعب) سەرخرام، کاتێ خەوتبووم کلیلی گەنجینەکانی زەویيم بۆ هێنران و نرانە ناو دەستمەوە)**، ئەبو هورەیرە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) رۆیشت و ئەوەی تێیاندایە[1] ئێوە دەریدەهێنن.

## ٣٦- دەروازەی: جگە لە لاوازانتان ئێوە بە چ شتێکی تر سەردەخرێن؟

٢١٣٢- (خ) عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: رَأَى سَعْدٌ ﷺ أَنَّ لَهُ فَضْلاً عَلَى مَنْ دُونَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**هَلْ تُنْصَرُونَ وَتُرْزَقُونَ إِلاَّ بِضُعَفَائِكُمْ**). [خ٢٨٩٦]

(خ) لە موصەعەبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، وتی: سەعد(خوا لێی رازی بێت) پێیوابوو فەزڵی هەیە بەسەر ئەوانەی خوار ئەو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(جگە لە لاوازانتان ئێوە بە چ شتێکی تر رۆزی دەدرێن و سەردەخرێن؟)**.

٢١٣٣- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**ابْغُونِي الضُّعَفَاءَ، فَإِنَّمَا تُرْزَقُونَ وَتُنْصَرُونَ بِضُعَفَائِكُمْ**). [د٢٥٩٤/ ت١٧٠٢/ ن٣١٧٩]

* صحيح.

لە ئەبی دەرداوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(بۆ من بەدوای لاوازاندا بگەڕێن، ئێوە بە لاوازەکانتان رۆزی دەدرێن و سەردەخرێن)**.

---

[1] واتە: ئەوەی لەناو ئەو گەنجینانەدایە-و.

## ٣٧- دەروازەی: جەنگ فێڵ و فریودانە

**٢١٣٤-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمَّى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم الحَرْبَ خَدْعَةً.

[خ٣٠٢٨، ٣٠٢٩/ م١٧٤٠]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) جەنگی بە فێڵ و فریودان ناوبرد(الحَرْبُ خَدْعَة).**

- ولفظ مسلم: قال صلّى الله عليه وسلّم: (**الْحَرْبُ خُدْعَةٌ**).

**لەفزەکەی موسلیم: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: جەنگ فێڵ و فریوە(الحَرْبُ خُدْعَة).**

## ٣٨- دەروازەی: بە سزای خودا سزا مەدەن

**٢١٣٥-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي بَعْثٍ، فَقَالَ: (**إِنْ وَجَدْتُمْ فُلاَناً وَفُلاَناً، فَأَحْرِقُوهُمَا بِالنَّارِ**). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حِينَ أَرَدْنَا الخُرُوجَ: (**إِنِّي كُنْتُ أَمَرْتُكُمْ أَنْ تُحْرِقُوا فُلاَناً وَفُلاَناً، وَإِنَّ النَّارَ لاَ يُعَذِّبُ بِهَا إِلاَّ اللهُ، فَإِنْ وَجَدْتُمُوهُمَا فَاقْتُلُوهُمَا**). [خ٣٠١٦ (٢٩٥٤)]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ناردەیەکدا ڕەوانەی کردین و فەرمووی: (گەر فلان و فلانتان بینی بە ئاگر بیسوتێنن)، پاشان کە ویستمان دەربچین پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (من فەرمانم پێکردن فلان و فلان بسوتێنن، تەنها خودا بە ئاگر سزا دەدات، گەر ئەو دوانەتان بینی بیانکوژن).**

## ٣٩- دەروازەی: پێشوازی غەزاکاران

**٢١٣٦-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ تُلُقِّيَ بِصِبْيَانِ أَهْلِ بَيْتِهِ. قَالَ: وَإِنَّهُ قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ فَسُبِقَ بِي إِلَيْهِ، فَحَمَلَنِي بَيْنَ يَدَيْهِ، ثُمَّ جِيءَ بِأَحَدِ ابْنَيْ فَاطِمَةَ، فَأَرْدَفَهُ خَلْفَهُ. قَالَ: فَأُدْخِلْنَا الْمَدِينَةَ، ثَلاَثَةً عَلَى دَابَّةٍ. [م٢٤٢٨]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی جەعفەرەوە، وتی: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە سەفەر دەگەڕایەوە بە منداڵانی خانەوادەی خۆی پێشوازی لێ دەکرا، وتی: ئەو لە سەفەرێك گەڕایەوە منیان بۆ پێشوازی لێکردنی پێشخست لەبەردەمی خۆی سواری کردم، پاشان یەکێك لە کوڕەکانی فاتیمە هێنرا لە پاشکۆی خۆی سواری کرد، وتی: چووینە ژوورەوە بۆ ناو مەدینە سیان لەسەر وڵاخێکی سواری بووین.

## ٤٠- دەروازەی: جیهاد بە وشە و جیهاد بە نەفس

**٢١٣٧-** عَنْ أَنَسِ بنِ مالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ، وَأَنْفُسِكُمْ، وَأَلْسِنَتِكُمْ**). [د٢٥٠٤/ ن٣٠٩٦/ مي٢٤٧٥]

* صحيح.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بە ماڵ و سامان و بە نەفسی خۆتان و بە زمانتان جیهادی هاوەڵدانەران بکەن).**

**٢١٣٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ مِنْ أَعْظَمِ الْجِهَادِ: كَلِمَةَ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ**). [د٤٣٤٤/ ت٢١٧٤/ جه٤٠١١]

* صحيح.

**لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (کەلیمەیەکی ڕێك و ڕاست لای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار لە مەزنترین جیهادە).**

**٢١٣٩-** عَن عَبْد الرَّحْمَنِ بْن عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ حِينَ أَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي الشِّعْرِ مَا أَنْزَلَ، أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَدْ أَنْزَلَ فِي الشِّعْرِ مَا قَدْ عَلِمْتَ، وَكَيْفَ تَرَى فِيهِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ الْمُؤْمِنَ يُجَاهِدُ بِسَيْفِهِ وَلِسَانِهِ**). [حم١٥٧٨٥]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

لە عبدالرحمانی کوڕی عەبدولاّی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە: کاتێ خودا(تبارك وتعالى) ئەوەی دابەزاند دەربارەی هۆنراوە کە دایبەزاند، کەعبی کوڕی مالیك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: خودا(تبارك وتعالى) دەربارەی هۆنراوە ئەوەی دابەزاندووە کە دەزانیت، چی تیادا دەبینی؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(باوەڕدار بە شمشێرەکەی و بە زمانی جیهاد دەکات)**.

**٢١٤٠**– عَنْ فُضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْمُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ**). [ت١٦٢١]

* صحيح.

لە فوزالەی کوڕی عوبەیدەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(موجاهید کەسێکە موجاهەدەی نەفسی خۆی دەکات)**.

## ٤١- دەروازەی: جیهاد لە کاتی تەنگانە

**٢١٤١**– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ أَرَادَ أَنْ يَغْزُوَ فَقَالَ: (**يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ، إِنَّ مِنْ إِخْوَانِكُمْ قَوْماً لَيْسَ لَهُمْ مَالٌ وَلاَ عَشِيرَةٌ، فَلْيَضُمَّ أَحَدُكُمْ إِلَيْهِ الرَّجُلَيْنِ أَوْ الثَّلاَثَةِ**). فَمَا لِأَحَدِنَا مِنْ ظَهْرٍ يَحْمِلُهُ إِلاَّ عُقْبَةٌ كَعُقْبَةِ - يَعْنِي: أَحَدِهِمْ. قَالَ: فَضَمَمْتُ إِلَيَّ اثْنَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً، قَالَ: مَا لِي إِلاَّ عُقْبَةٌ كَعُقْبَةِ أَحَدِهِمْ مِنْ جَمَلِي.

* صحيح. [د٢٥٣٤]

لە جابری کوڕی عەبدولاّوە: لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) باس دەکات، ئەو ویستویەتی غەزایەك بکات، بۆیە فەرمووی: **(ئەی کۆمەڵی کۆچکەران و پشتیوانان، لە براکانی ئێوە کۆمەڵێك هەن ماڵ و سامان و عەشرەتیان نییە، با یەکێك لە ئێوە دوو پیاو یان سێ پیاو لەخۆ بگرێت)**، هەر کەس لەناو ئێمە وڵاخی سواری هەبوو تەنها وەك ئەوان نۆرەی سواری بۆ هەبوو–وەك یەکێك لەوان– وتی: منیش دوان یان سیانم گرتەخۆ، وتی: منیش تەنها نۆرەی سواریم وەك نۆرەی سواری یەکێك لەوان بوو لە حوشترەکەم.

## ٤٢- دەروازەی: دوعا بەر لە ڕووبەڕووبوونەوە

**٢١٤٢**– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا غَزَا قَالَ: (**اللَّهُمَّ أَنْتَ عَضُدِي وَنَصِيرِي، بِكَ أَحُولُ، وَبِكَ أَصُولُ، وَبِكَ أُقَاتِلُ**). [د٢٦٣٢/ ت٣٥٨٤]

* صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) غەزای بکردبایە دەیفەرموو: (**خودایە تۆ پشتیوان و سەرخەری منی، بە تۆوە هەوڵی لادانی زیان دەدەم، بە تۆوە هەڵدەکوتمە سەر دوژمن و بە تۆوە بنبڕی دەکەم، بە تۆوە دەتوانم لەگەڵ دوژمن بجەنگم**).

**٢١٤٣**– عَنْ صُهَيْبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَدْعُو أَيَّامَ حُنَيْنٍ: (**اللَّهُمَّ بِكَ أُحَاوِلُ، وَبِكَ أُصَاوِلُ، وَبِكَ أُقَاتِلُ**). [مي٢٤٨٥]

* صحيح.

لە صوهەیبەوە: لە ڕۆژەکانی حونەیندا پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم دوعایەی دەکرد: (**خودایە، بە تۆوە هەڵدەکوتمە سەر دوژمن و بە تۆوە بنبڕی دەکەم، بە تۆوە دەتوانم لەگەڵ دوژمن بجەنگم**).

## ٤٣- دەروازەی: ئەوەی شەهید دەیبینێتەوە لە ئازار

**٢١٤٤**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا يَجِدُ الشَّهِيدُ مِنْ مَسِّ الْقَتْلِ، إِلاَّ كَمَا يَجِدُ أَحَدُكُمْ مِنْ مَسِّ الْقَرْصَةِ**). [ت١٦٦٨/ ن٣١٦١/ جه٢٨٠٢/ مي٢٤٥٢]

* حسن صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**شەهید لە بەرکەوتنی کوشتن تەنها ئەوەندە دەبینێتەوە یەکێك لە ئێوە لە گەستنی مێروولەیەك دەیبینێتەوە**).

## ٤٤- دەروازەی: دەربارەی بەیداخەکان و لیواکان و دروشمەکان

**٢١٤٥**– عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ: أنه سئل عَنْ رَايَةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَا كَانَتْ؟ فَقَالَ: كَانَتْ سَوْدَاءَ مُرَبَّعَةً مِنْ نَمِرَةٍ. [د٢٥٩١/ ت١٦٨٠]

* صحيح.

**لە بەرائی کوڕی عازیبەوە: ئەو پرسیاری لێکرا لە بەیداخی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چۆن و چی بوو؟ وتی: ڕەشی چوارگۆشە بوو لە "نَمِرَة[1]"ەوە.**

**٢١٤٦**– عَنْ جَابِرٍ يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُ كَانَ لِوَاؤُهُ يَوْمَ دَخَلَ مَكَّةَ أَبْيَضَ. [د٢٥٩٢/ ت١٦٧٩/ ن٢٨٦٦/ جه٢٨١٧]

* صحيح.

**لە جابرەوە، بەرزی دەکاتەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ): ئەو ڕۆژەی چووە ناو مەککە بەیداخەکەی سپی بوو.**

**٢١٤٧**– عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ أَبِي بَكْرٍ ﷺ زَمَنَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَكَانَ شِعَارُنَا: أَمِتْ، أَمِتْ. [د٢٥٩٦/ جه٢٨٤٠]

* حسن.

**لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەبوبەکر(خوا لێی ڕازی بێت) غەزامان کرد، دروشمەکەمان بریتی بوو لە "أَمِتْ أَمِتْ"[2].**

**٢١٤٨**– عَنِ الْمُهَلَّبِ بْنِ أَبِي صُفْرَةَ: قَالَ أَخْبَرَنِي مَنْ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(إِنْ بُيِّتُّمْ فَلْيَكُنْ شِعَارُكُمْ: حم لاَ يُنْصَرُونَ)**. [د٢٥٩٧/ ت١٦٨٢]

* صحيح.

---

[1] پۆشاکێکە خەتی ڕەش و سپی تێدا بووە، وەك هێڵی فەرووی پڵنگ–و.

[2] "أمت أمت" وشەی نهێنی نێوانیان بووە لەو شەوەدا، چونکە لە شەودا پەلاماری هاوەڵدانەرانیان داوە، تا یەکتری پێ بناسنەوە، وشەکە فەرمانکردنە بە کوشتن: وەك مانای (بکوژ بکوژ)–و.

لە موهەلەبی کوڕی ئەبی صوفرەوە: وتی کەسێك لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەواڵی پێدام فەرمووی: **(گەر دوژمن شەبیەخونی کرد**[1] **بەسەر ئێوەدا با دروشمەکەتان بریتی بێت لە: "حم لا یُنْصَرون**[2]**")**.

## ٤٥- دەروازەی: ڕێکخستنی سەربازگە و پلە و پایەی پاسەوانی

**٢١٤٩-** عَن أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ قَالَ: كَانَ النَّاسُ إِذَا نَزَلُوا مَنْزِلاً . قَالَ عَمْرٌو: كَانَ النَّاسُ إِذَا نَزَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَنْزِلاً . تَفَرَّقُوا فِي الشِّعَابِ وَالْأَوْدِيَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ تَفَرُّقَكُمْ فِي هَذِهِ الشِّعَابِ وَالْأَوْدِيَةِ، إِنَّمَا ذَلِكُمْ مِنَ الشَّيْطَانِ)**. فَلَمْ يَنْزِلْ بَعْدَ ذَلِكَ مَنْزِلاً؛ إِلاَّ انْضَمَّ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، حَتَّى يُقَالَ: لَوْ بُسِطَ عَلَيْهِمْ ثَوْبٌ لَعَمَّهُمْ. [د٢٦٢٨]

* صحيح.

لە ئەبی سەعلەبەی خوشەنییەوە، وتی: گەر خەڵکی لە شوێنێك دابەزیبان -عەمر دەڵێ: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە شوێنێك دابەزیبا- خەڵکی بە شیو و دۆڵەکاندا بڵاوەیان دەکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بەم شیو و دۆڵانەدا بڵاوە بکەن، ئەو کارە لە ئێوە لە شەیتانەوەیە)**، لەدوای ئەوە لە هەر شوێنێك دابەزیبا خەڵکی یەکیان دەگرت تا دەوترا: گەر پۆشاکێك بەسەریاندا هەڵبدرێت هەموویان دەگرێتەوە.

**٢١٥٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(عَيْنَانِ لاَ تَمَسُّهُمَا النَّارُ: عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللهِ، وَعَيْنٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ فِي سَبِيلِ اللهِ)**. [ت١٦٣٩]

* صحيح.

---

[1] واتە: بە شەو هێرشی بۆ هێنان-و.

[2] "حم لا یُنصرون" وشەی نهێنی نێوانیان بووە لە شەوەدا بۆ ناسینەوەی یەکتر، واتە: بە فەزڵ و مەنزیلەتی ئەو سورەتانەی بە (حم) دەست پێ دەکەن دوژمن سەرناخرێت، واتە: بێباوەڕان بەسەر ئەواندا سەرناخرێن-و.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(دوو چاو ئاگر بەریانناکەوێت: چاوێك لە ترسی خودا گریا بێت، و چاوێك شەوێك بکاتەوە و لە ڕێگەی خودا پاسەوانی کردبێت).**

**٢١٥١**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ النبي صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِلَيْلَةٍ أَفْضَلَ مِنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ، حَارِسٌ حَرَسَ فِي أَرْضِ خَوْفٍ، لَعَلَّهُ أَنْ لاَ يَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهِ).**

* قال الذهبي: على شرط البخاري.	[ك٢٤٢٤/هق٩/١٤٩]

لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(دەتانەوێ هەواڵتان پێ بدەم بە شەوێك باشتر و چاکتر لە شەوی قەدر، پاسەوانێك لە زەوی ترس پاسەوانی کردبێت، لەوانەیە نەگەڕێتەوە بۆ لای خانەوادەکەی).**

## ٤٦- دەروازەی: دەربارەی نێراوان

**٢١٥٢**– عَنْ سَلَمَةَ بْنِ نُعَيْمِ بْنِ مَسْعُودٍ الْأَشْجَعِيِّ، عَنْ أَبِيهِ نُعَيْمٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ لَهُمَا حِينَ قَرَأَ كِتَابَ مُسَيْلِمَةَ: **(مَا تَقُولاَنِ أَنْتُمَا)**؟ قَالاَ: نَقُولُ كَمَا قَالَ، قَالَ: **(أَمَا وَاللهِ، لَوْلاَ أَنَّ الرُّسُلَ لاَ تُقْتَلُ، لَضَرَبْتُ أَعْنَاقَكُمَا).**	[د٢٧٦١]

* صحيح.

لە سەلەمەی کوڕی نوعەیمی کوڕی مەسعوودی ئەشجەعییەوە: لە باوکییەوە(نوعەیم)، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو–کاتێ نوسراوەکەی موسەیلەمەی خوێندەوە– بە هەردووکیانی[1] دەفەرموو: **(ئێوە چی دەڵێن؟)**، وتیان: ئەوە دەڵێین ئەو دەیڵێ، فەرمووی: **(سوێند بە خودا، گەر لەبەر ئەوە نەبوایە نێراوان ناکوژرێن دەمدا لە گەردنی هەردووکتان).**

[1] واتە: بە هەردوو نێراوەکە–و.

## ٤٧- دەروازەی: لار و لەنجە کردن لە جەنگدا

**٢١٥٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَتِيكٍ: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَقُولُ: (**مِنَ الْغَيْرَةِ مَا يُحِبُّ اللهُ، وَمِنْهَا مَا يُبْغِضُ اللهُ، فَأَمَّا الَّتِي يُحِبُّهَا اللهُ: فَالْغَيْرَةُ فِي الرِّيبَةِ، وَأَمَّا الْغَيْرَةُ الَّتِي يُبْغِضُهَا اللهُ: فَالْغَيْرَةُ فِي غَيْرِ رِيبَةٍ. وَإِنَّ مِنَ الْخُيَلاَءِ مَا يُبْغِضُ اللهُ، وَمِنْهَا مَا يُحِبُّ اللهُ، فَأَمَّا الْخُيَلاَءُ الَّتِي يُحِبُّ اللهُ: فَاخْتِيَالُ الرَّجُلِ نَفْسَهُ عِنْدَ الْقِتَالِ، وَاخْتِيَالُهُ عِنْدَ الصَّدَقَةِ، وَأَمَّا الَّتِي يُبْغِضُ اللهُ: فَاخْتِيَالُهُ فِي الْبَغْيِ**). قَالَ مُوسَى: (**وَالْفَخْرِ**). [د٢٦٥٩/ ن٢٥٥٧/ مي٢٢٧٢]

* حسن.

**لە جابری کوڕی عەتیکەوە: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (هەندێ غیرەت هەیە خودا خۆشیدەوێت و هەندێ غیرەتیش هەیە خودا رقی لێیەتی، ئەو غیرەتەی خودا خۆشیدەوێت: غیرەتە لە شکەوە، ئەو غیرەتەش خودا رقی لێیەتی غیرەتە بەبێ بوونی شك، هەندێ لەنجە و لار هەیە خودا خۆشیدەوێت، و هەندێکیش خودا رقی لێیەتی، ئەو لەنجە و لارەی خودا خۆشیدەوێت لەنجە و لاری پیاوە لە کاتی جەنگاندا و لەنجە و لاری لە کاتی صەدەقەکردن، ئەوەش کە خودا رقی لێیەتی لەنجە و لارە لە خراپە و دەستدرێژیدا)، موسا دەڵێت: (ئەو فەخرەی[1]).**

## ٤٨- دەروازەی: نیشتەجێبوون لە وڵاتی بێباوەڕان

**٢١٥٤-** عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَنَا بَرِيءٌ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ أَظْهُرِ الْمُشْرِكِينَ**)، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، لِمَ؟ قَالَ: (**لا تَرَاءَى نَارَاهُمَا**).

* صحيح. [د٢٦٤٥/ ت١٦٠٤]

---

[1] واتە: لە جێگەی (ئەو لەنجە و لارەی(الخيلاء)) ئەو (فەخرەی(الفخر))-و.

لە جەریری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(من بەریم لە هەر موسڵمانێك لەناو هاوەڵدانەران نیشتەجێ دەبێت)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، بۆچی؟ فەرمووی: **(ئاگریان یەکتر نابینن[1])**.

## ٤٩- دەروازەی: داباریینی ئومەتان بەسەر موسڵماناندا

**٢١٥٥**- عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(يُوشِكُ الْأُمَمُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ، كَمَا تَدَاعَى الْأَكَلَةُ إِلَى قَصْعَتِهَا)**. فَقَالَ قَائِلٌ: وَمِنْ قِلَّةٍ نَحْنُ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: **(بَلْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ، وَلَكِنَّكُمْ غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ، وَلَيَنْزِعَنَّ اللهُ مِنْ صُدُورِ عَدُوِّكُمُ الْمَهَابَةَ مِنْكُمْ، وَلَيَقْذِفَنَّ اللهُ فِي قُلُوبِكُمُ الوَهْنَ)**، فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا الْوَهْنُ؟ قَالَ: **(حُبُّ الدُّنْيَا، وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ)**.

* صحيح.		[د٤٢٩٧]

لە سەوبانەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خەریکە ئومەتان بەسەر ئێوەدا دادەبارێن، وەك چۆن فرەخۆر بەسەر قەصعەدا دادەبارێ)**، یەکێك وتی: ئایا ئەو ڕۆژە لە کەمیمانە؟ فەرمووی: **(بەڵکو ئەو ڕۆژە ئێوە زۆرن، بەڵام کۆتەڵن وەك کۆتەڵی سەر لافاو، خودا ترس لە ئێوە لە سینەی دوژمنەکەتان دەردەهێنێت، و خودا "الوهن" دەخاتە ناو دڵتانەوە)**، یەکێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، "الوهن" چییە؟ فەرمووی: **(خۆشەویستی دنیا و ڕق لە مردن)**.

## ٥٠- دەروازەی: جیهاد بەردەوامە

**٢١٥٦**- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ نُفَيْلٍ الْكِنْدِيِّ قَالَ: كُنْتُ جَالِساً عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَذَالَ النَّاسُ الْخَيْلَ، وَوَضَعُوا السِّلاَحَ، وَقَالُوا: لاَ جِهَادَ، قَدْ وَضَعَتِ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا! فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِوَجْهِهِ وَقَالَ: **(كَذَبُوا، الْآنَ الْآنَ**

---

[1] واتە: موسڵمان و بێباوەڕ لەیەکتر دوورەپەرێزن و ئەوەندە لەیەکتر دوورن ئاگریان یەکتر نابینن–و.

جَاءَ الْقِتَالُ، وَلاَ يَزَالُ مِنْ أُمَّتِي أُمَّةٌ يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ، وَيُزِيغُ اللهُ لَهُمْ قُلُوبَ أَقْوَامٍ، وَيَرْزُقُهُمْ مِنْهُمْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، وَحَتَّى يَأْتِيَ وَعْدُ اللهِ، وَالْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. وَهُوَ يُوحَى إِلَيَّ أَنِّي مَقْبُوضٌ، غَيْرَ مُلَبَّثٍ، وَأَنْتُمْ تَتَّبِعُونِي أَفْنَاداً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، وَعُقْرُ دَارِ الْمُؤْمِنِينَ الشَّامُ). [ن٣٥٦٣]

* صحيح.

لە سەلەمەی کوڕی نوفەیلی کیندییەوە، وتی: لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتبووم، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، خەڵکی کەمبایەخ تەماشای ئەسپ دەکەن و چەکیان داناوە، و دەڵێن: جیهاد نییە، و جەنگ دامرکاوەتەوە و تەواو بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕووی لێکرد و فەرمووی: **(درۆیان کرد، هەر ئێستا، ئێستا جەنگان هاتووە، بەردەوام لە ئومەتەکەم کۆمەڵێك هەن لەسەر حەق دەجەنگن، خودا دڵی خەڵکانیان بۆ لادەدا و لەوانەوە ڕۆزییان دەدات تا قیامەت بەرپا دەبێت، هەروەها تا بەڵێنی خودا دێت، ئەسپ خێر بە ناوچاویەوەیە تا ڕۆژی قیامەت، وەحیم بۆ کراوە من دەمرم و لەناو ئێوە نامێنمەوە، ئێوەش بە کۆمەڵی جیاجیا بەدوای مندا دێن، هەندێکتان دەکێشن بە گەردنی هەندێکی ترتان، کونجی خانەی باوەڕداران بریتییە لە شام).**

# بەشی دووەم

# حوکمەکانی غەنیمەت

## ١- دەروازەی: حەڵاڵی غەنیمەت

**٢١٥٧-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ اللهَ فَضَّلَنِي عَلَى الْأَنْبِيَاءِ. أَوْ قَالَ: أُمَّتِي عَلَى الْأُمَمِ. وَأَحَلَّ لَنَا الْغَنَائِمَ**). [ت١٥٥٣]

* صحيح.

[وانظر: ١٠٦٦، ٢١٣١، ٣٧٧٩].

لە ئەبی ئومامەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، فەرمووی: (**خودا فەزڵی منی داوە بەسەر پێغەمبەراندا**-یان فەرمووی: **فەزڵی ئومەتەکەمی داوە بەسەر ئومەتاندا**- **و غەنیمەتی بۆ حەڵاڵ کردووین**).

## ٢- دەروازەی: پاداشتی ئەو کەسەی غەزا دەکات و غەنیمەت بەدەست دەهێنێت

**٢١٥٨-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا مِنْ غَازِيَةٍ أَوْ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فَتَغْنَمُ وَتَسْلَمُ؛ إِلاَّ كَانُوا قَدْ تَعَجَّلُوا ثُلُثَيْ أُجُورِهِمْ. وَمَا مِنْ غَازِيَةٍ أَوْ سَرِيَّةٍ تُخْفِقُ وَتُصَابُ؛ إِلاَّ تَمَّ أُجُورُهُمْ**).

(م) لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەر غەزاکەرێك یان هەر سریەیەك غەزا بکەن و غەنیمەت بگرن و سەلامەت بن دوو سێ بەشی[1] پاداشتیان بۆ خۆیان پێشخستووە، هەر غەزاکەرێك یان هەر سریەیەك شکست بهێنن و تووشبن بەتەواوی پاداشت دەدرێنەوە**).

---

[1] واتە: لە سێ بەش دوو بەش-و.

- وفِي رواية قَالَ: (مَا مِنْ غَازِيَةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللهِ فَيُصِيبُونَ الْغَنِيمَةَ، إِلاَّ تَعَجَّلُوا ثُلُثَيْ أَجْرِهِمْ مِنَ الآخِرَةِ، وَيَبْقَى لَهُمُ الثُّلُثُ. وَإِنْ لَمْ يُصِيبُوا غَنِيمَةً تَمَّ لَهُمْ أَجْرُهُمْ). [م١٩٠٦]

**لە ریوایەتێکدا فەرمووی: (هەر غەزاکەرێك لە ڕێگەی خودا غەزا بکەن و تووشی غەنیمەت بن دوو سێ بەشی پاداشتی دواڕۆژیان بۆ خۆیان پێشخستووە و سێ یەکی پاداشتیان بۆ دەمێنێتەوە، گەر تووشی غەنیمەت نەیەن پاداشتەکەیان بۆ تێر و تەواو دەبێت).**

## ٣- دەروازەی: دابەش کردنی غەنیمەت

**٢١٥٩-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم جَعَلَ لِلْفَرَسِ سَهْمَيْنِ، وَلِصَاحِبِهِ سَهْماً. [خ٢٨٦٣/ م١٧٦٢]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوو بەشی بۆ ئەسپ دانا و بۆ هاوەڵەکەی یەك بەش[(١)].**

## ٤- دەروازەی: ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی گشتی موسڵمانان لە دابەش کردن

**٢١٦٠-** (خ) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ قَالَ: أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلاَ أَنْ أَتْرُكَ آخِرَ النَّاسِ بَبَّاناً لَيْسَ لَهُمْ شَيْءٌ، ما فُتِحَتْ عَلَيَّ قَرْيَةٌ إِلاَّ قَسَمْتُهَا، كَمَا قَسَمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم خَيْبَرَ، وَلكِنِّي أَتْرُكُهَا خِزَانَةً لَهُمْ يَقْتَسِمُونَهَا. [خ٤٢٣٥ (٢٣٣٤)]

**(خ) لە عومەری کوڕی خەتابەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، گەر پاشینەکانی خەڵکم بێبەش نەکردبا هیچ شتێکیان**

---

(١) واتە: بۆ ئەسپسوار دوو بەش-بەشێك بۆ سوارەکە و بەشێك بۆ ئەسپەکە- و بۆ پیادەڕەو یەك بەش-و.

نەبێت[1] ئەوا هەر ئاوەدانییەك بۆم فەتح کرابا دابەشم دەکرد، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) خەیبەری دابەش کرد، بەڵام وەك گەنجینەیەك[2] وازی لێ دەهێنم خەراجەکەی دابەش بکەن.

## ٥- دەروازەی: ئەوەی بە دڵڕاگیراوان(مؤلفة قلوبهم) دەدرێت

**٢١٦١-** (خ) عَنْ عَمْرِو بْنِ تَغْلِبَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أُتِيَ بِمَالٍ ـ أَوْ بِسَبْيٍ ـ فَقَسَمَهُ، فَأَعْطَى رِجَالاً وَتَرَكَ رِجَالاً، فَبَلَغَهُ أَنَّ الَّذِينَ تَرَكَ عَتَبُوا، فَحَمِدَ اللهَ ثُمَّ أَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (**أَمَّا بَعْدُ، فَوَاللهِ إِنِّي لأُعْطِي الرَّجُلَ وَأَدَعُ الرَّجُلَ، وَالَّذِي أَدَعُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الَّذِي أُعْطِي، وَلكِنْ أُعْطِي أَقْوَاماً لِمَا أَرَى فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الجَزَعِ وَالْهَلَعِ، وَأَكِلُ أَقْوَاماً إِلَى مَا جَعَلَ اللهُ فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الْغِنَى وَالْخَيْرِ، فِيهِمْ عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ**). فَوَاللهِ مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِكَلِمَةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حُمْرَ النَّعَمِ. [خ٩٢٣]

(خ) لە عەمری کوڕی تەغلیبەوە: ماڵ و سامان-یان سەبی[3]- هێنرا بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) و دابەشی کرد، بە هەندێ پیاوی بەخشی و وازی لە هەندێك پیاو هێنا[4]، پێیگەیشتەوە ئەوانەی وازیلێهێنان سەرزەنشتیان کردووە، بۆیە حەمدی خودای کرد و سەنای لەسەر کرد، پاشان فەرمووی: (**پاشان، سوێند بە خودا، من بە پیاوێك دەبەخشم و واز لە پیاوێك دەهێنم، ئەو کەسەی وازملێهێناوە لام خۆشەویستترە لەو کەسەی پێمبەخشیوە، بەڵام من بە خەڵکانێك دەبەخشم لەبەر ئەو نیگەرانی و پەشێوایییەی لە دڵیان دەیبینم، خەڵکانێکیش دەدەمە دەست ئەو**

---

[1] واتە: گەر ترسی ئەوانەی داهاتوو(نەوەکانی داهاتوو)م نەبێت تووشی بێبەشی و مەحرووم بوون بێن-و.

[2] واتە: وەك گەنجینەیەك بۆ نەوەکانی داهاتوو-و.

[3] ئەو کەسانەی لە بەرەی جەنگدا دەگیرێن-و.

[4] واتە: بە هەندێ پیاوی تری نەبەخشی-و.

**بێنیازی و خێرەی خودا لە دڵیان دایناوە، تیایدا عەمری کوڕی سەعلەب)**، سوێند بە خودا کۆمەڵە حوشتری سوور بەو کەلیمەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناگۆڕمەوە.

## ٦- دەروازەی: دەربارەی خۆراك لە غەنیمەتدا

**٢١٦٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى: أنه سئل هَلْ كُنْتُمْ تُخَمِّسُونَ . يَعْنِي: الطَّعَامَ . فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَقَالَ: أَصَبْنَا طَعَاماً يَوْمَ خَيْبَرَ، فَكَانَ الرَّجُلُ يَجِيءُ فَيَأْخُذُ مِنْهُ مِقْدَارَ مَا يَكْفِيهِ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ. [د٢٧٠٤]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە: ئەو پرسیاری لێکرا: ئایا لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێنج یەکتان دەگرت—واتە خۆراك—؟[١] وتی: لە ڕۆژی خەیبەر تووشی خۆراك هاتین، پیاوێك دەهات و بڕی پێویستی خۆی لێ دەبرد و پاشان دەڕۆیشت[٢].**

## ٧- دەروازەی: هەر کەس ماڵەکەی خۆی لە غەنیمەتدا ببینێتەوە

**٢١٦٣-** (خ) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْداً لابْنِ عُمَرَ أَبَقَ فَلَحِقَ بِالرُّومِ، فَظَهَرَ عَلَيْهِ خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ، فَرَدَّهُ عَلَى عَبْدِ اللهِ. وَأَنَّ فَرَسَاً لابْنِ عُمَرَ عَارَ فَلَحِقَ بِالرُّومِ، فَظَهَرَ عَلَيْهِ، فَرَدُّوه عَلَى عَبْدِ اللهِ. [خ٣٠٦٨ (٣٠٦٧)]

**(خ) لە نافیعەوە: بەندەیەکی ئیبن عومەر هەڵهات و پەیوەندی کرد بە ڕۆمەوە، خالیدی کوڕی وەلید گرتی و ڕەوانەی کردەوە بۆ عەبدوڵا، ئەسپێکی ئیبن عومەر هەڵهاتبوو و گەیشتبووە لای ڕۆمەکان گێڕایانەوە بۆ عەبدوڵا[٣].**

---

[١] وەك قورئان ئاماژەی پێ دەکات پێنجیەکی غەنیمەت بۆ خودا و پێغەمبەرە، پرسیارکەرەکە دەپرسێت: ئایا خۆراکێك لە دەست دوژمن گیرابێت پێنیەکی لێ دەردەکرا؟—و.

[٢] واتە: خۆراك دابەش نەدەکرا، هەر کەس بەپێی پێویستی خۆی لێی دەبرد—و.

[٣] واتە: دوای ئەوەی ڕۆمەکان شکان و موسڵمانان دەستیان گرت بەسەر غەنیمەتیاندا ئەسپەکەیان بۆ ئیبن عومەر گێڕایەوە—و.

## ٨- دەروازەی: شتەکانی کوژراو بۆ بکوژە

**٢١٦٤-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَئِذٍ. يَعْنِي: يَوْمَ حُنَيْنٍ.: (**مَنْ قَتَلَ كَافِراً فَلَهُ سَلَبُهُ**)، فَقَتَلَ أَبُو طَلْحَةَ يَوْمَئِذٍ عِشْرِينَ رَجُلاً، وَأَخَذَ أَسْلاَبَهُمْ.
* صحيح. [د٢٧١٨/ مي٢٥٢٧]

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو ڕۆژە -واتە ڕۆژی حونەین- فەرمووی: (هەر کەس بێباوەڕێك بکوژێت شتومەکەکانی بۆ ئەوە)، ئەو ڕۆژە ئەبو تەلحە بیست پیاوی کوشت و شت و مەکی ئەوانەی وەرگرت.**

**٢١٦٥-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ قَتَلَ فَلَهُ السَّلَبُ**). [جه٢٨٣٨]
* صحيح.

**لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس بکوژێ[(١)] شتومەکەکەی بۆ هەیە).**

## ٩- دەروازەی: ئەوەی ئیمام بە زیادە دەیدات بە موجاهیدان

**٢١٦٦-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَعَثَ سَرِيَّةً فِيهَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ قِبَلَ نَجْدٍ، فَغَنِمُوا إِبِلاً كَثِيرَةً، فَكَانَتْ سِهَامُهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيراً، أَوْ أَحَدَ عَشَرَ بَعِيراً، وَنُفِّلُوا بَعِيراً بَعِيراً. [خ٣١٣٤/ م١٧٤٩]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) سریەیەکی ڕەوانە کرد بەرەو نەجد، عەبدوڵای کوڕی عومەری تێدا بوو، زۆرێك لە حوشتریان بە غەنیمەت گرتبوو، بەشیان[(٢)] دوازدە حوشتر بوو، یان یازدە حوشتر بوو، هەریەکەیان حوشترێکی زیادەی پێدرا.**

---

(١) واتە: هەر کەس جەنگاوەرێکی بێباوەڕ بکوژێ-و.

(٢) واتە: بەشی سریەکە-و.

## ١٠- دەروازەی: حوكمی "الفيء"

**٢١٦٧-** (ق) عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسٍ، عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِي النَّضِيرِ مِمَّا أَفَاءَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم، مِمَّا لَمْ يُوجِفِ المسْلِمُونَ عَلَيْهِ بِخَيْلٍ وَلاَ رِكَابٍ، فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَاصَّةً، وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةَ سَنَتِهِ، ثُمَّ يَجْعَلُ مَا بَقِيَ فِي السِّلاَحِ وَالْكُرَاعِ، عُدَّةً فِي سَبِيلِ اللهِ. [خ٢٩٠٤/ م١٧٥٧]

**(ق) لە مالیكی كوڕی ئەوسەوە، لە ئیبن عومەرەوە، وتی: ماڵ و سامانی "بني النضير" لەو ماڵ و سامانە بوو خودا كردی بە فەی[1] بەسەر پێغەمبەرەكەیەوە(ﷺ)، لەو ماڵ و سامانە بوو موسڵمانان ئەسپیان بۆ تاو نەدابوو و پیادەڕەوییان بۆ نەكرد بوو، بۆیە تایبەت بوو بە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، خەرجی ساڵێكی بۆ خانەوادەكەی دابین كرد، پاشان ئەوەی مایەوە لە چەك و وڵاخی جەنگ-وەك چەك و تفاقی جەنگ بۆ ڕێگەی خودا- بەكاریهێنا.**

**٢١٦٨-** عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا أَتَاهُ الْفَيْءُ قَسَمَهُ فِي يَوْمِهِ، فَأَعْطَى الْآهِلَ: حَظَّيْنِ، وَأَعْطَى الْعَزَبَ: حَظّاً. زَادَ ابْنُ الْمُصَفَّى: فَدُعِينَا، وَكُنْتُ أُدْعَى قَبْلَ عَمَّارٍ، فَدُعِيتُ فَأَعْطَانِي حَظَّيْنِ وَكَانَ لِي أَهْلٌ، ثُمَّ دُعِيَ بَعْدِي عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ، فَأَعْطَى لَهُ حَظّاً وَاحِداً. [د٢٩٥٣]

* حسن الإسناد.

**لە عەوفی كوڕی مالیكەوە: گەر فەی بهاتبا بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەر ئەو ڕۆژە دابەشی دەكرد، دوو بەشی دەدا بە خانەوادەدار و یەك بەشی دەدا بە بێ خێزان.**

---

[1] **فەی(الفيء): ئەوەیە لە ماڵ و سامانی جەنگاوەرانی بێباوەڕ دەگیرێ بەبێ جەنگان، غەنیمەت ئەوەیە بە جەنگ و لە جەنگدا دەگیرێت-و.**

ئیبن موصەففا ئەمەی زیاد کردووە: هەموو بانگکراین، من بەر لە عەممار بانگکرام، بانگرام و دوو بەشیان پێدام، من خانەوادەم هەبوو، پاشان بەدوامدا عەماری کوڕی یاسر بانگ کرا و یەك بەشی پێدرا[١].

## ١١- دەروازەی: حەرامکردنی لاخستن

**٢١٦٩-** (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ خَيْبَرَ، أَقْبَلَ نَفَرٌ مِنْ صَحَابَةِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالُوا: فُلاَنٌ شَهِيدٌ، فُلاَنٌ شَهِيدٌ، حَتَّى مَرُّوا عَلَى رَجُلٍ فَقَالُوا: فُلاَنٌ شَهِيدٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**كَلاَّ، إِنِّي رَأَيْتُهُ فِي النَّارِ، فِي بُرْدَةٍ غَلَّهَا، أَوْ عَبَاءَةٍ**). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَا ابْنَ الْخَطَّابِ، اذْهَبْ فَنَادِ فِي النَّاسِ: إِنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ الْمُؤْمِنُونَ**). قَالَ: فَخَرَجْتُ فَنَادَيْتُ: أَلاَ إِنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ الْمُؤْمِنُونَ. [م١١٤]

(م) لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: لە ڕۆژی خەیبەر کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتن و وتیان: فلان شەهیدە و فلان شەهیدە، تا بە سەر پیاوێکدا گوزەریان کرد و وتیان: فلان شەهیدە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**نەخێر، من لەناو ئاگردا ئەوم بینی، لەبەر بوردەیەك، یان عەبایەك لایخستبوو**)، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئەی کوڕەکەی خەتاب، بڕۆ و بەناو خەڵکیدا بانگ بدێرە: تەنها باوەڕداران دەچنە بەهەشتەوە**)، وتی: ڕۆیشتمە دەرەوە و بانگم دێرا: دەزانن تەنها باوەڕداران دەچنە بەهەشتەوە.

## ١٢- دەروازەی: فیدیەدانی دیل

**٢١٧٠-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَدَى رَجُلَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ بِرَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ. [ت١٥٦٨]

* صحيح.

---

[١] چونکە ئەو کاتە خانەوادەی نەبووە –و.

لە عیمرانی كوڕی حوصەینەوە: پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێك لـە هاوەڵدانـەرانی كـرد بـە فیدیەی دوو پیاو لە موسڵمانان[1].

## ١٣- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی پێنجیەك(الخُمس) هاتووە

**٢١٧١-** (خـ) قال البخاري: بَاب: وَمِنَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْخُمُسَ لِلْإِمَامِ، وَأَنَّهُ يُعْطِي بَعْضَ قَرَابَتِهِ دُونَ بَعْضٍ: مَا قَسَمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لِبَنِي الْمُطَّلِبِ، وَبَنِي هَاشِمٍ مِنْ خُمُسِ خَيْبَرَ.

قَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ: لَمْ يَعُمَّهُمْ بِذَلِكَ، وَلَمْ يَخُصَّ قَرِيباً دُونَ مَنْ هُوَ أَحْوَجُ إِلَيْهِ، وَإِنْ كَانَ الَّذِي أَعْطَى لِمَا يَشْكُو إِلَيْهِ مِنَ الْحَاجَةِ، وَلِمَا مَسَّتْهُمْ فِي جَنْبِهِ مِنْ قَوْمِهِمْ وَحُلَفَائِهِمْ.

[خ. الخمس، باب ١٧]

**(خـ) بوخاری دەڵێت: دەروازەی: لەو بەڵگانەی پێنجیەك بۆ ئیمامە و بە هەندێ لە نزیكانی دەدات و بە هەندێكی نادات: ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە پێنجیەكی خەیبەر بـۆ "بني المطَّلِب و بني هاشم"ی دابەش كرد.**

**عومەری كوڕی عبدالعزیز وتی: بەو دابەش كردنە هەموویانی نەگرتـەوە، هـەروەها نزیكێكی خۆی تایبەت نەكرد بەسەر ئەو كەسـەی پێـی ئاتـاج بـوو، بـا ئـەو كەسـەش دەبەخشیٚ بـۆ سـكاڵای پێویسـتییەك بێـت خرابێتـە بـەردەمی، هـەروەها بـۆ ئـەوەی تووشیان هاتووە بە هۆی ئەوەوە لە هۆز و هاوپەیمانیان.**

**٢١٧٢-** عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى بَعِيرٍ مِنَ الْمَغْنَمِ، فَلَمَّا سَلَّمَ أَخَذَ وَبَرَةً مِنْ جَنْبِ الْبَعِيرِ، ثُمَّ قَالَ: (**وَلاَ يَحِلُّ لِي مِنْ غَنَائِمِكُمْ مِثْلُ هَذَا، إِلاَّ الْخُمُسُ**، وَالْخُمُسُ مَرْدُودٌ فِيكُمْ). [د٢٧٥٥]

* صحيح.

**لە عەمری كوڕی عەبەسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لای حوشتری غەنیمـەت نوێژی پێكردین، كاتێك سەلامی دایەوە كوڵكێكی لە لای حوشترێك كـردەوە و پاشـان**

[1] واتە: بە دیلێكی هاوەڵدانەر دوو دیلی موسڵمانی وەرگرتەوە-و.

فەرمووی: **(لە غەنیمەتی ئێوە نموونەی ئەمە بۆ من حەڵاڵ نییە، جگە لە پێنجیەك، پێنجیەكیش بۆ خۆتان دەگەڕێتەوە).**

**٢١٧٣**– عَن أبي الزُّبَيْرِ قَالَ: سُئِلَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَصْنَعُ بِالْخُمُسِ؟ قَالَ: كَانَ يَحْمِلُ الرَّجُلَ مِنْهُ فِي سَبِيلِ اللهِ، ثُمَّ الرَّجُلَ، ثُمَّ الرَّجُلَ.

* إسناده حسن.　　　　[حم١٤٩٣٢]

**لە ئەبی زوبەیرەوە، وتی: پرسیار لە جابری كوڕی عەبدوڵا كرا: پێغەمبەری خودا(ﷺ) چی دەكرد لە پێنجیەك؟ وتی: پیاوی لە ڕێگەی خودا ئامادە دەكرد[1]، پاشان پیاو و پاشان پیاو.**

**٢١٧٤**– عَنْ عَطَاءٍ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ﴾ [الأنفال: ٤١] قَالَ: خُمُسُ الله وَرسُولِهِ وَاحِدٌ كَانَ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم يَصْنَعُ فِيهِ مَا شَاءَ.　　　　[هق٦/٣٣٨]

**لە عەتاوە دەربارەی فەرموودەی خوداوە(سبحانه وتعالى): ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ﴾ [الأنفال: ٤١]، وتی: پێنجیەكی خودا و پێغەمبەرەكەی یەكێكە، پێغەمبەر(ﷺ) چۆنی بیویستبایە بەو جۆرەی دەكرد تیایدا.**

---

[1] **واتە: بەردەوام پیاوانی بۆ جیهاد پێ ئامادە دەكرد، بە كڕینی شمشێر و ئەسپ و هتد..—و.**

**بەشی سێیەم**

# جزییە و ئاشتەوایی و وازهێنان لە جەنگ

## ١- دەروازەی: وەفا بە پەیمان

**٢١٧٥-** (م) عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ قَالَ: مَا مَنَعَنِي أَنْ أَشْهَدَ بَدْراً إِلاَّ أَنِّي خَرَجْتُ أَنَا وَأَبِي، حُسَيْلٌ، قَالَ: فَأَخَذَنَا كُفَّارُ قُرَيْشٍ، قَالُوا: إِنَّكُمْ تُرِيدُونَ مُحَمَّداً؟ فَقُلْنَا: مَا نُرِيدُهُ، مَا نُرِيدُ إِلاَّ الْمَدِينَةَ. فَأَخَذُوا مِنَّا عَهْدَ اللهِ وَمِيثَاقَهُ لَنَنْصَرِفَنَّ إِلَى الْمَدِينَةِ وَلاَ نُقَاتِلُ مَعَهُ. فَأَتَيْنَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَخْبَرْنَاهُ الْخَبَرَ، فَقَالَ: (**انْصَرِفَا، نَفِي لَهُمْ بِعَهْدِهِمْ، وَنَسْتَعِينُ اللهَ عَلَيْهِمْ**). [م١٧٨٧]

**(م) لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە، وتی: ئەوەی ڕێگری لێ کردم لە بەدر ئامادە بم: من و باوکم، حوسەیل[1]، ڕۆیشتینە دەرەوە، وتی: بێباوەڕانی قورەیش ئێمەیان گرت، وتیان: ئێوە محەمەدتان دەوێت[2]؟ وتمان: نامانەوێ، تەنها مەدینەمان دەوێ[3]، ئەوان پەیمان و بەڵێنی خودایان لێ وەرگرتین بگەڕێینەوە بۆ مەدینە و لەگەڵ پێغەمبەر دژ بە ئەوان نەجەنگین، هاتین بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هەواڵەکەمان پێ ڕاگەیاند، فەرمووی: (بڕۆن، ئێمە پەیمانەکەیان لەگەڵ دەپارێزین و داوای یارمەتی دەکەین لە خودا بۆ سەر ئەوان)[4].**

---

[1] حوسەیل: ناوەکەی باوکی حوزەیفەیە-و.

[2] واتە: دەتانەوێ بچن بۆ لای محەمەد؟-و.

[3] واتە: نامانەوێ بچین بۆ لای محەمەد، تەنها دەمانەوێ بگەڕێینەوە بۆ مەدینە-و.

[4] واتە: پێغەمبەر فەرمووی: پەیمانەکەیان لەگەڵ بپارێزن و لەگەڵ ئێمە دژ بە ئەوان مەجەنگن-و.

## ٢- دەروازەی: خوارترینی موسڵمانان پەیمانی ڕێزلێگیراوە

**٢١٧٦**- عَنْ عبدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العاصِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**الْمُسْلِمُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ، يَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ، وَيُجِيرُ عَلَيْهِمْ أَقْصَاهُمْ، وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ، يَرُدُّ مُشِدُّهُمْ عَلَى مُضْعِفِهِمْ، وَمُتَسَرِّيهِمْ عَلَى قَاعِدِهِمْ، لاَ يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ، وَلاَ ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ**). [د٢٧٥١/ جه٢٦٨٥]

* حسن صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (خوێنی موسڵمانان هاوتایە، و پەیمانی خوارترینی موسڵمانان ڕێزلێگیراوە و پەنادانی دوورترینیان دەخوات، بەهێزکەرانیان بەسەر لاوازکەرانیاندا دەگەڕێتەوە، هەروەها سرییەدارەکانیان بەسەر دانیشتووەکانیاندا، باوەڕدار و خاوەن پەیمان لە پەیمانەکەیدا بە بێباوەڕ ناکوژرێت).**

## ٣- دەروازەی: ئەماندان بە ئافرەتان و جارییەکانیان

**٢١٧٧**- (ق) عَنْ أَبِي مُرَّةَ ـ مَوْلَى أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ ـ: أَنَّهُ سَمِعَ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ تَقُولُ: ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَامَ الْفَتْحِ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ، وَفَاطِمَةُ ابْنَتُهُ تَسْتُرُهُ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: (**مَنْ هذِهِ**)؟ فَقُلْتُ: أَنَا أُمُّ هَانِئٍ بِنْتُ أَبِي طَالِبٍ، فَقَالَ: (**مَرْحَباً بِأُمِّ هَانِئٍ**). فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ غُسْلِهِ، قَامَ فَصَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، مُلْتَحِفاً فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، زَعَمَ ابْنُ أُمِّي، عَلِيٌّ، أَنَّهُ قَاتِلٌ رَجُلاً قَدْ أَجَرْتُهُ، فُلاَنُ ابْنُ هُبَيْرَةَ! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ يَا أُمَّ هَانِئٍ**). قَالَتْ أُمُّ هَانِئٍ: وَذلِكَ ضحى.

[خ٣١٧١ (٢٨٠)/ م: صلاة المسافرين ٣٣٦ (٨٢)]

**(ق) لە ئەبی مورەوە—مەولای ئوم هانی کچی ئەبی تالب—: ئەو گوێی لە ئوم هانی کچی ئەبی تالب بوو دەیوت: ساڵی فەتح ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بینیم**

خۆی دەشۆرێت و فاتیمەی کچی پەردەی بۆ کرد بوو، سەلامم لێکرد، فەرمووی: **(ئەوە کێیە؟)**، وتم: منم، ئوم هانی کچی تالب، فەرمووی: **(مەرحەبا لە ئوم هانی)**، کاتێ لە خۆ شۆرینەکەی تەواو بوو، هەستا و هەشت رکات نوێژی کرد، خۆی بە یەك پۆشاك پێچابوویەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، کوڕەکەی دایکم، عەلی پێیوایە ئەو پیاوێك دەکوژێ من پەنام داوە، فولانی کوڕی هوبەیرە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئێمە پەنای کەسێك دەدەین تۆ پەنات داوە، ئەی ئوم هانی)**، ئوم هانی وتی: ئەوەش کاتی چێشتەنگاو بوو.

**٢١٧٨**– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِنْ كَانَتِ الْمَرْأَةُ لَتُجِيرُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ فَيَجُوزُ. [د٢٧٦٤]

* صحيح.

لە عائیشەوە، وتی: ئافرەت پەنای کەسێکی دەدا لە باوەڕداران، و شیاو و گونجاو بوو[١].

## ٤- دەروازەی: گوناهی ئەو کەسەی کەسێکی هاوپەیمان دەکوژێت

**٢١٧٩**– (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ قَتَلَ مُعَاهَداً لَمْ يَرِحْ رَائِحَةَ الجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا تُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَاماً)**. [خ٣١٦٦]

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): پێغەمبەری(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس هاوپەیمانێ بکوژێت بۆنی بەهەشت ناکات، بۆنی بەهەشت لە دووری چل ساڵ ڕێوە بۆن دەکرێت)**.

## ٥- دەروازەی: حەرامکردنی غەدر

**٢١٨٠**– (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ الْغَادِرَ يُنْصَبُ لَهُ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُقَالُ: هذِهِ غَدْرَةُ فُلاَنِ بْنِ فُلاَنٍ)**. [خ٦١٧٨ (٣١٨٨)/ م١٧٣٥]

---

[١] واتە: کارەکەی شیاو و گونجاو بوو-و.

(ق) لە ئیبن عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کەسی غەدرکەر لە ڕۆژی قیامەت بەیداخێکی بۆ هەڵدەکرێت، دەتوترێت: ئەمە غەدر کردنەکەی فلانی کوڕی فلانە)**.

**٢١٨١**– (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يُرْفَعُ لَهُ بِقَدْرِ غَدْرِهِ، أَلاَ وَلاَ غَادِرَ أَعْظَمُ غَدْراً مِنْ أَمِيرِ عَامَّةٍ). [م١٧٣٨]

(م) لە ئەبی سەعیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ڕۆژی قیامەت هەر غەدرکەرێك بەیداخێکی هەیە، بە بڕی غەدرەکەی بۆی بەرز دەکرێتەوە، دەزانن هیچ غەدرکەرێك غەدرەکەی گەورەتر نییە لە ئەمیری گشتی[1])**.

**٢١٨٢**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الْإِيمَانُ قَيَّدَ الْفَتْكَ، لاَ يَفْتِكُ مُؤْمِنٌ). [د٢٧٦٩]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئیمان کوشتن بە غەدر کۆت و بەند دەکات، باوەڕدار بە غەدر ناکوژێت)**.

## ٦- دەروازەی: دەربارەی جزییە

**٢١٨٣**– عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْجِزْيَةَ مِنْ مَجُوسِ الْبَحْرَيْنِ، وَأَخَذَهَا عُمَرُ مِنْ فَارِسَ، وَأَخَذَهَا عُثْمَانُ مِنَ الْفُرْسِ. [ت١٥٨٨]

* صحيح.

لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) جزییەی لە مەجووسی بەحرەین وەرگرت، عومەریش لە فارسی وەرگرت[2]، عوسمانیش لە فورسی[3] وەرگرت.

---

[1] دەسەڵاتداری گشتی، چونکە غەدرەکەی زۆرترین خەڵك دەگرێتەوە–و.

[2] فارس: واتە وڵاتی فارس–و.

[3] فورس(فُرس) کۆی وشەی (فارس)ە، واتە کەسی فارس–و.

**٢١٨٤**- عَنْ أَسْلَمَ . مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ .: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ضَرَبَ الْجِزْيَةَ عَلَى أَهْلِ الذَّهَبِ أَرْبَعَةَ دَنَانِيرَ، وَعَلَى أَهْلِ الْوَرِقِ أَرْبَعِينَ دِرْهَماً، مَعَ ذَلِكَ أَرْزَاقُ الْمُسْلِمِينَ وَضِيَافَةُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ. [ط٦١٨]

* إسناده صحيح.

**لە ئەسلەمەوە-مەولای عومەری کوڕی خەتاب-: عومەری کوڕی خەتاب چوار دینار جزییەی دانا لەسەر ئەهلی زێڕ و زیو، چل درهەمیش لەسەر ئەهلی درهەمی زیوی، لەگەڵ ئەوەش بژێوی موسڵمانان و میوانداری سێ ڕۆژ.**

**٢١٨٥**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بن العاصِ: أَنَّ رَسُولَ الله صلّى الله عليه وسلّم فَرَضَ الْجِزْيَةَ، عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ دِينَاراً دِينَاراً. [هق٩/١٩٤]

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) جزییەی فەرز کرد لەسەر هەر کەسێکی باڵغ لە ئەهلی یەمەن دینار دینار[1].**

---

[1] **بۆ هەر یەکەیان دینارێک-و.**

## بەشی چوارەم

## ئەسپ و تیرئەندازی و پێشبڕكێ

### ١- دەروازەی: لە ناوچاوانی ئەسپ خێر دانراوە

**٢١٨٦-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (الْخَيْلُ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ). [خ٢٨٤٩/ م١٨٧١]

(ق) لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(تا رۆژی قیامەت لە ناوچاوانی ئەسپ خێر هەیە).**

**٢١٨٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنِ احْتَبَسَ فَرَساً فِي سَبِيلِ اللهِ، إِيمَاناً بِاللهِ، وَتَصْدِيقاً بِوَعْدِهِ، فَإِنَّ شِبَعَهُ وَرِيَّهُ وَرَوْثَهُ وَبَوْلَهُ فِي مِيزَانِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). [خ٢٨٥٣]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس ئەسپێك لە رێگەی خودا بەند بكات، وەك ئیمان بە خودا، و بەڕاستزانینی بەڵێنی، لە رۆژی قیامەت تێركردن و پاراوكردن و پیسی و میزی[١] لە ترازووەكەیدایە).**

**٢١٨٨-** (م) عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَلْوِي نَاصِيَةَ فَرَسٍ بِإِصْبَعِهِ، وَهُوَ يَقُولُ: (الْخَيْلُ مَعْقُودٌ بِنَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الأَجْرُ وَالْغَنِيمَةُ). [م١٨٧٢]

(م) لە جەریری كوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی پەنجەی دەهێنا بە ناوچاوانی ئەسپەكەی خۆیدا، ئەو دەیفەرموو: **(تا رۆژی قیامەت خێر لە ناوچاوانی ئەسپ دانراوە: پاداشت و غەنیمەت).**

---

[١] واتە: هەموو شتێكی ئەسپەكە بۆ ئەو خێر و چاكەیە-و.

## ٢- دەروازەی: ئەسپ سیانە

**٢١٨٩-** عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْخَيْلُ ثَلاَثَةٌ: فَرَسٌ يَرْبُطُهُ الرَّجُلُ فِي سَبِيلِ اللهِ تَعَالَى، فَثَمَنُهُ أَجْرٌ، وَرُكُوبُهُ أَجْرٌ، وَعَارِيَتُهُ أَجْرٌ، وَعَلَفُهُ أَجْرٌ. وَفَرَسٌ يُغَالِقُ عَلَيْهَا الرَّجُلُ وَيُرَاهِنُ، فَثَمَنُهُ وِزْرٌ، وَعَلَفُهُ وِزْرٌ، وَرُكُوبُهُ وِزْرٌ. وَفَرَسٌ لِلْبِطْنَةِ فَعَسَى أَنْ يَكُونَ سَدَّاداً مِنَ الْفَقْرِ إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى**). [حم٢٣٢٣٠]

* إسناده صحيح.

**لە ئەبی عەمری شەیبانییەوە، لە پیاوێك لە ئەنصارەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (ئەسپ سیانە: ئەسپێك[1] پیاوێ لە ڕێگەی خودا(تعالی) دەیبەستێتەوە، نرخەکەی پاداشتە، سواربوونی پاداشتە، خواستنی پاداشتە[2]، ئالفدانی پاداشتە، ئەسپێك[3] پیاوێك سامانی لەسەر دادەنێ و قوماری لەسەر دەکات، نرخەکەی گوناهە، ئالفدانی گوناهە، و سواربوونی گوناهە، ئەسپێکیش(ماینێکیش)[4] بۆ سك و سزا و زۆربوون، بەڵکو-إن شاء الله تعالی- بەر لە هەژاری بگرێت).**

## ٣- دەروازەی: پێشبڕکێ لە نێوان ئەسپ و حوشتر

**٢١٩٠-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم سَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي أُضْمِرَتْ: مِنَ الْحَفْيَاءِ، وَأَمَدُهَا ثَنِيَّةُ الْوَدَاعِ، وَسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضْمَرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ، وَأَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ فِيمَنْ سَابَقَ بِهَا. [خ٤٢٠/ م١٨٧٠]

---

[1] جۆری یەکەم-و.

[2] واتە: کەسێك بۆ کارێکی خێر ئەسپەکەی لێ بخوازێت-و.

[3] جۆری دووەم-و.

[4] جۆری سێیەم-و.

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێشبڕکێی خستە نێوان کۆمەڵێك ئەسپ لەڕ کرابوون[1]: لە "الحَفْياء"ەوە تا کۆتایی "ثنية الوداع"[2]، هەروەها پێشبڕکێی خستە نێوان ئەو ئەسپانەی لەڕ نەکرابوو لە "الثنيّة"وە بۆ مزگەوتی "بني زُرَيق"، عەبدولای کوڕی عومەر لەو سوارانە بوو پێشبڕکێیان پێ دەکردن.

**٢١٩١**– (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَتْ نَاقَةٌ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تُسَمَّى: الْعَضْبَاءَ، وَكَانَتْ لاَ تُسْبَقُ، فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ عَلَى قَعُودٍ لَهُ، فَسَبَقَهَا، فَاشْتَدَّ ذلِكَ عَلَى المسْلِمِينَ، وَقَالُوا: سُبِقَتِ الْعَضْبَاءُ! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ حَقّاً عَلَى اللهِ أَنْ لاَ يَرْفَعَ شَيْئاً مِنَ الدُّنْيَا، إِلاَّ وَضَعَهُ**). [خ٦٥٠١ (٢٨٧١)]

(خ) لە ئەنەسەوە، وتی: حوشترێکی مێیەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەبوو پێیدەوترا: "العَضْباء"، هیچ حوشترێك پێشی نەدەکەوت، ئەعرابییەك لەسەر حوشترێکی خۆی هات و پێشیکەوت، ئەوە لەسەر موسڵمانان گران بوو و وتیان: پێش "العضباء" کەوت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**حەقە لەسەر خودا هەر شت لە دنیا بەرز دەکاتەوە نزمی بکاتەوە**[3]).

**٢١٩٢**– عَن أبي هُرَيْرَةَ قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ سَبَقَ إِلاَّ فِي خُفٍّ، أَوْ حَافِرٍ، أَوْ نَصْلٍ**). [د٢٥٧٤/ ت١٧٠٠/ ن٣٥٨٧/ جه٢٨٧٨]

* صحيح.

---

(١) لەڕ کرابوون: واتە: ئامادە کرابوون بۆ غەزا و جیهاد، چونکە ئەسپی قەڵەو و توانای غار و هێرش بردنی نییە–و.

(٢) "الحفياء و ثنية الوداع" دوو شوێنی نزیك شاری مەدینەن–و.

(٣) واتە: یاسای خودا لە دنیا بەو جۆرەیە هەر شتێك بەرز بکاتەوە بۆ ماوەیەکە پاشان نزمی نزمی دەکاتەوە، حوشترەکەی پێغەمبەر ماوەیەك لە لوتکەدا بوو و هیچ حوشترێك پێشی نەدەکەوت، پاشان حوشترێکی تر هات و پێشیکەوت–و.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ماڵ و سامان وەرناگیرێ[1] مەگەر لە حوشتر، یان ئەسپ، یان تیرئەندازی).**

## ٤- دەروازەی: پلە و پایەی تیرئەندازی

**٢١٩٣-** (خ) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ ﷺ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى نَفَرٍ مِنْ أَسْلَمَ يَنْتَضِلُونَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(ارْمُوا بَنِي إِسْمَاعِيلَ، فَإِنَّ أَبَاكُمْ كَانَ رَامِياً، ارْمُوا وَأَنَا مَعَ بَنِي فُلاَنٍ).** قَالَ: فَأَمْسَكَ أَحَدُ الْفَرِيقَيْنِ بِأَيْدِيهِمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَا لَكُمْ لاَ تَرْمُونَ)** ؟ قَالُوا: كَيْفَ نَرْمِي وَأَنْتَ مَعَهُمْ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ: **(ارْمُوا، فَأَنَا مَعَكُمْ كُلِّكُمْ).** [خ٢٨٩٩]

(خ) لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە پاڵ چەند کەسێك لە ئەسلەم تێپەڕی رمبازییان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ڕۆڵەکانی ئیسماعیل رم هەڵبدەن، چونکە باوکتان رمی هەڵدەدا، رم هەڵبدەن و من لەگەڵ بەنی فلانم)**، وتی: یەکێك لە دوو دەستەکە دەستیان گرتەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بۆچی رم هەڵنادەن؟)**، وتیان: چۆن رم هەڵبدەین و تۆ لەگەڵ ئەوان بیت؟ پێغەمبەر فەرمووی: **(رم هەڵبدەن من لەگەڵ هەمووتانم).**

**٢١٩٤-** (م) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، يَقُولُ: **(وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ. أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ).** [م١٩١٧]

(م) لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو، ئەو لەسەر مینبەر دەیفەرموو: **(تا دەتوانن هێزیان بۆ ئامادە بکەن، دەزانن هێز رمبازی و تیر هەڵدانە، دەزانن هێز رمبازی و تیر هەڵدانە، دەزانن هێز رمبازی و تیر هەڵدانە).**

---

[1] واتە: لە پێشبڕکێدا ماڵ و سامان وەرناگیرێ مەگەر پێشبڕکێکە بە یەکێك لەو سیانە ئەنجام بدرێت-و.

**٢١٩٥**– (م) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (سَتُفْتَحُ عَلَيْكُمْ أَرَضُونَ، وَيَكْفِيكُمُ اللهُ، فَلاَ يَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَلْهُوَ بِأَسْهُمِهِ). [م١٩١٨]

(م) لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(زەوییەکانتان بۆ فەتح دەکرێت و خودا بێنیازتان دەکات، با یەکێك لە ئێوە دەستەوسان نەبێت لەوەی یاری بە تیرەکانی بکات)**.

**٢١٩٦**– عَنْ أَبِي نَجِيحٍ السَّلَمِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَنْ بَلَغَ بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَهُوَ لَهُ دَرَجَةٌ فِي الْجَنَّةِ)، فَبَلَّغْتُ يَوْمَئِذٍ سِتَّةَ عَشَرَ سَهْماً.

قَالَ: وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَهُوَ عِدْلُ مُحَرَّرٍ).

* صحيح. [د٣٩٦٥/ ت١٦٣٨/ ن٣١٤٣]

لە ئەبی نەجیحی سەلەمییەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس لە ڕێگەی خودا تیرێك لە دوژمن بتەقێنێ ئەوە لە بەهەشت بۆ ئەو پلەیەکە)**، لەو ڕۆژەدا من بە تەقاندی شازدە تیر گەیشتم.

وتی: هەروەها گوێم لێ بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس تیرێك لە ڕێگەی خودا بتەقێنێت ئەوە لە ئاگر فیدیە و ڕزگارکەرە بۆی)**.

## ٥- دەروازەی: ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی وڵاخی سواری و وڵاخی بار لە ڕۆیشتن

**٢١٩٧**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا سَافَرْتُمْ فِي الْخِصْبِ؛ فَأَعْطُوا الإِبِلَ حَظَّهَا مِنَ الأَرْضِ. وَإِذَا سَافَرْتُمْ فِي السَّنَةِ؛ فَأَسْرِعُوا عَلَيْهَا السَّيْرَ. وَإِذَا عَرَّسْتُمْ بِاللَّيْلِ؛ فَاجْتَنِبُوا الطَّرِيقَ، فَإِنَّهَا مَأْوَى الْهَوَامِّ بِاللَّيْلِ). [م١٩٢٦]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر لە کاتی بوونی لەوەڕ سەفەرتان کرد بەشی ئەسپەکانتان بدەن لە زەوی**[1]**، گەر لە سیاساڵی**

---

[1] واتە: بیانلەوەڕێنن-و.

**و بێ لەوەڕیدا سەفەرتان كرد لەسەریان بە خێرایی بڕۆن، گەر لە كۆتایی شەو لە جێگەیەك دابەزین لە ڕێگە دوور بكەونەوە، چونكە ئەوە لە شەودا ماوای جانەوەرە).**

**٢١٩٨**– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنَّا إِذَا نَزَلْنَا مَنْزِلاً لاَ نُسَبِّحُ حَتَّى تُحَلَّ الرِّحَالُ. [د٢٥٥١]

* صحيح.

**لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە، وتی: گەر لە شوێنێك دابەزیبایین نوێژی چێشتەنگاومان نەدەكرد تا كۆڵ و بارەكانمان لە وڵاخەكان دادەگیران.**

## ٦- دەروازەی: دەربارەی ڕۆیشتنی سەرەتای شەو

**٢١٩٩**– عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**عَلَيْكُمْ بِالدُّلْجَةِ، فَإِنَّ الْأَرْضَ تُطْوَى بِاللَّيْلِ**). [د٢٥٧١]

* صحيح. [وانظر: **٦٢**].

**لە لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لەسەرتانە دەستبگرن بە ڕۆیشتنی سەرەتای شەوەوە، چونكە لە شەودا زەوی تەی(لوول) دەبێت).**

## ٧- دەروازەی: پیاو لەپێشترە بە پێشەوەی وڵاخی سوارییەكەی

**٢٢٠٠**– عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَمْشِي، جَاءَ رَجُلٌ وَمَعَهُ حِمَارٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، ارْكَبْ، وَتَأَخَّرَ الرَّجُلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ، أَنْتَ أَحَقُّ بِصَدْرِ دَابَّتِكَ مِنِّي؛ إِلاَّ أَنْ تَجْعَلَهُ لِي**). قَالَ: فَإِنِّي قَدْ جَعَلْتُهُ لَكَ، فَرَكِبَ.

* حسن صحيح. [د٢٥٧٢/ ت٢٧٧٣]

**لە بورەیدەوە، وتی: كاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پێیان دەڕۆیشت، پیاوێك هات و گوێدرێژێكی پێ بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، سواربە، پیاوەكە هاتە دواوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نەخێر، تۆ لەپێشتری بە پێشەوەی وڵاخی سوارییەكەت لە من، مەگەر وڵاخی سوارییەكەم پێ بدەی)، پیاوەكە وتی: من وڵاخی سوارییەكەم دا بە تۆ، بۆیە سواربە.**

## بەشی یەکەم

# پلە و پایەی زیکر

## ١- دەروازەی: پلە و پایەی زیکر

**٢٢٠١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ للهِ مَلاَئِكَةً يَطُوفُونَ فِي الطُّرُقِ، يَلْتَمِسُونَ أَهْلَ الذِّكْرِ، فَإِذَا وَجَدُوا قَوْماً يَذْكُرُونَ اللهَ تَنَادَوْا: هَلُمُّوا إِلَى حَاجَتِكُمْ. قَالَ: فَيَحُفُّونَهُمْ بِأَجْنِحَتِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، قَالَ: فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ، وَهُوَ أَعْلَمُ مِنْهُمْ، مَا يَقُولُ عِبَادِي؟ قالَ: تَقُولُ: يُسَبِّحُونَكَ وَيُكَبِّرُونَكَ وَيَحْمَدُونَكَ وَيُمَجِّدُونَكَ، قالَ: فَيَقُولُ: هَلْ رَأَوْنِي؟ قَالَ: فَيَقُولُونَ لاَ، وَاللهِ مَا رَأَوْكَ! قالَ: فَيَقُولُ: وَكَيْفَ لَوْ رَأَوْنِي؟ قالَ: يَقُولُونَ: لَوْ رَأَوْكَ كَانُوا أَشَدَّ لَكَ عِبَادَةً، وَأَشَدَّ لَكَ تَمْجِيداً، وَأَكْثَرَ لَكَ تَسْبِيحاً.قالَ: يَقُولُ: فَمَا يَسْأَلُونَنِي؟ قَالَ: يَسْأَلُونَكَ الجَنَّةَ، قالَ: يَقُولُ: وَهَلْ رَأَوْهَا؟ قالَ: يَقُولُونَ: لاَ، وَاللهِ يَا رَبِّ! مَا رَأَوْهَا، قالَ: يَقُولُ: فَكَيْفَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا؟ قالَ: يَقُولُونَ: لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ عَلَيْهَا حِرْصاً، وَأَشَدَّ لَهَا طَلَباً، وَأَعْظَمَ فِيهَا رَغْبَةً. قَالَ: فَمِمَّ يَتَعَوَّذُونَ؟ قالَ: يَقُولُونَ: مِنَ النَّارِ، قالَ: يَقُولُ: وَهَلْ رَأَوْهَا؟ قالَ: يَقُولُونَ: لاَ، وَاللهِ يَا رَبِّ! مَا رَأَوْهَا، قالَ: يَقُولُ: فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْهَا؟ قالَ: يَقُولُونَ: لَوْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ مِنْهَا فِرَاراً، وَأَشَدَّ لَهَا مَخَافَةً، قالَ: فَيَقُولُ: فَأُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ. قَالَ: يَقُولُ مَلَكٌ مِنَ المَلاَئِكَةِ: فِيهِمْ فُلاَنٌ لَيْسَ مِنْهُمْ، إِنَّمَا جَاءَ لِحَاجَةٍ. قَالَ: هُمُ الجُلَسَاءُ لاَ يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ).**

[خ٦٤٠٨/ م٢٦٨٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بۆ خودا کۆمەڵێك فریشتە هەن بە ڕێگە و بانەکاندا دەسوڕێنەوە، بەدوای ئەهلی زیکردا دەگەڕێن، گەر دەستەیەکیان بینی یادی خودا بکەن بانگی یەکتر دەکەن: وەرن بۆ لای پێویستییەکەتان، فەرمووی: بە باڵەکانیان تا ئاسمانی دنیا دەورەیان دەدەن، فەرمووی: پەروەردگاریان لێیان دەپرسێت-ئەو زاناترە بەوان- بەندەکانم چییان دەوت فەرمووی: دەڵێن: تەسبیح و تەکبیر و حەمد و تەمجیدی تۆیان دەکرد، فەرمووی: خودا دەفەرموێت: ئایا ئەوان منیان بینیوە؟ فەرمووی: دەڵێن: نەخێر،**

سوێند بە خودا تۆیان نەبینیوە، فەرمووی: خودا دەفەرموێت: ئەی دەبێ چۆن بن گەر من ببینن؟ فەرمووی: دەڵێن: گەر تۆ ببینن زۆرتر عیبادەتی تۆ دەکەن و زیاترتر تەمجیدی تۆ دەکەن و زۆرتر تەسبیحت دەکەن).

فەرمووی: خودا دەفەرموێت: ئەی داوای چییان لە من دەکرد؟ فەرمووی: داوای بەهەشتت لێ دەکەن، فەرمووی خودا دەفەرموێت: ئایا بەهەشتیان بینیوە؟ فەرمووی دەڵێن: نەخێر، سوێند بە خودا نەیانبینیوە، فەرمووی: خودا دەفەرموێت: ئەی دەبێ چۆن بن گەر بیانبینیبایە؟ فەرمووی دەڵێن: گەر ئەوان بیانبینیبا زۆرتر لەسەری پێداگر دەبوون و زیاتر هەوڵیان بۆ دەدا و حەزیان تیایدا فرەتر بوو.

فەرمووی: ئەی لە چ شتێك پەنایان دەگرت؟ فەرمووی: دەڵێن: لە ئاگر، فەرمووی خودا دەفەرموێت: ئایا ئاگریان بینیوە؟ فەرمووی دەڵێن: نەخێر، سوێند بە خودا، ئەی پەروەردگار، نەیانبینیوە، فەرمووی: خودا دەفەرموێت: ئەی دەبێ چۆن بن گەر بیانبینیبایە؟ فەرمووی دەڵێن: گەر ئەوان بیانبینیبا زۆرتر لێی هەڵدەهاتن، و زیاتر لێی دەترسان، فەرمووی: خودا دەفەرموێت: من ئێوە دەکەم بە شایەت لەوانە خۆشبووم، فەرمووی: یەکێك لە فریشتەکان دەڵێت: فلان کەس لەناو ئەواندا بوو، بەڵام لەوان نییە، ئەو بۆ پێویستییەك هاتبوو، فەرمووی: ئەوان ئەهلی مەجلیسێکن دانیشتوو لەگەڵیان بەدبەخت نابێت.

٢٢٠٢- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلأٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلأٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ شِبْراً تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعاً، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعاً تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعاً، وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً). [خ٧٤٠٥/ م٢٦٧٥]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: من لەگەڵ گومانی بەندەکەم بە من، من لەگەڵ ئەوم کاتێ یادم دەکات، گەر لە نەفسی خۆیدا یادم بکات لە نەفسی خۆمدا یادی دەکەم، گەر لەناو کۆمەڵێك یادم بکات لەناو کۆمەڵێك باشتر و چاکتر یادی دەکەم،

هەر کەس بستێك لێم نزیك ببێتەوە باڵێك لێی نزیك دەبمەوە، هەرکەس باڵێك لێم نزیك ببێتەوە دوو باڵ لێی نزیك دەبمەوە، هەر کەس بە ڕۆیشتن بێت بۆ لام من بە ڕاکردم دەچم بۆ لای).

٢٢٠٣- (ق) وَعَنْهُ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّ للهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْماً، مِائَةً إِلاَّ وَاحِداً، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الجَنَّةَ). [خ٢٧٣٦/ م٢٦٧٧]

(ق) هەر لە ئەبو هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بۆ خودا نەوەد و نۆ ناو هەن-سەد کەم دانەیەك- هەر کەس ئاماریان بکات دەچێتە بەهەشتەوە).

٢٢٠٤- (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: خَرَجَ مُعَاوِيَةُ عَلَى حَلْقَةٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: مَا أَجْلَسَكُمْ؟ قَالُوا: جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللهَ. قَالَ: آللهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلاَّ ذَاكَ؟ قَالُوا: وَاللهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلاَّ ذَاكَ. قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، وَمَا كَانَ أَحَدٌ بِمَنْزِلَتِي مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَقَلَّ عَنْهُ حَدِيثاً مِنِّي، وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ عَلَى حَلْقَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: (مَا أَجْلَسَكُمْ)؟ قَالُوا: جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللهَ وَنَحْمَدُهُ عَلَى مَا هَدَانَا لِلإِسْلاَمِ، وَمَنَّ بِهِ عَلَيْنَا. قَالَ: (آللهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلاَّ ذَاكَ)؟ قَالُوا: وَاللهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلاَّ ذَاكَ. قَالَ: (أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، وَلَكِنَّهُ أَتَانِي جِبْرِيلُ فَأَخْبَرَنِي: أَنَّ اللهَ عزّ وجل يُبَاهِي بِكُمُ الْمَلاَئِكَةَ). [م٢٧٠١]

(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: موعاویە هاتە دەرەوە بۆ لای ئەڵقەیەك لە مزگەوت، وتی: چی ئێوەی دانیشاندووە؟ وتیان: دانیشتووین یادی خودا دەکەین، وتی: سوێندتان دەدەم بە خودا تەنها ئەوە ئێوەی دانیشاندووە؟ وتیان: سوێند بە خودا، تەنها ئەوە ئێمەی دانیشاندووە، وتی: من لەبەر تۆمەتبار کردنی ئێوە سوێندم نەدان، هیچ کەس بە ئەندازەی من مەنزیلەتی لە پێغەمبەری خودا کەمتر نییە لە گێڕانەوەی فەرموودە لە ئەوەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لای ئەڵقەیەك لە هاوەڵانی و فەرمووی: (چی ئێوەی دانیشاندووە؟) وتیان: دانیشتووین یادی خودا دەکەین و حەمدی دەکەین بەوەی هیدایەتیداین بۆ ئیسلام و بەوە مننەتی کرد لەسەرماندا، فەرمووی: (سوێندتان دەدەم بە خودا تەنها ئەوە ئێوەی

**دانیشاندووە؟) وتیان: سوێند بە خودا، تەنها ئەوە ئێمەی دانیشاندووە، فەرمووی: (من لەبەر تۆمەتبار کردنی ئێوە سوێندم نەدان، بەڵام جیبریل هات و هەواڵی پێدام: خودا(عز وجل) شانازیتان پێوە دەکات لای فریشتەکان).**

**٢٢٠٥-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّهُمَا شَهِدَا عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: **(لاَ يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ الله عزّ وجل ؛ إِلاَّ حَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ).** [م٢٧٠٠]

(م) لە ئەبی هورەیرە و ئەبی سەعیدی خودرییەوە: ئەوان شایەتیان دا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: **(هەر دەستەیەك دانیشتن و یادی خودایان(عز وجل) کرد فریشتەکان دەورەیان دەدەن و رەحمەت دایاندەپۆشێت و سەکینەت بەسەریاندا دادەبارێ و خودا لای ئەوانەی لای ئەون باسیان دەکات).**

## ٢- دەروازەی: پلە و پایەی بەردەوامی زیکر

**٢٢٠٦-** (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَذْكُرُ اللهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ. [م٣٧٣]

**(م) لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو کاتەکان یادی خودای دەکرد.**

**٢٢٠٧-** (م) عَنْ حَنْظَلَةَ الأُسَيِّدِيِّ. وَكَانَ مِنْ كُتَّابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. قَالَ: لَقِيَنِي أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: كَيْفَ أَنْتَ يَا حَنْظَلَةُ؟! قالَ: قُلْتُ: نَافَقَ حَنْظَلَةُ. قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ! مَا تَقُولُ؟ قالَ: قُلْتُ: نَكُونُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، يُذَكِّرُنَا بِالنَّارِ وَالْجَنَّةِ، حَتَّى كَأَنَّا رَأْيَ عَيْنٍ، فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، عَافَسْنَا الأَزْوَاجَ وَالأَوْلاَدَ وَالضَّيْعَاتِ، فَنَسِينَا كَثِيراً. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَوَاللهِ! إِنَّا لَنَلْقَى مِثْلَ هَذَا. فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ، حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، قُلْتُ: نَافَقَ حَنْظَلَةُ يَا رَسُولَ اللهِ! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(وَمَا ذَاكَ)؟** قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! نَكُونُ عِنْدَكَ، تُذَكِّرُنَا بِالنَّارِ وَالْجَنَّةِ، حَتَّى كَأَنَّا رَأْيَ عَيْنٍ، فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِكَ، عَافَسْنَا الأَزْوَاجَ وَالأَوْلاَدَ وَالضَّيْعَاتِ، نَسِينَا كَثِيراً.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! إِنْ لَوْ تَدُومُونَ عَلَى مَا تَكُونُونَ عِنْدِي، وَفِي الذِّكْرِ، لَصَافَحَتْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ عَلَى فُرُشِكُمْ وَفِي طُرُقِكُمْ، وَلَكِنْ، يَا حَنْظَلَةُ! سَاعَةً وَسَاعَةً) ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. [م٢٧٥٠]

(م) لە حەنزەلەی ئوسەیدییەوە –ئەو لە نوسەرانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو– وتی: ئەبوبەکرم پێگەیشت و وتی: تۆ چۆنی ئەی حەنزەلە؟ وتی: وتم: حەنزەلە دووڕوویی لێ وەشایەوە، وتی: سبحان الله! تۆ چی دەڵێی؟ وتی: وتم: لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەبین بیری ئاگر و بەهەشتمان دەخاتەوە، تەنانەت وەك ئەوەی بە چاو ببینین، کاتێ لای پێغەمبەری خودا هەڵدەستین و دەڕۆین سەرقاڵی ژن و منداڵ و کاروبار دەبین، زۆرمان لەبیرچوو[1]، ئەبوبەکر وتی: سوێند بە خودا، ئێمەش هەمان شتمان تووش دێت.

من و ئەبوبەکر ڕۆیشتین تا چووینە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، حەنزەلە دووڕوویی لێوەشایەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوە چییە؟)**، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، لای تۆ دەبین ئاگر و بەهەشتمان بیردەخەیەوە، تەنانەت وەك ئەوەی بە چاو ببینین، کاتێ لە لای تۆ هەڵدەستین و دەڕۆین سەرقاڵی ژن و منداڵ و کاروبار دەبین، زۆرمان لەبیرچوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، گەر بەردەوام بن لەسەر ئەو حاڵەی لە لای من هەتانە، و بەردەوام بن لە زیکر فریشتەکان لەسەر جێگەکانتان و لە ڕێگە و بانەکان تەوقەتان لەگەڵ دەکەن، بەڵام ئەی حەنزەلە، سات ساتە)**.

**٢٢٠٨**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ شَرَائِعَ الْإِسْلاَمِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيَّ، فَأَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ أَتَشَبَّثُ بِهِ، قَالَ: (لاَ يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْباً مِنْ ذِكْرِ اللهِ عزّ وجل).

* صحيح. [ت٣٣٧٥/ جه٣٧٩٣]

---

[1] واتە: زۆر بێئاگادەبین و ئامۆژگارییەکانمان زۆر لەبیر دەچێت–و.

لە عەبدوڵای کوڕی بوسرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) شەرعی ئیسلامم لەسەر زۆر بووە، هەواڵم پێ بدە بە شتێك دەستی پێوە بگرم، فەرمووی: **(بەردەوام زمانت بە یادی خودا(عز وجل) پاراو بێت).**

## ٣- دەروازەی: فەزڵی "لا إله إلا الله"

**٢٢٠٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيْئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ حِرْزاً مِنَ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ؛ إِلاَّ أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذلِكَ).**
[خ٣٢٩٣/ م٢٦٩١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێ: "لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير" هاوتای ڕزگارکردنی دە کۆیلەیە، و سەد چاکەی بۆ دەنوسرێت، و سەد خراپەی لێ دەبێتەوە، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە بۆی دەبێتە پارێزەر لە شەیتان، و هیچ کەس باشتر لەو کارەی ئەوی ئەنجام نەداوە، مەگەر کەسێك زۆرتر لەوەی ئەنجام دابێت).**

**٢٢١٠-** (ق) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ قَالَ عَشْراً كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ).** [خ٦٤٠٤/ م٢٦٩٣]

(ق) لە ئەبی ئەیوبی ئەنصارییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس دە جار ئەوە[1] بڵێ وەك ئەوەی منداڵێکی ئیسماعیلی لە کۆیلەیی ڕزگار کردبێت).**

---

[1] واتە: وتنی: "لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير"-و.

▪ ولفظ مسلم: (مَنْ قَالَ: لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، عَشْرَ مِرَارٍ، كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ أَرْبَعَةَ أَنْفُسٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ).

لەفزەکەی موسلیم: (**هەر کەس بڵێ: "لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير" دە جار، وەك ئەوە وایە چوار نەفسی لە ڕۆڵەی ئیسماعیلی ڕزگار کردبێت**).

**٢٢١١**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، مَنْ قَالَهَا عَشْرَ مَرَّاتٍ حِينَ يُصْبِحُ، كُتِبَ لَهُ بِهَا مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَ عَنْهُ بِهَا مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ عَدْلَ رَقَبَةٍ، وَحُفِظَ بِهَا يَوْمَئِذٍ حَتَّى يُمْسِيَ، وَمَنْ قَالَ مِثْلَ ذَلِكَ حِينَ يُمْسِي، كَانَ لَهُ مِثْلُ ذَلِكَ**). [حم٨٧١٩]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەر کەس بڵێ: "لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير" هەر کەس دە جار بیڵێ کاتێ ڕۆژی لێ دەبێتەوە سەد چاکەی بەوە بۆ دەنوسرێت و سەد خراپەی بەوە لێ دەبێتەوە، هاوتای ڕزگارکردنی کۆیلەیەکە، و ئەو ڕۆژە تا ئێوارەی بەسەردا دێت بەوە پارێزراو دەبێت، هەر کەس هاوشێوەی ئەوە بڵێ کاتێ ئێوارەی بەسەردا دێت هاوشێوەی ئەوەی بۆ هەیە**).

**٢٢١٢**- عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ حَدَّثَهُ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لَهُ: (**يَا مُعَاذُ بْنَ جَبَلٍ**)، قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: (**لاَ يَشْهَدُ عَبْدٌ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، ثُمَّ يَمُوتُ عَلَى ذَلِكَ؛ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ**) قال: قُلْتُ: أَفَلاَ أُحَدِّثُ النَّاسَ؟ قَالَ: (**لاَ، إِنِّي أَخْشَى أَنْ يَتَّكِلُوا عَلَيْهِ**). [حم٢٢٠٠٩]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

[وانظر حديث البطاقة: ١٩٤].

لە ئەنەسەوە: مەعاز بۆی باسکردووە: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: **(ئەی مەعازی کوڕی جەبەل)**، ئەویش وتی: "لبيك، يا رسول الله، وسعديك"[1]، فەرمووی: **(هەر بەندەیەك شایەتی بدات: "لا إله إلا الله"، پاشان لەسەر ئەوە بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە)**، وتی: وتم: ئایا بۆ خەڵکی باس بکەم؟ فەرمووی: **(نەخێر، من دەترسم شانی لەسەر دابدەن[2])**.

## ٤- دەروازەی: فەزڵی "سبحان الله و الحمد لله و الله أكبر"

**٢٢١٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، حُطَّتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ).

[خ٦٤٠٥/ م٢٦٩١، ٢٦٩٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە ڕۆژێکدا سەد جاتر بڵێ: "سبحان الله وبحمده" گوناهەکانی لێ هەڵدەوەرێن با وەك کەفی دەریاش بن)**.

- وفي رواية لمسلم: (مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ، لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ؛ إِلاَّ أَحَدٌ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ، أَوْ زَادَ عَلَيْهِ). [م٢٦٩٢]

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: **(هەر کەس کاتێ ڕۆژی لێ دەبێتەوە و کاتێ ئێوارەی بەسەردا دێت سەد جار بڵێ: "سبحان الله وبحمده" لە ڕۆژی قیامەت هیچ کەس شتێکی نەهێناوە باشتر لەوەی ئەو هێناویەتی، مەگەر کەسێك هەمان شتی ئەوی وتبێت، یان زیاد لەسەر ئەوە)**.

---

[1] "لبيك وسعديك" واتە: جار لەدوای جار وەڵامت دەدەمەوە و بەردەوامم لە وەڵامدانەوە و کۆمەکی لەدوای کۆمەکی بۆ فەرمانی تۆ و شوێنکەوتن لەدوای شوێنکەوتن بۆ دینەکەی تۆ-و.

[2] واتە: دەترسم شان لەسەر وتنی ئەوە دابدەن و لە کارکردن سارد ببنەوە-و.

**٢٢١٤**– (ق) وعَنْهُ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**كَلِمَتَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمنِ، خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ**).

[خ٧٥٦٣ (٦٤٠٦)/ م٢٦٩٤]

(ق) هەر لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(دوو کەلیمە هەن لای رەحمان خۆشەویستن، لەسەر زمان سووك و ئاسانن، لە ترازوودا قورس و گرانن: "سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم").**

**٢٢١٥**– (م) وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لأَنْ أَقُولَ: سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ**). [م٢٦٩٥]

(م) هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بڵێم: "سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله أكبر" لام خۆشەویسترە لەوەی خۆری بەسەردا هەڵدێت).**

**٢٢١٦**– (م) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ حَسَنَةٍ**)؟ فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ: كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ؟ قَالَ: (**يُسَبِّحُ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ، فَيُكْتَبُ لَهُ أَلْفُ حَسَنَةٍ، أَوْ يُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ خَطِيئَةٍ**). [م٢٦٩٨]

(م) لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، وتی: لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، فەرمووی: **(ئایا یەکێك لە ئێوە دەستەوسانە لە رۆژێکدا هەزار چاکە بکات؟)**، یەکێك لە هاومەجلیسانی پرسیاری لێکرد: چۆن یەکێك لە ئێمە هەزار چاکە بەدەست بهێنێت؟ فەرمووی: **(سەد "سبحان الله" بکات هەزار چاکەی بۆ دەنوسرێت، یان هەزار خراپەی لێ هەڵدەوەرێت).**

## ٥- دەروازەی: "سبحان الله" كردن سەرەتای ڕۆژ و كاتی خەوتن

**٢٢١٧**- (ق) عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّ فَاطِمَةَ ﷺ اشْتَكَتْ مَا تَلْقَى مِنَ الرَّحى مِمَّا تَطْحَنُ، فَبَلَغَهَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أُتِيَ بِسَبْيٍ، فَأَتَتْهُ تَسْأَلُهُ خَادِماً فَلَمْ تُوَافِقْهُ، فَذَكَرَتْ لِعَائِشَةَ، فَجَاءَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَذَكَرَتْ ذلِكَ عَائِشَةُ لَهُ، فَأَتَانَا وَقَدْ دَخَلْنَا مَضَاجِعَنَا، فَذَهَبْنَا لِنَقُومَ، فَقَالَ: (**عَلَى مَكَانِكُمَا**)، حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمَيْهِ عَلَى صَدْرِي، فَقَالَ: (**أَلاَ أَدُلُّكُمَا عَلَى خَيْرٍ مِمَّا سَأَلْتُمَاهُ، إِذَا أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا: فَكَبِّرَا اللهَ أَرْبَعاً وَثَلاَثِينَ، وَاحْمَدَا ثَلاَثاً وَثَلاَثِينَ، وَسَبِّحَا ثَلاَثاً وَثَلاَثِينَ، فَإِنَّ ذلِكَ خَيْرٌ لَكُمَا مِمَّا سَأَلْتُمَاهُ**). [خ٣١١٣/ م٢٧٢٧]

**(ق) لە عەلییەوە(خوا لێی ڕازی بێت): فاتیمە(خوا لێی ڕازی بێت) سكاڵای هەبوو لەوەی لە دەستهاڕەوە[1] تووشی دێت لە كاتی شت هاڕین، ئەو هەواڵەی پێگەیشت "سبي[2]" هێنراوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، هات بۆ لای و داوای خزمەتكارێكی لێكرد، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵی هاوڕا نەبوو، فاتیمە ئەوەی بۆ عائیشە باس كرد، پێغەمبەر(ﷺ) هات و عائیشە ئەوەی بۆ باس كرد، پێغەمبەر هات بۆ لامان و هاتە ناو جێگەكەمان، ئێمەش ویستمان هەڵبستین، فەرمووی: (لە جێگەی خۆتان بن) تا فێنكی پێیەكانیم لەسەر سینەم هەست پێكرد، فەرمووی: (دەتانەوێ باشتر لەوەی داواتان كرد بە ئێوە نیشان بدەم، گەر چوونە ناو جێگەكەتان: سی و چوار جار "الله أكبر" بكەن، سی و سێ جار "الحمد لله" بكەن، و سی و سێ جار "سبحان الله" بكەن، ئەوە باشتر و چاكترە بۆ ئێوە لەوەی داواتان كردووە).**

**٢٢١٨**- (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ جُوَيْرِيَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا بُكْرَةً حِينَ صَلَّى الصُّبْحَ، وَهِيَ فِي مَسْجِدِهَا، ثُمَّ رَجَعَ بَعْدَ أَنْ أَضْحَى، وَهِيَ جَالِسَةٌ، فَقَالَ: (**مَا زِلْتِ عَلَى الْحَالِ الَّتِي فَارَقْتُكِ عَلَيْهَا**)؟ قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَقَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، لَوْ وُزِنَتْ بِمَا قُلْتِ مُنْذُ الْيَوْمِ لَوَزَنَتْهُنَّ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ**). [م٢٧٢٦]

---

[1] بەدیلگیراو لە جەنگدا—و.

[2] واتە: —و.

(م) لە ئیبن عەباسەوە، لـە جوەیریـەوە: بەیانییـەك پێغەمبـەرێك(ﷺ) كـە نوێـژی بەیانی ئەنجامدا لای ئەو چووە دەرەوە، جوەیرییە لە سوژدەگای خۆیدا بوو، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) چێشتەنگاو گەڕایەوە، جوەیرییە لە سـوژدەگاكەی خـۆی دانیشـتبوو، فەرمووی: **(هێشتا لەسەر ئەو حاڵەی تۆم لەسەر بەجێهێڵا؟)**، جوەیریە وتی: بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(لەدوای تۆ سێ جار چـوار كەلیمـەم وت، گـەر بكێشرێ بەوەی لە ئەمڕۆدا تۆ وتووتە هاوتان لەگەڵی: "سبحان الله وبحمده، عدد خلقه، ورضا نفسه، وزنة عرشه، ومداد كلماته")**.

## ٦- دەروازەی: فەزڵی "لا حول ولا قوة إلا بالله"

**٢٢١٩**- عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ)؟ قُلْتُ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ). [جه٣٨٢٥]

* صحيح.

لـە ئـەبی زەڕەوە، وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) پێـی فـەرمووم: **(دەتـەوێ گەنجینەیەك لە گەنجینەی بەهەشتت پێ نیشان بدەم؟)**، وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(لا حول ولا قوة إلا بالله)**.

## ٧- دەروازەی: (رضيتُ بالله ربا- رازیم خودا پەروەردگارم بێت)

**٢٢٢٠**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ قَالَ: رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً، وَبِالْإِسْلاَمِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ). [د١٥٢٩]

* صحيح.

[وانظر: ٣٨].

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس بڵێت: "رضيتُ بالله ربا، وبالإسلام دينا، وبحمد رسولا" بەهەشتی بۆ واجب دەبێت)**.

## ٨- دەروازەی: ژماردنی تەسبیح بە دەست

**٢٢٢١-** عَنْ يُسَيْرَةَ بِنْتِ يَاسِرٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَمَرَهُنَّ أَنْ يُرَاعِينَ بِالتَّكْبِيرِ وَالتَّقْدِيسِ وَالتَّهْلِيلِ، وَأَنْ يَعْقِدْنَ بِالْأَنَامِلِ، فَإِنَّهُنَّ مَسْؤولاَتٌ مُسْتَنْطَقَاتٌ. [د١٥٠١/ ت٣٥٨٣]

* حسن.

**لە یوسەیرەی کچی یاسرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردن گرنگی بدەن بە تەکبیر و تەقدیس و تەهلیل، و بە پەنجەکانیان بیانژمێرن، چونکە پەنجەکان پرسیارلێکراون و دەهێنرێنە گۆ.**

**٢٢٢٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَعْقِدُ التَّسْبِيحَ.

* صحيح. [د١٥٠٢/ ت٣٤١١/ ن١٣٥٤]

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی تەسبیحی بە پەنجە ئەنجام دەدا.**

## ٩- دەروازەی: ئەو مەجلیسەی یادی خودای تێدا ناکرێت

**٢٢٢٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَا مِنْ قَوْمٍ يَقُومُونَ مِنْ مَجْلِسٍ لاَ يَذْكُرُونَ اللهَ فِيهِ؛ إِلاَّ قَامُوا عَنْ مِثْلِ جِيفَةِ حِمَارٍ، وَكَانَ لَهُمْ حَسْرَةً)**. [د٤٨٥٥]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کۆمەڵێك لە مەجلیسێك هەستان و یادی خودایان تێدا نەکردبێت لەسەر لاکە تۆپیوی گوێدرێژ هەستاون و بۆ ئەوان دەبێتە حەسرەت).**

## بەشی دووەم

## فەزڵی دوعا

### ١- دەروازەی: بۆ هەر پێغەمبەرێك دوعایەکی وەڵامدراوە هەبووە

**٢٢٢٤-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ يَدْعُو بِهَا، وَأُرِيدُ أَنْ أَخْتَبِئَ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لأُمَّتِي فِي الآخِرَةِ**). [خ٦٣٠٤/ م١٩٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بۆ هەر پێغەمبەرێك دوعایەکی وەڵامدراوە هەبووە پێغەمبەرەکە کردوویەتی، من دەمەوێ دوعاکەم هەڵبگرم وەك شفاعەت بۆ ئومەتەکەم لە دواڕۆژ)**.

### ٢- دەروازەی: دوعای پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" بۆ ئومەتەکەی

**٢٢٢٥-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم تَلاَ قَوْلَ اللهِ عزّ وجل فِي إِبْرَاهِيمَ: ﴿**رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ**﴾ الآية [إبراهيم:٣٦]، وَقَالَ عِيسَى عليه السلام: ﴿**إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ**﴾ [المائدة: ١١٨] فَرَفَعَ يَدَيْهِ وَقَالَ: (**اللَّهُمَّ أُمَّتِي أُمَّتِي**) وَبَكَى. فَقَالَ اللهُ عزّ وجل: يَا جِبْرِيلُ، اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ، وَرَبُّكَ أَعْلَمُ، فَسَلْهُ مَا يُبْكِيكَ؟ فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ فَسَأَلَهُ، فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِمَا قَالَ، وَهُوَ أَعْلَمُ. فَقَالَ اللهُ: يَا جِبْرِيلُ، اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ فَقُلْ: إِنَّا سَنُرْضِيكَ فِي أُمَّتِكَ وَلاَ نَسُوؤُكَ. [م٢٠٢]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە: پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ئیبراهیم فەرموودەی خودای(عز وجل) خوێندەوە: ﴿**رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ**﴾ [إبراهيم:٣٦]، هەروەها عیسا(علیه السلام) فەرمووی: ﴿**إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ**﴾ [المائدة: ١١٨]، دوو

دەستی خۆی بەرز کردەوە و فەرمووی: **(خودایە ئومەتەکەم، خودایە ئومەتەکەم)**، ئەو گریا، خودا(عز وجل) فەرمووی: ئەی جیبریل، برۆ بۆ لای محەمەد، پەروەردگاری تۆ زاناترە، پرسیاری لیّ بکە چی تۆ دەگریەنێت؟ جیبریل(علیه الصلاة والسلام) هات و پرسیاری لێکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەواڵی پێدا بەوەی فەرمووی، ئەو زاناترە، خودا فەرمووی: ئەی جیبریل، برۆ بۆ لای محەمەد و بڵێ: ئێمە لە ئومەتەکەت رازی دەکەین و شەرمەزارت ناکەین.

## ٣- دەروازەی: سووربوون و لێبڕان و پێداگری لە داواکردن

**٢٢٢٦-** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا دَعا أَحَدُكُمْ؛ فَلْيَعْزِمِ المَسْأَلَةَ، وَلاَ يَقُولَنَّ: اللَّهُمَّ إِنْ شِئْتَ فَأَعْطِنِي، فَإِنَّهُ لاَ مُسْتَكْرِهَ لَهُ)**.

[خ٦٣٣٨/ م٢٦٧٨]

(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە دوعای کرد با پێداگر بێت لە داواکردن، نەڵێت: خودایە گەر دەخوازی پێم ببەخشە، چونکە زۆرلێکەر بۆ خودا بوونی نییە)**.

## ٤- دەروازەی: (خۆراکی حەرامە... چۆن وەڵامی دەدرێتەوە)

**٢٢٢٧-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ اللهَ طَيِّبٌ لاَ يَقْبَلُ إِلاَّ طَيِّباً، وَإِنَّ اللهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ، فَقَالَ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَٱعْمَلُواْ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ۝٥١﴾** [المؤمنون: ٥١]، وَقَالَ: **﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ﴾**[البقرة:١٧٢]. ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ، أَشْعَثَ أَغْبَرَ، يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ، يَا رَبِّ! يَا رَبِّ! وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَغُذِيَ بِالْحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ؟). [م١٠١٥]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی خەڵکینە، خودا پاك و بێگەردە و تەنها پاك و بێگەرد قبووڵ دەکات، خودا فەرمانی کردووە بە**

باوەڕداران بەوەی فەرمانی پێغەمبەران کردووە، و فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ﴾ [المؤمنون: ٥١]، وە فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ﴾ [البقرة:١٧٢]، پاشان باسی پیاوێکی کرد سەفەری دوور و درێژ دەکات، قژ هەڵچوو و تۆزاوی، دەستی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان، ئەی پەروەردگار، ئەی پەروەردگار، خۆراکەکەی حەرامە، و خواردنەوەکەی حەرامە و پۆشاکەکەی حەرامە، و بە حەرام گۆشکراوە، چۆن وەڵامی ئەوە دەدرێتەوە).

## ٥- دەروازەی: لە شەودا ساتێك هەیە تیایدا وەڵامی دوعا دەدرێتەوە

**٢٢٢٨-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ اللهِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ فِي اللَّيْلِ لَسَاعَةً، لاَ يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ، يَسْأَلُ اللهَ خَيْراً مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ؛ إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ، وَذَلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ). [م٧٥٧]

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(لە شەودا ساتێك هەیە، هەر پیاوێکی موسڵمان ڕێی لێ بکەوێت، داوای خێر بکات لە کاروباری دنیا و دواڕۆژ خودا پێی دەبەخشێت، ئەوەش لە هەموو شەوێکدا).**

## ٦- دەروازەی: وەڵامی بەندە دەدرێتەوە گەر پەلە نەکات

**٢٢٢٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ: دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي). [خ٦٣٤٠/ م٢٧٣٥]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(وەڵامی یەکێك لە ئێوە دەدرێتەوە گەر پەلە نەکات، ئەو دەڵێت: دوعام کرد و وەڵامم نەدرایەوە[1]).**

---

[1] پەلە کردنەکەی وتنی ئەو قسەیە: دوعام کرد و وەڵامم نەدرایەوە-و.

■ وفي رواية لمسلم: قَالَ: (لاَ يَزَالُ يُسْتَجَابُ لِلْعَبْدِ مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ، مَا لَمْ يَسْتَعْجِلْ). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الاِسْتِعْجَالُ؟ قَالَ: (يَقُولُ: قَدْ دَعَوْتُ، وَقَدْ دَعَوْتُ، فَلَمْ أَرَ يَسْتَجِيبُ لِي، فَيَسْتَحْسِرُ عِنْدَ ذَلِكَ، وَيَدَعُ الدُّعَاءَ).

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: فەرمووی: (**بەردەوام وەڵامی بەندەیەك دەدرێتەوە –گەر بە خراپە یان بڕینی سیلەی ڕەحمەوە دوعا نەکات– گەر پەلە نەکات**)، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، پەلەکردن چییە؟ فەرمووی: (**دەڵێت: من دوعام کرد و دوعام کرد، نابینم وەڵامم بداتەوە، لەو بارەدا حەسرەت دەکێشێت، و دوعا وازلێدەهێنێت**).

## ٧- دەروازەی: زۆرترین دوعای پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٢٢٣٠**– (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ أَكْثَرُ دُعَاءِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: (**اللَّهُمَّ! رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ**). [خ٦٣٨٩ (٤٥٢٢)/ م٢٦٩٠]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: زۆرترین دوعای پێغەمبەر(ﷺ): (**أللهم**[1] **ربنا آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار**).

**٢٢٣١**– وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ: (**اللَّهُمَّ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ**)، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، تَخَافُ عَلَيْنَا، وَقَدْ آمَنَّا بِكَ وَصَدَّقْنَاكَ بِمَا جِئْتَ بِهِ؟! فَقَالَ: (**إِنَّ الْقُلُوبَ بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ عزّ وجل يُقَلِّبُهَا**). [ت٢١٤٠/ جه٣٨٣٤]

* صحيح.

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە زۆری دەیفەرموو: (**أللهم ثبِّتْ قلبي على دينِك–خودایە، لەسەر دینەکەت دڵم دامەزراو بکە**)، پیاوێك وتی:

---

[1] واتە: کردنی "أللهم" لە سەرەتای دوعا قورئانییەکانەوە سوننەتە، بەوەدا خوێندنەوەی ئایەتەکە دەبێتە دوعا، نەك خوێندنی قورئان–و.

ئەی پێغەمبەری خودا، لەسەر ئێمە دەترسی[1]، ئێمە ئیمانمان پێهێناى و ئەوەی تۆ هێناوتە بە راستمان زانی؟ فەرمووی: **(دڵان لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی رەحمانن(عز وجل)، وەریاندەگێرێت).**

## ٨- دەروازەی: لە دوعاکانی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٢٢٣٢**- (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الْأَشْعَرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو بِهٰذَا الدُّعَاءِ: (رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي، وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي كُلِّهِ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطَايَايَ، وَعَمْدِي وَجَهْلِي وَهَزْلِي، وَكُلُّ ذٰلِكَ عِنْدِي. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ). [خ٦٣٩٨/ م٢٧١٩]

(ق) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): ئەو ئەم دوعایەی دەکرد: **(رب اغفر لي خطيئتي وجهلي، وإسرافي في أمري كلّه، وما أنت أعلم به مني، اللهم اغفر لي خطايايَ وعَمْدي وجهلي وهزلي، وكل ذالك عندي، اللهم اغفر لي ما قدّمتُ وما أخّرتُ وما أسررتُ وما أعلنتُ، أنت المقدِّمُ وأنت المؤخِّرُ، وأنت على كل شيء قدير).**

**٢٢٣٣**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (اللَّهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِيَ الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي، وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي، وَأَصْلِحْ لِي آخِرَتِي الَّتِي فِيهَا مَعَادِي، وَاجْعَلِ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِي فِي كُلِّ خَيْرٍ، وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِّ شَرٍّ). [م٢٧٢٠]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: **(اللهم اصلح لي ديني الذي هو عصمة أمري، وأصلح لي دنياي التي فيها معاشي، وأصلح لي آخرتي التي فيها معادي، واجعل الحياة زيادة لي في كل خير، واجعل الموت راحة لي من كل شر).**

---

[1] واتە: دوعاکەت بۆ ترسە لە سەرئەنجامی ئێمە، کە دەڵێی لەسەر دینەکەت دڵم دامەزراو بکە؟ واتە: بە گوێی ئێمەدا دەیخوێنی تا ئەو دوعایە بکەین، چونکە ترست هەیە دڵمان دامەزراو نەبێت-و.

**٢٢٣٤–** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى، وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى**). [م٢٧٢١]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، ئەو دەیفەرموو: (أللهم إني أسألك الهدى والتُّقى والعَفاف والغِنى).**

**٢٢٣٥–** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ مِنْ دُعَاءِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**اللَّهُمَّ! إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ، وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ، وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ، وَجَمِيعِ سَخَطِكَ**). [م٢٧٣٩]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: لە دوعاکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ): (أللهم إني أعوذ بك من زوال نعمتك، وتحوُّلِ عافيتِك، وفُجاءة نَقْمَتِك، وجميع سَخَطِكَ).**

**٢٢٣٦–** (م) عَنْ سَعْدِ بْنِ طَارِقِ بْنِ أَشْيَمَ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَقَدْ أَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ أَقُولُ حِينَ أَسْأَلُ رَبِّي؟ قَالَ: (**قُلْ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَعَافِنِي، وَارْزُقْنِي**) . وَجَمَعَ أَصَابِعَهُ الْأَرْبَعَ إِلاَّ الْإِبْهَامَ . (**فَإِنَّ هَؤُلاَءِ يَجْمَعْنَ لَكَ دِينَكَ وَدُنْيَاكَ**). [م٢٦٩٧/ جه٣٨٤٥]

[وانظر: **٢٢٥٢**].

**(م) لە سەعدی کوڕی تاریقی کوڕی ئەشیەمەوە، لە باوکییەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ئەو پیاوێك هاتبوو بۆ لای و وتبووی: ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن بڵێم کاتێ داوا لە پەروەردگارم دەکەم؟ فەرمووی: (بڵێ: أللهم اغفر لي، وارحمني، وعافني، وارزقني)، چوار پەنجەی کۆکردەوە جگە لە پەنجە گەورە[1]، (ئەمانە دین و دونیات بۆ کۆدەکەنەوە).**

**٢٢٣٧–** عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَّمَهَا هَذَا الدُّعَاءَ: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنَ الْخَيْرِ كُلِّهِ، عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ،**

---

[1] واتە: فەرمووی: ئەم چوارە دین و دنیات بۆ کۆدەکەنەوە: (أللهم اغفر لي وارحمني) کۆکردنەوەی دینە، (وعافني وارزقني) کۆکەرەوەی دنیایە—و.

عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَاذَ بِهِ عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَسْأَلُكَ أَنْ تَجْعَلَ كُلَّ قَضَاءٍ قَضَيْتَهُ لِي خَيْرًا). [جه٣٨٤٦]

* صحيح.

له عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم دوعایەی فێرکردین: **(أللهم إني أسألك من الخير كله، عاجله وآجله[١]، ما علمت منه وما لم أعلم، وأعوذ من الشر كله، عاجله وآجله، ما علمت منه وما لم أعلم، أللهم إني أسألك من خير ما سألك عبدُك ونبيُّك، وأعوذ بك من شر ما عاذ به عبدُك ونبيُّك، أللهم إني أسألك الجنة وما قرب إليها من قول أو عمل، وأعوذ بك من النار وما قرب إليها من قول أو عمل، وأسألك أن تجعل كل قضاء قضيته لي خيرا).**

## ٩- دەروازەی: دوعا لە کاتی خەوتن و بەئاگاهاتن

**٢٢٣٨-** (ق) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ، فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ للصَّلاَةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأَيْمَنِ، ثُمَّ قُلْ: اللَّهُمَّ! أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَى مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ. اللَّهُمَّ! آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ، فَأَنْتَ عَلَى الْفِطْرَةِ، وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَتَكَلَّمُ بِهِ). قَالَ: فَرَدَّدْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمَا بَلَغْتُ: اللَّهُمَّ! آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، قُلْتُ: وَرَسُولِكَ، قَالَ: (لاَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ).

[خ٢٤٧/ م٢٧١٠]

(ق) لە بەرائی کوڕی عازیبەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر چوویە ناو جێگەکەت، دەستنوێژی نوێژ هەڵبگرە، پاشان لەسەر لای راستت راکشێ، پاشان بڵێ:**

---

[١] واتە: خێری دنیا و دوارۆژ-و.

**"اللهم أسلمت وجهي إليك[1]، وفوضت أمري إليك[2]، وألجأت ظهري إليك[3]، رغبة ورهبة إليك، لا ملجأ ولا منجى منك إلا إليك[4]، أللهم آمنت بكتابك الذي أنزلتَ، وبنبيك الذي أرسلت" گەر لە شەوەکەت مردی تۆ لەسەر فیترەتی، ئەوانە بکە بە دوایین شتێك دەیڵێی)**، وتی: بۆ پێغەمبەرم(ﷺ) دووبارە کردەوە کاتێ گەیشتم بە "أللهم آمنت بكتابك الذي أنزلت"، وتم: "ورسولك"، فەرمووی: **(نەخێر، "ونبيك الذي أرسلت")**.

**٢٢٣٩**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ؛ فَلْيَنْفُضْ فِرَاشَهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ، ثُمَّ يَقُولُ: بِاسْمِكَ رَبِّي وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ)**. [٦٣٢٠/ م٢٧١٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە ڕۆیشتە ناو جێگەی خەو، با جێگەکەی بە ژێر پۆشاکەکەی بتەکێنێت، چونکە ئەو نازانێت لەسەری چی بەجێماوە، پاشان بڵێ: "باسمك ربي وضعت جنبي وبك أرفعه، إن أمسكتَ نفسي فارحمها، وإنْ أرسلتها فاحفظها بما تحفظ به عبادك الصالحين–بە ناوی تۆ ڕاکشام و بە نای تۆ بەرزدەبمەوە، گەر نەفسی منت لای خۆت هێڵایەوە ڕەحمی پێبکە، گەر ڕەوانەت کردەوە بیپارێزە، بەوەی بەندە صاڵحەکانی خۆتی پێ دەپارێزی")**.

**٢٢٤٠**– (خ) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنَ اللَّيْلِ، وَضَعَ يَدَهُ تَحْتَ خَدِّهِ، ثُمَّ يَقُولُ: **(اللَّهُمَّ! بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا)**. وَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ: **(الْحَمْدُ للهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَمَا أَمَاتَنَا، وَإِلَيْهِ النُّشُورُ)**. [خ٦٣١٤ (٦٣١٢)]

---

[1] واتە: ڕووی خۆمم ڕادەست کرد–و.

[2] واتە: کاری خۆم ڕادەست کرد–و.

[3] واتە: پشتم بە تۆ قایم کرد–و.

[4] واتە: هیچ پەنا و هانایەك نییە جگە لە پەنا و هانای تۆ–و.

(خ) لە حوزەیفەوە، وتی: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لە شەودا دەچووە ناو جێگەکەی دەستی دەخستە ژێر گۆنای، پاشان دەیفەرموو: (**أللهم باسمك أموت وأحيا**[1])، کاتێ بەئاگا دەهات دەیفەرموو: (**الحمد لله الذي أحيانا بعد ما أماتنا وإليه النشور**).

**٢٢٤١**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ رضي الله عنه قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مُرْنِي بِكَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ إِذَا أَصْبَحْتُ وَإِذَا أَمْسَيْتُ، قَالَ: (**قُلْ: اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي، وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ**).

قَالَ: (**قُلْهَا إِذَا أَصْبَحْتَ، وَإِذَا أَمْسَيْتَ، وَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ**).

لە ئەبی هورەیرەوە: ئەبو بەکری صدیق(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمانم پێ بکە بە چەند کەلیمەیەك کاتێ بەیانیم لێ دەبێتەوە و کاتێ ئێوارەم بەسەردا دێت بیانخوێنم، فەرمووی: (**بڵێ: "أللهم فاطرَ السموات والأرض، عالمَ الغيب والشهادة، ربٌّ كل شيء ومليكه، أشهد أن لا إله إلا أنت، أعوذ بك من شر نفسي وشرِ شيطان وشِرْكِهِ"**).

فەرمووی: (**کە بەیانیت لێبوویەوە و ئێوارەت بەسەردا هات و کاتێ ڕۆیشتییە ناو جێگەی خەو بیانڵێ**).

ولفظ الترمذي: (**اللَّهُمَّ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، فَاطِرَ..**).

* صحيح.		[د٥٠٦٧/ ت٣٣٩٢/ مي٢٧٣١]

لەفزەکەی ترمزی: (**أللهم عالم الغيب والشهادة، فاطر..**)

## ١٠- دەروازەی: داوای هیدایەت و ڕێك و ڕاست وەستان

**٢٢٤٢**– (م) عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**قُلْ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي وَسَدِّدْنِي، وَاذْكُرْ بِالْهُدَى هِدَايَتَكَ الطَّرِيقَ، وَالسَّدَادِ سَدَادَ السَّهْمِ**).		[م٢٧٢٥]

---

[1] واتە: "بە ناوی تۆ دەمرم و دەژێمەوە" چونکە خەوتن جۆرێکە لە مردن، و بەئاگاهاتن جۆرێکە لە زیندووبوونەوە-و.

(م) لە عەلییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: (**بڵێ: "أللهم اهدني وسدِّدْني"، بە "الهدى" بیر لە هیدایەتی ڕێگەت بکەرەوە، بە "السداد" بیر لە پێکانی تیر بکەرەوە**[1]).

## ١١- دەروازەی: دوعا کاتێ لە مەنزڵێك دادەبەزێت

**٢٢٤٣-** (م) عَنْ خَوْلَةَ بِنْتِ حَكِيمٍ السُّلَمِيَّةِ: أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِذَا نَزَلَ أَحَدُكُمْ مَنْزِلاً، فَلْيَقُلْ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، فَإِنَّهُ لاَ يَضُرُّهُ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْهُ**). [م٢٧٠٨]

(م) لە خەولەی کچی حەکیمی سولەمییەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (**گەر یەکێك لە ئێوە لە مەنزڵێك دابەزی با بڵێت: "أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق" هیچ زیانی پێ ناگەیەنێت تا لەو شوێنە دەڕوات**).

## ١٢- دەروازەی: دوعا لە کاتی تەنگانە و بەگیرهاتن

**٢٢٤٤-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: (**لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ الْعَظِيمُ الحَلِيمُ، لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَرَبُّ الأَرْضِ، وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمُ**). [خ٦٣٤٦ (٦٣٤٥)/ م٢٧٣٠]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە کاتی تەنگانە دەیفەرموو: (**لا إله إلا الله العظيم الحليم، لا إله إلا الله رب العرش العظيم، لا إله إلا الله رب السموات ورب العرش الكريم**).

**٢٢٤٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا كَرَبَهُ أَمْرٌ قَالَ: (**يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ**). [ت٣٥٢٤]

* حسن.

---

[1] واتە: ئەم ڕێنموونییە بۆ ئەوەیە مانای دوعاکە لە کەسەکەدا نەقش بگرێت–و.

له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: گەر کارێك پێغەمبەری تەنگەتاو بکردبایە دەیفەرموو: **(يا حيّ يا قيّوم برحمتك أستغيث)**.

## ١٣- دەروازەی: پەناگرتن لە بەڵای پڕوکێنەر

**٢٢٤٦-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَتَعَوَّذُ مِنْ جَهْدِ الْبَلاَءِ، وَدَرَكِ الشِّقَاءِ، وَسُوءِ الْقَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ.

قَالَ سُفْيَانُ: الحَدِيثُ ثَلاَثٌ، زِدْتُ أَنَا وَاحِدَةً، لاَ أَدْرِي أَيَّتُهُنَّ هِيَ. [خ٦٣٤٧/ م٢٧٠٧]

**(ق) له ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پەنای دەگرت له بەڵای پڕوکێنەر[1]، و تووشهاتنی ناڕەحەتی و بەدبەختی، و خراپی قەزا، و دوژمن پێخۆشبوون.**

**سوفیان دەڵێت: فەرموودەکە سیانە، من دانەیەکم زیاد کردووە، نازانم کام لەوانەیە.**

## ١٤- دەروازەی: پەناگرتن لە دەستەوسانی و ترسنۆکی و دەستنوقاویی و شتانی تر

**٢٢٤٧-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالجُبْنِ وَالهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالمَمَاتِ)**. [خ٦٣٦٧ (٢٨٢٣)/ م٢٧٠٦]

(ق) له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: **(أللهم إني أعوذ بك من العجز والكسل، والجبن والهرم، وأعوذ بك من عذاب القبر، وأعوذ بك من فتنة المحيا والممات)**.

---

[1] "بەڵای پڕوکێنەر" واتە: (جهد البلاء)-و.

**٢٢٤٨-** (م) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ: لاَ أَقُولُ لَكُمْ إِلاَّ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: كَانَ يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَمِ وَعَذَابَ الْقَبْرِ. اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلاَهَا. اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، وَمِنْ دَعْوَةٍ لاَ يُسْتَجَابُ لَهَا**). [م٢٧٢٢]

(م) لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە، وتی: ئەوەتان پێ دەڵێم پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو، ئەو دەیفەرموو: **(أللهم إني أعوذ بك من العجز والكسل، والجن والبخل، والهرم وعذاب القبر، أللهم آت نفسي تقواها، وزكّها أنت خير من زكاها، أنت وليُّها و مولاها، أللهم إني أعوذ بك من علم لا ينفع، ومن قلب لا يخشع، ومن نفس لا تشبع، ومن دعوة لا يُستجاب لها).**

**٢٢٤٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْأَرْبَعِ: مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لاَ يُسْمَعُ**).

* صحيح. [د١٥٤٨/ ن٥٤٨٢/ جه٢٥٠، ٣٨٣٧]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: **(أللهم إني أعوذ بك من الأربع: من علم لا ينفع، ومن قلب لا يخشع، ومن نفس لا تشبع، ومن دعاء لا يُسمع).**

**٢٢٥٠-** وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**اسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَاسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، اسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَاسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ**). [ت٣٦٠٤]

* صحيح.

هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پەنابگرن بە خودا لە سزای دۆزەخ، پەنابگرن بە خودا لە سزای ناو گۆڕ، پەنابگرن بە خودا لە فیتنەی مەسیحی دەججال، پەنابگرن بە خودا لە فیتنەی ژیان و مردن).**

**٢٢٥١**– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ سَأَلَ اللهَ الْجَنَّةَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، قَالَتِ الْجَنَّةُ: اللَّهُمَّ أَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَمَنِ اسْتَجَارَ مِنَ النَّارِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، قَالَتِ النَّارُ: اللَّهُمَّ أَجِرْهُ مِنَ النَّارِ**). [ت٢٥٧٢/ ٥٥٣٦٠/ جه٤٣٤٠]

* صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەر کەس سێ جار داوای بەهەشت لە خودا بکات، بەهەشت دەڵێت: خودایە بیخە ناو بەهەشت، هەر کەس سێ جار پەنا بگرێت لە ئاگر، ئاگر دەڵێت: خودایە، پەنای بدە لە ئاگر**).

## ١٥- دەروازەی: گەر پیاوێك موسڵمان بوو ئەوەی فێری دەکرێت لە دوعا

**٢٢٥٢**– (م) عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ إِذَا أَسْلَمَ عَلَّمَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم الصَّلاَةَ، ثُمَّ أَمَرَهُ أَنْ يَدْعُوَ بِهَؤُلاَءِ الْكَلِمَاتِ: (**اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَاهْدِنِي وَعَافِنِي وَارْزُقْنِي**). [م٢٦٩٧]

(م) لە ئەبی مالیکی ئەشجەعییەوە، لە باوکییەوە، وتی: گەر پیاوێك موسڵمان بوایە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی فێر دەکرد، پاشان فەرمانی پێ دەکرد ئەم چەند کەلیمەیە بڵێت: (**أللهم اغفر لي وارحمني واهدني وعافني وارزقني**[1]).

- زاد في رواية: (**فَإِنَّ هَؤُلاَءِ تَجْمَعُ لَكَ دُنْيَاكَ وَآخِرَتَكَ**).

[وانظر: **٢٢٣٦**]

لە ریوایەتێکدا ئەمەی زیاد کردووە: (**ئەمانە دنیا و دینت بۆ کۆدەکەنەوە**).

---

[1] کۆکەرەوەی دین: ( **أللهم اغفر لی وارحمنی واهدنی**)، کۆکەرەوەی دنیا: (**وعافني وارزقني**)–و.

## ١٦- دەروازەی: دوعا لە کاتی خوێندنی کەڵەشێر

**٢٢٥٣**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ؛ فَاسْأَلُوا اللهَ مِنْ فَضْلِهِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكاً. وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الحِمَارِ؛ فَتَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهُ رَأَى شَيْطَاناً). [خ٣٣٠٣/ م٢٧٢٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خـوا لێـی رازی بێـت): پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: **(گەر گوێتان لە خوێندنی کەڵەشێر بوو لە فەزڵی خودا داوا بکەن، چونکە ئەو فریشتەی بینیوە، گەر گوێتان لە سەرەی گوێدرێژ بوو پەنابگرن بە خودا لە شەیتان، چونکە ئەو شەیتانێکی بینیوە).**

## ١٧- دەروازەی: فەزڵی دوعا کردن بۆ موسڵمانان لە پەنهانەوە

**٢٢٥٤**- (م) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يَدْعُو لِأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ؛ إِلاَّ قَالَ الْمَلَكُ: وَلَكَ بِمِثْلٍ). [م٢٧٣٢]

(م) لە ئەبی دەرداوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر بەندەیەکی موسڵمان لە پەنهانەوە دوعا بۆ براکەی بکات فریشتەیەك دەڵێت: بۆ تۆش بـە هەمان شێوە).**

## ١٨- دەروازەی: دوعا لە نوێژدا و دوای نوێژ

[انظر: فصل صفة الصلاة: **١١٨٩** وما بعده]

## ١٩- دەروازەی: بەرزکردنەوەی دوو دەست لە دوعادا و هێنانیان بە روخساردا

**٢٢٥٥**- عَنْ سَلْمَانَ الفارِسِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ رَبَّكُمْ تَبَارَكَ وَتَعَالَى حَيِيٌّ كَرِيمٌ، يَسْتَحْيِي مِنْ عَبْدِهِ إِذَا رَفَعَ يَدَيْهِ إِلَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْراً).

* صحيح. [د١٤٨٨/ ت٣٥٥٦/ جه٣٨٦٥]

**لە سەلمانی فارسییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (پەروەردگاری ئێوە(تبارك وتعالى) زیندوو و بەخشندەیە، شەرم دەکات لە بەندەکەی گەر دوو دەستی بەرزکردەوە بۆ لای بە خاڵی بیانگێڕێتەوە).**

**٢٢٥٦**– عَنْ مَالِكِ بْنِ يَسَارٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِذَا سَأَلْتُمُ اللهَ؛ فَاسْأَلُوهُ بِبُطُونِ أَكُفِّكُمْ، وَلاَ تَسْأَلُوهُ بِظُهُورِهَا)**. [د١٤٨٦]

* حسن صحيح.

**لە مالیکی کوڕی یەسارەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر داواتان لە خودا کرد بە ناو لەپی دەستتان داوای لێ بکەن، بە پشتی دەستتان داوای مەکەن).**

**٢٢٥٧**– عَن عُمَرَ بنِ الخَطَّابِ ﷺ قال: كانَ رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ إذا رفعَ يديهِ في الدُّعاءِ، لم يحطَّهما حتَّى يمسحَ بِهما وجهَهُ. [ت٣٣٨٦]

* ضعيف، وقال الترمذي حسن غريب.

**لە عومەری کوڕی خەتابەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەر لە دوعادا دوو دەستی بەرزبکردبایەوە داینەدەگرتن تا دەیهێنان بە روخساری خۆدا.**

## ٢٠- دەروازەی: فەزڵی دوعا

**٢٢٥٨**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللهِ تَعَالَى مِنَ الدُّعَاءِ)**. [ت٣٣٧٠/ جه ٣٨٢٩]

* حسن.

**لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (هیچ شتێك لای خودا لە دوعا بەڕێزتر نییە).**

**٢٢٥٩**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّه مَنْ لَمْ يَسْأَلِ اللهَ يَغْضَبْ عَلَيْهِ)**. [ت٣٣٧٣/ جه٣٨٢٧]

* حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس داوا لە خودا نەکات لێی تووڕە دەبێت).**

**٢٢٦٠**– عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(مَا مِنْ أَحَدٍ يَدْعُو بِدُعَاءٍ؛ إِلاَّ آتَاهُ اللهُ مَا سَأَلَ، أَوْ كَفَّ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثْلَهُ، مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ، أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ)**.

* حسن. [ت٣٣٨١]

لە جابرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس دوعایەك بکات خودا ئەوەی پێ دەدات داوای کردووە، یان بە بڕی ئەوە خراپەی لێ دەگێڕێتەوە، گەر بە خراپە و تاوان، یان بڕینی سیلەی ڕەحم دوعا نەکات).**

## ٢١- دەروازەی: دوعا لەگەڵ یەقین بە وەڵامدانەوە

**٢٢٦١**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(ادْعُوا اللهَ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالْإِجَابَةِ، وَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ لاَ يَسْتَجِيبُ دُعَاءً مِنْ قَلْبٍ غَافِلٍ لاَهٍ)**. [ت٣٤٧٩]

* حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(داوا لە خودا بکەن و ئێوە یەقینتان هەبێت بە وەڵامدانەوە، بزانن خودا وەڵامی دوعایەك ناداتەوە لە دڵێکی بێئاگای سەرقاڵەوە).**

## ٢٢- دەروازەی: دوعا و داوا بە ناوی مەزنی خودا

**٢٢٦٢**– عَنْ بُرَيْدَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم سَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ، أَنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللهُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، الْأَحَدُ الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ. فَقَالَ: **(لَقَدْ سَأَلْتَ اللهَ بِالِاسْمِ الَّذِي إِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى، وَإِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ)**.

* صحيح. [د١٤٩٣/ ت٣٤٧٥/ جه٣٨٥٧]

لە بورەیدەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) گوێی لە پیاوێك بوو دەیوت: "أللهم إنّي أسألُك، أنّي أشْهدُ أنّك أنتَ اللهُ، لا إله إلا أنت، الأحدُ الصمدُ، الذي لم يلد ولم يولد، ولم يكن له كفوا أحد"، فەرمووی: **(تۆ بەو ناوە داوات لە خودا كرد گەر بەوە داوای لێ بكرێت پێدەدات، گەر بەوە بانگی لێ بكرێت وەڵام دەداتەوە).**

## ٢٣- دەروازەی: دوعا بە كۆكەرەوەكان لە دوعا

**٢٢٦٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَسْتَحِبُّ الْجَوَامِعَ مِنَ الدُّعَاءِ، وَيَدَعُ مَا سِوَى ذَلِكَ. [د١٤٨٢]

* صحيح.

**لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) كۆكەرەوە لە دوعای لا پەسەند بوو، جگە لەوەی وازلێدەهێنا[1].**

## ٢٤- دەروازەی: درێژدادڕی نەكردن لە دوعادا

**٢٢٦٤-** عَنْ ابْنٍ لِسَعْدِ بن أَبِي وقاصٍ قَالَ: سَمِعَنِي أَبِي وَأَنَا أَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَنَعِيمَهَا وَبَهْجَتَهَا وَكَذَا وَكَذَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَسَلاَسِلِهَا وَأَغْلاَلِهَا وَكَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: يَا بُنَيَّ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(سَيَكُونُ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الدُّعَاءِ)** فَإِيَّاكَ أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ، إِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَ الْجَنَّةَ أُعْطِيتَهَا وَمَا فِيهَا مِنَ الْخَيْرِ، وَإِنْ أُعِذْتَ مِنَ النَّارِ أُعِذْتَ مِنْهَا وَمَا فِيهَا مِنْ الشَّرِّ. [د١٤٨٠]

* حسن صحيح.

---

[1] كۆكەرەوە لە دوعا(الجوامع من الدعاء): بریتییە لە دوعایەك خێری دنیا و دواڕۆژ كۆبكاتەوە، وەك داواكردنی ڕۆزی و عافییەت بۆ دنیا و بەدەستهێنانی پاداشت و بەهەشت لە دواڕۆژ، جگە لەو جۆرە دوعا كۆكەرەوانە دوعای تری وازلێدەهێنا-و.

له کوڕێکی سەعدی کوڕی وەقاصەوە، وتی: باوکم گوێی لێبوو من دەموت: "أللهم إني أسألك الجنة ونعيمها وبهجتها، وكذا وكذا، وأعوذ بك من النـار وسلاسـلها وأغلالهـا، وكذا وكذا–خودایە، من داوای بەهەشـت و خۆشـییەکان و جـوانی و رازاوەییـەکانی، و ئەوە و ئەوەت لێ دەکەم، خودایـە مـن پـەنات پێـدەگرم لـە ئـاگر و زنجـیر و کۆت و بەندەکانی و ئەوە و ئەوە"، وتی: کوڕی خۆم من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بـوو دەیفەرموو: **(کۆمەڵێك پـەیدا دەبـن لـە دوعـادا سـنووربەزێنی دەکـەن)**، ئاگـادارت دەکەمەوە نەوەك بچییە ریزی ئەوانە، گەر بەهەشتت پـێ بـدرێت بەهەشـت و ئـەوەی تێیدایە لە خێر بە تۆ دەدرێت، گەر پەنابدرێی لە ئاگر پەنا دەدرێی لە ئاگر و ئـەوەی تێیدایە لە شەڕ[1].

**٢٢٦٥**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ: أنه سَمِعَ ابْنَهُ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْقَصْرَ الْأَبْيَضَ عَنْ يَمِينِ الْجَنَّةِ، إِذَا دَخَلْتُهَا، فَقَالَ: أَيْ بُنَيَّ، سَلِ اللهَ الْجَنَّةَ، وَعُذْ بِهِ مِنَ النَّارِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (سَيَكُونُ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الدُّعَاءِ).                [د٩٦/ جه٣٨٦٤]

له عەبدوڵای کوڕی موغەفەلەوە: ئەو گوێی لە کوڕەکەی بوو دەیـوت: "أللـهم إنـي أسألك القصر الأبيض عن يمين الجنة–خودایە من داوای کۆشکە سپییەکەت لێ دەکەم لای ڕاستی بەهەشتەوە"، وتی: کوڕی خۆم داوای بەهەشت لە خودا بکە و پەنای پـێ بگرە لە ئاگر، چونکە من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفـەرموو: **(کۆمـەڵێك پەیدا دەبن لە دوعادا سنووربەزێنی دەکەن)**.

- ولفظ أبي داود: (فِي الطُّهُورِ وَالدُّعَاءِ).                * صحيح

لەفزەکەی ئەبی داود: **(لە خۆپاککردنەوە و دوعادا**[2])

---

[1] واتە: کە وتـت "خودایـە، داوای بەهەشـتت لـێ دەکـەم" درێژدادرییـە بڵێـی: "بەهەشـت و جوانییەکانی و میوە و ئافرەتان و غیلمانی لە تۆ داوا دەکەم"، چونکە هەر کـەس چـووە بەهەشتەوە خـودا ئەوانـەی پـێ دەدات، هـەر بـەو جـۆرە بـۆ پـەناگرتن لـە دۆزەخ، ئەمـە نموونەیە بۆ درێژدادری لە دوعادا و هاوشێوەی ئەمە لە دوعاکردن ناپەسەندە .

[2] واتە: کۆمەڵێك پەیدا دەبن لەو دوانەدا سنووربەزێنی دەکەن–و.

## ٢٥- دەروازەی: کۆمەڵێ دوعا ناگەڕێنرێنەوە

٢٢٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (ثَلاَثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٌ لاَ شَكَّ فِيهِنَّ: دَعْوَةُ الْوَالِدِ، وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ، وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ).

[د١٥٣٦/ ت١٩٠٥/ جه٣٨٦٢]

**لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (سێ دوعا وەڵامدراوەن و شکیان تێدا نییە: دوعای باوك[(١)]، و دوعای موسافیر، و دوعای زوڵملێکراو).**

■ وعند الترمذي: (دَعْوَةُ الْوَالِدِ عَلَى وَلَدِهِ)، وعند ابن ماجه: (لِوَلَدِهِ).

* حسن.

لای ترمزی: **(دوعای باوك لە کوڕەکەی)**، لای ئیبن ماجە: **(بۆ کوڕەکەی)**[(٢)].

٢٢٦٧- عَنْ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (دَعْوَةُ ذِي النُّونِ إِذْ دَعَا وَهُوَ فِي بَطْنِ الْحُوتِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَدْعُ بِهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ فِي شَيْءٍ قَطُّ؛ إِلاَّ اسْتَجَابَ اللهُ لَهُ). [ت٣٥٠٥]

* صحيح.

لە سەعدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دوعاکەی زونون[(٣)] کاتێ لە سکی حوتەکەدا بوو: "لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين" پیاوی موسڵمان لە هەر شتێکدا ئەو دوعایە بکات خودا وەڵامی دەداتەوە).**

---

(١) واتە: دوعای دایك و باوك بۆ منداڵ-و.

(٢) واتە: (دوعای باوك لە کوڕەکەی) واتە دوعای شەڕ لێی، (دوعای باوك بۆ کوڕەکەی) واتە دوعای خێر بۆی-و.

(٣) واتە: یونس(علیه السلام)-و.

## ٢٦- دەروازەی: دوعاکار بە خۆی[(١)] دەست بە دوعا دەکات

٢٢٦٨- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا ذَكَرَ أَحَداً فَدَعَا لَهُ، بَدَأَ بِنَفْسِهِ. [د٣٩٨٤/ ت٣٣٨٥]

* صحيح.

لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەر یادی کەسێکی بکردبایە و دوعای بۆ بکردبا بە خۆی دەستی بە دوعاکە دەکرد.

## ٢٧- دەروازەی: چی دەڵێ کاتێ لەماڵەوە دەردەچێت

٢٢٦٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا خَرَجَ الرَّجُلُ مِنْ بَيْتِهِ فَقَالَ: بِاسْمِ اللهِ، تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ، يُقَالُ حِينَئِذٍ: هُدِيتَ وَكُفِيتَ وَوُقِيتَ، فَتَتَنَحَّى لَهُ الشَّيَاطِينُ، فَيَقُولُ شَيْطَانٌ آخَرُ: كَيْفَ لَكَ بِرَجُلٍ قَدْ هُدِيَ وَكُفِيَ وَوُقِيَ) ؟. [د٥٠٩٥/ ت٣٤٢٦]

* صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر پیاو لە ماڵەکەی چووە دەرەوە و وتی: "باسم الله، توكلت على الله، لا حول ولا قوة إلا بالله" لەو کاتەدا پێی دەوترێت: هیدایەتدرای و دەستەبەرکرای و پارێزراو بوویت، بۆیە شەیتانەکان کەناری لێ دەگرن، شەیتانێك بە شەیتانێکی تر دەڵێت: چیتداوە لە پیاوێك هیدایەتدراوە و دەستەبەر کراوە و پارێزراوە؟).**

## ٢٨- دەروازەی: چی دەڵێ گەر تووشبوو بە بەڵایەکی بینی

٢٢٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ رَأَى مُبْتَلًى فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلاَكَ بِهِ، وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلاً، لَمْ يُصِبْهُ ذَلِكَ الْبَلاَءُ). [ت٣٤٣٢]

* صحيح.

---

(١) واتە: یەکەمجار دوعا بۆ خۆی دەکات—و.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس تووشبوو بە بەڵایەك ببینێ و بڵێت: "الحمد لله الذي عافاني مما ابتلاك به، وفضلني على كثير ممن خلق تفضيلا"[1] ئەوا ئەو بەڵایەی تووش نابێت).**

## ٢٩- دەروازەی: دوعای پێویستی

**٢٢٧١**– عَنْ عُثْمَانَ بْنِ حُنَيْفٍ: أَنَّ رَجُلاً ضَرِيرَ الْبَصَرِ، أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: ادْعُ اللهَ أَنْ يُعَافِيَنِي، قَالَ: (**إِنْ شِئْتَ دَعَوْتُ، وَإِنْ شِئْتَ صَبَرْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ**)، قَالَ: فَادْعُهْ، قَالَ: فَأَمَرَهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ فَيُحْسِنَ وُضُوءَهُ، وَيَدْعُوَ بِهَذَا الدُّعَاءِ: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ، نَبِيِّ الرَّحْمَةِ، إِنِّي تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حَاجَتِي هَذِهِ لِتُقْضَى لِيَ، اللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ**).

* صحيح.		[ت٣٥٧٨/ جه١٣٨٥]

لە عوسمانی کوڕی حونەیفەوە: پیاوێکی نابینا هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: داوا لە خودا بکە عافییەتم پێ بدات، فەرمووی: **(گەر بتەوێ دوعا بۆ دەکەم، ئەگەریش بتەوێ ئارام بگری ئەوە بۆ تۆ باشترە)**، پیاوەکە وتی: دوعاکە بکە، وتی: پێغەمبەر فەرمانی پێکرد دەستنوێژ هەڵبگرێت و دەستنوێژەکەی چاك و باش بێت و ئەم دوعایە بکات: **(أللهم إني أسألك وأتوجه بنبيك محمد، نبي الرحمة، إني توجهت بك إلى ربي في حاجتي هذه لتقضى لي، أللهم فشفعه فيَّ).**

## ٣٠- دەروازەی: چی دەڵێ گەر لە خەڵکانێك ترسا

**٢٢٧٢**– عَنْ أَبِي مُوسَى: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا خَافَ قَوْماً، قَالَ: (**اللَّهُمَّ إِنَّا نَجْعَلُكَ فِي نُحُورِهِمْ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شُرُورِهِمْ**).		[د١٥٣٧]

* صحيح.

---

[1] واتە: کردنی ئەم دوعایە دەبێ بە جۆرێك بێت "کەسە تووشبووەکە بە بەڵا" گوێی لێ نەبێت، چونکە دڵشکانی بۆ ئەو تێدایە، هەروەها لەگەڵ دوعاکە بتوانی دوعایەکیش بۆ کەسە تووشبووەکە بکەی کارێکی پەسەندە، وەك: خودایە شفای بۆ رەوانە بکە، یان خودایە رازی بکە بە بڕیار و قەزای خۆت–و.

له ئەبی موساوە: گەر پێغەمبەر(ﷺ) له کۆمەڵێك بترسابا[1] دەیفەرموو: **(أللهم إنا نجعلك في نحورهم، ونعوذ بك من شرورهم).**

## ٣١- دەروازەی: دوعا بۆ پارێزگاری له بیستن و بینین

**٢٢٧٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَدْعُو فَيَقُولُ: (**اللَّهُمَّ مَتِّعْنِي بِسَمْعِي وَبَصَرِي، وَاجْعَلْهُمَا الْوَارِثَ مِنِّي، وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ يَظْلِمُنِي، وَخُذْ مِنْهُ بِثَأْرِي**).

* حسن. [ت ملحق ٣٦٨١]

[وانظر: **٢٢٧٦**].

له ئەبی هورەیرەوەو وتی: پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) دوعای دەکرد و دەیفەرموو: **(أللهُمَّ مَتِّعْنِي بِسَمْعِي وبَصَرِي، واجعلهما الوارِثَ مِنِّي، وانصرني على مَنْ يَظْلِمُني وخُذْ مِنْه بِثَأْرِي).**

## ٣٢- دەروازەی: دوعا بۆ لێبوردن و عافییەت

**٢٢٧٤**- عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ عَلِّمْنِي شَيْئاً أَسْأَلُهُ اللهَ عزّ وجل، قَالَ: (**سَلِ اللهَ الْعَافِيَةَ**)، فَمَكَثْتُ أَيَّاماً، ثُمَّ جِئْتُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ عَلِّمْنِي شَيْئاً أَسْأَلُهُ اللهَ، فَقَالَ لِي: (**يَا عَبَّاسُ، يَا عَمَّ رَسُولِ اللهِ، سَلِ اللهَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ**).

* صحيح. [ت٣٥١٤]

له عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، شتێکم فێر بکە لە خودای(عز وجل) داوا بکەم، فەرمووی: **(داوای عافییەت لە خودا بکە)**، چەند ڕۆژێك مامەوە، پاشان هاتم و وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، شتێکم فێر بکە لە خودا داوای بکەم، پێی فەرمووم: **(ئەی عەباس، ئەی مامی پێغەمبەری خودا، لە خودا عافییەت لە دنیا و دواڕۆژ داوا بکە).**

---

[1] واتە: لە شەڕ و خراپەیان بترسابا-و.

**٢٢٧٥**– عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رافِعِ بْنِ مَالكٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَامَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ عَلَى الْمِنْبَرِ، ثُمَّ بَكَى، فَقَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَامَ الْأَوَّلِ عَلَى الْمِنْبَرِ، ثُمَّ بَكَى فَقَالَ: (**اسْأَلُوا اللهَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ، فَإِنَّ أَحَداً لَمْ يُعْطَ بَعْدَ الْيَقِينِ خَيْراً مِنَ الْعَافِيَةِ**). [ت٣٥٥٨]

* حسن صحيح.

**له ریفاعەی کوڕی رافیعی کوڕی مالیکی ئەنصارییەوە، وتی: ئەبوبەکری صدیق لەسەر مینبەر راستبوویەوە، پاشان گریا، و وتی: ساڵی یەکەم پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر مینبەر راستبوویەوە و پاشان گریا و فەرمووی: (داوای لێبوردن و عافییەت لە خودا بکەن، چونکە لەدوای یەقین باشتر و چاکتر لە عافییەت شتێك بە کەسێك نەدراوە).**

## ٣٣- دەروازەی: دوعای کۆتایی هێنان بە مەجلیس

**٢٢٧٦**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَلَّمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُومُ مِنْ مَجْلِسٍ حَتَّى يَدْعُوَ بِهَؤُلَاءِ الدَّعَوَاتِ لِأَصْحَابِهِ: (**اللَّهُمَّ! اقْسِمْ لَنَا مِنْ خَشْيَتِكَ مَا يَحُولُ بَيْنَنَا وَبَيْنَ مَعَاصِيكَ، وَمِنْ طَاعَتِكَ مَا تُبَلِّغُنَا بِهِ جَنَّتَكَ، وَمِنَ الْيَقِينِ مَا تُهَوِّنُ بِهِ عَلَيْنَا مُصِيبَاتِ الدُّنْيَا، وَمَتِّعْنَا بِأَسْمَاعِنَا وَأَبْصَارِنَا وَقُوَّتِنَا مَا أَحْيَيْتَنَا، وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنَّا، وَاجْعَلْ ثَأْرَنَا عَلَى مَنْ ظَلَمَنَا، وَانْصُرْنَا عَلَى مَنْ عَادَانَا، وَلاَ تَجْعَلْ مُصِيبَتَنَا فِي دِينِنَا، وَلاَ تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا، وَلاَ مَبْلَغَ عِلْمِنَا، وَلاَ تُسَلِّطْ عَلَيْنَا مَنْ لاَ يَرْحَمُنَا**). [ت٣٥٠٢]

* حسن.

**له ئیبن عومەرەوە، وتی: کەمجار پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مەجلیسێك هەستابا و ئەم دوعانەی بۆ هاوەڵانی نەکردبا: (اللهم أقسم لنا من خشيتك ما يحول بيننا وبين معاصيك، ومن طاعتك ما تبلغنا به جنتك، ومن اليقين ما تهون به علينا مصيبات الدنيا، ومتعنا بأسماعنا وأبصارنا وقوتنا ما أحييتنا، واجعله الوارث منا، واجعل ثأرنا على من ظلمنا وانصرنا على من عادانا، ولا تجعل مصيبتنا في ديننا، ولا تجعل الدنيا أكبر همنا ولا مبلغ علمنا ولا تسلط علينا من لا يرحمنا).**

**٢٢٧٧**– عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ إِذَا جَلَسَ مَجْلِساً، أَوْ صَلَّى تَكَلَّمَ بِكَلِمَاتٍ، فَسَأَلَتْهُ عَائِشَةُ عَنِ الْكَلِمَاتِ فَقَالَ: (**إِنْ تَكَلَّمَ بِخَيْرٍ كَانَ طَابِعاً عَلَيْهِنَّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَإِنْ تَكَلَّمَ بِغَيْرِ ذَلِكَ كَانَ كَفَّارَةً لَهُ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ**).

* صحيح. [ن١٣٤٣]

لە عائیشەوە: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مەجلیسێك دابنیشتبایە یان نوێژی بكردبایە چەند وشەیەكی دەفەرموو، عائیشە پرسیاری ئەو وشانەی لێكرد، فەرمووی: **(گەر بە خێر قسەی كردبێت تا ڕۆژی قیامەت مۆریان دەكات، گەر بە شتێكی تر قسەی كردبێت دەبنە كەفارەت بۆی: "سبحانك اللهم وبحمدك، أستغفرك وأتوب إليك")**.

## ٣٤- دەروازەی: ئاماژە بە پەنجە لە دوعادا

**٢٢٧٨**– عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: مَرَّ عَلَيَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَنَا أَدْعُو بِأُصْبُعَيَّ فَقَالَ: (**أَحِّدْ، أَحِّدْ**) وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ. [د١٤٩٩/ ن١٢٧٢]

* صحيح.

لە سەعدی كوڕی ئەبی وەقاصەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە پاڵمدا تێپەڕی من بە دوو پەنجەم دوعام دەكرد[١]، فەرمووی: **(تاكی بكە، تاكی بكە[٢])** ئاماژەی بە پەنجەی شایەتمان كرد.

---

[١] واتە: دوو پەنجەم دەجوڵاند–و.

[٢] واتە: بە یەك پەنجە ئاماژە بۆ تاك و تەنهایی خودا بكە، وەك بەرزكردنەوەی پەنجەی شایەتمان–و.

## بەشی سێیەم

# فەزڵی داوای لێخۆشبوون و تەوبەکردن

## ١- دەروازەی: پەسەندی زۆری داوای لێخۆشبوون

**٢٢٧٩-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(وَاللهِ! إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللهَ، وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً)**. [خ٦٣٠٧]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(سوێند بە خودا، من لە رۆژێکدا زیاتر لە حەفتا جار داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەم و بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە و تەوبە دەکەم).**

**٢٢٨٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي الْمَجْلِسِ الْوَاحِدِ مِائَةَ مَرَّةٍ **(رَبِّ! اغْفِرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ)**.

* صحيح. [د١٥١٦/ ت٣٤٣٤/ جه٣٨١٤]

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: جاری وابوو لە یەك مەجلیسدا سەد جار ئەمەمان لە پێغەمبەرەوە دەژمارد: **(رب اغفر لي وتب علي، إنك أنت التواب الرحيم).**

**٢٢٨١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(قَالَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: يَا ابْنَ آدَمَ! إِنَّكَ مَا دَعَوْتَنِي وَرَجَوْتَنِي، غَفَرْتُ لَكَ عَلَى مَا كَانَ فِيكَ وَلاَ أُبَالِي. يَا ابْنَ آدَمَ! لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ عَنَانَ السَّمَاءِ، ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِي، غَفَرْتُ لَكَ وَلاَ أُبَالِي. يَا ابْنَ آدَمَ! إِنَّكَ لَوْ أَتَيْتَنِي بِقُرَابِ الأَرْضِ خَطَايَا، ثُمَّ لَقِيتَنِي لاَ تُشْرِكُ بِي شَيْئاً، لأَتَيْتُكَ بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً)**. [ت٣٥٤٠]

* صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(خودا(تبارك وتعالى) فەرمووی: ئەی ئادەمیزاد، هەتا داوام لێ بکەی و رجام لێ بکەی**

لەوە خۆشدەبم لە تۆدایە و باکێکم نییە، با گوناهەکانیشت بگەنە بەرزایی ئاسمان، پاشان داوای لێخۆشبوونم لیّ بکەی، لێت خۆشدەبم و باکێکم نییە، ئەی ئادەمیزاد، گەر بە لێوانلێوی زەوی گوناهەوە بێی بۆ لام و پاشان پێمبگەی و شتێکت نەکردبێت بە هاوەڵم منیش بە لێوان لێوی زەوی لێخۆشبوونەوە دێم بۆ لای تۆ).

## ٢- دەروازەی: سەرداری داوای لێخۆشبوون(سيد الإستغفار)

**٢٢٨٢-** (خ) عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: (**سَيِّدُ الإِسْتِغْفَارِ أَنْ تَقُولَ: اللَّهُمَّ! أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ.**

قَالَ: وَمَنْ قَالَهَا مِنَ النَّهَارِ مُوقِناً بِهَا، فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، وَمَنْ قَالَهَا مِنَ اللَّيْلِ وَهُوَ مُوقِنٌ بِهَا، فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ). [خ٦٣٠٦]

**(خ) لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): (سەرداری داوای لێخۆشبوون ئەوەیە بڵێی:**

**"اللهم أنت ربي لا إله إلا أنت، خلقتني وأنا عبدك، وأنا على عهدك ووعدك ما استطعت، أعوذ بك من شر ما صنعت، أبوء لك بنعمتك علي وأبوء لك بذنبي، فاغفر لي فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت".**

**فەرمووی: هەر کەس لە ڕۆژدا بیخوێنێت و یەقینی پێی هەبێت، ئەو ڕۆژە بمرێت بەر لەوەی ئێوارەی بەسەردا بێت ئەو لە ئەهلی بەهەشتە، هەر کەس شەوەکەی بیڵێ و یەقینی پێی هەبێت، بەلەوەی ڕۆژی لێبێتەوە بمرێت ئەو لە ئەهلی بەهەشتە).**

## ٣- دەروازەی: (قەومێك دەهێنێت گوناه دەکەن و داوای لێخۆشبوون دەکەن)

**٢٢٨٣-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَذَهَبَ اللهُ بِكُمْ، وَلَجَاءَ بِقَوْمٍ يُذْنِبُونَ، فَيَسْتَغْفِرُونَ اللهَ، فَيَغْفِرُ لَهُمْ**). [م٢٧٤٩]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، گەر گوناه نەکەن خودا ئێوە دەباتەوە، و قەومێك دەهێنێت گوناه دەکەن و داوای لێخۆشبوون دەکەن و لێیان خۆشدەبێت).**

## ٤- دەروازەی: وەرگرتنی تەوبە تا خۆر لە خۆرئاوەوە هەڵدێت

**٢٢٨٤-** (م) عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّ اللهَ عزّ وجل يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ، لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ، وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ، لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا). [م٢٧٥٩]

[وانظر: ٢٣، ١٤٠].

(م) لە ئەبی موساوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا(عز وجل) بە شەو دەستی خۆی واڵا دەکات تا خراپەکاری رۆژ تەوبە بکات، هەروەها بە رۆژ دەستی خۆی واڵا دەکات تا خراپەکاری شەو تەوبە بکات، تا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت).**

## ٥- دەروازەی: هاندان بۆ تەوبەکردن و دڵخۆشبوون پێی

**٢٢٨٥-** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (اللهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنْ أَحَدِكُمْ، سَقَطَ عَلَى بَعِيرِهِ، وَقَدْ أَضَلَّهُ فِي أَرْضِ فَلَاةٍ).

[خ٦٣٠٩/ م٢٧٤٧]

(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا لە یەکێك لە ئێوە دڵخۆشترە بە تەوبەی بەندەکەی، لە حوشترەکەی بەریووەتەوە و لە زەوییەکی بەرینی چۆڵدا بزری کردووە[1]).**

---

[1] واتە: خودا بە گەڕانەوەی بەندەکەی دڵخۆشترە لەو کەسەی لە دەشت و سارا حوشترەکەی بزر کردووە و پاشان حوشترەکە دەگەڕێتەوە بۆ لای-و.

▪ وفي رواية لمسلم: (للهُ أَشَدُّ فَرَحاً بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ، حِينَ يَتُوبُ إِلَيْهِ مِنْ أَحَدِكُمْ، كَانَ عَلَى رَاحِلَتِهِ بِأَرْضِ فَلاَةٍ، فَانْفَلَتَتْ مِنْهُ وعَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ، فَأَيِسَ مِنْهَا، فَأَتَى شَجَرَةً، فَاضْطَجَعَ فِي ظِلِّهَا، قَدْ أَيِسَ مِنْ رَاحِلَتِهِ، فَبَيْنَا هُوَ كَذَلِكَ إِذَا هُوَ بِهَا، قَائِمَةً عَنْدَهُ، فَأَخَذَ بِخِطَامِهَا، ثُمَّ قَالَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ: اللَّهُمَّ! أَنْتَ عَبْدِي وَأَنَا رَبُّكَ، أَخطَأَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ).

له ریوایەتێکی موسلیمدا: **(خودا لە یەکێك لە ئێوە دڵخۆشترە بە تەوبەی بەندەکەی کاتێ دەگەڕێتەوە بۆ لای، ئەو لەسەر وڵاخی سوارییەکەی بوو لە زەوییەکی بەرینی چۆڵ، حوشترەکەی لەدەست دەرچوو و خواردن و خواردنەوەکەشی لەسەر بوو، ئەو بێهیوابوو لە بینینەوەی، بۆیە رووی کرد لە درەختێك و لە سێبەرەکەی پاڵیدایەوە، ئەو لە حوشترەکەی بێهیوابووبوو، لە کاتێکدا ئەو لەو حاڵەدا بوو لەناکاو بینی لە پاڵیدا وەستاوە، رەشوەکەی گرت و پاشان لە زۆری دڵخۆشبوون وتی: خودایە، تۆ بەندەی منی و من پەروەردگاری تۆم، لە زۆری دڵخۆشبوون هەڵەی کرد).**

**٢٢٨٦**– عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (كُلُّ ابْنِ آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ). [ت٢٤٩٩/ جه٤٢٥١/ مي٢٧٦٩]

* حسن.

له ئەنەسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەموو ئادەمیزادێك زۆر خەتاکارە، باشترین و چاکترین خەتاکار تەوبەکارانن).**

**٢٢٨٧**– عَنِ ابْنِ مَعْقِلٍ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِي عَلَى عَبْدِ اللهِ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (النَّدَمُ تَوْبَةٌ)، فَقَالَ لَهُ أَبِي: أَنْتَ سَمِعْتَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (النَّدَمُ تَوْبَةٌ) ؟ قَالَ: نَعَمْ. [جه٤٢٥٢]

* صحيح.

له ئیبن مەعقیلەوە، وتی: لەگەڵ باوکم چووینە ژوورەوە بۆ لای عەبدوڵا، گوێم لێبوو دەیوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پەشیمانی تەوبەیە)**، باوکم پێی وت: تۆ گوێت لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(پەشیمانی تەوبەیە؟)** وتی: بەڵێ.

## ٦- دەروازەی: چەندبارە کردنەوەی لێخۆشبوون بە چەندبارە کردنەوەی تەوبە

**٢٢٨٨-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فِيمَا يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ عزّ وجل قَالَ: (أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْباً، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْباً، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبّاً يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ. ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: عَبْدِي أَذْنَبَ ذَنْباً، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبّاً يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ. ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ: أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي. فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْباً، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبّاً يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، اعْمَلْ مَا شِئْتَ؛ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ). اللفظ لمسلم. [خ٧٥٠٧/ م٢٧٥٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، لەوەی لە پەروەردگارەوە(عز وجل) دەیگێڕێتەوە، فەرمووی: **(بەندەیەك گوناهێكی كرد و وتی: خودایە لە گوناهەكەم خۆشببە، خودا(تبارك وتعالى) فەرمووی: "بەندەكەم گوناهێكی ئەنجامدا و زانی پەروەردگارێك هەیە لە گوناه خۆشدەبێت و بە گوناه دەگرێت[1]"، پاشان گەڕایەوە و گوناهی كرد و وتی: ئەی پەروەردگار، لە گوناهەكەم خۆشببە، خودا(تبارك وتعالى) فەرمووی: "بەندەكەم گوناهێكی ئەنجامدا و زانی پەروەردگارێك هەیە لە گوناه خۆشدەبێت و بە گوناه دەگرێت"، پاشان گەڕایەوە و گوناهی كرد و وتی: ئەی پەروەردگار، لە گوناهەكەم خۆشببە، خودا(تبارك وتعالى) فەرمووی: "بەندەكەم گوناهێكی ئەنجامدا و زانی پەروەردگارێك هەیە لە گوناه خۆشدەبێت و بە گوناه دەگرێت"، برۆ هەرچی دەخوازی ئەنجامی بدە من لە تۆ خۆشبووم)**. لەفزەكە بۆ موسلیم دەگەڕێتەوە.

## ٧- دەروازەی: قبوولبوونی تەوبە با گوناهانیش زۆر بن

**٢٢٨٩-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْساً، فَسَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ فَدُلَّ عَلَى رَاهِبٍ، فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّهُ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْساً، فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: لاَ، فَقَتَلَهُ، فَكَمَّلَ بِهِ مَائَةً.

---

[1] "گرتن بە گوناه" واتە سزادان بە هۆی گوناهەوە—و.

ثُمَّ سَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ فَدُلَّ عَلَى رَجُلٍ عَالِمٍ، فَقَالَ: إِنَّهُ قَتَلَ مِائَةَ نَفْسٍ، فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، وَمَنْ يَحُولُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ التَّوْبَةِ؟ انْطَلِقْ إِلَى أَرْضِ كَذَا وَكَذَا، فَإِنَّ بِهَا أُنَاساً يَعْبُدُونَ اللهَ، فَاعْبُدِ اللهَ مَعَهُمْ، وَلاَ تَرْجِعْ إِلَى أَرْضِكَ، فَإِنَّهَا أَرْضُ سَوْءٍ.

فَانْطَلَقَ حَتَّى إِذَا نَصَفَ الطَّرِيقَ أَتَاهُ الْمَوْتُ، فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ وَمَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ. فَقَالَتْ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ: جَاءَ تَائِباً مُقْبِلاً بِقَلْبِهِ إِلَى اللهِ. وَقَالَتْ مَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ: إِنَّهُ لَمْ يَعْمَلْ خَيْراً قَطُّ، فَأَتَاهُمْ مَلَكٌ فِي صُورَةِ آدَمِيٍّ فَجَعَلُوهُ بَيْنَهُمْ، فَقَالَ: قِيسُوا مَا بَيْنَ الأَرْضَيْنِ، فَإِلَى أَيَّتِهِمَا كَانَ أَدْنَى، فَهُوَ لَهُ. فَقَاسُوهُ فَوَجَدُوهُ أَدْنَى إِلَى الأَرْضِ الَّتِي أَرَادَ، فَقَبَضَتْهُ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ).

اللفظ لمسلم.　　　[خ٣٤٧٠/ م٢٧٦٦]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(پیاوێك لە سەردەمانی پێش ئێوە نەوەد و نۆ کەسی کوشت، پرسیاری زاناترین ئەهلی زەوی کرد، راهیبێکی پێ نیشاندرا، ئەویش هات بۆ لای و وتی: ئەو نەوەد و نۆ کەسی کوشتووە، ئایا تەوبەی بۆ هەیە؟ راهیبەکە وتی: نەخێر، راهیبەکەشی کوشت و سەدی پێ تەواو کرد.**

**پاشان پرسیاری زاناترینی ئەهلی زەوی کرد، پیاوێکی زانای پێ نیشاندرا، وتی: ئەو سەد نەفسی کوشتووە، ئایا تەوبەی بۆ هەیە؟ زاناکە وتی: بەڵێ، کێ دەکەوێتە نێوان ئەو و تەوبەکردن؟ برۆ بۆ زەوی ئەوە و ئەوە، لەوێ خەڵکانێکی تێدایە خودا دەپەرستن لەگەڵیان خودا بپەرستە و مەگەرێوە بۆ زەوییەکەی خۆت، چونکە زەوییەکی خراپە.**

**رۆیشت تا گەیشتە نیوەی رێگە مردنی بۆ هات، فریشتەی رەحمەت و فریشتەی سزا دەربارەی ئەو کەوتنە ململانێ، فریشتەی رەحمەت دەیانوت: ئەو بە تەوبەکاری و بە دڵی روو لە خوداوە هاتووە، فریشتەی سزا دەیانوت: ئەو هەرگیز خێرێکی ئەنجام نەداوە، فریشتەیەك لە شێوەی ئادەمیزادا هات بۆ لایان، ئەویان کرد بە دادوەر لە نێوان خۆیان، ئەویش وتی: نێوان ئەم و دوو زەوییەکە پێوانە بکەن، لە**

**هەر کامیان نزیکتر بوو بۆ ئەوەیانە، ئەوانیش پێوانەیان کرد بینییان بۆ لای ئەو زەوییەی دەیویست بۆی بڕوات نزیکترە، بۆیە فریشتەی ڕەحمەت گیانی کێشا).**
لەفزەکە بۆ موسلیم دەگەڕێتەوە.

**٢٢٩٠**– (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَقُولُ اللهُ عزّ وجل : مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَأَزِيدُ. وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ، فَجَزَاؤُهُ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا، أَوْ أَغْفِرُ. وَمَنْ تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْراً، تَقَرَّبْتُ مِنْهُ ذِرَاعاً. وَمَنْ تَقَرَّبَ مِنِّي ذِرَاعاً، تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعاً. وَمَنْ أَتَانِي يَمْشِي، أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً. وَمَنْ لَقِيَنِي بِقُرَابِ الأَرْضِ خَطِيئَةً لاَ يُشْرِكُ بِي شَيْئاً، لَقِيتُهُ بِمِثْلِهَا مَغْفِرَةً**). [م٢٦٨٧]

(م) لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا(عز وجل) دەفەرمووێت: هەر کەس چاکەیەك بهێنێت دە بەرانبەری بۆ هەیە و زیادیش دەکەم، هەر کەس خراپەیەك بهێنێت سزاکەی یەك خراپەیە، یان لێیخۆش دەبم، هەر کەس بستێك لێم نزیك ببێتەوە باڵێك لە ئەو نزیك دەبمەوە، هەر کەس باڵێك لێم نزیك ببێتەوە دوو باڵ لێی نزیك دەبمەوە، هەر کەس بە ڕۆیشتن بێت بۆ لام بە ڕاکردن دەچم بۆ لای، هەر کەس پڕ بە زەوی خەتاوە بە من بگات و شتێکی نەکردبێت بە هاوەڵ بۆم پڕ بە زەوی لێخۆشبوونەوە پێی دەگەم).**

## ٨- دەروازەی: قبووڵبوونی تەوبە بەر لە غەرغەرە

**٢٢٩١**– عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ اللهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ**). [ت٣٥٣٧/ جە٤٢٥٣]
* حسن.

لە ئیبن عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا تەوبەی بەندە قبووڵ دەکات گەر نەکەوتبێتە غەرغەرە[1]).**

---

[1] "غەرغەرە" ئەو دەنگەیە لە سەرەمەرگ لە قوڕگدا دروست دەبێت، واتە: گەر گیان نەگەیشتبێتە قوڕگی-و.

## ٩- دەروازەی: کەفارەتی گوناهان

**٢٢٩٢**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَتَانِي اللَّيْلَةَ رَبِّي تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ، . قَالَ: أَحْسَبُهُ قَالَ: . فِي الْمَنَامِ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قالَ: قُلْتُ: لاَ، قَالَ: فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ . أَوْ قَالَ: فِي نَحْرِي .، فَعَلِمْتُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ، قَالَ: يَا مُحَمَّدُ! هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فِي الْكَفَّارَاتِ.

وَالْكَفَّارَاتُ: الْمُكْثُ فِي الْمَسَاجِدِ بَعْدَ الصَّلَوَاتِ، وَالْمَشْيُ عَلَى الأَقْدَامِ إِلَى الْجَمَاعَاتِ، وَإِسْبَاغُ الْوُضُوءِ فِي الْمَكَارِهِ، وَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ عَاشَ بِخَيْرٍ وَمَاتَ بِخَيْرٍ، وَكَانَ مِنْ خَطِيئَتِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ.

وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! إِذَا صَلَّيْتَ فَقُلْ: اللَّهُمَّ! إِنِّي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ، وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ، وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ، وَإِذَا أَرَدْتَ بِعِبَادِكَ فِتْنَةً؛ فَاقْبِضْنِي إِلَيْكَ غَيْرَ مَفْتُونٍ.

قَالَ: وَالدَّرَجَاتُ: إِفْشَاءُ السَّلاَمِ، وَإِطْعَامُ الطَّعَامِ، وَالصَّلاَةُ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ).

* صحيح. [ت٣٢٣٣]

**لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەم شەو پەروەردگارم(تبارك وتعالى) لە جوانترین شێوەدا هات بۆ لام– وتی: پێموایە فەرمووی: (لە خەوندا)– فەرمووی: ئەی محەمەد، ئایا دەزانی کۆڕی باڵا(الملأ الأعلى) نەیارییان دەربارەی چییە؟ فەرمووی: وتم: نەخێر، فەرمووی: دەستی لە نێوان دوو شانم دانا تا فێنکییەکەیم لە نێوان دوو مەمکم هەست پێ کرد–یان فەرمووی: (لە گەردنم)– بۆیە ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوەی لە زەوی بوو زانیم، فەرمووی: ئەی محەمەد، ئایا دەزانی کۆڕی باڵا(الملأ الأعلى) نەیارییان دەربارەی چییە؟ فەرمووی: وتم: بەڵێ، فەرمووی: دەربارەی کەفارەتەکانە.**

**کەفارەتەکان بریتین لە: مانەوە لە مزگەوتەکان پاش نوێژەکان، ڕۆیشتن بە پێ بۆ نوێژە جەماعەتەکان، گرتنی دەستنوێژ بە باشی لە ناخۆشییەکاندا، هەر کەس ئەوە بکات بە خێرەوە دەژی و بە خێرەوە دەمرێت، و لە گوناهەکەی وەك ئەو ڕۆژەیە لەدایك بووە.**

هەروەها فەرمووی: ئەی محەمەد، گەر نوێژت ئەنجامدا بڵێ: "اللهم إني أسألك فعل الخيرات، وترك المنكرات، وحُبَّ المساكين، وإذا أردتَ بعبادِك فتنة فاقبضني إليك غير مفتون".

فەرمووی: پلەکانیش بریتین لە: بڵاوە پێکردنی سەلام، و بەخشینی خۆراک، و نوێژ لە شەودا خەڵکی خەوتبن).

## بەشی چوارەم

# فەزڵی صەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

## ١- دەروازەی: فەزڵی صەلات لەسەر پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٢٢٩٣**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ عَشْراً)**. [م٤٠٨]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس یەك صەڵەوات لەسەر من بدات خودا دە صەڵەواتی لەسەر دەدات)**.

**٢٢٩٤**- وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُوراً، وَلاَ تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيداً، وَصَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ تَبْلُغُنِي حَيْثُ كُنْتُمْ)**. [د٢٠٤٢]

* صحيح.

هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان، گۆڕەکەی منیش مەکەن بە جێژوان، صەڵەواتم لەسەر بدەن، چونکە صەڵەواتی ئێوە بە من دەگات لە هەر کوێ بن)**.

## ٢- دەروازەی: ترساندن لە صەڵەوات نەدان لەسەر پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٢٢٩٥**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(رَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ، وَرَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ دَخَلَ عَلَيْهِ رَمَضَانُ، ثُمَّ انْسَلَخَ قَبْلَ أَنْ يُغْفَرَ لَهُ، وَرَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ أَدْرَكَ عِنْدَهُ أَبَوَاهُ الْكِبَرَ، فَلَمْ يُدْخِلاَهُ الْجَنَّةَ)**. قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: وَأَظُنُّهُ قَالَ: **(أَوْ أَحَدُهُمَا)**.

* حسن صحيح. [ت٣٥٤٥]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لووتی پیاوێك لە خۆڵەوە بچێت منی لا باس دەکرێت و صەڵەواتم لەسەر نادات، لووتی پیاوێك لە خۆڵەوە بچێت دەچێتە ناو رەمەزانەوە و لێی دێتە دەرەوە بەرلەوەی خودا لێیخۆش ببێت، لووتی پیاوێك لە خۆڵەوە بچێت دەگات بە دایك و باوکێکی بە تەمەن نایبەنە بەهەشتەوە)**، عبدالرحمن وتی: وا گومان دەبەم فەرمووی: **(یان یەکێك لەو دوانە)**.

**٢٢٩٥م**- عَنْ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(الْبَخِيلُ الَّذِي مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ)**. [ت٣٥٤٦]

* صحيح.

لە حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دەستنوقاو ئەو کەسەیە منی لە لا باس کراوە و صەڵەواتی لەسەر نەداوم)**.

## ٣- دەروازەی: فەزڵی سەلام لەسەر پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٢٢٩٦**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ لِلَّهِ مَلاَئِكَةً سَيَّاحِينَ فِي الْأَرْضِ، يُبَلِّغُونِي مِنْ أُمَّتِي السَّلاَمَ)**. [ن١٢٨١/ مي٢٨١٦]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بۆ خودا کۆمەڵێك فریشتە هەن بە زەویدا گەشت دەکەن، لە ئومەتەکەمەوە سەلامم پێ دەگەیەنن)**.

**٢٢٩٧**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ؛ إِلاَّ رَدَّ اللهُ عَلَيَّ رُوحِي، حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ)**. [د٢٠٤١]

* حسن.

لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس سەلامم لەسەر لێبدات خودا ڕۆحەکەم بۆ دەگێڕێتەوە تا وەڵامی سەلامەکەی بدەمەوە).**

**٢٢٩٨**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يَقِفُ عَلَى قَبْرِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَيُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَعَلَى أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ. [ط٣٩٩]

* إسناده صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی دینارەوە، وتی: عەبدوڵای کوڕی عومەرم بینی لەسەر گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ) دەوەستا، صەڵەواتی لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر لێدەدا.**

## بەشی یەکەم

## سوێندەکان

### ١- دەروازەی: نەهی لە سوێندخواردن بە شتێکی تر جگە لە خودا(سبحانه وتعالى)

**٢٢٩٩-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ أَدْرَكَ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ فِي رَكْبٍ وَهُوَ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ، فَنَادَاهُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَلاَ، إِنَّ اللهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفاً؛ فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ، وَإِلاَّ فَلْيَصْمُتْ**). [خ٦١٠٨ (٢٦٧٩)/ م١٦٤٦]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): ئەو لەناو کۆمەڵێکدا بە عومەری کوڕی خەتاب گەیشت، عومەر سوێندی بە باوکی دەخوارد، پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردن: **(دەزانن خودا نەهیتان لێ دەکات سوێند بە باب و باپیران بخۆن، هەر کەس سوێندخۆر بوو با بە خودا سوێند بخوات، ئەگەر نە، با بێدەنگ بێت).**

**٢٣٠٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، وَلاَ بِأُمَّهَاتِكُمْ، وَلاَ بِالأَنْدَادِ، وَلاَ تَحْلِفُوا إِلاَّ بِاللهِ، وَلاَ تَحْلِفُوا بِاللهِ إِلاَّ وَأَنْتُمْ صَادِقُونَ**).
* صحيح. [د٣٢٤٨/ ن٣٧٧٨]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بە باب و باپیرانتان سوێند مەخۆن، هەر بەو جۆرە بە دایکانتان، بە هەمان شێوە بە دژەکانی خودا[1]، تەنها بە خودا سوێند بخۆن، تەنها لە کاتێکدا راستگۆن سوێند بە خودا بخۆن).**

**٢٣٠١-** عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ حَلَفَ بِالأَمَانَةِ فَلَيْسَ مِنَّا**).
* صحيح. [د٣٢٥٣]

---

(١) مەبە بە دژەکانی خودا وشەی (أنداد)ە و کۆی وشەی (ندّ) کە مانای دژی هەیە–و.

لە بورەیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بە ئەمانەت[1] سوێند بخوات لە ئێمە نییە)**.

## ٢- دەروازەی: هەر کەس بە لات و عوززا سوێند بخوات

**٢٣٠٢-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: وَاللاَّتِ وَالعُزَّى؛ فَلْيَقُلْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ؛ فَلْيَتَصَدَّقْ). [خ٤٨٦٠/ م١٦٤٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس سوێند بخوات و لە سوێندەکەی وتی: بە لات و عوززا، با بڵێت: "لا إله إلا الله"[2]، هەر کەس بە هاوەڵەکەی خۆی وت وەرە قومارت لەگەڵ بکەم، با صەدەقە بکات)**.

## ٣- دەروازەی: هەر کەس سوێندی خوارد و شتێکی باشتر و چاکتر لەوەی بینی

**٢٣٠٣-** (م) عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا حَلَفَ أَحَدُكُمْ عَلَى الْيَمِينِ، فَرَأَى خَيْراً مِنْهَا؛ فَلْيُكَفِّرْهَا، وَلْيَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ). [م١٦٥١]

(م) لە عەدیی کوڕی حاتەمەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە پێداگرانە سوێندی خوارد و باشتر و چاکتر لەوەی بینی، با کەفارەتەکەی بدات و ئەوە بکات باشتر و چاکترە)**.

---

[1] مەبەست لە (ئەمانەت) نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکاتە، یەکێك لەوان دەیوت: سوێند بە نوێژەکەم، سوێند بە حەجەکەم، ..هتد-و.

[2] کەسانێك هەبوون تازە نەفامییان بەجێهێڵابوو و هاتبوونە ناو ئیسلامەوە، بۆیە هێشتا زمانیان لە سوێندی سەردەمی نەفامی پاك نەبووبوویەوە، پێغەمبەر ڕێنموونییان دەکات بۆ ڕزگاربوون لەو سوێندەی سەردەمی نەفامی، چونکە هاوەڵدانانی بچووکە-و.

## ٤- دەروازەی: نەهی لە پێداگری و سووربوون لەسەر سوێند

٢٣٠٤- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (وَاللهِ لأَنْ يَلِجَّ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ فِي أَهْلِهِ، آثَمُ لَهُ عِنْدَ اللهِ مِنْ أَنْ يُعْطِيَ كَفَّارَتَهُ الَّتِي افْتَرَضَ اللهُ عَلَيْهِ).
[خ٦٦٢٥/ م١٦٥٥]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بە خودا، گەر یەکێك لە ئێوە سوور و پێداگر بێت بە سوێندی لە خانەوادەکەی، لای خودا گوناهی بۆ ئەو زۆرترە لەوەی ئەو کەفارەتە بدات کە خودا لەسەری فەرز کردووە)**[1].

## ٥- دەروازەی: سوێندی لەغو

٢٣٠٥- (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أُنْزِلَتْ هذِهِ الآيَةُ: ﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَٰنِكُمْ﴾ [البقرة:٢٢٥] فِي قَوْلِ الرَّجُلِ: لاَ وَاللهِ، وَبَلَى وَاللهِ. [خ٤٦١٣]

(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): ئەم ئایەتە: ﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَٰنِكُمْ﴾ [البقرة:٢٢٥] دەربارەی قسەی پیاو دابەزی: نە سوێند بە خودا، با، سوێند بە خودا.

## ٦- دەروازەی: سوێندی درۆ

٢٣٠٦- (م) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ، فَقَدْ أَوْجَبَ اللهُ لَهُ النَّارَ، وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ)، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: وَإِنْ كَانَ شَيْئاً يَسِيراً، يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (وَإِنْ قَضِيباً مِنْ أَرَاكٍ). [م١٣٧]

---

[1] واتە: کەسێك سوێند لە خانەوادەکەی دەخوات و لە ترسی ئەوەی لای خودا گوناهبار نەبێت سوێندەکەی خۆی ناشکێنێت و بەردەوام و پێداگر دەبێت لەسەر سوێندەکەی و دەبێتە هۆی زیان بەسەر خانەوادەکەیەوە، گوناهی بەردەوامی و سووربوونەکەی زۆرتر و زیاترە لە گوناهی سوێندکەوتنەکەی، بۆیە دەبێت بەردەوام نەبێت و کەفارەتی سوێندەکەی بدات-و.

(م) لە ئەبی ئومامەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بە سوێندەکەی ماڵی کەسێکی موسڵمان بۆ خۆی بچڕێ خودا ئاگری بۆ پێویست دەکات و بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات)**، پیاوێك پێی وت: با شتێکی زۆر کەمیش بێت، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: **(با پارچەیەکیش بێت لە داری سیواك)**.

**٢٣٠٧**– عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: اخْتَصَمَ رَجُلاَنِ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي أَرْضٍ، أَحَدُهُمَا مِنْ أَهْلِ حَضْرَمَوْتَ، قَالَ: فَجَعَلَ يَمِينَ أَحَدِهِمَا، قَالَ: فَضَجَّ الْآخَرُ وَقَالَ: إِنَّهُ إِذاً يَذْهَبُ بِأَرْضِي! فَقَالَ: **(إِنْ هُوَ اقْتَطَعَهَا بِيَمِينِهِ ظُلْماً، كَانَ مِمَّنْ لاَ يَنْظُرُ اللهُ عزّ وجل إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلاَ يُزَكِّيهِ، وَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ)**. قَالَ: وَوَرِعَ الْآخَرُ فَرَدَّهَا. [حم١٩٥١٤]

* إسناده صحيح.

لە ئەبی موساوە، وتی: دوو پیاو لە ئەهلی حەزرەمەوت دەربارەی زەوییەك ناکۆکی خۆیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، وتی: زەوییەکەی لەسەر سوێندی یەکێکیان دانا، وتی: ئەویتریان کەوتە هاوار و وتی: کەوابوو زەوییەکەم دەبات، پێغەمبەر فەرمووی: **(گەر ئەو ستەم بۆ خۆی بیچڕێت دەبێت بە یەکێك لەو کەسانەی خودا(عز وجل) لە رۆژی قیامەت تەماشای ناکات و پاکی ناکاتەوە و سزایەکی بەئێشی بۆ هەیە)**، وتی: ئەویتریان وەرعی کرد و زەوییەکەی گێڕایەوە.

## ٧- دەروازەی: کەسێك سوێند بخوات لەسەر ئایینێکە جگە لە ئیسلام

**٢٣٠٨**– عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ حَلَفَ فَقَالَ: إِنِّي بَرِيءٌ مِنَ الْإِسْلاَمِ، فَإِنْ كَانَ كَاذِباً فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَإِنْ كَانَ صَادِقاً فَلَنْ يَرْجِعَ إِلَى الْإِسْلاَمِ سَالِماً)**.

* صحيح. [د٣٢٥٨/ ن٣٧٨١/ جه٢١٠٠]

لە بورەیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس سوێندی خوارد و وتی: من بەریم لە ئیسلام[1]، گەر درۆ بکات ئەوا ئەو بەو جۆرەیە، گەر راست بکات ئەو بە سەلامەتی ناگەڕێتەوە بۆ ئیسلام)[2].**

## ٨- دەروازەی: سوێند لەسەر نیێتی سوێندخۆرەکە

**٢٣٠٩-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(يَمِينُكَ عَلَى مَا يُصَدِّقُكَ عَلَيْهِ صَاحِبُكَ)**. وَقَالَ عَمْرٌو: **(يُصَدِّقُكَ بِهِ صَاحِبُكَ)**. [م١٦٥٣]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێندەکەت لەسەر ئەوەیە هاوەڵەکەت لەسەری بە راستت دەزانێت)[3]**، عەمر وتی: **(هاوەڵەکەت بەوە بە راستت دەزانێت)**.

- وفي رواية: (الْيَمِينُ عَلَى نِيَّةِ الْمُسْتَحْلِفِ).

لە ریوایەتێکدا: **(سوێند لەسەر نیێتی سوێنددەرەکەیە[4])**.

---

[1] یان بلێت: یەهوودی بم گەر درۆ بکەم، یان گاور بم گەر درۆ بکەم-و.

[2] واتە: درۆ بکات ئەو لە ئیسلام بەری بووە، راستیش بکات گوناهبار بووە-و.

[3] "سوێنددەر" واتە (المستحلِف) ئەو کەسەی کەسێك سوێند دەدات، قازی بێت یان هەر کەسێکی تر، سوێنخۆریش بریتییە لە (الحالِف)-و.

[4] واتە: کەسێك سوێند لە خانەوادەکەی دەخوات و لە ترسی ئەوەی لای خودا گوناهبار نەبێت سوێندەکەی خۆی ناشکێنێت و بەردەوام و پێداگر دەبێت لەسەر سوێندەکەی و دەبێتە هۆی زیان بەسەر خانەوادەکەیەوە، گوناهی بەردەوامی و سووربوونەکەی زۆرتر و زیاترە لە گوناهی سوێندکەوتنەکەی، بۆیە دەبێت بەردەوام نەبێت و کەفارەتی سوێندەکەی بدات-و.

## ٩- دەروازەی: دەربارەی سوێندی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٢٣١٠-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: كَثِيراً مِمَّا كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَحْلِفُ: (لاَ، وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ). [خ٦٦١٧]

(خ) لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە، وتی: لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر سوێندی پێ دەخوارد ئەمە بوو: **(نەخێر، سوێند بە وەرچەرخێنەری دڵان(لا، ومقَلِّبَ القُلوبِ)).**

## ١٠- دەروازەی: هەڵواردن لە سوێندا

**٢٣١١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ حَلَفَ فَاسْتَثْنَى، فَإِنْ شَاءَ رَجَعَ، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ غَيْرَ حِنْثٍ).

* صحيح. [د٣٢٦٢/ ت١٥٣١/ ن٣٨٠٢/ جه٢١٠٥/ مي٢٣٨٧]

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس سوێندی خوارد و هەڵواردنی كرد[1]، گەر بیەوێت گەڕاوەتەوە[2]، گەر بخوازێت وازدەهێنێت بەبێ كەوتنی سوێندەكەی).**

**٢٣١٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَقَالَ: إِنْ شَاءَ اللهُ، لَمْ يَحْنَثْ). [ت١٥٣٢/ ن٣٨٦٤/ جه٢١٠٤]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس لەسەر سوێندێك سوێندی خوارد و وتی: "إن شاء الله" سوێندەكەی ناكەوێت).**

---

[1] واتە وتی: "إن شاء الله"-و.

[2] "گەڕاوەتەوە" واتە: پەشیمانبووەتەوە لە سوێندەكەی-و.

## ١١- دەروازەی: نەهی لەوەی بوترێت: خودا و تۆ بخوازن(بیانەوێت)

**٢٣١٣**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا حَلَفَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَقُلْ: مَا شَاءَ اللهُ وَشِئْتَ، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ شِئْتَ)**. [جه٢١١٧]

* حسن صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە سوێندی خوارد نەڵێت: خودا و تۆ بخوازن، بەڵکو بڵێت: خودا ویستی و پاشان تۆ ویستت)**.

## ١٢- دەروازەی: کینایە لە سوێندا

**٢٣١٤**- عَنْ سُوَيْدِ بْنِ حَنْظَلَةَ قَالَ: خَرَجْنَا نُرِيدُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَمَعَنَا وَائِلُ بْنُ حُجْرٍ، فَأَخَذَهُ عَدُوٌّ لَهُ، فَتَحَرَّجَ الْقَوْمُ أَنْ يَحْلِفُوا، وَحَلَفْتُ أَنَّهُ أَخِي، فَخَلَّى سَبِيلَهُ، فَأَتَيْنَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَخْبَرْتُهُ: أَنَّ الْقَوْمَ تَحَرَّجُوا أَنْ يَحْلِفُوا، وَحَلَفْتُ أَنَّهُ أَخِي، قَالَ: **(صَدَقْتَ، الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ)**. [د٣٢٥٦/ جه٢١١٩]

* صحيح.

لە سوەیدی کوڕی حەنزەلەوە، وتی: دەرچووین و دەمانویست بگەین بە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، وائیلی کوڕی حوجرمان لەگەڵ بوو، دوژمنێکی وائیلی گرت، خەڵکەکە حەرەجیان هەبوو سوێند بخۆن، من سوێندم خوارد ئەو برامە، بۆیە ڕێگەی دا بڕوات، هاتین بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هەواڵم پێدا: خەڵکەکە حەرەجیان هەبوو سوێند بخۆن من سوێندم خوارد ئەو برامە، فەرمووی: **(تۆ ڕاستت کرد موسڵمان برای موسڵمانە)**.

## ١٣- دەروازەی: سوێند لە بڕینی سیلەی ڕەحمدا

**٢٣١٥**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ نَذْرَ إِلاَّ فِيمَا يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللهِ، وَلاَ يَمِينَ فِي قَطِيعَةِ رَحِمٍ)**. [د٣٢٧٣]

* حسن.

له عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(نەزر تەنها لەوانەدایە مەبەست پێیان ڕووی پاکی خودا بێت، سوێند لە بڕینی سیلەی ڕەحمدا نییە).**

**٢٣١٦**– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ حَلَفَ فِي قَطِيعَةِ رَحِمٍ، أَوْ فِيمَا لاَ يَصْلُحُ، فَبِرُّهُ أَنْ لاَ يَتِمَّ عَلَى ذَلِكَ). [جه٢١١٠]

* صحيح.

لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە بڕینی سیلەی ڕەحمدا یان لە شتێکدا باش نەبێت سوێندی خوارد چاکەکەی ئەوەیە ئەو کارە تەواو نەکات).**

## ١٤- دەروازەی: دەربارەی کەفارەت

**٢٣١٧**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: مَنْ حَلَفَ بِيَمِينٍ فَوَكَّدَهَا، ثُمَّ حَنِثَ فَعَلَيْهِ عِتْقُ رَقَبَةٍ، أَوْ كِسْوَةُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ، وَمَنْ حَلَفَ بِيَمِينٍ فَلَمْ يُؤَكِّدْهَا، ثُمَّ حَنِثَ فَعَلَيْهِ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ، لِكُلِّ مِسْكِينٍ مُدٌّ مِنْ حِنْطَةٍ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ، فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ. [ط١٠٣٥]

* إسناده صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: هەر کەس سوێندێکی خوارد و پێداگری لەسەر کرد، پاشان سوێندەکەی کەوت لەسەریەتی کۆیلەیەك ڕزگار بکات، یان پۆشاکی دە کەسی هەژار بکات، هەر کەس سوێندێکی خوارد و پێداگری لەسەر نەکرد پاشان سوێندەکەی کەوت لەسەریەتی نانی دە هەژار بدات، بۆ هەر هەژارێك "مُدّ"ێك[1] لە گەنم، هەر کەس نەیبوو ڕۆژووی سێ ڕۆژ.**

---

[1] واتە: پڕی دوو مشت–و.

## بەشی دووەم

## نەزر

### ١- دەروازەی: فەرمان بە وەفاداری بۆ نەزر

**٢٣١٨-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ ﷺ، اسْتَفْتَى رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا نَذْرٌ، فَقَالَ: (**اقْضِهِ عَنْهَا**).

[خ٢٧٦١/ م١٦٣٨]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت): سەعدی كوڕی عوبادە(خوا لێی رازی بێت) داوای فتوای لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) كرد و وتی: دایكم مرد و نەزری لەسەر بوو، فەرمووی: (لەوەوە بۆی جێبەجێ بكە).**

**٢٣١٩-**(ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ عُمَرَ سَأَلَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: كُنْتُ نَذَرْتُ فِي الجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ لَيْلَةً فِي المَسْجِدِ الحَرَامِ؟ قَالَ: (**فَأَوْفِ بِنَذْرِكَ**).

[خ٢٠٣٢/ م١٦٥٦]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): عومەر پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) كرد و وتی: لە سەردەمی نەفامی نەزرم كرد شەوێك لە مەسجیدولحەرام ئیعتیكاف بكەم؟ فەرمووی: (كەوابوو وەفاداریە بە نەزرەكەت).**

**٢٣٢٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ امْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَضْرِبَ عَلَى رَأْسِكَ بِالدُّفِّ، قَالَ: (**أَوْفِي بِنَذْرِكِ**). قَالَتْ: إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَذْبَحَ بِمَكَانِ كَذَا وَكَذَا ـ مَكَانٌ كَانَ يَذْبَحُ فِيهِ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ ـ قَالَ: (**لِصَنَمٍ**)؟ قَالَتْ: لاَ، قَالَ: (**لِوَثَنٍ**)؟ قَالَتْ: لاَ، قَالَ: (**أَوْفِي بِنَذْرِكِ**). [د٣٣١٢]

* حسن صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من نەزرم کردووە لەسەر سەری تۆ دەف لێ بدەم، فەرمووی: **(وەفاداریە بە نەزرەکەت)**، وتی: من نەزرم کردووە لە فلان شوێن و فلان شوێن کە لە نەفامیدا ئاژەڵیان تێدا سەردەبڕا ئاژەڵ سەرببڕم، فەرمووی: **(بۆ بت؟)**، وتی: نەخێر، فەرمووی: **(بۆ وەسەن؟)**، وتی: نەخێر، فەرمووی: **(وەفا بە نەزرەکەت بکە)**.

## ٢- دەروازەی: نەهی لە نەزر[١]

**٢٣٢١-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ النَّذْرِ، قَالَ: (إِنَّهُ لاَ يَرُدُّ شَيْئاً، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ). [خ٦٦٠٨/ م١٦٣٩]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد لە نەزر و فەرمووی: **(ئەوە شتێك ناگێڕێتەوە، بەڵکو بەهۆیەوە[٢] لە باخەڵی کەسی دەستنوقاو دەردەهێنرێ)**.

## ٣- دەروازەی: نەزر لە تاعەتی خودادا

**٢٣٢٢-**(خ) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللهَ؛ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ؛ فَلاَ يَعْصِهِ). [خ٦٦٩٦]

(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەرکەس نەزری کرد گوێڕایەڵی خودا بکات، با گوێڕایەڵی خودا بکات، هەرکەس نەزری کرد لە خودا یاخی ببێت با لە خودا یاخی نەبێت[٣])**.

---

[١] مەبەست پێی نەزری هەڵواسراو و پەیوەستکراوە، وەك وتنی: خودایە ئەگەر ئەوەم بۆ بکەی یان ئەوەم لەسەر لابدەی ئەوەم لەسەر نەزر بێت-و.

[٢] واتە: بەهۆی نەزرەکەوە-و.

[٣] واتە: با نەزرەکەی ئەنجام نەدات، چونکە کارەکەی لە یاخیبوونی خودادایە-و.

